# سەرجەم بەرهەمەکانی





# دکتۆر کەمال مەزهەر

## بەرگی سێیەم

ئامادەکردنی

دکتۆر جەبار قادر    دکتۆر دڵشاد مەحموود

دکتۆر ئازاد عوبێد    دکتۆر کامەران محەمەد

هەولێر ٢٠٢٢

# سەرجەم بەرهەمەکانی
# دکتۆر کەمال مەزهەر

## بەرگی سێیەم

ئامادەکردنی

دکتۆر جەبار قادر     دکتۆر دڵشاد مەحموود
دکتۆر ئازاد عوبێد     دکتۆر کامەران محەمەد

هەولێر ۲۰۲۲

* ناوی کتێب: سەرجەم بەرهەمەکانی - دکتۆر کەمال مەزهەر- بەرگی سێیەم
* ئامادەکردنی: لیژنەی کۆکردنەوەی نووسین و بەرهەمەکانی پ. د. کەمال مەزهەر
* گشت کارە هونەرییەکان و سەرپەرشتی چاپ: عوسمان پیرداود کواز
* وێنەی سەر بەرگ: هونەرمەند نورەدین جاف
* چاپی یەکەم - هەولێر - ٢٠٢٢
* تیراژ: (١٠٠٠) دانە
* چاپخانە: چاپخانەی دانیشفەر- هەولێر
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٩١٨) ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.
* نرخ (٦٠،٠٠٠) دینار

## پێشەکی

مایەی شانازی لیژنەی تایبەتی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی مێژووناسی ناودار و پەروەردەکاری گەورەی کۆچکردوو پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەرە، سەرجەم بەرهەمەکانی لە (١٠) بەرگدا بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بخاتە بەردەستی خوێنەرە بەڕێزەکان. لەو دە بەرگە شەشی یەکەمیان بە زمانی کوردیین و ئەوانی دیکەشیان، واتا لە حەوتەمەوە تا دەیەم بە زمانی عەرەبیین. ئەمە بەشی یەکەمی ئەو پرۆژە گەورەیەیە کە ئامانجەکەی ئەوەیە سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆبکاتەوە و سەرلەنوێ لە چاپیان بداتەوە.

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد پێشەنگی لێکۆڵەرانی مێژووی نوێی کورد و کوردستانە و بگرە بە دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی تایبەتیی مێژوویی کورد دەژمێردرێت؛ چونکە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە چەندین نەوە بۆ یەکەمین جار لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی ئەوەوە سەبارەت بە کورد و کوردستان ئاشنای میتۆدی زانستی بوون لە بواری مێژوودا، کە پێشتر پێی ڕانەهاتبوون. تا ئەو ڕۆژانە خوێنەرانی کورد بەو چیرۆک و ئەفسانانە ڕاهاتبوون کە باسیان لە مێرخاسی و ئازایی میر و سەرکردە خۆجێییەکانیان دەکرد و ئەوانەیان بە سەرچاوە و بەڵگەی مێژوویی دادەنا. کتێب و وتارە مێژووییەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کارێکی وایان کرد، خوێنەرانی ئاسایی و ڕووناکبیرانی نەوەی نوێی کورد، مێژوویان لە لا خۆشەویست بێت و هەوڵبدەن توانای خۆیان بۆ لێکدانەوەی مێژووی نەتەوە ستەملێکراوەکەیان بخەنەگەڕ، ئەوە سەرباری ئەوەی کە دکتۆر کەمال دەورێکی گەورەی هەبوو لە هاندانی چەندین خوێندکار لە بەشەکانی مێژووی زانکۆکان بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە بواری مێژوودا لە ناوەوە و لە دەرەوەی عیراق. جگە لەوەش وانەکانی بۆ قوتابیان کە زۆربەیان کوردیش نەبوون هەمان دەوریان هەبوو لە ڕووکردنە خوێندنی باڵا بۆ خوێندنی مێژوو بە ڕێبازێکی زانستی، ئەو شاگردانە بە درێژایی تەمەنیان و کاروانی زانستییان

به دڵسۆزی و وەفاداری بۆ مامۆستای گەورەیان مانەوە. ئەم کارانەی تەنیا خوێندکارانی کوردی نەدەگرتەوە، بەڵکو هەموو ئەو خوێندکارانەشی دەگرتەوە کە سەرپەرشتی نامە و تێزەکانی کردوون یان بۆ پرس و ڕاوێژ ڕوویان لێی ناوە بۆ هەڵبژاردنی بابەتی لێکۆڵینەوە و پرۆژەی توێژینەوە زانستییەکانیان.

دکتۆر کەمال بەردەوام ئەوەی دووپات دەکردەوە کەوا بواری مێژووی کورد وەک کێڵگەیەکی نەکێڵراو و نەچێندراوە، بۆیە ئەو ئەرکە مەزنە پێویستی بە چەندین نەوەی توێژەر هەیە بۆ ئەوەی بەشێکی بەجێبێنن. دکتۆر کەمال زۆر بەوە دڵخۆش بوو کاتێ ئاوڕی دواوەی دەدایەوە بەرهەمی کاری پەروەردەیی خۆی دەبینی، کە چەندین توێژەر و پسپۆڕ لە بواری مێژووی کورددا لەوانەی ڕاستەوخۆ بەشداریی لە پێگەیاندنیاندا کردبوو خەریکی کارکردنن لەسەر مێژووی کورد و کوردستان. ئەوانەی سەرپەرشتی نامە و تێزە زانستییەکانیانی کردبوو یا لە ڕێی کتێب و وتار و توێژینەوە مێژووییەکانییەوە کاریگەری لەسەر دانابوون. بەرهەمی زانستیی دکتۆر کەمال مەزهەر جێی بایەخی کۆڕ و ناوەندی بەرفراوانی خوێنەران و ڕووناکبیرانی کورد و عێراقییەکان بوو.

گومان لەوەدا نییە کە کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی مێژووناسێکی پڕ بەرهەمی وەک کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر پێویستی بە پاڵپشتی و هاوکاریی چەندین توێژەر و ڕووناکبیر هەیە، تەنانەت ئەوە ئەرکی دامەزراوەیەکی تایبەتمەندە لەگەڵ چەندین کادیری زانستی و کارگێڕی تەرخانکراو بۆ ئەو کارە، نەک ئەرکی لیژنەیەکی خۆبەخشی چوار کەسیی، کە لێرە و لەوێ کار دەکەن و سێ کەسیان لە هەمان کاتدا مامۆستای زانکۆن و دەبێ سەرقاڵی وانە وتنەوەو و کاری زانستیی خۆیان بن.

ئەم لیژنەیە بەر لە کۆچی دوایی زانای گەورەمان بە چەند ڕۆژێک پێکهات، بە مەبەستی کۆکردنەوەی کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی و

پۆلێنکردنیان و پاشان لە چاپدان و بڵاوکردنەوەیان. لیژنەکە پێی باشە کۆی بەرهەمەکانی خوالێخۆشبوو بەم شێوەیەی خوارەوە بەسەر شەش بەشدا دابەش بکات:

**بەشی یەکەم:** کە بە خۆشحاڵییەوە وا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران، کە هەموو کتێبە بڵاوکراوەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لە دە بەرگدا دەگرێتە خۆ. سەرلەبەری لاپەڕەکانی ئەم بەشە حەوت هەزار و دوو سەد و پەنجا لاپەڕەن.

**بەشی دووەم:** ئەو لێکۆڵینەوە زانستی و وتارانەن کە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە. لیژنەکەمان بەشێکی لەو وتارانە بەدەستهێناوە و وێنەیانی گرتووە، بەڵام لەم بوارە هێشتا کاری زۆر ماوە، پێویستی بە هاوکاری ژمارەیەکی زیاتر لە ئەندامانی لیژنەی سەرپەرشتیار هەیە.

**بەشی سێیەم:** ئەم بەشە ئەو کارە زانستی و ڕۆژنامەوانییانەی دکتۆر کەمال مەزهەر دەگرنەوە کە بە زمانی ڕووسی نووسیونی و بڵاوی کردوونەتەوە و خۆیان لە هەزار و پێنج سەد لاپەڕە دەدەن. ئەمانەیان پێویستە بکرێن بە کوردی، لیژنە هەنگاوی یەکەمی بۆ ئەمە ناوە. لە بەسەرکردنەوەی لیستی دانراو و توێژینەوەکانیدا بۆ لیژنەکە دەرکەوت کە هەندێ لەم توێژینەوە و وتارانە لە کاتی خۆیدا خوالێخۆشبوو کردوونی بە کوردی یان عەرەبی یانیش لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی دواتری خۆیدا بەکاری هێناون.

**بەشی چوارەم:** ئەم بەشەیان تەرخانکراوە بۆ کۆکردنەوەی ئەو پێشەکییانەی بۆ ژمارەیەکی بەرچاو لە کتێب و دانراوی توێژەرانی کورد و عەرەب نووسیوونی، وێڕای ئەو یادداشتنامانەی کە بۆ بڵاوکردنەوە ئامادەی کردوون و پێشەکی بۆ نووسیون. ئەو پێشەکییانە زانیاری و لێکدانەوەی گرنگیان تێدان و وا پێویست دەکات بایەخ بە کۆکردنەوەیان بدەین لە زیاتر لە بەرگێکدا.

**بەشی پێنجەم:** لیژنە هەوڵدەدات ئەم بەشە بۆ ئەو دیمانە و دیدار و چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیانە تەرخان بکات کە لەگەڵ دکتۆر کەمالدا کراون، کە تێیاندا بیروبۆچوون و لێکدانەوەکانی بۆ زۆر پرسی زانستی و هزری و ڕووناکبیری دەربڕیون. ئەمانە شایەتی بۆ ئەوە دەدەن کە ئاگاداریی بەرفراوانی لەمەڕ پرسەکان هەبووە و ڕاستیی و دروستیی گەلێ لە بۆچوونەکانی و قووڵیی لێکدانەوەکانی دەردەخەن. ئەمەشیان بابەتگەلێکی دەوڵەمەندن؛ بۆ توێژینەوە و لێکدانەوە لە بیروبۆچوونە هزری و ڕووگە ڕووناکبیرەکانی.

**بەشی شەشەم:** بە ئومێدی ئەوەین ئەم بەشەیان هەموو ئەو نووسینانە بگرێتەخۆ کە لەبارەی کۆچکردووەوە نووسراون و بڵاوکراونەتەوە، جا چ کتێب و نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا بن یان لێکۆڵینەوە و وتار کە لە سەروبەندی کۆچکردنی یان لە بیرەوەری یەکساڵەی کۆچی دوایی گوتران. پێمانوایە ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانە کە پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد سەرپەرشتی کردوون و بەپێی ڕێنماییەکان توێژینەوەی هاوبەشن، لەم بەشەدا جێیان بکەینەوە. کۆچکردوو لە داڕشتنی کاری زانستی خوێندکارانیدا داهێنەر بوو، لە پرۆژەی ماستەرنامە و کارنامەکانی دکتۆرا لە بیرۆکە و ناوونیشانی بابەت و پلانی لێکۆڵینەوە بگرە تا دەگەیشتە لێکدانەوە و ڕێکخستنیان، بۆیە بە پێویست زانرا پێڕستێک بە ناوونیشانی ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانەی کە سەرپەرشتی کردوون و ناوی خوێندکار، و ئاستی کارەکە و مێژووەکەیان لەم بەشەدا جێگە بکرێنەوە. جێی خۆیەتی لێرە ئاماژە بە بەشداریی پڕجۆش و دەوڵەمەندانەی دکتۆر کەمال بکەین لە گفتوگۆی دەیان نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرادا کە پڕ بوون لە زانیاری دەگمەن و بیرۆکەی هێژا. لەبەر ئەوەی ئەو گفتوگۆیانە بە وێنە و دەنگ تۆمار کراون؛ هەوڵدەدەین پەیوەندی بە لایەنی پەیوەندیدارەوە بکەین بۆ ئەوەی ئەو تۆمارانە دەست بخەین، لە داهاتوودا بخرێنە سەر کاغەز و لە چوارچێوەی سەرجەم بەرهەمەکانیدا

بڵاو بکرێنەوە. هەروەها لیژنەی تایبەت پەیوەندی بە خوێندکارە بەتواناکانی کۆچکردووەوە دەکات بۆ ئەوەی وتاری بابەتیانە سەبارەت بە شێوازی وانەوتنەوەکانی بنووسن.

لیژنەی تایبەت کە لەم بەڕێزانە پێکهاتووە: پرۆفیسۆر دکتۆر جەبار قادر، پرۆفیسۆر دکتۆر ئازاد عوبێد ساڵح، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر کامەران محەمەد حاجی، لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا بیبلیۆگرافیایەکی سەرەتایی بۆ سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر ئامادە کردووە، ئەوە وێڕای ئامادەکردنی کتێبە دانراو و وەرگێڕانەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بۆ چاپ، کە ئەم بەشەیە وا لێرەدا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران و توێژەران.

خۆشبەختانە ئەندامانی لیژنەکە دەستیان گەیشت بە بەشێکی گرنگ لە نووسین و بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کە لە کتێبخانە تایبەتییەکەی خۆیدا پارێزراون. ئەوەی لەوێدا کەوتە بەرچاویان وێنەیان گرتن و هەندێ کاریان لەسەر کراوە. هاوڕێ و دۆستانیش لە دەرەوەی لیژنەکە لە هەبوونی کۆمەڵێ وتار و توێژینەوە و کتێب کە پەیوەندییان بە کۆچکردووەوە هەیە ئاگاداریان کردینەوە. بەشێکیش لەو توێژینەوە، وەرگێڕان، لێدوان یان ئەو نووسینانەی خوێندکارەکانی و مامۆستاکانیان و هەڤاڵانی کۆچکردوو لەبارەی ژیانی تایبەتی و زانستی ئەوەوە نووسیوویانە دۆسیی تایبەتییان بۆ ڕێکخراون. لیژنە ژمارەیەک وتار و توێژینەوەی مامۆستای کۆچکردوویان تایپ کردووەتەوە و بە وردی پێیانداچوونەوەتەوە و هەڵەچنیان بۆ کردوون.

لیژنەکە دوابەدوای بڵاوکردنەوەی سەرجەمی کتێبەکانی بە کوردی و عەرەبی، کە ئەم بەشەی پرۆژەکە پێکدێنن، کۆشش بۆ تەواوکردنی بەشەکانی دیکەی ئەم پرۆژە زانستی و ڕووناکبیرییە گەورەیە دەکات؛ ئەم کارە بۆ خزمەتی ڕاستی و مێژووە و بەرز ڕاگرتنی بەخششی ئەم مرۆڤە مێژووزان و پەروەردەکارە مەزنەی نەتەوەی کورد کە بەدەگمەن هاوشێوە و هاوتای دووبارە دەبێتەوە. لێرەوە لیژنەی سەرپەرشتیار داوا لە توێژەران

و ئەو خوێنەرانە دەكات كە بایەخ بە بەرهەم و داهێنانەكانی ئەم پیاوە مەزنە دەدەن دەستی یارمەتی بۆ لیژنەكە درێژ بكەن و هەر گۆڤار و رۆژنامەیەكیان لە لا پەیدا دەبێ كە لێكۆڵینەوە، وتار یان دیدار و چاوپێكەوتنی رۆژنامەوانی بڵاوكراوەی كۆچكردوویان لە لایە، بیخەنە بەردەستی لیژنەكە. بێگۆمان هاوكاری و یارمەتی هەمووان لەم بارەیەوە دەبێتە بنەما و بناغە بۆ دامەزراندنی كتێبخانەیەكی مێژوویی و مۆزەخانەیەكی تایبەت بە كۆچكردوو كە دەكرێ هەرچی پەیوەندی بەوەوە هەبێت تێیدا كۆبكرێتەوە و بپارێزرێت. دابەشكردنی كتێب و بەرهەمەكانی كۆچكردووی گەورە لە رووی بابەت و ژمارەی لاپەڕەكانەوە بەسەر بەرگەكانی ئەم چاپەدا كێشەیەكی هەندێ ئاڵۆز بوو لە بەردەم لیژنەكەدا، لەم بارەیەوە گفتوگۆی زۆر كرا تا ئەوەی لە كۆتاییدا لەسەر ئەم شێوە دابەشكردنەی خوارەوە گیرساینەوە:

**بەرگی یەكەم:** "كوردستان لە ساڵەكانی شەڕی یەكەمی جیهاندا"، "مێژوو- كورتە باسێكی زانستی مێژوو و كورد و مێژوو"، "خەباتی ڕزگاریخوازی كورد و ئازەر لە ئێراندا".

**بەرگی دووەم:** "تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی كوردیدا"، "چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد – بەرگی یەكەم".

**بەرگی سێیەم:** "چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد – بەرگی دووەم".

**بەرگی چوارەم:** وەرگێرانی كوردیی كتێبی: "وردبونەوەیەكی مێژوویی دەربارەی مەكیاڤیللی و مەكیاڤیللیزم"، "ڕێنیسانس لەگەڵ باسێكی تر بە ناونیشانی ئەدیب و ئەركەكانی قۆناغ"، "ئافرەت لە مێژوودا- كورتە باسێكی مێژوویی و كۆمەڵایەتی"، "چینی كرێكارانی عێراق - دروست بوون و سەرەتای بزووتنەوەی".

**بەرگی پێنجەم:** "كورد و كوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەكانی حكوومەتی بەریتانیادا – بەرگی یەكەم".

**بەرگی شەشەم:** "كورد و كوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەكانی حكوومەتی بەریتانیادا – بەرگی دووەم".

**بەرگی حەوتەم:** وەرگێڕانی عەرەبیی کتێبی: "كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى" و کتێبی "كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير- دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق".

**بەرگی هەشتەم:** "دراسات في تاريخ إيران الحديث والمعاصر"، "أضواء على قضايا دولية في الشرق الأوسط"، "النهضة".

**بەرگی نۆیەم:** "صفحات من تاريخ العراق المعاصر- دراسات تحليلية"، "الطبقة العاملة العراقية- التكون وبدايات التحرك"، "ثورة العشرين في الإستشراق السوفيتي"، "رأي للمناقشة: الإطار الزمني لتأريخ العراق الحديث والمعاصر".

**بەرگی دەیەم:** "دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية"، "إنتفاضة عام ١٩٢٥ الكردية في تركيا - دراسة تحليلية"، "حول مسألة الإقطاع بين الكرد"، "ميكافيلي والميكافيلية"، "محاضرات في تاريخ الدول الكبرى بين الحربين العالميتين". وەک لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، شەش بەرگی یەکەمی بە زمانی کوردین و چوار بەرگی دواییش بە زمانی عەرەبیین.

لە کۆتاییدا لیژنەکەمان سوپاسی هەموو ئەو ناوەند و بەڕێزانە دەکات کە ئامادەییان دەربڕی پشتگیری مادی یا مەعنەوی لە پڕۆژەکە بکەن، دیارە بە ژمارە زۆرن، لە پێشەوەشیان سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولفەتاح بۆتانی، کە ژوورێکی تایبەتی بۆ ئەم لیژنەیە لە ئەکادیمیا تەرخان کرد. هەروەها سوپاسی دۆستی هێژا پرۆفیسۆر دکتۆر عیماد جەواهیری دەکەین کە تێبینی و سەرنجەکانی ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لە زیادکردنی تەوەرێکی نوێ بۆ بەشی شەشەمی پڕۆژەکە. هەروەها سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەین کە ئەرکیان کێشا و لیژنەکەیان لە وتار و لێکۆڵینەوەکانی کۆچکردوو ئاگادار کردەوە. هەروەها لیژنەکە سوپاسی مامۆستا جەلال زەنگابادی دەکات کە دڵسۆزانە بۆ سەرخستنی پڕۆژەکە بە باشترین شێوە کار دەکات.

**لیژنەی تایبەت بە کۆکردنەوە و**

**بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر**

د. کەمال مەزهەر

چەند لاپەڕەیەك لە

# مێژووی گەلی کورد

بەرگی دووەم
2001

ئامادەکردن
عەبدوڵڵا زەنگەنە



د. کەمال مەزهەر

# چەند لاپەڕەیەک لە
# مێژووی گەلی کورد

بەرگی دووەم

بەرهەڤکرنا

**عەبدوڵلا زەنگەنە**

هەولێر - یەکەم چاپ
2001



**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**کوردستان ت. «٢٢٢٩٩٩٢»**

e.mail:mukriani@yahoo.com

- کتێبی ژمارە: «٤٦»
- کتێب: چەندر لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد
- نووسینی: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد
- ئامادەکردن: عەبدوڵڵا زەنگەنە
- هونەرکاری بەرگ و ناوەوە: قاسم قادر
- چاپی یەکەم: هەولێر - ٢٠٠١
- ژمارەی سپاردن « ١٧٩»ی ساڵی ٢٠٠١دراوەتی.
- چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر

# پێڕست

| ناوەڕۆک | لاپەڕە |
| --- | --- |

## پاشکۆکان



**بەشی دووەم**

**قۆناغێکی نوێ لە خەباتی دەستەی ڕووناکبیری کورد**

**«دەربارەی کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردییەکان»**

## بەشی سێیەم

## لە لاپەڕە ونەکانی مێژووی کوردو عیراق

## بەشی چوارەم

## چەند لاپەڕەیەکی ون لە مێژووی ئەدەبی کوردی



## بەشی پێنجەم

## وتاری هەمەجۆر

# گوتەیەکی پێویست

ماوەیەک بوو نووسینەوەی مێژووی کاری رۆژنامەنووسیی کوردی لاپەڕەی رۆژنامە و گۆڤارەکانی چەند ساڵێک لەمەوبەری پێ هەڵدەدامەوە، زۆر باس و لێکۆڵینەوەی مێژوویی، لە نێوانیاندا بابەتەکانی د.کەمال سەرنجیان رادەکێشام، لەبەر ئەوەی هەستم دەکرد ژمارەیەکی زۆر لە لێکۆڵەرو قوتابیانمان لە دۆزینەوەی ئەو وتارو باسە مێژووییانە زۆر ماندوو دەبن، کاتێ «دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی»ش ئامادە بوونی خۆی پیشاندا کە هەندێ لەم وتارو باسانە لە دوو توێی کتێبێکدا وەک بەرگی دووەمی کتێبی «چەند لاپەڕەیەک لەمێژووی گەلی کورد» چاپ و بڵاو بکاتەوە، کەوتمە کۆکردنەوەو ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەکان بۆ چاپ، تا ئەو کتێبەی لێ پەیدا بوو کە لێرەدا دەیخوێننەوە.

هیوادارم بەم کارەم خزمەتێکی بچووکی هەموو لایەکم کردبێت، داوای لێبووردنیش لە مامۆستای بەڕیزم د. کەمال دەکەم، کە لەبەر بارودۆخێکی تایبەتی نەمتوانیوە پرسی پێ بکەم.

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد لەوە ناسراوترە کە لێرەدا وەسفی بکەین. بەڵام هەر چۆنێک بێت ئەو «مێژوو»ی لەسەر تاقیچەکەی کتێبخانەکان و لە بەردەستی توێژی هەڵبژاردەوە خستۆتە بەردەستی هەموو لایەک و لای کوردیش بەتێکڕایی مێژووی خۆشەویست کردووە، بۆیە هەرچییەکی بۆ بکرێت کەمە.

ئومێدەوارم بەم کارەم دڵی مامۆستام خۆشکردبێ و داوای تەمەن درێژی بۆ دەکەم و خوازیارم پتر بەرهەمی بۆ گەلی کوردو مرۆڤایەتی بەرهەم بهێنێ لە دواییدا هەمووولایەک هەر سەرفرازو سەرکەوتوو بن.

عەبدوللا زەنگەنە
٢٠٠١/٢/٥

# كورد و
# شەڕی شوعەیبە

ماوەیەک لەمەوبەر لە بەڵگەنامەیەكی نهێنیی ئینگلیزەكاندا راستییەكی بایەخدارم دەربارەی دەوری كورد لە شەڕی شوعەیبەدا بەرچاوكەوت كە شایانی لێدوان و لێكدانەوەیە.

بەرلەوەی دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕی یەكەمی جیهاندا بداتە پاڵ ئەڵەمانیاو لایەنگرانی دژی وڵاتە هاوپەیمانەكان بە ماوەیەک ئینگلیزەكان خۆیان بۆ داگیركردنی عیراق ئامادە كردبوو، **كە سێ صەد ساڵ دەبوو چاویان بڕیبووە سامان و شوێنی هەڵكەوتووی لە ناوەندی رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاستدا**[1]، بۆیەكا تەنها تاكە رۆژێک بەسەر بەرپابوونی شەڕ لە نێوان بەریتانیای گەورەو دەوڵەتی عوسمانیدا تێپەری كاتێک هێزە چەكدارەكانی ئینگلیز لە باشوورەوە پەلاماری خاكی عیراقیان داو هەر ئەو رۆژە، كە دەیكردە شەشی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٤[2]، توانییان فاوی تاكە بەندەری ئەوسای عیراق داگیر بكەن. لەو رۆژەوە تا ئاگربەسی مودرۆس لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨دا خاكی عیراق بووە یەكێک لە شەرگە سەرەكییەكانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست كە بایەخی بۆ دیاركردنی چارەنووسی شەڕی یەكەمی جیهان كەم نەبوو. دوای داگیركردنی فاو بە شازدە رۆژ هێزەكانی

---

(*) لە ژمارە (١٢٥)ی گۆڤاری «**رۆشنبیری نوێ**»ی وەرزی بەهاری ١٩٩٠ لە لاپەڕە (٣٦-٤٠)دا بڵاوكراوەتەوە.

(١) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە:
Zaki Saleh, Mesopotamia. Iraq 1600-1914, Baghdad, 1957.

(٢) رۆژی پێنجی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٤ بەریتانیای گەورە بانگی شەڕی دژی دەوڵەتی عوسمانی دا.

بەریتانیای گەورە شاری بەصرەی بایەخداریشیان بە ئاسانی داگیرکرد.

دامو دەزگای عوسمانی چونکە دەمێ ساڵ بوو جەورو ستەم و چەوساندنەوەی ناڕەوا ببووە پیشەی رۆژانەی وا دارزا بوو نەتوانێ خۆی لەبەر لێشاوی هێرشی وڵاتێکی پێشکەوتووی وەک بەریتانیای گەورەدا ڕابگرێ. لەبەر ئەوە فەرمانڕەوایانی دەروازەی باڵا، یا وەک دەڵێن بابی عالی و پاشا قاپوسی[٣]، دەبوو پەنا بەرنە بەر هەر ڕێگەیەک بۆی هەبێ یاریدەی بەربەست کردنی ئەو لێشاوە بدات. بۆ ئەم کارە بزواندنی هەستی ئایینی شتێکی لەبار بوو. بۆیەکا ئیتیحادییەکان کە لە ساڵی ١٩٠٨وە دەسەڵاتی وڵاتی عوسمانییان گرتبووە دەستو تا ڕادەیەکی زۆر لە دین لایان دابوو، لەپڕ بوونەوە موسڵمان و بانگی جیهادیان دا، ئاخوندو مەلایانی وڵات بە دەیان فەتوایان بۆ **«شەڕی کافران»** دەرکرد.

سەرەتای شەڕ بە هەزاران عیراقی بە دەم ئەم بانگەوازەوە چوون، تایبەت دوای ئەوەی پیاوە ئایینییە گەورەکانی شارانی وەک بەغداو کەربەلاو نەجەف بە پەرۆشەوە داوایان لە خەڵکی کرد پەنا بەرنە بەر چەک نەبا خاکی وڵاتیان بە هاتنی ئینگلیزی **«کافر»** گلاو بێت!

ئەمجارەیش کوردی ساکاری دڵپاک کەوتەوە داوی دەروازەی باڵاوەو گەلێکیان بە نانەسکی و چەک و تفاقی خۆیانەوە بەرەو باشووری عیراق بۆ شەڕی ئینگلیز ملیان نا. تا ئێستە نە ژمارەی ئەو کوردانە، نە ژمارەی سەرجەمی ئەو عیراقییانەی بە دەم ئەو بانگەوازەوە چوون بە تەواوی ساغ نەکراونەتەوە. کەمترین ژمارە بەپێی ئەو سەرچاوانەی بەدەستەوەن دە هەزارو زۆرترینیش بیست هەزار عیراقییە.

---

(٣) نەسڵەکەی **«پاشا قاپی سی - قاپوسی»**یە کە **«بابی عالی»** شیان پێ دەگوت، دیارە ئەمیان لە **«الباب العالی»**ی عەرەبییەوە هاتووە. لە زمانە ئەورپاییەکاندا(پۆرتە)ی پێ دەڵێن کە بە ئیتالیایی (Porta)و بە فەرەنسەیی(Porte)یەو بە مانای دەرگا دێت. عوسمانییەکان بە جێکاری(مقر عمل) صەدری ئەعزەم، یا سەرەک وەزیرانیان دەگوت پاشا قاپوسی کە مێژونووسان جاروبار بە هەڵە لە بریتی ناوی دەوڵەتی عوسمانی بەکاری دێنن، ئەو هەڵەیەی بۆتە راست و لە مێژوونووسیدا بەو جۆرە جێگەی خۆی کردۆتەوە. پێم وایە بە کوردی دەتوانین بڵێین **«دەروازەی باڵا»** یا **«دەروازەی پاشا»**.

هەرچۆن بێ ژمارەیان بەپێی سەرچاوەی باوەڕ پێکراو لە ژمارەی سەربازی تورک زیاتر بوو[٤].

هەمان جیاوازی لە ژمارەی ئەو کوردانەی بە دەنگ بانگەوازی دەروازەی بالاوە چوون هەیە. بەپێی مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە بەرگی یەکەمی **«یادداشت»**دا پتر لە هەزار سوارەی کورد بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود بە چەکی خۆیانەوە بۆ شەڕی ئینگلیز لە کوردستانەوە چوونەتە باشوور[٥]. هەرچی شوکری مەحمود ندیمە، کە ئەفسەرێکی شارەزایەو کتێبێکی لەسەر شوێنی عیراق لە شەڕی یەکەمی جیهاندا داناوە، دەڵێ تا کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٥ دوازدە هەزار چەکداری عەرەب و **«دوو هەزاری کورد و تورکمان»** دەواریان لە دەوروبەری شاری ناصرییە هەڵدا[٦]. لای مێژوونووسی بەناوبانگ عەبدولڕەزاق حەسەنی ئەو کوردانە هەزارو پێنج صەد کەسن[٧]، ئەو ژمارەیەی تێکەڵ بە نووسینی گەلێک مێژوونووسی تر بووە[٨].

تێکەڵ و پێکەڵی ئەم ژمارانە لە کەمتەرخەمی و بەرەڵڵایی کاربەدەستانی عوسمانییەوە هاتووە، هەرچی کاربەدەستانی ئینگلیزە تەواو بە پێچەوانەی ئەوانەوە هەموو شتێکیان بە حساب و تۆمارو ڕاپۆرت بوو. هەڵبەت ئەوان بایەخی زۆریان دابووە خۆ ئامادەکردنی بەرفراوانی عوسمانی بۆ شەڕی داهاتووی دوای کەوتنی شاری بەصرە، دەروازەی بالا دەیویست هەرچۆنی بێ لەشکری ئینگلیز لە ناوچە داگیرکراوەکانی باشووری عیراق دەرپەڕێنێ، چونکە باش لەوە گەیشتبوو کە داگیرکردنی هەموو عیراق بڕوای موسڵمانانی جیهان بە تواناو دەسەڵاتی

(4) A. T. Wilson, Loyalities Mesoptamia, 1914-1917 A Personal and Histori-cal record, London, 1930, pp. 33-34.

(٥) ڕەفیق حیلمی، یادداشت، چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٦، ل ٤٩-٥٠.

(٦) العميد الركن شكري محمود نديم، حرب العراق ١٩١٤-١٩١٨. دراسة علمية، الطبعة الثامنة، بغداد، ١٩٧٤، ص ٢٩-٣٠.

(٧) عبدالرزاق الحسني، العراق في دوري الاحتلال و الانتداب، لجزء الآول، صيدا، ١٩٣٥، ص١٦-١٧.

(٨) بە وێنە بڕوانە:

الدكتور عبدالله الفياض، الثورة العراقية الكبرى سنة ١٩٢٠، الطبعة الثانية، بغداد، ١٩٧٥، ص١٥٣.

عوسمانییان دەلەقێنێ، وێڕای ئەوەی داگیرکردنێکی وا مانای گەیشتنی دوژمنی بۆ سەر سنووری خودی تورکیا دەگەیاند.

لەبەر ئەوانەی باسمان کردن بەڵگەنامەکانی ئینگلیز بۆ لێکدانەوەی ئەم جۆرە باسانە لە گەلێک ڕووەوە لە سەرچاوەی تر زیاتر جێگەی بڕوان. جا لە یەکێک لە بەڵگەنامە تایبەتییەکانی وەزارەتی جەنگی بەریتانیادا کە سەرەتای بیستەکان نووسراوە ژمارەی ئەو کوردانەی لە شەڕی شوعەیبەدا بەشدارییان کردووە سێ هەزار کەسە، واتا دوو تا سێ هێندی ئەو ژمارانەی تا ئێستە وتراون[9]، ئەمەش خۆی لە خۆیدا، لەبەر گەلێک هۆ، بایەخی مێژوویی زۆرە. **شەڕی شوعەیبە یەکەم بەرەنگاربوونەوەی کوردە دژی ئینگلیزی داگیرکەر.** هەروەها سیمای یەکەم خەباتی هاوبەشی کوردو عەرەبی تێدا بەدی دەکرێ دژی دوژمنی تازەیان.

هاتنی ئەو سێ هەزار کوردە بە جل و بەرگی نەتەوەیی و خەنجەرو بڕنەوی خۆیانەوە لەڕێگەی بەغداوە بۆ ناصرییە سەرنجی هەموانی ڕاکێشاوە، وا دیارە بە هەر شوێنێکدا تێپەڕیبن بە گەرمی پێشوازی کراون[10]. گەورەترین بەڵگەی زیندووی ئەم بۆچوونە هۆسەیەکی باوی ئەو ڕۆژگارەی عەرەبانە کە بە دوو جۆر گوتوویانە: **«دوو بەشی بە هەشت بۆ هادی خۆمان و بەشێکیشی بۆ کاک ئەحمەدو نەوەی» (ثلثين الجنة لهادينا وثلثها لكاك أحمد وأولاده)**، یا **«دوو بەشی بە هەشت بۆ هادی خۆمان و بەشێکیشی بۆ شێخ مەحمودو کوردانی»**[11] **(ثلثين الجنة لهادينا وثلثها للشيخ محمود واكراده).**

دیارە مەبەست لە کاک ئەحمەد کاک ئەحمەدی شێخی کوڕی شێخ مارفی نۆدێی باپیرە گەورەی شێخ مەحمودە. بەڵام مەبەست لە هادی**(سەید هادی مکوطر)**ە کە یەکێک لە گەورە پیاوانی شامییە بوو. ئەم پیاوە پارەدارێکی دەوڵەمەندو دەست و دڵفراوانێکی سەیر بووە، پارەیەکی یەکجار زۆری بۆ شەڕکەرانی شوعەیبەو دوایی بۆ بەشدارانی شۆڕشی بیست خەرج کردووە، لەبەر ئەوە خەڵکی ساکار وەک باوکی

---

(9) War Office, 32/5806/2205, "The Pitential Enemies in Mesopotamia", No. 162/428, Dated April 15, 1920.

(١٠) بڕوانە: **«العراق»**(جريدة)، بغداد، ٢٩ حزيران ١٩٧٨.

(١١) دیارە مەبەستی پیاوەکانییە کە هەموویان کورد بوون.



وێنەی حاجی کاک ئەحمەدی شێخ و حاجی ئەحمەد بەگی بانەیی، کە گەڕیدەیەکی ئینگلیز گرتوویەتی؛ یەکەم جارە لە کوردستان بڵاودەکرێتەوە، دیاری کۆمەڵەی کەلەپوورو فۆلکلۆری کورد لە سلێمانییە

هەژارو نەدار سەیریان کردووەو زۆریان خۆش ویستووە بۆیەکا لە قوڵایی دڵەوە لە لایەن خۆیانەوە دوو بەشی بەهەشتیان بۆ قۆرغ کردووە. هەر لەبەر ئەوەش ئینگلیزەکان رقیان لێی بووە، دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشی بیست گرتویانەو بە دەسبەسەری ڕەوانەی هندستانیان کردووە، دوایی لەگەڵ فەیسەڵی یەکەمدا بۆ ساڵی داهاتوو گەڕاوەتەوە عیراق[١٢].

شێخ مەحمود بەناوبانگترین سەرداری کورد بوو کە لە شەڕی شوعەیبەدا

(١٢) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی ڕۆژی نۆزدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٠.

بەشداری کرد، هەرچەندە خوا هەڵناگرێ عوسمانییەکان بەر لەوە کەمیان بە خۆی و کەسوکاری نەکردبوو، بۆیەکا لێیان دڵ بریندارو ناحەزیان بوو[١٣]. **رەفعەتی ئیسماعیل بەگی داودەو نامیقی عەلی ئاغای ئامۆزای و سەید ئەحمەدی خانەقاش لەو ناودارانەی کوردی کەرکوکن کە بە خۆیان و پیاوەکانیانەوە دژی ئینگلیز چوونە غەزاو لە شەڕی شوعەیبەدا بەشدارییان کرد.**

بەشی هەرە زۆری ئەو سێ هەزار کوردەی چوونە شەڕی ئینگلیز بریتی بوون لە لایەنگرانی شێخ مەحمودو کوڕگەلی داودەو دەلۆو زەنگەنە و هەمەوەندو جافی دەوروبەری کەلار.

شەڕی شوعەیبە بۆ هەردوولا، چ ئینگلیزو چ عوسمانی، بایەخی زۆر بوو. گوندی شوعەیبە کە کەوتۆتە باکووری رۆژئاوای شاری بەصرەوە لەرووی ستراتیژییەوە زۆر گرنگە، ئەوسا هەموو رێگە سەرەکییەکانی بۆ بەصرە دەچوون بەوێدا تێدەپەڕین، بۆیەکا ئینگلیزەکان دوای داگیرکردنی بەصرە یەکسەر کردیانە سەربازگەو دواییش یەکێک لە بنکە جەنگییە بایەخدارەکانیان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. سەرکردەی لەشکری عوسمانی لەو باوەڕەدا بوو بۆ ئەوەی باشووری عیراق لە ئینگلیز پاک بکاتەوە بەر لە هەر شتێکی تر پێویستە دوژمن لە شوعەیبە دەربەڕێنێ.

هێرشی لەشکری عوسمانی و چەکدارانی کوردو عەرەب بۆ سەر سەربازگەی شوعەیبە بەرەبەیانی دوازدەی نیسانی ساڵی ١٩١٥ لە سێ لاوە دەستی پێ کرد. تۆپی ئینگلیز لەو شەڕەدا هێند زاڵ بوو مەودای ئەوەی نەدا هێرشهێنەران بتوانن زۆر لە سەربازگەی شوعەیبە نزیک بکەونەوە، هەرچەندە سەرەتا توانییان بگەنە چەند تەپۆڵکەیەکی دەوروبەری کە بۆ رۆژی داهاتوو ئینگلیزەکان دیسان گرتیاننەوە. بەرەبەیانی چواردەی نیسان دژە هێرشی گەورەی لەشکری ئینگلیز دەستی پێ کردو دوای شەڕێکی قورسی چەند سەعاتی لەشکری تورک و چەکدارانی کوردو عەرەب خراپ شکان و بە ناچاری کشانەوە بێشەلانی بورجییە کە کەوتۆتە رۆژئاوای

---

(١٣) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە:
M.S. Lazarev, Kurdistan i Kurdskaya Problema"90-egodi XIX veka- 1917", Moscow, 1969, pp. 143, 211, 212, 216-217, 230, 302, 348, 355-357, 368, 371.

شوعەیبەوە. سلێمان عەسکەریی فەرمانەدەی ئەو هێزانە، کە پیاوێکی ئازاو لێهاتوو بوو[١٤]، لە تاوا خۆی کوشت.

زیانی ئینگلیز لە شوعەیبەدا یەک بە یەک بە دروستی زانراوە، ئەوان هەزارو دووصەدو پەنجاو حەوت کوژراو و بریندارپان هەبوو[١٥]. بەڵام زیانی لەشکری تورک و چەکدارانی کوردو عەرەب تاوەکو ئێستە بە تەواوەتی نەزانراوەو وا دیارە هەرگیز ناشزانرێ. سەرچاوە هەیە ئەو زیانە دەگەیێنیتە شەش هەزار کوژراو و بریندار[١٦]. بەپێی سەرچاوە ئینگلیزییە ئاگادارەکان زیانی بەرەی عوسمانی بە کوردو عەرەبەوە دوو هێندی زیانی خۆیان بووە، کە دەکات دەورویەری دوو هەزارو پێنج صەد کوژراوو بریندار[١٧]. وا پێدەچێ ئەم ژمارەیە لە راستییەوە نزیکتر بێ، چونکە ئەو ناوچانەی لاشەی کوژراوەکانیان تێدا کەوتبوو کەوتنەوە دەست ئینگلیز.

**هەرچی ژمارەی کوژراوو برینداری عەرەب و کوردە لە شەڕی شوعەیبەدا ئەوە نە زانراوەو نە دەزانرێ.** ئارنۆلد ویلسنی لێپرسراوی سیاسیی لەشکری ئینگلیز بە نیمچە گاڵتە پێ کردنێکەوە باسی بەشداری کردنی چەکدارانی عەرەب و کوردی لەو شەڕەدا کردووە[١٨]، هەرچەندە ئەگەر جەنابی بیری لە ناوەرۆکی ئەو بەشداری کردنە بکردایەوە هەڵبەت وا بە سووکی هەڵی نەئەسەنگاند.

نووسەری تر هەیە ئەو بەشداری کردنەی بەرز نرخاندووە[١٩]. شوکری مەحمود نەدیم، کە وەک وتمان ئەفسەرێکی شارەزایە، بەتایبەتی باسی دەوری چەکدارانی

---

(١٤) سلێمان عەسکەریی زۆر بڕوای بە پێویستیی یاریدەی چەکدارانی کوردو عەرەب بوو. بەر لە شەڕی شوعەیبە بریندار کرابوو، لە کاتی شەڕی شوعەیبەدا بە برینداری سەرکردایەتی هێزەکانی دەکرد.

(15) ) A.T.Wilson, Op. Cit., P.35.

(١٦) العميد الركن شكري محمود نديم، المصدر السابق، ص٢٩.

(17) A.T.Wilson, Op. Cit., P. 35fi

(18) Ibid, PP. 22-23.

(١٩) بە وێنە بڕوانە:

**الدكتور عبدالله الفياض، المصدر السابق، ص١٤٩-١٥٣، العميد الركن شكري محمود نديم، المصدر السابق، ص٢٨-٣٠، ٣٣.**

کوردو عەرەبی لە شەڕی ڕۆژی سیازدەی نیساندا کردووەو وەک دەڵێ ئەو ڕۆژە ژمارەیەکی زۆر لە سوارەی عەرەب و کورد بوونە قوچی قوربانیی گوللە تۆپەکانی دوژمن. بەپێی بۆچوونی ئەو ژمارەی کوژراوو برینداری کوردو عەرەب لە شەڕی شوعەیبەدا بەسەریەکەوە خۆی داوە لە نزیکەی سێ هەزار کەس کە، وەک دەڵێ، چواریەکی هەموو بەشدارانی کوردو عەرەبە لەو شەڕەدا، ئەوەش بەپێی هەموو پێودانێک نیسبەتێکی زۆر بەرزە[٢٠]. من بەش بە حاڵی خۆم وای بۆ دەچم ئەم ژمارەیە زۆر بێ، هەرچەندە دانەری ئەو کتێبە لەبەر ئەوەی زمانی تورکی دەزانێ توانیوییە سەرچاوەی عوسمانیش بەکاربهێنێ.

لەشەڕی شوعەیبەدا لە گەورە پیاوانی کورد نامیقی عەلی ئاغای داوەده[٢١] شەهید بووە. شایانی باسە بنەماڵەی ئەم پیاوە بە درێژایی بیستەکان ناحەزی ئینگلیز و لایەنگرو پشتیوانی شێخ مەحمود بوون[٢٢]، هەروەها بەپێی گێڕانەوەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی **«ڕەشید پاشای خەڵکی سلێمانیی کۆنە موتەسەریفی مونتەفیک و چەند پیاوێکی ناوداری تری کورد لە شەڕی شوعەیبەدا کوژراون»**[٢٣].

وەک گوتمان ناوەڕۆکی مێژوویی بەشداری کردنی چەکدارانی کوردو عەرەب لە شەڕی شوعەیبەدا گەورەیە. ڕاستە هەستی ئایینی دەوری گەورەی بینی بۆ پاڵ پێوەنانی ئەو هەزاران کەسە بۆ شەڕی ئینگلیز، بەڵام هەستی نیشتمانپەروەریش دەوری خۆی لەو کارەدا بینی، چونکە بەلای ئەوانەوە ئینگلیز هەر کافر و غەیرە دین نەبوون، بەڵکو هەمان کات داگیرکەری بیانیش بوون. پێویستە ئەوەیش لە یاد نەکەین کە لەو ڕۆژگارەدا تێکەڵییەکی زۆر لە نێوان هەستی ئایینی و نیشتمانیدا هەبوو، بۆیەکا جیاکردنەوەو دابڕینیان لە یەکدی کارێکی ڕەوا نییە.

ئەو هەستە بزوێنەرە وای کرد سەردارانی عەرەب و کورد خەرجی زۆری ئەو

---

(٢٠) العميد الركن شكري محمود نديم، المصدر السابق، ص٣٣.

(٢١) شوکری مەحمود نەدیم بە هەڵە بە هەمەوەندیی لە قەڵەم داوە.

(٢٢) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە لاپەڕە سەدو سی و سەدو چل و هەشتی ئەو کتێبەمان کە ساڵی ١٩٧٨ لە بەغدا بە ناوی **«دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية»**ەوە بڵاومان کردۆتەوە.

(٢٣) ڕەفیق حیلمی، یادداشت، بەرگی یەکەم، ل٥٠.



شێخ مەحمودو مستەفا ئاغای عەبدوڵلا ئاغاو رەفعەت بەگی ئیسماعیل بەگی داودە

هەزاران کەسە بگرنە ئەستۆی خۆیان. هی وایان بووە بە قەرزو قۆڵە ئەو کارەی راگەیاندووە، چونکە وای دەزانی بەو جۆرە فەرمانی ئایین و نیشتمان بەجێ دێنێ[٢٤].

ئینجا لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا کاربەدەستانی عوسمانی بە دەستوورو پیشەی هەموو شۆڤێنییەکی رِق ئەستووری بێ وەفاو نالەبار رەفتاری ئەو هەزاران کوردو

(٢٤) دوکتۆر عەبدوڵلا فەییاز لەم بارەیەوە بەتایبەتی باسی محەمەد سەعید حەبوبی دەکات و دەڵێ مولکی خۆی خستە رەهنەوە تا بتوانێ ئەرکی خەرجی چەکدارەکانی بگرێتە ئەستۆ (بروانە لاپەرە١٥٢-١٥٣ی کتێبەکەی).

عـەرەبە لە خـۆبوردووانەیان کـردووە، ئەوە وای لە گـەلێکیـان کـردووە هەر زوو بگەڕێنەوە هەوارگەی خۆیان. بەپێی گێڕانەوەی نووسەرێکی ئاگادار ئەفسـەرێکی گەورەی عـوسمـانی بە ناوی ئەحمەد بەگی ئەوراقەوە زۆر بێ شەرمانە باسی ئەوەی کردووە چۆن لەشکری عوسمانی دوای **«دەرپەڕاندنی ئینگلیز لە شوعەیبەو بەصرە»** پێویستە بکەوێتە گیانی **«خۆفرۆشانی عیراق»** کە بە خایەنی لەقەڵەم داون[٢٥].

هەرچۆن بێ شەڕی شوعەیبە لاپەڕەیەکی بایەخداری مێژووی هاوچەرخی عیـراقە کە کـورد دەوری دیاری تێدا بینیـوە. دەشبێ لەمـەودوا ژمـارەی ئەو کـوردانەی لەو شەڕەدا بەشدارییان کردووە بەسێ هەزار کەس دابنرێن نەک کەمتر.

**«دوژمنە چاوەڕوانکراوەکانی وڵاتی دوو ئاوان - مـیـسـۆپۆتامـیـا»** ناونیـشـانی سـەیری ئەو بەڵگەنامـە ئینگلیـزییـەیە کـە ئەم ڕاسـتـیـیـە مـێژووییـە بایەخدارەی بۆ پاراستووین. دەربارەی کورد ئەو بەڵگەنامەیە نووسیوییە دەڵێ: **«ئەوان لەبەر ئەوەی شـەڕکـەری چاک و گـورج و گـۆڵن دوژمنێکی خـەتەر، یا ترسناکن»**[٢٦]، وەک بەڵگەش باسی بەشـداری کـردنی ئەو سێ هەزار چەکـدارە کـوردەی لە شـەڕی شوعەیبەدا کردووە. **ئینگلیز لە ڕاپۆرتە نهێنییە تایبەتییەکانی خۆیاندا بەو جۆرە باسی کوردیان دەکرد، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گەلێک نووسەری بێ ویژدان هەن کە بە زۆری زۆردارەکی کوردیان کردۆتە داردەستی ئینگلیز.**

---

(٢٥) فريق المزهر ال فرعون، الحقائق الناصعة في الثورة العراقية سنة ١٩٢٠، الجزء الأول، بغداد، ١٩٥٢، ص٣٩-٤٠.

(26) W.O., 32/5806/2205, (The Potential Enemies in Mesopotamia), No. 162/ 428, Dated April 15, 1920.

بابەتی دووەم*

# لە نێوان شێخ مەحمودو ئەمیری کوێتدا

ئەوانەی بە راستی گەورەو پیاون گەورەیی و پیاوەتی لە هەموو رەفتارێکیان دەتکێ. شێخ مەحمود یەکێکە لەو گەورە پیاوانەی کورد کە لە دژوارترین هەڵوەستی ژیاندا بە سەربەرزی هاتۆتە دەست. بەڵگەی ئیمڕۆمان پوختەی گێڕانەوەیەکی پڕ مانای مێژوونووسێکی سیاسیی عەرەبە.

نەوەی شێخ خەزعەلی عەرەبستانی بەناوبانگ حسەین خەڵەف لەساڵی ١٩٦٢وە دەستی کردە بڵاوکردنەوەی کتێبی **«مێژووی سیاسیی کوێت»** لە چەند بەرگێکدا کە هەریەکەیانی بۆ رۆژگاری فەرمانڕەوایی یەکێک لە شێخەکانی کوێت تەرخان کردووە... بەپێی هەڵسەنگاندنی شارەزایان ئەم کتێبە یەکێکە لە سەرچاوە عەرەبییە چاکەکانی مێژووی نوێ و هاوچەرخی کوێت.

بەشی یەکەمی بەرگی پێنجەمی کتێبی **«مێژووی سیاسیی کوێت»** کە ساڵی ١٩٧٠ دیسان لە بێروت چاپ کراوە بریتییە لە تۆماری رووداوەکانی رۆژگاری شێخی بەناوبانگی کوێت ئەحمەد جابرلصەباح کە لە رۆژی ٢٣ی شوباتی ساڵی ١٩٢١وە تاوەکو ٢٥ی شوباتی ساڵی ١٩٥٠ میری کوێت بوو[1]. لە رۆژگاری ئەودا کوێت بووە شت، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٦وە سامانی نەوتی زۆری کەوتە بازاڕەوە.

پەنجاو چوار لاپەڕە، واتە نزیکەی یەک دەر پێنجی ئەو بەرگە گرنگەی کتێبەکەی

(*) لە ژمارە (١١٨٠)ی رۆژنامەی **«هاوکاری»**، رۆژی ٢٤ی مایسی ١٩٩٠دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) حسین خلف الشیخ خزعل، تأریخ الکویت السیاسي، الجزء الخامس، القسم الاول المتضمن لعصر الشیخ احمد الجابر الصباح من ١٥ جمادي الثانیة ١٣٣٩ الی ١٠ ربیع الأول ١٣٦٩، ٢٣ شباط ١٩٢١ - ٢٥ شباط ١٩٥٠، بیروت، ١٩٧٠.

تاريخ الكويت السياسي

تأليف

حسين خلف الشيخ خزعل

القسم الاول

من الجزء الخامس

الملتزم بنشره الشيخ احمد [illegible]

حسەین خەڵەف شێخ خەزعەل[٢] بۆ باسی کوردو کوردستان تەرخان کراوە[٣].

هەرچەندە **«هاتنی شێخ مەحمودی بەرزنجی بۆ کوێت»** سەرناوی ئەو بەشەی کتێبەکەیە، بەڵام ناوەرۆکی زۆر لەو باسەی زیاتر گرتۆتەوەو بریتییە لە پوختەی مێژووی کۆن و نوێی کوردو باسی رەگەزیان و کوردستانی نیشتمانیان و سنووری کوردستان و ژمارەی کوردو داب و نەریتیان و مێژوویان بەر لە پەیدابوونی ئیسلام و لەژێر سایەی ئەوداو حوکمەت و میرنشینە کوردییەکانی وەک شەددادی و مەروانی و دۆستەکی و بابان و سۆران و بادینان و جزیرو بۆتان و پێوەندی کورد بە سەلجوقی و عوسمانییانی تورکیاو صەفەوی و ئەفشارو

(٢) بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی **«مێژووی سیاسی کوێت»** بەسەر یەکەوە ٢٨٠ لاپەڕەیە.
(٣) لە لاپەڕە ٦٧وە تا لاپەڕە ١١١.

زەندییانی ئێران وشۆڕشی بەدرخان و کوڕانی بەدرخان و شێخی گەورەی شەمدینان و هۆی کەوتنیان و گەلێک باس وخواسی تری وای ژیانی کوردەواری.

کە ئەو باس و خواسانەی ناو کتێبی **«مێژووی سیاسیی کویت»** دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت دانەری کوردی خۆش دەوێت و هەولی داوە تا رادەیەکی زۆر بێ لایەنانە لە باسەکانی بکۆڵێتەوە، بە وێنە گەلێک بەسەر دلێری و جوامێری کوردا هەڵدەدات و دەڵێ:

**«ژمارەیەک تایبەتی هەن کورد بە درێژایی مێژووی ناوی پێیانەوە دەرکردووە. ئەو تایبەتییانە بەرهەمی زۆرانبازی کوردن لەگەڵ سروشت و لەگەڵ دوژمندا پێکرا.**

**یەکەم دیاردەی لەرووی کورد جەنگاوەری و ئازایەتییە، ژیان وای فێرکردووە جیهان بە لایەوە لانەی پیاوی ئازا نەک جێ ژینی ترسنۆک بێ. کورد رەوشتیان بەرزە، جەوانمەردی و دست بلاوی دروشمی ژیانیانە، لە هەڵس و کەوتا رەفتار جوان و سەر راستن، پەیان پەروەرن، لە پێناوی سەربەرزیدا بێ سڵ خۆیەختکەرن.. بێ ئەندازە رێزی ئافرەت دەگرن»**[٤].

کە دێتە سەر باسی مێژووی کورد **«لە رۆژگاری ئیسلامدا»** حسەین خەڵەف شێخ خەزعەل دەڵێ:

**«کورد دەوریان لە سیاسەتی دەولەتی ئیسلامدا گەورە بوو، زۆر بە گەرمی تێکەڵ بەو هەراو بگرە سیاسییانە بوون کە ئەو دەولەتە دووچاریان هاتووەو هەمیشە لایەنی ئەو دستەو تاقمانەیان گرتووە کە بۆ سەرکەوتنی ئیسلام تێکۆشاون، لەپێناو بلاوبوونەوەی ئیسلامداو بۆ پاراستنی جەنگیون، لە خۆشی و ناخۆشیدا چارەنووسی خۆیان تێکەڵ بە چارەنووسی ئیسلام کردووە»**[٥].

لەگەڵ ئەوەشدا نووسینەکەی حسەین خەڵەف لە کەم و کورتی بێ بەش نییە. هەر بۆ نموونە دەڵێین کاتێک دێتە سەر باسی ژمارەی کورد هەر ئەو ژمارانە دەهێنێتەوە کە بەر لەو بە نیو سەدە گوتراون، بۆیەکا سەرجەمی کورد بە لایەوە لە سەرەتای حەفتاکاندا تەنها چوار ملیۆن و نیون[٦].

(٤) بروانە لاپەڕە شەست و نۆ.
(٥) بروانە لاپەڕە حەفتا.
(٦) بروانە لاپەڕە شەست و هەشت و شەست و نۆ.

مقدم الشيخ محمود البرزنجي

[illegible]

ئەوانەی دانەری «مێژووی کوێتی سیاسی» دەربارەی کورد بە ویژدانەوە نووسیونی بۆ کوێتییەک کەم بیستراوو نوێن، ئەوەی لەو کتێبەدا بۆ ئێمە تازەو گەلێک بایەخدارە دیدەنیی شێخی بەردە قارەمان و میری کوێتە.

حسەین خەڵەف شێخ خەزعەل بایەخێکی زۆری داوەتە باسی شێخ مەحمودو بنەماڵەکەی و بزوتنەوەکانی، لەو بەشەی کتێبەکەیدا رێکوپێک و تێروتەسەل باسی تەکییەی بەرزنجی و کاک ئەحمەدی شێخ و هەڵوەستی شێخ مەحمود بەرانبەر بە تورک و حوکمدارێتی شێخ و راپەرینی دژی ئینگلیزو ئازادکردنی هەڵەبجەو شەڕی تاسڵوجەو دەوروبەری چەمچەماڵ و رانییەو کۆیەو دەربەندی بازیان و شوێنی هەمەوەند لەو شەڕانەداو گرتنی شێخی کردووە[7]. ئینجا بە هەمان دەستوور هاتۆتە سەر باسی دانی شێخ بە دادگەو لەوێدا ئەمە دەگێڕێتەوە.

**«دوای ئەوەی شێخ مەحمود هێنرایە بەغدا درایە دادگەیەکی سەربازی. کاتی موحاکەمەکەی سەرۆکی دادگە کە ئینگلیز بوو قسەی ناشرینی بە شێخ گوت و گاڵتەی پێ کرد، ئەویش لە عاستی خۆیدا راپەڕی و چونکە هیچ چەکێکی پێ نەبوو**

(۷) بروانە لاپەڕە هەشتاو چوار تا لاپەڕە نەوەت و هەشت.

**تا پێی بەریتە گیانی سەرزکی دادگە پەلاماری کڵاوو جەمەدانییەکەی سەری خۆی داو گرتییە سەرو پۆتەڵاکی و بە جنێوو قسەی پیس داباریبە سەری»**[8].

دوای ئەوە دانەر هەشت لاپەڕەی ئەو بەرگـەی کـتـێـبـەکـەی بۆ باسی ئەو بەسەرهاتانەی کوردستان تەرخا کردووە کە دوای دوورخستنەوەی شێخ مەحمود لە کـوردسـتـان قەومـاون[9]، لەوێدا ژمارەیەک بەڵگەی مێژوویی بەنـرخی دەربارەی داخوازییـەکـانی کـوردو گـفـتی زۆری ئینگلیـزو کـاربەدەسـتـان و هەڵوەستی کـورد بەرانبەر هەڵبژاردنی فەیسەڵی یەکەم بۆ تەختی پاشایی عیراق و ئەو جۆرە باسانە هێناوەتەوە کە هەمـوویان وەک پێشەکی وان بۆ ئەو باسە بایەخدارە کـەم زانراوەی مـەبەسـتمانەو لەژێر سەر ناوی **«هاتنی شێخ مەحمود بۆ کوێت»**دا بلاوی کردۆتەوە. ئەمەش دەقی ئەو بەشەی کتێبەکەیە:

شێخ مـەحـمـودو حـەمـە غـەریبی زاوای تا سـاڵی ١٣٤٠ی کـۆچی **(دەورووبەری کـۆتایی سـاڵی ١٩٢١ی**[10] **عـیـسـایی)** بە دەربەدەری لە هندسـتـان مـانەوە. بەڵام دوای ئەو روداوانەی باسمان کردن[11] حوکمەتی بەریتانیا ناچار بوو پەنایان بەرێتە بەرو عـەفـویان بۆ دەربکات و لەگـەڵـیـان رێک بکەوێت کـە بگەڕێنەوە سلێـمـانی تاوەکو ئەو فەراغە پڕبکەنەوە کە بە هۆی ئەو بزوتنەوانەوە دروست بوو بوو.

بۆ جێ بەجێ کـردنی ئەم مـەبەسـتـە حـوکـمـەتی بەریتـانـیـا بڕیاری دا سـەرەتا هەردووکـیـان بێنێـتـە کوێت تاوەکـو رێی گەڕانەوەیان بۆ سلێـمانی بۆ خۆش دەکات. نوێنەری باڵا **(مندوبی سامی)** بەریتـانی لە عـیـراق سیر پێـرسی کۆکس نامـەیەکی تایبـەتیی بۆ نوێنەری باڵای بەریتـانی لە کـوێت مـێـجـەر مۆر نارد بۆ ئەوەی شێخ

---

(٨) بڕوانە لاپەڕە نەوەت و هەشت.

(٩) لە لاپەڕە نەوەت و هەشتەوە تاوەکو لاپەڕە صەدو شەش.

(١٠) بەداخەوە گەلێک هەڵەی چاپ کەوتۆتە ناو دێرەکانی **«مێژووی سیاسیی کوێت»**ەوە. لێرەدا بە هەڵە لە بریتی دەورووبەری کـۆتایی سـاڵی ١٩٢١ دەورووبەری کـۆتایی سـاڵی ١٩٢٢ چاپ کـراوە. راستە ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی لە نیسانی ١٩٢١وە تاوەکو تەمموزی ١٩٢٢ی عیسایی دەگرێتەوە، بەڵام بەپێی کاتی رووداوەکان ئاشکرا دیارە کە مەبەستی دانەر لێرەدا **(کۆتایی ساڵی ١٩٢١)**ە نەک کۆتایی ١٩٢٢.

(١١) مـەبەسـتی باری ئاڵۆزاوی کـوردسـتـان و پەرەسـەندنی بزوتنەوەی رزگاریخوای کـوردو داواکـردنی گێڕانەوەی شێخ مەحمودو فشاری کەمالییەکانی تورکیایە، ئەوانەی ئینگلیزیان تەواو شڵەژاندبوو، چونکە لەوە دەترسان ویلایەتی موسڵیان لەدەست دەرچێ.

ئەحمەدی **(میری کوێت)** ئاگادار بکات. مێجەر مۆر رۆژی بیست و حەوتی صەفەری ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی کە دەکاتە سیی ئەیلولی ساڵی ١٩٢١ شێخ ئەحمەدی ئاگادار کردو ئەمیش رەزامەندیی خۆی نیشان دا.

رۆژی چواردەی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی کە دەکاتە سیازدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ی عیسایی پاپۆری بەنکورە لە بەندەری بۆمبێی **(هندستانەوە)** کەوتە رێ، شێخ مەحمودو حەمە غەریبی زاوای لەو پاپۆڕەدا بوون، ئەوساکە نوێنەری باڵا لە کوێت نامەیەکی نارده لای شێخ ئەحمەدلجابر کە مێژووی بیست و شەشی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی، بیست و پێنجی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ی عیسایی بەسەرەوە بوو تاوەکو پێی رابگەیێنێ کە ئەو پاپۆڕەی ئەو دوو شێخەی تێدایە رۆژی هەینیی بیست و نۆی جەمادی یەکەم، بیست و هەشتی کانوونی دووەم دەگاتە کوێت. شێخ ئەحمەدیش ئەم وەڵامەی دایەوە:

**«لە ئەحمەدلجابرلصەباحی حاکمی کوێتەوە بۆ جەنابی خاوەن رەوشتی چاک و پایە بڵندی گەورەو ئازیزو خۆشەویست مێجەر ج.سی. مۆر پۆلتکل کە دەوڵەتی بە شان و شەوکەتی چاری ئینگلیز کوێتی پێ کردە بەهەشت خواوەندی گەورە بیپارێزێ.**

**دوای سڵاوو لێپرسینەوە لە خاتری شەریفتان (هیوادارم) هەر بە خۆشی و بەخێر بژین. بە دەستی قەدرو رێزەوە ئەو نامەیەتانمان وەرگرت کە رۆژی بیست و یەکی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٣٤٠ ناردووتانەو ژمارەی پەنجاو نۆی بەسەرەوەیەو تێیدا باسی شێخ مەحمودو شێخ غەریبتان کردووە کە خەڵکی ناوچەی سلێمانین و جەنابی نوێنەری باڵای پایەبڵند دەیەوێ دوای بەردانیان لە هندستان لە کوێت بێیننەوەو جەنابیشتان رۆژی بیست و حەوتی صەفەری ١٣٤٠ باسیانت بۆ کردبووین، ئێمەش موافەقەتمان لەسەر ئیرادەی پایەبڵند نوێنەری باڵا کرد. لەبەر ئەوە خەڵک بۆ موراقەبەیان دائەنێین.**

**ئەو دووانە رۆژی چواردەی ئەم مانگە لە بۆمبێیەوە کەوتوونەتە رێ و وا چاوەڕوان دەکرێ بە پاپۆری بەنکورە رۆژی هەینیی بیست و نۆی هەمان مانگ**

**بکەنە جێ.**

**جەنابتان بۆ ئەو ماوەیەی لە کوێت دەبن ماڵی کاپتەن مادیکتان بۆ تەرخان کردووە، ئێمەیش پەنا بە خوا تەرتیبی دانانی ئەوانە دەکەین کە دەبێ موراقەبەیان بکەن. ئەمەو ئیتر هەر خۆش بن. ڕۆژی بیست و یەکی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٣٤٠».**

ئەو ڕۆژە پاپۆڕی **(بەنکورە)** کە شێخ مەحمودو زاواکەی تێدا بوون گەیشتە کوێت. ئەو دوو شێخە وا چاوەڕوان بوون شێخ ئەحمەدلجابر یا خزمێکی یا یەکێک لە پیاوانی دەوروبەری هاتبێ بۆ پیشوازییان، بەڵام کەسێک لەوانە نەهاتبوو، تەنها نوێنەرێکی بارەگای موعتەمەدی باڵای بەریتانی هاتبوو ئەویش بۆ ئەوەی ئەو ماڵەیان نیشان بدات کە ئەو بارەگایە بۆی تەرخان کردبوون، خانۆکەش لەسەر ڕۆخی دەریا بوو، جاران کاپتەن مادیکی تێدا دەژیا. بۆ ڕۆژی داهاتوو نوێنەری باڵای بەریتانی لە کوێت زیارەتی کردن و زۆر بە جوانی بەخێرهاتنی کردن و پێی گوتن ئەو ماوەیەی لە کوێت دەمێننەوە میوانی حوکمەتی بەریتانی دەبن.

## سەردانی شێخ مەحمود لە شێخ ئەحمەد

هەرچەندە چەند ڕۆژێک بەسەر گەیشتنی **(شێخ مەحمودو شێخ حەمە غەریبدا)** تێپەڕی بەڵام نە شێخ ئەحمەدلجابر، نە یەکێک لە خزمانی نەهاتنە زیارەتیان، ئەوەی بووە هۆی سەرسوڕمانی بێ ئەندازەیان. لەبەر ئەوە بڕیاریان دا ئەوان بچنە کۆشکی سەیف بۆ زیارەتی شێخ. کە گەیشتنە ئەوێ مەلا صالحی سکرتێری شیخ ئەحمەد هاکەزایی پێشوازیی کردن و لە ژوورێکی تەنیشت ئەو ژوورەی شێخ ئەحمەد لێی دانیشتبوو دانیان تا ڕێگەیان دەداتێ بچنە لای. **تەنانەت قاوەشیان پێشکەش نەکردن، هەرچەندە قاوەدان بە میوان نەریتی عەرەبە.**

شێخ ئەحمەد دەترسا بێ ڕەزامەندیی نوێنەری باڵای بەریتانی پێشوازییان بکات، بۆیەکا یەکێک لە پیاوەکانی نارده لای تا ئیزنی بینینیانی لێ وەربگرێ، بەڵام وا ڕێک کەوت لەو کاتەدا ئەو لە ماڵ نەبێ. ئەوساکە شێخ ئەحمەد بە مەلا صالحی گوت **«بەو کوردانە بڵێ با وەختێکی تر بێنە دیدەنیم»**. شێخ ئەم قسەیەی

به جۆرێک کرد کە بۆنی ڕێز لێ نەگرتنی لێوە دەهات. شێخ مەحمود گوتی لەو قسانە بوو کە شێخ ئەحمەد بە مەلا صالحی گوتن، لەبەر ئەوە یەکجار ڕقی هەڵساو دەستوبرد، بەر لەوەی مەلا صالح بگاتە لای و قسەکانی شێخ ئەحمەدی پێ بڵێ ئەو کۆشکی **(سەیفی)** بەجێ هێشت و بڕیاری دا جارێکی تر زیارەتی شێخ ئەحمەد نەکات.

بۆ ڕۆژی داهاتوو نوێنەری باڵای بەریتانی لەگەڵ شێخ ئەحمەدلجابردا کۆبۆوەو زۆر بە توندی لۆمەی کردو لەسەر ئەو ڕەفتارەی بەرانبەر بە شێخ مەحمود سەرزەنشتی کردو[١٢] داوای لێ کرد هەرچۆنێک بێ شێخ مەحمود ئاشت بکاتەوە، ئەویش مەلا صالحی ناردە لای شێخ مەحمود بۆ عوزرخوایی و داوای لێ کرد جارێکی تر زیارەتی بکات. شێخ مەحمود سەرەتا ئەو داوایەی ڕەت کردەوە، بەڵام دوایی لەبەر زۆری مەلا صالح و پاڕانەوەی ناچار بوو داواکەی قەبوڵ بکات.

لای ئێوارەی ئەو ڕۆژە شێخ مەحمودو شێخ حەمە غەریبی زاوای چوونە دیدەنیی شێخ ئەحمەد. **شێخ مەحمود بەو بۆنەیەوە دەستێ جلی عەرەبیی نایابی لەبەر کردبوو.**

نوێنەری باڵای بەریتانی بەر لەو گەیشتبووە جێ، کە شێخ مەحمود هاتە ژووێ هەردووکیان، نوێنەری باڵاو شێخ ئەحمەدلجابر، بەرزە پێ لەبەری هەڵسان و زۆر بە گەرمی پێشوازییان کرد. کە نوێنەری باڵا ئەسەفی خۆی دەربڕی و بەوە پاکانەی بۆ شێخ ئەحمەد کرد کە بە تەواوی نەیناسیوە شێخ مەحمود یەکسەر بەم تاکە بەیتە وەڵامی دایەوە:

ولیس قولك من هذا بضائره
العرب تعرف من انکرت و العجم

کاتێک بەپێی نەریتی عەرەب قاوەیان هێنا شێخ مەحمود قەبووڵی نەکردو گوتی:

---

(١٢) دەقی ئەو قسەیە لە کتێبەکەدا بە عەرەبی بەم جۆرەیە: «وفي اليوم الثاني من هذه الحادثة اجتمع المعتمد البريطاني بالشيخ احمد الجابر فوجه اليه اشد اللوم، وابنه على ما بدر منه بشأن الشيخ محمود، وطلب اليه ان يعمل ما في وسعه لاسترضاء الشيخ محمود»(ص١٠٨).

**«ببورن من کوردم، کوردیش لای هەندێک مەری عەرەب، کە مەبەستی شێخ ئەحمەد بوو، شایانی ئەوە نین لە مەجلسیاندا قاوەیان پێشکەش بکرێ».**

نوێنەری بالاّ لە مەبەستی شێخ مەحمود تێ گەیشت بۆیەکا رووی دەمی تێ کردو گوتی:

**«جەنابی شێخ ببورە، تۆ نەناسراو نیت، کەس ئینکاری پایەو مەقامت ناکات، تۆ یەکێکیت لە سەردارە هەرە گەورەو پایەبڵندەکانی کورد».**

شێخ مەحمودیش لە وەلاّمدا پێی گوت:

**«جەنابی نوێنەر سوپاسی لوتفتان دەکەم، من زۆر بەوەوە دەنازم کە کوردم و سەرداری کوردم».** ئینجا رووی دەمی کردە شێخ ئەحمەدو پێی گوت:

**«ئەی شێخ ئەمەوێ سەرباری فەرمایشتی نوێنەر شتێکی ترتان بۆ روون بکەمەوە، ئەویش ئەوەیە کە من، شانازی نەبێ، نەوەی سەردەستەی کورانی ئادەمم»**[(١٣)].

شێخ ئەحمەد شەرم گرتی و وەلاّمی نەدایەوە. بەو جۆرە زیارەتی شێخ مەحمود کۆتایی هات.

پاش چەند رۆژێکی کەم شێخ ئەحمەد چووە زیارەتی شێخ مەحمود، دڵنەوایی کردو داوای لێ بوردنی لێ کرد. شێخ مەحمود بە نابەدڵی عوزرخوایی شێخ ئەحمەدی قەبووڵ کرد، بەلاّم جارێکی تر، بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە کوێت مایەوە، بیری لەوە نەکردەوە زیارەتێکی تری شێخ ئەحمەد بکات[(١٤)].

هەی ئافەرین شێخی سەربەرزی بەردە قارەمان، سەرداری لێهاتووی کورد، هەزار جاریش ئافەرین بۆ حسەین خەڵەف شێخ خەزعەلی دانەری **«مێژووی سیاسیی کوێت»** کە وا بە ئەمانەتەوە ئەم داستانە گەورەیەی بۆ کوردو بۆ مێژوو تۆمار کرد..

پێم وایە مێژووی کوردو بەسەرهاتی شێخ مەحمود برینی حسەین خەڵەفی کولاندۆتەوەو چارەنووسی رەشی عەرەبی ئێران و شێخ خەزعەلی سەردارییانی هێناوەتەوە یاد بۆیەکا وا بە سۆزەوە باسی کوردو باسی شێخ مەحمودی گەورەی

---

(١٣) دانەر ئەڵێ: **«مەبەستی بوو تێی بگەیێنێ کە ئەو نەوەی پێغەمبەرە»** (١٠٩).

(١٤) لە لاپەرە صەدو شەشەوە تاوەکو لاپەرە صەدو نۆ.

کوردی کردووه.

ئەم سەرگوزشتەیەی حسەین خەڵەف بۆی تۆمار کردووین پڕییە لە پەندو پڕییە لە دەرس. **یەکێکی وەک ئەو شێخ مەحمودەی ئەو بەو جۆرە باسی دەکات هەرگیز ناشێ رۆژێک لە رۆژان داردەست، یا پیاوی لایەنێک بووبێ، کەچی مێژوونووسی ئەوتۆ هەیە هەوڵ دەدات بە زۆری زۆردارەکی بەرگی نۆکەریی بە بەردا بکات. یەکێک لەوانە دەڵێ ئینگلیزەکان ساڵی ١٩٢٤و ١٩٢٥ لە کاتی وتووێژی مەسەلەی نەوتدا پەتیان بۆ شێخ شل کردبوو گوایە تا مەلیک فەیسەڵی یەکەم ناچار بێ مافی دەرهێنانی نەوتی عیراقیان بداتێ، هەرچەندە ئەو کاتەی ئەو دەفەرموێ فڕۆکەکانی ئینگلیز، بەپێی گێڕانەوەی بەڵگەی تایبەتی و کاربەدەستی ئاگادار، بە راوودوونانی شێخ مەحمودو پیاوەکانییەوە خەریک بوون و ئاسمانی کوردستانیان کردبووە فێرگەی مەشقی خۆیان و بۆ یەکەم جار لە مێژوودا بۆمبای دووصەدو پەنجا پاوەنییان بۆ سوتاندنی گوندو لادێی کوردەواری و پەرەوازەکردنی زارۆڵەکانی بەکار هێنا.**

لە نووسینەکەی حسەین خەڵەفدا هەست بە ئازادی دەربڕین و زۆرزانی ئینگلیزو پیاوچاکی مەلا صالح دەکەیت. **برایەتی و هاوچارەنووسی کوردو عەرەب پێویستیان بەم جۆرە نووسینانەیە، نەک نووسینی ئەوانەی لەخۆڕا هەستی کورد بریندار ئەکەن و دڵیان ئەڕەنجێنن.**

# گاڵتەو گەپ و گەمەکانی
# نێوان شێخ مەحمودو فڕۆکەوانە ئینگلیزەکان

هەر لە سەرەتاوە ئەڵێم ئەگەر فڕۆکەکانی ئینگلیزو زۆر جار بۆمبابارانی بێ وچانیان نەبوایە شێخ مەحمودو لایەنگرانی لەوانە بوو بتوانن بەشی زۆری ئامانجە نەتەوایەتییەکانی کورد جێبەجێ بکەن. بۆ روونکرنەوەی ئەم راستییە بایەخدارە دەیان بەڵگەو رووداوی هەمەچەشنە بە دەستەوەن کە سەرچاوەکانیان ئینگلیز خۆیانن.

پێم وایە رۆژنامەی **«تێگەیشتنی راستی»** کە ئینگلیز لە بەغدا لە رۆژی یەکەمی کانوونی دووەمی ساڵی١٩١٨ەوە دەستیان کردە بڵاوکردنەوەی، یەکەم چاپەمەنییە بە کرمانجی خواروو باسی فڕۆکەو بە تایبەتی باسی فڕۆکەی ئینگلیزی کردووە، فڕۆکەی ناوناوە کۆلارە، فڕۆکەوانیش کۆلارەوان. هەر ئەو سەرەتای ١٩١٨ بۆ یەکەم جار وێنەی فڕۆکەو فڕۆکەوانێکی لە ژمارە یازدەی خۆیدا بڵاوکردۆتەوەو لە ژێریدا نووسیوییە **«کۆلارەوانێکی ئینگلیز کۆلارەکەی پیشانی خەڵک ئەدا»**[(١)]. دوای ماوەیەک **«تێگەیشتنی راستی»** بۆ رۆژگاری خۆی دەربارەی فڕۆکە هەواڵێکی سەیری بڵاوکردۆتەوە، تێیدا دەڵێ: **«جاران مودەتی سەفەر لە قاهیرەوە بۆ بەغداد لە**

---

(*) لە ژمارە (١٣٦)ی ساڵی ١٩٩٥ی گۆڤاری **«رۆشنبیری نوێ»**دا بڵاوکراوەتەوە.

**تێبینی:**

(أ) (P. R. O) کورت کراوەی (Public Record Office)ە واتە دایەرەی فایلە گشتییەکان لە لەندەن.

(ب) (C.O)ش کورت کراوەی (Colonial Office)ە، واتە وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانی.

(ج) مەبەست لە (Air)ش وەزارەتی هێزی ئاسمانی بەریتانییە.

(١) **«تێگەیشتنی راستی»** (رۆژنامە)، بەغدا، ژمارە یازدە، ٥ی شوباتی ١٩١٨.




بەینی دوو سێ هەفتــەدا بوو» بەڵام **«کۆلارەیەکی ئینگلیز»** توانی ئەو ڕێگە دوورو درێژە بە **«۲۱ سەعات و ۳۵ دەقیقە طەی»** بکات[۲].

**«تێگەیشــتنی ڕاســتی»** لەو ریپــۆرتاجــەشــیــدا کــە دەربارەی ئەو ئاهەنگەی نووســیــبــووی کــە ئینگلیــزەکــان لە بەغــدا بە بۆنەی تەواو بوونی شــەڕی یەکــەمی جیهانەوە گێڕابوویان باسی فڕۆکەی بەم جۆرە کردووە:

**«چەن کــۆلارەیەک لە هەوادا دەســتــیــان کــرد بە یاریی، بەرزو نزم دەبوون و تەقلەیان لێ ئەداو لە خوارەوە چەپڵەیان بۆ لێ ئەدان و تەحسینیان دەکرد»**[۳].

زۆری نەبرد کورد بە چاوی خۆیان ئەو **«کۆلارە سەیرەیان»** لە ئاسمـان و زەمـینی کوردسـتـاندا بینی. بە وێنە جێگری حـاکـمی گـشـتـیی بەریتـانی لە عیـراق ئارنۆلد ولسن بۆ خۆی ڕۆژی یەکی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۱۸ بە فڕۆکە هاتە سلێمانی و دیدەنی شێخ مەحمودو ژمارەیەک گەورە پیاوانی کوردی کرد[٤]. لەوساوە فڕۆکە ، وەک زۆر شتـی تر، بووە هۆی ئەوەی کـورد لەوە تێبگەن ئینگلیز چەند بە تواناو بە دەسەڵاتن.

---

(۲) **«تێگەیشتنی راستی»**، ژمارە پەنجاو هەشت، ۹ی کانوونی یەکەمی ۱۹۱۸.
(۳) **«تێگەیشتنی راستی»**، ژمارە پەنجاو سێ، ٤ی تەشرینی دووەمی ۱۹۱۸.
(4) A. T. Wilson, Loyalities Mesopotamia, Vol.II(1917-1920). A Personal and Historical Record, London, 1936, P.129.

**لەو رۆژگارەدا وەک مافێکی رەوای خۆی و وەک گەلانی تری رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست کورد سەربەخۆیی دەویست. بەڵام گەلێک هۆی دەرەکی بە رادەی یەکەم و ناوەکی بە رادەی دووەم بوونە کۆسپ لە بەردەم جێبەجێ کردنی ئەو ئاواتەدا کە سەرئەنجام وای لێهات لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئینگلیزدا نەگونجێ.** لەبەر ئەوە زۆری نەخایاند ئینگلیزو کورد لێک ترازان و بوونە دوو بەرەی ناحەزی دژ بەیەک، بۆیەکا پێکادان لە نێوانیاندا خۆی داسەپاندو خاکی کوردستان لە کۆتایی ساڵی ١٩١٨ەوە تا ساڵی١٩٣٢ بووە شەرگەیەکی بەرفراوان. لەبەر گەلێک هۆ شێخ مەحمود لەو رۆژگارەدا بووە رابەری یەکەمی کوردایەتی لە کوردستانی باشوور، بۆیەکا بەشی هەرە زۆری شەڕو پێکادانەکانی ئەو قۆناغە لەگەڵ هێزەکانی ئەودا قەومان.

شێخ مەحمود سوور بوو لەسەر جێبەجێ کردنی داخوازییەکانی کورد، بۆیەکا دەبوو هەر چۆنێک بێ لەناو ببرێ، خۆ ئەگەر ئەویانە نەلوا ئەوساکە هیچ نەبێ لە پەلوپۆ بخرێ. لە وتارێکی تردا گوتومە ئەوە کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە **«شێخ مەحمود بەشێک بوو لە بزووتنەوەیەکی بەرفراوانی رەوا کە هۆی مان و ژیانی لە بێ مافی گەلەکەیەوە سەرچاوەی وەردەگرت»**، سەرباری ئەوە **«شاخ و داخی کوردستان بوو بوونە پەناگەی شێخ و لەشکری میری ئەوەی لەباردا نەبوو بتوانێ بزووتنەوەکانی لەناو بەرێ»**[5].

لەو بارودۆخەدا ئەرکی سەرەکی لەناوبردنی شێخ مەحمود، یا هیچ نەبێ بەربەست کردنی تەشەنەسەندنی بزووتنەوەکانی راستەوخۆ کەوتە ئەستۆی فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیای گەورەوە.

بەهاری ساڵی ١٩١٩ بۆ یەکەم جار ئینگلیز فڕۆکەی دژی کوردی عێراق بەکارهێنا، رۆژی یەکی مایسی ئەو ساڵە لایەنگرانی شێخ مەحمود کتوپڕ رژانە ناو شاری سلێمانییەوەو لە سووکە شەڕێکدا ئەو هێزەی ئینگلیزیان بەزاند کە بە سەرکردایەتی دانێلس لەوێ بوو، دەستیان بەسەر شاردا گرت و گرینهاوسی جێگری میجەر سۆن و هەموو یاریدەدەرەکانیان بەدیل گرتن کە پێنجیان ئەفسەری ئینگلیز

---

(٥) **«رۆشنبیری نوێ»** (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە ١٣٥، ئاداری ١٩٩٥، ل٣٤-٤٠.

بوون، ئینجا بانگی سەربەخۆییان دا. هەمان کات لایەنگرانی شێخ، بە تایبەتی جافەکانی سەر بە حامید بەگ، ئابلۆقەی هەڵەبجەیان داو گ.م.لێسی یاریدەدەری کارگێڕی سیاسییان لە دەروبەری شار دابڕی. هەنگاوی داهاتوو بەرەنگار بوونەوەی ئینگلیز بوو لە کەرکوک.

لەوساوە ئینگلیزەکان بە فڕۆکە کەوتنە سۆراخی شۆڕشگێڕانی کورد، چەند جارێک هاتنە سەر ئەو ناوچانەی بە دەستیانەوە بوون بۆ تاقیبی نیازەکانیان و بەسەرکردنەوەو زانینی هەواڵی دیلەکانی خۆیان، لە ئاسمانەوە نامەو بەیاننامەی تایبەتیان فڕێ ئەدایە خوارێ. یەکێک لەو نامانە بۆ خودی شێخ مەحمود بوو کە تیایدا داوایان لێکردبوو بۆ گفتوگۆ سەردانی بەغدا بکات. تەنانەت ئارنۆلد ویلسنی جێگری حاکمی گشتی عیراق بۆ خۆی بە فڕۆکە هاتە سەر ناوچەکەو بەو جۆرە باسی ئەو هاتنەی بۆ تۆمار کردووین:

**«یەکسەر بە فڕۆکە هاتمە سەر ناوچەکە تا بە چاوی خۆم ببینم چی روو ئەدات، هەر شەش ئەفسەرە بەریتانییەکەم لە سەربانی بەندیخانە کاتییەکەیان لە سلێمانی بینی**[٦]**. دوای ئەوە چوومە هەڵەبجە بەو نیازەی بتوانم دابەزم و لێسی یاریدەدەری کارگێڕی سیاسی ئەوێ لەگەڵ خۆمدا بهێنمەوە، بەڵام کەمی ئەو بەنزینەی پێمان مابوو بواری جێبەجێ کردنی ئەو کارەی نەدام، هەر ئەوەندەم بۆ کرا نامەیەکی بۆ فڕێ بدەمە خوارێ و داوای لێبکەم لەوێ نەمێنێ..»**[٧].

بەر لە شەڕی بازیان چەند جارێک فڕۆکەکانی ئینگلیز هاتنە سەر ناوچەی جیاجیای کوردستان هەم بۆ تۆقاندنی خەڵکەکەی نەبا بدەنە پاڵ شێخ مەحمود، هەم بۆ تاقیبی جموجۆڵی شۆڕشگێڕان. رۆژی هەژدەی حوزەیرانی ساڵی١٩١٩یش کاتێک ئەو شەڕە قەوماو دوای تەواو بوونیشی بە شکانی کورد فڕۆکە دەوری رێ نیشاندەری هێزەکانی ئینگلیزی ئەبینی.

بۆ هەمان مەبەست فڕۆکەی ئینگلیز نیشتە ناوچەکانی بادینانیش، **بە تایبەتی دوای ئەوەی بارزانی و زێباری بۆ یەکەم جار لە بەختی کوردا پێکرا بەرەنگاری**

(٦) دوور نییە شێخ مەحمود خۆی فەرمانی دابێ لە کاتی هاتنی فڕۆکەکەی ویلسندا دیلەکان بهێننە سەربان تا لە مانیان دڵنیا بێ.

(7) A. T. Wilson, Op. Cit., P.136.

**دوژمن هاتن و پایزی ساڵی١٩١٩ دەستی چاکیان لێوەشاندن**. بە پێی «**یادداشت**» شۆڕشگێڕانی کورد لە نزیک زاخۆوە فڕۆکەیەکیان خستۆتە خوارێ[٨]، ئەگەر وابێ[٩] ئەوە یەکەم فڕۆکەی شەڕکەری ئینگلیزە لە لایەن شۆڕشگێڕانی کوردەوە بپێکرێ.

لە ڕۆژانی شۆڕشی بیستیشدا ئینگلیزەکان چەند جارێک فڕۆکەیان ناردە سەر ناوچەی جیاوازی کوردستان بۆ چاوترساندنی دانیشتوانیان. ناوەندی ئەیلولی ١٩٢٠ دوو فڕۆکەی ئینگلیز بۆمبابارانی بارام ئاواو بەڵخەو چەند گوندێکی تری ناوچەی هەورامانیان کرد بۆ دامرکاندنەوەی دژڵێیەکان کە هەمیشە لایەنگری شێخ مەحمود بوون[١٠].. هەر لەو دەورو بەرەشدا ئارنۆڵد ویلسن بە فڕۆکەیەکی تایبەتی هاتە هەولێرو لەوێ کۆبوونەوەیەکی گەورەی سازکرد بۆ هێوەرکردنەوەی باری ئاڵۆزی شارو دەوروبەری[١١].

بەم جۆرە لەگەڵ داگیرکردنی کوردستانی باشووردا لە لایەن ئینگلیزەوە فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا بوونە یەکێک لە ئامرازە سەرەکییەکانی سەرکوت کردنی نیشتمانپەروەرانی کورد. بەپێی قسەی گۆڤاری باوەڕپێکراوی «**ڕۆژهەڵاتی نزیک و هندستان**»ی لەندەنی ئینگلیزەکان تەنانەت فڕۆکەیان بۆ کۆکردنەوەی باج و سەرانەش بەکار ئەهێنا[١٢].

بە هۆی پەرەسەندنی خەباتی رزگاریخوازی کوردەوە ڕۆژ بە ڕۆژ ڕۆڵی فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز لە کوردستاندا زیاتر دەبوو. ئەم ڕاستییە لە بەسەرهات و ڕووداوەکانی ڕۆژانی قۆناغی دووەمی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمودا تەواو خۆ دەنوێنێ، دەبوو ئەو ڕژێمەی شێخ مەحمود تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢دایمەزراند

---

(٨) رەفیق حیلمی، یادداشت، بەرگی سێیەم، بەغدا، ١٩٥٦، ل٦٢.

(٩) بۆیە ئەو ئەگەرەم تێ خستووە چونکە ئارنۆڵد ویلسنی جێگری حاکمی گشتی بەریتانی لە عیراق لە کتێبەکەی خۆیدا باسی نەکردووە.

(١٠) لەو بارەیەوە بڕوانە بەیاننامەی ئینگلیزەکان لە ڕۆژنامەی«**العراق**»دا، بەغدا، حەڤدەی ئەیلولی ١٩٢٠. ڕۆژنامەی«**پێشکەوتن**»یش کە لە سلێمانی دەردەچوو لەو ژمارەیەیدا کە ڕۆژی بیست و سێی ئەیلولی هەمان ساڵ چاپ بووە باسی ئەو هێرشەی کردووە.

(11) A. T. Wilson, Op. Cit., P.288.

(12) "The Near East and India", London, November 23, 1922, PP. 149-150.

زوو بە زوو زیندە بەچاڵ بکرێ. رۆڵی فڕۆکەکانی ئینگلیز لە جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانەدا گەورە بوو.

ئەمجارەیان لە سەرەتای مانگی مارتی۱۹۲۳وە فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز لە ئاسمانی کوردستاندا کەوتنە جموجۆڵ. دوای ئەوەی کاربەدەستانی میری و ئینگلیز شێخ مەحمودیان پێ قایل نەکرا دەست هەڵگرێ رۆژی یەکی مارتی ئەو ساڵە ئینگلیز لە رێگەی فڕۆکەکانی خۆیانەوە شێخیان ئاگادار کرد دەبێ بێ دواخستن خۆی و هێزەکانی لە سلێمانی بچنە دەرێ. کە شێخ ملی نەدا دوای دوو رۆژ فڕۆکە کەوتە بۆمبابارانی شارو ژمارەیەک خەڵکی بێ تاوان پێوە بوون، ئەوساکە شێخ مەحمود ناچار بوو بەرەبەیانی چواری مارت بە خۆی و هێزەکانییەوە بکشێتەوە ناوچەی سورداش و ئەشکەوتی جاسەنەی کردە بنکەی سەرکردایەتی خۆی و لەوێ لە رۆژی هەشتی مارتەوە رۆژنامەی **«بانگی حەق»**ی دەرکرد کە ناوی خۆی بەخۆیەوەیە. داستانی بێ هاوتای ئەو رۆژنامە دەگمەنەی کوردو سەرجەمی مێژووی رۆژنامەنووسی ناوچەکەو لەوانەشە جیهان بە ئاسانی ئەوە روون ئەکاتەوە بۆ چ فڕۆکەکانی ئینگلیز دەسبەرداری شێخ نەئەبوون. لە ژێر ناوی رۆژنامەکەدا نووسراوە **«ناشکێ بە تۆپ و بۆمبا سەرفرازە بانگی حەق»**. ئینجا نووسراوە **«بانگی حەق» «غزتەیەکی رسمییە لە قەرارگاهی عمومی ئۆردووی کوردستان طەبع دەکرێ. غایەو ئەمەلی استحصالی حقوقی کوردانە»**[۱۳].

فڕۆکەکانی ئینگلیز لێرەش تەنگیان بە شێخ مەحمود هەڵچنی و ناچاریان کرد پەنا بەرێتە بەر گوندی پیران کە کەوتۆتە ناو خاکی کوردستانی ئێرانەوەو دوو میل لە سنوورەوە دوورە. لە پیرانەوە شێخ دژی ئینگلیز یادداشتێکی ئاراستەی گشت ئەو دەوڵەتانە کرد کە بالیۆزخانەیان لە تاران هەبوو. لەو یادداشتەیدا شێخ مەحمود بەتایبەتی باسی بۆمبابارانی فڕۆکەکانی ئینگلیزی کردووە کە چۆن لەگەڵ هێزەکانی تریاندا تەنگیان بە کورد هەڵچنیوەو بوونەتە هۆی کاول کردنی ولاتەکەو ئاوارە بوونی نزیکەی دوو صەد سەرخێزانی سلێمانی[۱٤].

(۱۳) **«بانگی حەق»** (رۆژنامە)، جاسەنە، ژمارە سێ، پێنج شەمە، ۱۲ی نیسانی ۲٦/۱۳۳۹ی شەعبانی ۱۳٤۱.

(14) Kurd Oglu, Kurdi i Imperialism, "Blioten Srednevo Vostoka", Tashkent,



فرۆکەکەی A.T. Wilson

تا رۆژی بیست و هەشتی مایسی١٩٢٣ هێزەکانی ئینگلیزو میری نەیانتوانی بێنەوە ناو شاری سلێمانی، بۆ رۆژی داهاتوو سەرەک وەزیران عەبدولموحسین سەعدون و صەبیح نەشئەت و کۆرۆنوالیسی راوێژکاری نوێنەری بالاّ **(المندوب السامی)** بەریتانیا لە عیراق گەیشتنە سلێمانی. دوای ئەوان سێر هێنری دۆبسی نوێنەری بالاّ بۆ خۆیشی گەیشتە ئەوێ و هەموویان تا رۆژی چواری حوزەیران لەوێ مانەوە، بەلاّم شتێکی ئەوتۆیان پێنەکرا بۆ هێمن کردنەوەی بارودۆخی ئالۆزی ناوچەکەو یەکێکیان بۆ نەدۆزرایەوە بتوانێ جێگەی شێخ بگرێتەوە، بۆیەکا هێزەکانی میری ناچار بوون رۆژی حەڤدەی حوزەیران سلێمانی بەجێ بهێلن، دەستوبرد کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند دەستی بەسەر شاردا گرت و بە ناوی شێخ مەحمودەوە کەوتە حوکمرانی ناوچەکە تا رۆژی یازدەی تەمووز شێخ بۆ خۆی گەیشتەوە ناو شار. ئینگلیزەکان لە رێگەی کەرکوکەوە بە ناوی نوێنەری بالاّوە نامەیەکیان بۆ شێخ نارد، تێیدا هەرەشەی ئەوەیان لێکردبوو کە ئەگەر بێتو دەست بخاتە ناو کاروباری رانیەو قەلاّدزەو چەمچەماڵ و هەڵەبجەو قەرەداغ و سەرگەڵوو ماوەت و سەنگاوەوە ئەوساکە بە توندی لێی ئەدەن(١٥).

No. 13-14, 1932, P.115.

(15) "Report by His Britannic Majesty s Government on the administration of Iraq for the period April, 1923-December, 1924", London, 1925, PP. 30-31.

ئەو هەڕەشەیە دەستی ئەدا لە هەموو سات و ئانێکدا بکرێتە بیانوو بۆ لێدانی شێخ مەحمود ئەگەرچی سەری تەنانەت لە مزگەوتەکەی حاجی کاک ئەحمەدی شێخی باپیریشی دەرنەهێنایە. بەپێی گێڕانەوەی ئەدمۆندسی سەرپەرشتکاری کەرکوک زۆری پێ نەچوو نوێنەرانی هەڵەبجە، بەگزادانی جاف بە رابەری حامید بەگ و ئەحمەد بەگ و عیزەت بەگ بۆ خۆیان گەیشتنە سلێمانی بۆ **«ڕاگەیاندنی بڕوایان بە مەلیکی»** کوردستان[(١٦)]. زۆربەی دانیشتوانی مەڵبەندە قەدەغەکانی تریش موریدو لایەنگری شێخ بوون و لەبەر گەلێک هۆ لە سلێمانی دانەدەبڕان.

ئەمجارەیان ئینگلیز خراپتر پەنایان بردە بەر فڕۆکە بۆمباهاوێژەکانیان. بۆ یەکەم جار لە مێژوودا ئەو فڕۆکانە کەوتنە بەکارهێنانی بۆمبای ٢٢٠پاوەنی[(١٧)] تازە دروستکراو دژی کورد[(١٨)]. کاولکاری ئەو فڕۆکانە دیسان بۆ یەکەم جار لە جنێڤ و لۆزان و لەندەن و ئەنقەرە دەنگی دایەوە. پاکانەی ئینگلیز ئەوە بوو گوایە ئەوان بە ناچاری **«بۆ پاراستنی هێمنی و ئاسایش»** پەنایان بردۆتە بەر ئەو کاولکارییە[(١٩)].

لەم بوارەدا مس بێڵی بەناوبانگ رووداوێکی یەکجار سەیری بۆ تۆمار کردووین[(٢٠)]. خاتوو بێل کە ئەوساکە سکرتێری نوێنەری باڵا بوو لە بەغداو لە هەرکەس پتر ئاگاداری کەین و بەینی ئینگلیز بوو لە عیراق دەورووبەری کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی١٩٢٣ بە بۆنەی نزیک کەوتنەوەی کریسمس و جەژنی سەری ساڵی نوێوە نامەیەکی بۆ باوکی ناردووە لە لەندەن. بە دەستووری نامەکانی تری خاتو بێڵ لەم نامەیەشدا باوکی دەربارەی چالاکییەکانی خۆی و رووداوە گرنگەکانی عیراق ئاگادار کردووە. لەو نامەیەدا کە بەداخەوە تا ئێستە، بە پێچەوانەی زۆربەی نامەکانی ترییەوە، نەکراوە بە عەرەبی باسی ئەوەی کردووە چۆن

---

(16) C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs. Politics travel and research in North- Eastren Iraq, London, 1957,P.371.

(١٧) هەر پاوەنێک ٤٥٣٫٦ غرامە، واتە قورسایی هەر بۆمبایەک خۆی دەدا لە سەد کیلۆ، بەر لەوە لە هیچ شوێنێک بۆمبای وا بەکارنەهێنراوە.

(18) C.J.Edmonds, Op.Cit.,P.350.

(19) "Report by HBMG on the administration of Iraq for the period April,1923-December, 1924",P.31.

(٢٠) پێم وایە تەنها ئێدمۆندس کورتە باسێکی ئەو پیلانەی کردووە.

# اعلان رسمي

قرارمان دا كه لەم روژانه دا قوةيكي عسكريه بنيرينه
سليماني بو تنظيم ادارەء مملكت وترتيب امور قضا ونواحي.
اشراف مملكت ، ورؤساي عشاير ، ومامورين حكومت ،
[illegible]
دليكي صادقي دەخالت وتسليم به قومندانات و عسكره
بن ، كه اگاته سليماني .
خبر دەدريتە همه كس اي خلقينه كه اگر ايوه مخالفت ومقابله
عسكركه نكهن اوان به هيچ كلوه جي دەخل ايوەنا كهن
وضروريات لي ستانن وهيچ اذيتيكتان بي ناگه يني . فقط او
كسانه كه مقابله بكهن عسكر تعقيب وتاديب اوان
دەكات .
واگر بو خوا و سولم [illegible] مقابله
عسكركه مان بكەن ويتفنك بو عسكر وطياره بهاويزن اوسا
مسؤليت گورە اكه ويته سراوكسانه كه سبب بن
وعسكر دست دەكات به تعقيب وتاديبيان .

باش قومندانات قوات ملوكانه وعساكر
بريه اردوي بريطانياي گوره له عراقدا
ه آي رواتيل مارشال ، فريق اول
اردوي معظم

ئینگلیز لەم جۆرە بانگەوازانەی لەبارەی بۆمباردمان کردنی کوردستان زۆربووە

سەرکردەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق مارشاڵ موهیب روکن سێر جۆن سالمۆند ویستوویە سەری شێخ مەحمود بکاتە دیاریی دەستی بۆ لەندەن بە بۆنەی جەژنی سەری ساڵی نوێوە. بێل دەڵێ:

**«بۆ خۆی زۆر بە نهێنی سواری فڕۆکەکەی بوو، چووە سەر سلێمانی و هێندە دابەزیبە خوارێ کە تەنها سەدو پەنجا پێی مابوو بدا لە زەوی، ماڵی شێخ مەحمودی دەستنیشان کردو ژمارەیەکی بێ شومار بۆمبای تێ گرت، بە دڵ خۆشی گەڕایەوە چونکە پێی وابوو ئەو گەوجەی[21] گۆڕ بەگۆڕ کردووە»**[22].

خاتوو بێل لە نامەکەیدا دەڵێ: **«شێخ مەحمود بۆ خۆی ڕۆژی داهاتوو بە بروسکە بەغدای ئاگادار کردەوە کە لە سایەی خواوە تەندروستی باشەو تێناگات بۆ چی سلێمانییان بۆمباباران کرد»**[23]. شایانی باسە یەکێک لە بۆمباکان دەروازەی دەرەوەی ماڵی شێخی هەڵتەکاندبوو.

زۆری نەبرد ئینگلیزەکان لەوەیش خراپتریان کرد. ڕۆژی بیستی مایسی ١٩٢٤ بە فڕۆکە بەیاننامەیەکی زۆریان بەسەر گەلێک ناوچەی کوردستاندا بڵاوکردەوە، بەیاننامەی ئەمجارەیان دەڵێ هەموو ئەو ناوچانەی سەر بە شێخ مەحمودن بۆمباباران دەکرێن. پاش دوو ڕۆژ دیسان بە بەیاننامەی تایبەتی خودی شێخیان ئاگادار کرد کە دەبێ خۆی و چەکدارەکانی تا ڕۆژی بیست و پێنجی مایس شاری سلێمانی چۆڵکەن. لەو ڕۆژەدا فڕۆکەکانی ئینگلیز بە خەستی بۆمبارانی شاریان کرد، بە رادەیەک، وەک خۆیان لە راپۆرتی ئەو ساڵەیاندا کە دەربارەی عیراق داویانەتە **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** (عصبة الامم) دانیان پێدانا وە، لە ناو شاردا تەنها ٧٠٠ کەس ماونەتەوە، ئەو باقی خەڵکەکە، واتە بەلای کەمەوە ١٩هەزارو ٣٠٠ کەس پەرەوازە بوون و **«پاش چوار مانگ ئینجا ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی دیسان گەیشتۆتەوە دۆخەکەی جارانی»**[24].

---

(٢١) بە ئینگلیزی (Rogue) کە بەمانای نامەردو گەوج و نەفام و خوێڕی دێت.

(22) E.Burgoyne,Gertrude Bell from Her personal papers 1914- 1926, Ernest Benn Limited,London,1961,P.323.

(23) Ibid.

(24) "Report by HBMG on the administration of Iraq for the period April, 1923-December,1924",PP.32-33.

هەر لە سەرەتاوە شۆڕشگێرانی کورد بە بڕنەوە کۆنەکانیان دەستڕێژیان لە فڕۆکەی دوژمن دەکردو جارویار لێیان دەپێکان، جاری واش هەبوو فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز بۆ خۆیان پەکیان دەکەوت و دەکەوتنە خوارەوە کە ئەوەیش بەڵگەیەکی تری زۆر بەکارهێنانی فڕۆکە بوو دژی کورد. بە وێنە دەوروبەری کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی١٩٢٣ دوو فڕۆکەی بۆمباهاوێژی ئینگلیز لە یەک کاتدا کەوتنە خوارێ، یەکێکیان لە سەرچنارو ئەوی تریان لە تاسلوجە، ئەمەی تاسلوجەیان پیاوەکانی کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند لە داخی دڵی خۆیان پارچە پارچەیان کرد. ڕۆژی بیست و یەکی نیسانی ساڵی ١٩٢٤یش فڕۆکەیەکی تری ئینگلیز لە کاتی نیشتنەوەیدا لە هەڵەبجە تەقیەوە. بەر لەوەیش بە مانگێک و چەند ڕۆژێک سێ فڕۆکەی جەنگی هاتنە سەر شەمێرانی نزیک وارماوە، گوللەی شۆڕشگێرانی ئەو ناوچەیە تانکی بەنزینی یەکێکیان پێکاو فڕۆکەوانەکەی ناچار بوو بنیشێتەوە[٢٥].

تۆ بڵێی لەو٣٤ ملیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشەیەی ژێر دەستیاندا ئینگلیز لەو ڕۆژگارەدا لە هیچ شوێنێکی تر بەو رادە فراوانەی کوردستان فڕۆکەی جەنگییان بەکار هێنابێ. هەر ئێدمۆندس کە بۆ خۆی فڕۆکەوان نەبوو ساڵی١٩٢٤ جارێکیان لە ماوەی دوو مانگدا سی جار بە فڕۆکە چۆتە سەر ناوچە جیاجیاکانی کوردستان[٢٦]. لەگەڵ ئەوەشدا فڕۆکە دادی ئینگلیزی نەدا، شێخ مەحمود دەستی هەڵنەگرت. ئەوساکە ئینگلیز پەنایان بردە بەر پیلانێکی سەیر بۆ کوشتنی شێخ مەحمود، بۆ ئەم مەبەستە بە سەرپەرشتی خودی نوێنەری باڵا هێنری دۆبس و بەشداری سەرەک وەزیران یاسین هاشمی ڕۆژی دووی مایسی ساڵی ١٩٢٥ لە کەرکوک کۆنگرەیەکی بەرزیان سازکردو پارەیەکی زۆرو هێزێکی تایبەتییان تەرخان کرد[٢٧].

بەر لەوەی گەشتەکەمان لەگەڵ فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیزو کوردا تەواو بکەین پێم باشە وەک بەڵگەی بێ ئاگایی بە تایبەتی زۆربەی هەرە زۆری مێژوونوسانی

---

(25) C.J.Edmonds,Op.Cit.,PP.377-380

(26) Ibid,P.392

(٢٧) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە: «ڕۆشنبیری نوێ»، ژمارە ١٣٥، ئاداری ١٩٩٥، ل٣٤-٤٠.

عەرەب لێرەدا نمونەیەکی لەبار بهێنمەوە. بۆ ئەم لایەنەی باسەکەمان پەنا دەبەمە بەر بۆچوونی مێژوونووسێکی ڕێکوپێک و بەڕێز **دکتۆر نوری عەبدولحەمید خەلیل عانی** کە لە لێکۆڵینەوەیەکی پڕ بایەخی زانستییانەی خۆیدا دەربارەی نەوتی عیراق ئەو هەموو گاڵەیەی ئینگلیز بە شێخ مەحمودیان کرد دەیانخاتە لاوەو سووک و باریک شێخ دەکاتە داردەستی ئینگلیز، گوایە ئەوان کاتی خۆی ڕێگەیان داوە هێزەکانی میری لە سلێمانی وەدەرنێ لە کاتێکدا، وەک دەڵێ: **«هێزی ئاسمانی زۆر پێویست بوو بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەم جۆرە بزووتنەوانە»**[28].

بەپێی بۆچوونی ئەو ئینگلیزەکان ئەمەیان بۆیە کرد تا بەغدا ناچار بکەن مافی دەرهێنانی نەوتیان بداتێ. بۆ چەسپاندنی ئەو بیرەی دکتۆر نوری لە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا دەڵێ: **«دوای ئەوەی ئینگلیزەکان بە مەرامی خۆیان گەیشتن و ڕۆژی چواردەی مارتی ساڵی ١٩٢٥ئیمتیازی نەوتەکەیان وەرگرت ئەوساکە هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق هێرشێکی گشتیی کردە سەر لایەنگرانی شێخ مەحمود لە باکوور»**[29].

بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ لەو ڕۆژانەدا کە دکتۆر باسیان دەکا فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز لە ئاسمانی کوردستاندا تا ڕادەیەکی زۆر لە جموجۆڵ کەوتبوون. لە ناو فایلە تایبەتییەکاندا ئەو ڕاستییە روون و ئاشکرایە. لە سەرەتای پاییزی ساڵی١٩٢٥ەوە فڕۆکەکانی ئینگلیز دیسان بە خەستی کەوتنە ڕاوە کورد، بە تایبەتی ڕابەرە لێهاتووەکانی هێزە چەکدارەکانی شێخ مەحمودو لە سەروی هەمووشیانەوە کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو سابیری کوڕی کە وا دیارە لەو ڕۆژانەدا وەجاخی باوو باپیرانی بە شیاوی ڕوون کردبۆوە.

بەپێی بۆچوونی دکتۆر نوری و ئەوانەی وەک ئەو دەڕواننە مەسەلەی کوردو بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود بە تایبەتی، دەبوو دوای دانی ئیمتیازی نەوت ئیتر نیشتمانپەروەرانی کورد دەسەوەسان دانیشن و دەست لە خەباتی ڕەوایان هەڵگرن،

---

(٢٨) الدكتور نوري عبدالحميد خليل، التأريخ السياسي لامتيازات النفط في العراق ١٩٢٥-١٩٥٢، بغداد، ١٩٨٠، ص١٠٧. شایانی باسە ئەسڵی ئەم کتێبە نامەی دوکتۆرای خاوەنییە کە پلەی زۆر باش(جيد جيدا)ی وەرگرتووە.

(٢٩) هەمان سەرچاوە، ل١٢١.

کەچی بە پێچەوانەوە کوردایەتی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر پەلی دەهاویشت.

لێرەدا چەند نمونەیەکی مانادار دەخەمە بەر چاو، چونکە وەک دکتۆر دەڵێ، ڕاستیش دەکات، ئینگلیز دەیانویست ئیتر ناوچەکە هێمن و هێوەر بێ تا کۆمپانیای نەوت لە کەرکوک لە بارێکی ئاساییدا بکەوێتە کار[٣٠]، کەچی ئەوەتا چالاکییەکانی لایەنگرانی شێخ مەحمود دوای دانی ئیمتیازی نەوتەکە ڕاستەوخۆ دەگەنە بن دەستی ئەو کۆمپانیایە. لە بواری سەرکوت کردنی کوردا لەو ڕۆژانەدا میری مەجید یەعقوبی کردبووە موتەسەریف(پارێزگار)ی کەرکوک کە وەک باوەکوشتەی شێخ مەحمود وابوو. بەپێی گێڕانەوەی بەڵگەنامە تایبەتییەکانی ئینگلیز ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا چالاکییەکانی لایەنگرانی شێخ لەو ناوچەیەدا تا دەهات زیاتر پەرەیان دەسەند، ئینگلیز مەترسی ئەوەیان لێ نیشتبوو هێرش بەرنە سەر هێلی شەمەنەفەری نێوان بەغداو کەرکوک، لەبەر ئەوە ناوچەکەیان خستبووە ژێر چاودێری وردی فڕۆکەکانیانەوە[٣١]. بروسکەیەکی تایبەتیی سەرپەرشتکاری کەرکوک کە ڕۆژی بیستی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٥ ناردوویە بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆو نوێنەری باڵاو بنکەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق باسی **«هێزێکی گەورەی دوژمن»** دەکات کە پۆلیسی کفریی ناچار کردووە لە شار دەرچن[٣٢].

پاش چوار ڕۆژ بروسکەیەکی تر باسی ئەوە دەکات چۆن شۆڕشگێڕان هێلی تەلەفۆنی نێوان کەرکوک چەمچەماڵیان بڕیوە[٣٣]. ژمارەیەکی زۆر لە بروسکەکانی سەرپەرشتکاری کەرکوک باسی ئەو دەردەسەرییە دەکەن کە لەو ڕۆژانەدا قافڵەیەکی گەورەی چەک و تفاقی لەشکر دووچاری بووە، چۆن سوارەی شێخ هەرکە لە شار دەرچووە داویانە بە سەریاو چەند ڕۆژێک لە ڕێگا گیریان کردووەو دوای مەینەتییەکی زۆر بە یاریدەی فڕۆکە دەرباز بووە[٣٤]. سەیر ئەوەیە جاروبار

---

(٣٠) هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

(31) P.R.O.,Air 23/207, Part18,X/M4583,From Admintor Kirkuk to Interior, Highcom., Aviation and Special Sulaimani, Ref.K/525, date 4.9.1925.

(32) Ibid, From Admintor Kirkuk to Interior, Highcom., Aviation and Special Sulaimani,Ref.K/513,Date20-9-1925.

(33) Ibid, To Aviation, From Defalis Cavtwo, Kirkuk, Prefix D,Ref.2275,Date24.9.1925.

(34) Ibid, To Interior, Highcom., Aviation,Defence, Baghdad, Special Sulai-

لایەنگرانی شێخ مەحمود لەو ناوانەدا بە جلوبەرگی خاکییەوە دەبینران[٣٥].
هەڵبەت ئەوە نیشانەی زیاتر ڕێکخستنی ریزەکانی شۆڕشگێڕانە. ژمارەیەک لە هۆزەکانی نزیک کانە نەوتەکان کۆدە(باج)یان دەدایە شێخ مەحمود نەک میری[٣٦].کار گەیشت بەوەی سابیری کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند ئاگاداری تایبەتی بە ناو دانیشتووانی قەرەحەسەن و گوندەکانی دەوروبەریدا بلاو بکاتەوە. سەرپەرشتکاری کەرکوک ئێدمۆندس ڕۆژی ٢٠ی ئەیلولی ساڵی١٩٢٥ دەقی ناوەڕۆکی ئەو ئاگادارییەی ناردووە بۆ ڕاوێژکاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆ کۆرۆنوالیس و وێنەی داوە بە سکرتێری هێنری دۆبسی نوێنەری باڵا لە بەغدا.
سەرەتای ئاگاداریەکە بەم جۆرەیە:

**«بۆ گشت دانیشتوانی قەرە حەسەن. ئاگادارتان دەکەم کە من سابیر بەگی کوڕی کەریمی فەتاح بەگم، لە لایەن مەلیکی کوردستانەوە نێردراوم. ئەو هێزەی لە گەڵمدایە بریتییە لە ٣٠٠سوارە، لە هیچ مەترسن، من بۆ کۆکردنەوەی کۆدە-باج- هاتووم».**

لە کۆتاییشدا دەڵێ: **«ئەم ڕاگەیاننەم گونداو گوند بنێرن تا دەگاتە کەرکوک. ئیمزا: محەمەد سابیر، فەرماندەی بەتالیۆنی کوردستان»**[٣٧].

لە هەمووی پڕ ماناتر ئەوەیە کە مەجید یەعقوبی نامەیەکی هەڕەشەی تایبەتیی لە کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەندو سەید ئەحمەدی جەبارییەوە بۆ هاتووە کە تیایدا ئاگاداریان کردووە بێتو شار بەجێ نەهێڵێ ئەیکوژن. مەجید یەعقوبی لە تاوا بە خاوو خێزانەوە ڕۆژی ٢١ی ئەیلولی ساڵی١٩٢٥ کەرکوکی بەجێهێشت و بە پەلە پرۆزکێ گەیشتە بەغدا[٣٨].

---

mani and Special Kirkuk , From Admintor Kirkuk , Prefix D,Ref.K/53,Date26.9.1925;Prefix D, Ref,.O/625,Date26.9.1925. (35) Ibid, From Admintor Kirkuk to Interior...,No.K.528,Date25.9.1925.

(36) Ibid, From Special Sulaimani to Aviation Baghdad,No.M.398,Date26.9.1925.

(37) Ibid,Confidential,No.K.512/CIA,The Sarai,Kirkuk,20th September1925,To the Adviser to the Ministry of Interior, Baghdad.

(38) Ibid, Extract from Report No .D/21,Dated 22nd September . 1925 received from the Special Service Officer, Baghdad.

ئەم جۆرە هەڵوێستـانە خوێنی کـەریم بەگی فـەتاح بەگی هەمـەوەندو سـابیـری کوڕیان لای ئینگلیز کردە کاسەوە، بە رادەیەک بە تایبەتی بۆ کوشتنیـان بە فڕۆکە کـەوتنە تاقـیـبی هەردووکـیـان. ئەمـە دەقی بروسکەیەکی بنکەی هێزی ئاسـمـانی بەریتـانییە لە سلێمانی کە رۆژی ٢٦ی ئەیلولی ساڵی١٩٢٥ لەو بارەیەوە داویە بە فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە بەغدا:

**«چالاکییەکی فڕۆکەوانی، سەعات پێنج و چل و پێنج دەقیقە بە کاتی ناوخۆ پێنج فڕۆکە[٣٩] چوونە سەر خانەقین و ناوچەی رووباری تانجەرۆ بۆ گەڕان بە دووی کـەریم فەتاح بەگ و سابیردا. هیچ وەدی نەکرا. سـەعـات حەڤدەو نیو بە کـاتی ناوخۆ سێ فڕۆکەی تر چوونە سەر کانی گوڵەو جێشانەو هەزار مێرد دیسان بۆ گەڕان بە دووی کەریم فەتاح بەگ و سابیردا. لە هەزار مێرد سێ ئەسپ بینران، دەسڕێژیان لێکراو یەکێکیان پێوە بوو»**[٤٠].

با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان ، واتە گاڵتـەوگەپ و گەمەکـانی نێوان شێخ مـەحـمـودو فـڕۆکـەوانە ئینگلیـزەکـان. قـۆناغی نوێی پڕ تەوژمی هێـرشی فـڕۆکـە جەنگییەکانی ئینگلیز بۆ سەر لایەنگرانی شێخ مەحمود لە پاییزی ساڵی ١٩٣٠ەوە دەسـتـی پێکرد. دوای راپەڕینەکـەی شـەشی ئەیلولی ئەو سـاڵەی سلێـمـانـی بە مـاوەیەکی کـەم شـێخ هاتەوە مـەیدان. لەو رۆژگـارەدا لەبەر گـەلێک هۆ بزووتنەوەی کـوردایەتی پێـی نابووە ناو قـۆناغـێکی گـرنگەوە، ژمـارەیەک رێکخـراوی نوێ دامـەزرێنرا، لە سـەرانسـەری ناوچەکـانی کـوردسـتـانەوە بە دەیان بروسکە بۆ داوای مافی کورد ئاراستەی بەغداو لەندەن و **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** (عصبة الامم)کرا. بە سەدان بەڵگەنامەی ئینگلیز بۆ ئەو باسە تەرخان کراون.

ئەم دیاردەیە ئینگلیزی تەواو شڵەژاند. بەپێی بەڵگەنامە تایبەتییەکانی خۆیان ئەوان لەوە ترسـابوون بادینان و سۆران دەست بخەنە نـاو دەست و لە یەک کـاتدا بۆ داوای مـافی کـورد راپەڕن، ئەوان ئاگـاداری ئەوە بوون کـە شـێخ مـەحـمـود بۆ ئەو

---

(٣٩) ژمارەی فڕۆکەکان لە بەڵگەنامەکەدا باش دەرنەچووە، لەوانەیە سێ بێ نەک پێنج.

(40) P.R.O.,Air 23/207,Part 18, X/M 4583, To Aviation and Aeroone, From Aeroone Sulaimani, Prefix D, Ref. A/470,Date 26.9.1925.



**دانیشتوو: شێخ ئەحمەدی بارزانی**
**لە راستەوە: لوقمان بارزانی، مستەفا بارزانی، شێخ محەمەد خالید بارزانی، شێخ عوبێدوڵڵا بارزانی**

مەبەستە پێوەندیی بە شێخ ئەحمەدەوە کردووە(٤١)، بۆیەکا کەوتنە پیلان گێران بۆ دورخستنەوەی ئەو دوو مەڵبەندە لە یەکتر. بەڵگەنامەکانی ئەو رۆژگارەی وەزارەتی موستەعمەرات باسی ئەو بڕیارە تایبەتیانە دەکەن کە **«کاربەدەستانی خاوەن پایەو مەقام»** لە بەغدا دەربارەی ئەوە دەریانکردووە کە نابێ بە هیچ جۆر رێگە بدرێ هێزە چەکدارەکانی میری نە لە بەرزان، نە لە پشدەر «تا دیارکردنی سەرنەنجامی شێخ مەحمود دەست بەکار بن»(٤٢).

لەوەیش گرنگتر کاربەدەستە گەورەکانی ئینگلیز لە عیراق بۆ خۆیان رۆژی سیازدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣١ کۆنفرانسێکی تایبەتییان لە بارەگای نوێنەری باڵا لە بەغدا ساز کرد بۆ لێکۆڵینەوە لەو رێبازەی دەبێ بۆ دامرکاندنەوەی

---

(41) P.R.O.,C.O.,730,163/88069, X/M 08533, 1931, Shaikh Mahmud Part 1, Extract from Intelligence Summary No.30, Northern and Central Kurdistan, Kurdish Propaganda, Authority S.S.O.,Mosul.

(٤٢) بۆ نموونە بڕوانە: Ibid, No. 15,10 March 1931;No.23,18 March 1931

راپەڕینەکەی شێخ مەحمود بیگرنە بەر. بەشدارانی کۆنفرانسەکە بۆ وەدیهێنانی ئەو مەبەستە حەوت بڕیاری سەرەکییان دەرکرد کە دوانیان، یەکەم و پێنجەمیان، بۆ هەمان مەبەست تەرخان کراون. دەقی بڕیاری یەکەمی کۆنفرانسەکە بەم جۆرەیە:

**«١-بێ ئەندازە پێویستە (urgently necessary) لە ماوەی دوو مانگی داهاتوودا هەموو هەنگاوێکی سیاسی و سەربازی بنرێ بۆ کەمکردنەوەی مەترسی ئەوەی شێخ مەحمود بتوانێ پشتگیریی زیاتر وەدەست بهێنێ، تەبا بەهاری داهاتوو راپەڕینێکی بەرفراوان هەموو کوردستان بگرێتەوە».**

دەقی بڕیاری پێنجەم ئەو مەبەستەی باشتر روون کردۆتەوە:

**«٥-حوکمەتی عیراق دەبێ بزانێ تا مسۆگەرکردنی بێدەنگی شێخ مەحمود حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا رازی نابێ هیچ کارێکی سەربازی دژی شێخی بارزان، یا بۆ مەسەلەی دامەزراندنی دەسەڵاتی میری لە ناوچەی پشدەردا ئەنجام بدرێ»**[٤٣].

هەڵبەت کارێکی لەو جۆرە دەبووە هۆی ئەوەی ئەو دوو مەڵبەندە بەهێزە بدەنە پاڵ شێخ مەحمودو بەو جۆرە ئەوەی ئینگلیز لێی دەترسان دەقەوما، واتە راپەڕینێکی سەرانسەری لە هەموو کوردستانی باشووردا بەهاری ساڵی١٩٣١ بەرپا دەبوو.

فڕۆکە جەنگییەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا لە عیراق رۆڵی یەکەمیان بینی لەو نەخشە وردەی ئینگلیزداو لە دامرکاندنەوەی دوا قۆناغی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمودا کە، وەک وتمان، لە دوای شەشی رەشی ئەیلولەوە دەستی پێکرد. ژمارەیەکی یەکجار زۆر بەڵگەی سەیرو هەمەچەشنە بۆ سەلماندنی ئەم راستییە مێژووییە بە دەستەوەن، وا لێرەدا نموونەی ژمارەیەکی کەمیان دەخەینە بەرچاو.

با هەر بە کۆنفرانسەکەی رۆژی سیازدەی کانوونی دووەمی ساڵی١٩٣١ خۆی دەست پێ بکەین. لەو کۆنفرانسە باڵایەدا جگە لە سێر هەمفریزی نوێنەری باڵا نۆ کاربەدەستی گەورەی تری ئینگلیز بەشدارییان تێیدا کرد، پێنجیان، واتە لە

---

(43) Ibid , Conculusions of a Conference held at the Residency on 13th January, 1931.

نیوەیان زیاتر نوێنەری هێزی ئاسمانی بەریتانیا بوون لە عیراق، یەکەمیان خودی سەرکردەی ئەو هێزە بوو، ئەوانیتریان بریتی بوون لە سەرپۆل **(قائد السرب)** بەرێنت و سەرپۆل کۆرتنی و جەنەراڵ براون و کاپتەن رید. بەرێنت و کۆرتنی، وەک دواییش باسی دەکەین، لەو فرۆکەوانانەن کە حەشریان بە کورد کرد. شایانی باسە سێر کێنهان کۆرۆنوالیس کە دوایی تا ساڵی۱۹۳۵ بووە راوێژکاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆو پاش ماوەیەکیش بووە بەناوبانگترین باڵوێزی بەریتانی لە عیراق یەکێک بوو لە بەشدارانی ئەو کۆنفرانسە.

شێخ مەحمود ملی نەدا، پێی لەسەر دابین کردنی مافە رەواکانی کورد داگرت. لە وەڵامدا بۆمباهاوێژەکانی ئینگلیز گاڵەیەکیان بە کورد کرد کە تا ئەو رۆژە، بێ کەم و زۆر ، مێژووی گەلان لە وێنەی بە خۆیەوە نەدیبوو. هەرچەندە سەرەتا بڕیار وابوو تا بەهار دادێ و کەش وهەوا خۆش دەبێ ئینگلیز فرۆکە نەنێرێتە سەر لایەنگرانی شێخ، بەڵام وا پێ دەچێ دانیان بە خۆیاندا نەگرت و گەلێک لەوەی بڕیار بوو زووتر دوا مۆدیلی بۆمباهاوێژە کەم وێنەکانیان لە جیهاندا بەردایە گیانی کوردو خاکی کوردستان. هەر لە سەرەتاشەوە جاروبار، نەک هەمیشە، دەستیان لە خەڵکی شەڕ نەکەریش نە دەپاراست. بەپێی بەڵگەنامەکانی خۆیان هێشتا چلەی زستان بوو کاتێک فرۆکە جەنگییەکانیان تەنها رۆژی ٢٤ی کانوونی دووەمی ساڵی۱۹۳۱ لە دوو جێگە پەلاماری هێزەکانی شێخ مەحمودیان داو بۆمباکانیان بوونە هۆی کوشتنی چەکدارێک و بریندار بوونی شەش چەکداریتر، وێرای بریندار بوونی پێنج کەسی بێ لایەن لە دانیشتوانی یەکێک لە گوندەکانی ناوچەکە(٤٤). هەر لەوساوە ئینگلیزەکان ژمارەیەکی زۆر فرۆکەیان لە پۆلی سی و پەنجاو پێنج لە کەرکوک و سلێمانی و هەڵەبجە بۆ لێدانی لایەنگرانی شێخ مەحمود تەرخان کرد(٤٥). رۆژی شەشی کانوونی دووەمی ساڵی۱۹۳۱ شێخ مەحمود نامەیەکی تایبەتیی ئاراستەی نوێنەری باڵا کرد لە بەغدا کە تێیدا **«ناڕەزایی خۆی بەرانبەر بە بەکارهێنانی**

(44) Ibid, Extract from Summary of Intelligence, Dated 28th January, 1931, Southern Kurdistan, No. 15,Shaikh Mahmud.

(45) Ibid, Secret, Paraphrase,A.M.120,Cipher Telegram form Headquarters, R.A.F. Iraq, To Air Ministry, February 5th,1931,Southern Kurdistan.

**فرۆکەی ئینگلیز دژی کورد دەربڕیبوو».**

فایله تایبەتییەکانی وەزارەتی موستەعمەرات و هەندەران و هێزی ئاسمانیی بەریتانیا بە نمونەی لەو بابەتەی هێرشی فرۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز ئاخنراون کە دەتوانین گەلێکیان لێ بخەینە بەرچاو، بەڵام کورد واتەنی مشتێک نمونەی خەروارێکە، لەو مشتەش بە تایبەتی ئەم بروسکەیەی نوێنەری باڵا هەڵدەبژێرم کە رۆژی ٩ی مارتی١٩٣١ ناردوویە بۆ وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن. دەقی ناوەرۆکی بروسکەکە بەم جۆرەیە:

**«بروسکە لە نوێنەری باڵاوە لە عیراق بۆ وەزیری موستەعمەرات. رۆژی ٩ی مارتی١٩٣١ . کاتی گەیشتن (بە لەندەن) سەعات ٤,٥ی پاش نیوەڕۆی ١٠ی مارتی ١٩٣١ . ژمارە ١٣٢ . کاتێک فرۆکەکانی هێزی ئاسمانی پاشایی (مەلەکی)بە کاری پشکنینەوە خەریک بوون، لە ناوچەیەکدا کە ٢٠میل لە باشووری رۆژهەڵاتی سلێمانییەوە دوورە بەر دەستڕێژی یاخیگەران کەوتن، فرۆکەکانیش لە ئاسمانەوە لێیان هاتنە دەست و چوار هەزار گوللە رەشاش و ٢٥بۆمبایان تێ گرتن. ژمارەی یاخیگەرەکان خۆی لە ٤٠٠ سوارە دەدا کە سەرجەمیان بڵاوەیان لێ کرد. بەپێی ئەو راپۆرتانەی پێمان گەیشتوون چەند زیانێکیان لێ کەوتووە. دەڵێن شێخ مەحمود بۆ خۆی لەگەڵ ئەو تاقمەدا بووە. رۆژی ٩ی مارتیش ٥ میل لەولای قەرەداغەوە پێکادانێکیتر لە ئاسمانەوە لەگەڵ دەستەیەک سوارەی تردا رووی دا کە ژمارەیان ٨٠ کەس دەبوو. لەبەر ئەوەی لەوانەیە هۆزی جاف مەیلی هەبێ بداتە پاڵ شێخ مەحمود رۆژی ٨ی مارت بە فرۆکە بەیاننامەی تایبەتی بەسەر ئەندامانی ئەو هۆزەدا بڵاوکرایەوە کە تێیدا هەڕەشەمان لێ کردوون نەکەن بدەنە پاڵ شێخ مەحمود»**(٤٦).

ناوەرۆکی ئەم بروسکەیە بە تەنها بۆی هەیە مەبەستی گشت لایەنە سەرەکییەکانی باسەکانمان بۆ روون بکاتەوە، بە تایبەت بەرفراوانی راپەڕینەکەی شێخ مەحمودو ئازایی لایەنگرانی و لە سەروو هەمووشیانەوە رۆڵی گەورەی هێزی

(46) Ibid, Telegram from the High Commissioner of Iraq to the Secretary of State for the Colonies, Dated 9March , 1931.

ئاسمانی بەریتانی لە لێدانی ئەو راپەڕینەو سەرکوت کردنی کوردا.

فـشـاری فـڕۆکـەکـانی ئینگلیـزو هێـزەکـانی مـیـری رادەی بۆ تەشـەنەسـەندنی راپەڕینەکەی شێخ مـەحـمـود دانەنا ، لە سـەرەتای بەهارەوە ئاگری ئەو راپەڕینە بە جۆرێکی بەرفـراوان گـەیشـتـە دەورووبەری خـانەقـینیش. لێـرە، بەپێی گـێـڕانەوەی بەڵگەنامـەکـانی ئینـگلیـز، هۆزی شـەرەف بەیانی و **«کـۆمـەڵەی پاراسـتـنی مـافی کـوردان»** دەوری گـەورەیان دەبینی. جـاف و هەمـەوەندی دەوروبەری کـەرکـوکـیش بە جارێک خرۆشابوون(٤٧).

لەو بارودۆخەدا دەبوو بۆمباهاوێژەکانی ئینگلیز گورزی توندتر لە شۆڕشگێڕانی کورد بووەشێنن. لێرەشدا تاکە بەڵگەیەکی ئینگلیـزەکان خۆیان دێنمەوە. ئێوارەی رۆژی بیست و دووی مارتی ساڵی١٩٣١ گەورە لێپرسراوانی ئینگلیز لە عێراق بە رابەری نوێنەری باڵا سێر فرانسێس هەمفرێز کۆنفرانسێکی تایبەتیتریان ساز کرد. بەڵگەنامەیەکی نهێنی وەزارەتی موستەعمەرات باسی ئەو کۆنفرانسەی وا بۆ تۆمار کردووین:

**«ئێـوارەی رۆژی بیـست و دووی مـارت لە بارەگـای نوێنەری باڵا (لە بەغـدا) کۆنفـرانسێک سازکرا کە تیایدا ، بە نیازی بەربەست کردنی تەشەنەسەندنی ئەو بزووتنەوەیەی شێخ مەحمود رابەریی دەکات و بۆ ئەوەی نەهێڵرێ یاخی بووان لەگەڵ نزیک کـەوتنەوەی فڕۆکەکاندا پەنا بەرنە بەر گوندەکـان، بڕیار درا فڕۆکە دژی ئەو گوندانە بەکـار بهێنرێ کە داڵدەی یاخـییەکـان دەدەن. بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە بڕیاردرا بە فڕۆکە بەیاننامە بەسەر ئەو گوندانەدا بڵاوبکرێتەوە کە کەوتوونەتە ناوچە یاخـییـەکـانەوەو پێـیـان رابگەیەنرێ ئەو گـوندانەی داڵدەی شـێخ مـەحـمـود، یا لایەنگرانی دەدەن خۆیان مـوعـەرەزی بۆمباباران ئەکەن دوای نیو سەعـات لەوەی کە لە ئاسمانەوە ئاگاداریی‌یان بەسـەردا بڵاو دەکرێتەوە. ناوەرۆکی ئەم ئاگاداریی‌یەش بەم جۆرەی لای خوارەوە دیار کرا:**

**١- لەبەر ئەوەی شێخ مەحمودو لایەنگرانی بە یاخی بوون تاوانبار کراون لەمەودوا**

(47) Ibid, Extract from Intelligence Report No.6,d/d 18 March, 1931, 129 Kirkuk; Extract from Intelligence Report No. 7,Dated 1st April, 1931, Par. 161 and 163-164.

**ئەو گوندانەی داڵدەی خۆی، یان لایەنگرانی ئەدەن خۆیان موعەرەزی بۆمباباران ئەکەن دوای نیو سەعات لەوەی لە ئاسمانەوە ئاگادار ئەکرێن.**

**٢- لەبەر ئەوەی ئاگادارکران ئەو گوندانەی داڵدەی یاخی بووانیان داوە بۆمباباران دەکرێن، وا پێتان رادەگەیێنین کە پاش نیو سەعاتی تر گوندەکەتان بۆمباباران دەکرێ.**

**دوایی دەقی ناوەرۆکی خاڵی دووەمی ئاگادارییەکەمان گۆڕی و وەک لای خوارەوەمان لێ کرد:**

**گوندەکەتان پاش نیو سەعاتی تر بۆمباباران ئەکرێ، لەبەر ئەوە نەسیحەتتان ئەکەین کە هەمووتان بە پیرو پیرێژن و منداڵەوە بەر لەوەی بۆمبابارانەکە دەست پێ بکات گوندەکەتان جێبهێڵن»**(٤٨).

فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز دەست و برد، بە جۆرێکی بەرفراوان کەوتنە جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی ئەو کۆنفرانسە. لێرەشدا چەند نمونەیەکی کەم دەخەمە بەرچاو. لە یەکەم رۆژی دوای کۆنفرانسەکەوە، واتە لە رۆژی بیست و سێی مارتەوە، بۆمباهاوێژەکانی ئینگلیز بۆ ماوەی چەند رۆژێک لەسەر یەک کەوتنە گیانی گوندو شارۆچکەکانی دەوروبەری خانەقین، بە تایبەتی هۆرین و شێخان و کانی کرمانج و شاهوازی و باخ هەنارو بێلولەو قۆرەتوو گوندەکانی عوسمان بەگی سەرەک هۆزی شەرەف بەیانی و چیای سورخ و ناوچەکانی سەر رووباری عەبباسیان. ژمارەیەک لەو گوندانە کاول کران، بە لایەنی کەمەوە سێ کەسیش لەوانە کوژران کە وا دیارە لەبەر هەر هۆیەک بووبێ وەک خەڵکەکەی تر گوندەکانیان بەجێ نەهێشتووە. رۆژی سیی مارتیش ژمارەیەک لەو گوندانە بۆمباباران کران کە کەوتوونەتە باشووری دامێنی زنجیرە چیای قەرەداغەوە. بەپێی گێڕانەوەی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز خۆیان فڕۆکەکانیان بە تەنها ئەو رۆژە ٩٩ بۆمبی ٢٠ پاوەنی و ٥٢٠٠ گوللە رەشاشیان گرتۆتە تەنها سیان لەو گوندانەی باشووری قەرەداغ. هەر لەو رۆژانەدا کنگرەبانیش کرایە بنکەیەکیتری فڕۆکە جەنگییەکانی

---

(48) Ibid, Extract from Intelligence Report No. 7, Dated 1st April 1931, No. 162.

ئینگلیز[٤٩].

ئەمانەش زۆر دادی ئینگلیزو میرییان نەدا. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە چەند برێک لەو راپۆرتە دوورودرێژە تایبەتییە دێنمەوە کە سەرکردەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق دەربارەی راپەڕینەکەی ئەو رۆژگارەی شێخ مەحمود دایناوە. ئەو بەشەی راپۆرتەکە باسی ئاڵوگۆڕەکانی بەهاری ساڵی ١٩٣١ی راپەڕینەکە بەم جۆرە دەکات:

**«لەگەڵ ئەو هەموو کارانەشدا** (واتە کاری بەردەوامی فڕۆکەو لەشکر- ک.م) **هێشتا بارودۆخەکە زۆر ئاڵۆز بوو، بە رادەیەکی ترسناک کڵپەی سەندبوو. شێخ مەحمود هەموو توانای بۆ بڵاوکردنەوەو پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆی بەکارهێنا. لە راستیشدا چەند بەڵگەیەک لە ئارادا بوون دەربارەی ئەوەی کۆششەکەی لە پتر لە ناوچەیەک بە فیڕۆ نەچوو بوو. دیاردەی زۆر هەبوو وایان دەردەخست کە وا خەریکە بارودۆخەکە بە لای باشیدا بۆ ئەو بشکێتەوە. مەترسیی راستەقینە خۆی نواند، خەریک بوو شۆڕش بڵاو بێتەوەو پەرە بسێنێ بۆ شتێکی ترسناکتر لەوەی بریتی بێ تەنها لە چالاکی پەرەوازەی دەستەیەکی بچوکی یاخی بوو لەناو شاخەکانی ئەودیوی سلێمانیدا»**[٥٠].

بەرفراوانی راپەڕینی نوێی شێخ مەحمود گەیشتە رادەیەک رۆژی ٢٨ی مارتی ١٩٣١ سەعد سالحی بەناوبانگ[٥١] لەناو هۆڵی پەرلەماندا هاواری لێ هەڵسێ و بڵێ:

**«بەر لە هەر شتێکیتر دەبێ لە دەست شێخ مەحمود قوتار بین، ئەگەر دەرەقەتی نایەین ئەوا پێویستە سەربەخۆیی بدەینێ، ئەگەر دەرەقەتیشی دێین ئەوا پێویستە**

---

(49) Ibid, No. 163-166.

(50) P.R.O.,C.O.,730, 163/88069, Part II, X/M 08533,1931 Iraq, Shaikh Mahmud, Report by the Air Officer Commanding Iraq Command on the Operations in Southern Kurdistan against Shaikh Mahmud from October, 1930-May, 1931,P.15.

(٥١) سەعد سالح نیشتمانپەروەرێکی هێوەر بوو، تەنها لە مەسەلەی کوردا توندڕەو بوو، ئەوساکە نوێنەری دیوانییە بوو، شوباتی ساڵی ١٩٤٦ لە دووەم کابینەی تۆفیق سوێدیدا بووە وەزیری کاروباری ناوخۆ.



مەحمود خانی دزلی

**یەکجارەکی لە ناوی بەرین... ئەمە مەسەلەی ژیانی وڵاتە، یا دەبێ بتوانین شێخ مەحمود لەناو بەرین، یا دەبێ ئەو مافانەی پێ بدەین کە داوایان دەکات»**[٥٢].

بەو جۆرە راپەڕینەکەی ئەمجارەی شێخ مەحمود تا دەهات زیاتر پەرەی دەسەند. تاڵەبانییەکانیش لەگەڵی رێک کەوتن[٥٣]. بە پێی قسەی یەکێک لە پەرلەمانتارەکان لەو رۆژانەدا شێخ مەحمود ببووە **«مەسەلەیە کە هیچ مەسەلەیەک لەوگەورەتر نەبوو»**[٥٤]. لەبەر ئەوە پێویست بوو لە هەموو لایەک فشاری بخەنە سەرو هیچ دەرفەتێک بۆ خۆی و لایەنگرانی نەهێڵنەوە. لەو قۆناغەی بزووتنەوەکەیاندا، وەک زۆر قۆناغی تری رابردووی ئەو بزووتنەوانە، کوردستانی ئێران و بە تایبەتی دزڵی و بانەیی بووبوونە یەکێک لە هۆ سەرەکییەکانی هێزو توانای شێخ مەحمود. کەوابێ دامرکاندنەوەی راپەڕینی نوێی کورد پێویستی بە هاریکاری ئێرانی رەزاشاش هەبوو. مەلیک فەیسەڵ بۆ خۆی داوای لە تاران کرد

(٥٢) «الحكومة العراقية. محاضر مجلس النواب. الدورة الانتخابية الثالثة. الجلسة الثامنة والاربعون المنعقدة صباح يوم السبت المصادف ٢٨ آذار سنة ١٩٣١»، بغداد، بلا، ص٦٧٣.

(٥٣) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە: دوکتۆر مکرم تاڵەبانی، شەڕی ئاوباریک بۆچ شکستی هێنا؟، «رەنگین» (گۆڤار)، بەغدا، ژمارە ٦٨، ساڵی ١٩٩٤، ل١٠-١١.

(٥٤) «محاضر مجلس النواب. الدورة الانتخابية الثالثة»، ص٦٧٥.

کۆبونەوەیەکی هاوبەش لە نێوان هەردوولادا ساز بکرێ بۆ ڕێکخستنی هاریکاری سەربازی دژی شێخ مەحمودو مەحمود خانی دزڵی، هەمان کات داواشی لە ئینگلیزەکان کرد پشتیوانی لەو کۆششەی بکەن[55].

ئینگلیزەکان لەم بوارەشدا درێغییان نەکرد. بە وێنە هەر ئەوەندە زانییان شێخ مەحمود نیازییە جێژنی قوربان لە پیران بەرێتە سەر یەکسەر بە **«بروسکەیەکی گرنگ»** ڕۆژی ٢٤ی نیسانی ١٩٣١تارانییان ئاگادار کرد[56]. کاتێکیش تاران ڕازی بوو ئەو کۆبونەوەیەی مەلیک فەیسەڵ داوای کردبوو بکرێ بە پێی ڕاوێژی ئینگلیزەکان وەفدی هاوبەشی عیراق و ئینگلیز بە فڕۆکەی تایبەتیی مەلیک خۆی چووە ئێران. ئێرانییەکان بە گەرمی پێشوازییان لە پێشنیارەکەی مەلیک فەیسەڵ کرد. بەڵگەنامەکانی ئینگلیز پوختەی ئەم کارەیان بەم جۆرە بۆ تۆمار کردوین:

**«ئێرانییەکان دەستوبرد بە سەر ڕاستی بە دەنگ ئەم داوایەوە هاتن، بەوە قایل بوون پیکرا هاریکاریی دژی یاخی گەرانی(کورد) بکەن. پێشنیار کرا کۆبوونەوەکە لە مەریوان بکرێ چونکە لەوێ دەتوانرێ شوێنی لەبار بۆ نیشتنەوەی فڕۆکە ئامادە بکەن. مەریوان ٤٢ میل لەولای ڕۆژهەڵاتی سلێمانییەوەیەو ١٠میلیش لە سنوورەوە دوورە»**[57].

بەو جۆرە ئێران بووە فاکتەرێکی کاریگەری نوێ دژی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحمود. هەمان کات پەرلەمان بە گەرمی خەریکی لێکۆڵینەوە بوو بۆ تەرخان کردنی خەرجی نوێ بۆ کاروباری سەربازی دژی شێخ مەحمود[58]. لەگەڵ دەست پێکردنی وەرزی بەهاردا فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیزیش توانای دەست وەشاندنیان لە جاران زۆر زیاتر بوو.

---

(55) P.R.O.,C.O.,730, 163/88069,X/M08533 , 1931,Shaikh Mahmud,Part I, Telegram from High Commissioner, Baghadad to H.B.M. s Minister , Tehran, No. 23, Dated 23rd April,1931.

(56) Ibid, Telegram, Code-Important, from High Commissioner, Baghdad to Minister, Tehran, No.23,Dated 24.4.1931

(57) Ibid, Shaikh Mahmud, Part II, Report by the Air Officer Commanding Iraq Command on the Operations in Southern Kurdistan against Shaikh Mahmud from October, 1930 - May,1931,No.101.

(٥٨) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە: **«محاضر مجلس النواب. الدورة الانتخابية الثالثة»**،ص٦٧٢-٦٧٧.

شێخ مەحمود ئاگای لە بەشی زۆری ئەم کەین و بەینانە نەبوو، دڵنیا بوون لە پشتگیری جاف و هەمەوەندو تاڵەبانی و زەنگەنەو جەباری پاڵی پێوە نا روو بکاتە ناو جەرگەی گەرمیان بەو نیازەی لەوێ گورزی توندتر لە دوژمن بووەشێنێ. ئەم بڕیارە لە دەستیا شکایەوە. فڕۆکەکانی ئینگلیز هەنگاو بە هەنگاو تاقیبیان دەکرد، بە پێی زانیارییەکانی ئەوان لەشکری میری خۆی بۆ شەڕی گەورەی داهاتوو ئامادە ئەکرد.

ئەو شەڕە رۆژی پێنجی نیسانی ساڵی١٩٣١ لە ئاوباریک قەوما کە هەمووی بەسەر یەکەوە ٢٠ میل لە دوزخورماتووەوە دوورە. باس و خواس و بەسەرهات و ئەنجامەکانی ئەو شەڕە وتارێکی گەورەی سەربەخۆیان پێ دەوێ. ئەوەی من مەبەستمە رۆڵی فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیزە لە ئاوباریک.

هەر لە سەرەتاوە دەڵێم بۆمباکانی ئەو فڕۆکانە سەر ئەنجامی ئاوباریکیان دیار کرد. بەلایەنی کەمەوە هەزارو یەک بەڵگەی جۆراوجۆر لەناو فایلە تایبەتییەکاندا دەربارەی ئەو راستییە بەرچاو دەکەوێ. لێرەشدا چەند نمونەیەکی هەڵبژاردەی کەم دێنمەوە.

رۆژی چواری نیسان فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا لە عیراق بەوەیان زانی کە شێخ مەحمود گەیشتۆتە گوندی ئاوباریک، هەر ئەوان یەکسەر بنکەی گۆگتەپەیان لەوە ئاگادار کرد تا هێزەکانی میری بێ دواکەوتن روو بکەنە ئاوباریک. لەوساشەوە ئەو فڕۆکانە ئاسمانی ناوچەکەیان بەرنەدا نەبا بەر لە گەیشتنی هێزەکانی میری شێخ مەحمودو هێزەکانی بتوانن بکشێنەوە. ئینگلیزەکان لەم بارەیەوە بۆ خۆیان دەڵێن:

**«لە ئاوباریک بە بۆمباباران و دەسڕێژی بێ وچانی هێزی ئاسمانی مەلەکی دوژمن لە شوێنی خۆیدا راگیرا»** تا سەعات چواری لای ئێوارە هێزەکانی میری گەیشتنەجێ. ئەو هێزانە **«هێرشێکی ئازایانەیان بردو زیانی گەورەیان لێ کەوت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی هەموو گوندی ئاوباریک بگرن». «هەردوو هێزەکەی میری لە بەرانبەر دوژمنێکی چەکداردا کە خۆی لە سەنگەری چاکدا مەڵاس دابوو، ئازایانە دەجەنگی، تەواو لاواز بوون، بۆیەکا دوژمن کە شەو داهات توانی خۆی**

**قوتار بکات»**. لەگەڵ ئەوەش، وەک راپۆرتی ئینگلیزەکان دەڵێ، شەڕی ئەو رۆژە **«وورەی یاخی بوانی (کوردی)تەواو هەڵتەکاند، چونکە هێزی ئاسمان مەلەکی بە توندی و بێ بەزەیی بۆمباباراانی دەکردن»**[٥٩].

فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق لە راپۆرتە دوورودرێژەکەی خۆیدا دەربارەی بزووتنەوکانی شێخ مەحمود لە پایزی ساڵی ١٩٣٠ەوە چەند لاپەڕەیەکی بۆ شەڕی ئاوباریک تەرخان کردووە کە تێیاندا بە وردی وێنەیەکی پانۆراما ئاسایی گەلێک لایەنی ئەو شەڕەی بە ژمارەو ناوەوە بۆ کێشاوین. بەشی زۆری ئەو لاپەڕانە باسی چالاکیی فڕۆکەکانی ئینگلیز دەکەن کە ئەمە پوختەیانە:

**«فەرمان درایە دەستەیەک(رف) لە فڕۆکەکانی پۆلی ٣٠ی بۆمباهاوێژ لە کنگرەبان بە رابەری فڕۆکەوان ا.ب. لیچمر بە درێژایی رۆژ بە هۆی بێ تەلی نزیکەوە پێوەندی بە هێزە پیادەکانی میرییەوە بکات. هەمان کات فەرمانیش درایە دەستەیەک لە فڕۆکەکانی پۆلی ٥٥ی بۆمباهاوێژ لە سلێمانی کە ئەوانیش بە درێژایی رۆژ تاقیبی جموجۆڵی شێخ مەحمود بکەن»**. بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستە **«پێویست بوو ئەو فڕۆکانە بێ وچان (بە نۆرە) بە ئاسمانەوە بەسەر یاخییەکانەوە بن لەو ساتەی دەیاندۆزنەوە»**. فەرمانیش درایە **«دەستەی ژمارە دووی فڕۆکەکانی پۆلی ٥٥ی بۆمباهاوێژ وەک هێزێکی دەسوەشێن ئامادە بن و هەر کە هەواڵیان لە رێگەی بێ تەلەوە پێ گەیشت ئەوانیش دەست بەکاربن»**. رۆژی پێنجی نیسان **«فڕۆکەوان گ.گاردنەر کە لەگەڵ هێزە دەسوەشێنەکەی خۆیدا لە سلێمانییەوە فڕی بوو دەوروبەری ٦٠ تا ١٠٠ لە یاخییەکان و ژمارەیەک وڵاخی قەڵتاغ کراوی لەناو دارو درەخت و جۆگەلەکانی باشووری ئاوباریکدا بەدی کرد، دەستوبرد هێرشی بردە سەریان، کە بۆمباو گوللەکانی فڕۆکەکانی تەواو بوون فەرمانی دا یەکێک لە فڕۆکەوانەکان بگەڕێتەوە سلێمانی بۆ راگەیاندنی هەواڵەکە. خۆیشی (لەگەڵ هاوەڵەکانی) هەر بە ئاسمانەوە مایەوە تا یاخییەکان نەتوانن لە شوێنی خۆیان بجوڵێن. هێزەکانی میری کە نزیک کەوتبوونەوە بە وردی لە شوێنی یاخییەکان**

(59) P.R.O., C.O.,730,163/88069,X/M08533, 1931, Shaikh Mahmud, Part II,No.26,Action Awbarik.

ئاگادار کران. گشت فرۆکە بۆمباهاوێژەکانی هەردووک پۆلی ٥٥و٣٠ بە درێژایی دوا سەعاتەکانی ئەو رۆژە خەریکی بۆمباباران بوون، هەر کە بەنزین یا تفاقیان تەواو دەبوو بە پەلەو بێ دواخستن پڕ چەک و سووتەمەنی دەکرانەوە، هەمیشە بەلای کەمەوە فرۆکەیەک بەسەر سەری یاخییەکانەوە دەمایەوە. بەو جۆرە یاخییەکان خۆیان لە باروودۆخێکی ترسناکدا دییەوە. کە فرۆکەکان هێرشیان دەکردە سەریان ئەوانیش لە خوارەوە بە خەستی دەسڕێژیان لێدەکردن. گوللەیەک تانکی فرۆکەکەی گاردنەری کوتاودڕ کرد، بەلام گاردنەر توانی لە دووری چەند میلێک لەولای باشووری رۆژهەلاتی دوزخورماتووەوە بێ زیان بنیشێتەوە».

راپۆرتەکە لەسەری دەڕواو دەڵێ: «ژمارەیەک لە یاخییەکان خۆیان لە بەشی خوارووی گوندەکە قایم کردبوو، بەشێکی تریان پەنایان بردە بەر ئەو دۆڵە قووڵەی کەوتۆتە لای رۆژهەلاتی گوندەکەوە. بەلام چ ئاوباریک و چ ئەو دۆڵە بێ وچان بەپێی توانا لە ئاسمانەوە بە خەستی دەسڕێژیان لێ دەکرا، بە رادەیەک بە درێژایی ئەو رۆژە هیچ دەرفەتێکی هەڵهاتن بۆ یاخییەکان نەمابۆوە. بە نیازی کەلک وەرگرتنی تەواو لەم هەلە رەخساوەو بۆ دەست وەشاندنێکی توندوتۆڵ لە یاخییەکان دەوروبەری سەعات ١٣فەرمانم دا دەستەیەک لە فرۆکەکانی پۆلی ژمارە٧٠ کە هەم بۆمباهاوێژو هەم راگوێزەرن، بە بۆمبا بار بکرێن، دەستوبرد بێ دواکەوتن روو بکەنە شەرگەی ئاوباریک تا ئەوانیش لە هێرشەکەدا بەشدار بن.

بە داخەوە بە هۆی هەڵەیەکی ناچاوەڕوانەوە فرۆکەکانی پۆلی ژمارە٧٠ تا درەنگانێ نەگەیشتنە ئاوباریک، ئەوساش ئیتر نەدەتوانرا نیشانەکان بە وردی دەستنیشان بکرێن و لە ترسی پێوە بوونی هێزی پیادەکانی میری فەرمان درایە ئەو فرۆکانە لە کنگرەبان بنیشنەوە تا سبەی رۆژ هەڵدێ، بەلام ئەوان بەو شەوە موراقەبەی کشانەوەی یاخییەکانیان نەکرد، هەرچەندە لەم هەوڵەیاندا سەرکەوتوو نەبوون. بۆ رۆژی داهاتوو ئەوانیش کەوتنە راونانیان»[٦٠].

بە پێی راگەیاندنی بەیاننامەی میری ژمارەی ئەو کوردانەی لە شەڕی ئاوباریکدا

---

(60) Ibid, Report by the Air Officer Commanding Iraq, Command on the Operations in South Kurdistan against Shaikh Mahmud from October, 1930-May,1931, No.92-93.

کـوژران ٣٧ کـەس بوو[٦١]، هەڵبـەت ژمـارەی بریندارەکـانیـان لەوەیش زیـاتر بووە، دوور نییە ژمارەی کوژراوەکانیش لەوە تێپەڕیبێ کە میری رایگەیاند. هەرچۆن بێ یەکـێک لە بەڵگەنامـەکـانی ئینگلیـز راسـتـەوخـۆ دانی بەوەدا ناوە کـە تەقـریبـەن سەرجەمی کوژراوەکانی کورد لە ئاوباریک **«بە گوللەی رەشاشی فرۆکە لە ئاسمانەوە پێکراون»**[٦٢]. بەرانبـەر بەوە لە سـایەی فـرۆکـەکـانی ئینگلیـزدا زیانی هێـزە چەکدارەکانی میری یەکجار کەم بوو-٦ کوژراوو ١٨بریندار[٦٣]، لە کاتێکدا بە پێی یاسـای جـەنگ دەبوو زیانی ئەوان زۆر لە زیانی شـۆڕشگێـڕان زیاتر بووایە، چونکە ئەوان هێرشیان دەهێناو ئەمان لە سەنگەری چاکدا بەرگرییان دەکرد.

دوای ئاوباریک فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز دەستیان لە شۆڕشگێڕانی کورد هەڵنەگـرت تا بە تەواوی ورەیان پێ بەردان. لەم بارەیەوە دانەری راپۆرتێکی تری ئینگلیزەکان دەربارەی دوا قۆناغی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود نووسیوییە دەڵێ:

**«هەمـان کات فـڕۆکەکانی هێزی ئاسـمانی مـەلەکی هەنگاو بە هەنگاو کەوتنە بۆمبارانی یاخییەکان، هێزە پیادەکانیش بۆ یاریدە بەو خێراییەی سروشتی ناوچەکە بوواری ئەدان پێش ئەکەوتن. لە ئەنجامـدا شێخ مـەحمـود هەناوی کەوت و ورەی لێبرا، زۆربەی لایەنگرانی لێی تەکینەوە، بۆ خۆیشی رۆژی بیست و یەکی نیسـان پەنای بردە بەر ئێـران، شـەوی بیـست و دوو لەسـەر بیـست و سێ چووە پیـران کـە هەشت مـیل لەولای باشـووری رۆژهەڵاتی پێنجـوێنەوەیە. فـەرمـان درایە هێـزە پیادەکان لە پێنجوێن کۆببنەوە»**[٦٤].

ئەمجارەیان ئێرانیش ئامادە نەبوو داڵدەی شێخ مەحمود بدات. رۆژی پێنجی مایسی ١٩٣١سەرکردەی هێزە پیادە شەڕکەرەکانی میری لە کوردستان زەعیم خەلیل زەکی بە یاوەری ئەفسەری بەریتانی رۆبرتس کە راوێژکاری بوو بە فڕۆکەی تایبەتی خودی مەلیک فەیسەڵ چوونە مەریوان و لەوێ لەگەڵ سەرهەنگ (عەقید)

---

(٦١) **«العالم العربي»** (جريدة)، بغداد، ١٤ نیسان ١٩٣١.

(62) P.R.O., C.O., 730, 163/88069 X/M 08533, 1931, Shaikh Mahmud, Part II, Comments on Engagement at Barika 5th April.

(٦٣) **«العالم العربي»**، ١٩ نیسان ١٩٣١.

(64) P.R.O., C.O., 730, 163/88069, X/M 08533, 1931, Shaikh Mahmud, Part

مەحمود خانی ئەمین کۆبووەوە. بەڵگەنامە تایبەتییەکان بەم جۆرە باسی کۆبوونەوەکەی مەریوان دەکەن:

**«کۆبوونەوەکە تەواو سەرکەوتوو بوو، هەردوو لا ڕێککەوتن پێکرا دەست بەکار بن، بۆ دابین کردنی پێوەندی خێرا بڕیار درا بێتەل بەکار بهێنرێ. سەرەتای ڕۆژی دوازدەی مایس بۆ دەست بەکار بوونی ئێرانییەکان دانرا، دوایی کرایە شازدەی مایس»**(٦٥).

بەو جۆرە هیچ دەرفەتێک لە بەردەم شێخ مەحمودا نەمایەوە. ڕۆژنامەی**«تایمس»**ی لەندەنی لەم بارەیەوە نووسیوییە دەڵێ:

**«هێزە سەربازییەکانی ئێران لە نزیک گوندی پیرانی سەر سنوور کە شێخ مەحمود پەنای بردبووە بەر، خۆیان ئامادەکردو رایان گەیاند کە سوورن لەسەر ئەوەی کە چواردەی مایس شێخ لە خاکی ئێران وەدەرنێن. هەمان کات لەودیو سنوورەوە هێزە چەکدارەکانی عیراقیش خۆیان بۆ هێرشێکی هاوکات ئامادە کرد تا پەلاماری شێخ بدەن ئەگەر هاتوو سنووری پەڕاند... ڕۆژی سیازدەی مایس هەردوولا خۆیان بۆ هێرشی هاوبەشی ڕۆژی داهاتوو ئامادەکرد»**(٦٦).

ئینگلیزەکان شێخ مەحمودیان لەوە ئاگادار کردەوە کە ئەگەر دەست هەڵنەگرێ ئەوا **«هێرشی هاوکاتی»** هەردوو لا بۆ سەر هێزەکانی بێ دواخستن دەست پێدەکا.

بەو جۆرە شێخ مەحمود ناچاربوو دەست لە خەبات هەڵگرێ، ڕۆژی سیازدەی مایس دوابڕیاری خۆی ڕاگەیاند، هەر ئەو شەوەش هاتەوە ناو خاکی عیراق. بە پێی قسەی پەیامنێری **«تایمس»** شێخی ماندوو لە ژوورێکی قوڕدا لە دەرەوەی پێنجوین تا بەرەبەیان خۆی داوەتە دەست خەوێکی قووڵ(٦٧). کە ڕۆژ هەڵدێ، واتە چواردەی مایس، شێخ ڕوو دەکاتە ناو شارو دوای گفتوگۆیەکی دوورودرێژ لەگەڵ کاپتەن ڤیڤیان هۆڵت، کە سێر فرانسیس هەمفریزی نوێنەری باڵا بە ناوی خۆیەوە

---

II, Operations against Shaikh Mahmud..., No. 30.

(65) Ibid, Report by the Air Officer Commanding..., No. 102.

(66) "The Times", London, May 21, 1931.

(67) Ibid

ناردبووی، به بەشداری موتەسەریفی سلێمانی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، شێخ خۆی دا بە دەستەوە.

هەر ئەو ڕۆژەی شێخ مەحمود بڕیاری دا چەک دانێ، واتە سیازدەی مایسی ١٩٣١، یەکسەر سێر فرانسیس هەمفرێز لە بەغداوە بروسکەیەکی دایە وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن. چەند لایەنێکی ئەو بروسکەیە سەرنج ڕادەکێشن، یەکەمیان خێرایی ناردنییە، سەعات نۆو بیست دەقیقەی بەیانیی چواردەی مایس ئەو بروسکەیە گەیشتە لەندەن، واتە لە کاتێکدا هێشتا گفتوگۆکەی نێوان شێخ مەحمودو کاپتەن هۆڵت لە پێنجوین تەواو نەبوو بوو. لە لای سەرەوەی بروسکەکەش نووسراوە گرنگ وەک نیشانەی بایەخی ناوەڕۆکی، ئەو بروسکانەی وا نەبوونایە لە سەریان دەنووسرا **«ئاسایی»**. دێڕێکی ناو دەقی بروسکەکەش بۆ ئەم باسەی ئێمە بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. هەمفرێز لەو دێڕەی بروسکەکەیدا دەڵێ:

**«هۆی سەرەکی ئەم ئەنجامە**[٦٨] **یەکجار چاکە دەگەڕێتەوە بۆ چالاکییەکانی هێزی ئاسمانی مەلەکی بەریتانی»**[٦٩].

هەواڵەکە چ بۆ ئینگلیزو چ بۆ کاربەدەستانی میری گەورە بوو، تا ڕادەیەکیش هەواڵێکی زۆر چاوەڕوان نەکراو بوو. بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی موستەعمەرات بێ کەم و زیاد بەو دێڕە دەستی پێکردووە: **«خۆ بەدەستەوەدانی شێخ مەحمود هەواڵێکی یەکجار خۆشە»**. هەر ئەو ڕۆژەش، واتە ڕۆژی چواردەی مایس، مەلیک فەیسەڵی یەکەم نامەیەکی پیرۆزبایی تایبەتی نارد بۆ سێر فرانسیس هەمفرێز. مەلیک فەیسەڵ لە نامەکەیدا دەڵێ: **«دەمەوێ بەم بۆنەیەوە هەستی پڕ لە بەختەوەری خۆم دەربڕم لە بواری ئەو یاریدەیەدا کە هێزەکانی خاوەن شکۆی بەریتانی دایان و...بووە هۆی گەیشتن بە ئەنجامێکی وا چاک**[٧٠]**»**.

مەلیک فەیسەڵ لەو نامەیەدا دەیەوێ وای نیشان بدات ئەوەی کراوە هەمووی

---

(٦٨) لە دەقی نامەکەدا «ئەم حەللە».

(69) P.R.O., C.O., 730, 163/88069, X/M 08533, 1931, Shaikh Mahmud, Part II, Telegram from the High Commissioner for Iraq to the Secretary of State for the Colonies, Dated 13 May 1931, Received 9.20. a.m.14 May 1931.

(70) Ibid, No. Ya/25, The Palace, 14th May, 1931.

لەبەر خاتری چاوی کاڵی باکووری باکوورییەکان بووە تا بەو جۆرە لە دەست زوڵم وزۆری شێخ مەحمود ڕزگاریان بکەن. ئەو ڕۆژانە کاربەدەستان و ئەندامانی پەرلەمان و ڕۆژنامەنووسانی سەر بەمیری و ناحەزی میری وەک یەک، جارویاریش ئینگلیزەکان وایان رادەگەیاند گوایە کورد زەلالەتی بووە بە دەست شێخ مەحمودەوە، خواخوایان بوو ڕۆژێ زووتر لە دەستی ڕزگاریان بێ[٧١]. وەڵامی ئەم شێوانەنە لە زاری دوو شایەتی ناحەزی بیانییەوە دێنمەوە:

شایەتی یەکەم کاپتەن ڤیڤیان هۆڵتە کە کاربەدەستێکی بە تواناو ئاگادار بووە، کوردییەکی چاکی زانیوەو وەک وتمان ئەو بە ناوی نوێنەری باڵاوە لە پێنجوین گفتوگۆی لەگەڵ شێخ مەحمودا کردو بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە سلێمانی و لەوێوە بردییە بەغدا. ڤیڤیان هۆڵت دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحمود ڕاپۆرتێکی نهێنی دەربارەی ئەو ڕاپەڕینەو گفتوگۆی خۆی لەگەڵ شێخداو گواستنەوەی بۆ سلێمانی و لەوێوە بۆ باشووری وڵات داناوە. لە و ڕاپۆرتە بایەخدارەیدا هۆڵت نووسیویە دەڵێ:

**«شێخ مەحمود ئازایانە، خاوێن و مەردانە دەجەنگی... دۆڕاندنی لە شەڕدا ناوی لە ناو کوردی باشووردا نەزڕاند. دوای ئەوەی لە پێنجوین خۆیدا بە دەستەوە بە دەسبەسەری گواستمانەوە، کوردی گوندەکانی دامێنی چیاکان بە لێشاو بە سەریا دەڕژان، بە پەرۆشەوە دەستیان ماچ ئەکرد، گەلێکیان بە چاوی پڕ فرمێسک و هەنسکەوە ماڵ ئاواییان لێ ئەکرد... باسی دڵ ڕەقی ئەکەن، بەڵام کێ شایەتە؟، لە ناو لادێییەکاندا شایەتێکی وا نییە، ئەوان لە کاتی بەزینیدا پاڵەپەستۆیان بوو تا فریاکەون دەستی ماچ کەن. شایەتێکی وا لە ناو فڕۆکەوانەکانی هێزی ئاسمانی مەلەکیشدا، کە دژی جەنگێن، چنگ ناکەوێ، دوانیان لای شێخ دیل بوون، ئەوانیش هەموویان بە دڵ دەیانویست لەو کاتی شکستییەیدا دڵ نەوایی بکەن. کەس لاریی لەوە نییە شێخ طەموح و خاوەن کیبریا بوو، بەڵام هەردووکیان بۆ نەتەوەکەی بوون نەک تەنها بۆ خۆی، زۆر کەسی تریش وەک ئەو طەموح و خاوەن کیبریا بوون و ئەوەیان پێ شەرم نەبوو. با نازناوی چەتەو یاخیگەری لە ئاستی**

---

(٧١) بە وێنە بڕوانە: «محاضر مجلس النواب. الدورة الانتخابية الثالثة»، ص٦٧٤.

**یاسادا پێ ببەخشین، ئەی غاریبالدی و مستەفا کەمالیش وەک ئەو نەبوون. خۆ ئەگەر بێتوو هەردووک لایەنی مەسەلەکە وەبەر چاو بگرین ئەوساکە دروستترین حوکم بەسەریا ئەوەیە کە گەورەترین هەڵەی شێخ بریتی بوو لەوەی سەدەیەک درەنگتر لەوەی دەبوو لە دایک بووە»**[٧٢].

مالّت ئاوا کاپتەن ڤیڤیان هۆڵتی دوژمن بۆ خۆت و ویژدانی راستگۆییت، هەڵبەت شێخ مەحمود بەو هەموو هەستی کوردایەتی و ئازایەتی و دڵسۆزی و جوامێری خۆیەوە سەرەتای سەدەی نۆزدەمین، کاتێک فڕۆکەو چەکی کوشندەو عەقڵی وردی ئینگلیز لەئارادا نەبوو، شتێکی بۆ کورد پێ ئەکرا.

شایەتی دووەممان پەیامنێری رۆژنامەی هەرە بەناوبانگی **« تایمس»**ە. دەربارەی هەمان باس ئەمیان رۆژی ٢٠ی مایسی١٩٣١ لە بەغداوە راپۆرتە هەواڵێکی بۆ رۆژنامەکەی ناردو تێیدا دەڵێ:

**«کاتێک شێخ مەحمود بەدیلی بەرەو سلێمانی دەیانبرد لە هەموو شوێنێک بە ئەوپەڕی دڵنەواییی لێکردنەوە پێشوازی لێدەکرا. دانیشتوانی شاری سلێمانیش بۆ پێشوازی و دەست ماچ کردنی هاتنە دەرێ»**[٧٣].

کاک فوئاد عارف دەڵێ دانیشتووانی کەرکوکیش بە هەمان دەستوور پێشوازیی شێخ مەحمودیان کرد[٧٤].

بەم جۆرە بە زەبری بۆمباباران و راوەدوونانی فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز لە ماوەی نزیکەی حەوت مانگدا پەردە بەسەر دوا قۆناغی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمودا بە یەکجارەکی دادرایەوە. ئینگلیز هیچ کاتێک وا گەرم دژی کورد نەهاتنە دەست. ئەمجارەیان زۆرترین و بە تواناترین فڕۆکەوانیان خستە کار. دوای بە یەخسیرگرتنی شێخ مەحمود چەند لیستەیەکی تایبەتییان بە ناوی ئەو فڕۆکەوانانەوە دەرکرد کە بڕیادرا بەو بۆنەیەوە نیشان و میدالی سەرکەوتنیان پێبدرێ. لەو لیستانەدا پوختەی ژیانی هەر یەکێکیان تۆمار کراوە، جا وا لێرەدا بۆ

---

(72) P.R.O., C.O., 730 163/88069, X/M 08533, 1931, Shaikh Mahmud, Part II, Appendix A, Biographical Note on Shaikh Mahmud by Captain V. Holt.
(73) The Times , May 21, 1931.
(٧٤) دیدەنی لەگەڵ لیوای خانەنیشین فوئاد عارف رۆژی دوازدەی تەمموزی ساڵی١٩٩٥.



ڕوونکردنەوەی مەبەست چەند نموونەیەکی هەڵبژاردە دەخەمە بەرچاو:

یەکێک لەو لیستانە بەناوی جەنەراڵ لۆید کۆرتنی ی فڕۆکەوان دەست پێ دەکات. وا دیارە لۆید کۆرتنی فڕۆکەوانێکی شارەزاو ئازاو لێهاتوو بووە، بۆیەکا بەر لەوەی بێتە کوردستان دوو میدالی بەرزی وەرگرتووە. فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق پێشنیاری کردووە لەسەر چالاکییەکانی دژی لایەنگرانی شێخ مەحمود میدالێکی نوێی بدەنێ و بەو بۆنەیەوە لە پێشنیارەکەیدا نووسیوییە دەڵێ:

**«لەسەر خزمەتی چاکی بە گشتی، بە تایبەتیش لەبەر ئەو چالاکییانەی لە کاتی یاخی بوونی هۆرین و شێخاندا لە ڕۆژی ٢٧ تا ٣١ی مارتی ١٩٣١دا نواندی، لەو ڕۆژانەدا بارودۆخی ئەو ناوچەیە گەیشتە ئاستێکی زۆر ناسک و ترسناک، سەدان یاخی بوو نزیکەی ٨٠ پۆلیسی ناو پۆلیسخانەی بێلولەیان بۆ ماوەی نزیکەی حەفتەیەک گەمارۆ دا، بێلولە مەڵبەندی ناحیەکەیە، یاخییەکان بەرەو باکوور، بۆ لای خانەقین پەرەیان بە دەسەڵاتی خۆیان دا، وەزعەکە ئاشکراو خێرا بەرەو ئاڵۆزبوون دەشکایەوە. حوکمەتی عیراق چەند جارێک داوای لێکردین فڕۆکە بنێرینە سەر ناوچە یاخییەکان. ڕۆژی ٢٧ی مارت جەنەراڵی فڕۆکەوان کۆرتنیم ناردە**

خانەقین بۆ ئەوەی رابەریی هێرشی فڕۆکەکان بکات. بۆ خۆی بە فڕینێکی نزمی ئازایانە توانی زۆر بە وردی لە باری ناوچەکە تێبگات، زانی کە ورەو میزاجی یاخیبەکان یەکجار بەرزەو بەرانبەر بەوان ورەی پۆلیسەکان تەواو نزمە.

سەرنجەکانی کۆرتنی وەک ئەو زانیارییانە بوون کە بەر لەوە پێمان گەیشتبوون دەربارەی نیازی پۆلیسەکان کە خۆیان بدەن بەدەستەوە. دوای ئەوە کۆرتنی بە شێوازێکی زۆر چاک رابەری هێرشی فڕۆکەکانی کرد، بە جۆرێک لە ماوەی تەنها سێ رۆژدا توانرا بارودۆخەکە ئاسایی بکرێتەوە، یاخیبەکان بە ناچاری بلاوەیان لێکرد، پەنایان بردە بەر گردو تەپۆڵکەکانی ناوچەکە، دەستوبرد دەسەلاتی کارگێری گەڕایەوە گشت ناحیەکە. بە زیانێکی گیانی زۆر کەم ئەم ئەرکە راپەڕێنرا. تا رادەیەکی زۆر هۆی ئەم سەرکەوتنە لەو رابەرییە وردو بەرزەدا بەدی ئەکرێ کە جەنەرالی فڕۆکەوان کۆرتنی لە کاتی هێرشی ئاسمانیدا نواندی. لەبەر ئەوە پێشنیار ئەکەم میدالی جۆری باثی پێ ببەخشرێ. ئیمزا لیوای فڕۆکەوان، فەرماندەی هێزی ئاسمانی(بەریتانی) لە عیراق»[75].

دووەم ناوی هەمان لیستە موقەدەمی فڕۆکەوان ئەلفرێد گەی رۆنالد گارۆدە. ئەمیشیان بەر لەوەی بێتە کوردستان دوو میدالی بەرزی وەرگرتووە. بە پێی گێڕانەوەی فەرماندەی گشتیی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق پوختەی کارەکانی ئەم دژی شێخ مەحمود بەم جۆرەی لای خوارەوە بوو:

«بە سەرپەرشتی گشتی خۆم موقەدەمی فڕۆکەوان گارۆد لە لیوای سلێمانی لە رۆژی ٢٣ی مارتی ١٩٣١ەوە تا ٢٥ی نیسانی ئەو ساڵە بەرپرسیاری هێرشی فڕۆکەکان بوو. بۆ خۆی رابەری فڕۆکە بۆمباهاوێژەکانی پۆلی ژمارە ٥٥ی دەکرد کە بنکەکەیان لە سلێمانی بوو. هەر سات و ئانێک پێویست بووایە فڕۆکە بۆمباهاوێژەکانی پۆلی ژمارە ٣٠و پۆلی ژمارە٨٤و فڕۆکە بۆمباهاوێژو راگوێزەرەکانی پۆلی ژمارە ٧٠ بۆ یاریدە دەهاتنە سلێمانی.

سەرباری رابەری کردنی هێرشی فڕۆکە گارۆد هەمان کات یاریدەی مێجەر

(75) P.R.O., C.O., 730 163/88269, X/M 08533, 1931, Shaikh Mahmud, Part II, Appendix C, List of Recommendations for Honours and Awards in connection with Operations in Kurdisan from 23. 10. 1930 to 11.5.1931.

**رۆبرتسی دەدا کە بەرزترین پلەداری بیعسەی بەریتانی بوو لە سلێمانی و راوێژکاری یەکەمی فەرماندەی لەشکری عیراقی بوو.**

**ئەرکەکانی سەر شانی گەلێک دژوارو زەحمەت بوون، ئەو هەر چەندە تا نیوە شەو بە کاروباری هێزە پیادەکانەوە خەریک دەبوو کەچی بەرەبەیان خۆی دەگەیاندە فڕۆکەخانەی شار تا لە سەرەتای دەست بەکاربوونی فڕۆکەکانی دڵنیابێ، چەند جارێک دەرفەتی بۆ خۆی رەخساند بە فڕۆکە بچێتە سەر ناوچەکە تا بە وردی دەرسی سروشتی نیشانەو باری گشتیی ئەو شوێنانە بکا کە دەبوو فڕۆکەکانی پۆلەکەی بچنە سەریان. لە هەموو روویەکەوە نموونەیەکی بێ هاوتا بوو، لە میانی پێوەندییەکانیشیدا لەگەڵ هێزەکانی میریدا شارەزاییەکی چاکی نواند. لەبەر ئەوانە پێشنیار ئەکەم نیشانی ئیمپراتۆریی بەریتانی پێ ببەخشرێ..»**[٧٦].

نموونەی سێیەممان پاڵەوانێکی بە جەرگی کەم وێنەیە. ئەمیان رائیدی فڕۆکەوانە، ناوی جۆرج سیسیل گاردنەرە، سەر بە پۆلی پەنجاوپێنجی بۆمباهاوێژ بوو. ئەمە پوختەی سەرگوزشتەی چالاکییەکانی گاردنەرە لە دوا قۆناغی راپەڕینەکەی شێخ مەحموددا:

**«گاردنەر یەکەم کەس بوو کە رۆژی ٣٠ی مارت یاخیگەرانی لە گوندی بانی مۆرت دۆزییەوە. یەکسەر بە بێتەل داوای لە سلێمانی کرد فڕۆکە بنێرن، ئەو هێزەی میریشی ئاگادار کرد کە لەو نزیکانە بوو، ئینجا خەست و خۆڵ کەوتە بۆمباباران و دەسرێژی رەشاش لێیان، پاش ماوەیەک هەمان رۆژ یاخییەکانی لە سێ گوندی تری نزیک بانی مۆرتەوە دۆزییەوە، بۆ خۆی رابەریی هێرشی فڕۆکەی بۆ سەر ئەوانیش ئەکرد.**

**سەرەتای نیسان دیسان دەستەیەک یاخیگەری لە گوندی دەروزاملک (؟) بەدی کرد، رابەریی هێرشی سەر ئەوانیشی کرد.**

**رۆژی پێنجی نیسان گاردنەر یەکەم فڕۆکەوان بوو بە دروستی شوێنی شێخ مەحمودی لە ئاوباریک دەستنیشان کرد، یەکسەر پەلاماری دوژمنی دا، ئەوانیش لە خوارەوە بە خەستی دەسرێژیان لێ دەکرد، وەستایانە رەشاشەکانی ناو فڕۆکەکەی**

---

(76) Ibid

خۆی بەکار ئەهێنا ، تایبەت لەو کاتەوەی گشت فڕۆکەکانی تر گەڕانەوە بنکەکانی خۆیان بۆ بارکردنی بۆمبا ، بەو جۆرە یاخییەکانی ناچار کرد لە ناو گوندی ئاوباریک و دەوروبەریدا گیر بخۆن تا هێزی پیادەی میری گەیشتەجێ. گەلێک گوللە تفەنگی دوژمن بەر فڕۆکەکەی کەوتن، تانکی بەنزین و کابرێتەرەکەیان کوناودڕ کرد، فڕۆکەکەی بە لایەنی کەمەوە ٤٧جار پێکرا، هەرچەند کڵپەی ئاگری بەنزین زۆری بۆ هینا ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا توانی بە سەلامەتی لە نزیک وێستگەی شەمەندەفەری سلێمان بەگەوە بنیشێتەوە. هەمووی دوو سەعاتی نەخایاند دوای ئەو نیشتنەوە ناچارییەی کاتێک فڕۆکەیەکی تری لە بنکەی هێندیەوە (موعەسکەر رەشیدی ئێستا لە بەغدا-ک.م)بۆ هات و بێ دواکەوتن هاتەوە سەر ئاوباریک. دیسان کەوتەوە بەر لێشاوی تەقەی دوژمن، ئەمجاریش، بێ گومان، دەسڕێژی نیشانپێکی رشاشەکانی ئەو هێزە پیادەکەی میریی لە زیانی گەورە رزگار کرد.

رۆژی ١٧ی نیسان گاردنەر رابەریی هێرشی فڕۆکەکانی بۆ سەرکان کرد. دوژمن فڕۆکەکەی کوناودەر کرد. دوای چوار رۆژ، واتە ٢١ی نیسان لە سپاگوێز تاقمێکی گەورەی تری لە یاخییەکان بەدی کرد، ئەو تاقمەش بە رابەری خۆی کەوتنە بەر شالاوی هێرشی ئاسمانی.

«وێنگەرمی و چاونەترسی ئەم ئەفسەرە بە درێژایی رۆژانی هێرشەکان بە بەرچاوی هەموانەوە روون وئاشکرا بوون، بەدووگەڕان و هێرشە توندوتیژەکانی لە ناو ئاگری دەسڕێژی دوژمندا رۆڵی باڵایان لە خۆبەدەستەوەدانی شێخ مەحمودا بینی. پێشنیار دەکەم میدالی خزمەتی باڵای بدرێتێ»[77].

لەناو لیستەکاندا گەلێک نمونەی تری لەم بابەتە وەبەرچاو ئەکەون. ئەفسەری فڕۆکەوان سیدنی جۆزێف کار ١٨٥سەعات فڕینی تەنها لە کاتی هێرشەکانی ئاوباریک و بانی مۆرت و گوندەکانی ئەو دەوروبەرەدا تۆمارکرد. بە پێی گێڕانەوەی فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق هێرشی ئازایانەی کار بۆ سەر سەنگەرەکانی لایەنگرانی شێخ مەحمود رۆڵی گەورەی هەبوو بۆ کپ کردنی دەسڕێژیان و بەو جۆرە رێگەی بۆ سەرکەوتنی هێرشی هێزی پیادەی میری لە

(77) Ibid

خوارەوە خۆش کرد.

فڕۆکەوانەکانی ئینگلیز زۆر جار ناچار ئەبوون بە نزمی بفڕن چونکە، وەک لە راپۆرتێکدا نووسراوە، شێخ مەحمود **«کون و کەلەبەرو دارو بەردی شاخ و داغی کوردستان شارەزا بوو، ساڵەهای ساڵ بە شەڕی چەتەگەرییەوە خەریک بوو»** بۆیەکا دەیزانی چۆن و لە کوێ لایەنگرەکانی مەڵاس دەدا. ئەو نزم فڕینە بەردەوامە **«بێ ئەندازە فڕۆکەوانەکانی هیلاک کردبوو»**[٧٨].

فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز بە هەزاران سەعات لە ئاسمانی کوردستاندا دژی شۆڕشگێڕانی کورد گاڵەیان ئەکرد. بەوێنە تەنها سەرەتای مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٠ ئەو فڕۆکانە ماوەی ١٤٩٦ سەعات تەنها بەسەر سورداش و دەوروبەرییەوە بوون کە وەک راپۆرتەکە ئەڵێ **«یەکێکە لە ناوچە هەرە سەختەکانی جیهان»**[٧٩]، ئەمە لە کاتێکدا کە هێشتا شەڕ تەواو گەرم نەبوبوو، تۆف و بارانی زستانیش کۆسپێکی گەورە بوون لە بەردەم هەڵسانی ئاسایی ئەو فڕۆکانەدا.

وانەبوایە، وەک وتمان، راپەڕینەکەی شێخ مەحمود بە هەمو لادا پەلی دەهاویشت. لێرەدا وەک بەڵگە باسی جافی گەرمیان دێنمەوە کە چۆن کۆششی ئینگلیزەکان رێگەی خەباتی لێ گرتن. لە راپۆرتە دوورودرێژەکەی خۆیدا فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق لەم بارەیەوە دەڵێ:

**«دەبوو بە وریایی ئاگامان لە هەڵوستی جافەکان بێ، لەبەر ئەوە ئەفسەرێکی تایبەتیی ئیستخباراتی هێزی ئاسمانی مەلەکیم نارده ناوچەی کفری. ئەفسەری ناوبراو سەر پۆلی فڕۆکەوان ف. د. ئۆمالی بوو کە هەڵگری میدالیکە، دەزگایەکی بێتەل و نیو تاقم زرێ پۆشم لەگەڵ نارد تا پێوەندی بە هێزەکانەوە ببەستێ و بەردەوام لە باروذۆخی ناوچەکە ئاگادارم بکا. ئۆمالی قەڵای شێروانەی کردە بارەگای خۆی، ئەو قەڵایە پۆلیسخانەیەو کەوتۆتە کەناری ناوچەی جافایەتییەوە. ئۆمالی لەو بنکەیەوە کارێکی فرەخاسی راپەڕاند، بە شێوازێکی رێک و پێک ئاشنای وەزعەکەی کردم. فڕۆکە بۆمباهاوێژەکانی پۆلی ژمارە ٥٥ی بنکەی هنێدی**

(78) Ibid, Report by the Air Officer Commanding, Iraq Command ..., Chapter I, Return of Shaikh Mahmud, No. 4.

(79) Ibid, PP.7-8, Attack on Surdash, No. 35.

**خرایە بەردەست. تەختانییەکی لەباریان لە نزیک پۆلیسخانەکەوە دۆزییەوەو کردیانە فرۆکەخانە. چەند جار فرۆکەکان چوونە سەر ناوچە بزێوەکان، شوێنی رەشماڵ و جم و جۆڵیان خرانە ژێر چاودێرییەوە. بەو جۆرە بە وردی(رەصدی) تیرەکانی جافمان کرد. وا دیارە فڕینی یەک لە دوای یەکی فرۆکەکان، لەگەڵ هەستی بێ دەسەڵاتیدا لەبەردەم هێرشی ئاسمانیدا کارێکی گەورەیان کردە سەر ئەو تیرانەو بوونە کۆسپ لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ناڕەزایی لەناویاندا»**[80].

ڕۆژنامەی **«تایمس»**یش هەر لەو ڕۆژانەدا لە کورتە وتارێکیدا دەربارەی ڕۆڵی هێزی ئاسمانی بەریتانی دژی کورد دانی بەوەدا ناوە کە ژمارەیەکی زۆر لە سەرەک هۆزانی کوردستان چاوەڕوان بوون گەر شێخ مەحمود سەرکەوت بدەنە پاڵی، بەڵام، وەک ڕۆژنامەکە دەڵێ**«خۆش بەختانە ڕێگەی ئەوە نەدرا»**[81].

فڕۆکەوانە ئینگلیزەکان دواییش بە شانازییەوە باسی بیرەوەریی چالاکییەکانی خۆیانیان لە ئاسمانی کوردستاندا ئەکرد. یەکێکیان دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێک بەسەر ئاوبارێکدا تێروتەسەل لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤارێکی خۆیاندا باسی ئەوەی گێڕاوەتەوە چۆن خۆی و هاوەڵەکانی ماوەی شەش حەفتەی ڕەبەق بەدووی شێخ مەحمودەوە بوون تا سەر ئەنجام ناچاریان کردووە خۆی بەدەستەوە بدات[82].

ڕەنجی فرۆکەوانانی ئینگلیز لە داپڵۆسینی نیشتمانپەروەرانی کوردا بەفیڕۆ نەڕۆیی، وێڕای ئەو میدال و نیشانانەی بەسەر سنگیاندا هەڵواسران هی واشیان تێدا بوو دوایی بوونە گەورە پیاوی ناسراوی وڵاتی خۆیان و جیهان. پۆلی ژمارە ۳۰ کە چەند جارێک تا ئێستە ناویمان هێناوەو کەرکووک بنکەی بوو، سەرەتای بیستەکان ئەفسەری فرۆکەوان جێمس ڕۆب فەرماندەی بوو، لە پەنجاکاندا ڕۆب ببووە مارشاڵی فرۆکەوانی گەورەو بە فەرمانی پاشایی نازناوی پایەبەرزی سێری پێ بەخشرابوو. جۆنس ولیەمزیش بووە یەکێک لە فرۆکەوانە هەرە بەناوبانگەکانی جیهان، ولیەمز لەو هێرشەدا بەشداربوو کە مارشاڵی فرۆکەوان جێژنی کریسمسی ساڵی ۱۹۲۳ کردییە سەر ماڵی شێخ مەحمود لە سلێمانی. پاش حەوت ساڵ

(80) Ibid, P. 15, No. 62.
(81) "The Times" April 10, 1931.
(82) "Journal of the Royal Asian Society", London, July, 1934.

جۆنس ولیەمز کاتێک لە پێشبڕکێیەکی جیهانیدا دەیویست بەرزترین پلەی خێرافڕین بۆ خۆی تۆمار بکا، فڕۆکەکەی لە نزیک تونسەوە بەر یەکێک لە لوتکەکانی چیای ئەتلەس کەوت و مرد[٨٣].

بەکارهێنانی فڕۆکە دژی کورد بەو رادە فراوانە کەم نەکەوت لەسەر ئینگلیزیش. شۆڕشگێڕانی کورد لە جاران زیاتر بە دەسڕێژ بەرەنگاری ئەو فڕۆکانە دەبوونەوەو جاروبار زیانی کوشندەیان پێ دەگەیاندن. لەو قۆناغەدا وێڕای ئەو فڕۆکەوانانەی کوژران دوانیشیان بە دیلی کەوتنە دەست شۆڕشگێڕانی کورد. شێخ مەحمود بەدرێژایی چەند مانگێک جوامێرانە رەفتاری کردن، بۆ خۆیان دوای ئەوەی بەربوون لە هەموو شوێنێک باسی ئەوەیان ئەکرد چۆن شێخ مەحمود هەر کاتێک بیانویستایە دەیناردن بۆ راوەشکارو چۆن **«هیچ کاتێک لە ژیانیاندا راوی وا خۆشیان نەکردووە»**. ئەو جۆرە رەفتارە دوایی وای لە ئینگلیز کرد، بەپێی قسەی خۆیان، لەوە دڵنیابن کە کورد پیاوانە لەگەڵ دیلەکانیان دەجوڵێنەوە[٨٤].

لەرووی ماڵیشەوە هێرشی بەرفراوانی هێزی ئاسمانی بەریتانی بۆ سەر کورد کەم نەکەوت لەسەر ئینگلیز. بەپێی سەرچاوەی خۆیان خەرجی تەنها دامرکاندنەوەی دوا قۆناغی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود یەک ملیۆن پاوەن بوو کە بۆ رۆژگاری خۆی پارەیەکی یەکجار زۆر بوو، ئەوساکە بودجەی ساڵانەی هەموو عیراق بەزەحمەت خۆی دەدا لە چوار پێنج ملیۆن پاوەن. دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە ئەوساکە لەندەن بۆ خۆی بۆ پوولێک دەچوو بە ئاسماندا، چونکە، وەک دەزانین، لە ساڵی ١٩٢٩وە تاوەکو ساڵی ١٩٣٣ گشت وڵاتە سەرمایەدارییەکان دووچاری گەورەترین کێشەی ئابووری هاتبوون کە تا ئەو سەردەمە مێژوو لە وێنەی بەخۆیەوە نەدیبوو. پێم وایە لەم بارەیەوە هێند بەسە گەر بزانین لەو رۆژانەدا بە سەدان کارگەی ئینگیلتەرە لەکار کەوتبوون، ژمارەی بێ کارە تەنها لەناو کرێکاراندا گەیشتە ٣ ملیۆن کەس، لە ٢٠٪ی رۆژانەی ئەوانەشیان کە هێشتا لە کاردا مابوون داشکێنرا. شایانی باسە رۆژنامەکانی عیراق هەموو رۆژ بە دووروودرێژی باسی ئەو بارودۆخە

(83) C.J.Edmonds, Op. Cit., PP.377, 390.

(84) P.R.O., C.O., 730, 174/96396, X/M 08533, Shaikh Ahmad, Part I, Extracts from Intelligence Report No. 25, Par.65.

سەختەی ژیانی رۆژانەی ئینگلیزیان ئەکرد[٨٥]. خەرجی ئەو ملیۆن پاوەنە لەو رۆژگارە هەرەسەخت و دژوارەدا رقی **«ئەنجوومەنی نەقابەو کرێکاران»**ی ئینگلیزی هەڵساند. رۆژی چواردەی مایس ئەنجوومەنی ناوبراو یادداشتێکی تایبەتیی لەو بارەیەوە دایە ئەنجوومەنی وەزیران، کە وابزانم هەر ئەویش بۆ خۆی تاکە دەنگێکی زۆر نزمە لەسەر کورد هەڵی دایێ. دەقی یادداشتەکە بەم جۆرەیە:

**«ئەنجوومەنی نەقابەو کرێکاران. ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن. گەورەو خۆشەویستم. ئەنجوومەنی ناوبراو پەیوەندیی پێوە کردم بۆ دەربڕینی نارەزایی لەسەر بۆمبابارانکردنی پیاوی چیایی عیراق** (مەبەستی شێخ مەحمودە - ک. م.)**. ئێمە لەو باوەڕەدایین دەبوو ئەو ملیۆن پاوەنە بۆ مەبەستی ئەوتۆ تەرخان بکرایە کە لەگەڵ چ سیاسەتی حوکمەتی (ئێستای) کرێکاران لە بواری کاروباری هەندەراندا بگونجایە، چ لەگەڵ ئەو بانگەوازانەمانددا کە لەناو هۆڵی پەرلەماندا بڵاومان کردنەوە. لەوە دڵنیام بەڕێزتان بایەخی تەواو دەدەنە ئەم مەسەلەیە. دڵسۆزتان ت. ر. ئابۆت»**[٨٦].

پێم وایە هەر کەسێک لە هەر رەگەز و تیرەیەک بێ راستییەکانی ناو ئەم وتارە بخوێنێتەوە، کە وەک وتمان مشتێکە لە خەروارێک، بە ئەوپەڕی قەناعەتەوە تێدەگا فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز چ گاڵەیەکیان بە شێخ مەحمود و لایەنگرانی کردووە. تەنانەت گۆڤاری **«رۆژهەڵاتی نزیک و هندستان»**ی لەندەنی نازناوی **«راهێنەر (مدرب)ی هێزی ئاسمانیی مەلەکی بەریتانیی»** بە شێخ مەحمود بەخشیوە، واش بوو، چونکە بیستەکان و سەرەتای سییەکان پیشەسازی فڕۆکە دروست کردن زۆر پێشکەوت، تازە شەڕی یەکەمی جیهانیش تەواو بوبو، هێشتا نازییەکانی ئەڵەمانیا دەسەڵاتیان وەرنەگرتبوو، بۆیەکا ئاشتی تا رادەیەکی زۆر باڵی بەسەر دونیادا کێشابوو، لە هیچ شوێنێک پێویستییەکی ئەوتۆ نەبوو بۆ بەکارهێنانی فڕۆکەی جەنگی. تەنانەت **«گەوهەری هەرە نایابی تاجی شاهی بەریتانیای گەورە»**

---

(٨٥) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە: **كمال مظهر احمد، صفحات من تاريخ العراق المعاصر.** دراسات تحليلية، منشورات مكتبة البدليسي، بغداد، ١٩٨٧، ص٨٥-١١٥.

(86) P.R.O., C.O., 730, 163/88069, X/M 08533, 1931, Shaikh Mahmud, Part II, Trafers and Labour Council.

هندستانیش له بیستەکاندا تا رادەیەکی زۆر هێوەر بوو، له هیچ شوێنێکی ئەو ولاته شتێکی ئەوتۆ رووی نەدا پێویستی به بەکارهێنانی فڕۆکەی جەنگی بێ. لەبەر ئەوه کوردستان لەبارترین شوێن بوو بۆ فێرکردن و راهێنانی فڕۆکەوانەکانی ئینگلیز له بوواری بەکارهێنانی دوا مۆدێلی فڕۆکەی جەنگی و چەک و تفاقی نوێی ئەو فڕۆکانەدا. هەڵبەت لەڕووی سەربازییەوه راهێنان له شەڕگەی راستەقینەدا زۆر باشتره لەشەڕگەی دەستکرد که بۆ راهێنانی ئاسایی ئاماده ئەکرێ. شایانی باسه پوختەی ئەم راستییانه لەناو کتێبه بەهادارەکەی جەواهێر لال نەهرۆی رابەری گەورەی هندستانیشدا رەنگی داوەتەوه(٨٧).

زۆر جار فڕۆکەکانی ئینگلیز به هانای هێزەکانی میریدا دەکەوتن و لەشکاندنی گەوره قوتاریان دەکردن. لەم وتارەدا چەند نموونەیەکی ئەو راستییەمان خستۆته بەر چاو، لەناو فایله تایبەتییەکاندا گەلێک سوپاسنامەی دەزگاکانی میری هەڵگیراون که لەو بارەیەوه ناردوویانن بۆ فەرماندەی هێزی ئاسمانیی بەریتانی له عیراق و نوێنەری بالاو وەزیری موستەعمەرات و لایەنی تر. دەقی ناوەرۆکی یەکێک لەو سوپاسنامانه لەم بارەیەوه دەخەمه بەرچاو که وەزیری ئابووری و جێگری وەزیری کاروباری ناوخۆ موزاحیم پاچەچی ناردوویه بۆ نوێنەری بالا:

**«نهێنی، د. و.، ژماره س/ ٤٩٩، وەزارەتی ناوخۆ. عیراق. بەغدا ٢٣/ ٢٥ی نیسانی ١٩٣١. خۆشەویستم سێر فرانسیس. بۆ ئاگاداریتان وێنەیەکتان له یادداشتی ژماره س/ ٥٢٤٨ی رۆژی پازدەی نیسانی ساڵی ١٩٣١ پێشکەش ئەکەم که سەرپەرشتکاری پۆلیسی سلێمانی بۆ سەرپەرشتکاریی گشتیی پۆلیسی ناردووه(له بەغدا) دەربارەی فڕۆکەوانی سەرپۆل گاردنەرو ئەفسەری فڕۆکەوان کار له بوواری هێرشەکانی ئێستەدا بۆ سەر شێخ مەحمود.**

**حەز دەکەم پایەبلندتان ئاگادار بکەم که حوکمەتی عیراق زۆر بەرز کاره پڕ له قارەمانییەکانی ئەو دوو ئەفسەره دەنرخێنێ. بەختەوەر ئەبم گەر داوا له فەرماندەی هێزی ئاسمانی بکەن سوپاسنامەی بێ پایانمانیان پێ رابگەیەنێ»**(٨٨).

---

(٨٧) جواهر لال نهرو، لمحات من تاريخ العالم، الطبعة الثانية، منشورات المكتب التجاري للطباعة والتوزيع والنشر، بيروت، ١٩٥٧، ص٣٣٤-٣٣٥.

(88) P.R.O., C.O., 730, 163/ 88069, X/M..., Shaikh Mahmud, Part I, Secret,

فرۆکەوانە ئینگلیزەکان بەو چالاکییە بەر فراوانەی لە سەرەتای پایزی سالّی ١٩٣٠وە تاکۆتایی بەهاری سالّی ١٩٣١ دژی دوا قۆناغی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود نواندیان مەبەستێکی ستراتیژیی زۆر گەورەیان جێ بەجێ کرد، ئەویش، **وەک وتمان، دابڕینی سۆران و بادینان بوو لە یەکتر، دوای شێخ مەحمود نۆرەی شێخ ئەحمەد هات.** بەلّگەنامەیەکی نهێنیی ئینگلیزەکان کە دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحمود بە نزیکەی سالّێک نووسراوە ئەو ڕاستییەی زۆر بە ڕوونی بۆ تۆمار کردووین. ئەو بەلّگەنامەیە بریتییە لە لێدوانێکی وردی هۆلّی فەرمانبەری وەزارەتی موستەعمەرات دەربارەی ڕاپۆرتێکی فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق کە ناوەندی نیسانی سالّی ١٩٣٢ دەربارەی ڕاپەڕینی ئەمجاری کورد لە بادینان نووسیوییە، هۆلّ دەلّێ:

**«... بێ گومان هاریکاری هێزی ئاسمانی لە ناوچەیەکی وا شاخاویدا گەلێک جار کارێکی زۆر پێویستە بۆ وەدی هێنانی سەرکەوتن. ڕەنگبێ هی وا هەبن بلّێن کە عیراق بووە ئەندامی کۆمەلّەی نەتەوەکان(عصبە الامم) ئیتر نابێ چاوەڕوانی یاریدەی هێزی ئاسمانی مەلەکی (بەریتانی) بێ، بۆیەکا ئەوساکە لە بواری چارسەرکردنی ڕاپەڕینی وا ترسناکدا دووچاری بارودۆخێکی سەخت دێ. وەلّامی ئەم بۆ چوونە بەلای منەوە دوودیوییە. یەکەم هیچ هۆکارێک لە ئارادا نییە وامان لێ بکا چاوەڕوانی بەرپابوونی شۆڕشێکی ترسناکی تر بین لە دوارۆژدا لە کوردستان. لەماوەی گەلێ سالّدا شێخ مەحمودو شێخ ئەحمەد دوو مەلی شووم[89] بوون بە ئاسمانی کوردستانەوە، یەکەمیان ئەوا بۆ خۆی دەسبەسەرە، پێم وایە دووەمیشیان لە ماوەی چەند مانگێکدا وەک ئەوی بەسەر دێ. بە نەمانی ئەم دوو یاخییە ئیتر لەسەر شانۆکە کەسێکی وا نامێنێ ئالّای شۆڕشی پێ هەلّگیرێ»[90].**

---

D.O. No. C/ 499, Ministry of the Interior, Iraq, Baghdad, the 23rd/ 25th April, 1931.

(٨٩) لە دەقی لێدوانەکەدا (Stormy Petrel) کە مەلێکی دەریایی بالّ درێژی دوورەفڕە، زۆر لە وشکانی دوور ئەکەوێتەوە، بە عەرەبی(**طائر نوء**)ی ناوە. ناوی ئەو مەلە بۆتە زاراوە لە زمانی ئینگلیزیدا، بە واتای ئاژاوەچی بەکاردەهێنرێ.

(90) P.R.O., C.O., 730, 174/ 96396, X/M 08533, Shaikh Ahmad, Part I, Extract from Intelligence Report No. 25, Par. 47.

زۆری نەخایاند بۆچوونەکەی هۆڵ هاتە دی. شایانی باسە ئەو کەرت و پۆلانەی هێزی ئاسمانی بەریتانی کە ڕۆڵی گەورەیان لە دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی شێخی سۆراندا بینی، هەر ئەوان بوون پاش دەوروبەری ساڵێک نیشتنە ئاسمانی بادینانیش، بەتایبەتی پۆلی ژمارە ۳۰ی ئەو هێزە. **بەداخەوە مێژووی کورد لە ڕۆژگاری بەدرغانی گەورەوە جارەهای جار لەم بووارە ناسکەدا خۆی دووپات کردۆتەوە.**

شێخ مەحمود دوای ئەوەی بە ناچاری خۆی دا بەدەستەوە دە ساڵی ڕەبەقی بە دەسبەسەری لە شارەکانی باشوور بردە سەر، هەر ڕۆژەی لەشارێکەوە دەیانگواستەوە شارێکی تر تا بۆ دواجار لە بەغدا گیرسایەوە. ڕۆژانی ڕاپەڕینەکەی نیسان - مایسی ۱۹٤۱ کە زۆر جاران بە بزووتنەوەی ڕەشید عالی گەیلانی ناودەبرێ، دەرفەتی بۆ ڕەخساو گەڕایەوە کوردستان، دوای بێنەو بەرەیەکی زۆر ڕێگەی پێ درا لە گوندی داری کەلی نیشتەجێ بێ بەومەرجەی ئیتر توخنی سیاسەت و کوردایەتی نەکەوێ و تەنها جاروبار بۆ نوێژی جومعان و جەژنان و کاری زۆر پێویست نەبێ بە هیچ جۆر تەنانەت سەری سلێمانیش نەدا.

لێرەدا دەتوانین لە قوژبنێکی ترەوە بۆ مەسەلەی پێوەندیی نێوان ئینگلیز و شێخ مەحمود بچین. **شێخ مەحمود بۆ خۆی بە دڵ حەزی ئەکرد لەگەڵ ئینگلیز ڕێکەوێ، باش لەوە گەیشتبوو با لە کام کونەوە دێتە دەر، دەیزانی سەرو بەرو بنی کلیلی کارەکە وا لە لۆمباردستریتی**[٩١] **لەندەن.** تەواو بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لەناو خوێندەوارانی کوردا باوە شێخ لە عەقڵەوە بێ وچان هەوڵی ئەدا ئینگلیز بەلای کوردا رابکێشێ، بەر لەوەی لەشکری ئینگلیز بگاتە ناو خاکی کوردستان ئەو بۆ خۆی پێوەندی پێوەکردن، دوای ئەوەش بە دەیان جار نامەی تایبەتی و نوێنەری خۆی ناردۆتە لایان، **بەڵام ئەوان ئاتاجی کورد نەبوون ونەیاندەویست مەسەلە ئاڵۆزەکەیان بکەنە تەوق بەسەر خۆیانەوە، بۆیەکا هیچ کاتێک لە سنوورێکی تایبەتی تەسکدا نەبێ ئاوڕی ڕەحمەتیان لە کورد نەئەدایەوە، هەمیشە گشت خواست و داواکانی**

(٩١) ئەو شەقامەی لەندەنە کە دەزگا سەرمایەدارییە هەرە گەورەکانی ئینگیلتەرەی لەسەرە، ئەوانەی دەوری بینراویان لە دیارکردنی سیاسەتی دەوڵەتدا هەیە، هەروەک چۆن وۆڵ ستریتی نیۆیۆرک هەیەتی.

**شێخیان رەت ئەکردەوە. بەڵگەنامە تایبەتییەکانی ئینگلیز بە زانیاریی هەمەچەشنە دەربارەی ئەم راستییە مێژووییە تەنراون.**

شێخ مەحمود لەدوا قۆناغی خەباتیشیدا کەمی نەکرد بۆ ئەوەی ئینگلیز بەلای کوردا راکێشێ. ئەو لەوە دڵنیا بوو زۆربەی هەرە زۆری سەرەک هۆزەکانی کوردستان لە ترسی ئینگلیز نەبێ بێ سێ و دوو ئەدەنە پاڵی. ئینگلیزەکانیش چاک لەوە گەیشتبوون بۆیەکا هەر لە سەرەتاوە بە هەموو جۆر هەوڵیان دا گشت لایەنە دەستڕۆشتووەکانی کوردستان لەوە ئاگادار بکەن کە ئەوان دژی شێخن. فەرماندەی گشتیی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق لە راپۆرتە دوورو درێژەکەی خۆیدا بەتایبەتی ئاماژەی بۆ ئەم راستییە کردووە. لە خاڵی بیست و حەوتەمینی راپۆرتەکەیدا دەڵێ لەسەر داوای نوێنەری باڵا دەوروبەری ناوەندی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ بەیاننامەیەکی تایبەتیمان ئامادە کردو بە فڕۆکە بە کوردستاندا بڵاومان کردەوە تا هەمووان بە دروستی لەوە تێ بگەن کە ئێمە دژی شێخین. ئەمەش پوختەی بەیاننامەکەیە:

**«چ حوکمەت و چ نوێنەری باڵا شێخ مەحمود بە یاخی دائەنێن لە ئاستی یاسادا... بۆیەکا بە پێویستی ئەزانن لە هەر شوێنێک لەناو خاکی عیراقدا بینرا بێ ئینزار بۆمبابارانی بکەن. لەبەر ئەوە گشت گوندنشینەکان ئاگادار ئەکەین کە نابێ داڵدەی شێخ مەحمود بدەن، خۆ ئەگەر هاتو داڵدەیان دا ئەوا سەروماڵیان ئەخەنە مەترسییەکی گەورەوە»**[٩٢].

*

* *

ئەمە بوو پوختەی مێژووی پێوەندیی نێوان شێخ مەحمود و ئینگلیزو هۆ بزوێنەکانی ئەو پێوەندییە. تا ئێستە چەند جارێک لە نووسین و موحازەرە تایبەتی و گشتییەکانی خۆمدا گوتومە ئەگەر بێتوو کورتەیەکی ئەم زانیارییانە بدەینە

---

(92) P.R.O., C.O., 730..., Report by the Air Officer Commanding, Iraq Command on the Operation in Southern Kurdistan..., PP.6-7, Par. 27.

ساکارترین کۆمپیوتەری یابانی لە وەڵامدا پێمان ئەڵێ ئەبێ شێخ مەحمود لە هەر عیراقییەک زیاتر رقی لە ئینگلیز بوبێ. شێخ بۆ خۆی بە شێوازێکی بەرز جارێکیان قوڵایی هەستی بەرانبەر ئینگلیز لای گەورەیەکیان دەربڕیوە. سەندرسن پاشای بەناوبانگ کە دوکتۆری تایبەتی کۆشک بوو لە یاداشتەکانیدا کە بە ناوی **«دەهەزار شەو و شەوێک»**ەوە بڵاوی کردوونەوە ئەمەمان بۆ ئەگێڕێتەوە:

**«رابەری شۆڕشگێڕ شێخ مەحمود لە دوای تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهانەوە بیووە چقڵی چاوی میری. دوای چەند ساڵێک شێخ مەحمود بە دەسبەسەری هێنرایە بەغدا. شێخ یەکێک بوو لە نەخۆشەکانم. یەکەم جار کە موعایەنەم کرد لوویەکی بچکۆلەم لەسەر گازی پشتی بەدی کرد، کە لێم پرسی هۆی ئەو لووە چییە وتی:**

**ئەوە گوللەیەکی بەریتانییە!**

**شێخ لەسەر قسەکەی خۆی رۆیی:**

**ئەو گوللەیە کت ومت لە ئێوەی ئینگلیز خۆتان ئەکا، ئێوە بچنە هەر شوێنێک مەگەر شەیتان لەو شوێنە دەرتان پەڕێنێ»** (٩٣).

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوانەی بۆ خۆیان پیاوی دڵسۆزی ئینگلیز بوون، یا جاروبار بە ئاشکراو زۆر جار لە ژێرەوە پشی پشییان بۆ ئینگلیز ئەکرد بە راست و بە چەپدا پەلاماری شێخ مەحمودیان ئەدا، دەسە چەورەکەی خۆیان بەسەر ئەودا ئەسوو، بە زۆری زۆردارەکی ئەیانکردە دەسکەلای دەسی ئینگلیز. لەو بووارەدا هەستی کوێرانەی خۆیان بە پەردەیەکی تەنکی نیشتمانپەروەرییەکی دەسکرد دائەپۆشی و هەموو راستییە رەواکانیان بۆ ئەو مەبەستە هەڵئەگێڕایەوە.

ئەوەی بای بیابانەکان بە دەواری شڕی ئەکەن هەرگیز لەوە زیاتر نییە کە فرۆکەوانەکانی ئینگلیز سەرەتای سییەکان بە شێخ مەحمودیان کرد، کەچی ئەو راستییە زەقە لە رۆژی نیوەڕۆدا وا شێوێنراوە پیاو بەزەیی بە ویژدانی مردووی ئەو شایەتانەدا بێتەوە کە بە ناحەق ملی خەڵکی بێ تاوان ئەکەن بەپەتی سێدارەوە.

---

(٩٣) **«عشرة الاف ليلة وليلة. مذكرات سندرسن باشا طبيب العائلة الملكية في العراق ١٩١٨-١٩٤٦»**، ترجمة وتعليق سليم طه التكريتي، الطبعة الثانية، منشورات مكتبة اليقظة العربية، بغداد، ١٩٨٢، ص١٣٩.

وابزانم دوای ئەوەی بەڵگەکانی ئەم بۆ چوونە ئەخەمە بەرچاو ئەوساکە هەموان حەقی حوکمێکی وا نائاسایی ئەدەن.

چاو خشاندنێکی خێرا بە تۆماری قسەی نایبەکاندا کە لەو ڕۆژانەدا لە هۆڵی پەرلەمان دەرحەقی شێخ مەحمود کردویانن بۆی هەیە بە ڕوونی هەموو لایەنەکانی ئەم باسەمان بۆ شی بکاتەوە. لە کۆبونەوەی چل و هەشتەمینی ڕۆژی شەممەی بیست و هەشتی مارتی ساڵی ١٩٣١ی **«ئەنجوومەنی نوێنەران»**(مجلس النواب)دا هەشت پەرلەمانتار ئەوی ناشێ بە شێخ مەحمودیان کردووە، گەلێک ناوو ناتۆرەیان لێ ناوە، بە ئارەزووی خۆیان پلارو توانجیان تێ گرتووە، بێ پەروا قسەی نزم و ناشرینیان پێی گوتووە، چەندەها تۆمەتی نارەوایان بۆی هەڵبەستووە. سەلمان بەراکی نوێنەری حللەو سابیت عەبدولنوری نوێنەری مووسڵ و زامل مەنناعی نوێنەری مونتەفیک و ئەحمەد جەلیلی دیسان نوێنەری مووسڵ لە هەموان زیاتر حەشریان کردووە. ئەو ڕۆژە سەلمان بەراک بە جارێک خۆی گیف کردەوە، لە هۆڵی پەرلەماندا دەینەڕاند:

**«... وانابێ، بە فەوجێک سەرباز دەتوانین لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا لەناوی بەرین... ئەگەر مەسەلەکە بریتییە لە مەسەلەی شێخ مەحمودو ٣٠٠ سەر لێ شێواو ئەوا من دەتوانم بە فوویەک دەریان پەڕێنم»**[٩٤].

ئەو ڕۆژە ئەحمەد جەلیلی لە هەموان زیاتر هەڵچوو، بە گەرمی داوای کرد **«هەموان چەک دژی ئەو یاخییە چەپەڵە هەڵگرن»**و بە توندی بەرپەرچی قسەکانی عیزەددین نەقیبی نوێنەری باقوبەی دایەوە کە تێیدا داوای کردبوو هەوڵ بدرێ لە ڕێگەی گفتوگۆوە چارەسەرێک بۆ کێشەکە بدۆزرێتەوە[٩٥]، جەلیلی سوور بوو لەسەر ئەوەی شێخ مەحمودو لایەنگرانی لە خوێنی خۆیاندا بگەوزێنرێن، چونکە هیچ گومانی لەوە نەبوو کە **«شێخ مەحمود ئەمرازێکە لە ئەمرازەکان، بەڵام ئەمرازێکە لەو ئەمرازە وێرانکارانەی بێ شەرمانە بۆ لێدانی ئەم وڵاتە بەکار ئەهێنرێ»**[٩٦]. سابیت عەبدولنوری نوێنەری مووسڵ **«ناپاکی شێخ مەحمود»**ی

(٩٤) **«محاضر مجلس النواب. الدورة الثالثة»**، ص٦٧٣.

(٩٥) بۆ قسەکانی عیزەدین نەقیب بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٦٧٢.

(٩٦) هەمان سەرچاوە، ل٦٧٣.

لەوەدا وەدی ئەکرد کە یەک لە دوای یەک دژی عوسمانییەکان و ئینگلیزەکان و رژێمی پاشایی ئەوسای عیراق راپەریوە[٩٧].

وادیارە لە کەش و هەوای وادا عەقڵ ئیجازە وەردەگرێ. بە پێی گێرانەوەی عەبباس عەزاویی شارەزا زامل مەنناع[٩٨] سەرەک هۆزێکی لەسەرخۆو پێوەندی لەگەڵ ئینگلیزدا چاک بوو[٩٩]، کەچی ئەویش خۆی پێ نەگیراوەو لە ئاستی خۆیەوە کەوتۆتە هات و هاوار:

**«ئەم حوکمەتە حوکمەتێکی عەرەبیی سەربەخۆیەو هیچ کەس لە رەعییە بۆی نییە یاری بە چارەنووسی بکا»**[١٠٠].

لێرەدا نایبە کوردەکان وەخەبەر دێن، غیاسەدینی نەقشبەندی کە یەکێک دەبێ لە نوێنەرانی کوردی مووسڵ دێتە دەنگ و دەڵێ **قوربان ئەم حوکمەتەی جەنابتان ئەفەرموون حوکمەتی هەمووانە.** قسەکانی نەقشبەندی نایبە کوردەکانی تریش ئەبزوێنێ، لە خۆشییاندا خۆیان پێ ناگیرێ و بەتەنها ئەکەونە چەپڵە رێزان[١٠١]... خوانەیبڕێ.

رۆژنامەکان لە نایبەکان کەمتریان نەکرد، ئەوانیش ئەوی نەشیا بە شێخ مەحمودیان کرد، هیچ کامیان بە پێویستی نەزانی بەدووی بەڵگەیەکدا بگەرێ بۆ سەلماندنی ئەوەی شێخ مەحمود پیاوی ئینگلیزەو بە فەرمانی ئەوان راپەریوەو داوای مافی کورد ئەکا، ئەو مەسەلەیە بەلایانەوە هێند روون و ئاشکرا بوو هیچ پێویستی بە بەڵگەو سەلماندن نە ئەکرد، رستەی قەڵەو قەڵەوی پڕ لە جوێن و پلارو توانج جێگەی بۆ عەقڵ و لێکدانەوە نەهێشتبۆوە. تەنانەت رۆژنامەی **«العراق»**یش لەم

---

(٩٧) هەمان سەرچاوە، ل٦٧٥.

(٩٨) زامل مەنناع سەرەک تیرەی ئەجوەد بوو لە مونتەفیک، لە ئەسڵدا لە ئەحساوە هاتۆتە عیراق، یەکێک بوو لەو سەرەک هۆزانەی ئینگلیز دوای داگیرکردنی عیراق زەوی و زاریان بەسەریاندا دابەش کرد، تا کۆچی دوایی لە ساڵی ١٩٥٢دا چەند جارێک بووە نایب، لایەنگری ئینگلیز و نوری سەعیدو وەصی بوو.

(٩٩) عباس العزاوي، عشائر العراق، الجزء الرابع (اهل الارياف)، بغداد، ١٩٧٦، ص٧٧-٧٨.

(١٠٠) **«محاضر مجلس النواب. الدورة الانتخابية الثالثة»**، ص ٦٧٣.

(101) P.R.O., C.O., 730, 163/88069, X/M 08533, 1931, Shaikh Mahmud, Part I, Extract from Intelligence Report No. 7, Dated 1st April 1931.

بووارەدا دریغی نەکرد، هەرچەندە بۆ خۆی دەسنێژی ئینگلیز و دوژمنی باوە کوشتەی هەموو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز بوو، کاتی خۆی لە شێخ مەحمود زیاتری بە سەرانی شۆرشی بیست کرد، بەڵام لە بۆ چوونێکی تەواو جیاوازەوە. تەنها لەو وتارە دوورو درێژەیدا کە رۆژی هەینیی بیست و یەکی مارتی ساڵی ١٩٣١ دەربارەی شێخ مەحمود بڵاوی کردۆتەوە **«العراق»** چەند جارێک بە جەردەو چەتە و یاخی و خایەن و نەفام و نەخوێندەوارو شێت ناوی بردووە(١٠٢).

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە ئەو رۆژنامانە جارو بار دەقی ئەو وتارانەیان بڵاونەکردەوە کە رۆژنامەو گۆڤارەکانی لەندەن دەیاننووسین و بە راشکاوی سەرنجی دوژمنانەی خۆیان بەرانبەر بە شێخ مەحمود تێیدا دەرئەبری. بە وێنە رۆژنامەی **«العالم العربي»** سەرجەمی ئەو وتارە درێژەی گۆڤاری نیر ئیستی (١٠٣) بڵاوکردەوە کە هەمووی هێرشە بۆ سەر شێخ مەحمود و خەفەتی ئەوە ئەخوا کە ئینگلیز ساڵی ١٩١٩ لەناویان نەبرد(١٠٤). شایانی باسە سەرەتای سییەکان رۆژنامەی **«تایمس»**یش بە هەمان دەستوور رەخنەی لە شێخ مەحمود ئەگرت، ئەوەی هەر زوو سەرنجی رۆژنامەنووسە بیانییەکانی راکێشا(١٠٥).

کاتێک بە ناوەرۆکی لێشاوی ئەو هەموو تۆمەت و توانج و پلارو جنێوانەدا دەچیتەوەو لەگەڵ راستیی رووداوەکاندا بەراوردیان ئەکەیت لە حوکمی رەوای مێژوو بەولاوە هیچت بۆ نامێنێتەوە کە تێت دەگەیەنێ ئەو جۆرە توندڕەوە شۆڤێنییانە چ ئاوێکی خراپیان رشت و چەند لە ئاستی کوردو چارەنووسی ئەم وڵاتەدا گوناهبارن.

لەو رۆژانەدا لەناو هۆڵی پەرلەماندا دەنگێکی رەوای نزم بۆ خزمەتی حەقیقەت بە رزبۆوە، ئەویش دەنگی موزاحیم ئەمین پاچەچی بوو. موزاحیم پاچەچی بۆ ئەوسای عیراق خوێندەوارێکی چاک و سیاسییەکی شارەزا بوو، بیستەکان چەپڕەوو لەبەرەی ناحەزانی ئینگلیزدا چالاک بوو، بەرادەیەک راپۆرتێکی تایبەتیی

---

(١٠٢) **«العراق»**(جريدة)، بغداد، ٢٧ آذار ١٩٣١.

(103) "The Near East and India", April 16, 1931.

(١٠٤) **«العالم العربي»**، بغداد، ٢٨ نيسان ١٩٣١.

(١٠٥) بە وێنە بروانە:

"Zaria Vostoka", Tiblisi, April 28, 1931.

اعلان

برای عموم اهالی از طرف کردستان

کل دوای دولت فخیمه

ئینگلیزەکان دەربارەی گەورە پیاوانی عیراق وای لەقەڵەم داوە گوایە پزیشکی کۆمۆنیزم تێکەڵ بە بیروباوەڕی موزاحیم پاچەچی بووە[(١٠٦)]. بەرلەوەی موزاحیم پاچەچی بێتە وەزیر ڕێکخراوە کوردییە تازە دامەزراوەکان پێوەندییان پێوەی کرد. نوری سەعیدی دانا دەیزانی بە ڕاکێشانی پاچەچی دەتوانێ کەلێنێکی گەورە بخاتە ناو ریزی ناحەزانییەوە. سەرەتای کانوونی دووەمی ١٩٣١ نوری سەعید موزاحیم پاچەچی کردە وەزیری ئابووری، پاش ماوەیەک وەزارەتی کاروباری ناوخۆشی بەو سپارد کەتا ئەو کاتە بەدەست خۆیەوە بوو. جا لە کۆبوونەوەی ڕۆژی بیست و هەشتی مارتی ١٩٣١ی ئەنجوومەنی نوێنەراندا ئەو وەک وەزیری ناوخۆ ئامادە بوو. دوای هاواری توندڕەوەکان قسەی وەرگرت و لە وەڵامدا گوتی: **«... دەربارەی ئەوەی نوێنەری مووسڵ گوتی کە شێخ مەحموود ئامرازی دەستی هەندێ لایەنە، کەی ویستیان بەکاری ئەهێنن من پێم وایە گوتنی قسەی وا لە جێگەی خۆیدا نییە، لەوە دەترسێم هەڵس و کەوتی ڕابوردووی شێخ مەحموود پەردەی گومان بخاتە سەر ئەو تۆمەتە، چونکە هەر شێخ بۆ خۆی دژی دەسەڵاتی عوسمانی و دژی دەسەڵاتی**

---

(١٠٦) **«تقرير عن الشخصيات الرئيسية في العراق في سنة ١٩٣٥ من السير ارجيبولد كلارك كير الى مسترايدن»، «العراق في الوثائق البريطانية سنة ١٩٣٦»**، اعداد وترجمة وتحرير نجدة فتحي صفوت، البصرة، ١٩٨٣، ص ٥١-٧١.

**بەریتانی لە رۆژانی ئیحتیلالداو دژی دەسەڵاتی عیراق راپەڕی، ئەو پیاوە خووی بە شۆڕش و یاخی بوونەوە گرتووە»**[107].

شێخ مەحمود تا ئێستەش لە پلارو توانجی ناڕەوا رزگاری نەبووە. ماوەیەک لەمەو بەر ژمارەیەک وردە فرۆشی ئاخر زەمان بۆ ئەوەی هیچ لە مێژووی شێخ مەحمودو ژیانی بزانن کەوتنە پەلاماردانی لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەو گۆڤارەکان، دوو روناکبیری کورد، **عەبدوڵلا عەباس و موحسین تاهیر بەرزنجی** لێیان هاتنە دەست و وەڵامی شیاویان دانەوە[108]. خوا هەڵناگرێ بەرانبەر ئەو جۆرە وردەفرۆشانە رۆژنامەنووسی بەوێژدانی وەک حەمید مەطبەعیش هەڵئەکەوێ کە پێی وایە **«تەنها گوتەیەکی شێخ مەحمود هاوسەنگی سێ کتێبە لە مێژووی نیشتمانپەروەریدا»**[109].

ئەوی بەتایبەتی جێگەی داخ بێ ئەوەیە کە ئەو لێشاوی تۆمەتەی دراوەتە پاڵ شێخ مەحمود لەناو کتێبی ژمارەیەکی زۆر لە مێژوونووسانی عەرەبدا جێگەی دیاری بۆ خۆی کردۆتەوە بێ ئەوەی گوێ رایەڵی ئیبن خەلدونی گەورە بن کە بەگەرمی داوای لە مێژوونووسان ئەکرد ئەوی لەگەڵ عەقڵ و مەنتیقدا نەگونجێ رەتی بکەنەوە. ئا لێرەدا دێمە سەر سەرناوی وتاری ئەمجارەم کە سەرناوێکی رۆژنامەنوسانەیە نەک زانستییانەو ئەڵێم: **وا دیارە ئەو کاولکاری و راوودوونانە زۆرەی فرۆکەوانە ئینگلیزەکان لە کوردستاندا ئەنجامیان دا هەر هەموویان گاڵتەو گەپ و گەمە بوون کاتیان لەگەڵ شێخ مەحمودا پێ ئەبردە سەر. بەوەی باشە ئەو تۆمەتکارانە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی شێخ مەحمود نازانن، ئاگایان لەوە نییە پیاوێکی قسەخۆش و نوکتەبازو قۆشمە بووە** ئەگینا بەپێوە ئەچوونە سەر قورئان و دەیانگوت ئەوی لە کوردستان قەوما **«بەراستی»** گاڵتەو گەپ و گەمە بوو لە نێوان شێخ مەحمود و فرۆکەوانە ئینگلیزەکاندا.

---

(١٠٧) **«محاضر مجلس النواب. الدورة الانتخابية الثالثة»**، ص ٦٧٤.

(١٠٨) بروانە: **«الثورة»** (جريدة)، بغداد، ٢ نيسان ١٩٩٢؛ **«شمس كردستان»** (مجلة)، بغداد، العدد ٨١، تشرين الاول ١٩٩٣، ص٥-٧.

(١٠٩) **«القادسية»**(جريدة)، بغداد، ٦ كانون الاول ١٩٩٢.

# بەڵگەنامەیەکی نهێنی بایەخدار دەربارەی هەڵوێستی ئینگلیز بەرانبەر شێخ مەحمودو بزووتنەوەکانی

زۆرجار توانجی نابەجێ دەگیرێتە شێخ مەحمود[1]، هی ئەوتۆ هەن بێ سێ و دوو بە داردەست و پیاوی ئینگلیزی دادەنێن. بێ گومان شێخ مەحمودیش وەک هەر سەردارێکی مێژوویی تری ئەم جیهانە جاروبار دروست نیشانی نەپێکاوە، جاروباریش کەوتۆتە هەڵەوە، ئەوەش بۆ خۆی دیاردەیەکی ئاسایی ئەوتۆیە کە تەنانەت پێغەمبەرانیشی گرتۆتەوە. لینین کاتی خۆی راستی فەرمووە **«تەنها ئەوانە ناکەونە هەڵەوە کە هیچ ناکەن»**. هەر هەڵەو ناتەواوییەکیش دەبێ بە سەنگی کات و شوێنی خۆی بکێشرێ، نە لێی کەم بکرێتەوە تا وای لێ بێ کەس نەیبینێ و پەندی لێ وەرنەگرێ، نە وا گەورەش بکرێ بەری چاوی پێ بگیرێ و لایەنی چاک و گەورەیی کەسانی پێ داپۆشرێ. بەڵام هەرچۆن بێ دەبێ سەردارو ڕابەری لێهاتوو لە کەسانی ئاسایی کەم هەڵەتر بن، ئەنجامی هەڵەی ئەوان لەوانەیە کوشندە بێ و سەرانسەری گەلێکی پێوە گیرۆدە بێ. نموونەی مێژوویی ئەم راستییە زۆرو بەرچاوە.

**شێخ مەحمود بۆ رۆژگاری خۆی سەردارێکی شایستە بوو، تا رادەیەکی باش جێگەکەی خۆی بە شیاوی پڕ کردبۆوە، زۆری بۆ کورد کردو زۆریشی لە پێناویاندا**

---

(*) لە ژمارە (١٣٥)ی ئاداری ساڵی ١٩٩٥ی گۆڤاری **«رۆشنبیری نوێ»**دا بلاوکراوەتەوە.

(١) کاکە حەمە بۆری خۆمان دوا کەسە کە لە لاپەڕە حەوت و هەشتی ژمارە حەفتاو پێنجی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٥ی **«رەنگین»**(*)دا رەخنەی لە شێخ مەحمود گرتووە، هیوادارم لە دەرفەتێکدا بتوانم بە تایبەتی هەر لەسەر لاپەڕەکانی **«رەنگین»**ی خۆشەویست خۆیدا کورتە دەمەتەقێیەکی لەو بارەیەوە لەگەڵدا بکەم.

* {بنۆڕە پاشکۆی ژمارە (٦). **«عەبدوڵڵا زەنگەنە»**}.

**چێشت، لە کاتێکدا دەیتوانی لە سەرجەمی گەورە پیاوانی کوردی هاوچەرخی خۆی زیاتر لەنازو نیعمەتدا بژی. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە دوژمنانی کورد بە خوێنی سەری تینووبوون.** من بەش بەحاڵی خۆم دەیان بەڵگەنامەی دیپلوماسی تایبەتیم لایە کە هەموویان جەختی سەلمێنەری ئەم بۆچوونەن. لەم کورتە وتارەدا بە تایبەتی باسی یەکێک لەو بەڵگەنامە نهێنییانە دەکەم کە بۆ مێژووی خەباتی شێخ مەحمود بە هیچ نانرخێنرێ.

ئەو رژێمەی شێخ مەحمود تەشرینی دووەمی ساڵی۱۹۲۲ دایمەزراند لەبەر گەلێک هۆی ئاڵۆزی ناوەکی و دەرەکی تێکەڵ بۆ ئینگلیز دەستی نەئەدا، بۆیەکا دەبوو ناوی لە نەخشەدا نەمێنێ. جێ بەجێ کردنی ئەو کارە لەوێزەی لەشکری میریدا نەبو. عەبدولعەزیز یامولکی کە یەکێک بوو لە ئەفسەرە خوێن گەرمەکانی ئەو لەشکرە شتی زۆر سەیرو سەمەرە دەربارەی کەم و کورتی و ورە نزمی ئەو هێزانەی دەگێڕێتەوە کە بەتایبەتی بۆ دامرکاندنەوەی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود ئاراستەی کوردستان کرابوون[٢]. بۆمباو گوللەبارانی فڕۆکەو تۆپ و زرێ پۆشەکانی ئینگلیز رژێمەکەی شێخ مەحمودیان روخاند، بەڵام ئەوانیش نەیانتوانی دواڕادە بۆ راپەڕینەکەی دابنێن کە لەقۆناغی شەڕی چەتەگەریدا بە تەواوی ئینگلیزو لەوانیش زیاتر دەستەو دایەرەی مەلیک فەیسەڵیان وەڕس کردبوو، هەر رۆژەی لەلایەکەوە لێیان راست دەبۆوە.

ئینگلیزەکان بە وردی ئاگاداری ئەوەش بوون کە هەست و نەستی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لەگەڵ شێخ و دروشمەکانیدایە، ئەو راستییەی، لەدووتوێی ئەم وتارەشدا بە ئاسانی هەستی پێ دەکەین، هەرچەندە دەزگاکانی راگەیاندنی ئینگلیز بە مەبەستی چەواشەکردنی خەڵکەکەو **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»**[٣] بە سەرزاری دانیان بەوەدا نەدەنا.

لەو کاتەدا کێشەی مووسڵیش هاتبووە کایەوە، کەمالییە بەهێزەکانی تورکیا

---

(٢) **«كشف القناع عن بعض الوقائع العراقية. مذكرات عبدالعزيز يا ملكي في العراق»**، الجزء الأول، بغداد، ١٩٥٧، ص١٠-١٤، ١٦-١٧.

(٣) عصبة الامم.

دەیانویست ویلایەتی مووسڵ بۆ خۆیان زەوت بکەن. لە ناو کوردی باشووردا لە ڕقی ئینگلیزو بە هۆی کورتبینی فەرمانڕەوایانی ئەو ڕۆژگارەی عیراقەوە کەمالییەکان لایەنگریان کەم نەبوو[٤]. لەبەر گەلێک هۆی ئابووری و سیاسی کەمالییەکان ویلایەتی مووسڵیان مەبەست بوو، ئەوان، بەپێی مێژوونووسی ئاگاداری ئینگلیز ئارنۆلد تۆینبی، لەوە زراوەترەک بووبوون کە بەشێک لە کوردی ئیمپراتۆریی عوسمانی روخاویان لەدەست بچێ چونکە نیازیان لەگەڵ کوردا پاک نەبوو[٥]. سەرباری ئەوە کەمالییەکان تینووی داهاتی چاوەڕوان کراوی نەوتی ویلایەتی مووسڵ و خێروبێراتی زۆری تری بوون تا وڵاتەکەیانی پێ ببوژێننەوە[٦].

بۆ دیارکردنی چارەنووسی ویلایەتی مووسڵ دەنگی کورد بۆ هەردوو داواکاری ئەو هەرێمە زۆر پێویست بوو. کەمالییەکان هەوڵیان دا چەند دەتوانن هێند کەڵک لە سەردارانی کورد وەربگرن، بە تایبەتی شێخ مەحمود کە ئەویش دوای ئەوەی هیوای بە ئینگلیز نەما بۆ جێ بەجێ کردنی مەبەستەکانی لاریی لە دامەزراندنی جۆرە پێوەندییەک لەگەڵ کەمالییەکاندا نەبوو کە ئەوساکە لای هەموو نیشتمانپەروەرانی جیهان خۆشەویست بوون، چونکە بە دوژمنی گەورەی ئینگلیز لە سەرجەمی ڕۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاستدا دادەنران. جگە لەوە ئەو کوردانەی لە نێوان هەردوو لادا بوون وایان بردبووە مێشکی شێخ مەحمودەوە گوایە ئینگلیز نامادەن دەست لە ویلایەتی مووسڵ هەڵبگرن و کەمالییەکانیش، دیسان گوایە، لارییان لەوە نییە ئۆتۆنۆمی بدەنە کورد. بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیا باسی چالاکییەکانی **«ئەحمەد تەقی ئەفەندی»** دەکات لەم بوارەدا، وەک دەڵێ ئەحمەد تەقی دەورووبەری حەوتی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٣ لە ئەنقەرەوە بە ڕێگەی ورمێدا گەڕاوەتەوە سلێمانی و لەوێ ڕای گەیاندووە کە **«ویلایەتی مووسڵ بێ سێ و دوو دەگەڕێتەوە دەست تورک و حوکمەتی بەریتانی دەپاڕێتەوە بۆ**

---

(٤) ناحەزانیان بە توانجەوە ناویان لێ نابوون **«جل خوارەکان»**.

(5) A. Toynbee, Angora and the British Empire in the East, The Contemporary Review , London, June 1923, PP. 386-387.

(٦) الدكتور فاضل حسين، مشكلة الموصل. دراسة في الدبلوماسية العراقية- الانكليزية- التركية وفي الرأي العام، الطبعة الاولى، بغداد، ١٩٥٥، ص٢٧٢، ٣٠١-٣١١.

ئەوەی تەنها **هێڵی شەمەندەفەرو بەشێک لەنەوتی»** ئەو هەرێمەی پێ بدرێ. بەپێی هەمان بەڵگەنامە **«ئەحمەد تەقی ئەفەندی»** گوتوویە کە **«فەرمانی ئۆتۆنۆمیی پێیە بۆ شێخ مەحمود»**[٧].

پێوەندی نێوان کەمالییەکان و شێخ مەحمود زۆر زوو دەستی پێکرد. شێخ مەحمود کە لەهندستان گەڕایەوەو بەر لە کۆتایی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٢[٨] لە بەغداوە بەرەو کوردستان کەوتە رێ پێش ئەوەی بگاتەوە بارەگای جارانی لە سلێمانی هەر لە رێگەوە پێوەندیی لەگەڵ کەمالییەکاندا دامەزراند، ئەوەی ئینگلیزەکان، وەک خۆیان لەو راپۆرتەیاندا کە داویانە بە**«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** دانیان پێدا ناوە، دوایی پێیان زانیوە[٩]. ئەمە دەبێ بۆ شێخ مەحمود بنووسرێ، چونکە هەڵخەڵەتاندنی ئینگلیز لە بارودۆخی ئەو رۆژگارەی کوردو عیراقدا کارێکی هەروا ئاسان نەبوو.

پێوەندی نێوان شێخ مەحمودو کەمالییەکان لە چەند رێگەیەکەوە رێچکەی بەست. ئۆزدەمیری[١٠] بەناوبانگ یەکێکیان بوو[١١]. رەفیق حیلمی و بەتایبەتی ئەحمەد تەقی لەو بوارەدا دەوری گەورەیان بینی[١٢]. بەپێی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز خۆیان غەفور خانی ناودەشت[١٣] و عەبدوڵڵا ئاغای **«کۆنە مودیر»**[١٤]و سیتۆ

---

(7) Public Record Office, Foreign Office, 371 10097, 4601, Intelligence Report No. 24, December 15. 1923, Kurdistan in Iraq, No. 880, PP. 5-6.

(٨) شێخ مەحمود رۆژی ١٢ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٢ گەیشتە بەغدا، دوای دیدەنیی مەلیک فەیسەڵ و پێرسی کۆکس بەرەو سلێمانی گەڕایەوە، لە رێگە پێشوازییەکی گەرمی لێ کراو لە چەند شوێنێک لای دا. رۆژی ٣٠ی ئەیلول گەیشتەوە سلێمانی.

(9) "Iraq. Report on Iraq administration, April 1922- March 1923", London, 1924, P. 36.

(١٠) ناوی عەلی شەفیقە، بە رەگەز میسرییە، ئەفسەری لەشکری عوسمانی بوو، بە گەرمی لایەنی مستەفا کەمالی گرت، هەوڵی دەدا لە رێگەی بزواندنی هەستی ئاینییەوە کورد لە خشتە بەرێ.

(11) M.A. Kamal, Natsionalno Osvoboditelnoe dvijenie v Irakscom Kurdistane, Baku, 1967, PP.98-99, 112,114.

(١٢) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە یادداشتەکانی رەفیق حیلمی و ئەحمەد تەقی و **«چیم دی»**یەکەی ئەحمەد خواجا.

(١٣) غەفور خانی ناودەشت لە بنەماڵەیەکی ناسراوی ناوچەی رانییەیە، یەندزەی بنار قەندیل گوندی سەرەکییانە، تورکی زانێکی چاک بووە.

(١٤) لە بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە ناوی هاتووە، مەبەست عەبدوڵڵا ئاغای کوڕی حاجی تایەر ئاغای

ناوێکی خەڵکی ئامێدیش دەوریان لەو کارەدا بینیوە. ئینگلیزەکان لەو پێوەندییە یەکجار قارس بوون، هەوڵیان دا بە زووترین کات رادەی بۆ دابنێن و مەیتەرەکانی شێخ مەحمودو لایەنگرەکانی بۆ لای کەمالییەکان دەسگیر بکەن، بەڵام لەوەدا سەرکەوتنیان وەدەست نەهێنا. لە بەڵگە نهێنییەکانیاندا ئینگلیزەکان دانیان بەوەدا ناوە کە هەستی دانیشتوانی ناوچەکە بەرانبەر بە شێخ مەحمود بۆتە کۆسپی جێ بەجێ کردنی ئەو نیازەیان کە، دیسان بەپێی قسەی خۆیان، بێ هاریکاریی کاریگەری دانیشتوانی ناوچەکانی رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵاتی کۆیە سەری نەدەگرت(١٥).

لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتیی دەبوو دەستوبرد بزووتنەوەکانی شێخ مەحمودو پێوەندییەکانی بە کەمالییەکانەوە بن بڕ بکرێن. ئەو لیژنەیەی **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی مووسڵ دایانبوو تا کۆتایی مانگی مارتی ساڵی ١٩٢٥ کارەکانی خۆی لە عیراق تەواو کردو گەڕایەوە جنێڤ و لە دەوروبەری کۆتایی مانگی نیسانەوە لەوێ کەوتە دانانی ئەو راپۆرتە بایەخدارەی خۆی کە **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** دەبوو بەپێی راسپاردەکانی چارەنووسی ویلایەتی مووسڵ دەسنیشان بکات. ئەو لیژنەیە لە راپۆرتەکەی خۆیدا گوتبووی ئەگەر بێتو مافە نەتەوەییەکانی کورد دابین نەکرێن ئەوساکە وای بەباش دەزانێ ویلایەتی مووسڵ بدرێتە تورکیا چونکە ئەو وەک دەوڵەتێک لە عیراق چەسپاوو پێشکەوتووترە(١٦).

---

کوڕی حاجی بەکر ئاغای گەورەی سەرداری حەوێزییانی ناوچەی کۆیەیە، حاجی تایەر ئاغای باوکی عەبدوڵلا ئاغاو طەیب ئاغاو لە دایکەوە باپیری مەلای گەورە لە رۆژگاری عوسمانیدا لای دەروازەی باڵا دەست رۆیشتوو بوو، لە بەغدا قۆناغی تایبەتی خۆی هەبوو، زۆر دەوڵەمەندو جێگەی بڕوا بوو. هەرچی عەبدوڵلا ئاغا خۆیەتی ئینگلیز سەرەتای هاتنیان کردیانە مودیری تەق تەق، بەڵام لەبەر ئەوەی حەزی لە کەمالییەکان بوو دووریان خستەوە، مستەفا کەمال نیشان و بەرگی پاشایی خەڵات کردووە کە تا دوا رۆژانی ژیانی لە ئاهەنگە تایبەتییەکاندا لەبەری دەکردن.

(15) Public Record Office, AIR, 23/1372, X/M 04583, from Air Headquarter s Iraq to Secretary High Commissioner, Baghdad, No. 1/17, 17th May, 1924, P.11;

دار الكتب والوثائق(لەمەودوا: د.ک.و)، التسلسل ١٦٧، مذكرة من المقر الجوي البريطاني في العراق الى سكرتير المندوب السامي برقم ١/١٧ وتأريخ ١٤ آيار ١٩٢٤، الوثيقة رقم ١٤، ص١٤.

(16) "Question of the frontier between Turkey and Iraq. Report submitted to

هەر لەو دەوروبەرەشدا راپەڕینە گەورەکەی شێخ سەعیدی پیران لە کوردستانی تورکیا بەرپابوو، ئەوەی بووە بیانوویەکی بێ هاوتا بە دەست ئینگلیزەوە بۆ سەلماندنی نارەزایی کورد لە تورکیای کەمالی. بەرانبەر بەوە کەمالییەکان خوا خوایان بوو راپەڕین و ئاژاوە سەرانسەری کوردستانی عیراق بگرێتەوە بۆ ئەوەی ئەوانیش بیکەنە بەڵگەی نارەزایی کورد تا ئەوە کار بکاتە سەر دوا بڕیاری **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** دەربارەی چارەنووسی ویلایەتی مووسڵ. هێنری دۆبسی نوێنەری باڵای [17] بەریتانیای گەورە لە عیراق لەو پێشەکییەی خۆیدا کە بۆ نامەکانی گێرترود بێڵی نووسیوە[18] دەڵێ ئەگەر ئەو ئاواتەی کەمالییەکان بهاتایە دی هەڵبەت بە خراپترین شێوە بۆ عیراق کاری دەکردەسەر ئەنجومەنی **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** کە ئەوساکە لە جنێڤ خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لە کێشەی مووسڵ.

لەو بارودۆخە ناسکەدا بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود لە هەرکات زیاتر زیانیان بۆ ئینگلیز هەبوو، بەڵگەی نارەزایی کوردو بێ بەری کردنیان بوون لەمافە رەواکانیان کە شێخ سوور بوو لەسەر دابین کردنیان، بۆیەکا دوای روخاندنی رژێمەکەی و دوورکەوتنەوەی بەشێک لە هۆزە ناودارەکانی کورد لێی بەرە بەرە خۆی گرتەوەو رۆژ بە رۆژ بزووتنەوەکانی زیاتر پەرەیان دەساندو لە زۆر لاوە بە دەنگییەوە چوون. هەر بەپێی بەڵگەنامە تایبەتییەکانی ئینگلیز خۆیان لە یەکێک لە شەڕەکانی ئەو رۆژانەی شێخدا سەد کەسی ناوچەی سروچک و هەشتا بەرزنجەیی و حەفتا هەمەوەندی و پەنجا شاربازێری بەشداریبیان کردووە[19]. لە شەڕێکی تریدا کە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥ لە نزیک کەنارۆوە قەوماوە شێخ مەحمود، دیسان بە پێی گێڕانەوەی بەڵگەنامە ئینگلیزییەکان، نزیکەی ٥٠٠ چەکداری لەگەڵ بووە کە

---

the council by the Commissioner instituted by the Council resolution of September 30, 1924", Lasuanne, 1925, PP. 57, 77, 88-89.

(١٧) دوور نییە «نوێنەری باڵا» بۆ واتای «المندوب السامي» دەست بدات، چونکە مەبەست لەو زاراوە ئەو کەسەیە کە بەناوی حوکمەتی بەریتانیای گەورەوە بە رەزامەندی «کۆمەڵەی نەتەوەکان» سەرپەرشتی بەڕێوەبردنی کاروباری عیراقی دەکرد لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠ و ١٩٣٢دا، واتە بەر لەوەی سەربەخۆیی تەواوی پێ ببەخشرێ.

(18) "The Letters of Gertrude Bell", Eleventh Printing, London, April 1930.

(19) Public Record Office, AIR, 23/195-Part 7,X/M 04583, From Special Sulaimani to Aviation Baghdad, No. M/282, 5th June, 1925, P.55.

بەشێکیان پشدەری و لەژێر فەرماندەی پیرۆتی حاجی رەسوڵ ئاغادا بوون، بەشێکیشیان هەمەوەندو لە ژێر فەرماندەی کەریمی فەتاح بەگ و سابیری کوڕیدا بوون، ٥٠ کەسیشیان لە ژێر فەرماندەی سەید رەوف و یونس ئەفەندیدا بوون[٢٠].

نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٢٤و نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٢٥[٢١] ژمارەیەک لەو جۆرە شەڕانەیان بەخۆیانەوە بینی. لەو راپۆرتی ساڵانەیەیاندا کە ئینگلیزەکان دەبوو دەربارەی بەڕێوەبردنی کاروباری عیراق بیدەنە **«کۆمەڵەی نەتەوەکان» «بەشەرمەوە»** باسی ئەو شەڕانەیان بەم جۆرە کردووە:

**«بنکەی سەرکردایەتی شێخ مەحمود کەوتۆتە رۆژهەڵاتی قەزای شارباژێڕەوە، شێخ هەموو هەلێک دەقۆزێتەوە بۆ نانەوەی ئاژاوە...»**[٢٢]. لە شوێنێکی تری هەمان راپۆرتدا ئینگلیزەکان باسی ئەوە دەکەن چۆن هێزە چەکدارەکانی میری بە درێژایی ساڵی ١٩٢٥ پەلاماری هێزەکانی شێخ مەحمودیان داوەو لە ئەنجامدا ٤ ئەفسەرو ٣ سەربازیان لێ کوژراوەو ٢٦ سەربازیان لێ بریندار کراوەو ٣ سەربازیشیان لێ بە دیل گیراوە جگە لەوەی ٥ کەسیشیان بێ سەروشوێن ماونەتەوە[٢٣].

ئەم زیانانە بۆ رۆژگاری خۆیان کەم نەبوون، بەتایبەتی ئەگەر لە هەڵسەنگاندنیاندا باری قورسی جەنگاوەرانی کورد فەرامۆش نەکەین. لە بەڵگەنامەیەکی تریاندا ئینگلیزەکان، بێ ئەوەی خۆیان مەبەستیان بێ، ئەو لایەنەی باسەکەیان بە وردی بۆ تۆمار کردووین. بەڵگەنامەی ناوبراو هی وەزارەتی هێزی ئاسمانی بەریتانییە، باسی شەڕێک دەکات کە رۆژی ٢٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥ لە نزیک چوارتاوە لە نێوان هەردوولادا قەوماوەو وەک دەڵێن شازدە سەعاتی رەبەقی خایاندووەو بۆتە هۆی شەهید بوونی ژمارەیەکی زۆر لە چەکدارانی

---

(20) Ibid, 23/198-Part 10, X/M 04583, From Special Choartah to Aviation 1925, P.3. Adm. Sul., No. M/CH 52, 27th June

(٢١) ئەو ماوەیەمان بە تایبەتی پێویستە بۆ لێکدانەوەی ئەو بەڵگەنامەیەی سەردێڕو ناوەڕۆکی ئەم وتارەمان بۆی تەرخان کردووە.

(22) "Report by His Britannic Majesty s Govemmnent to the Council of the Leagne of Nations on the administration of Iraq for the year 1925", London, 1926, P.21.

(23) Ibid, PP. 103-104.

کورد کە وا دیارە بە چەک و تفاقێکی کەمەوە بەرەنگاری داگیرکەر دەهاتن، چونکە هەمان بەڵگەنامە دەڵێ: **«بە کوژراوەکانی دوژمندا**[٢٤] **وا دەردەکەوێ هەر یەکەیان ژمارەیەکی یەکجار کەم گوللەیان پێ مابێ»**[٢٥].

لە بارێکی وا سەختدا هەڵبەت زیانی گیانی شۆڕشگێڕان گەورە دەبێ. بەپێی ئەو بەڵگەنامەیەی باسی شەڕەکەی نزیک کەنارۆ دەکات لایەنگرانی شێخ مەحمود ١٩تا٢٣ کوژراویان هەبووە[٢٦].

لەگەڵ ئەوەش بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود پەلیان دەهاویشت و دیسان لە دوو لاوە گەیشتنەوە دەوروبەری کەرکوک. بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی موستەعمەرات کە مێژووی ٢٠ی ئابی ساڵی ١٩٢٥ی بەسەرەوەیە باسی ئەوە دەکات چۆن پرۆپاگەندەی شێخ مەحمود زۆر کاری کردۆتە سەر هەمەوەندەکانی چەمچەماڵ بە رادەیەک **«خۆیان کۆکردۆتەوە بۆ بەشداربوون لە شەڕدا»**[٢٧]. لەولایشەوە جەنگاوەرانی کورد بەپێی بەڵگەنامەیەکی تری هەمان وەزارەت بەر لە کۆتایی هەر ئەو مانگە گەیشتوونەتە ناحییەی گل و گوندی قەرەخاوەر، ئەوەی کاربەدەستانی کەرکوکیان ناچار کردووە پەنا بەرنە بەر تاڵەبانییەکان، جگە لەوەی فڕۆکەکانی ئینگلیزیش کەوتوونەتە گیانیان[٢٨].

سەرباری کەمالییەکان شێخ مەحمود هەوڵی دەدا پێوەندی بە زۆر لایەنی ترەوە بکات کە هەموویان لەو سەردەمەدا ناحەزی ئینگلیز بوون. یەکێک لەو لایەنانە ئێرانی رەزا شا بوو کە ئەوساکە ئەویش زۆر دانووی لەگەڵ ئینگلیزدا نەدەکوڵاو هێشتا دانی بە رژێمەکەی مەلیک فەیسەڵدا نەنابوو[٢٩]. رووناکبیرانی کوردو

---

(٢٤) مەبەستی شۆڕشگێڕانی کوردە.

(25) Public Record Office, AIR, 23/198- Part 10, X/M 04583, From Cameron, Choartah to Aviation, No. CH/ 55, 29th June, 1925, P.28.

(26) Public Record Office, AIR, 23/198- Part 10, X/M 04583, From Special Choartah to Aviation Adm. Sul., No. M/CH/52, 27th June, 1925, P.3.

(٢٧) دەربارەی ناوەرۆکی ئەو بەڵگەنامەیە بڕوانە: م.ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووەم، لەندەن، جاف پرێس، ١٩٩١، ل٥٧٦.

(٢٨) هەمان سەرچاوە، ل٥٧٧.

(٢٩) لای بەڕێز کاک کەمال نوری مەعروف ناوەرۆکی ژمارەیەک لەو نامانەم دی کە شێخ مەحمود ناردوونی بۆ رەزا شای پەهلەوی و حەلاوە خانی هاوسەری شێخ لەتیف، ماڵی ئاوایێ، پاراستوونی.

کوردناسان لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو نامەیەی شێخ مەحمودن کە لەڕێگەی تەورێزەوە سەرەتای ساڵی ١٩٢٣ بۆ رابەرانی شوورەوی ناردو تێیدا تەنانەت داوای تۆپ و فرۆکەشی لێ کردبوون. ئەو نامەیە گومان لەوەدا ناهێڵێ کە شێخ مەحمود لەپێناو جێ بەجێ کردنی ئاواتەکانیدا بە دووی هەر دەرفەتێک و کەلێنێکدا گەڕاوە کە بتوانێ، بەپێی بۆچوونی خۆی، کەڵکی لێ وەربگرێ. وا پێدەچێ شێخ مەحمود ئەو نامەیەی بە زمانی فارسی نووسیبێ(٣٠). گرنگ بۆ ئێمە لێرەدا ئەوەیە کە ئینگلیز و فەیسەڵی یەکەم بەو نامەیان زانیبوو(٣١). هەڵبەت ئەوە هێندەی تر خوێنی شێخ مەحمودی لای ئینگلیز کردە کاسەوە، چونکە، وەک ئاشکرایە، بەلشەفیکەکانی ئەوسای رووسیا گەورەترین دوژمنی سەرسەختی ئەوان بوون. **راستە شوورەوی لە وەڵامی ئەو نامەیەدا هیچی بۆ کورد نەکرد، بەڵام رووکردنە قاپیی مۆسکۆ بەلای ئینگلیزەوە تاوانێکی ئەوتۆ بوو کە هەرگیز ئامادە نەبوون چاوی لێ بپۆشن، لە بەڵگەنامە نهێنییەکانیانەوە روون و ئاشکرا دیارە کە ئەوان هەمیشە مەترسییان لەوە دەکرد رۆژێک لە رۆژان بەلشەفیکەکان بتوانن لە رێگەی کوردەوە لە ناوچەی رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاستدا زەفەریان پێ بەرن و ئاژاوەیان بۆ بنێنەوە، بۆیەکا هەموو کات بە وردی تاقیبی ئەو کوردانەیان دەکرد کە لەوانەیە پێوەندی بە شوورەوییەوە بکەن(٣٢).**

گشت ئەمانەی باسمان کردن بەسەریەکەوە بوونە مایەی حوکمی ئیعدامی بێ موحاکەمەی شێخ مەحمود لە نەزەر ئینگلیزدا. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە پەنا دەبەینە بەر چەند دێڕێکی یەکێک لە بەڵگەنامەکانی خۆیان کە بریتییە لە بروسکەیەکی نهێنی دایەرەی ئیستخباراتی بەریتانی لە هەولێر کە رۆژی نۆزدەی

---

(٣٠) دەقی نامەکە تا ئێستە چەند جارێک بە زمانی کوردی و رووسی و ئازەری بڵاوکراوەتەوە.

(٣١) نیازمە وتارێکی تایبەتی دەربارەی ئەو نامەیە بنووسم.

(٣٢) وەک نموونە بڕوانە ئەو راپۆرتە نهێنییەی سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی ئینگلیز لە عیراق رۆژی ٣٠ی مارتی ساڵی ١٩٢٧ دەربارەی بزوتنەوەی کورد ناردوویە بۆ وەزیری هێزی ئاسمانی بەریتانیا لە لەندەن:

Public Record Office, Foreign Office, Reference: No. 1/407, Air Headquarters British Forces in Iraq, Baghdad, Dated 30th March 1927, To the Secretary Air Ministry, Adastral House, Kingsway, London, W.C.2, Secret, The Kurdish Movement, P.8.

حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٤ ئاراستەی بنکەی ئیستخباراتی خۆیانی کردووە لە بەغدا. دەزگای ناوبراو لە بروسکەکەیدا باسی ئەوە دەکات چۆن مەڵبەندی سلێمانی و دەوروبەری بوونەتە سەرچاوەی بلاوبوونەوەی راپەڕین و لەوەدا دەیشوبهێنێ بە ناوچەیەک دووچاری پەتاو دەردی کوشندە هاتبێ کەمیکرۆبی ترسناکی ناوچەکانی تریش تووش دەکات. دوا بەدوای ئەوە نووسەری بروسکەکە دەقاو دەق دەڵێ:

**«ئەو مەترسییە لە ئارادا دەمێنێ تا شێخ مەحمود، کەمیکرۆبی دەردەکەیە، لە ژیاندا مابێ»**[٣٣].

لەبەرئەوە ئینگلیزەکان شار بە شارو گوند بە گوندو هەنگاو بە هەنگاو کەوتنە سۆراخی هەموو بزووتنەوەو رەفتارو هاتوچۆیەکی شێخ مەحمودو کەس وکارو لایەنگرانی. دوور نییە هەست بە زێدەڕۆیی لەم قسەیەدا بکرێ، بۆیەکا لە ناو دەیان و دەیان بەڵگەنامەی تایبەتیی سەلمێنەریدا پوختەی ناوەرۆکی یەکێکیان دەخەمە بەرچاو کە رۆژی حەوتی تەمموزی ساڵی ١٩٢٥ لە پێنجوینەوە بە بروسکە رەوانەی بەغداو لەوێشەوە رەوانەی لەندەن کراوەو دەڵێ:

**«ئێمرۆ بەیانی شێخ مەحمود بە یاوەری کەریمی فەتاح بەگ و سابیر[٣٤] لە تەک سەدو پەنجا کەس لە پیاوەکانی بە خەڵوزەدا(؟) تێپەڕین کە ٥ میل لەو لای رۆژهەڵاتی پێنجوینەوە دوورە... شێخ لەتیف و شێخ رەوفی لەگەڵ بوو. دوێنێ بەهێ خان[٣٥]و شێخ بابە عەلیی کوری بە هەمان ڕێگەدا تێپەڕین. بەر لەوان ئایشە خانیش[٣٦] رۆژی چواری تەمووز ئەو ڕێگەیەی بڕی، هەموویان بەرەو هەورامان دەڕۆن»**[٣٧].

---

(33) Public Record Office, AIR, 23/372, X/M 04583, From Special Service Office, Arbil to Airstaff Intelligence, Bagdad, June 19th 1924, P.47.

(٣٤) مەبەست سابیری کوری کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەندە.

(٣٥) مەبەست بەهێ خانی ئەمینی عەتاری هاوسەری شێخ مەحمود و دایکی شێخ رەوف و شێخ بابە عەلی و حەلاوە خانە.

(٣٦) مەبەست ئایشە خانی شێخ مارفی نەقیبی هاوسەری شێخ مەحمودو دایکی شێخ لەتیفە، ئایشە خان خوشکی گەورەی حەپسە خانی نەقیبی بەناوبانگە کە هاوسەری شێخ قادری برا بچووکی شێخ مەحمود بوو.

(37) Public Record Office, AIR, 23/198-Part 10, X/M 04583, From Special Penjwin to Aviation, No. M/CH/ 73, 7th July, 1925, P.100.

دوای ئەم پێشەکییە دووردرێژە کە بە پێویستم زانی بۆ روون کردنەوەی هەموو لایەنە ئاڵۆزەکانی مەبەستی سەرەکیی ئەم وتارەم دێمە سەر باسی ئەو بەڵگەنامە بایەخدارەی کردوومەتە سەردێڕی خودی وتارەکە. **ئینگلیزەکان لەو قۆناغەدا ئامادە بوون پەنا بەرنە بەر هەر کۆششێک بلوێ بۆ لەناوبردنی زووبەزووی شێخ مەحمود.** وەک وتمان لە ناو شاخ و داخی کوردستاندا کە بوویوونە پەناگەی شێخ ئەو کارە بە گوللە تۆپ و بۆمبابارانی فڕۆکە جێ بەجێ نەدەبوو، لەبەر ئەوە ئینگلیزەکان پەنایان بردە بەر پیلانی تایبەتی کە دڵنیابوون لەوەی دەیانگەێنێتە مەبەست.

هەڵبەت ئەو کارە هەروا ئاسان نەبوو، بۆیەکا نوێنەری باڵای ئینگلیز لە عیراق سێر هێنری دۆبس[٣٨] بۆ خۆی سەرپەرشتی کردو بایەخی زۆری پێیدا. **رۆژی دووی مایسی ساڵی ١٩٢٥ بە رابەری خۆی لە شاری کەرکوک بۆ جێ بەجێ کردنی پیلانی لەناوبردنی شێخ مەحمود دۆبس کۆنگرەیەکی بەرزی سازکرد.** بەشدارانی کۆنگرە بریتی بوون لە هێنری دۆبس و سەرەک وەزیران یاسین هاشمی و جێگری سەرکردەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق سی. تی. دۆدنگ و جێگری سەرلەشکری بەریتانی لە عیراق و راوێژکاری وەزارەتی بەرگری عیراق لێفتینانت کۆلۆنێل کامرۆن و یاریدەدەری راوێژکاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆی عیراق و سەرپەرشتکاری کارگێڕی سلێمانی[٣٩] و سەرکردەی کەرت رۆب و سەرپەرشتکاری کارگێری کەرکوک و سەرپەرشتکاری پۆلیسی کەرکوک[٤٠].

**بەشدارانی کۆنگرە بە دوورو درێژی لەو رێبازە سەربازییەیان کۆڵیەوە کە بەلایانەوە پێویست بوو بۆ دامرکاندنەوەی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود پەیرەو بکرێ**

(٣٨) کە پێرسی کۆکسی یەکەم نوێنەری باڵای بەریتانی لە عیراق رۆژی یەکەمی مایسی ساڵی ١٩٢٣ گەڕایەوە لەندەن هێنری دۆبس جێگەی گرتەوە، ئەمیش وەک ئەو پیاوێکی شارەزا بوو، جێ پەنجەی بە رووداوەکانی عیراقەوە لە قۆناغێکی پڕ لە ئاڵ و گۆڕو هەراو بەزمدا زۆر دیارە، بەڵام بە داخەوە لەگەڵ کوردا کەوتە هەڵەوە، هەرچەندە خوا هەڵناگرێ درێغیشی نەکرد بۆ کەم کردنەوەی زێدە رۆیی ژمارەیەک لە کاربەدەستە شۆڤێنییەکان کە شەیدای بێ بەری کردنی کورد بوون لە مافە رەواکانی، تا سەرەتای ساڵی ١٩٢٩ دۆبس بە نوێنەری باڵا مایەوە.

(٣٩) هەر سێ سەرپەرشتکاری کەرکوک و سلێمانی ئینگلیز بوون.

(٤٠) د.ک.و.، الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي، التسلسل: 311/1/30، الوثيقة رقم٢، ص٦، بيان عن المقررات التي بت فيها المؤتمر المعقود في كركوك في ٢ ايار ١٩٢٥.

**و خەرجی پێویستیان بۆ دیار کردو پوختەیان لە پێنج خاڵی سەرەکیدا تۆمار کرد.** سەرباری ئەوەش بڕیاریاندا ٢٠ هەزار ڕۆپی[٤١] تەرخان بکرێ وەک خەڵات بۆ هەر کەسێک شێخ مەحمود بە زیندوویی یا بە مردوویی دەسگیر بکات، جگە لە ١٠ هەزار ڕۆپی بۆ هەر یەکێک لە کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەندو سابیرو عەبدوڵلای کوڕانی کەریمی فەتاح بەگ و خەلیفە یونس[٤٢]. ئەم لایەنەی کۆنگرەکەمان لە لایەنەکانی تری بەلاوە گرنگترە، چونکە جۆرە وەرچەرخانێکی سەیرە لە سیاسەتی ئینگلیزدا بەرانبەر بە کورد بە گشتی و بەرانبەر خودی شێخ مەحمود بە تایبەتی.

بەشدارانی کۆنگرە جێ بەجێ کردنی ئەو کارەیان سپاردە هێزێکی ئاشووری[٤٣] تایبەتی کە بڕیار درا لە ٢٥٠ کەس پێک بێ، ٢٠٠یان سوارەو ٥٠یان پیادە، بە ڕابەری دوو ئەفسەری[٤٤] ئاشووری **«لەوانەی خوێندەوارن و دەتوانن لە نەخشە بگەن»** بە مەرجێک **«دوو پیاوی موسڵمانیان لەگەڵ دابنرێ، لەوانەی چاک شارەزای ناوچەکەن بۆ ئەوەی ببنە ڕێ نیشاندەریان»** تاوەکو **«ئەو کوردانەی سەر بە میرین پێوە نەبن»**. هەمان کات کۆنگرە بڕیاری دا ٢٠٠ ئەسپ و ئێسترو بۆ هەر یەکێک لە چەکدارانی هێزەکە پێخەفێک بکڕێ[٤٥].

ماوەی شەش مانگ بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی ئەم هێزە دانرا، ئەو ناوچەیەی بۆی هەبوو چالاکیی تێدا بنوێنێ لە تاسڵوجەوە دەستی پێ دەکردو بە هەڵەبجە کۆتایی دەهات. کۆنگرە مافی دایە هەموو ئەو هێزانەی دەبوو لەو ناوەدا کار بکەن دەسڕێژ لە گوندەکانی سەر بە شێخ مەحمود بکەن بێ ئەوەی بەر لەوە دانیشتوانیان ئاگادار بکرێن، ئەمەش دیسان وەرچەرخانێکی تر بوو لە هەڵوێستی

---

(٤١) عانەو ڕوپێ و لەک دانەی پوولی هندی بوون کە ئینگلیزەکان لەگەڵ داگیرکردنی عیراقدا لە بریتی پارەی عوسمانی بەکاریان هێنا، ساڵی ١٩٣١ فلس و دیناری عیراقی جێگەیانی گرتەوە.

(٤٢) د.ك.و.، الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي، التسلسل 311/1/30، الوثيقة رقم٢، ص٧.

(٤٣) لەو سەردەمەدا بە هۆی سیاسەتی عوسمانی و کەمالییەکانەوە ئاشوورییەکان ماڵ و حاڵیان لەدەست دابوو، گیرۆدەی دەربەدەری هاتبوون و بەناچاری بەشێکیان لە عیراق بوبوونە داردەستی ئینگلیز.

(٤٤) لە بەڵگەنامەکەدا جارێک **«ضابط»** نووسراوە جارێکی تریش **«ضابط صف»**. بڕوانە لاپەڕە حەوتی بەڵگەنامەکە.

(٤٥) د.ك.و.، الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي، التسلسل 311/1/30، الوثيقة رقم٢، ص٦-٧.

ئینگلیزدا چونکە جاران دانیشتوانی ئەو شارو گوندانەی بڕیار دەدرا هێرشیان بکرێتە سەر سەرەتا ئاگادار ئەکران. ئەم بەڵگەیە وەک نموونە دەخەمە بەرچاو. ڕۆژی ۲۰ی مایسی ساڵی ۱۹۲٤ فڕۆکەکانی ئینگلیز هاتنە سەر شاری سلێمانی و دەوروبەری و بەخەڵکەکەیان ڕاگەیاند ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتی شێخ مەحموددان بۆمباباران دەکرێن گەر چەکدارانی شێخ چۆڵیان نەکەن. پاش دوو ڕۆژ کە زانرا ئەو چەکدارانە هەر وان لە شوێنەکانی خۆیاندا دیسان فڕۆکە هاتەوە سەر ناوچەکەو ئەمجارەیان ڕۆژی ۲٥ی مایسی وەک دوا ماوە بۆ کشانەوەیان ڕاگەیاند. کە هێزەکانی شێخ نەجوڵان ئەوجا فڕۆکەکان ڕۆژی ۲٥ی مانگ کەوتنە بۆمبابارانی شارو هێزەکانی شێخیان ناچار کرد بکشێنەوە شارباژێرو پێنجوین[٤٦].

دوای گەڕانەوەی بۆ بەغدا هێنری دۆبس یەکسەر بڕیارەکانی کۆنگرەی لەگەڵ فەرماندەی گشتیی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق هەڵسەنگاند، ئەمیش هەموویانی پەسندکرد تەنها ئەو خاڵەیان نەبێ کە دەربارەی گواستنەوەی فەوجێکی لێڤی[٤٧] بوو بۆ هەڵەبجە، فەرماندەی گشتیی پێی وابوو ئەو لایەنەی بڕیارەکان پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە. ڕۆژی ٥ی مایسی ساڵی ۱۹۲٥ سکرتێری دۆبس نامەیەکی تایبەتیی نارد بۆ سکرتێری ئەنجومەنی وەزیران کە لە پێنج خاڵی سەرەکیدا دیسان باسی بڕیارەکانی کۆنگرەی کەرکوک و وتووێژی دۆبس لەگەڵ فەرماندەی گشتی هێزی ئاسمانیی بەریتانی لە عیراق دەکات. بۆردلنی سکرتێری دۆبس لە نامەیەکدا دەڵێ کە داوا لە لێپرسراوانی لێڤی لە مووسڵ کراوە دەستوبرد لەناو ئاشوورییەکاندا ئەو ۲٥۰ کەسە کۆبکەنەوە کە پێویست بوون بۆ پێکەوەنانی هێزە تایبەتییەکەی دەبوو شێخ مەحمود بەزیندوویی یا بە مردوویی دەسگیر بکات. خاڵێکی تری نامەکەی بۆردلن سەرنج ڕادەکێشێ. بەپێی بڕیارەکانی کۆنگرە دەبوو

---

(46) "Report by His Britannic Majesty s Government on the administration of Iraq for the period April 1922-December 1924", London, 1925, PP. 32-33.

(٤٧) لێڤی لە وشەی«Levy»ی ئینگلیزییەوە وەرگیراوە کە یەکێک لە واتاکانی هێزی کۆکراوە یا گەڵاڵە کراو دەگەیەنێ، دوای داگیرکردنی عیراق ئینگلیزەکان بە ناوی «لێڤی»یەوە هێزێکی تایبەتییان دامەزراند بۆ پاراستنی بەرژەوەندی و دەزگا تایبەتییەکانیان و لێدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو عەرەب.

ژمارەی پۆلیسی ناوچەی سلێمانی زیادبکرێ. لەو بارەیەوە بۆردلن لە نامەکەیدا دەڵێ وا بە باش دەزانرێ ئەو پۆلیسانە خەڵکی ناوچەکە نەبن **«چونکە لەوانەیە ئەگەر خەڵکی ناوچەکە بن بۆ خزمەتی شێخ مەحمود خیانەت لە حوکمەت بکەن»**.
لەکۆتاییشدا بۆردلن داوا لە ئەنجومەنی وەزیران دەکات **«بێ دواخستن»** ئەو پارەیەی بڕیار دراوە بۆ خەرجی هێزە تایبەتییەکە لە بودجەی میریدا تەرخانی بکات(٤٨).
نامەکەی بۆردلن کۆتایی نەهێنا بە وتووێژو ئاڵ و گۆڕی نامەی تایبەتی لە نێوان لێپرسراواندا بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو پیلانە سەیرەی بۆ لەناوبردنی شێخ مەحمود بەوردی نەخشەیان بۆی کێشابوو. بەشێک لەناوەڕۆکی یەکێکی تر لەو نامانە دەهێنمەوە چونکە بایەخی زۆرە بۆ روون کردنەوەی هەموو لایەنەکانی باسەکەمان.
ئەم نامەیەشیان هی سکرتێری دۆبسە کە رۆژی هەشتی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥ ناردوویە بۆ سکرتێری ئەنجومەنی وەزیران. بۆردلن لەم نامەیەدا دەڵێ نوێنەری باڵا هێنری دۆبس ٢٠ هەزار روپێ بۆ کوشتن یا بەدیل گرتنی شێخ مەحمود بە پارەیەکی کەم دەزانێ، بۆیەکا پێشنیار دەکات بکرێتە ٦٠ هەزار روپێ، هەروەها لە بریتی ١٠ هەزار ٢٠ هەزار روپێش بۆکوشتن یا بەدیل گرتنی کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەندو سابیری کوڕی تەرخان بکرێ و واز لە خەلیفە یونس و عەبدوڵلای کوڕی کەریمی فەتاح بەگ بهێنرێ، واتە ناویان لە پیلانەکەدا بکوژێنرێتەوە چونکە، وەک بۆردلن دەڵێ **«ئەو دوانە بایەخیان کەمەو وا پێ دەچێ ئەوە هەڵناگرن خەڵات بۆ لەناوبردنیان دابنرێ»**(٤٩).
چەند لایەنێکی تری ئەم نامەیە سەرنج رادەکێشن. دۆبس وای بە باش زانیوە ئەگەر پیلانەکەیان سەری گرت ئەوا پارەی خەڵاتەکەی بێ جیاوازی بەسەر هەر ٢٥٠ ئەندامی هێزە تایبەتییەکەدا دابەش بکرێ، چونکە ئەگەر وانەبێ ئەوساکە، وەک

(٤٨) د.ك.و.، الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي، التسلسل 311/1/30، الوثيقة رقم٢، ص٥، من سكرتير فخامة المعتمد السامي ب.هـ. بوردلن الى سكرتير مجلس الوزراء، رقم الكتاب ٩٢/و.ر.، في ٥ ايار ١٩٢٥.
(٤٩) د.ك.و.، الوحدة الوثائيقة: البلاط الملكي، التسلسل 311/2462، الوثيقة رقم٤٦، ص٥٨. قرارات مجلس الوزراء/ سري، ترجمة الكتاب المرقم BO/122 في ٨ حزيران ١٩٢٥ المرسل من مستشار فخامة المعتمد السامي بالعراق الى سكرتير مجلس الوزراء.



خەلیفە یونس

لەدەقی نامەکەدا هاتووە، کەسێک لە چەکدارانی ئەو هێزە دان بەخۆیدا ناگرێ و هەریەکەیان لای خۆیەوە هەوڵ دەدات خەلاتەکە بۆ خۆی مسۆگەر بکات[٥٠].

هەمان کات دۆبس وای بە باش زانیوە خەلاتی دەسگیر کردن بە زیندوویی زیاتر بێ لە خەلاتی کوشتن، گوایە بۆ ئەوەی **«کەسی بێ تاوان پێوە نەبێ»**، بۆیەکا پێشنیاری کردووە ئەگەر شێخ مەحمود بە زیندوویی دەسگیر کرا ئەوا هەموو ٦٠ هەزار روپیەکە بە خەلات دابەش بکرێ، خۆ ئەگەر کوژرا ئەوا سێ دەر چواری کۆی خەلاتەکە، واتە ٤٥ هەزار رۆپێی لێ دابەش بکرێ. بۆ کەریمی فەتاح بەگ و سابیری کوڕیشی داوای کردووە بە هەمان دەستوور خەلاتەکە دابەش بکرێ، واتە ٢٠ هەزار روپێ بۆ دەسگیرکردنی هەر کامیان بەزیندوویی و ١٥ هەزاریش بۆ هەر کامیان بە کوژراوی[٥١].

---

(٥٠) هەمان سەرچاوە، خاڵی یەکەمی نامەکە.
(٥١) هەمان سەرچاوە، خاڵی دووەم و سێیەمی نامەکە.

هێنری دۆبس صەد هەزار رۆپیی خەڵاتەکەو خەرجی دامەزراندنی ئەو هێزەی ئەرکی لەناوبردنی شێخ مەحمودی پێ سپێردرا بوو، کە ئەویش بە صەدو پەنجا هەزار رۆپێ تەقدیر کراوە، بە پارەیەکی زۆر نابینێ، چونکە، وەک بۆ ئەنجومەنی وەزیرانی نووسیوە، داهاتی ناوچەکە خۆی گەلێک لە کۆی ئەو پارەیە بەسەریەکەوە زیاترە[٥٢]، بە نەمانی شێخ مەحمود ئەو داهاتەی کوردستانیش دەچۆوە ناو خەزێنەی میرییەوە.

ئینگلیز پیلانەکەیان بۆ نەچووە سەر، شێخ مەحمود بەشێک بوو لە بزووتنەوەیەکی بەرفراوانی رەوا کە هۆی مان و ژیانی لە بێ مافی گەلەکەیەوە سەرچاوەی وەردەگرت. وا پێ دەچێ ئەوانەی چاوەڕوانی خەڵاتی چەوری لەناوبردنی شێخ مەحمودو هاوەڵەکانی بوون هیچ درێغییەکیان نەکردبێ. مێژوونووسی شارەزا عەبدولڕەزاق حەسەنی لە زاری بابە عەلیی کوڕی شێخ مەحمودەوە باسی ئەوە دەکات چۆن لەو سەردەمەدا لایەنگرانی شێخ ئاشورییەکیان بەدیل گرتووە کە خۆی دانی پێدا ناوە بۆ کوشتنی شێخ هاتووە[٥٣]. شێخ رەوفی شێخ مەحمود لە یادداشتەکانیدا ئەو کارە دەداتە پاڵ چەکدارێکی ئەرمەنی[٥٤]، بێ گومان شێخ رەوف لەوەدا بە هەڵەدا چووە چونکە ناوی ئەرمەن لە هیچ کام لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەو پیلانەدا نەهاتووە، جگە لەوەی ئینگلیزەکان ئەرمەنیان لە دژی کورد پێ لە خشتە نەبرا، بە پێچەوانەوە ڕابەرانی ئەوان لەو سەردەمەدا لە کۆششدا بوون بۆ نزیک کەوتنەوە لە کوردو یەکخستنی خەباتی هەردوو لا دژی دوژمنی هاوبەش، بۆ ئەمیشیان گەلێک بەڵگەنامەی تایبەتی بەدەستەوەن و لەو وتارەدا خۆ دەنوێنن کە لەسەر «**خۆیبوون**» پێوەی خەریکم.

هەرچۆن بێ وشەی نەگریسی کوردی پڕ بەپێستی ئەم پیلانەیە کە هەموو ناوو ناتۆرەیەک هەڵدەگرێ بۆیەکا تەنانەت ئینگلیزەکان بۆ خۆیشیان شەرمیان کردووە

---

(٥٢) هەمان سەرچاوە، خاڵی سێیەمی نامەکە، هەروەها بڕوانە دەقی نامەکەی رۆژی ٥ی مایس و بەیانە تایبەتییەکەی رۆژی ٢ی مایسی ١٩٢٥.

(٥٣) عبدالرزاق الحسني، تأريخ العراق السياسي الحديث، الطبعة الثانية، الجزء الثاني، صيدا-لبنان، ١٩٥٧، ص٢٦٨-٢٦٩.

(٥٤) لەو بارەیەوە بڕوانە: م.ر. **هاوار، سەرچاوەی ناوبراو**، بەرگی دووەم، ل٥٧٤-٥٧٥.

لەو راپۆرتی ساڵانەیەیاندا باسی بکەن کە دەبوو دەربارەی بەڕێوەبردنی عێراق پێشکەشی **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»**ی بکەن، لەو بەشانەی راپۆرتەکەی ساڵی ١٩٢٥یاندا کە بۆ مەسەلەی کوردیان تەرخان کردووە بە هیچ جۆر توخنی ئەو باسە گرنگە نەکەوتوون(٥٥). **لە لایەکی ترەوە کۆنگرەی کەرکوک یەکێکە لە بەڵگەنامە هەرە بایەخدارو نایابەکان بۆ لێکدانەوەی مێژووی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمودو هەڵوێستی ئینگلیز بەرانبەر بەو بزووتنەوانەو چەمۆڵەیەکی رەوایە بە رووی ئەو نووسەرە بێ ویژدانانەدا کە بە زۆری زۆردارەکی شێخ مەحمود، وەک هەر سەردارێکی تری کورد، دەکەنە داردەست و پیاوی بێگانە.**

## سەرنجێک*

دوای بڵاوبوونەوەی **«بەڵگەنامەیەکی نهێنی بایەخدار دەربارەی هەڵوێستی ئینگلیز بەرانبەر شێخ مەحمودو بزووتنەوەکانی»** لە رۆشنبیریدا برادەرێکی نزیکم پێی گوتم وا پێ ئەچێ من مەیلم بە لای شێخ مەحمودا هەبێ. دوور نییە خوێندەواری تریش هەبن وەک ئەو برادەرە بۆ مەسەلەکە بچن، بۆیەکا بە هەلی ئەزانم لێرەدا دوو خاڵ روون بکەمەوە.

یەکەم: **من هیچ لارییەکم لەوە نییە مەیلم بۆ رابەرێکی دڵسۆزو بەجەرگ و جوامێری وەک شێخ مەحمود هەبێ، لەوەتەی هیردۆتس قەڵەمی خستۆتە سەر کاغەز مێژوونووسێک نەبووەو قەتیش مێژوونووسێکی وا هەڵناکەوێ مەیلی بۆ سەرداری لێهاتووی گەلەکەی خۆی نەبێ،** مەگەر ئەو مێژوونووسە سپڵەو خۆفرۆش بێ. لەگەڵ ئەوەشدا، هەروەک بەو برادەرە خۆیشم گوت، من لە سەرەتای وتارەکەمدا گوتومە:

**«بێ گومان شێخ مەحمودیش وەک هەر سەردارێکی مێژوویی ئەم جیهانە جارو بار دروست نیشانی نەپێکاوە، جاروباریش کەوتۆتە هەڵەوە... هتد»..**

دووەم: لەسەر داوای خوالێخۆشبوو دوکتۆر نوری قەیسی کە بەراستی پیاوێکی

(55) "Report by His Britannic Majesty s Gov. to the Council of the League of Nations on the adm. of Iraq for the year 1925", PP. 20-23, 103-104.

* ئەو بابەتەی **«سەرنجێک»** لە ئەسڵدا لەگەڵ بابەتی سێیەمی بەشی یەکەم بووە، لە ژمارە (١٣٦)ی **«رۆشنبیری نوێ»**دا بڵاوکراوەتەوە – عەبدوڵڵا زەنگەنە.

خێرخواو دڵسۆزێکی بەپەرۆشی برایەتی کوردو عەرەب بوو لەگەڵ بەڕێز فەیسەڵ فەهمی سەعیدو دوکتۆر ئوسامە دووریدا لەو کۆڕەدا بەشداریم کرد کە ڕۆژی دووی مایسی ساڵی ١٩٩٢ کۆلێجی ئاداب بەسەرپەرشتی مامۆستا عەبدولغەنی عەبدولغەفور بۆ یادکردنەوەی راپەڕینی مایسی ١٩٤١ سازی کردو ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستایانی زانکۆو روناکبیرانی ناسراو ئامادەی بوون. من دەربارەی هەڵوەستی کورد بەرانبەر بەو راپەڕینە قسەم کردو بەو بۆنەیەوە کەمێکیش باسی شێخ مەحمودم کرد. بەشی زۆری قسەکانم بەرگری مێژوویی بوو، بۆیەکا بەر لەوەی کۆتایی بە قسەکانم بێنم گوتم:

**«داوای لێ بوردن ئەکەم گەر کەمێک لە ناوەرۆکی خودی باسەکە دوور کەوتبمەوە چونکە چارەنوسی مێژوونوسی کورد وا هاتووە کە دەبێ هەمیشە موحامی بێ و دیفاع لە حەق بکا».** ئەوە جەوهەری مەسەلەکەیە، **مێژووی کورد، بە تایبەتی قۆناغی نوێ و هاوچەرخی، هێند شێوێنراوەو هێند زوڵمی لێ کراوە کە مێژوونوسی کورد ناچار بێ هەمیشە بەرگری لە راستییەکان بکا.**

# پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی

دوای راپەرینە بەناوبانگەکەی شاری سلێمانی لە رۆژی شەشی ئەیلولی ۱۹۳۰دا شێخ مەحمود هاتەوە مەیدان و دەستی لەو رێککەوتنامەیە هەڵگرت کە بە ناچاری سەرەتای حوزەیرانی۱۹۲۷ لەگەڵ میریدا بەسەرپەرشتی ئینگلیزەکان مۆری کردبوو. لە ماوەی ئەو سێ ساڵ و چەند مانگەدا شێخ گوندی پیرانی ئەودیو سنووری کردە بارەگاو خۆی لە کاروباری ئەمدیوە دوورە پەرێز گرت.

کوشتاری شەشی ئەیلول هەستی هەموانی بزواند، دەیان بروسکەی نارەزایی کورد گەیشتە بارەگای «**کۆمەڵەی نەتەوەکان**»، (عصبە الامم) لە جنێڤ، تەنانەت دانیشتوانی مەریوانی ئەودیویش بە بروسکە داوای ئازادکردنی ئەو نیشتمانپەروەرانەیان کرد کە لە سلێمانی گیران و برانە کەرکوک[1].

هەڵبەت شێخ مەحمودیش نەیدەتوانی دەسەوەسان دانیشێ، ئەویش یەکسەر کەوتە خۆ. هەر زوو شێخ سەلامی شاعیری بە نهێنی ناردە بەغدا تا دەنگ ونیازی بگەیەنێتە ئەو ئەفسەرە کوردانەی پشتی پێ دەبەستن، ژمارەیەکیان هەڵاتن و دایانە پاڵ شێخ و کەوتنە گەڵاڵە کردنی هێزەکانی بۆ راپەرینی داهاتوو[2]. بەر لە کۆتایی ساڵی ۱۹۳۰ شێخ هاتەوە ئەمدیوو بە نامەیەکی تایبەتی داوای لە نوێنەری باڵای بەریتانی(**المندوب السامي البريطاني**) کرد گشت داخوازییەکانی کورد جێ بەجێ بکەن و گیراوەکان ئازاد بکەن[3]. وەڵامی نوێنەری باڵا بۆمبابارانی ناوچەکە بوو،

(*) لە گۆڤاری «**رۆشنبیری نوێ**»، ژمارە ۱٤۰، ساڵی ۱۹۹۷، لە ل۹-۱۱دا بڵاوکراوەتەوە.

(۱) بروانە: «**العالم العربي**»(جريدة)، بغداد، ۱۵تشرين الاول ۱۹۳۱.

(۲) «**رۆژی نوێ**»، سلێمانی، ژمارە شەش، ئەیلولی۱۹٦۱، ل۱۰٤؛ «العالم العربي»، ۲۱تشرين الاول۱۹۳۱.

(3) "Special Report by His Magesty s Government in the United Kingdom of

دیسان فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز بەربوونەوە گیانی کورد. بەڵام ئاگری شۆڕش زۆر ناوچەی گرتەوەو گەیشتە ناوجەرگەی هۆرین و شێخانیش.

ئەمە بۆ ئینگلیز دەستی نەئەدا، خەریک بوو ریسەکەیان بێتەوە خوری و هەموو ئەو کۆششەی لە بیستەکاندا دایان بۆ لە پەلوپۆخستنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بە فیرۆ بچێت. رۆژنامەو گۆڤارە ئینگلیزییەکانی وەک **«تایمس»**و **«نیرئیست ئێند ئینديا»** (رۆژهەڵاتی نزیک و هیندستان) کەوتنە باسی ئەو مەترسییە[٤].

راپەرینی ئەمجارەی کورد وا تەشەنەی سەند شێخ مەحمود دیسان زاتی ئەوە بکات بەرەو کەرکوک و دەوروبەری بکشێ تا رۆژی پێنجی نیسانی ساڵی١٩٣١ شەڕی ئاوباریک لە ناوچەیەکدا قەوما کە تەنها بیست میل لە دووزخورماتووەوە دوورە. لەم شەڕەدا بۆمبا هاوێژەکانی ئینگلیز شێخ مەحمودیان بەخەبەر هێناو خەونەکانیان پوچەڵ کردەوە. ئینگلیزەکان ماوەیەکی چاک بە دارشتنی ئەو پیلانەوە خەریک بوون[٥].

وا دیارە لەو ماوەیەدا ئینگلیزەکان و کاربەدەستانی رژێمی پاشایی ئەوسا ترسی ئەوەیان لێ نیشتبوو کە شۆڕشگێڕانی کورد شاری سلێمانی ئازاد بکەن، بۆیەکا نەخشەیەکی بەرفراوانی تایبەتییان بۆ بەرگری کردن لەو شارە دارشت. دەقی ئەو نەخشەیە بریتییە لە راپۆرتێکی دوورودرێژ کە وا دیارە ئەفسەرانی ئینگلیز تەواو بە دانانییەوە ماندووبوون و دوای تەواوکردنی رۆژی بیست و هەشتی شوباتی ساڵی١٩٣١ چاپیان کردووەو ناویان لێناوە **«پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی»**[٦].

دەقی راپۆرتەکە بە زمانی ئینگلیزی بریتییە لە چواردە لاپەڕەی قەوارە گەورە، وێڕای حەوت پاشکۆ کە ئەوانیش بەسەر یەکەوە بریتین لە هەشت لاپەڕەی تر، جگە

---

Great Britain and Northern Ireland to the Council of theLeague of Nations on the Progress of Iraq during the period 1920-1931," London,1931,PP.265-266.

(٤) بۆ نموونە بڕوانە:
"The Near East and India", April 16,1931; "Zaria Vostoka", April 28,1931.

(٥) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە: **«رۆشنبیری نوێ»**، ژمارە ١٣٦، ساڵی١٩٩٥، ل٦-٢٢.

(6) Ministry of Interior(Iraq),1931, Confidential(6) ,File No.25/SL/3, Subject: Operations Sulaimani Liwa, Sulaimani Defence Scheme.

Telegram [illegible]
From High Commissioner, Baghdad.
To Administrative Inspector, Kirkuk.
No. [illegible]
Dated. [illegible]-24.

The bombing of [illegible] is the only action which will be taken immediately. Please telegraph whether, immediately after the bombing, it would not be possible and advisable to despatch to Halabja the 'Iraq Police officials whose despatch had been decided before receipt of the letter from Muhammad [illegible] regarding the new administrati[illegible] which he contemplated.

Regarding the [illegible] grounds on which you base statement that Shaikh Ahmed has summoned the disaffected chiefs to be telegraphed.

As the burning of the [illegible] is not considered feasible any bombing which takes place will have to be directed against Shaikh Ahmed's quarters.

Reference is to your telegram of [illegible] No.[illegible]

**بەڵگەنامەیەکی بەریتانی دەربارەی بۆومبابارانی (کانی کەوە) بە فڕۆکە**

لە دوو نەخشەی شاری سلێمانی، کە هەموویان بەسەر یەکەوە دەکەنە بیست و چوار لاپەڕە.

حەوت دانە لە راپۆرتی **«پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی»**و پاشکۆو نەخشەکانی چاپ کراوەو بەسەر دەزگا بەرزەکانی میریدا دابەش کراون کە یەکێکیان وەزارەتی کاروباری ناوخۆیەو من لە ناو فایلە تایبەتییەکانی ئەو وەزارەتەدا دەقی پرۆژەکەم دۆزییەوە. هەروەها وێنەیەکیشی لێ دراوەتە بنکەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە هنێدی کە ئێستا بۆتە **(معسکر الرشید)** لە بەغدا.

بە پێی زانیارییەکانی ناو ئەو راپۆرتە ژمارەی دانیشتوانی شاری سلێمانی سەرەتای سییەکان شازدە هەزار کەس بووە[7]. ئەو خەمڵە دروست نایەتە بەرچاو، چونکە بە پێی یەکێک لەو راپۆرتە بایەخدارانەی کە هەر ئینگلیزەکان خۆیان

(7) Ibid, P.1

دەربارەی بەڕێوەبردنی عێراق داویانەتە **(کۆمەڵەی نەتەوەکان)** ساڵی ۱۹۲٤ ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارە بە لایەنی کەمەوە بیست هەزار کەس بووە[٨].

هەرچۆن بێ بایەخی زانیارییەکانی ناو راپۆرتەکە دەربارەی بارودۆخی سلێمانی لە سەرەتای سییەکاندا زۆرە، بەشێکیشیان دەگمەنن. لەوانە زانیارییەکە دەربارەی ژمارەی چەکی ناو شار کە، وەک دەڵێ، خۆی دەدا لە ٥٠٠ پارچەو بەشی زۆری دەمانچە بووە، هەرچەندە راپۆرتەکە ئەو ژمارەیە بە دروست دادەنێ، بەڵام دوور نییە ژمارەی خاوەن چەک لە ناو شاردا ئەوسا لەوە زۆرتر بووبێ، لەبەر باری ژیان لەو ساڵانەدا بازاڕی قاچاغی چەک لە ناو شاردا گەرم بوو.

سەرەتای راپۆرتی **«پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی»** بۆ باسی ناڕەزایی زۆربەی دانیشتوانی شار تەرخان کراوە کە، وەک دەڵێ **«دوور نییە هەر ئەوەندە دەرفەتیان بۆ هەڵبکەوێت راپەڕن»**. بۆ لێکدانەوەی سەنگی ئەم قسەیە دەبێ کوشتارەکەی رۆژی شەشی ئەیلولی بەر لە نزیکەی شەش مانگ بهێنینەوە یاد کە دوژمن ویستی کوردی وا پێ تەمێ بکات جارێکی تر بیر لە راپەڕین نەکاتەوە. بە داخەوە کەس دەرسی لەو پەندە گەورەیە وەرنەگرت.

هەمان کات دانەرانی **«پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی»** بە دووری نابینن ئەگەر شار راپەڕێت هەموو ناوچەکە بە دەنگییەوە بچێت و **«هەرایەکی گشتی»** بەرپا بێت و لە ماوەیەکی کورتدا **«چەند هەزار یاخی بوویەکی جەربەزە لە هەموو لاوە ئابڵوقەی شار بدەن»**. بەڵام ئەگەر هێزەکانی میری لەناو شاردا توانییان خۆیان بۆ **«ماوەی سێ چوار رۆژ رابگرن»** ئەوساکە لەبەر نەبوونی ئازووقە پشتی ئابڵوقەدەران دەشکێت و بە ناچاری بڵاوەی لێدەکەن. کەوا بێت پێویستە گشت ئەو مەرجانە بە وردی دابین بکرێن کە بۆ مسۆگەرکردنی خۆڕاگری هێزەکانی میری لە ناو شاردا پێویستن بە نیازی پووچەڵ کردنەوەی ئەگەری ئابڵوقەدانی سلێمانی لە لایەن شۆڕشگێڕانەوە. لەبەر ئەوە **«پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی»** رۆژی بیست و هەشتی شوباتی ساڵی ۱۹۳۱ لە دایک بوو، واتا لەو رۆژگارەدا کە شێخ مەحمود بە گەرمی خۆی بۆ راپەڕینی داهاتوو ئامادە دەکرد.

---

(8) "Report by His Brittanic Majesty s Government on the administration of Iraq for the Period April 1923-December 1924", London, 1925, PP. 32-33.

ئینگلیزەکان زۆر بە وردی **«پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی»**یان داڕشتووە، هێزی میری و لیڤی ئاشووری و پۆلیسی پیادەو سوارەو ژمارەیەک فڕۆکەی جەنگییان بۆ تەرخان کردبوو. لەگەڵ ئابلۆقەدانی شاردا لە دەرەوە دەبوو دوازدە بنکەی سەربازیی سەرەکی لە ناوەوە وەک بازنەیەکی توندوتۆڵی پێکەوە بەستراو **«هیچ دەرفەتێک بۆ دزەی دوژمن»** نەهێڵنەوە[٩]. ئەو دوازدە بنکەیە بە ریز بەسەر تاوڵەی سواری و فڕۆکەخانەی قەراغ شارو حامییەو سەرەتای ڕێگەی ئەزمڕو نێوانی ڕێگەی گۆیژەو هەڵەبجەو ماڵی عەزمی بەگی بابان و گردی سەیوان و مزگەوتی مەلا مەحمودو گەڕەکی جولەکان و شیوی جولەکان و ماڵی هاڕون و دەباخانەکەدا دابەش کرا بوون.

سەرباری ئەوە **«پرۆژەی بەرگری»**زۆر بە وردی پلانی پاراستنی شوێنە گرنگەکانی ناو شاری داڕشتووە، وەک سەراو فڕۆکەکانی ئینگلیزو دایەرەی پۆست و ئاشی ئەلەکتریکەکەو چەند مەڵبەندو شوێنێکی تر. چۆن پێویست بوو بەو جۆرە دانەرانی **«پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی»** بایەخێکی تایبەتییان دابوو بە پاراستنی ماڵ و حاڵی گشت فەرمانبەرە ئینگلیزەکانی ناو شار، کە دەبو لەگەڵ موتەسەریف و گەورە لێپرسراواندا بگوێزرێنەوە ناو سەرا لە ناوەڕاستی شاردا[١٠]. مزگەوتی گەورەش لە پرۆژەکەدا کراوەتە بارەگای کاربەدەست و شۆفێرو سەکنەکانی تیپی گواستنەوە[١١]. وەک وتمان ماڵی عەزمی بەگی بابانیش لە قەراغ شار، لەسەر ڕێگەی هەڵەبجەو گردی سەیوان دەکرایە یەکێک لە بنکە سەربازییەکانی بەرگری لە شار، دیارە نیازیان بووە لە کاتی پێویستدا ماڵەکەیان پێ چۆڵ بکەن.

بە پێی **«پرۆژەی بەرگری»** دەبوو ئازووقەی تەواوی مانگێک بۆ گشت سەربازو ئەفسەرو وڵاخەکانیان بخرێت، ئاوی تەواویان بۆ پاشەکەوت بکرێت، داوودەرمانیان بۆ هەڵبگیرێت، جگە لە ٦٥٠ گالۆن نەوت و ٦٠ گالۆن بەنزین. بڕیار وابوو لە کاتی ئابلۆقەدا هاتووچۆی شار قەدەغە بکرێت، واتە جاڕی(منع التجول) بدرێت، چەند شوێنێک دیاری کرابوو بۆ هاتنە ناو شارو چوونە دەرەوە لێی کە دەبوو لەژێر

(9) Ministry of Interior..., Sulaimani Defence Scheme,PP.1-2.
(10) Ibid, PP.4-5,13
(11) Ibid, P.9

چاودێری پۆلیسدا بێت(١٢). ئەگەر هاتوو ناچار بوون پۆلیس بۆی هەبوو ڕێگە بدات لە دەرەوەی شار بازاڕێکی تایبەتی بۆ فرۆشتنی بەرهەمی گوندەکانی دەوروبەری سلێمانی ساز بکرێت **«تا دوژمن بە ناوی قەتارچییەوە، یا بە بیانووی کەلوپەل فرۆشتنەوە نەتوانێت دزە بکاتە ناو شارەوە»**(١٣).

بە داخەوە فڕۆکەی ئینگلیز لە ئاویاریک بوواری ئەوەی نەدا پەنا بەرنە بەر **«پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی»**. بەڵام ئەم ڕاستییە لە بایەخی مێژوویی **«پرۆژەی بەرگری»** کەم ناکاتەوە، ئەویش بەڵگەیەکی تری دوژمنایەتی ئینگلیزو زۆردارانە بەرانبەر کوردو شێخ مەحمود، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تا ئیمڕۆکە هی ئەوتۆ هەن بە زۆری زۆردارەکی مێژوو سەروین دەکەن و لە قوڵەپێوە بە ئاوەژوو هەڵیدەخەن، ئەوانەی، مەخابن، لە سەرانسەری دونیادا لە هەڵە زەقەکانی خۆیان بەو لاوە هیچ شتێکی تر بە ڕاست نازانن.

کاتێک **«پرۆژەی بەرگری»**م دەخوێندەوە قسەیەکی ئەستەقی ئێدمۆندسم هاتەوە یاد. لە بیستەکاندا ئێدمۆندس بۆ ماوەی چەند ساڵێک ئەفسەری سیاسی بوو لە کەرکوک، زۆربەی کاتی بۆ ڕاونانی کورد تەرخان کردبوو، جاری وا هەبوو لەگەڵ فڕۆکەوانە ئینگلیزەکاندا دەکەوتە ڕاوە کورد، دوای ئەوەی ڕۆژی حەڤدەی حوزەیرانی ساڵی١٩٢٣ ئێدمۆندس لە یەکێک لەو ڕاوانەی بۆوە لە سلێمانییەوە بە فڕۆکە بەرەو کەرکوک گەڕایەوەو ئەم چەند دێرەی لە یاداشتەکانیدا تۆمار کرد:

**«هەر ئەوەندە فڕۆکەکەمان دوا تەکانی داو ڕووی کردە ئاسمان لێشاوی بیرەوەری دوا چوار ساڵی ژیانم (لە کوردستان) کەوتە دەنگدانەوە لە مێشکمدا، کەمێکیان خۆش، زۆربەیان ناخۆش، هەستی پڕ لە نائومێدی ترش و تاڵ ناخی دەرووغی هەژاند، لەو ساتەدا پیرەمەگروون هاتە بەرچاوم، وام هەست کرد لە هەر جارگرژترە. لە دڵی خۆمدا پرسیم: ئاخۆ قەدەر چی تری بۆ دوا ڕۆژی ئەم شارە شۆڕشگێڕە هەڵگرتووە»**(١٤).

---

(12) Ibid, PP.9-13
(13) Ibid, P.13
(14) C.J.Edmonds,Kurds,Turks and Arabs. Politics,Travel and Research in North-Eastern Iraq. 1919-1925,London,1957,P.338.



لیژنەی ویلایەتی موسڵ لە نێوانیاندا ئەدمۆندس لەلای چەپ دووەمین کەسە




شاری سلێمانی لە سەردەمی بزووتنەوەی شێخ مەحمود

قوربان جەنابی ئیدمۆ ندس مەگەر هەر پیرەمەگروونی سەرکەشی پرچ کلۆسپی رۆژی حەشر وەلامی ئەو پرسیارەت بداتەوە، ئەو رۆژەش مەگەر فەرهەنگە بەنرخەکەت[15] لە حزوور عەرشدا تکاکارت بێت!!

---

هەروەها بڕوانە لاپەڕە ٣٠٢-٣٠٣ی چاپی عەرەبیی هەمان سەرچاوە.

(١٥)مەبەست ئەو فەرهەنگە کوردی-ئینگلیزییەیە کە سالی١٩٦٦ ئیدمۆندس و تۆفیق وەهبی پێکرا. لە لەندەن بلاویان کردەوە.

# نامەیەکی ونی
# شێخ مەحمود بۆ کەمالییەکان

تا ئێستا لە نووسینەکانی خۆمدا چەند جارێک بە گەرمی دوعای خێرم بۆ ئینگلیزەکان کردووە چونکە گەلێک بەڵگەنامەی بەنرخی کوردیان بۆ پاراستووین. ئیمڕۆ نۆرەی باسی نامەیەکی بایەخداری شێخ مەحمودە کە ڕۆژی نۆی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۳٤۳ی کۆچی (واتا ساڵی ۱۹۲٤) ناردوویە بۆ کەمالییەکانی تورکیا. کەس تا ئێستا بەو نامەیەی نەزانیوە کە دیارە دەبێ شێخ مەحمود بە تورکی نووسیبێتی و دەقی ئێستا لە ئارشیفە تایبەتییەکانی تورکیادا هەڵگیرابێ. ئینگلیزەکان وێنەی ئەو نامەیەیان دەسکەوتووەو یەکسەر کردوویانەتە ئینگلیزی و ناردوویانەتە وەزارەتی فڕۆکەوانی و موستەعمەرات لە لەندەن.

**بایەخی ئەو نامەیەی شێخ مەحمود زۆرە، چونکە لە گەرمەی بینەوبەرەی کێشەی بەناوبانگی موسڵدا نووسراوە، سەرباری ئەوەی گەلێک زانیاریی مێژوویی بایەخداری تێدایە کە بەشێکیان تیشک دەخەنە سەر لایەنێک لە ڕێبازو تەکتیکی خەباتی ئەو ڕۆژانەی شێخ مەحمود.** نامەکە زۆر دووورودرێژە، ئینگلیزییەکەی نزیکەی سێ لاپەڕەی گەورەی پڕ کردۆتەوەو لە سیازدە خاڵی سەرەکی پێکهاتووە کە هەر یەکەیان بۆ باسێکی گرنگی ئەو ڕۆژگارە تەرخان کراوە.

مێژوی پێوەندیی نێوان شێخ مەحمودو کەمالییەکان لە ئەیلولی ساڵی ۱۹۲۲ەوە دەست پێ دەکات، واتا لەو ڕۆژەوەی شێخ مەحمود پێی نایەوە ناو خاکی کوردستانەوە دوای ئەوەی لە هندستان ئازاد کرا. ئینگلیزەکان دەیانویست شێخ

(*) لە ژمارە (۱۰۷)ی گۆڤاری «ڕەنگین»ی ساڵی ۱۹۹۷دا بڵاوکراوەتەوە.

کوردستانی باشوریان بۆ دابین بکات و بەر لە دەسدرێژی کەمالییەکان بگرێ، ئەویش بەپێی لێکدانەوەی خۆی هاتبوە سەر ئەو بڕوایەی بەرژەوەندی کورد لەوەدایە دەست بخاتە ناو دەستی ناحەزانی ئینگلیزەوە چونکە ئەو مارانگازی دەستی ئینگلیز بوو، بۆیەکا دوای ئەوەی سەرەتا ئەوانی تاقی کردەوە رووی کردە شوورەوی و کەمالییەکان و رەزا شا کە بەداخەوە هیچ کامێکیان دادیان بۆی نەدا، ئەو راستییەی لە چەند شوێنێکی ئەم نامەیەشدا رەنگی داوەتەوە.

شێخ مەحمود بەر لەوەی بگاتە سلێمانی[1] بە ماوەیەک بە نهێنی پێوەندیی بە کەمالییەکانەوە کرد. ئەوساکە هەموو شۆڕشگێڕانی ناوچەکە پەنایان دەبردە بەر ئەوان چونکە ناحەزی ئینگلیز بوون، لەوانە، بە وێنە، رابەرانی شۆڕشی بیست. کەوابێ ئەو کارەی شێخ مەحمود لەگەڵ رەوتی مێژوودا دەگونجا، ئەم نامەیەشی دەچێتە هەمان خانەوە. بەڵام بەداخەوە کەمالییەکان دەستی شێخیان بری و هیچیان بۆی نەکرد. ئەوان دەیانویست بە چەند نیشان و میدالێک و ژمارەیەک گفتی درۆ کورد بکەنە داردەستی خۆیان بۆ زەوت کردنی کوردستانی باشوور. شێخ لەوە گەیشتبوو ئەو نیشان و میدالانە فشە گاڵتەن، ئەوەتا لە خاڵی سێیەمی نامەکەیدا دەڵێ: **«شەرمەندم ئاگادارتان بکەم کە ئەو میدالانەی بۆ خۆم و کوڕەکانمتان ناردبوون گەیشتنە دەستمان، بەڵام بەندە وای بەباش دەزانم ئەم باسە جارێکا بە نهێنی لە نێوان خۆماندا بمێنێتەوە...»**.

شێخ میدالی راستەقینەی بۆ ئاغایانی کورد دەویست، دەیویست کەمالییەکان دەستی یاریدەیان بۆ درێژ بکەن تا نەکەونە داوی ئینگلیزەوە، ئەوەتا لە خاڵی هەشتەمی نامەکەیدا دەفەرموێ:

**«تکام وایە ئەوە بزانن کە تەنها پێشکەش کردنی چەند نیشان و میدالێک بە سەرۆک هۆزانی کورد بەس نییە بۆ بەردەوام بوونی پێوەندییان... پێویستە پارەیەکی ئەوتۆ دابین بکرێ کە بتوانم بەپێی فەرمانەکانم پادداشتی نهێنییان بۆ تەرخان بکەم... ئەگەر بەم پێشنیارانە قایل بوون ئەوا دەتوانن ئەوەی داوامان کردووە لە رێگەی کەرکوکەوە بۆمانی بنێرن»**.

---

(١) شێخ مەحمود رۆژی ٣٠ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٢ گەیشتەوە سلێمانی.

by Shaikh Mahmud to the Turks.

---

To:-

The Officer Commanding 8th Division and
Frontier Commissioner.

(1) Although it was mentioned in a letter dated October 1st, 1343, No.2348, which was received through Fattah Beg, the Musul Deputy, that arrangements had been made to ensure the facilitation and assistance of the Persians, it has happened that since my interview with the representative of the British Government at Khurmal that the frontier officia[ls are] plainly opposing us and showing us difficulties, althou[gh] it would be useful if they apparently showed themselves to be on good terms with us, but by their preventing our transport, communications and it shows

مەحمود خانی دزڵی کە کوردێکی خاوێن و سەرڕاست بووەو بە کەس فریو نەدراوە ئەو میداڵەی ڕەتکردەوە کە کەمالییەکان بۆیان ناردبوو. لە خاڵی نۆیەمی نامەکەیدا شێخ مەحمود لەم بارەیەوە نووسیوییە دەڵێ: **«زەخیرەم داوەتە هاوڕێی دڵسۆزو بە ئەمەکمان مەحمود خانی دزڵی کە پیاوێکی بەهادارە. هەرچەندە چەند جارێک میداڵەکەی ڕەتکردەوە بەڵام من، دوای گەڕانەوەی نۆرخان بەگ، زۆرم لێی کرد کە قەبوڵی بکات. بە ڕاستی مەحمود خان دۆستەو شایانی هەموو جۆرە بایەخ پێدان و چاودێرییەکە».**

شایانی باسە مەحمود خانی دزڵیش سەرەتا بڕوای زۆری بە کەمالییەکان بوو، ئەویش پێی وابوو بە یاریدەی ئەوان دەتوانێ درێژە بە خەباتی خۆی بدات. لەو ڕاپۆرتەیاندا کە ئینگلیزەکان دەربارەی ڕەوتی کاروباری کارگێڕی عیراق لە ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢٢دا داویانەتە **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** (عصبە الامم) بە تایبەتی باسی نامەیەکی مەحمود خانی دزڵییان کردوە کە ناردویە بۆ مستەفا کەمال و داوای چەکی لێی کردووە تا بتوانێ ئینگلیز لە سلێمانی وەدەرنێ[٢]. کەمالییەکان هیچیان بۆ ئەویش نەکرد بۆیەکا دڵی لێیان ڕەنجابوو، باوەڕی پێیان نەمابوو.

---

(2) "Iraq. Report on Iraq Administration, October 1920-March 1922", London, 1923, P. 116.

لایەنێکی زۆر بایەخداری تری نامەکەی شێخ مەحمود بۆ کەمالییەکان دەربارەی پێوەندیی کوردو عەجەمەکانە کە ئەوانیش ئاشکرا شێخیان دەسخەڕۆ کردووەو پەلپیان پێی گرتووەو کۆسپیان خستۆتە ڕێی. شیخ نامەکەی بەم باسە دەست پێکردووەو لە خالی یەکەمدا نووسیوییە دەڵێ:

**«هەرچەندە لەو نامەیەتاندا کە ژمارەکەی (٢٣٤٨)و ڕۆژی یەکی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٣٤٣ (١٩٢٤) نووسیوتانەو لە ڕێگەی فەتاح بەگی[٣] نوێنەری مووسڵەوە پێمان گەیشت، باسی ئەو کۆششەتان کردووە کە داوتانە بۆ دابین کرنی یاریدەی عەجەمەکان، بەڵام لەو ڕۆژەوەی لە خورماڵ لەگەڵ نوێنەری حوکمەتی بەریتانیادا کۆبووینەوە کاربەدەستانی سەر سنوری ئەوان ئاشکرا کەوتوونەتە دوژمنایەتیمان و هەمەجۆر کۆسپ و تەگەرە دەخەنە ڕێگەمان، باشتریش وایە ئەوان بێ پێچ و پەنا هەستی ناحەزانەی خۆیان بەرانبەرمان دەربڕن، هەر چەندە ئەو هەولاتەی دەیدەن بۆ قەدەغەکردنی هاتوچۆو پێوەندییەکانمان هیچیان بۆ ئەوە نەهێشتۆتەوە کە بە ڕوونی هەست بە هەڵوێستی دوژمنانەی راستەقینەیان نەکرێ. ئەم باسە بە وردی خرایە بەردەم وەزیری جەنگ عەبدوللا خانی تەهماسبی لە کاتی ئەو سەردانیەدا کە لەم چەندانەی دواییدا بۆ ناوچەکە کردی و داوای لێکرا چارسەری ئەو کێشەیە بکات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کاربەدەستە نەخوێندەوارەکانی سەر سنوور شتێکیان نەکرد بۆ ئەوەی هیچ جۆرە ئامادەییەک نیشان بدەن کە نیازیانە دەست لە بەدفەری خۆیان هەڵبگرن و رەفتاریان لەگەڵماندا بگۆڕن..».**

دەمێنێتەوە برگەیەکی تری بایەخداری ئەو نامەیە کە بە ڕوونی سەرنجی شێخ مەحمودمان دەربارەی ئینگلیز نیشان دەدات و ئەمیشیان تفێکی ڕەوای مێژووە بە رووی ئەو نووسەرۆکانەوە کە تا ئیمڕۆش، بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆ دەربارەی مێژووی کورد بزانن، شێخ بە پیاوی ئەڵقە لەگوێی ئینگلیز دادەنێن. لە هەمان خاڵی یەکەمی گرنگی نامەکەیدا شێخ مەحمود بە کەمالییەکان دەڵێ:

**«لە رابردودا بە درێژی باسی هەموو تەماعە نارەواو ساختەکانی حکومەتی**

---

(٣) فەتاح بەگی ژنبرای شێخ مەحمود ئەوساکە یەکەم لایەنگری کەمالییەکان بوو لە ناو کوردا. تەنانەت یەکێک بو لە ئەندامانی ئەو وەفدەی تورکیا کە لە تەک وەفدی **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** (عصبة الامم)دا هاتە عیراق بۆ تۆژینەوەی کێشەی مووسڵ.



بەداخەوە کەمالییەکان دەستی شێخیان بڕی و هیچیان بۆی نەکردا

**بەریتانی و بیروڕا ژەهراوییەکانم کردووە. من ئەوی هەمەو نیمە... بە ئەوپەڕی دڵسۆزییەوە تەرخانم کردوە بۆ خزمەتی جیهانی موسڵمانان و هەرگیز ڕێگە بەخۆم نادەم ببمە داردەستی ئەو بیروڕا هەڵخەڵەتێنەرانەی حوکمەتی بەریتانی بڵاویان دەکاتەوە».**

لە خاڵی شەشەمی نامەکەیدا شێخ مەحمود داوای پارچەیەک زەوی لە نزیک شاری ئەستەمبۆڵەوە دەکات تا، وەک دەڵێ: **«خۆم و کەس وکارم دوا ساتی ژیانمانی لێ بەرینەسەر»** کە **«ناوچەیەکی دڵفڕینی وڵاتێکی موسڵمانە»**. لەو بڕگەیەی نامەکەیدا شێخ جارێکی تر دێتەوە سەر باسی ئینگلیزو دووپاتی دەکاتەوە کە ئەو لەو کەسانە نییە بە فەنوفێڵی ئینگلیز هەڵبخەڵەتێ. هەر لەبەر ئەوەش لە خاڵی دەیەمی نامەکەیدا شێخ هێرشێکی توندوتیژ دەکاتە سەر بابەکر ئاغای پشدەری و مستەفا پاشا یا مولکی کە بە **«مستەفا نمرود»** ناوی دێنێ و باسی هەردووکیان وەک نۆکەری ئینگلیز دەکات. لێرەدا شێخ دەڵێ مستەفا پاشا بەهۆی هەواڵەکانی بەرلین[٤] و کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە لەوە دڵنیایە کە کێشەی گەلی کورد ڕوو لە

(٤) دوور نییە مەبەستی جنێف بێ نەک بەرلین.

هەورازەو بەم زوانە گرێی بەختی کوردیش دەکرێتەوە.

لە خاڵی دوازدەمینی نامەکەیدا دیسان شێخ دێتەوە سەر باسی ئینگلیزو ئەمجاریان دەڵێ: **«...دڵنیاتان دەکەم ئێستا لە هەر کات زۆرتر بە پەرۆشم بۆ گرتن و دیل کردنی ئینگلیزەکان، دەمەوێ ئەوەیان پێ بکەم کە لە دەربەند پێم کردن»**، کە دیارە مەبەستی گرتنی ئینگلیزەکانە لە سلێمانی لە مانگی مایسی ساڵی ١٩١٩دا، ئەگینا لە دەربەند شێخ خراپ شکاو بە برینداری و بەخسیری کەوتە دەست ئینگلیزەکان.

خوێندنەوەی مێژوویی ناوەرۆکی ئەم نامە گرنگەی شێخ مەحمود ئاو زۆر دەکێشێ کە لە **«رەنگین»**دا جێگەی نابێتەوە، بەڵام نابێ لێرەدا چاو لە دوو خاڵ بپۆشین، **یەکەمیان** ئەوەیە کە ئینگلیزەکان ئاگاداری هەموو کەین و بەین و بیروبۆچونێکی شێخ مەحمود بوون، کوردە ناموبارەکەکان خۆیان سەرجەمی نامەو بریارو پێوەندییە نهێنییەکانی شێخیان وەک هێلکەی پاککراو دەخستە بەردەم ئینگلیزەکان، بۆیەکا ئەوانیش هیچ بروایەکیان بە شێخ نەبوو. **دووەمیان** ئەوەیە کە ئینگلیز، زۆر بەداخەوە، لەگەڵ کوردو خودی شێخ مەحمودا گەلێک لە کەمالییەکانی تورکیاو پەهلەوییەکانی ئێران و زۆر لایەنی تر بە رەحمترو جوامێرتر بوون، ئەوانیش دەیانتوانی زۆر بە ئاسانی شێخ مەحمود بە دەردی شێخ سەعیدی پیران و سمکۆی شکاک بەرن کەچی تا دوارۆژ بەرێزەوە رەفتاریان دەکرد، پێوەندییان لەگەڵدا نەپچڕی، داوایان لە کاربەدەستانی رۆژگاری پاشایی دەکرد دڵی نەشکێنن، بابە عەلی کوریان خستە بەر خوێندن و بۆ ئەم مەبەستە بردیانە ئەسکەندەرییەی میسرو ناردیانە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. دەیان و دەیان بەڵگەنامەی نهێنیی ئینگلیزەکانم دەربارەی ئەم باسانە لایە، تەنانەت نومرەکانی بابە عەلیشم دەسکەوتووە کە لە کۆلیجی ڤیکتۆریا وەریگرتوون و ئینگلیزەکان بە تایبەتی لە فایلەکانی خۆیاندا هەڵیان گرتوون.

**هەڵبەت تۆماری مێژووی هەموو گەلێک پڕییە لە پەندی بەکەڵک، بەڵام بە داخەوە پەند زۆرو پەندوەرگر کەم!!**

بابەتی حەوتەم*

# لاپەڕەیەکی ون لە مێژووی خەباتی شێخ مەحمود دەربارەی هەڵوێستی کورد بەرانبەر ڕاپەڕینی مایسی ١٩٤١

**پێشکەشە بە ناوی پاکی جوانەمەرگ ئەمیری شێخ ڕەوفی شێخ مەحمود بەیادی هاوڕێی ئازیز ڕەشید خەفاف**

**سەرەتایەک:**

بە داخەوە مێژوونووسی کورد دەبێ بەشێکی زۆری کاتی خۆی بۆ ڕوون کردنەوەو بەرپەچ دانەوە تەرخان بکات، ئەم ڕاستییە هەڵوەستی گەلی کورد بەرانبەر ڕاپەڕینی مایسی ساڵی ١٩٤١یش دەگرێتەوە.

ڕاپەڕینی مایسی ١٩٤١ بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی ڕەوای گەلی عیراق بوو دژی ئینگلیزی داگیرکەر کە لە هەلومەرجێکی زۆر ئاڵۆزو نالەباردا بەرپا بوو، هەرچەندە تاوەکو ئێستا چ بە عەرەبی و چ بە زمانی تر نووسەران توخنی زۆر لایەنی ئەم ڕاپەڕینەو بەسەرهاتەکانی کەوتوون[١]، بەڵام هێشتا گەلێک لایەنی تری پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی وردو هەڵسەنگاندنی زانستییانەی دوور لە هەستە. هیچ دوور نەڕۆین گەلێک مێژوونووسی بێگانە هەن لایەنە ڕزگاریخوازەکانی ئەو ڕاپەڕینە نابینن و بە دەسکردی نازییەکانی ئەڵەمانیای لە قەڵەم دەدەن[٢]. وەک

---

(*) لە گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»، ژمارە (١٢١)ی مارتی ١٩٨٩دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) باشترین سەرچاوە بە زمانی عەرەبی دەربارەی ڕووداوەکانی ڕاپەڕینی مایس ئەو کتێبەی مێژوونووسی ناسراو عەبدولڕەزاق حەسەنییە کە کاتی خۆی قەدەغەکرا. بڕوانە: **عبدالرزاق الحسني، الاسرار الخفية في حركة السنة ١٩٤١ التحررية، الطبعة الثانية، صيدا، ل ١٩٦٤، ٣٥٦.** هەروەها نامەی دوکتۆرای فاضل بەراکێش کە پێشکەشی مەعهەدی ڕۆژهەڵاتناسی کۆڕی زانیاری سۆڤیەتی کرد دەربارەی هەمان باسە(بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٢).

فەیسەڵ فەهمی سەعید دەڵێ شارەزایان دەتوانن بە ئاسانی هەست بەوە بکەن چۆن بەشی زۆری ئەو نووسینانەی بۆ باسی ڕووداوەکانی ڕاپەڕینی مایس تەرخان کراون لە لێکدانەوەی بەسەرهاتە مێژووییەکاندا ورد نین(٣). ئەم بۆچوونە بە تەواوی هەڵوەستی کورد بەرانبەر ئەو ڕاپەڕینە دەگرێتەوە. ئەوانەی دەسکاریی ئەم لایەنەی باسەکەیان کردووە بە داخەوە لە لێکدانەوەیاندا تەواو ورد نین، بێ هەڵسەنگاندنی قووڵ حوکمی خۆیان داوە.

هەڵوەستی کورد بەرانبەر ڕاپەڕینی مایس یەکێکە لەو لایەنە گرنگانەی پێویستیان بە لێکۆڵینەوەو لێدوانە، یەکەم لەبەر ئەوەی تاوەکو ئێستە شتێکی ئەوتۆی دەربارە نەنووسراوە، دووەمیش چونکە ئەو شتە کەمەی دەربارەی نووسراوە لە هەموو ڕوویەکەوە بابەتەکی **(مەوزوعی)** نییە، ئەمیانە بە تایبەتی هەڵوەستی شێخ مەحمودو ڕەفتاری لەو ڕۆژگارە ناسکەدا دەگرێتەوە.

بەشێک لە نووسەران نە زۆرو نە کەم توخنی ئەم باسە نەکەوتوون، بەشێکیشیان چ لە خۆو چ لە بێگانە، سوورن لەسەر ئەوەی گوایە شێخ مەحمود، کە لە کاتی بەرپابوونی ڕاپەڕینەکەدا لە بەغدای پایتەخت دەسبەسەر بوو، بە فیتی ئینگلیز هەڵهات بەو نیازەی لە کوردستان ئاژاوە بنێتەوە، سەلاحەدین سەباغ کە یەکێک بوو لە پێشەوا هەرە چالاکەکانی ڕاپەڕینی مایس وای بۆ چووە کە دەبێ شێخی کوردان بە فەرمانی ئینگلیز بۆ پەلاماری ئەوان ڕای کردبێ(٤). دوا بە دوای ئەو گەلێک نووسەری تر ئەو بۆچوونەی دووبارە کردۆتەوە. بە وێنە مەحمود الدره دەڵێ: **«شێخ مەحمودی سەرداری کورد لە دەسبەسەری لە باشوور هەڵهات و چۆوە سلێمانی بۆ ئەوەی شۆڕش دژی پێشەوایانی بەغدا بەرپا بکات. تەحسین عەلی پارێزەری موسڵیش هەوڵی دەدا هۆزە عەرەبەکان، تایبەت هۆزی شەممەرو هۆزە کوردەکان بۆ**

---

(٢) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە:

الدكتور فاضل البراك، دور الجيش العراقي في حكومة الدفاع الوطني والحرب مع بريطانيا عام ١٩٤١. دراسة تحليلية نقدية مقارنة، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٨٧، ص ٢٧٧-٢٨٣.

(٣) **«الثورة»** (جريدة)، بغداد، ٢ ايار ١٩٨٨.

(٤) **« مذكرات الشهيد العقيد الركن صلاح الدين الصباغ. فرسان العروبة في العراق»**، بغداد، بلا، ص ٢٢٥.

**پشتگیری کردنی وەسی هان بدات»**[٥].

میرسکی و[٦] ئۆگانیسیان **(ئۆهانیسیان)**[٧] وەک یەک دەڵێن شێخ مەحمود لە بەغدا رای کردو گەڕاوە سلێمانی و کەوتە کۆکردنەوەی هێز بۆ پشتگیریی ئینگلیز، سەرچاوەی هەردووکیشیان لۆنگریگە کە دەقی قسەکانی لەم بارەیەوە بەم جۆرەیە:

**«هیچ کام لە سەرەک هۆزانی (عیراق)پشتی حوکمەتیان نەگرت(مەبەستی ئەو رژێمەیە کە لە ئەنجامی راپەڕینی مایسدا دامەزرا - ک.م)، شێخ مەحمود کە لە بەغدارا هەڵهات و گەیشتەوە سلێمانی کەوتە باسی ئەوەی نیازییە هێز بۆ «پشتگیریی بەریتانییەکان» ئامادە بکات»**[٨]. وەک دواییش دەیبینین ئەم وتنەی لۆنگریگ پێویستی بە لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی وردە، جگە لەوەی لەگەڵ قسەکانی میرسکی و ئۆگانیسیاندا تەواو یەک ناگرنەوە.

هەمان کات نووسەری ئەوتۆش هەیە تەواو بە پێچەوانەی ئەو نووسەرانەی باسمان کردن وای بۆ چووە کە مەبەستی سەرەکیی راپەڕینی مایسی ساڵی ١٩٤١ لێدانی کوردو کوردایەتی بووە[٩]. راستی مەسەلەکەش نە ئەویانە، نە ئەمیان.

دیارە هەموو رووداوو هەڵوەستێکی مێژوویی، بە چاک و خراپییەوە، هەلومەرج و بناغەو رابوردووی خۆی هەیە، جا بۆ ئەوەی بتوانین دروست بۆ پوختەی ناوەرۆک و هۆ بزوێنە دروستکەرەکانی هەڵوەستی کورد بەرانبەر راپەڕینی مایس بچین پێویستە بەر لە هەرشتێکی تر لەوە بگەین ئایا کورد لەو رۆژگارەدا لە رووی بیرو بەرژەوەندی نەتەوەیی و تاقیکردنەوەی رابوردووی دوورو نزیکییەوە ئامادە بوو بداتە پاڵ ئینگلیزو کۆنەپەرستانی عیراق، یان بچێتە ناو سەنگەری

---

(٥) محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، بيروت، ١٩٦٩، ص ٢٠٤.

(6) G.E.Mirski,Iraq, smutnaya vremia 1930-1941, Moscow, 1961, p. 161.

(7) N.O.Oganesian, Natsionalno-Osvoboditelnaya dvijene v Iraqe (1917-1958), Erevan, 1976, p.290.

(8) S.H.Longrigg, Iraq 1900 to 1950. A Political, Social and Economic History, London, Second Impression, 1956, p. 295.

(٩) بە وێنە بڕوانە:

K.Kaftan, Barzanskaya Vosstania 1900-1945, Cand. Diss., Leningrad, 1964, P.122.

دوژمنانیانەوە.

وەلامی ئەم پرسیارە یەکجار کورت و ئاسانە: ئینگلیز، کە هەموو شتێکی بە دەست بوو، تا رۆژی بەرپابوونی راپەرینی مایس هیچی بۆ کورد نەکرد، فڕۆکەو تانک و زرێپۆشەکانی بێ درێغی گاڵەیان بەهەر کوردێک دەکرد بیوێرایە داوای مافە رەواکانی گەل و نیشتمان بکات، وێڕای ئەوە چەوساندنەوەی نەتەوەیی کورد لە ژێر سایەی ئینگلیزدا ببووە کارێکی رۆژانەی فەرمانڕەوایانی ئەو رۆژگارە، مشتێ لە خەرواری گەلێک زۆرە بۆ روون کردنەوەی ئەم راستییە، بۆیەکا لێرەدا وەک بەڵگە چەند راستییەکی کەم دەخەینە بەرچاو.

تا دەهات تەوژمی فشاری کاربەدەستان بۆ سەر ژیانی روناکبیریی کورد پتر دەبوو. بەر لەوەی سییەکان کۆتاییان بێ کار گەیشت بەوەی خوێندنی کوردی لە شارێکی دێرینی وەک کۆیە لە ١٨ سەعاتەوە بێتە سەر تەنها سێ سەعات، ئەو کارەی بووە هۆی مان گرتنی شاگردانی ئەو شارە[١٠]. بەڵگەنامەکانی میری بۆ خۆیان دەڵێن سالی ١٩٤٠، واتا ساڵێک پێش بەرپابوونی راپەرینی مایس، لە نزیکەی ١٤ هەزار شاگردی فێرگەی ناوەندیی هەموو عیراق تەنها ٣١٣یان بەر شاری سلێمانی کەوتوون. هەر ئەو ساڵە لە سەرانسەری شاری هەولێرو دەوروبەریدا فێرگەیەکی ناوەندیی کچان نەبوو، هەرچەندە سالی ناوبراو ژمارەی ئەو فێرگانەی عیراق ٥٦ فێرگە بوو کە هەژدەیان هی کچان بوون[١١]. تا سالی ١٩٤٣ لە شارێکی وەک سلێمانیدا کتێبخانەیەکی گشتی نەبوو، **هەر ئەو ساڵە دانیشتوانی هەولێر ناچار بوون بۆ خۆیان پیتاک بکەن و ٦٠٠ دینار بۆ دامەزراندنی کتێبخانەیەک کۆبکەنەوە کە بۆ ئەو رۆژگارە پارەیەکی کەم نەبوو**[١٢]. بەر لەوە بە ماوەیەکی کەم لە ناو هەموو کتێبخانەی گشتیی بەغدادا بۆ ئاهی سوێن کتێبێکی

(١٠) بڕوانە:
«العالم العربي» (جريدة)، بغداد، ١٣ تشرين الثاني ١٩٣٥، ٢٩ شباط ١٩٣٦.

(١١) «الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد- الدائرة الرئيسية للاحصاء. المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنتي ١٩٤٤، ١٩٤٥»، بغداد، ١٩٤٦، الجدولان ٣٨ و ٣٩، ص٢٠-٢١.

(١٢) «صوت الاهالي» (جريدة)، بغداد، ٨ كانون الثاني ١٩٤٣.

کوردی نەبوو، کەچی ژمارەی کتێبە فارسییەکانی ١١٦و تورکییەکانی ٧٥٢ کتێب بوو[١٣].

باری چاپەمەنی و رۆژنامەنووسی کوردی لەوەیش خراپتر بوو، لە سییەکانەوە تا ناوەندی چلەکان هەموو بەسەر یەکەوە ١٠٠ کتێبێکی کوردی کەوتۆتە بازاڕەوە کە ئەوانیش زۆربەیان نامیلکەی ئەدەبی یان ئایینی بوون[١٤]. گۆڤاری **«رووناکی»** کە موکریانی دەری دەکرد لە یازدەمین ژمارەیدا قەدەغە کرا، چونکە داوای دامەزراندنی پرۆژەی ئاوی خاوێنی بۆ شاری هەولێر کردبوو[١٥].

هەر ئەو دەورووبەرە رووناکبیرانی کورد تەنها **«یانەی سەرکەوتن»**یان هەبوو کە ئەویش بەر لە راپەڕینی مایس بە ماوەیەک داخراو تا نیسانی ١٩٤٢ رێگەی نەدرا بکەوێتەوە کار[١٦]، کەچی بەرانبەر بەوە هێشتا لە سەرەتای سییەکاندا ئاسوری و ئەرمەن[١٧] نزیکەی ١٠ یانەو کۆمەڵەی رووناکبیریی تایبەتی خۆیان هەبوو کە هەموویشیان وەک **«یانەی سەرکەوتن»** لە بەغدا نەبوون[١٨].

دەربارەی باری تەندروستی لە کوردستانی ئەو رۆژگارەدا پێم وایە هێند بەسە بڵێین لە ناوەندی سییەکاندا یەک برینپێچ هەر مانگەی جارێک سەری لە یەکێک لە ناوچە فراوانەکانی سەر بە پارێزگای هەولێر دەدا[١٩]. ساڵی ١٩٣٦ هەموو

---

(13) "The Iraqi Directory, 1936", Baghdad, 1936, p.428.

(١٤) بڕوانە: نەریمان، کتێبخانەی کوردی، کەرکووک، ١٩٦٠، ل١١-٢٤.

(١٥) **«هەتاو»**، هەولێر، ژمارە ١٨٦، ئەیلولی ١٩٦٠، ل٧.

* (ئەو کێشەی داوای ئاوی خواردنەوە بۆ هەولێر گوایە گۆڤاری «**روناکی**» بەهۆیەوە راوەستاوە لاوازەو لەم ژمارە (١٨٦)ی **«هەتاو»** کە دکتۆر ئاماژەی پێداو مامۆستا عوسمان شارباژێڕی نووسیویەو سۆزی تێکەوتووە، ئێستا بەڵگەی بەهێز لەبەردەستدایە کە کێشەکە زۆر لەوە گەورەترەو هۆی دیکەی لە دوادا بووە دەمێکیشە ئەو بۆچوونەم هەبووە، بەم دواییەش کە د. کوردستان موکریانی لە ژمارە ٩ی زستانی ٢٠٠١ لەژێر ناونیشانی **«چۆنیەتی دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان لە هەولێر»**ی بڵاوکردەوە، زیاتر باوەڕم بە بۆچوونەکانم قایم بووە، بۆیە دەبێ ئەو رایەی لەسەر راوەستانی «**روناکی**» چاوی پێدا بخشێندرێتەوە - **عەبدوڵڵا زەنگەنە**).

(١٦) **«گەلاوێژ»**، بەغدا، ژمارە٥و٦، مایس و حوزیرانی ١٩٤٢، ل٩٥.

(١٧)تەنها بە نیازی بەراورد ئەو ژمارەیەم هێناوەتەوە، ئەگینا بریا لەوەیش زیاتریان هەبووایە.

(18) "The Iraqi Directory, 1936", p.561.

(١٩) **«الاخاء الوطني»** (جريدة)، بغداد، ١٥تموز ١٩٣٤.

شاری سلێمانی ٢ دوکتۆرو ٢ برینپێچ و ١ نەخۆشخانەی ٣٤ کەسی تێدابوو[٢٠].

سەرباری هەموو ئەوانەش گشت سەردارو پێشەوایانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی ئەوسای کورد، کە شێخ مەحمود لە سەروو هەموویانەوە بوو، یان دەربەدەر، یان دەسبەسەر بوون.

لێرەدا پرسیارێکی رەوا خۆ دەسەپێنێ، ئەوساکە کێ بەرپرسیاری ئەو بارە ناهەموارە قورس و گرانەی سەرشانی کوردی عیراق بوو؟. وەڵامی ئەم پرسیارە لە **«گۆڤاری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست»**ی لەندەنی وەردەگرین کە دەڵێ: **«تەواوی چارەنووسی عیراق»** لە سەردەمی پاشاییدا **«بە دەست حوکمەتی بەریتانیاوە بوو»**[٢١].

جا گەر لەم قوژبنەوە بۆ باسەکە بچین ئاخۆ ئەوساکە رەزای ئینگلیزو پیاوەکانیان لای کورد چۆن بووبێ، کاتێک بیر لەمە دەکەینەوە پێویستە ئەوەیش لە یاد نەکەین ئەو سەردەمە پروپاگەندەی چالاکی نازییەکانی ئەڵەمانیا، کە **«گەیشتبووە کەلاترین ناوچەی وڵات»**[٢٢]، هێندەی تر رەزای ئینگلیزی لای خەڵکی گران کردبوو، لە رقی ئینگلیز پروپاگەندەی نازی هەست و نەستی زۆربەی رووناکبیرانی کوردیشی لەناخەوە بزواندبوو[٢٣]. ئەو رۆژانە لە هەموو شوێنێ ئاوازی هاورەگەزیی کوردو ئەڵەمان دەبیستراو باسی **«هەستی هیتلەر»** بەرانبەر بە کورد دەکرا، زۆر کەس لە کوردستان، وەک هەموو ناوچەکانی تری رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاستی ژێردەستەی بەریتانیاو فەرنسە،عەوداڵی سەوکەوتنی هێزەکانی ئەڵەمانیا بوون لە شەڕگەکانی جەنگدا[٢٤]، لەبەر ئیستگەی بەرلین و قسە ئاگرینەکانی یونس بەحری کەم کەس

---

(20) "The Iraqi Directory, 1936", pp. 179, 181, 357.
(21)"The Middle East East Journal", London, Vol. 3, No 3, Summer 1954, p. 341.

(٢٢) **«القاعدة»**، العدد التاسع، آب ١٩٤٤، ص٢٢.

(٢٣) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا مەسعود محەمەد، رۆژی ٤ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩؛ دیدەنی لەگەڵ مامۆستا قادر قەزاز، رۆژی ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨.

(٢٤) بۆ درێژەی ئەم باسانە بڕوانە:

G.L.Harris, Iraq. Its people, its society, its culture, p. 98;

ساڵح قەفتان، بەراوردێکی تاریخی، سلێمانی ١٩٣٦؛ **«رووناکی»**، ژمارەکانی مارت و نیسانی ساڵی ١٩٣٦.

دەپپەرژایە سەر ئیستگەی تر، تا وای لێهات خەڵکی لەسەر دەگیرا، یەکێک لە ڕووناکبیرەکانی ئەو دەمە بە دڵنیاییەوە دەڵێ هەستی لە سەدا نەوەتی کورد لەگەڵ ئەڵەمان بوو[٢٥]. دیارە لەخۆڕا نەبوو ساڵی ١٩٤٢ باڵیۆزخانەی بەریتانی لە بەغدا نامیلکەی **«بیروباوەڕی نازییەکان بەرانبەر ئاینەکان»**ی بەزمانی کوردی دەرکرد. دەرچوونی گۆڤاری **«دەنگی گێتی تازە»**ش بۆ هەمان مەبەست بوو، تایبەت دوای ئەوەی چالاکیی نازییەکان لە ناو کوردا تا دەهات پەرەی دەسەندو گەیشتە ئەوەی یەکێک لە سیخوڕانی ئەڵەمان کە لە ناوچەکانی سنووردا کاری دەکرد **«هەڵۆی کوردستان»** بکاتە نازناوی خۆی[٢٦].

کەوابێ، دیارە هەر وایش بووە، دەبوو کورد هەستی لەگەڵ هەموو بزووتنەوەیەکی دژ بە ئینگلیز بێ، چ جای بزووتنەوەیەکی وەک ڕاپەڕینی مایسی ١٩٤١ کە لەبەر گەلێک هۆ هەستی گشت لایەکی بزواند، هەموو پیاوە ئاینییە بەناوبانگەکانی عیراق بە فەتوای تایبەتی، بە ئەوپەڕی سۆزەوە داوایان لە گشت چین و دەستەو نەتەوەکانی عیراق دەکرد بە گەرمی، بە ماڵ و بە گیان پشتگیریی بکەن، لاپەڕەکانی هەموو ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژانە بەو جۆرە فەتوایانە تەنراون[٢٧]، ئیستگە یەک لەسەر یەک بڵاوی دەکردنەوە. بە هەمان ڕادەو، زیاتریش، هێزە نیشتمانییەکان چووبوونە سەنگەری شۆڕشگێڕانەوە، پارتی کۆمۆنیستی عیراقی، کە دەنگی لە کوردستان زوڵاڵ بوو، سەرەتا پشتی ڕاپەڕینی مایسی گرت، تایبەت دوای ئەوەی ڕەشید عالی گەیلانی بڕیاری بەردانی ئەو کۆمۆنیستانەی دەرکرد کە کاتی خۆی بەکر سدقی گرتبوونی[٢٨].

---

(٢٥) دیدەنی لەگەڵ دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی، ڕۆژی ٣١ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩.

(٢٦) مقتدر، كليد خليج ....، تهران، ١٣٣٣، ص١١٨.

(٢٧) بۆ نموونە بڕوانە:

**«الاستقلال»**(جريدة)، بغداد، ٥-٨مايس ١٩٤١.

(٢٨) **«الشرارة»**، العددان ٦و٧، مايس-حزيران ١٩٤١؛ عبدالرزاق الحسني، الأسرار الخفية في حركة السنة ١٩٤١ التحررية، ص ٢٥٤.

## دەوری کورد لە ڕاپەڕینی مایسی ١٩٤١دا

هەڵوەستی کورد بەرانبەر ڕاپەڕینی مایس لە هەردوو مەیدانی خەباتی ئەو ڕۆژەدا، کە **یەکەمیان** ریزەکانی ناو لەشکرو **دووەمیان** بزووتنەوەی جەماوەر بوو، زۆر روون و ئاشکرا خۆ دەنوێنێ، ئەفسەرە کوردەکان بە دڵ و بە گیان هاتوونەتە کۆڕی خەباتەوە، لیوای خانەنشین فوئاد عارف، کە ئەو کاتە لە **(مسیب)** ئەفسەر بووە، بە شانازییەوە دەڵێ لەو ڕۆژە ناسکەدا هیچ کام لە ئەفسەرانی کورد نە شەڕگەیان بەجێ هێشت و نە لە ژێرەوە پێوەندییان لەگەڵ ئینگلیزو فەرمانڕەوایانی پێشووی وڵاتدا دامەزراند(٢٩). بەڵگەی پێچەوانەوەی ئەوە بەدەستەوەن، بەڵام ئێرە شوێنی باسیان نییە(٣٠). **(محمد الطريحي)**یش کە یەکێک بوو لە ئەفسەرە چالاکەکانی ڕاپەڕینی مایس، دەڵێ کەم ئەفسەر لەو ڕۆژگارەدا بە ڕادەی میرحاج بە گەرمی هاتۆتە کۆڕی خەباتەوە. میرحاج وەک تۆپچی لەگەڵ ئەو هێزانەدا بەشدار بوو کە گەمارۆی هێزەکانی ئینگلیزیان لە **(سن الذبان)**ی نزیک حەبانیەوە دا(٣١). فایقی کاکە مینیش، کە سەرلەشکری ناسریە بوو، بە تەواوی دەستی لەگەڵ سەردارانی ڕاپەڕینی مایسدا تێکەڵ کردبوو(٣٢)، ئەوساکە فایقی کاکەمین بە خۆی دەگوت **«هیتلەری کوردستان»**، طریحی دەڵێ مەبەستی فایق لەو نازناوە ئەوەبوو گوایە بە ڕادەی هیتلەر ڕقی لە ئینگلیزە(٣٣).

دەوری ئەفسەرانی کورد لە هەموان زیاتر لە هەڵوەستی ڕەشید جەودەتدا خۆ دەنوێنێ، ئەمیان، لەگەڵ مەحمودی برا گەورەیدا، لە سەرەتای خەباتی شێخ مەحمودو سمکۆوە وەک نیشتمانپەروەرێکی خوێنگەرم و دڵسۆز ناسراوە، لە کاتی تەقینەوەی ڕاپەڕینی مایسدا ڕەشید جەودەت سەرلەشکری بەسرە بوو.

---

(٢٩) دیدەنی لەگەڵ لیوای خانەنشین فوئاد عارف، ڕۆژی ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨. لەمەدا هیچ حسێبێک بۆ نورەدین مەحمود ناکرێ، ئەو پیاوە هەر بە ناو کورد بووە.

(٣٠) وەک نمونە بڕوانە:

**عبدالرزاق الحسني، الاسرار الخفية في حركة السنة ١٩٤١ التحررية، ص٢١، الهامش ٢.**

(٣١) دیدەنی لەگەڵ محمد الطريحي، ڕۆژی ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩.

(٣٢) دیدەنی لەگەڵ لیوای خانەنشین فوئاد عارف، ڕۆژی ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨؛ محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، ص٢١٦.

(٣٣) دیدەنی لەگەڵ محمد الطريحي، ڕۆژی ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩.



**رەشید جەودەت بەر لە راپەڕینی مایس بە ماوەیەکی کەم**

لەبەر گەلێک هۆ بەسرە چ بەلای ئینگلیزەوەو چ بەلای رابەرانی راپەڕینی مایسەوە بایەخی یەکجار زۆر بوو. ئینگلیزەکان دەیانویست ئەو شارە گرنگەی وڵات بکەنە بنکەی بەرهەڵستی بەغداو هەر لەبەر ئەو مەبەستەش وەسی و ژمارەیەک لە پیاوە سیاسییە بەناوبانگەکان کە لە پایتەخت هەڵهاتن چوون بۆ ئەوێ، وەسی بۆ خۆی لەم بارەوە دەڵێ:

**«... من بەرەو بەسرە چووم و شەوی پێنج شەممە کە دەیکردە ۳ی نیسانی ۱۹٤۱ گەیشتمە ئەوێ، هەوڵمان دا ئەندامانی وەزارەتیش بانگ کەینە ئەوێ تاوەکو دوور لە فشاری بەغدا کار بکەین و بزووتنەوەکەی رەشید عالی گەیلانی لەناو بەرین، بەڵام وەزیرەکان نەیانتوانی بکەنە لامان»**(٣٤).

دوای گەیشتنی وەسی بۆ بەسرە یەکسەر پێوەندیی بە رەشید جەودەتەوە دەکاو دوو یان سێ جار بانگی دەکاتە لای خۆی و داوای یاخی بوونی لێ دەکا، بەڵام ئەو ملی نەداوەو وەک **(طریحی)** دەڵێ ئازایانە هەموو جار پێی وتوە **«من وەک**

---

(٣٤) عبد الرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الخامس، الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨، ص٢٣٤.

**ئەفسەرێک ناچارم فەرمان تەنها لە بەغدای پایتەختەوە وەربگرم»**[٣٥].

سەرەتا رابەرانی راپەڕینی مایس، تایبەت سەلاحەدین سەباغیان، لە هەڵوەستی رەشید جەودەت دڵنیا نەبوون، بەپێی گێڕانەوەی مەحمود الدره، صەباغ لێی دوو دڵ بوو، چونکە رەشید جەودەت **«لە لایەکەوە کوردێکی (متعصب) بوو، لە لایەکی تریشەوە لەگەڵ رابەرە قەومییەکاندا تەبا نەبوو»**[٣٦]. هەرچی طریحی یە دەڵێ: **«رەشید جەودەت بێ ئەندازە پیاوێکی ساغڵەم و راستگۆو دڵسۆزو قسە لەروو بوو، ئەو سیفەتانەی ژمارەیەک ناحەزیان بۆ دروست کردبوو، پێی ناوێ ناویان بێنم، بەڵام هەمیشە بۆیان تێ دەچاند»**[٣٧].

هەردووکیان ڕاست دەکەن، بەو مەرجەی وشەی **(متعصب)**ی ناو قسەکانی مەحمود الدره بکەینە **(دڵسۆز)**. هەردووکیشیان بۆ ئەم باسە سەرچاوەی رەسەنن. چونکە سەلاحەدین سەباغ بە فڕۆکەی تایبەتی ناردوونییە لای رەشید جەودەت لە بەسرەو دوای کۆبونەوەیان لەگەڵ خۆی و هاوەڵەکانی بە ئەو پەڕی دڵنیاییەوە گەڕانەوە بەغداو طریحی راپۆرتێکی تایبەتی پێشکەش سەلاحەدین سەباغ کرد کە بەم جۆرە دەستی پێ کردووە:

**«بۆ هەلومەرجی ئەمڕۆکە بەسرە یەکجار گرنگە، ئینگلیزو وەسی و دەستەودایەرەی ویستیان حوکمەتێک لە بەسرە دابمەزرێنن، بەڵام ئەو ئاواتەیان نەهاتەدی بەهۆی... هەڵوەستی پیاوانەی ئۆردوگای بەسرەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە تەمان بەسرە بکەنە بنکەی (حەربی ئەعصاب)و پیلانگێران، لەوێوە پێوەندی دەکەن بە ژمارەیەک لە سەرەک هۆزانی فورات و دیجلەو هۆرەوە...»**[٣٨].

بۆ هەمان مەبەست سەلاحەدین سەباغ فەریق ئەمین زەکی، کە کاتی راپەڕینەکە جێگری رەئیس ئەرکانی سوپا بوو، بە تەلەفون قسە لەگەڵ رەشید جەودەتدا دەکەن،

---

(٣٥) دیدەنی لەگەڵ محمد الطریحي، رۆژی ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩.

(٣٦) محمود الدرة، حیاة عراقي من وراء البوابة السوداء، الهیئة المصریة العامة للکتاب، القاهرة، ١٩٧٦، ص١٢٧.

(٣٧) دیدەنی لەگەڵ محمد الطریحي، رۆژی ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩.

(٣٨) بۆ دەقی ئەو راپۆرتە بڕوانە:

**عبدالرزاق الحسني، تأریخ الوزارات العراقیة، الجزء الخامس، ص٢٣٥.**

لە لایەکی تریشەوە داوا لە ماجید مستەفای خزمی ئەکەن، کە ئەوساکە پارێزگاری عەمارە بوو، قسەی لەگەڵ بکا، ئەمیش بە تایبەتی دەچێتە بەسرە بۆ لای ، بە هەمان دەستوور فایقی کاکەمینیش کە ئەو سەردەمە، وەک وتمان، سەرلەشکری ناسرییە بوو زیاتر رەشید جەودەت هان دەدات[٣٩]، بەڵکو ئەمیان بە گەرمی داوای لێ دەکات وەسی بگرێ، یەکێک لەو شایەتانەی دوای دامرکاندنەوەی راپەرینەکە بۆ موحاکەمەی رەشید جەودەتیان هێنا لە پۆستەخانەی بەسرە بەرپرسیاری تەلەفون بووە، وتویە هەموو جارێک کە فایقی کاکەمین قسەی لەگەڵ رەشید جەودەت دەکرد بە کوردی پێی ئەوت، **«کورە بیگرە»** بێ ئەوەی کابرا بزانێ ئەو قسەیە مانای چییە[٤٠].

دیارە ئەم هەموو بایەخ پێدانەی شۆرشگێرانی بەغدا بە هەڵوەستی رەشید جەودەت لەبەر ئەوە بوو کە ئینگلیزو دۆستەکانیان هەر لەسەرەتاوە دەیانتوانی لە رێگەی بەسرەوە دەستی خۆیان بووەشێنن، بە راستیش لەبەر گەلێک هۆ وەزعی رەشید جەودەت زۆر وردو ناسک بوو، بەر لەهەر شتێک ئینگلیزەکان هەمیشە بەسرەیان مەبەست بوو، دەمێ ساڵ بوو لەوێ کنەیان دەکردو جێ پێی خۆیان قایم دەکرد، گەلێک سەرەک هۆزو بازرگانی گەورەو پیاوی دەستڕۆیشتووی بەسرەو دەوروبەری بوبونە پیاوی ئەڵقە لە گوێیان، بنکەی شوعەیبە، کە بە دەست ئینگلیزەوە بووە، هەمووی دوو بست لەولای بەسرەوەیە، هێشتا راپەرینی مایس نەگەیشتبووە ئاستی تەقینەوە کە ئینگلیزەکان دوو کەشتی جەنگییان هێنایە ناو رووباری **(شط العرب)**ەوە کە شاری بەسرەی کەوتۆتە سەر، وێرای هەموو ئەمانەش بەپێی راپۆرتە تایبەتییەکەی طریحی ئەو ئەفسەرانەی لەگەڵ رەشید جەودەت بوون تەواو ورەیان بەرز نەبووە، چەک و تفاقی لەشکرەکەشی بەرانبەر هێزو توانای ئینگلیز لە خانەی هیچاندا بووە[٤١]، نابێ ئەوەیش لەیاد بکەین کە هەمووی چەند

---

(٣٩) محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، ص٢١٢-٢١٧؛ عبد الرزاق الحسني، الأسرار الخفية في حركة السنة ١٩٤١ التحررية، ص١١٣-١١٤، ١١٦-١١٨.

(٤٠) دیدەنی لەگەڵ لیوای خانەنشین فوئاد عارف، رۆژی ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨.

(٤١) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الخامس، ص٢٣٥.

سالێک نەبوو رەشید جەودەت بە هەڵواسینی مەحمودی برا گەورەی کوژستی کەوتبوو، ئەو کارەی بە داخەوە نەتەوەپەرستی عەرەبی ئەوتۆ هەبوون بە دڵیان بوو.

لەگەڵ هەمـوو ئەوانەدا ئینجا رەشید جەودەت پیاوانە هاتە دەست، فەرمانی ئەوتۆی راگەیاند کە بوونە هۆی پووچ بوونەوەی پیلانەکانی وەسی و ناچاریان کرد لە بەسرەش هەڵبێ[٤٢]. تایبەت دوای ئەوەی رۆژی ٤ی نیسان رەشید جەودەت ئەفسەرەکانی ژێردەستی کۆکردنەوەو بریاریان دا بە هیچ جۆر بەرهەڵستی سویا نەکەن و بێ فەرمانی بەغدا رێگەی ئینگلیز نەدەن لەشکر بهێننە بەسرە، جگە لەوە رەشید جەودەت دەستی گرت بەسەر پۆستەخانەو چاپخانەکانی ناو شارداو رێگەی نەدا هیچ بەیاننامەیەکی وەسی بڵاوبکرێتەوە، یان کەس پێوەندی لەگەڵ بکات[٤٣].

یەکێک لە کارە گرنگەکانی تری رەشید جەودەت لەو رۆژانەدا گرتنی سالح جەبری متەسەرفی بەسرە بوو کە بە دڵ و بە گیان لەگەڵ ناحەزانی راپەرینی مایس بوو، رەشید جەودەت هەر ئەوەندە لە بەغداوە بروسکەی بۆ هات سالح جەبری پەل بەست کردو بە دەسبەسەری ناردییە بەغدا، ئەو بەو کارەی رێگەی بۆ سالح جەبر خۆش کرد پاش چەند سالێک بێتە سەرەک وەزیرانی عیراق و بۆ خۆشی پێی چویە بەندیخانەو دواییش لەسەری خانەنشین کرا، خۆ گەر مامۆستا ئەمین زەکی و چەند دەسترۆیشتوویەکی تر بە فریایدا نەکەوتنایە لەوەیش خواپتری پێ دەکرا، چونکە رەشید جەودەت تا دوا رۆژانی راپەرینی مایس دەستی هەڵنەگرت و دوای ئەوەش یەکسەر لەگەڵ هاوەڵەکانیدا گیراو درایە دادگەی سەربازی تایبەتی. مامۆستا عەبدولرەزاق حەسەنی دەڵێ: **«رەشید جەودەت نەبوایە لە یەکەم رۆژەوە دوژمن زەفەری بە راپەرینی مایس دەبردو لەناوی دەبرد»**[٤٤].

هەمان کات گەلی کورد بەشی خۆی هەیە بە رابەرانی راپەرینی مایسی سالی ١٩٤١وە. فەریق ئەمین زەکی سلێمان کە ئەوساکە جێگری رەئیسی ئەرکان بوو بە

---

(٤٢) وەصی کە دەستی لە بەصرە شت بە فڕۆکەیەکی بەریتانی تایبەتی، لەگەڵ ژمارەیەک لە لایەنگرەکانی، چۆتە قودس و لەوێشەوە چۆتە عەممانی پایتەختی ئوردون.

(٤٣) محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، ص٢١٤-٢١٦.

(٤٤) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا عەبدولرەزاق الحسني، رۆژی ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩.

ڕەگەز کوردە[٤٥].

دەوری ئەم ئەفسەرە لە ڕووداوە هەرە گرنگەکانی ڕاپەڕینی مایسدا زۆر گەورەو دیارە، بە ڕادەیەک دەتوانرێ بە یەکێک لە ڕابەرەکانی لە قەڵەم بدرێ، مەحمود سەلمان ڕۆژی ١٧ی مارتی ١٩٤٢ لەبەردەم دادگەدا ئەم ڕاستییەی وتووە کە ئێستە بە تۆمارکراوی لە قەزییەی ژمارە ٢٨٣ و ٤١/٢٨٤دا ماوە. دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکە گەورەترین ئەفسەری لەشکری عیراقی بوو کە لە ئێران گیراو ڕەوانەی ڕۆدیسیا لە باشووری ئەفەریقیا کراو دوایی پێنج ساڵ حوکم درا.

فەهمی سەعید کە یەکێک بوو لەو چوار ئەفسەرەی[٤٦] لەگەڵ ڕەشید عالی گەیلانی سەرکردەی ڕاپەڕینی مایس بوون و لە زووەوە نازناوی **«لولب الحرکە»**ی پێ دراو[٤٧]، لە دوو سەرەوە کوردە[٤٨]. خەدیجە خانی نەنکی فەهمی سەعید لە باوکەوە ، واتە دایکی سەعیدی کوڕی مەحمود، لە بنەماڵەی ڕەسوڵ پاشای ڕەواندوزییەو بە خزمایەتی دەگاتەوە باوێل ئاغا. خەدیجە خان کە سەرەتای سییەکان لە تەمەنی ١٠٨ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، کوردی لە عەرەبی باشتر زانیوە.

هەرچی ئایشەخانی دایکی فەهمییە، واتە هاوسەری سەعیدی کوڕی مەحمود، لە بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانییە، کە لە باپیرە گەورەیەوە بە خزمایەتی دەگاتەوە باپیرانی ماجید مستەفاو عوسمان فایق و فوئاد عارف، وەک فەیسەڵی کوڕەزای

---

(٤٥) **«مذكرات الشهيد العقيد الركن صلاح الدين الصباغ»**، ص١٨؛ محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، ص٢١٣.

(٤٦) سیانەکەی تریان صەلاح الدین صەباغ و مەحمود سەلمان و کامیل شەبیب بوون. لەگەڵ فەهمی سەعیدا هەر چواریان عەقید بوون، بۆیەکا پێیان دەوترێ **«چوار عەقیدەکە»** (العقداء الاربعة).

(٤٧) **«الثورة»**، ٢ ايار ١٩٨٨.

(٤٨) بەشی هەرە زۆری ئەو زانیارییە گرنگانەی دەربارەی فەهمی سەعید لەم باسەدا هاتوون لە فەیسەلی کوڕی وەرگیراون، کە پیاوێکی ڕووناکبیرو دووربین و خوێندەوارێکی کەم هاوتایە، لەبیروبۆچووندا ناصرییە. ساڵەهای ساڵ لەگەڵ خوالێخۆشبوو یەعرووبی برا گەورەیدا کەوتوونە کۆکردنەوەی دەگمەنترین زانیاری دەربارەی باوکی. ئەفسەری خانەنشین ڕەشید فلیح کە نزیکترین هاوڕێی گیانی بە گیانی باوکیان بووەو تا ئێستە گەورەترین سوێندی ژیانی گۆڕی فەهمی سەعیدە، بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو کارە گەلێک یاریدەی داون (**دیدەنی لەگەڵ فەیسەڵ فەهمی سەعید، ڕۆژی ٢٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨**).

باسی دەکات ئایشەخان تا مردیش بە تەواوی فێری عەرەبی نەبوو، هەمیشە لە ماڵەوە بە مەمەند ناوی فەهمی کوڕی بردووە **(فەهمی سەعید سەرەتا بە محەمەد فەهمی ناسراوە)**.

سەعیدی باوکی فەهمی ئەفسەری لەشکری عوسمانی و پیاوێکی لەسەرخۆ و دەروێشێکی خواپەرست و سەر بە تەکیەی نەقشەبەندی بووە، ئەوانەی لە خوو رەوشت و هەستی فەهمی دا بەرانبەر بە کورد رەنگی خۆیان داوەتەوە. کە سەعید کۆچی دوایی کرد، ئایشە خانی خێزانی لەگەڵ هەرسێک کوڕەکەیدا (مەحمودو ئەحمەدو فەهمی) گەڕایەوە سلێمانی و لەوێ لەگەڵ خاڵیان پێکەوە دەژین، رەشید فلەیحی هاوەڵ و هاوگیانی فەهمی سەعید دەڵێ: **«فەهمی خاڵی بەقەدەر باوکی خۆش دەویست»**.

فەهمی سەعید خوێندنی سەرەتایی و فێرگەی روشدییەی سەربازی لە سلێمانی تەواو کردو دوای ئەوەی فێرگەی ناوەندیی سەربازی لە بەغدا تەواو دەکات سەرەتای ساڵی ١٩١٦ لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا **(ساڵی ١٨٩٨ لە دایک بوو)** دەچێتە ئەستەمبوڵ بۆ خوێندنی بەرزو بەر لەوەی شەڕی یەکەمی جیهان تەواو بێ دەبێتە ئەفسەری لەشکری عوسمانی.

فەهمی سەعید وەک هەر کوردێک فێری زمانی کوردی دەبێ و وا دیارە شاری سلێمانی هێند بە دڵ دەبێ کە دەیلکێنێ بە ناوی خۆیەوە، تەنانەت هەموو بەڵگەنامەکانی ئەو ساڵانەی بە ناوی **(محەمەد فەهمی سەعید سلێمانیە)**وە تۆمار کراون، تۆماری ژمارە ٣٣٢ لەسەر ٤٢٨ی وەزارەتی بەرگری تورکیا لە ئەنقەرە بریتییە لە کارنامەی ئەوو بە تورکی لەسەری نووسراوە **«کنیسی: سعید اوغلو محمد سلیمانیە»**.

فەهمی سەعید ژمارەیەکی زۆر هاوەڵ و هاوڕێی کوردی هەبوو، ئەمین رەواندوزی برای شیرییەتی و لە ژیاندا وەک برای راستەقینە وابوون. پێوەندی لەگەڵ ماجید مستەفادا کەم وێنە بووە، فەیسەڵ فەهمی سەعید لەم بارەیەوە دەڵێ:

**«باوکم لە قوڵایی دڵەوە خواڵێخۆشبوو ماجید مستەفای خۆش دەویست و هەمیشە گرێی دڵی خۆی لای ئەو دەکردەوە، بۆیەکا شتی وردی ئەوتۆ هەبوو لە**



T. C.

دۆسییەی فەهمی سەعید لە وەزارەتی بەرگریی تورکیا لە ئەنقەرە کە لە سەری نووسراوە سەعید ئۆغلو محەممەد سلێمانی یە

ژیانی باوکمدا لە ماجید مستەفا بەولاوە کەسێکی تر نەیدەزانی، ئێمە لە ماڵەوە هەر بە مامە ماجید ناومان دەبرد»(٤٩).

وەک دواییش دەیبینین فەهمی سەعید لەگەڵ شێخ مەحمودیشدا لە نزیکەوە پێوەندی هەبوو. لە کاتی راپەڕینی مایسدا فەهمی سەعید یەکێک بوو لەوانەی دەنگی خۆیان گەیاندە رەشید جەودەت لە بەسرە . رەشید جەودەت لە وەڵامیدا وتبووی: «وا دیارە محەممەد فەهمی من باش ناناسێ، تۆ بڵێی من دووی خوێرییەکی وەک... وەسی بکەوم، یا تۆ بڵێی ئیبراهیم راوی(٥٠) لە من باش و پیاوتر بێ»(٥١).

---

(٤٩) دیدەنی لەگەڵ فەیسەڵ فەهمی سەعید، رۆژی ٢٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨.

(٥٠) (إبراهیم الراوي) کە سەرلەشکر بوو لە دیوانییە یەکێک بوو لەو ئەفسەرانەی رۆژانی راپەڕینی مایس و بەر لەو پیاوانە هاتنە دەست.

(٥١) دیدەنی لەگەڵ فەیسەڵ فەهمی سەعید، رۆژی ٢٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨.

***

لەبەر چەند هۆیەکی ئاشکرا رۆژانی ڕاپەڕینی مایس دەوری کورد لە خەباتی جەماوەردا زیاتر خۆی نواند وەک لە ناو لەشکردا. کوردستان، وەک گشت ناوچەکانی تری عیراق، بە جارێک خرۆشا، رۆژنامەکانی پایتەخت بە بروسکەی پشتگیریی دانیشتوانی کودستان تەنراون، لە ناسراوانی کوردستان عەلی دۆغرەمەچی و هەموو دۆغرەمەچییە بەناوبانگەکانی هەولێر، فایق تاڵەبانی و عارف تاڵەبانی و فایق تۆفیق و کوڕانی نوری باوێل ئاغا سەباح و سمکۆو گەلێکی تر بروسکەی بەسۆزیان داوە بە رەشید عالی گەیلانی لە بەغدا[٥٢]. هەر ئەو ڕۆژانە بە دەیان سەرەک هۆزی ناسراوی کوردستان بروسکەی پشتگیرییان ناردۆتە بەغدا، هەباسی مەمند ئاغاو حەسەن فەهمی جاف و حەوێز ئاغاو سوار ئاغاو ئاغایانی رایات و حەریرو شیروان و شوان و مێرگەسوورو رانییەو ناودەشت و برادۆست و زێبار بروسکەی تایبەتییان داوەتە رەشید عالی[٥٣]. تەنها رۆژی ١٢ی نیسانی ١٩٤١ رۆژنامەی **«العالم العربي»** سێ بروسکەی سەرەک هۆزانی رانییەی بڵاوکردۆتەوە.

لاوانی کوردی بەغداو شارو شارۆچکەکانی کوردستان بە گەرمی پشتگیریی راپەڕینی مایسیان کرد، ئاگاداران دەڵێن لەو رۆژانەدا بە دەگمەن رووناکبیرێکی کوردی ئەوتۆ هەڵدەکەوت هەستی لەگەڵ ئەو راپەڕینەدا نەبێ[٥٤]. ئەوانیش گەلێک بروسکەی پشتگیرییان ناردووە. حەمەڕەش و کاکە زیادو حەوێز ئاغای غەفوری و عەبدولسەمەد محەمەد (مەنجەڵ)و رەشید عارف و عەونی حەبیب و فەتحوڵلا محەمەد و عەبدولحەمید تۆفیق و عەبدولڕەحمان ئەسعەدو عەبدولمەجید ئەمین و

---

(٥٢) بە وێنە بڕوانە:
**«الاستقلال»**، ٦ نيسان ١٩٤١؛ **«العالم العربي»**، ٦و ١٠و ١٢ نيسان ١٩٤١؛ **«الزمان»**، ٢٤ ايار ١٩٤١.

(٥٣) بە وێنە بڕوانە:
**«العالم العربي»**، ١٢ نيسان و ١٨ ايار ١٩٤١؛ **«الزمان»**، ٢٣ ايار١٩٤١؛ **«الاستقلال»**، ٥ و ١٦ و ٢٢ مايس ١٩٤١.

(٥٤) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا مەسعود محەمەد، رۆژی ٤ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩؛ دیدەنی لەگەڵ مامۆستا قادر قەزاز، رۆژی ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨.

لاوانی کوردی **(باب الشیخ)** لە بەغداو گەلێکی تر لەو کوردانەن کە نیسان و مایسی ساڵی ١٩٤١ بروسکەیان ناردووە بۆ ڕەشید عالی[٥٥].

قوتابییە کوردەکانی کۆلێجەکانی بەغداش لەو ڕۆژانەدا دریغییان نەکرد، لە خۆنیشاندانەکانی پایتەختدا بەشدارییان کردووە، پارەیان کۆکردۆتەوەو خۆیان ناونووس کردووە بۆ هەڵگرتنی چەک، بەهادین قطب و ئەنوەر جاف و ئەمین عەبدولکەریم و هاشم عومەر بەرزنجی و فایق تۆفیق و مەزهەر قەرەداغی لەوانەن کە بروسکەی پشتگیرییان بۆ فەرماندەی ڕاپەڕینی مایس ناردووە[٥٦].

ڕۆژنامەی **«العالم العربی»** بروسکەیەکی سەربەخۆی **«قوتابییانی کوردی فێرگە بەرزەکان»**ی بەغدای بڵاو کردۆتەوە کە بە ڕیز مەعروف عەبدوڵڵا و بایز دزەیی و هادی ڕەشید چاوشلی و معتەسەم دەباغ و بورهان جاف و فەیسەڵ ئەحمەد عوسمان و نامیق نادرو ئیبراهیم دزەیی و فەتاح مەحمودو جەمال شەریف[٥٧]و نوری کاکە حەمە (نوری غەریبی) و جەلیل ئەسکەندەر عەلەکە ئیمزایان کردووە، ئەم زاتانە دوایی هەر یەکەیان بە جۆرێک ناوو شۆرەتی پەیدا کرد.

بەپێی ئەو سەرچاوە جیاوازانەی من دیومن ڕەشید عالی گەیلانی لەو سەدان بروسکانەی پێی گەیشتوون وەڵامی خاوەنی تەنها سێ بروسکەیانی داوەتەوە کە دوانیان کوردن، یەکێک لەو سیانە حەسەن فەهمی جافە کە بە ڕاستی نەوەی بە وەفاو جێگری ئەحمەد موختار جاف و مەحمود پاشا بوو، لەو بروسکەیەیدا کە حەسەن فەهمی جاف ناوەندی مایسی ١٩٤١ ناردوویە بۆ ڕەشید عالی گەیلانی نووسیویە دەڵێ:

**«سەرداری پایە بڵندی بەڕێز: ڕێزو قەدر زانینم پێشکەش بە جەنابی شکۆدارتان دەکەم، لە قوڵایی دڵەوە داواکاری سەرکەوتنتانم، خۆم و ماڵ و هۆزم دەخەمە ژێر دەستی جەنابتان و نیشتمانی پیرۆزەوە، لە یەزدانی گەورە دەپاڕێمەوە سەرتان**

(٥٥) **«الزمان»**، ٧و ٢٤ ایار ١٩٤١؛ **«العالم العربی»**، ١٦ نیسان و ٧ ایار ١٩٤١.

(٥٦) **«العالم العربی»**، ١و٢ ایار ١٩٤١.

(٥٧) بە هەڵە لە بریتی جەمال جەلال چاپ کراوە. ئەوساکە جەمالی میرزا فەتاحی حاجی شەریف لە حقوق دەیخوێند. چەند ساڵێک لەمەوبەر، دوای ئەوەی گەیشتە پلەی کارگێڕی گشتی«مدیر عام»، خانەنشین کرا.

**بخات و ئاگای لە ولاتتان بێ، حەسەن فەهمیی نەوەی مەحمود پاشا».**

ئەمەش دەقی وەلامی رەشید عالییە:

**«جەنابی حەسەن فەهمیی نەوەی مەحمود پاشای بەرێز: نامەکەتان کۆمەڵێک حەماسی دامێ. لە دڵسۆزی و نیشتمانپەروەریتان دڵنیام، تکام وایە سوپاس و رێزم قەبوڵ بفەرموون، سلاوم بگەیێننە برا نیشتمانپەروەرەکانتان، هەر بژین، رەشید عالی»**[٥٨].

دوای ئەوەی فرۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز کەوتنە بۆمبارانی بەغدا، سەرکردایەتی راپەرینی مایس بە نیازی وروژاندنی هەستی موسڵمانان دەنگ وباوێکی وای خستەوە کە گوایە ئەو فرۆکانە بە ئەنقەست هێرشیان بردۆتە سەر مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە باب الشیخ[٥٩]. ئەم دەنگوباوە ئاگرێکی تر بوو نرا بە پووش و پەلاشی رقی پەنگخواردووی ساکارانەوە، بە رادەیەک ئینگلیزەکان ناچاربوون بایەخی تایبەتی بدەنێ و وەک لە بەڵگەنامە نهێنییەکانەوە دەردەکەوێ بە پەرۆش بوون بۆ بەدرۆخستنەوەی. یەکێک لەو بروسکانەی **«سەرکردایەتی رۆژهەڵاتی ناوەراست»**ی لەشکری بەریتانی ناردوویە بۆ جەنەراڵی فرۆکەوان لە حەبانییە دەڵێ:

**«پروپاگەندەی دوژمن ئیدیعا دەکات کە گوایە ئێمە مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانیمان بۆمباباران کردووە، کە وا بزانین نزیک بەغدایە، ئایا ئێوە دەزانن کەوتۆتە کوێوەو دەتوانن ئەو هەواڵە بە توندی بە درۆبخەنەوە»**[٦٠].

وەک ئاشکرایە شێخ عەبدولقادر مەقامی تایبەتی لە ناو کوردا هەیە، بۆیەکا ئەو هەواڵە هێندەی تر بزواندنی، یەکێک لەو بروسکانەی لە کوردستانەوە بۆ رەشید عالی گەیلانی بەم بۆنەیەوە نێردراون هی شێخ عەبدولقادری قەرەداغییە کە بە ناوی تەکیی قادرییەوە ناردوویەو دەڵێ:

---

(٥٨) «الاستقلال»، ٢٣ مایس ١٩٤١.

(٥٩) دەربارەی هێرشی فرۆکەی ئینگلیز بۆ سەر مەرقەدی شێخ عەبدولقادر بەتایبەتی لە مامۆستایان مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و صدیق شەنشەلم پرسی، هەردووکیان دەڵێن شتی وا نەبووە. دووەمیان کارگێری گشتیی پرۆپاگەندەی حوکمەتەکەی رەشید عالی بوو.

(60) Public Record Office, AIR, 23/7912, XM-1847.

**«سەرداری تێکۆشەری پایەبڵند جەنابی گەیلانی. بیستمان فڕۆکەکانی دوژمنی خایەن زاتیان کرد حەزرەتی گەیلانی پیرۆز بۆمباباران بکەن، ئێمەی دەرویشانی تەریقەی قادری و ئەم زاتە موبارەکە دەبێ لە پێناوی پێشلکردنی دوژمنی بێ ئابڕوودا بمرین، لەبەر ئەوە ئێمە کە ژمارەمان هەزاران تێکۆشەرە بە ماڵ و بە گیان ئامادەین لەم ڕێگەدا گیان فیدا بین، چاوەڕوانی فەرمانتانین بۆ جێ بەجێ کردنی واجبی پیرۆز».**

ڕەشید عالی وەڵامی ئەم بروسکەیەشی داوەتەوە: **«جەنابی شێخی جەلیل سەی عەبدولقادری ڕابەری تەریقەی قادری لە قەرەداغ-سلێمانی»**[٦١]. بروسکەی سێیەمی گەیلانی بۆ شێخ محەمەد کاشف غطای ڕابەری شیعەی بەناوبانگە[٦٢].

لە گەرمەی ڕاپەڕینی مایسی ١٩٤١دا گەلێک وەفدی تایبەتی لە کوردستانەوە هاتنە بەغداو ڕەشید عالی بۆ خۆی بە گەرمی پێشوازیی کردن، وەفدی هەولێرو کەرکوک پێکرا هاتن. بەشدارانی ئەو وەفدە ئەمانە بوون: محەمەد زیاد ئاغاو عەلی ئاغای حاجی ئەحمەد ئاغاو حەوێز ئاغای حەسەن ئاغاو سوار ئاغای محەمەد ئاغاو ڕەشید خادم ئەلسوجادەو عەبدوڵڵا ئاوچی و عومەر ئاغاو بەهادین ساری و فایق تاڵەبانی کە ئەو سەردەمە نوێنەری کەرکووک بوو لە پەرلەماندا. شایانی باسە ڕەشید عالی بە کوردی قسەی لەگەڵ کردوون[٦٣]. محەمەد زیاد ئاغا وەڵامی وتاری پێشوازیی ڕەشید عالی داوەتەوە[٦٤]. دوای ئەوان وەفدی کەربەلاو نەجەف و کوفە هاتنە بەغدا.

نوێنەرانی دهۆک و ژەنگارو ئاکرێ و ئامێدی و زاخۆ لەگەڵ وەفدی موسڵدا هاتن، حازمی شەمدین ئاغاو شێخ مەزهەری شێخ تەهاو شێخ محەمەد ڕەقیب و

---

(٦١) **«الزمان»**، ٢١ ايار ١٩٤١.

(٦٢) دەربارەی بڕوانە:

**«الندوة»** (جريدة)، كربلاء، ٢٨ ايار ١٩٤١.

(٦٣) مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی دەڵێ ڕەشید عالی کوردیی دەزانی **(دیدەنی لەگەڵ مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی، ڕۆژی ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩)**.

(٦٤) **«الاستقلال»**، ١٦نيسان ١٩٤١؛ **«العالم العربي»**، ١٦ نيسان ١٩٤١.

شێخ نوری بریفکانی و سەعید ئاغای دۆسکی لە بەشدارانی ئەو وەفدە بوون(٦٥).
لە ٩ کەسی ناو ئەو وێنە گەورەیەی ئەندامانی وەفدی موسڵ کە ڕۆژنامەی **«العالم العربي»** لە لاپەڕەی یەکەمی ژمارەی ڕۆژی ٢٥ی نیسانی دا بڵاوی کردۆتەوە شەشیان بە جل وبەرگی کوردییەوەن، دوا بەدوای ئەوان وەفدی شێخان و زێبار گەیشتنە بەغداو وەک ئەوانی تر چوونە لای ڕەشید عالی(٦٦).
خۆنیشاندانەکانی ناوچە کوردەوارییەکان دژی ئینگلیز لەو ڕۆژانەدا دەنگی زۆریان دایەوە، ڕۆژی سێی مایس کۆبوونەوەی لیژنەیەکی بەرگری لە سلێمانی هەستی دانیشتوانی شاری بزواندووەو دوو ڕۆژ لەسەر یەک ڕژاونەتە بەر دەرکی سەراو سەر شەقامەکان و بە سروودو بە دروشم و بە بروسکە هەستی خۆیان دەربڕیوە(٦٧). پەیامنێری ڕۆژنامەی **«الزمان»** بەم جۆرە باسی خۆنیشاندانێکی تری دانیشتوانی سلێمانی کردووە:
**«گەر عیراق ئیمڕۆکە شانازی بە نیشتمانپەروەری و موسڵمانەتی راستەقینەی خۆیەوە بکات دەبێ شانازیی بە ڕۆڵە دلێرو دڵسۆزەکانی سلێمانی و پاڵەوان و ئافرەت و پیرو لاوی ئەو شارەوە بکات... دانیشتوانی سلێمانی بە پیرو لاوو ئافرەت و منداڵەوە بە دەنگی پێغەمبەری گەورەوە چوون و هاواری «خواوەندی گەورە» لە سەرتاپای سلێمانی و شەقام و کۆڵان و دۆڵ و کوخێکدا بەرز دەبێتەوەو زایەڵەی دەگاتە هەموو ئەشکەوت و شاخ و داخ و دەشت و دەرو دارستان و لێڕەکانی...»**(٦٨).
ڕۆژی شەممەی ٣ی مایس دانیشتوانی کەرکووک خۆنیشاندانێکی گەورەیان کرد، بە ناو شاردا گەڕان و چوونە بەر دەرکی سەراو لەوێ گوتەبێژان گەلێک وتاری پشتگیرییان خوێندەوە. ڕۆژنامەکانی پایتەخت بەناوی **«خۆنیشاندانی نیشتمانیی گەورەی کەرکووک»**ەوە لەسەریان نووسی(٦٩).

---

(٦٥) **«العالم العربي»**، ١٧و٢٥ نیسان ١٩٤١.
(٦٦) **«الاستقلال»**، ١٧ نیسان ١٩٤١.
(٦٧) **«الزمان»**، ٦ ایار ١٩٤١.
(٦٨) **«الزمان»**، ١٣ ایار ١٩٤١.
(٦٩) **«العالم العربي»**، ١٠ ایار ١٩٤١؛ **«الزمان»**، ٧ ایار ١٩٤١.

دوای دوو رۆژ دانیشتوانی شەقلاوە بۆ پشتگیریی راپەڕینی مایس رژانە سەر شەقامی شار، مامۆستای فێرگەی سەرەتایی شەقلاوە خەلیل محەمەد خۆشناو وتاری لەو خۆنیشاندانەدا خوێندۆتەوەو تێیدا بە گەرمی **«داوای یەک بوون و خەباتی»** کردووە. **(ئەبو فاروقی)** پەیامنێری رۆژنامەی **«الزمان»** ریپۆرتاژێکی لەسەر خۆنیشاندانی شەقلاوە نووسیوەو باسی بەشداریی مامۆستایان و شاگردان و کاسبکاران و ئافرەتانی تێدا کردووەو چەند بەیتێکی سروودێکی خۆنیشاندەرانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی کە هەمووی باسی خەبات و سەربەخۆیی نیشتمان و سەرزەنشتی ئینگلیزە[٧٠].

خۆنیشاندانی هەولێر لە خۆنیشاندانەکانی تر توندوتیژتر بوو، تایبەت لەبەر ئەوەش کە دوو جار بۆمبابارانی شار لە لایەن فڕۆکەکانی ئینگلیزەوە[٧١] تەواو رقی هەولێرییانی هەڵساندبوو. کار گەیشت بەوەی خۆنیشاندەران ئوتومبیلی موتەسەریف بسووتێنن[٧٢]. **ئەم کارە لە راستیدا بریتی بوو لە دەربڕینی کوڕانەی هەستی وورژاوی دانیشتوانی شار دژی ئینگلیز، ئەگینا سالح زکی ساحێبقڕانی رووناکبیرو قاڵبووی رێگەی کوردایەتی، کە ئەوساکە موتەسەریفی هەولێر بوو، ئەو پیاوە نەبوو ئوتومبیلی بسوتێنرێ**[٧٣]. بەپێی بەڵگە نهێنییەکانی ئینگلیز هەولێر تەنانەت دوای گرتنەوەی بەغداش بە ماوەیەک ئینجا هێمن بۆوە[٧٤].

لە هەولێرو شوێنی تر هەموو جار خەڵکی بە تفەنگ و تاپڕ دەکەوتنە دەسڕێژ لە فڕۆکە هێرشهێنەرەکانی ئینگلیز. لە هەموو شوێنێکیش هەر بەیاننامەیەک ئەو

---

(٧٠) **«الزمان»**، ١٤ ايار ١٩٤١.

(٧١) عبدالرزاق الحسني، الأسرار الخفية في حركة السنة ١٩٤١ التحررية، ص٢١٤.

(72) M.A.Kamal, Natsionalno- Osvboditelnoe dvijenie v Iraqskom Kurdistane v1918-1958 gg., Vol. 2, Moscow, 1969, p. 391.

(٧٣) دوایی لەبەردەم دادگەی سەربازی تایبەتی کەرکووک صالح زەکی بەگی صاحێبقبڕان وازی لەو کەسانە هێنا کە بە تاوانی سووتاندنی ئوتومبیلەکەی گوناهبار کرابوون.

(*) (لە چەند کەسێکم بیستووە کچێکی کوڕانی کەم عەقڵ بەناوی **«ئەڵماس حەمەسەعید»** کە لەناو خەڵکیدا بە **«ئەڵماسە»** ناسراو بووە چووە نەوتی هێناوەو خەڵکی توندڕۆ ئوتومبێلەکەیان سووتاندووە- **عەبدوللا زەنگەنە**).

(74) PRO, AIR 23/5933, XM-7055.

فرۆكانه فرێیان دەدا خەڵک دەیاندڕاندن[75].

كه (**تطوع**) دەستی پێکرد دانیشتوانی كوردستانیش به لێشاو خۆیان ناونووس كردو به دەیان بروسکەیان بۆ ئەم مەبەستە دایه بەغدا. بەرله هەموان قوتابییه كوردەكانی پایتەخت(**تطوع**)یان کرد[76]. بەپێی گێڕانەوەی هادی رەشید چاوشلی، كه ئەو كاته قوتابی كۆلیجی حقوق بوو، ئەو قوتابییانه له گۆڕەپانێکی نزیک (باب المعظم) چەند رۆژێک مەشقیان كردووه[77].

نەوەی شێخ حسامەدینی نەقشەبەندی به ناوی دانیشتوانی هەورامان و خورماڵەوه به بروسکه ئامادەیی خۆیان **«بۆ غەزا»** نیشاندا **«نەبا ترسنۆكانه بمرن»**[78]. شوانییانی كەركوک و میراودەلی یان و پشدەری یانی قەڵادزەو خۆشناوانی شەقڵاوەو كوڕگەلی هۆزانی تر له بنكه سەربازی و دەزگاكانی میری خۆیان ناونووس دەكرد[79]. بەپێی قسەی رۆژنامەكانی بەغدا له ماوەیەكی كەمدا تەنها له سلێمانی دوو هەزار كەس خۆیان ناونووس كرد، ٨٠ كەسیان چەكداری پشدەری بوون[80].

**«شێخ عەلائەددینی عوسمانی»** دەروێشانی نەقشەبەندی و قادری هان داوه **«چەک بۆ شەڕی دوژمنانی خوا»** هەڵگرن و داوای له كاربەدەستان كردووه چەكی پێویست بۆ موردیدەكانی بنێرن كه **«زۆربەی هەره زۆریان»**، وەک نووسیوییه، **«جووتیاری هەژاری بێ چەكن»**[81].

ئەو بەڵگانەی بەدەستەوەن وای نیشان دەدەن دانیشتوانی ناوچه كوردەواییەكان بەپەرۆشەوه (تطوع)یان دەكرد، بەپێی راگەیاندنی رۆژنامەی **«الاستقلال»**

---

(٧٥) دیدەنی لەگەڵ دوكتۆر ئیبراهیم حیلمی، رۆژی ٣١ی كانوونی دووەمی ١٩٨٩.

(٧٦) **«العالم العربي»**، ٢ ايار ١٩٤١.

(٧٧) طارق إبراهيم شريف، شخصيات تتذكر، الجزء الاول، اربيل، ١٩٨٨، ص٩٠.

(٧٨) **«العالم العربي»**، ١١ ايار ١٩٤١.

(٧٩) **«الاستقلال»**، ٥و٦ مايس ١٩٤١؛ **«الزمان»**، ٦و١٤ ايار ١٩٤١؛ **«العالم العربي»**، ١١ ايار ١٩٤١.

(٨٠) **«الزمان»**، ١٣ ايار ١٩٤١. لەو هەواڵەدا تەنها ناوی پشدەرییەكان هاتووه.

(٨١) **«الاستقلال»**، ٢٢ مايس ١٩٤١.



شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی « ١٩٥٤» کۆچی دوایی کردووە

دانیشتوانی ناوچەی دهۆک هەموو وروژان و هەر رۆژەی بە سەدانیان لە سەربازگەی شار ناوی خۆیان تۆمار دەکرد[٨٢]. رۆژنامەکانی موسڵ بە تایبەتی باسی ئەوەیان کردووە چۆن ئەندامانی هۆزە کوردەکان بە چەک و تفاقی خۆیانەوە دەچنە سەر پۆلیسخانەکان و داوا دەکەن دەستوبرد بیاننێرنە شەڕگەکان[٨٣].

لە مەسەلەی (تطوع)یشدا کوردەکە لە دڵسۆزییەوە شتی سەیرو بێ وێنەی کردووە، بەپێی ئەو سەرچاوانەی من دیومن لە سەرانسەری عیراقدا تەنها کیژگەلی شاری سلێمانی (تطوع)یان کردووەو ژمارەیەکیان بەرگی خاکییان پۆشیوەو چەکیان لەشان کردووەو بەپێی وتنی رۆژنامەکانی بەغدا **«لە بارەگای لەشکر کاری گرانیان پێ سپێردراوە»**[٨٤]. **«مەحمود الدرە»**ش، کە بۆ خۆی لە بەشدارانی راپەڕینی مایسە، ئەم راستییەی وەک بەڵگەی پشتگیری کۆمەڵانی خەڵک تۆمار کردووە[٨٥]. بە هەمان دەستوور کرێکارانی سلێمانی چوونەتە سەر بارەگای لەشکرو

---

(٨٢) **«الزمان»**، ٦ ایار ١٩٤١؛ **«الاستقلال»**، ١٦ مایس ١٩٤١.

(٨٣) **«الزمان»**، ١٣ ایار ١٩٤١.

(٨٤) ئەم پەراوێزە خۆی ناوی سەرچاوەکەی دیارنەکراوە لەوانەیە **«الزمان»** بێ، عەبدوڵلا زەنگەنە.

(٨٥) محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، ص٤١٤.

به زۆر وەک سەرباز خۆیان داسەپاندووەو لەوێ ماونەوە[٨٦].

لە شەقلاوە حاجی سەلیم و حاجی ئەحمەدی لالۆ بڕیاریان داوە بە پارەی خۆیان ئوتومبێل بە کرێ بگرن بۆ گواستنەوەی ئەوانەی (تطوع)یان کردووەو بە بروسکە ئەو هەواڵەیان بە رەشید عالی گەیلانی راگەیاندووە[٨٧].

ئێزیدییانی ژەنگارو شێخان لە رۆژگاری عوسمانییانەوە بەرگی سەربازییان لەبەر نەدەکردو جارەهای جار لەسەر ئەو کارەیان لە میری یاخی دەبوون و دەیاندایە شاخ و جاروباریش ناچار دەبوون هەڵبێنە خاکی گورجستان و ئەرمەنستانی ناو رووسیاوە، کەچی هەر ئەوەندە شەڕ هەڵگیرساو فرۆکەکانی ئینگلیز کەوتنە بۆمباباران نەوەی ئەو کوردە ئێزیدییانە پیاوانە هاتنە دەست و بڕیاریان دا ببنە سەرباز. سەعید بەگی میری شێخان بڕیاری بێ بەری کردنی هەر ئێزیدییەکی لە **«سەرانسەری جیهان»**دا دەرکرد گەر بێت و **«بە دەنگ داوای حوکمەتی نیشتمانییەوە نەچێ بۆ سەربازی و بەگژاچوونی ئینگلیزە خۆفرۆشەکان»**[٨٨]. لە ماوەیەکی کەمدا ٥٠٠ لاوی ئێزیدی بەدەنگ ئەم بانگەوازەوە هاتن و خۆیان لە دەزگاکانی میری ناونووس کرد[٨٩].

لە زۆر ناوچە خەڵکی شان بەشانی (تطوع)پیتاکیشیان بۆ هێزەکانی لەشکر دەکرد، لەم بارەیەوە وەک نموونە تەنها بروسکەیەکی بەسۆزی دانیشتوانی کۆیە بۆ گەیلانی دێنمەوە:

**«لەسەر جێ بەجێ کردنی ئەرکی پیرۆزی سەرشانمان بەردەوامین بۆ پتەوکردنی پێوەندی و بەهێزکردنی قەوارەی نیشتمان و بەرزکردنەوەی ئاڵای یەکیەتی بە رابەریی بەرێزتان.**

**بێ وچان پارە بۆ پشتگیری لەشکری دلێرمان کۆ دەکەینەوە بۆ هەمان مەبەست، سبەینێ دەچینە هەولێر، چاوەڕوانی فەرمانتانین بۆ جێ بەجێ کردنی هەموو**

(٨٦) **«الزمان»**، ١٣ ايار ١٩٤١.

(٨٧) **«الزمان»**، ١٤ ايار ١٩٤١.

(٨٨) **«العالم العربي»**، ١٠ ايار ١٩٤١.

(٨٩) **«الاستقلال»**، ١١ و ١٢ و ٢٩ مايس ١٩٤١.



**سالح جەبر کە رەشید جەودەت گرتی و بەدەست بەسەری ناردییە بەغداو بەو کارەی ڕێگەی بۆ خۆش کرد ببێتە سەرۆک وەزیران**

**داوایەکتان تا بە سەرکەوتوویی بواری ئەم خەباتە پیرۆزە ببڕنە[٩٠].**

لە ڕۆژگاری شۆڕشی بیستەوە فەتوای پیاوە ئایینییەکان بووە هاندەرێکی کاریگەری کۆمەڵانی خەڵک بۆ خەبات کردن دژی ئینگلیز، لەبەر ئەوە هیچ سەیر نییە لەکاتی ڕاپەڕینی مایسدا زانایەکی ئایینی ناسراو ئەما بێ فشارو هاندان فەتوای دوورو درێژ دەرنەکات[٩١]. کەچی دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکە دەگمەن خۆفرۆشێک هەڵدەکەوت بچێ بەدەنگ وەسیەوەو فەتوایەکی پێچەوانەی ئەوانەی پێشوو دەربکات[٩٢].

ئەو فەتوایانەی نیسان ومایسی ١٩٤١ پیاوە ئایینییەکان دژی ئینگلیز دەریان کرد کاری زۆریان کردە سەر کۆمەڵانی خەڵکی عیراق. لەم بوارەشدا شێخ و مەلایانی کوردستان درێغییان نەکرد، ڕۆژنامەکانی بەغدا ژمارەیەکی زۆر فەتوای

---

(٩٠) «الزمان»، ٢٤ ايار ١٩٤١.

(٩١) بۆ نموونە بڕوانە:

«النلوة»، ٧ و ١٠ و ١٣ و ٢٨ ايار ١٩٤١.

(٩٢) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء السادس، الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨، ص٢٩.

ئەوانی لە شوێنی دیاری لاپەڕەکانیاندا بڵاوکردۆتەوە، وا دیارە فەتوای شێخانی ڕێبازی نەقشەبەندی دەنگی زۆریان داوەتەوە، وەک فەتوای شێخ بەهادینی نەقشەبەندی لە بامەڕنی و شێخ حسامەدینی نەقشەبەندی لە بیارەو شێخ زەینەدین و مەلا ئەحمەدی نەقشەبەندی لە سلێمانی و عەبدولحەق حامیدی نەقشەبەندی لە بەغدا[٩٣]. جاری وا هەیە ئەو فەتوایانە لە دیارترین شوێنی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراوەتەوە[٩٤].

هەمان کات مەلایانی هەولێرو کەرکوک و سلێمانی یەک لە دوای یەک فەتوایان بۆ هاندانی خەڵکی دەردەکرد[٩٥]، مامۆستا عەلائەدین سەجادیش فەتوایەکی دوورودرێژی دەرکرد کە ڕۆژنامەی **«الزمان»** لە شوێنێکی دیاری لاپەڕەی یەکەمی داو ڕۆژنامەکانی تر لە شوێنی دیاری لاپەڕەکانی تریاندا لە ژێر ناونیشانێکی گەورەدا چاپیان کردووە. لە فەتواکەیدا سەجادی داوای یەکبوون و بەرگریی ئازایانەو خۆڕاگری وپیتاکی کردووەو گەلێک ئایەتی هێناوەتەوە[٩٦]. لە ڕووناکبیرانی کورد جگە لەو مامۆستا عەبدولمەجید لوتفیش نووسینی بە سۆزی بەبۆنەی بەرپابوونی ڕاپەڕینی مایسەوە بڵاوکردۆتەوە[٩٧]. بەڵام تێ ناگەم چۆن گۆڤاری **«گەلاوێژ»** هیچی لەسەر ئەو باسە نەنووسیوە، دوور نییە لەبەر کورتیی تەمەنی ڕاپەڕینی مایس فریا نەکەوتبێ هیچ دەربارەی بڵاوبکاتەوە، تایبەت **«گەلاوێژ»** بۆ خۆیشی ئەو ڕۆژانە بە دوو مانگان جارێک ژمارەیەکی لێ دەردەچوو، مامۆستا قادر قەزازیش، کە یەکێک بوو لە سەرپەرشتیکەرانی **«گەلاوێژ»**، وای بۆ دەچێ.

بێگومان سەرکردایەتی ڕاپەڕینی مایس ئەم وروژانە گشتییەی دانیشتوانی

---

(٩٣) محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، ص٤١٤؛ **«العالم العربي»**، ٧و٩و١١ ايار ١٩٤١، **«الاستقلال»**، ٧و٢٢ مايس ١٩٤١؛ **«الزمان»**، ٧و١٢ ايار ١٩٤١.

(٩٤) بە وێنە بڕوانە: **«الزمان»**، ١٢ ايار ١٩٤١.

(٩٥) **«الاستقلال»**، ٨ مايس ١٩٤١؛ **«الزمان»**، ١١و ٢١ ايار ١٩٤١؛ **«العالم العربي»**، ١٠ نيسان، ٩ و ١١ ايار ١٩٤١.

(٩٦) **«العالم العربي»**، ١١ ايار ١٩٤١؛ **«الزمان»**، ١٢ ايار ١٩٤١.

(٩٧) بڕوانە: **«الزمان»**، ٢٨ ايار ١٩٤١.

کوردستانی زۆر مەبەست بوو، هەر لەبەر ئەوەش بەشی عەرەبی ئیستگەی بەغدا لەو رۆژانەدا سەعات ٨ی ئێواران شان بەشانی زمانی عەرەبی دەنگ و باسی رۆژانەی بەزمانی کوردیش بلاودەکردەوە کە بەشی زۆری بە شێوازێکی هەست بزوێن بۆ سەرکەوتنە دروستکراوەکان تەرخان دەکرا[٩٨]. هەر بەو جۆرەش بەشی کوردی ئیستگەی بەغدا کاری دەکرد. ئەوساکە کامیلی کاکەمینی برای فایقی کاکەمین بەڕێوەبەری ئیستگە کوردییەکە بوو کە لە رۆژی ٢٩ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٩وە دامەزرابوو، رووناکبیری ناسراویش قادر قەزاز پرۆگرامەکانی دەخوێندەوە کە سەعات و نیوێکیان دەخایاند **(لە سەعات پێنجەوە تاوەکو شەش و نیوی ئێواران)**، هەردووکیشیان بە دڵ و بە گیان لەگەڵ سەرکەوتنی راپەرینی مایس بوون[٩٩].

بەو جۆرە فراوانە دانیشتوانی کوردستان شان بەشانی نیشتمانپەروەرانی عیراق لە سەرەتاوە تا کۆتایی چوونە ناو سەنگەرەکانی راپەرینی مایسەوە، لێرەدا پێویستە ئەوەیش تۆمار بکەین کە سەرکردایەتی ئەو راپەرینە لەو رۆژە ناسکەدا هیچ جۆرە هەنگاوێکی نەنا بۆ دڵنیاکردنی کورد بە جێ بەجێ کردن، یان گفتی جێ بەجی کردنی هیچ کامێک لە داوا رەواکانی کە لە دەمێ ساڵەوە ببوونە یەکێک لە کێشە ئاڵۆزە سیاسییەکانی عیراق. هەرچەندە لە راستیدا بوون و نەبوونی وەزیری کورد خۆی لەخۆیدا هیچ ناگەیەنێ، بەڵام پێویستە ئەوەیش بڵێین کە وەزارەتەکەی گەیلانی، بە پێچەوانەی دەستووری باوی رۆژگاری پاشایەتییەوە، بۆ ئاهی سوێن تاکە وەزیرێکی راستەقینەی کوردی تێدا نەبوو، دەڵێن محەمەد عەلی مەحمود، کە بە عەلی ئاڵتی ناسراوە، بەرەگەز کوردە، جاروبار دەربارەی یونس سەبعاویش هەمان قسە دەکرێ، مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی دەڵێ: مەعروف جیاوک چەند جارێک ئەوەی لای من وتووە، هەروەها دانەری نامیلکەی **«العراق بين شهرين»** کە بە هاندانی میری دوای دامرکاندنەوەی راپەرینی مایس حەمید گەنین ناوێ دەری کردووە، هەمان قسەی نووسیوە[١٠٠].

---

(٩٨) **«الزمان»**، ٢٦ ايار ١٩٤١.

(٩٩) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا قادر قەزاز، رۆژی ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨.

(١٠٠) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی، رۆژی ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩.

هەرچۆن بێ ئەندامانی وەزارەتەکەی رەشید عالی گەیلانی، کە ١٢ی نیسانی ساڵی ١٩٤١ دامەزرا، ئەمانە بوون: ناجی سوێدی بۆ دارایی و ناجی شەوکەت بۆ بەرگری و موسا شابەندەر بۆ کاروباری هەندەران و محەمەد عەلی مەحمود بۆ کاروباری گشتی و رێگەوبان و عەلی مەحمود بۆ دادوەری و یونس سەبعاوی بۆ ئابووری[١٠١].

وێڕای ئەوە لەناو رابەرانی راپەڕینی مایسدا هی وا هەبوون، هیچ نەبێ لەناو خەڵکیدا، بە دۆستی کورد لە قەڵەم نەئەدران. لێرەدا بە پێویستی دەزانم بۆ مێژوو قسەیەکی بایەخداری مەحمود الدره لەم بارەیەوە بهێنمەوە. مەحمود الدره لەو کتێبەیدا کە بۆ باسی راپەڕینی مایسی تەرخان کردووە دەڵێ: **«سەرداره کوردەکان لەناو ریزەکانی لەشکرو لە دەرەوەیدا»** بەهۆی هەندێک لە کارەکانییەوە گومانیان لە سەلاحەدین سەباغ دەکرد، هەرچەندە، وەک ئەو دەڵێ، سەباغ **«رایەکی ئازایانەی بۆ چارەسەرکردنی مسەلەی کورد هەبوو کە تەنانەت کوردە (متطرف)ەکانیشی پێ قایل دەبوون، ئەوانەی تا رادەیەکی زۆر لەگەڵیان رێک کەوتبوو»**[١٠٢]. کەوابێ لەو رۆژە ناسکانەدا کوردی ئەوتۆ هەبوون بتوانن جێگەی ئەو وەزیرە کوردانە بگرنەوە کە بە لایەنگری نووری سەعید ناسرابوون، یەکێک لەوانە ماجید مستەفا بوو کە سەباغ بۆ خۆی زۆر بە گەرمی و رێزەوە چەند جارێک ناوی هێناوە[١٠٣]. وێڕای ئەوە لەناو دەستەو توێژە بەرزەکانی کوردەواری ئەو رۆژانەدا هی ئەوتۆ هەبوون کە، وەک کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، بە دڵ و گیان لەگەڵ راپەڕینی مایسدا بوون. عەلی دۆغرەمەچی کە ئەندامی **«ئەنجومەنی پیران»** (مجلس الأعيان) و فایق تاڵەبانی کە ئەندامی **«ئەنجومەنی نوێنەران»** (مجلس النواب) بوون چەند جارێک بروسکەی پشتگیرییان داوەتە رەشید عالی گەیلانی و بەشداری پیتاکیان کردووەو بە کاری تریان هەوڵیان داوە هەستی دانیشتوانی کوردستان بۆ پشتگیریی شۆڕشگێڕانی

---

(١٠١) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الخامس، ص٢٤٥.

(١٠٢) محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، ص١٢٦.

(١٠٣) **«مذكرات الشهيد العقيد الركن صلاح الدين الصباغ»**، ص١٩٨.

بەغدا بیزوێن[١٠٤]. بنەماڵەی غەفوری لە کۆیە هەمان هەڵوەستیان بووە[١٠٥].

لە سەرانسەری عیراقدا ڕەشید عالی تەنها بە مەلا فەندی[١٠٦] هەوڵیریدا ڕاپەڕموو فەیسەڵی دووەم، کە ئەوساکە منداڵێکی شەش ساڵان بوو، لەگەڵ دایکی و پورەکانی و لەلە ئینگلیزەکەیدا بەو بسپێرێ[١٠٧]. لەبەر چەند هۆیەک قەبوڵ کردنی ئەم ڕاسپاردەیەو داڵدەدانی ئەوانە کارێکی هەروا ئاسان نەبوو. ڕەشید عالی لە پێشدا نیازی بوو بیاننێرێتە هاوینەهەواری سەلاحەددین و بڕیار وابوو نەهێڵرێ کەس پێوەندییان پێوە بکات[١٠٨]. جگە لەوە عالییەی دایکی فەیسەڵ بە توندی دژی ڕابەرانی ڕاپەڕینی مایس بوو. وا پێ دەچێ بۆ مەبەستی خۆیان ئینگلیزەکانیش ویستبێتیان هەرچۆن بێ فەیسەڵ لە ژێر چنگی ئەو ڕابەرانە دەربێنن. سەندرسن پاشای دوکتۆری کۆشک، کە یەکێک بوو لە ئینگلیزە شارەزاو دەست ڕۆیشتووەکان لە عیراق، بۆ خۆی دەڵێ: **«لەگەڵ پات دۆمفیل لە چەند پیلانێکی فراندنی فەیسەڵ و دایکی و دایەنەکەی کۆڵیمەوە»**[١٠٩].

مەلا فەندی، کە لەنزیکەوە پێوەندیی لەگەڵ ڕەشید عالی هەبوو، بە ئەوپەڕی ڕێزەوە پێشوازی فەیسەڵ و دایکی و دەستەو دایەرەیانی کردووە، خانووە گەورەکەی خۆی لە باداوە بۆ چۆڵ کردوون و خۆی بە خاووخێزانەوە چۆتە خانوویەکی نیوداشتی لە قەڵا، دەستوپێوەندێکی زۆری بۆ خزمەتیان تەرخان کردووەو هەموو ڕۆژێک جگە لەوەی خۆی بەسەری کردوونەوە لە بەیانیشەوە کچی گەورەی و خوشکی ناردۆتە لای شاژن تا بێتاقەت نەبێ. مەلا فەندی و خێزانی لە هیچ ڕوویەکی ترەوە

---

(١٠٤) **«العالم العربي»**، ٦ و ١١ و ١٦ نيسان ١٩٤١؛ **«الاستقلال»**، ٦ و ١٦ نيسان ١٩٤١؛ **«الزمان»**، ٢٤ ايار ١٩٤١.

(١٠٥) **«الزمان»**، ٢٤ ايار ١٩٤١؛ **«العالم العربي»**، ١٦ نيسان ١٩٤١.

(١٠٦) مەبەست مەلا ئەبو بەکر ئەفەندییە کە لە ناو کوردەواریدا بە مەلا فەندی ناسراوە.

(١٠٧) جرالد دي غوري، ثلاثة ملوك في بغداد، ترجمة وتعليق سليم طه التكريتي، بغداد، ١٩٨٣، ص١٩٠، ٢٠٢؛ طارق إبراهيم شريف، المصدر السابق، ص٥٠.

(١٠٨) **«العالم العربي»**، ٢٣ أيلول ١٩٤١.

(١٠٩) **«مذكرات سندرسن باشا طبيب العائلة الملكية في العراق ١٩١٨-١٩٤٦»**، ترجمة وتعليق سليم طه التكريتي، بغداد، ١٩٨٠، ص٢٣٤-٢٣٥.

دریغییان نەکردووە[١١٠]. کەچی دایکی فەیسەڵ لەو یەکەمین وتارەیدا کە دوای دامرکاندنەوەی راپەڕینی مایس دای و سوپاس گوزاری خۆی بەرانبەر هەستی عیراقییەکان دەربڕی دوورو نزیک توخنی باسی ئەو مەردایەتییەی مەلا فەندی نەکەوت[١١١].

وێڕای ئەوانەی وتمان زۆربەی هەرە زۆری عەین و نایبە کوردەکانی پەرلەمان لەگەڵ ئەو ٩٣ ئەندامەدا ئامادە بوون کە لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتیدا بڕیاریاندا شەریف شەرەف بخەنە جێگەی عەبدولئیلا وەک وەسی بەسەر فەیسەڵی دووەمەوە. راستە دوای دامرکاندنەوەی راپەڕینەکە بەشی زۆری ئەوانە دیسان دەنگیان بۆ گێڕانەوەی عەبدولئیلا دا، بەڵام پێم وایە هەستی راستەقینەی ناوەوە ژمارەیەکیانی لە هەڵوێستی یەکەمیاندا بزواندبێ، رەنگبێ لە کورددا عەلی دۆغرمەچی و فایق تاڵەبانی لەوانە بن. مێژوونووسی شارەزا عەبدولڕەزاق حەسەنی لەم بارەیەوە نووسیویە دەڵێ: **«بۆ مێژوو دەڵێین.. گشت ئەندامانی ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نوێنەران کە لەو کۆبوونەوە مێژووییەی پەرلەماندا ئامادەبوون، سەربەست بوون لە هاتن و نەهاتندا، نە کەس بە زۆر هێنراو نە کەس لە چوونە دەرەوە قەدەغە کرا، جا ئیتر ئەو هاتنە لە دەنگدانەوەی دەروونەوە بووبێ یان لە مەرایی کردنەوە بۆ رژێم»**[١١٢].

سەرکردایەتی راپەڕینی مایس دەیتوانی لەوەیش زیاتر هەستی کورد بەلای خۆیدا رابکێشێ و کەڵکی باش لە هەڵوێستیان ببینێ. بەڵام، ئەو سەرکردایەتییە لەبەر ئەوەی باوەڕی بە خەباتی جەماوەر نەبوو شتێکی ئەوتۆی نەکرد بۆ ئاراستەکردنی ئامادەیی بێ ئەندازەو رقی کۆبۆوەی کۆمەڵانی خەڵکی هەموو عیراق دژی دوژمن بە کردەوە نەک بە قسە. مێژوونووسی میسری دکتۆر سەلاح ئەلعەقاد ورد بۆی چووە کە دەڵێ: **«حوکمەتی گەیلانی تاکە حوکمەتی عەرەبی بوو کە ویستی بە نیازی خزمەت کردنی ئامانجە نیشتمانییەکانی عەرەب کەڵک لە هەردوو بەرەی شەڕ وەربگرێ،**

---

(١١٠) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا مەسعود محەمەد، رۆژی ٤ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩؛ طارق إبراهيم شريف، المصدر السابق، ص٤٦-٥٤.

(١١١) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء السادس، ص٣٠-٣١.

(١١٢) هەمان سەرچاوە، بەرگی پێنجەم، ل٢٤٤.



نوری سەعید: هەمیشە بیری دەکردەوە؟

لەوە بەولاوە شتێکی ئەوتۆی نەکرد بۆ گۆڕینی باری سیاسی و کۆمەلایەتی لە نیشتمانی عەرەبدا»[113].

ژمارەیەک لە مێژوونووسە بیانییەکانیش بۆ ئەم راستییە چوون و بە هۆیەکی سەرەکیی سەرنەکەوتنی راپەڕینی مایسی لە قەڵەم دەدەن. فێدچینکە دوای ئەوەی باسی ئامادەیی جەماوەری عیراقی کردووە بۆ خەبات دژی ئینگلیز دەڵێ بەڵام سەرکردەکانی راپەڕینی مایس **«نەک تەنها کەڵکیان لە هەڵچوونی شۆڕشگێرانەی جەماوەر نەبینی بۆ رێکخستنی بەرگرییەکی گشتی دژی دوژمن، بەڵکو هەوڵیشیان دەدا بە هەموو جۆر کەف و کوڵی ئەو هەڵچوونە کزکەن»**[114]. بەو قسانەشدا کە نووسەری ئاگاداری ئەڵەمانی دوکتۆر شرۆیدەر کردوونی روون و ئاشکرا دیارە سەربازانی لەشکری عیراقی بە دڵ ئامادەی شەڕی ئینگلیز بوون[115].

هەست بەمە لە قسەی ئەو کوردانەشدا دەکرێ کە بەشدارو ئاگاداری رووداوەکانی

---

(١١٣) الدكتور صلاح العقاد، دراسات في تأريخ العراق الحديث. حول حركة رشيد عالي الگيلاني ١٩٤٠-١٩٤١، «الهلال» (مجلة)، القاهرة، العدد التاسع، سبتمبر ١٩٦٦، ص٤٨.

(114) A.F.Fedchinka, Iraq v borbe za nezavicimost 1917-1969, Moscow, 1970, p.84.

(١١٥) الدكتور بيرند فيليب شرويدر، العراق ١٩٤١، ترجمة فاروق الحريري، بغداد، ١٩٨٢، ص٨٢.

نیسان و مایسی ١٩٤١ بوون. به وتنه هادی رەشید چاوشلی که ئەو دەمە قوتابی بووە لە حقوق و خۆی ناونووس کردووە بۆ بەرگری و مەشقی سەربازی، لەم بارەوە دەڵێ: **«حەفتەیەکمان لە مەشق کردن تەواو نەکرد کاتێک هەواڵی وستاندنیمان پێ راگەیێنراو داوا لە قوتابیان کرا بگەڕێنەوە شارەکانیان تا لەرێگەی ئیستگەوە بانگ دەکرێنەوە بۆ ئەوەی دیسان بچنەوە بۆ مەشق کردن.. قوتابیان بەم بڕیارە نیگەران بوون چونکە رێگەی بەشداری کردنی لەو بزووتنەوە نیشتمانییەدا لێگرتن»**[١١٦].

رابەرانی راپەڕینی مایس دەیانتوانی دەرس لە تاقیکردنەوەکانی شۆڕشی بیست وەرگرن هیچ نەبێ بۆ ئەوەی سەرئەنجامی بزووتنەوەکەیان بەو کۆتاییە کتوپڕە نەهاتایە[١١٧]. پێویستە ئەوەیش بڵێین کە ئەوان لە زۆر رووەوە لە بارودۆخێکی گەلێک باشتردا بوون لە رابەرانی شۆڕشی بیست. ئینگلیز لای عیراقییەکان زیاتر ریسوا بوون، رادەی بیرو تێگەیشتنی کۆمەڵانی خەڵک بەرزتر بوو، چەک و تفاقی باشتر بەدەستەوە بوو[١١٨]، ئینگلیز لە گەرمەی جەنگێکی کوشندەدا بوون لەگەڵ دوژمنێکی سەرسەخت و کەللە رەق، رای گشتی لەوسا زیاتر پشتی گەلی عیراقی دەگرت. لەخۆڕا نەبوو دوای دامرکاندنەوەی راپەڕینەکە ئەفسەران و کاربەدەستانی ئینگلیز لە هیچ کوێ زاتیان نەدەکرد تێکەڵ بە جەماوەر بن. هەر ئەوەندە دەرفەت بۆ دانیشتووانی شاری ناسرییە هەڵکەوت ئەفسەرێکی ئینگلیزیان لەناو بازاڕ کوشت[١١٩]. دوای کشانەوەی رەشید عالی گەیلانی و لایەنگرانی بۆ ئێران دانیشتووانی بەغدا داخی دڵی خۆیان بە جووەکان رشت، هەراوبگرو تالانییەکی فراوان لە ماوەی یەکەم دوو رۆژی حوزەیراندا پایتەختی گرتەوە کە لە مێژوودا بە «فەرهود» ناسراوەو[١٢٠] بووە هۆی بریندار بوون و کوشتنی گەلێک کەس. سەرچاوە

---

(١١٦) طارق إبراهيم شريف، المصدر السابق، ص٩٠.

(١١٧) تا ٢٩ی مایسی ١٩٤١ رابەرانی راپەڕینی مایس تەواو ورەیان بەرداو بەرەو ئێران هەڵهاتن هێزەکانی ئینگلیز رۆژی یەکی حوزیران بەغدایان گرتەوەو تا هەژدەی هەمان مانگ توانییان دەست بەسەر هەموو وڵاتدا بگرنەوە.

(١١٨) عبدالرزاق الحسني، الاسرار الخفية في حركة ١٩٤١ التحررية، ص٢١٥.

(١١٩) هەمان سەرچاوە، ص٢٠٩.

(١٢٠)نووسەرە بیانییەکانیش هەمان وشەی (فەرهود) بەکاردێنن.

همن ژمـارەی کـوژراوانی ئەو کـارەسـاتە بە نزیکەی ۱۸۰و بریندارانی بە نزیکەی ۸۰۰ کەس و زیانی بە یەک دوو ملیۆن دینار دادەنێن(۱۲۱).

لە هەولێـریش خەریک بوو رووداوێکی وەک ئەوەی بەغدای پایتەخت بقەومێ، ئەوەی سەرنجی ئینگلیزەکانی راکێشا. لە بروسکەیەکی نهێنیدا کە بنکەی شوعەیبە رۆژی ۱۱ی حوزەیرانی ساڵی ۱۹٤۱ ناردوویە بۆ بنکەی حەبانییـە، کە ئەوسـاکە هەردووکیان بەدەست ئینگلیزەوە بوون، بەم جۆرە باسی هەولێر لەو رۆژانەدا کراوە:

**«تا ئێـسـتـەش بارودۆخی هەولێـر خـراپە. بەر لە چەند رۆژێک خـەریک بوو کوشتاری جووەکان لێرەش دەست پێبکات و ئەو کارانە دووبات بنەوە کە لە بەغـدا کران. بەڵام فـایق تۆفیـقی متەسـەرف بە فریادا کەوت و رێگەی ئەوەی نەدا. مـوسا یەعقوبی لە جێگەی ئەو دانرا»**(۱۲۲).

بە ناوەرۆکی هەمـان بروسکەدا وا پێدەچێ سەرکردایەتی راپەڕینی مایس سالح زەکی ساحێـبقرانی لە هەولێر لابردبێ و فـایق تۆفـیـقی لە جێگەی دانابێ چونکە ئەمـیـان، کە کوردی خانەقی و پارێزەرێکی بەناوبانـگ و ناحەزی ئینگلیـز بوو، زۆر بە گـەرمی لایەنی راپەڕینی مـایسی دەگـرت(۱۲۳). دیارە هەر لەسـەر ئەوەش دوای دامرکاندنەوەی راپەڕینەکە موسا یەعقوبی خراوەتە جێگەی.

سەرکەوتنی راپەڕینی گشتیی گەلی عـیراق دوای تێپەڕبونی تەنهـا حەوت ساڵ بەسـەر دامـرکاندنەوەی راپەڕینی مـایسـداو پووچ کردنەوەی پەیمانی پۆرتسـمۆث لە بارودۆخێکی سەختـتـردا بەڵگەیەکی تری سەڵمێنەری کەمـتـەرخەمی سەرکردایەتی راپەڕینی مـایس و بێ باوەڕییەتی بە خەباتی جەماوەر. بەلای ئەوانەوە سەربازێکی مەشق پێکراو ۲۰ (متطوع)ی دەهێنا(۱۲٤)، هەرچەندە تاقیکردنەوەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلان وا ناڵێن.

---

(121) H.J.Coben, The Anti- Jewish Farhud in Baghdad, 1941, "Middle Eastern Studies", London, Vol. 3, No.1, October 1966, p. 12.

(122) PRO, AIR, 23/5933, XM-7055.

(۱۲۳) پێم وایە ئەو فـایق توفـیـقـەی(تطوع)ی کـردووەو رۆژنامـەکـانی بەغـدا چەند جـارێک لەگـەڵ کوردەکاندا ناویان هێناوە هەمان فایق تۆفیقە (بۆ نمونە بڕوانە: **«العالم العربي»**، ۲ ایار ۱۹٤۱).

(۱۲٤) ئەو قسانە هی ئیبراهیم راوین (**بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، الاسرار الخفية في حركة ۱۹٤۱**

دیاره دوای دامرکاندنەوەی راپەڕینی مایس لەلایەن ئینگلیزەوە دەبوو کوردیش بەشی خۆی لە کردارە ناهەموارەکانی کۆنەپەرستی عیراق بەرکەوێ. دوای بەغدا ژمارەی ئەوانەی لە هەولێر گیران لە هەموو شارەکانی تری عیراق زیاتر بوو[125]، ٤٢ هەولێری گیران. دوای هەولێر کەرکوک دێ کە ژمارەی گیراوەکانی ٣٧ کەس بوو. سێیەم مونتەفیکە ٢٣ کەس و چوارەم باقوبەیە ١٣ کەس و پێنجەم عەمارەیە ١٢ کەس و شەشەم دیوانییەو موسڵ و کەربەلایە کە هەر یەکەیان ١٠ کەس و حەوتەم کـــوتە ٩ کەس و هەشتە م سلێمانییە ٧ کەس و دوای ئەو حلەیە ٤ کەس و دوای هەمووانیش دلێمە کە سێ کەسی لێ گیراوە.

ژمارەی هەموو ئەو کوردانەی لەسەر راپەڕینی مایس گیران و حوکم دران خۆی دەدا لە ٧٩ کەس کە پزیشک و ئەندازیارو مامۆستا (٦کەس)و قوتابی (٦ کەس)و کرێکار (١٠ کەس)و بێ کارە (١٠ کەس)یان تێدا بوو. ئەم گیراوانە بۆ ماوەی چەند مانگێک لە بەندیخانەی فاو بوون و دوای ئەوە گوێزرانەوە بەندیخانەی عەمارە. جەمیل بەندی رۆژبەیانی و دکتۆر جەعفەر محەمەد کەریم و شێخ رەئووفی شێخ سالحی برای شێخ نوریی شاعیرو عەلی حەیدەر سلێمان و عەونی یوسف و فایق نادرو میر حاج لەو گیراوانە بوون.

پوختەی ئەو بەڵگەو راستییانەی تا ئێستە هێناومانەوە هیچ گومان لەوەدا ناهێڵن کە کورد بە دڵ، لە سەرەتاوە تا کۆتایی، لایەنگری راپەڕینی مایسی ١٩٤١ بووە. هەرچۆنێکیش لێکی بدەیتەوە ناشێ شێخ مەحمود لەم یەک دەنگییەی کورد دەرچووبێ.

## هەڵوێستی شێخ مەحمود بەرانبەر راپەڕینی مایس

وەک ئاشکرایە شێخ مەحمود یەکێک بوو لەو سەردارە کوردانەی بەر لە هەموان پەلاماری چەکی دژی ئینگلیز داو لەسەر ئەوە دووچاری گرتن و دەربەدەری و دەردو

---

التحررية، ص١٨٧).

(١٢٥) ئەم ژمارانەم لەو لیستەیە وەرگرتووە کە مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی لە بەندیخانە دایناوە

ئازارێکی ئەوتۆ بوو کە کەم کەس لە وێنەی بەدەست ئینگلیزەوە چێشتبوو. دوا جاری ئەشکەنجەیی شێخ مەحمود دەگەڕێتەوە دە ساڵان پێش بەرپابوونی ڕاپەڕینی مایس. ئەوە بوو شێخ مەحمود دوای شکانی لە شەڕی ئاوباریکدا بە ماوەیەکی کەم ناچار بوو ڕۆژی ١٣ی مایسی ساڵی ١٩٣١ خۆی بەدەستەوە بدات. فشاری بێ وچانی فڕۆکەکانی ئینگلیز شێخی ناچار کرد چەک دانێ. فڕۆکەوانێکی بەشداری ئینگلیز لەم بارەیەوە نووسیویەو دەڵێ: **لە ماوەی شەش حەفتەی پێش خۆبەدەستەوەدانی، فڕۆکە بەردەوام بەسەر سەری شێخەوە بوو**[١٢٦]. ڕۆژنامەی **«تایمس»**ی لەندەنیش دانی بەوەدا ناوە کە بۆمبابارانی فڕۆکەکانی ئینگلیز بووە هۆی ئەوەی هۆزەکانی کوردستان نەدەنە پاڵ شێخ مەحمود[١٢٧]. بۆ دامرکاندنەوەی ئەو ڕاپەڕینەی شێخ مەحمود ئینگلیز جگە لە فڕۆکە لیڤیشیان بەکارهێناو ئەفسەرێکی خۆیشیان کردە سەر لەشکری بارەگا لە سلێمانی[١٢٨]. شایانی باسە هێزەکانی ئێرانی ڕەزا شاش هاریکاری تەواویان کرد بۆ دامرکاندنەوەی دوا ڕاپەڕینی شێخ مەحمود[١٢٩].

دوای ئەوە شێخ مەحمود بۆ ماوەی ١٠ ساڵی ڕەبەق (لە ناوەندی مایسی ١٩٣١وە تاوەکو ناوەندی مایسی ١٩٤١) بە دەسبەسەری مایەوە. شێخ ئەو دە ساڵەی بە ڕیز لە سەماوەو ناسرییەو عانەو بەغدا بردە سەر. میری بڕیاری زەوت کردنی هەموو زەوی وزاریشی دەرکرد[١٣٠]. بە پێی قسەی ئاگاداران ئەو ماوەیە خاوخێزانی شێخ بە کولەمەرگی ژیانیان دەبردە سەر[١٣١].

---

مامۆستا حەسەنی بە گەرمی بەشداری ڕاپەڕینی مایسی کردو یەکێک بوو لەوانەی ڕەشید عالی گەیلانی خەریک بوو بینێرێتە لای ڕەشید جەوەدت لە بەصرە.

(126) J.A.Chamier (Air Commander), Air control of frontiers "Journal of the Royal Central Asian Society", London, Vol XXI, July 1934, p.409.

(127) "The Times", May 10, 193

(١٢٨) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨، ص١٣١.

(129) S.H.Longrigg, Op. Cit., p. 149; M.A.Kamal, Op. Cit., pp. 239-240.

(١٣٠) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، ص١٣٣.

(١٣١) دیدەنی لەگەڵ دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی، ڕۆژی ٣١ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩.

شێخ مەحمود بە درێژایی ئەو دە ساڵە جارەهای جار بێ سوود داوای لە ئینگلیزەکان و کاربەدەستانی بەغدا دەکرد رێگەی گەڕانەوەی بدەنێ. **گەڕانەوەی شێخ ببووە یەکێک لە دروشمەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی ئەو رۆژگارە.** زۆر جار بە بروسکەی تایبەتی خەڵکی داوایان لە کاربەدەستان دەکرد ئەو داوایە جێبەجێ بکەن[١٣٢]. بەڵام شێخ مەحمود نەدەبوو بگەڕێتەوە چونکە، وەک رۆژنامەی **«تایمس»**ی لەندەنی کاتی خۆی نووسیبووی تا شێخ ئازاد بێ ناوچە کوردەوارییەکان هێمنی بەخۆیانەوە نابینن[١٣٣].

کەوابێ ئاخۆ هەستی شێخ مەحمود بەرانبەر ئینگلیز لەو سەردەمەدا چۆن بووبێ؟. مێژوونووسی گەورە مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێ:

**«کە شێخ مەحمود لە بەغدا بوو هەموو رۆژێکی هەینی لەگەڵ مەعروف جیاوکدا دەچووینە خزمەتی لە ماڵەکەی کە لە سلێخ بوو. زۆر جار بە ئاسانی هەستم دەکرد تا چ رادەیەک لە ئینگلیز داخ لە دڵە»**[١٣٤].

فەهمی سەعید کە، وەک وتمان، یەکێک بوو لە رابەرە هەرە چالاکەکانی راپەڕینی مایس، پەی بەم راستییە بردووە، ماوەیەکی زۆر بەر لەوەی راپەڕینی مایس بەرپا بێ پێوەندی نزیکی لەگەڵ شێخ مەحمودا دامەزراندووە. فەیسەڵی کوڕی دەڵێ: تا ئێستەش بیرمە چۆن شێخ مەحمود بە جلوبەرگی کوردییەوە دەهاتە میوانیی باوکم، کە هەردووکیان پێکەوە بوونایە تەنها بە کوردی قسەیان دەکرد. زۆر جاریش لە مەجلیسدا ئەوی شێخ مەحمود دەیفەرموو باوکم وەری دەگێڕایە سەر زمانی عەرەبی. یەکێک لەو دانیشتنانە سێ قۆڵی بووە لە نێوان شێخ مەحمودو نوری سەعیدو فەهمی سەعیدا[١٣٥]. سەرەتا فەهمی سەعیدو هاواڵە ئەفسەرەکانی، کە دوایی بوونە رابەری راپەڕینی مایس، پێوەندی نزیکیان لەگەڵ

---

(١٣٢) بە وێنە بڕوانە: «البلاد» (جريدة)، بغداد، ١٢ تشرين الثاني ١٩٣٦.

(١٣٣) لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە:

"Zaria Vostoka", Tblisi, 28. V. 1931.

(١٣٤) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی، رۆژی ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩.

(١٣٥) دیدەنی لەگەڵ فەیسەڵ فەهمی سەعید، رۆژی ٢٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨.

نوری سەعیددا هەبوو، تەنانەت ئەوان کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٨ سێیەم وەزارەتی نوری سەعیدیان بەسەر مەلیک غازیدا سەپاند[١٣٦].

بەر لە راپەڕینی مایس بە ماوەیەکی زۆر فەهمی سەعید دەرکی بە رادەی پێویستی چارەسەرکردنی کێشەی کورد کردبوو. کە ساڵی ١٩٢٧ لەگەڵ ژمارەیەک لە هاوەڵە نزیکەکانی دەستەیەکی نهێنی لەناو ریزەکانی سوپادا دامەزراندو هەر خۆی دەستووری کاری بە ناوی **«الميثاق القومي العربي»**ەوە بۆ دانا فەهمی سەعید کێشەی کوردی فەرامۆش نەکرد، یەکێک لە بەندە سەرەکییەکانی ئەو بەڵگەیە بەم جۆرە دارێژراوە:

**«ئامانجەکانمان بۆ گەیشتن بە مەبەست:**

**د- هاریکاریی و برایەتی مێژوویی لەگەڵ کوردا، چونکە ئەو دەستەیەی ئێمە لەو باوەڕەدایە کە مەسەلەی کورد هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ نەتەوەی عەرەبدا نییە، لەبەر ئەوەی ئامانجی (ئەو مەسەلەیە) تەشەنە سەندنە لەناو وڵاتە دراوسێیەکانی عێراقدا چ لە رۆژهەڵاتەوەو چ لە باکوورەوە. ئەمە بنەمای هاریکارییە لەگەڵ کورددا»**[١٣٧].

ئەو باس و خواس و بەڵگانەی کوڕانی فەهمی سەعید یەعروب و فەیسەڵ کۆیان کردوونەوە وا دەگەیێنن باوکیان رۆژانی راپەڕینی مایسیش بیری لە کورد وەک هێزێکی دۆست و پێویست کردۆتەوە، لەبەر ئەوە پێوەندی بە شێخ مەحمودەوە کردووەو لەگەڵی رێککەوتووە شێخ بگەرێتەوە کوردستان و کەی پێویست بوو وەک جاران بکەوێتەوە شەڕی چەتەگەری دژی ئینگلیز. بەو جۆرە ناوەندی مایس، واتە لەکاتی گەرمەی شەڕی نێوان عێراق و بەریتانیادا، لە پشت سەدەی نازم پاشاوە ئوتومبیلی تایبەتی بۆ شێخ ئامادە دەکەن و بەرەو ناوچەی سلێمانی رەوانەی دەکەنەوە[١٣٨].

---

(١٣٦) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە:

عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الخامس، ص٥٤-٥٥؛ **«مذكرات الشهيد العقيد الركن صلاح الدين الصباغ»**، ص٩٥.

(١٣٧) **«آفاق عربية»**(مجلة) بغداد، العدد الرابع، السنة الرابعة، كانون الأول ١٩٧٨ص١٥٩-١٦٠

(١٣٨) دیدەنی لەگەڵ فەیسەڵ فەهمی سەعید، رۆژی ٢٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨.

هەرچی بەدەستەوەیە ئەم قسانە دەسەلمێنن و پێچەوانەیان پووچ دەکەنەوە. جا با یەکە یەکە سەرنج لە لایەنەکانی ئەم باسە بدەین و لێکیان بدەینەوەو بەراوردیان بکەین بەلکە بگەینە ئەنجامێکی دروست و سەلمێنەر.

**یەکەم:** سەرکردایەتیی راپەڕینی مایس بیری لەوە کردبۆوە ئەگەر هاتو هێزەکانی ئینگلیز پێشکەوتن و توانییان بەغدای پایتەخت بگرن ئەوان بەرەو باکوور بکشێنەوەو ئەوێ بکەنە بنکەی بەرگری. دیارە ناوچە شاخاوییەکانی ئەوێ بۆ بەرگری لەبارترن تا دەشتە کاکی بە کاکییەکانی باشوور. جگە لەوە گەیشتنی یاریدەی ئەڵەمانیای دوژمنی باوەکوشتەی بەریتانیا بۆ ئەوێ گەلێک ئاسانتر بوو، چونکە، ئەوساکە سوریا بەدەست حوکمەتی فیشی فەرەنسەیی سەر بە هیتلەرییەکانەوە بوو. هەروەها کاربەدەستان و کۆمەلانی خەلکی سوریا بە دڵ و بە گیان لەگەل راپەڕینی گەلی عیراقدا بوون[١٣٩].

لەلای رۆژهەلاتیشەوە ئێرانی رەزا شا بوو کە لە راستیدا ببووە بنکەیەکی کاریگەری هیتلەرییەکان. تەنانەت لەگەڵ تەقینەوەی راپەڕینی مایسدا وەزارەتی هەندەرانی ئەڵەمانیا کاربەدەستێکی گەورەی خۆی نارده تاران بە نیازی هاندانی رەزا شا بۆ پشتگیری ئەو راپەڕینەو رێگەدان بە گرۆپای باڵیۆزی ئەڵەمانیا بە خاکی ئێراندا بگەڕێتەوە عیراق[١٤٠]. هەروەها ئەڵەمانەکان هەوڵیاندا لە رێگەی ئێرانەوە چەک و بەنزینی فرۆکە فریای عیراق بخەن[١٤١].

کەوابێ رابەرانی راپەڕینی مایس مەترسیی ئێرانیان نەبوو، ئەوەبوو کە لێشیان قەوما هەموویان پەنایان بردە بەر ئەوێ، ئەوساکە ئەڵەمانیا پێوەندیی بە تورکیاشەوە زۆر باش بوو، فۆن پاپنی باڵیۆزی هیتلەر لەوێ گالەی دەکرد.

ئەمانەی وتمان مەرجێکی پێویست بوون بۆ ئەوەی ناوچەکانی باکووری وڵات ببنە

---

(١٣٩) رۆژنامە بەغدایییەکان نیسان و مایسی سالی ١٩٤١ پڕن لە بەلگەی پشتگیریی سورێکان بۆ راپەڕینی مایس.

(١٤٠) دوای دەست پێ کردنی شەڕی دووەمی جیهان بە ماوەیە حوکمەتی نوری سەعید پێوەندی دیپلۆماسیی لەگەڵ بەرلیندا پچڕی و گرۆپای باڵیۆزی ئەڵەمانیا لە بەغدا ئیزن درا. دوای تەقینەوەی راپەڕینی مایس گرۆپا گەڕایەوە شوێنی خۆی.

(١٤١) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە:

S.L.Agaev, Germanski Imperialism v Irane, Moscow, 1969, pp.97- 99.

بنکەیەکی لەباری بەرگری دژی ئینگلیز. هەر بەو رادەیەو بگرە زیاتریش دەبوو پشتگیریی هێزە کاریگەرەکانی ئەو ناوچانە مسۆگەر بکرێ، کە بێگومان شێخ مەحمودی بەرزنجی لە سەرووی هەموویانەوە بوو. لەبەر ئەوە زۆر رێی تێدەچێ بۆ ئەو مەبەستە فەهمی سەعید لەگەڵی رێککەوتبێ، رێشی تێدەچێ هەموو رابەرانی راپەڕینی مایس ئاگاداری ئەو کردارەی فەهمی سەعید نەبووبن. لە راستیشدا نیمچە پاشاگەردانییەک لەناو ریزەکانی سەرکردایەتی ئەو راپەڕینەدا هەبوو، ئەوەی بە یەکێک لە هۆ سەرەکییەکانی ژێرکەوتنی دادەنرێ(١٤٢).

وا دیارە ئینگلیزەکان ئاگاداری نەخشەی رابەرانی راپەڕینی مایس بوون دەربارەی گواستنەوەی بنکەی بەرگری بۆ باکوور، واش پێ دەچێ راگەیاندنی ئەو نەخشەیەیان بە دوور نەزانیبێ، بۆیەکا ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە پلانێکی وردیان بۆ کاول کردنی بیرە نەوتەکانی کەرکوک لە کاتی پێویستدا دانابوو(١٤٣).

**دووەم:** بێ گومان لەبەر گەلێک هۆی تێکەڵ و پێکەوە بەستراو ئینگلیز بە هەموو جۆر دەیانویست بە زووترین کات راپەڕینی مایس دابمرکێننەوە. چەرچلی سەرەک وەزیرانی ئەوسای بەریتانیا لە یادداشتەکانیدا دەربارەی شەڕی دووەمی جیهان ئەم راستییەی بەتایبەتی تۆمارکردووە(١٤٤). دیارە بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم مەبەستە دەبوو کاربەدەستانی ئینگلیز پەنا بەرنە بەر هەر رێگەیەک ببێتە هۆی ئەوەی کەمتر پێویستیان بە هێنانی هێزی چەکداری خۆیان بێ، تایبەت چونکە دوای خۆبەدەستەوەدانی فەرەنسییەکان خۆیان بە تەنیا رووبەڕووی دوژمنێکی سەرسەختی وەک ئەڵەمانیای نازی مابوونەوە، بۆیەکا پێویستیان بە هەر سەربازێک و بە هەر فڕۆکەیەک و تەنانەت بە هەر گوللەیەک بوو بۆ شەڕگە گەورەکان.

لەبەر ئەوە ئینگلیزەکان دەبوو لە هەزارو یەک رێگەوە سەرەک هۆزانی کوردو عەرەب دژی راپەڕینی مایس هان بدەن. بەر لەوەی شەڕ لەنێوان لەشکری عیراق و هێزەکانی ئینگلیزدا دەست پێ بکات فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق

---

(١٤٢) الدكتور فاضل البراك، المصدر السابق، ص٢٤٦.

(143) PRO, AIR, 23/5887, XM-6847.

(144) W.S.Churchill, The Second World War, Vol. 3,London, 1950, p.46.

له بەڵگەیەکی نهێنیدا دەڵێ: **«من سۆراخی ئەوەم چۆن بتوانم هەستی کوردەکان لە کاتی پێویستدا بیزوێنم»**(١٤٥).

بەڵام لەو رۆژانەدا تەنها ئەو سەردارو سەرەک هۆزانە بەدەنگ ئینگلیزەوە چوون کە لە هەموو روویەکەوە لەژێر سایەیاندا حەسابوونەوە، نەک ئەوانەی بە دەستیانەوە دەربەدەرو بێ لانە بوون. رۆژنامەنووسی ئەمریکایی جۆن ئۆکێرنی لەم بارەیەوە نووسیوییە دەڵێ: **ئینگلیزەکان دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشی بیست پەنجا کەسێکیان لە سەرەک هۆزانی عیراق لە خۆیان نزیک خستەوە بۆ ئەوەی بە دەستووری هندستانی سەدەی هەژدەمین بیانکەنە داردەستی خۆیان. بە وێنە بلاسم ئال یاسین ساڵی ١٩٢٥ شتێکی ئەوتۆی نەبوو، کەچی ئێستە ١٥٠ هەزار کەسێکی لەبەردەستدایە، ٥٠٠ هەزار دۆنم زەوی بەپیت و کۆشک و یاساولی تایبەتی خۆی هەیە... ئەو جۆرە شێخانە لە کاتی راپەڕینی ١٩٤١دا پشتی ئینگلیزەکان دژی لەشکری عیراقی گرت**(١٤٦).

بەرانبەر بەوان ژمارەیەکی تر لە سەرەک هۆزانی عیراق نەچوون بەدەنگ ئینگلیزەوە. جیرالد دی گۆری کە لە کاتی راپەڕینی مایسدا بەرپرسیاری کاروباری سەربازی باڵیۆزخانەی بەریتانی بوو لە بەغدا دانی بەوەدا ناوە ئەو رۆژانە چۆن نەیانتوانیوە کارێکی ئەوتۆ بکەن هۆزەکان پشتیان بگرن(١٤٧). بە پێچەوانەوە سەرەک هۆزی ئەوتۆ هەبوو دڵسۆزانە دایە پاڵ رابەرانی راپەڕینی مایس. رابەری بەناوبانگی شۆڕشی بیست عەبدولواحید حاج سکر یەکێک بوو لەو سەرەک هۆزانەی تا دوارۆژ سەنگەری خەباتی بەرنەدا تا لەلایەن دوژمنەوە لەگەڵ عەلوان یاسریدا کۆتایی تەمووزی ساڵی ١٩٤١ گیرا(١٤٨).

بەپێی هەموو سەنگ و کێشێک هیچ سەیر نییە ئەگەر بەشی زۆری سەرەک هۆزانی کوردیش هەمان هەڵوێستیان هەبووبێ. سەرچاوەی شارەزا هەیە باسی ئەوە دەکات چۆن هەوڵی دوژمنانی راپەڕینی مایس لەگەڵ ژمارەیەک سەرداری ناوداری

---

(145) PRO, AIR, 23/5933, XM-7055

(146) J.O Kearney, Red Mirage,London, 1958, p.131.

(١٤٧) جرالد دي غوري، سەرچاوەی ناوبراو، ل١٩٥.

(١٤٨) «الأخبار» (جريدة)، بغداد، ٣١ تموز ١٩٤١.

کورددا بەفیرۆ چووە[149]. لەوەش زیاتر، بارودۆخی کوردستان لە کاتی ڕاپەڕینی مایسدا هێند هێمن بوو ڕەشید عالی بتوانێ ئەو هێزانەی سوپا کە لە عەقرەو زاخۆ بوون بیانهێنێتە موسڵ بۆ شەڕی چاوەڕوانکراوی ئینگلیز[150].

سێهەم: بەپێی یەکێک لە سەرچاوەکان گوایە جەمیل مەدفەعی داوای لە شێخ مەحمود کردووە بگەڕێتەوە کوردستان[151]. کەچی بەپێی هەمان سەرچاوە جەمیل مەدفەعی لە سەرەتای نیسانەوە لە بەغدا هەڵهاتووەو چۆتە موسڵ و لەوێوە ئینگلیزەکان بە فڕۆکەی تایبەتی بردوویانەتە لای وەصی لە بەسرەوە لەوێشەوە لەگەڵ دەستەو دایەرەی وەصیدا چۆتە فەلەستین و ئوردون و تا دەوروبەری کۆتایی مایس نەگەڕاوەتەوە عیراق[152]. واتە کاتێک شێخ مەحمود بڕیاری گەڕانەوەی داوە جەمیل

پێڕەوی یەکەم دەستەی نهێنی ئەفسەرانی لەشکری عیراق کە بە خەتی فەهمی سەعید ساڵی ١٩٢٧ نووسراوەو کە یەکەم بەڵگەیەکی لەو بابەتەیە باسی چارەنووسی کوردی تێدا کراوە

---

(١٤٩) بڕوانە ئەو وتارەی مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا لە گۆڤاری «المثقف»دا بلاوی کردۆتەوە: ژمارە ١١-١٢، ئاب و ئەیلولی ١٩٥٩، ل١٦.

(150) PRO, AIR, 23/5933, XM-7055. هەروەها بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، الاسرار الخفية في حركة السنة ١٩٤١ التحررية، ص٢١٤.

(١٥١) عبد الرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء السادس، ص ٣٤ -٣٥.

(١٥٢) هەمان سەرچاوە، بەرگی پێنجەم، ل٢٧٨- ٢٧٩.

مەدفەعی لە چەند حەفتەیەک لەوەوپێشەوە بە سەدان کیلۆمەتر لێوەی دوور بووە. هەر ئەو کاتەش هیچ ئینگلیزێک دەستی بە شێخ مەحموددا نەدەگەیشت. هەموو ئەوئینگلیزانەی لە بەغدا بوون خۆیان لە باڵیۆزخانەی بەریتانی و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا حەشار دابوو، وێڕای ئەوانەی هەر زوو ڕەوانەی حەبانییە کران و لەوێوە بە فڕۆکەی تایبەتی نێررانە هندستان. شۆڕشگێڕان هەمان کات بارەگای باڵیۆزخانەی بەریتانییان خستە ژێر چاودێرییەوەو هەموو پێوەندییەکیان بە دەرەوە بڕی[153].

**چوارەم:** ئینجا با بێینە سەر لێکدانەوەی قسەکانی لۆنگریک. بێ گومان لۆنگریک پیاوێکی زیرەک و شارەزاو خاوەن قەڵەمە، ماوەیەک لە کەرکوک ئەفسەری سیاسی بووەو چەند بەرهەمێکی بایەخداری لەسەر مێژووی عیراق داناوە. بەڵام بە داخەوە هەموو کردارێکی ئینگلیز بە لای لۆنگریکەوە ڕەواو بەجێیە. کەچی هەمان کات زۆر لە بەرزەوە دەروانێتە گەلی عیراق و تایبەت گەلی کورد. کورد لای لۆنگریک دڕندەو دواکەوتووە، بە تەماعە، ڕقی لە تاعەتە[154]. ڕابەرانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد چەتەو ڕێگرن[155]، سمکۆ **«خوێن ڕێژو سەربڕە»**. شێخ ئەحمەد **«نیمچە شێتە»**[156]. لە هەمووانیش زیاتر لۆنگریک ڕقی لە شێخ مەحمودە، ئەوەی خۆی لە خۆیدا جۆرە پاکانەیەکە بۆ شێخی **«بەردە قارەمان»**. شێخ مەحمود بەلای لۆنگریکەوە **«ئاغر نییە»** (غیر متزن)، **«دڵ ڕەقە»**، **«منداڵانە ڕەفتار دەکات»**، لایەنگرانی **«چەتەو خوێن ڕێژن»**، بزووتنەوەکانی **«کەرانەن»**[157]. لای لۆنگریک تەنها ئەو کوردانە پیاوچاکن کە دەستیان لەگەڵ ئینگلیز تێکەڵ

---

(١٥٣) **«مذكرات سندرسن باشا»**، ص ٢٣٦-٢٧٩.

154) S.H.Longrigg, Op. Cit., p. 101.

(١٥٥) بە داخەوە سەلیم تەها تکریتی بەشێک لەم قسانەی لۆنگریکی پەڕاندووە، یان لەبەر خاتری کورد دڵی نەهاتووە وەریان بگێڕێ، بەشێکیشیانی دروست وەرنەگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی. هەرچەندە بە وەرگێڕانی ئەو کتێبەی لۆنگریک خزمەتێکی گەورەی ڕاگەیاندووە. پێویستە ئەوەش بڵێین کە شێوازی نووسینی لۆنگریک قورس و پڕ پێچ و پەنایە. بۆ وەرگێڕانی عەرەبیی ئەو کتێبە بڕوانە: **ستيفن همسلي لونگريگ، العراق الحديث من سنة ١٩٠٠ الى سنة ١٩٥٠، ترجمة وتعليق سليم طه التكريتي، بغداد، ١٩٨٨.**

156) S.H.Longrigg, Op. Cit., pp. 101,103

157) Ibid, pp. 104, 324.

کـردووه[١٥٨]، واتە ئەوانەی بە درێژایی مـێـژووی نوێ و هاوچەرخ لە سـەنگەری دوژمنانی گەل و خۆفرۆشاندا بوون.

لەگـەڵ هەمـوو ئەوانەشـدا لۆنگریگ، وەک لە سـەرەتادا وتمان، تەنهـا ئەوەندەی نووسیوە کە گوایە شێخ مەحمود دوای گەڕانەوەی بۆ خۆی **«باسی ئەوەی کردووە»** کە **«نیازی هەیە هێز بۆ پشتگیریی بەریتانییەکان ئامادە بکات»**. ئەم قسـەیە تەواو ڕێی تێ دەچێ، ئەی گـوایە دوای ئەوەی رابەرانی راپەڕینی مـایس هەمـوویان هەڵهاتن و ئینگلیز دەستیان بەسەر هەموو عیراقدا گرتەوە دەبوو شێخ مەحمود بڵێ من بۆ شەڕی ئینگلیز هاتوومەوە. فەردریکی گەورەی پاشای پروسیا (١٧٤٠-١٧٨٦) کاتی خۆی ئامـۆژگارییـەکی باشی داوەتە سیاسـەتکاران: **«کەی راستی باش بوو بیڵێن، کەی درۆش پێویست بوو بیکەن»**.

لۆنگریگ بۆ خۆی، چونکە باوەڕی بەو قسانەی شێخ مەحمود نییە، ئەو بەشەی لێ خسـتـوونە نێـوان دوو کەوانی بچـووکەوە کـە تێـیـدا دەڵێ **«بۆ پشـتـگـیـریی بەریتانییەکان»**. واتە ئەو قسانە بەم جۆرە چاپ کراون:

شێخ مەحمود کە لە بەغداڕا هەڵهات و گەیشتەوە سلێمانی کەوتە باسی ئەوەی نیازی هەیە هێز بۆ **«پشتگیری بەریتانییەکان»** ئامادە بکات[١٥٩].

وەک ئاشکراشە نووسەران ئەو جووت کەوانە یا بۆ وەرگرتنی دەقی قسـە، یا لە کاتی گوماندا بەکاریان دێنن. دوودڵی و گومان و تەنانەت گاڵتە پێکردنیش ئاشکرا بە جۆری داڕشتنەکەی لۆنگریگەوە دیارن.

**پێنجەم:** ئەو بەڵگە تایبەتی و نهێنییانەی ئینگلیز کە تاوەکو ئێستە من دیومن، ژمارەشیان کەم نییە، باسی ئەوە ناکەن شێخ مەحمود بە فیتی ئینگلیز گەڕابێتەوە کوردستان. دیارە ئەوانەی وەک لۆنگریگن لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو جۆرە بەڵگانەن، هەر بۆ خۆیشـیـان دانەریانن و دوایی ناوەڕۆکیـان لەناو بەرهەمـەکـانیـاندا بە زەقی ڕەنگ دەداتەوە. خـۆ ئەگـەر لە دوارۆژیشـدا بەڵگەیەکی ئەوتۆ دۆزرایەوە پێم وایە خۆی لە خۆیدا نابێـتـە هۆی سـەلمێنەری تەواوی ئەو کـارە. راسـتـە بەڵگەی نهێنی

---

(158) Ibid, pp. 144, 146.
(159) Ibid, p.295.

سەرچاوەیەکی رەسەنی گرنگە، بەڵام جۆری خوێندنەوەی و تێگەیشتنی لەو کەمتر نییە. وەک بەڵگە لێرەدا دوو نموونە دێنمەوە:

ئەو عەبدولواحید الحاج سکرەی وتمان بە دڵسۆزی لایەنی راپەرینی مایسی گرت و لەسەر ئەوە گیرا، بەپێی بەڵگەیەکی نهێنی بەریتانی گوایە **«سوێندی خواردووە هەرگیز هیچ دژی ئینگلیز نەکات»**[١٦٠]. لە راپۆرتێکی نهێنی ترد رەشید عارفی کورد کابرایەکی بەلشەفییە[١٦١]، هەرچەندە ئەو پیاوە لە راستید هەستی کوردایەتی هەبووەو سەرەتای چلەکان مەیلی بە لای نازییەکاندا زیاتر بوو وەک لە بەلشفییەکان.

هەموو دەیزانین سیاسەت یارییەکی وردەو درۆو هەڵخەڵەتاندن و پاشگەز بوونەوە یەکێکن لە مەرجەکانی. وەک وتمان ژیان شێخی ئێمەشی کەمێک فێری ئەو جۆرە یارییە کردبوو. ئەو وەرسی دەربەدەری و دەسبەسەری بوو، عەوداڵی بۆن و بەرامەی شاخ و داخ بوو، دەیویست هەرچۆن بێ بگەڕێتەوە. لێرەدا چەند قسەیەکی ئەدمۆندس دێنمەوە کە بایەخیان بۆ ئەم باسە زۆرە.

ئەدمۆندس کاتێک راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراقی بووەو دەستی زۆر رۆیشتووەو ئاگای لە گەلێک شتی نەبینراو بووە، لە خاڵی شەشەمی راپۆرتێکی نهێنی خۆیدا کە بە ناوی **«رووسیاو کورد»**ەوە رۆژی ١٥ی شوباتی ساڵی ١٩٤٠ ناردوویە بۆ باڵیۆزخانەی بەریتانی لە بەغدا، ئەم قسانەی نووسیوە:

**« دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم هەواڵم دەربارەی لیژنەیەک لە سلێمانی بۆ دەهات کە گوایە نیازی هەیە پێوەندی لەگەڵ رووسیا دامەزرێنێ. ژمارەیەک لەوانەی ناویان دێ، هەموویان نا، لەو کەسانە نین پەیوەندییان بە رەفتاری واوە هەبێ. لە هەموان زیاتر شێخ مەحمود، یان ئەوانەی دەیانێرێتە لام، ئەم جۆرە دەنگوباوە بڵاودەکەنەوە. هەندێک لەو راپۆرتانەی لەم بارەوە پێمان دەگات لە مەلا حسەین ناوێکی خەڵکی هەڵەبجەوەیە کە ئێستە دانیشتووی کەرکووکە، بەڵام ئەو کابرایە بزێوە، جێی بڕواو متمانە نییە. رۆژی ١٣ی شوبات شێخ مەحمود بۆ خۆی هاتە لام و گەلێک**

---

160) PRO, AIR,23/5933,XM-7055.
161) PRO, Foreign Office, 371/ 24560.



**روو و پشتی وێنەی فەهمی سەعید ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٦ لە بەغدا گیراوە «٥» مانگ بەر لە راپەڕینی مایس بەختی خۆی پێشکەشی مەحمود سەلمانی کردووە**

سوپاسی یەزدانی کرد چونکە هەرچی ئەو وتبوونی لەو رۆژەوەی ئێستگەی یەرێڤان باسی گەیشتنی سکاڵانامەی کوردی عیراقی کردبوو، راست دەرچوون. دوای هەموو بیدەنگییەکیش لەگەڵ خۆی، یان ئەوانەی ئەیناردن، شێخ مەحمود زۆر بە گەرمی داوای دەکرد رێگەی بدەین بگەڕێتەوە سلێمانی، چونکە گوایە(بە قسە خۆی -ک. .) هەر ئەو دۆستمانەو دەتوانین پشتی پێ ببەستین و هەمیشە دڵسۆزانە خزمەتی کردووین و خزمەتمان دەکات و لەو جۆرە قسانە. پێم وایە شێخ مەحمود، هەرچەندە ئیدیعای پیرێتی دەکات و دەڵێ تاکە هیوای ئەوەیە بە هێمنی لە ماڵی خۆیدا بژی، بەڵام لەو وایە هێشتا پیاوەکەی ساڵی(١٩٢٢)ە، ئەو کاتەی دوای ژێرکەوتنی راتیکۆل[١٦٢] نێررایەوە سلێمانی تاوەکوو بەربەستێکی کوردی بەرانبەر تورکەکان[١٦٣] دروست بکات. لە شێخ وایە ساڵی ١٩٤٠یش هەمان دەوری پێ دەسپێردرێ، بۆیەکا هەوڵ دەدات چەند دەتوانێ هێند کەڵک لە ئەفسانەی بزوتنەوەی سەر بە رووسیا لە کوردستاندا وەربگرێ»[١٦٤].

یارییەکەی شێخ مەحمود لەم بەڵگەیەدا کە تەنها ساڵێک و سێ مانگ بەر لە

---

(١٦٢) مەبەستی ئەو هێزەیە کە بۆ دەرکردنی هێزەکانی ئوزدەمیر پاشای ئەفسەری کەمالی ئینگلیز ناردیانە ناوچە کوردەوارییەکانی نزیک رانییەو رەواندوز.

(١٦٣) مەبەستی کەمالییەکانە کە ئەوساکە خۆیان بە دۆستی کورد لەقەڵەم دەداو شێخ مەحمود لە نزیکەوە دژی ئینگلیز هاریکاریی لەگەڵ دەکردن.

(164) PRO, F.O., 371/ 24560.

راپەڕینی مایس نێرراوە، زۆر دیارە. شێخ مەحمود هەر بۆ ئەوەی ڕێگەی گەڕانەوەی بدرێتێ ئینگلیزەکان بە سۆڤیەت و پرۆپاگەندەی ئەوان دەترسێنێ و تەنانەت شت دروست دەکات و خەڵک دەنێرێتە لای ئینگلیز، وا دەزانێ جارێکی تر وەک ساڵی ۱۹۲۲ دەیانخەڵەتێنێتەوە، ئەو ساڵەی بروایان پێ کردو لە هەنجامەوە هێنایانەوە. کەچی لە بریتی ئەوەی چەک دژی کەمالییەکان هەڵبگرێ کەوتە هاریکاری لە گەڵیان بۆ بەربەرەکانیی ئینگلیز. داخەکەم ئەو خورمایەی شێخ خواردبووی دەنگەکەی بە پوختی لە گیرفانی ئینگلیزدا بوو. ئەوەتا لە هەمان بەڵگەدا ئەدمۆندس دەڵێ:

**«هەرچەندە قسە دەربارەی پرۆپاگەندەی رووس زۆرە، بەڵام من لەو باوەڕەدام تاوەکوو ئێستە (ناوەندی شوباتی ۱۹٤۰) هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەر دەربارەی ئەو پرۆپاگەندەیە، یان هەر چالاکییەکی تری لەو جۆرە بەدەستەوەیە نییە... پێم وایە ئەو پرۆپاگەندەیە یان لە لایەن ئەو بزێوە بێزارانەوە دروست کراوە کە ناویان لە خاڵی حەوتەمدا هاتووە، یان دەستکردی کەسانی وەک شێخ مەحمودە کە بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان دەیانەوێ بڵاوی بکەنەوە...»**[١٦٥].

شایانی باسە بەپێی ڕاپۆرتەکەی ئەدمۆندس لایەنگرانی شێخ مەحمود کە ئەو جۆرە پرۆپاگەندەیەیان بڵاوکردۆتەوە ئەمانە بوون: بە رادەی یەکەم شێخ قادری برای و حەماغاو تۆفیق قەزازو مەلا صدیقی حاکم و شێخ محەمەدی خاڵ و حامی بەگی جاف و بە رادەی دووەم شێخ عەلادینی هەورامان و عەلی حاجی صالح کە بە عەلی کاتب ناسراوەو عەلی غالب و حازم بەگی زاخۆیی و شێخ عەونیی دانیشتووی گوندی سەرکانی[١٦٦]. ئەوانەش کە لە خاڵی حەوتەمی ڕاپۆرتەکەدا بە ناوی «بزێوە بێزار»ەوە ناویان هاتووە حەوت کەسن کە دوانیان کوردن: یەکەمیان رەشید عارف و دووەمیان دوکتۆر رەفیق کۆیی کە مەبەستی دوکتۆر رەفیق تایەر چەلەبییە[١٦٧].

**شەشەم:** شێخ رەوفی کوڕی شێخ مەحمود یەکێک بوو لەو ئەندامانەی ئەنجوومەنی نوێنەران کە لە کۆبوونەوەی لابردنی (عبدالاله)دا ئامادە بوو، دەنگی بۆ

(165) Ibid.
(166) Ibid.
(167) Ibid.



لابردنی ئەوو دانانی شەریف شەرەف دا[١٦٨]، هەرچەندە ئەویش دەیتوانی، وەک ژمارەیەک لە ئەندامە کوردەکانی تر، بەشداری ئەو کۆبوونەوەیە نەکات. لەوەیش گەلێک گرنگتر: بەشێکی زۆر لەو کوردانەی دوای دامرکاندنەوەی راپەڕینی مایس گیران یان خزم و نەوەی شێخ، یان لە لایەنگرانی بوون. بابە عەلیی کوڕی یەکێک بوو لەو گیراوانەو ناویشی لە لیستەکەی مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنیدا هاتووە(بڕوانە پەراوێزی ژمارە١٢٥). دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی کە دۆست و برادەری بابە عەلییەو لە دوو سەرەوە بە خزمایەتی پێک دەگەنەوە، دەڵێ ئەوساکە بابە عەلی زۆر لە ئینگلیز داخ لە دڵ بوو، بە توشوستییان گەشەدار دەبوو[١٦٩]. شایانی باسە بابە عەلی لە گەرمەی ئەو هەراو بگرەی رێگەی بۆ تەقینەوەی راپەڕینی مایس خۆش کرد وتارێکی لە «گەلاوێژ»دا دەربارەی «سەربەستی» بلاوکردەوە[١٧٠]. لەو

(١٦٨) ئەو ئەندامە کوردانەی لەو کۆبوونەوەیەی پەرلەماندا ئامادە بوون و دەنگیان بۆ لابردنی عبدالاله دا ئەمانە بوون: ئەحمەد عوسمان، جەمال بابان، حازم شەمدین ئاغا، حوسێن مەلا دزەیی، خالید نەقشەبەندی، دارا داودە، داود جاف، شێخ رەوفی شێخ مەحمود، صدیق میران قادر، عەبدوڵلا بریفکانی، عەلی دزغرەمەچی و فایق تالەبانی بڕوانە: «العالم العربي»، ١١ نیسان ١٩٤١.

(١٦٩) دیدەنی لەگەڵ دوکتۆر ئیبراهیم حیلمی، رۆژی ٣١ی کانوونی دووەمی ١٩٨٩.

(١٧٠) وتارەکە هی جۆن ستیوارت ملە، ئەو کردوویە بە کوردی. یەکەم وتاری بلاوکراوەی ئەو ژمارەیەی «گەلاوێژ».

وتارەدا بابە عەلی دەڵێ: **«راستی تێکڕا لەو ڕێ سەختەوە دست ئەکەوێت کە هەرچی ناحەزن بەرەلا بکرێن، هەرکەس بەرەو ئامانجی خۆی پەلامار بدات»**[171].

شێخ جەلالی شێخ ئەحمەدیش، کە یەکێک بوو لە گیراوەکان، ئامۆزای شێخ مەحمودە. شێخ رەوفی شێخ صالحیش، کە برادەری بابە عەلی بوو، بە خزمایەتی دەگاتەوە شێخ. ناوی ئەمانیش لە لیستەکەی حەسەنیدا هەیە.

**حەوتەم:** شێخ مەحمود تاکە ناسراوی عێراق نەبوو کەڵکی لەو بارودۆخە راپەڕینی مایس هێنایەکایەوە وەرگرت و لە دەسبەسەری خۆی قوتار کرد. حیکمەت سلێمانی سەرەک وەزیرانی رۆژگاری کۆدیتاکەی بەکر صدقیش ئەو کاتە لە سلێمانی دەسبەسەر بوو، راپەڕینی مایسی بە هەل زانی و هەڵهات بۆ ئێران بێ ئەوەی کەس بۆی بکات بە قسە. حیکمەت سلێمان دوای دامرکاندنەوەی راپەڕینی مایس و دەرچوونی بڕیاری لێ خۆش بوونی لە ١٢ی تەمووزی ١٩٤١دا بە ماوەیەک گەڕایەوە بەغدا[172].

**هەشتەم:** دوا جار نورەی گەورەترین بەڵگەی سەلمێنەرە بۆ ئەوەی کە شێخ مەحمود نە دەبێ و نەدەشێ بە فیتی ئینگلیزو هاندانی ئەوان گەڕابێتەوە... بەڵام گریمان وابوو، شێخ بە فەرمانی ئینگلیز بۆ بەرهەڵستی راپەڕینی مایس گەڕاوە کوردستان! ئەی کە ئینگلیز سەرکەوتن و وەصی و دەستەو دایەرەی گەڕانەوەو وڵات هەمووی خامۆش بۆوە بۆ چ دیسان شێخی **« ئاڵقە لە گوێ»** چەکی دانەناو نەگەڕاوە بەغدا، یان هەر شوێنێ ئینگلیز بیەوێ؟ بۆ چ وەصی و جەمیل مەدفەعی سەرەک وەزیران کە هەردووکیان بە دڵ پیاوی ئاڵقە لە گوێی ئینگلیز بوون، ناچار بوون پەنا بەرنە بەر چەک دژی هەر ئەو شێخ مەحمودەی گوایە هەمان جەمیل مەدفەعی کاتی خۆی هانی دابوو هەڵ بێ؟. ئەفسوس لای ژمارەیەک مێژوونووسی عەرەب هەر ئەوەندە کار گەیشتە ئاستی کورد تەنانەت یەکێکی وەک جەمیل مەدفەعیش دەبێتە پاڵەوان و نیشتیمانپەروەر.

---

(١٧١) **«گەلاوێژ»**، ژمارە ١-٢، ساڵی دووەم، کانوونی دووەم و شوباتی ١٩٤١، ل ٢-٨.

(١٧٢) **«العالم العربي»**، ١٣ تموز ١٩٤١.

(١٧٣) دەربارەیان بڕوانە:

**«الوقائع العراقية»** (جريدة)، بغداد، ١٩ تموز و ٣١ آب ١٩٤١؛ **«الأخبار»**، ٢٥ و ٢٧ و ٣١ تموز و



پوختـەی ڕووداوەکـانی کـوردسـتـان دوای دامرکـاندنەوەی ڕاپەڕینی مـایس بەم جۆرەبوو:

شێخ مەحـمود لە مـانگی حوزەیرانی سـاڵی ١٩٤١وە دیسـان پەنای بردەوە بەر چەک و دایەوە شاخ بۆ خودموختـاری. جەمـیل مەدفـەعی کە بە پێشنیـاری ئینگلیـز یەکەم وەزارەتی دوای ڕاپەڕینی مـایسی دامـەزراند، هەوڵی دا لە ڕێگەی(مـحـمـد امین العمری)ەوە، کە ئەوساکە سەرەک ئەرکانی سوپا بوو، قەناعەت بە شێخ بکات واز بێنێ و بگەڕێتەوە بەغدا. هەوڵدانی مسـتـەفـا قەرەداغیش، کە تازە کـرابووە متصرفی سلێمانی، بۆ جێ بەجێ کردنی هەمان مەبەست سەری نەگرت. دوای ئەوە وەزارەتی جەمـیل مـەدفـەعی بڕیاری دا بە زەبری چەک کـۆتایی بە بزوتنەوەی نوێی شێخ مەحـمود بهێنێ، لەشکری بۆ ئەو مـەبەسـتـە ئامـادە کـردو، بانگی عـورفی لە

---

٢٢ و ٢٥آب ١٩٤١.

سلێمانی و دەوروبەری داو، گەلێک هەنگاوی تری نا[173] کە قەناعەتیان بە شێخ کرد دەرەقەت نایە بۆیەکا ناچاربوو بەوە قایل بێ وازی لێ بهێنن لە گوندی( **داری کەلی**)ی نزیک سلێمانی نیشتەجێ بێ بەو مەرجەی رێگەی بدرێ نوێژی جومعان لە مزگەوتی گەورەی شار بکات، شێخ لەتیفی کوڕیشی کردە بارمتە لای میری.

راستییەکەی لەوانە بوو نە ئینگلیزو نە جەمیل مەدفەعی بەم نیمچە رێککەوتنە قایل نەبوونایە گەر ئەو بارودۆخە تازەیە نەبوایە کە هێرشی ئەڵمانیای نازی بۆ سەر وڵاتی شورەوی و دابەزینی لەشکری سوور بۆ ناو خاکی کوردستانی ئێران هێنانییە کایەوە. لەوکاتەوە ئینگلیزەکان نەیاندەویست کوردی عیراق بوروژێ، چونکە باش لەوە تا دێ لە خۆیان دور دەکەونەوە، **لە دۆسیەی ژمارە چواری بەشی ژمارە چواری ئەرشیفی پارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجانی سۆڤیەتیدا ناوەرۆکی نامەیەکی گرنگی شێخ مەحمود هەڵگیراوە کە ئەو دەوروبەرە لە رێگەی حاجی بابە شێخەوە ناردوویە بۆ قازی محەممەدو بۆ ئەم باسە بایەخی خۆی هەیە.** لەو نامەیەدا شێخ بە توانجەوە باسی ئینگلیز دەکات و خۆزگە بە قازی محەممەد دەخواو لێی دەپاڕێتەوە دەسبەرداری شورەوی نەبێ و **«بەوادەی شیرین و درۆو دەلەسەی»** ئەوانە نەخەڵەتێ **«کە چاکیان دەناسێ»**، ئەوانەی دەیانەوێ کورد هەمیشە **«ئالەت بێ بە دستیانەوە»**.

لە کۆتاییشدا دەڵێم زۆر بە داخەوە تۆمەت دانە پاڵ نیشتیمانپەروەران بۆتە کارێکی ئاسایی و وێردی سەر زمانی زۆر کەسان. هیچ دوور نەڕۆین گەلێک تۆمەت دراوەتە پاڵ ئەو چوار ئەفسەرەی رابەری راپەڕینی مایس بوون و بەوە تاونبارکراون گوایە خۆیان بە زێڕی ئەڵەمانیای هیتلەری فرۆشتووە، هەر لەوەشەوە دەنگوباوی «Golden Square» واتە **(چوارگۆشەی زێڕین)** داکەوت[174]. هەرچەندە راستە ئەو ئەفسەرانە سیاسیی باش و هەمیشە دووربین نەبوون، بەڵام نیشتمانپەروەری دڵسۆزو خاوێن بوون بۆیەکا ئینگلیزو دەستەو دایەرەی ئینگلیز لەناویان بردن.

---

**(١٧٤) «مذكرات سندرسن باشا...»، ص٢١٢-٢٣٩.**

# چەند راستییەکی نوێ دەربارەی شوێنی کورد لە راپەڕینی مایسی ١٩٤١ دا

لەبەر ئەوەی زۆر لایەنی مێژووی گەلی کورد بێ دەستکاری ماوەتەوە بۆیەکا هەر ئەوەندە مێژوونووس توخنی باسێک کەوت دەرگا ئاوالەو زانیاری ون ئاشکرا دەبێ. دوای ئەوەی لە وتاری **«لاپەڕەیەکی ون لە مێژووی خەباتی شێخ مەحمود(**)»** باسی شوێنی گەلی کوردمان لە راپەڕینی مایسدا کرد، چەند زانیارییەکی نوێمان لە خەڵک و سەرچاوەی جیاوازەوە پێ گەیشت کە تۆمارکردن و لێکدانەوەی بەشێکیان بە پێویست دەزانین تا لە فەوتان رزگاریان بکەین و هەمان کاتیش باشتر لە شوێنی کورد لەو راپەڕینەدا تێ بگەین.

بەشێک لە زانیارییەکانی ناو ئەم وتارە بۆ روون کردنەوەی زیاتری پێوەندی نێوان شێخ مەحمودو فەهمی سەعیدە، ئەو باسەی بایەخی تایبەتیی خۆی هەیە بۆ دەستنیشان کردنی هەڵوێستی راستەقینەی شێخ مەحمود کە هەن دەیانەوێ بە زۆری زۆردارەکی بیکەنە داردەستی ئینگلیزو فەرمانڕەوایانی رژێمی پاشایی. لەو شوێنەی وتارەکە بەپێی پێداویستی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و بە مەبەستی دەست نیشان کردنی لایەنە سەلمێنەرەکان و لەبەر هۆی تر ناچار بووین بگەڕێینەوە سالانی پێش بەرپابوونی راپەڕینی مایس و لێکدانەوەی هەندێک باس کە پێوەندییان بە سروشتی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمودەوە هەیە.

---

(*) لە گۆڤاری **«رۆشنبیری نوێ»**ی ژمارە (١٢٣)ی رێکەوتی ئەیلولی ١٩٨٩، لە ل (١٥-٢٧)دا بلاوکراوەتەوە.

(**) ئاماژەیە بۆ بابەتی حەفتەمی بەشی یەکەمی ئەو کتێبە کە لە ل (١١٥، ١٦٤) دەیخوێنیتەوە.

دیاره بەشداری بوونی فراوانی جەماوەری کوردستان لە ڕاپەڕینی مایسدا کارێکی ئەوتۆی کرد ئینگلیزو لایەنگرانی ئینگلیز پەنا بەرنە بەر هەر ڕێگەیەک بۆی هەبێ کوردی لێ بتەکێننەوە. بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم مەبەستە فڕۆکەکانی ئینگلیز بە ناوی وەصییەوە گەلێک بەیاننامەیان بە زمانی کوردی بەسەر دانیشتوانی شارو شارۆچکەکانی کوردستاندا بلاوکردەوە. لەم دواییەدا وێنەی یەکێک لەو بەیاننامانەمان دەست کەوت کە لە ناو دۆسییەکانی **«وەزارەتی ناوخۆ»**دا لەگەڵ بەڵگە تایبەتییەکانی کۆشکی پاشایی لە کتێبخانەی نیشتیمانی هەڵگیراوە[1].

بەیاننامەکە، کە بە ناوی وەصییەوە بلاوکراوەتەوە، ڕۆژو مانگی چاپی بەسەرەوە نییە، بەڵام بە ناوەرۆکیدا دیارە کە دەبێ دەوروبەری کۆتایی مایسی ساڵی ١٩٤١ چاپ کرابێ و بلاوکرابێتەوە، چونکە بەیاننامەکە لە بەندی سێیەمیدا بە ناوی وەصییەوە دەڵێ **«... من ئەوا ئەگەڕێمەوە»**. ئینگلیزەکان و دەستەودایەرەشیان کاتێک کەوتنە باسی گەڕانەوەی وەصی کە خۆری ڕاپەڕینی مایس بە خێرایی کەوتە ئاوابوون.

ئەوەبوو ئینگلیزەکان دەستوبرد کەوتنە خۆ، چونکە سوور بوون لەسەر ئەوەی بە زووترین کات ڕاپەڕینی مایس دابمرکێننەوە. لەو بروسکە تایبەتییەیدا کە چەرچلی سەرەک وەزیران دەربارەی ڕووداوەکانی عیراقی ئەو ڕۆژگارە ڕۆژی ٢٠ی نیسانی ١٩٤١ ناردوویە بۆ وەزیری هەندەرانی بەریتانیا بێ پێچ و پەنا گوتویە **«گەی پێویست بوو دەبێ تا ئەوپەڕی هێز بەکار بهێنین»** بۆ لێدانی ئەو ڕاپەڕینە[2].

بەر لەوە کاربەدەستە سەربازییەکانی ئینگلیز کەوتبوونە جێ بەجێ کردنی ئەم فەرمانە. پێش تەواو بوونی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤١ دوو جاران هێزی خۆیان هێنایە بەسرەو دەوروبەرییەوە. لە فەڵەستینیشەوە هێزیان بەرەو حەبانییە خستە ڕێ. هەرچەندە هێرشی فڕۆکە عیراقییەکان کەمێک پێشکەوتنی ئەم هێزەی

---

(١) دار الكتب و الوثائق(د. ك. و.)، الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي، رقم الملف ١٦٣، عنوان الملف: **«الحرب العراقية البريطانية»**، الوثيقة رقم ٤٠.

(2) W.S.Churchill , The Second World War ,Vol.3, London, 1950,P.225.

ندای وصی عرش عراق بوخلق نجیب عراق

١ — كومه لى له پلپه كان عسكرى له ژير رياست [illegible] و چند كسيكى اكل [illegible] كه به پاره ى بيگانه وه دوژمن كراون [illegible] بزور سلاح له مال خوم جيايان كرد وله ئداى واجبات مقدسه وسايت كور خونكم [illegible] خوشويست خوتان دوريان كرد

ئم كومه له فتنيا بهزار دوو [illegible] عراقيهان تسليم كرد

٢ — نتيجه ى ئم حيله بازى ودوركردنه لرض مقدس عراق له دستى ك ف بو كورنا وبوه ساحه يك جنك وجدال

٣ — واجبانى من ئاشكرا ، من ئوا اكريوه كه حق استرجاع شرف وطن خوتان بكم وبوجارى دوهين له ژير سايه حكومتى كه شرعى بو وطن عزيزمان ام وظيفه وسائق پيغمبرى تطبيق بكم

٤ — ايستا من حو كوره كان شعبى عراق دعوت ائم كه ام شرذمه [illegible] كان دور بكهن واعاده حريت واستقلال خويان تأمين بكهن

٥ — اى كوره كان عزيزم عسكره كان بكرينه جى خوتان بسلام ، والنظار اعادة حيات فاروق واستقلال [illegible] خوتان بكهن ، ولمس جلالة ملك فيصل الثانى

وصى عرش عراق

عبد الاله

دواخست، بەلام تا ڕۆژی حەڤدەی مایس گەیشتە بنکەی حەبانییە.

لە ڕۆژی دووی مایسەوە جەنگ لە نێوان لەشکری عیراقی و هێزەکانی ئینگلیز لە حەبانییەوە دەستی پێ کرد. دوای نیوەڕۆی هەر ئەو ڕۆژە ئینگلیزەکان هێزەکانی لەشکری عیراقییان ناچار کرد لە بەسرە بکشێنەوە. ڕۆژی حەوتی مایس شاری عەشاریشیان گرت. لە ڕۆژی نۆزدەی مایسەوە هێرشی گەورەی ئینگلیز بەرەو فەلوجەو بەغدا دەستی پێ کرد. هەر ئەو ڕۆژە هێزەکانی لەشکری عیراق ناچار بوون لە فەلوجەو دەورویەری بەرەو بەغدا بکشێنەوە. دوای دوو ڕۆژ هێزەکانی ئینگلیز شاری فەلوجەیان داگیرکرد، هەوڵی دەرکردنی ئینگلیزەکان لە فەلوجە بە کوشتن و بریندار بوونی ٢٧٣ سەربازو ١١ ئەفسەر بە فیڕۆ چوو[٣].

(٣) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە:

کشانەوەی فەلوجە پشتی بەرگریی لەشکری عیراقی شکاندو ئەوساکە وەصی و دەستەو دایەرەی لە ئوردونەوە بەرەو عیراق گەڕانەوە. ڕۆژی ٢٥ی مایس وەصی و ژمارەیەک لە سیاسییە بەناوبانگە هەڵاتووەکان بە فڕۆکەی تایبەتی هاتنەوە حەبانییە. ڕۆژی یەکی حوزەیرانیش، دوای ڕاکردنی ڕەشید عالی گەیلانی و سەرکردەکانی تری ڕاپەڕینی مایس، وەصی هاتەوە بەغدا.

بەو جۆرە دەبێ ئەو بەیاننامەیەی وەصی لە ماوەی ئەو حەفتەیەی نێوان بیست و پێنجی مایس و یەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١دا بڵاوکرابێتەوە. وەصی بەر لەوەش دوو بەیاننامەی تری بە زمانی عەرەبی بڵاوکردەوە، یەکەمیان ڕۆژی هەشتی مایس و دووەمیشیان ڕۆژی بیست و چواری مایس لە قودس چاپ کراون[٤]. بەڵام ناوەرۆکی بەیاننامە کوردییەکە لە هیچ کامیان ناکات.

ئەمەش دەقی ناوەرۆکی بەیاننامە کوردییەکەی وەصییە وەک خۆی بڵاوی دەکەینەوە[٥].

**«نیدای وەصی عەرشی عیراقی بۆ خەڵقی نەجیبی عیراق»**

**١- کۆمەڵێ لە عاصییەکانی عەسکەری لە ژێر ریاسەتی ڕەشید عالی و چەند کەسێکی لەگەڵ ئەو کە بە پارەی بێگانەو دوژمن کراون منیان بە زۆری سیلاح لە دیاری خۆم جودایان کردو لە ئەدای واجباتی موقەدەسی وصایەتی کوڕی خوشکم، مەلیکی خۆشەویستی هەموتان، مەحرومیان کرد. ئەم کۆمەڵە ئەشقیایە بە هەزار درۆ ئەفکاری عیراقییەیان تەسمیم کرد.**

**٢- نتیجەی ئەم حیلە بازی و درۆکردنە ئەرزی موقەدەسی عیراق لە نیعمەتێکی تێدا بوو گۆڕاو بووە ساحەیەکی جەنگ و جیدال.**

**٣- واجباتی من ئاشکرایە، من ئەوا ئەگەڕێمەوە کە هەتا استرجاعی شەرەفی**

---

عبدالرزاق الحسني، الاسرار الخفية في حركة السنة ١٩٤١ التحررية، الطبعة الثانية، صيدا ـ لبنان. ١٩٦٤، ص ١٧٢، ١٧٤، ١٨٤، ١٩٧ -١٩٨، ٢٠١.

(٤) دەربارەیان بڕوانە:

عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الخامس، الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨. ص٢٨٨ - ٢٨٩.

(٥) تەنها دەستکاری ڕێنووسەکەیمان کردووە بۆ ئەوەی بە ئاسانی بخوێنرێتەوە.

**وەطەنی خۆمان بکەم و بۆ جاری دووەمین لەژێر. سایەی حکومەتێکی شەرعی بۆ وەطەنی عەزیزمان ئەو رەفاهو سەعادەتەی پێشوو تامین بکەم.**

**٤- ئێستا من هەموو کوڕەکانی موخلیصی عیراق دەعوەت ئەکەم کە ئەم شەرزەمەی عاصییەکان دەربکەن و ئیعادەی حورییەت و ئیستیقلالی خۆیان تامین بکەن.**

**٥- ئەی کوڕەکانی عەزیزم، عەسکەرەکان بگەڕێنە جێی خۆتان بە سەلام، وە ئینتیزاری ئیعادەی حەیاتی قانونی و ئیستیقلالی مەملەکەتی خۆتان بکەن.**

**ولیعش جلاله الملک فیصل الثانی.**

**«وەصی عەرشی عیراق عبدالاله»**

بە ناوەرۆکی ئەم بەیاننامەیەدا دیارە وەصی دەستی بە کوردی زانێکدا نەگەیشتووە بۆیەکا زمانەکەی وا شەق و پەقە. دوور نییە یەکێکی وەک جەمیل مەدفەعی، کە ئەویش بەخێرێ بە رەگەز کوردە، بۆی نووسیبێ. رێشی تێ دەچێ بۆ نووسینی پەنایان بردبێتە بەر سەربازێکی لیوای[٦] کورد، یا ئاشووری کە ئەو ساکە ژمارەیەکیان لە حەبانییە لە ناو هێزەکانی ئینگلیزدا کاریان دەکرد.

دەبێ لەگەڵ دامرکاندنەوەی راپەڕینی مایسدا ژمارەیەکی زۆر لە سەربازی کورد هەڵاتبن، چونکە وەصی لە بەیاننامەکەیدا داوای گەڕانەوەیان دەکات، کەچی ئەو باسە لە دوو بەیاننامە عەرەبییەکەدا نییە. ئەمە زۆر رێی تێ دەچێ چونکە یەکێک لە ئەفسەرە بەشدارەکانی رووداوەکانی ئەو رۆژگارە لە کتێبێکی خۆیدا باسی ئەوەی کردووە چۆن لەگەڵ بەرپابوونی راپەڕینی مایسدا سەربازە هەڵاتووەکانی ناوچەی خانەقی و مەندەلی و دەوروبەریان گەڕاونەتەوە بنکەکانیان لە نزیک حەبانییەوەو لە شەڕی دژی ئینگلیزدا بەشدار بوون[٧]. دیارە ئەوانەو، لەوانەیە هی تریش، لەگەڵ گەڕانەوەی عیراقدا بۆ دۆخی جارانی داویانەتەوە شاخ.

---

(٦) راستەکەی **(لیڤی)**یە، لە**(Levy)** ئینگلیزییەوە وەرگیراوە کە بە مانای سەربازی و سەربازگرتن و کۆکردنەوەی سەربازو ئەو جۆرانە دێ. کاتێک ئینگلیزەکان عیراقیان داگیرکرد هێزی لیڤییان دامەزراند کە کوردو عەرەبیش تێیدا بەشدار بوون، بەڵام زۆربەیان ئاشووری بوون. لیڤی داردەستێکی خراپ بوو بۆ لێدانی نیشتمانپەروەران. دوای وەرگرتنی سەربەخۆیی بە ماوەیەک ئینگلیزەکان پاشماوەی ئەو هێزەیان بردە بنکەکانیان لە حەبانییەو شوعەیبە.

(٧) محمود الدرة، الحرب العراقية البريطانية ١٩٤١، بيروت، ١٩٦٩، ص٢٩١.

شایانی باسە لە ئەفسەرانی کورد عیزەت عەبدولعەزیزو مستەفا خۆشناو لەو شەڕەی نزیک فەلوجەدا بەشدار بوون. مستەفا خۆشناو یەکێک بوو لەو بیست و سێ ئەفسەرەی لەو شەڕەدا لە لایەن ئینگلیزەوە بە دیل گیران. هەمووش دەیزانێ چۆن بەسەریەکەوە چەند ساڵێکی نەخایاند کاتێک ئەم دوو رۆڵە نیشتمانپەروەرەی نەتەوەی کورد وەک سەردارانی راپەڕینی مایس لەلایەن دوژمنانی گەلەوە هەڵواسران. ئەمە بۆ خۆی دەرسێکی مێژوویی گەورەیە بۆ ئەوانەی بە داخەوە لە مێژوو ناگەن، یا بە ئەنقەست فەرامۆشی ئەکەن.

هەن لەوە دوو دڵن کە چۆن دەشێ فەهمی سەعید هەموو هاوەڵەکانی دەربارەی رێککەوتنەکەی خۆی لەگەڵ شێخ مەحمودا ئاگادار نەکردبێ. دیسان دەڵێن ئەو کارە شتێکی سەیر نەبوو بۆ گێژاوی ئەو پاشاگەردانییەی سەرکردایەتی راپەڕینی مایسی تێکەوتبوو. جگە لەوە شێخ مەحمود، وەک گەلێ کوردی تری ناسراوی ئەو رۆژگارە دڵی لە سەلاحەدین صەباغ کرمێ بوو، ئەوانەی مەحمود الدرە بێ ناو هێنان بە تایبەتی باسی کردوون. الدرە دەڵێ **«ژمارەیەک لە سەردارانی کورد لەناو ریزەکانی لەشکرو لە دەرەوەی لە(صەباغ) دڵنیا نەبوون»**[8].

وێڕای ئەوە فەهمی سەعید پیاوێکی مەندو نهێنگر بوو، زۆریش باوەڕی بە راوتەگبیری خۆی بووە. لەم بارەیەوە سەلاحەدین صەباغ نووسیویە دەڵێ:

**«فەهمی... پێ داگرە لەسەر رای خۆی، بە زانینی خۆیەوە دەنازێ، هەرچەندە لە توانای زیاترە»**[9].

سەرباری ئەو بەڵگەو ڕاستییانەی جاری پێشوو باسمان کردن بەڵگەیەکی مێژوویی ونی تەنانەت لەوانیش گرنگتر بە دەستەوەیە کە بۆچوونی رێککەوتنی شێخ مەحمودو فەهمی سەعید زیاتر دەسەلمێنێ. بایەخی یەکەمی ئەو بەڵگەیە لەوەدایە کە پێوەندیی دێرینی نێوان ئەو جووتە نیشان دادەت و دەیگێڕێتەوە دەوروبەری کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۲۸، واتە سیازدە ساڵ و چوار مانگی رەبەق بەر لە بەرپابوونی راپەڕینی مایسی ۱۹٤۱ گەر مانگی نیسان بکەینە سەرەتای.

---

(۸) هەمان سەرچاوە، ل۱۲٦.

(۹) **«مذکرات الشهید العقید الرکن صلاح الدین الصباغ. فرسان العروبة في العراق»**، بلا، ص۲۲.

سەرباری ئەوەی مەودای قووڵی و لایەنی تایبەتیی پێوەندیی ئەو دوو سەرداره به ڕوونی نیشان دەدات. جا با کەمێک بە درێژی بکەوینە لێدوانی بەڵگەی نوێمان.

دوای شەڕی دەربەندی بازیان (حەڤدەی حوزەیرانی ۱۹۱۹)و بەدیل گرتنی شێخ مەحمود بە برینداری لای «بەردە قارەمان»ەوەو پێشکەش کردنی بە دادگەیەکی تایبەتی کە بڕیاری خنکاندنی دەرکردو دوایی ئەو بڕیاره کرایه ده ساڵ بەندی و سزای ده هەزار ڕوپی[10] و دوای ئەوەی شێخ بە دەسبەسەری نێردرایە دوورگەی هەنجام کە کەوتۆتە کەنداوی عەرەبەوە، ئینگلیزەکان بە نیازی بەرهەڵستی کەمالییەکانی تورکیا لەگەڵ شێخ ڕێککەوتن و ڕۆژی دوازدەی ئەیلولی ساڵی ۱۹۲۲ هێنایانەوە بەغداو لەوێوە ڕێگەیان داین بگەڕێتەوە سلێمانی.

شێخ کە مارانگازی دەستی ئینگلیزو ئاتاجی پشتیوان بوو ئەمجاریان کەوتە هاریکاریی کەمالییەکان کە ئەوساکە وەک یەک ڕزگاریخواو دوژمنی ئینگلیز بوون. ڕێتمی سەربەخۆو دامودەزگای تایبەتی و کابینەی وەزیرانی دامەزراند، ئەوەی لەبەر نەوتەکەی کەرکووک و دڵی عەجەم و هیوای ڕێککەوتن لەگەڵ تورکدا بۆ ئینگلیز دەستی نە ئەدا. هەر لەبەر ئەوەش بەلای ڕۆژنامەی «تایمس»ی لەندەنییەوە گێڕانەوەی شێخ مەحمود لە دەسبەسەری تاکە هەڵەی مەندوبی سامی بەریتانی سێر پێرسی کۆکس بوو کە لە ماوەی دوورودرێژی کاری هەمە جۆریدا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کردی[11].

بۆ ڕاست کردنەوەی ئەو «هەڵە»یە فڕۆکەو زرێ پۆش و لیوی و خۆفرۆش دیسان کەوتنەوە پەلاماردانی شێخ و لایەنگرانی. لە ژێر ئەو فشارەدا شێخ ناچار بوو بەرەبەیانی چواری مارتی ساڵی ۱۹۲۳، واتە ڕۆژێک دوای بۆمبابارانی شاری سلێمانی، بداتەوە شاخ.

---

(۱۰) ڕوپێ ئەو پارە هندییەیە کە ئینگلیز لەگەڵ داگیرکردنی عیراقدا لە بریتی پارەی عوسمانی خستیانە بازاڕەوەو تا دەرچوونی دیناروو وردەی عیراقی لە ساڵی ۱۹۳۲دا مایەوە. بەپێی نرخی بانق هەر سەدهەزار ڕوپێ دەیکردە ۷٤٤۸ پاوەنی ئیستەرلینی، واتە ڕوپێیەک نزیکەی ۷٥ فلس بوو، تا پەنجاکانیش لە ناو کوردەواریدا ڕوپێ وەک ناوی پارە بەکار دەهێنرا، دەگوترا نرخی ئەو شتە دوو یا سێ یا چوار ڕوپێیە.

(۱۱) بڕوانە: Zaria Vostoka, "28. v.1931"

لەوساوە نیشتمانپەروەرانی کورد بە رابەری شێخ مەحمود کەوتنەوە زۆرانبازی لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیزدا کە بێ بەزەیی دەستیان دەوەشاند. فرۆکەکانی ئینگلیز خاکی کوردستانیان کردە شوێنی تاقی کردنەوەی چەک و تفاقی نوێ[12]. هەرچەند ئینگلیز بەو جۆرە توانییان شێخ و لایەنگرانی سەرەتا لە جاسەنەو دەوروبەری و دوایی لە پێنجوینیش دەرپەڕێنن، بەڵام ئەوە نەبووە هۆی تەواوبوونی بەرگریی ئازادیخوایانی کورد. لەبەر ئەوە داگیرکەران ناچاربوون دیسان پەنا بەرنەوە بەر گفتوگۆ.

دوای چەند دیدەنی و هاتووچۆیەک و دوای ئەوەی شۆڕشگێران بۆ دوا جار رۆژی بیستی نیسانی ساڵی ١٩٢٧ پێنجوینیان لەدەست چوو شێخ مەحمود ناچار بوو لە ناوەندی حوزەیرانی هەر ئەو ساڵەدا رێککەوتننامەیەک لەگەڵ میری مۆر بکات کە بەپێی بەندەکانی پەیمانی دا لە گوندی پیرانی کوردستانی ئێران نیشتەجێ بێ و بێ رەزامەندی کاربەدەستان نەیەتە ناو خاکی عیراقەوەو دەست نەخاتە کاروبارییەوە. بەرانبەر گێڕانەوەی موڵکەکانی و رێگەدان بە گەڕانەوەی ژمارەیەک لە لایەنگرانی و ناردنی بابە عەلیی کوری بۆ خوێندن لە بەغدا کە دیارە کاربەدەستان ویستوویانە بیکەنە نیمچە بارمتەیەک.

هەمووی چەند مانگێکی نەخایاند کاتێک شێخ مەحمود لەم نیمچە رێککەوتنە. کە بۆ خۆی بوو نەک بۆ کورد، پاشگەز بۆوە، دیسان خولیای هەڵسانەوەو راپەڕین بۆ مافی کورد داوێتیەوە لە کەلەی. یەکێک لە نزیکەکانی شێخ بۆ مێژوونووسی شارەز عەبدولڕەزاق حەسەنی گێڕاوەتەوە چۆن ئەوساکە شێخ لە نامەیەکی تایبەتیی خۆیە بۆی نووسیوە نیازییە سنوور ببڕێ و دیسان بێتەوە ناو خاکی عیراق ئەگەر زانیویە ئەو کارەی **«دەبێتە هۆی لە سێدارەدانی»**[13].

لەوە دەچێ ئەم هەواڵە بە گەرم و گوڕی گەیشتبێتەوە فەیسەڵی یەکەم. بە دەم و

12) C.J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs. Politics travel and research in North - Eastern Iraq, London, 1957,p.350.

(١٣) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، الطبعة السابعة، بغداد ١٩٨٨، ص١٣٢.



**شێخ مەحمودو ماجید مستەفا**
**لە نیسکەی «شەمەندەفەری کەرکووک» سالی ١٩٢٧**

تووی ئەو ناسیاوەی شێخدا[١٤]، وا دەرئەکەوێ هەر بۆ خۆی هەواڵەکەی بە فەیسەڵ گەیاندبێتەوە، چونکە لە وەڵامی شێخدا بە دڵسۆزی راوێژی کردووە بە تایبەتی تەنگی خۆی بگەیێنێتە ئەو[١٥].

فەیسەڵی یەکەم پیاوێکی دووربین بوو، لەو رۆژانەدا لە سەرانسەری رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاستدا کەم کەس لە سیاسەتبازیدا دەیتوانی شان لەشانی بدا. ئەو ساڵانەش یەکجار بەپەرۆش بوو عیراق هێمن و ئاسوودە بنوێنێ تاوەکو لە **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»**[١٦] بە ئەندام وەرگیرێ. **هەمووی دوو سێ ساڵ لەوەوپێش پەیمانی دابووە ئەو دەزگا جیهانییە گشت داخوازییە رەواکانی گەلی کورد جێ بەجێ**

---

١٤) وا دیارە ئەو ناسیاوەی شێخ مەحمود حەزی نەکردووە ناوی بهێنرێ، بۆیە حەسەنی تا چاپی حەوتەمی **«تاریخ الوزارات»** بە ناوبانگەکەی ئەو ناوەی هەر وا بە نهێنی هێشتەوە، هەرچەندە بە جۆرێکی زیرەکانە، لە ناو دوو توێی قسەکانیدا، پەنجەی بۆ راکێشاوە، چونکە دەڵێ: **«فنصحه هذا المعروف ...»**. کە لێمان پرسی وتی مەبەستم مارف جیاوکە. حەسەنی لە نزیکەوە پێوەندیی لەگەڵ مارف جیاوکدا هەبوو.

١٥) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨، ص١٣٢.

١٦) عصبة الامم.

**بکات.** جا بۆ ئەوەی بەربەستی هەراوبگرێکی نوێ بکات سەرەتای ساڵی ١٩٢٨ بێ ئەوەی ئینگلیز پێ بزانن لە رێگەی فەهمی سەعیدەوە پێوەندی لەگەڵ شێخ مەحمود دەکات. فەیسەڵی یەکەم کرداری وای کەم نەبوو. ئەو هەنگاوەش پێویست بوو، چونکە ئینگلیزەکان هێمنی عیراقیان وەک ئەو مەبەست نەبوو، ئەوێ دەیانویست قەیمومەتی[١٧] خۆیان رۆژێک زیاتر درێژە بسێنێ.

لە هەموو روویەکەوە فەهمی سەعید کەسێکی لەباربوو بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو راسپاردەیە. فەیسەڵی یەکەم لە ساڵی ١٩١٩وە فەهمی سەعیدی دەناسی. ئەوساکە کە ئەو پاشای شام بوو فەهمی سەعید رابەری کەرتی شیرهەڵگرانی یاساوڵی تایبەتیی کۆشک بوو. دوای روخانی ئەو رژێمە بە دەستی فەرەنسەییەکێ و دانانی فەیسەڵ بە پاشای عیراق فەهمی سەعیدیش گەڕایەوە عیراق و بووە ئەفسەری لەشکری تازە دامەزراوی وڵات. فەیسەڵی یەکەم بەشی زۆری ئەفسەرانی ئەو لەشکرەی دەناسی چونکە کاتی خۆی بەشداری شۆڕشەکەی شەریف حسەینی باوکی بوون و گەلێکیان هەر لە ژێر فەرماندەی خۆی و کەمێکیان لە ژێر فەرماندەی میر عەبدوڵلای برایدا بوون. فەیسەڵ بۆ خۆی چاودێری ئەو ئەفسەرانەی دەکرد بایەخی دەدایە کاروباری تایبەتی و هەڵس و کەوتیان. لەبەر ئەوەش کە ژمارەیان کەم بوو ئەو کارە ئاسان مەیسەر دەبوو.

وێڕای ئەوە فەهمی سەعید هەر زوو سەرنجی جەعفەر عەسکەریی یەکەم وەزیری بەرگریی لە مێژووی عیراقی هاوچەرخدا راکێشا، جەعفەر هێند خۆشی دەوێ بێ سێ و دوو خزمێکی خۆی لێ مارەو لە ماڵی خۆی شایی ژن هێنانی بۆ ئەکات. لە رێگەی جەعفەر عەسکەریشەوە فەیسەڵی یەکەم زیاتر شارەزای فەهمی سەعید دەبێ. کەم کەس وەک جەعفەر عەسکەری جێگەی بڕواو متمانەی فەیسەڵ بوو[١٨] وێڕای هەموو ئەمانە فەهمی سەعید کوردی دەزانی[١٩]، خزم و ناسیاوی لە ناوچەی

---

(١٧) الأنتداب.

(١٨) لەو عیراقییانەی کە لە زووەوە کاریان لەگەڵ کردبوو جەعفەر عەسکەری یەکەم کەس بوو فەیسەڵی یەکەم تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٣ کردییە سەرەک وەزیران. جەعفەر بەر لە نووری سەعید بە شەش ساڵ و چوار مانگ و رۆژێک کابینەی خۆی دامەزراند.

(١٩) رۆژنامەی «الثورة» لە ژمارەی رۆژی دووی مایسی ١٩٨٨دا باسی کوردی زانینی فەهمی



**وێنەیەکی دەگمەن**
**شێخ مەحمود و فەهمی سەعیدی کۆکردۆتەوە**

سلێمانی زۆر بوو، شارەزای کون و کەلەبەری بوو، بۆیەکا دەیتوانی خۆی بە تەنها ئەوەی فەیسەڵی یەکەم دەیویست بەجێی بگەیێنێ. بۆ خۆیشی بروای بە سیاسەتی فەیسەڵ بوو، هێند خۆشی دەویست دوا کوڕی خۆی بە ناوی ئەوەوە ناو نا کە ئێستە جێگری شایانی باوکی و دڵسۆزو وەفاداری خاڵوانێتی[٢٠].

بۆ ئەوەی ئەو کارە تا سەر بە نهێنی بچێتە سەر فەهمی سەعید کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٨ دوو مانگ لەسەر یەک ئیجازە وەردەگرێ، نە بەر لەو جارەو نە دوای ئەو جارە فەهمی سەعید ئیجازەی وای وەرنەگرتووە[٢١]. لەو ماوەیەدا دوو جار بە جلی سیویلەوە دەچێتە خزمەت شێخ مەحمود، گفتوگۆی بە ناوی فەیسەڵەوە لەگەڵ

---

سەعیدی کردووە.

(٢٠) فەیسەڵ فەهمی سەعید لە زۆر شوێن بە شانازییەوە باسی خاڵوانی باوکی ئەکات، لەو کۆڕە تایبەتییەشدا کە مایسی ١٩٨٩زانکۆی مستنصریە رێکی خست فەیسەڵ دیسان ئەو باسەی کردبوو. لە رۆژنامەکانیشدا پەنجەی بۆ راکێشاوە (بڕوانە: «الثورة»، ٢ مایس ١٩٨٩).

(٢١) «دفتر خدمة العقيد فهمي سعيد»، السجل ٢١ خيالة س/ح/١٤٢.

ئەکات. لە کورد شێخ حەمە غەریب و ماجید مستەفا و مەحمود عەتتاری ژن برای شێخ ئاگاداری ئەو دیدەنی و گفتوگۆیە بوون. جاری دووەم لەسەر داوای شێخ مەحمود وێنەگری تایبەتی دەبەن، جا یا بۆ یادگار، یا بۆ بەڵگە وێنەیەک دەگرن.

هەرچۆن بێ ئێمە وێنەیەکی دەگمەنمان دەستکەوتووە کە شێخ مەحمودو فەهمی سەعیدی تێدایە وا لەگەڵ ئەم وتارەدا بڵاوی دەکەینەوە. لە پشتی وێنەکە بە کورتی و بە قەڵەمی رەش نووسراوە: **«رسمی جنابی شێخ مەحمود. هیاتی عمومی. یا الله هر خۆشبێ. ١٩٢٨»**[٢٢].

وا پێدەچێ ئەم دیدەنییە بێ ئەنجام بووبێ، چونکە فەیسەڵی یەکەم داواکانی شێخ مەحمودی پێ زۆربووە. هەر لەبەر ئەوەش کێشەی کورد بێ چارەسەر مایەوەو زۆری نەخایاند دیسان لە شێوەی تەقینەوەیەکی گەورەدا خۆی نواندەوە.

هەرچۆن بێ ئەم سەرەتا گرنگە پێوەندییەکی نزیکی لە نێوان شێخ مەحمودو فەهمی سەعیدا دروست کرد کە لە سییەکان و سەرەتای چلەکان و رۆژانی راپەڕینی مایسدا رەنگی خۆی دایەوەو زیاتر ئەوە دەسەلمێنێ کە دەبێ جۆرە رێک کەوتنێک لە نێوانی شێخ و فەهمی سەعیدا هەبووبێ، هەرچەندە بێ رێک کەوتنێکی وەهاش هیچ رێی تێ ناچێ گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ کوردستان بە فیتی ئینگلیز بووبێ. ئەگەر وابوایە هیچ رێی تێ نەئەچوو کوردستان وا بە گەرمی بۆ پشتگیریی راپەڕینی مایس بێتە کایەوە، چونکە ئەو رۆژگارە، واتە سەرەتای چلەکان، بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردو لایەنگرانی **«شێخی بەردە قارەمان»** هێندیان لە باردا بوو بتوانن گەر بیانویستایە، بەربەستی ئەو هەڵچوونە گشتییەی کوردستان بۆ پشتگیریی راپەڕینی مایس بکەن، یا هیچ نەبێ لە مەودای فراوانی کەم بکەنەوە. بوونی ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستی ناحەزی راپەڕینی مایس لە ناوچە کوردەوارییەکە جێ بەجێ کردنی ئەو کارەی ئاسانتر دەکرد.

شایانی باسە کاتێک دەنگوباوی گەڕانەوەی شێخ مەحمود کەوتۆتە دەم خەڵکی هەموان، بە رەش و رووتی کوردستانەوە، کەوتوونە باسی ئەوەی چۆن شێخ دیسان بۆ شەڕی ئینگلیز هاتۆتەوە. برای چیرۆکنووس مستەفا ساڵح کەریم لە نامەیەکی

---

(٢٢) وەک خۆی نووسیومەتەوە، تەنها چوکلەکانی سەر وشەی **«خۆشبێ»**م دانا تا بە دروستی بخوێنرێتەوە.

- یەتیی خۆیدا، کە چەند سەرنجێکی وردو بەکەڵکی لە سەر وتاری بڵاوکراوەی «لاپەڕەیەکی ون لە مێژووی خەباتی شێخ مەحمود»ی تێدا تۆمار کردووە، لەم -ڕەیەوە بۆی نووسیم دەڵێ:

**«لە بیرمە پۆلی سێیەمی سەرەتایی بووم، تاقی کردنەوەی سەری ساڵمان نەکرا، وتیان حەربی رەشید عالییە. باوکم بۆ دیدەنی ماڵی باپیرم بردمی بۆ وێڵەدەر... کە چووینە وێڵەدەر سەرەتای حوزەیران بوو، ... ئەو رۆژەی ئێمە گەیشتینە وێڵەدەر گەلێ چەکدارم دەبینی بە رانک و چۆغەی جوان و شەرواڵ و مرداخانی و قەدە نیشەک و دەمانچەی لاقەدیانەوە دەهاتن و دەچوون... سەیر ئەوە بوو هەندێکیان (خەتی سەربازی)یەکەیان بە دەرزی سنجاق لە چۆغەکانیان دابوو. منالانی هاوتەمەنم دەیانگوت ئەوانە چەتەی شێخ مەحمودن. دوای دوو رۆژ کە چووینە خزمەت باپیرم چونکە باوکم خوێندەوار بوو، لە شت دەگەیشت باپیرم لێی پرسی: دەنگوباسی ئەو پیاوانە چییە دەڵێن هاتوونەتە ئاوایی. باوکم پێی وت: قوربان شێخ لە بەغداوە رای کردووەو هاتۆتە داری کەلی، وا لە هەموو لایەکەوە پیاوان بە خۆیان و بە چەکیانەوە لە دەوری گرد دەبنەوە، بە قسەی قادر ئاغای سپیارە(**رەنگە زۆر لەو ناوەش دڵنیا نەبم چونکە تەمەنم بە هیچ حاڵ لە نۆ ساڵ تێپەڕ نەبوبوو، بەڵام زیتەڵە بووم، زوو شتم وەردەگرت) **شێخ نیازی هەرایەکی تری هەیە دژی ئینگلیزەکان، باپیرم کە لە کۆنەوە تێکەڵاوی ماڵی شێخان بوو هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: خوا دەست بە باڵی بگرێ و کاک ئەحمەدی شێخ پشتیوانی بێ و نوشوستی نەهێنێ»**[23].

وا دیارە کوردی کفری و دەوروبەری، تایبەت دەڵۆیەکان کە هەمیشە شوێنیان لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردا دیارو پێوەندییان لەگەڵ شێخ مەحمودا نزیک بووە، بە هەمان دەستوور بیریان کردۆتەوە. دانیشتوانی کفریش بە گەرمی، چ بە خۆنیشاندان و چ بە بروسکەوکاری تر، پشتی راپەڕینی مایسیان گرتووە. ئەو سەردەمە رووناکبیرانی کفری زۆر داخ لە دڵ بوون، جارویار نارەزایی و سکاڵای دڵی خۆیان لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکانی بەغدای پایتەخت دەردەبڕی[24].

(٢٣) نامەکە رۆژی حەڤدەی نیسانی ١٩٨٩ نووسراوە.

(٢٤) بە وێنە بڕوانە:

ژمارەیەک راستی نوێ دیسان ئەوە دەسەلمێنن کە وروژانی هەولێرو دەوروبەری لە رۆژانی راپەرینی مایسدا، چ لەناو خودی کوردستان و چ لەسەرانسەری عیراق. کەم هاوتا بوو. وەک جاری پێشوو باسمان کرد **ژمارەی گیراوانی هەولێر لەسەر راپەرینی مایس لە ژمارەی هەر کام لە شارەکانی تری عیراق، بەغدای پایتەختی لێ دەرکەی، زیاتر بوو.** بەلام ئەوەی بایەخی مێژوویی تایبەتی خۆی هەیە لەم رووەوە ئەوەیە کە بەشێکی زۆر لەو گیراوانە یا ئەندامی **«هیوا»**، یا لایەنگری بوون. بە وێنە رۆستەم جەببارو فەتاح جەببارو نازمی سەعید ئاغا لە **«هیوا»**دا بوون. دواییش بوونەتە ئەندامی **«رزگاری»**[٢٥].

یەکێک لەو روناکبیرانەی هەولێر کە دەوری دیاری لە هاندان و وروژاندنی جەماوەری ئەو شارەدا هەبووە بەڕێوەبەری قوتابخانەی دووەمی سەرەتایی شێخ حەسەن نیعمەتوللا بووە، کە بە حەسەن ئەفەندی شۆرەتی دەرکردووە. وەک دەگێڕنەوە ئەم پیاوە دەوری زۆر بووە بۆ هاندانی دانیشتوانی هەولێر کە ئوتومبێلی سالح زەکی بەگی صاحێبقران بسووتێنن. کە رۆژی چواردەی مایسی ١٩٤١ فڕۆکەکانی ئینگلیز بۆ یەکەم جار هاتنە سەر شاری هەولێر[٢٦] خەلکی پێیان وابوو فڕۆکەی ئەلەمانیان، بۆیەکا زۆر بە گەرمی، بە دەم چەپلەڕێزانەوە پێشوازییان کردن. بەلام کاتێک ئەو فڕۆکانە کەوتنە بۆمباباڕانی بارەگای لەشکری عیراقی لە قەراغ شارو زانرا فڕۆکەی ئینگلیزن نەک ئەلەمان، عەشاماتی شار بە جارێک خرۆشان و شێخ حەسەن ئەفەندی هێندەی تر بزواندوونی. لەو وتارەیدا کە لەوێدا بۆی هاتووە داوای لە دانیشتوانی هەولێر کردووە **«ئاگرێک بکەنەوە لە لەندەنەوە دیار بێ»**. شێخ حەسەنیش یەکێک بووە لەوانەی دوای دامرکاندنەوەی راپەرینەکە گیراون، پاش ماوەیەک لە هەولێر گوێزراوەتەوە[٢٧].

---

**«العالم العربي»**، ٢٦ كانون الثاني ١٩٣٨.

(٢٥) دیدەنی لەگەل سالح حەیدەری رۆژی ٢٠ی نیسانی ١٩٨٩.

(٢٦) فڕۆکەکانی ئینگلیز دوو جار بارەگای لەشکریان لە هەولێر بۆمباباران کرد، جاری یەکەمیان رۆژی چواردەو جاری دووەمیان رۆژی پازدەی مایس بوو. کەس لەو بۆمبابارانەدا نە کوژرا، بەلام رۆژی یەکەم دوو فڕۆکەی عیراقی پێوە بوون. ئەو کاتە ئەمین رەواندوزی فەرماندەی بارەگای لەشکر بوو لە هەولێر.

(٢٧) دیدەنی لەگەل سالح حەیدەری رۆژی ٢٠ی نیسانی ١٩٨٩.

خوالێخۆشبوو عیززەدین فەیزی لە یادداشتەکەیدا وێنەیەکی وردی شێخ حەسەن نیعمەتوڵڵای بۆ کێشاوین[٢٨] کە بایەخی زۆرە بۆ ئەم باسەی ئێمە، چونکە بەڵگەیەکی تری سروشتی ڕزگاریخوای دژ بە ئینگلیزی هەڵچوونی کوردەواری لای خۆمانە لە کاتی ڕاپەڕینی مایسدا. عیزەدین فەیزی دەڵێ:

**«لە ساڵی ١٩٣٩-١٩٤٠ لە قوتابخانەی دووەمی هەولێر بە مامۆستا دامەزرام. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە مامۆستا شێخ حەسەن نیعمەتوڵڵا بوو. پیاوێکی دڵسۆزو چالاک بوو. زۆر ڕقی لە ئینگلیز دەبوەوە. کە شۆڕشی مایس لە ساڵی ١٩٤١ لە عیراقدا بەرپابوو، عیراق دژ بە ئینگلیز وەستاو دۆستایەتی لەگەڵ ئەڵەمان پەیدا کرد، شێخ حەسەن هەستێکی کوردایەتی هەبوو، دەیزانی هەر کارساتێک کە بەسەر کورد هاتبێ لە رووی ئینگلیزەوەیە. لەبەر ئەوە خۆی بە دۆستی ئەڵەمان و دژ بە ئینگلیز دادەنا. چەند خۆپیشاندانێکی قوتابیان لەم شارەدا کرا، زۆربەی بە سەرپەرشتی شێخ بوو ...»**[٢٩].

پڕۆپاگەندەی نازی کاری زۆری کردبووە سەر گەلێک لەوانەی وەک شێخ حەسەن بیریان دەکردەوە. بەشێکی زۆری ئەو پڕۆپاگەندەیە لە دیوی ئێرانەوە دەهات. ئەوساکە خاکی ئێران، بە کوردستانییەوە، ببووە گۆڕەپانێکی بەرفراوان و بەرکراوەی چالاکی نازی. بەپێی ئەو ژمارانەی دوکتۆر ڕەحیمی قازی لە نامەی دوکتۆراکەیدا هێناونییەوە سێ هەزار لەو چوار هەزار ئەڵەمانەی بەر لە شەڕی دووەمی جیهان لە ئێران بوون لە ناوچە ئازەری و کوردەوارییەکان کاریان دەکرد. ئەو ڕۆژانە فەردریک هۆمێتی نازی خۆی گەیاندبووە ناو ریزی ژمارەیەک هۆزی ناوداری کوردەوە[٣٠].

بەپێی بەڵگەیەکی دیپلۆماسیی نهێنی عیراقی هەر ئەو دەوروبەرە دانسازی ئەڵەمانی دوکتۆر ئاین لوز لە کرمانشاو دەوروبەری چالاکی خۆی دەنواند[٣١].

---

(٢٨) برای چیرۆکنووس مستەفا ساڵح کەریم سەرنجی بۆ ئەم راستییە راکێشام.

(٢٩) **«یادی عیززەددین فەیزی»**، ئامادەکردنی سۆران عیزەدین فەیزی، هەولێر، ١٩٨٨، ل٨٩.

(30) R.G. Gazi, Kurdistankaya Democraticheskaya Partia- Organizator i rukovaditel Natsionalno - Osvoboditelnovo dvijenia v Iranskom Kurdistane (1945-1946 gg.), Baku, 1954, PP.134-136.

(٣١) د. ك. و.، الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي، ٤٩٨٧/ ٣١١، الوثيقة رقم ١٠٣، ص١٥٨، الموضوع: تقرير القنصلية العراقية في تبريز الى وزارة الخارجية العراقية، المرقم

ئەوساکە پزیشکی تایبەتی تانانەت رەزا شا خۆیشی دوکتۆرێکی ئەڵەمانی بوو.

ئاریچێتی ئەم جۆرە کەسانەو باسی بایەخ پێدانی بێ ئەندازەی هیتلەر بە **«رزگارکردنی نەتەوە ئارییەکان»** هەموو سنوورێکی بڕیبوو. بەڵێ دەبوو هیتلەر بۆ ئەم باسە گەلێک بەپەرۆش بێ(!!)، چونکە بەپێی پرۆپاگەندەی نازییەکان خوێنی هیچ نەتەوەیەکی ئاری نەژادی جیهان بە رادەی خوێنی ئارییەکانی ئێران خاوێن نەبوو، گوایە نیسبەتی ئەو خوێنە لەناو ئەواندا سێ هێندی نیسبەتی ئەو خوێنەیە لەناو تەنانەت ئەڵەمانەکانیش خۆیاندا(!!)[32]. **جا وەرە کوردی ساکاری لێ قەوماوی بێ مافی ژین و ژیان قسەی لەم بابەتە بەرپەردەی گوێی بکەوێ ...** نازییەکانیش، وەک ئاشکرایە، زۆر وەستا بوون لە بزواندنی هەستی خەڵکدا، دەیانزانی ئەوی مەبەستیانە چۆن دەیگەیێننە مێشکیان[33].

ئەوی رۆژانی راپەڕینی مایس لە کوردستان رووی دابوو هەمووی گەیشتبۆوە دەم ئینگلیز. دوای دامرکاندنەوەی ئەو راپەڕینە کاربەدەستانی ئینگلیز بە دەم هەڕەشەوە گلەیی خۆیان گەیاندۆتەوە شێخ عەلائەدینی نەقشەبەندی لە بیارە، ئەمیش بە ناچاری شێخ عوسمانی کوڕە گەورەی بۆ عوزرخوایی ناردۆتە لای ئینگلیزەکان لە کەرکوک. شێخ عوسمان پێکەوە لەگەڵ سەید ئەحمەدی خانەقا لای گەورەیەکی ئینگلیز، لەوێ[34] لە مەیانی رازو گلەییدا کابرای ئینگلیز دەڵێ:

**«جەنابی شێخ ئێوە لە هەموو لاوە لێمان راست بوبوونەوە، دەروێشەکانتان بە دەف لێدانەوە هاواریان دەکرد:**

لا الـــــه الا اللـــــه

ئینگلیز بشکێ ئیشەڵلا

**بەڵام ئێوە دەبێ باش لەوە بگەن هەر کات شێخ عەلائەدین بیەوێ لە زەمینەوە**

---

٢٩٢/٢/٢/٩٦، والمؤرخ ١١/ أيلول/ ١٩٣٩.

(32) D.N.Wilber. Contemporary Iran, New York, 1963, P.16.

(٣٣) بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە:

**نصيف جاسم عباس الأحبابي، العلاقات بين ايران و المانيا النازية (١٩٣٣-١٩٤٥)**، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب - جامعة بغداد، ١٩٨٩.

(٣٤) هەوڵمان دا لە رێگەی بەڕێز شێخ ئەمینی نەقشەبەندییەوە ناوی ئەو ئینگلیزە بزانین، بەڵام وا دیارە شێخ عوسمانی کاکی ناوەکەی لە یاد کردووە.

دەستخەتی فتواکەی شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی بە بۆنەی ڕاپەڕینی مایس وێنەکەی خۆیشی لە تەمەنی (٦٥) ساڵی دا لە ساڵی (١٩٣٥) گیراوە

**بۆمان بێ ئێمە لە ئاسمانەوە بۆی دێین»**، دیارە مەبەستی بووە بڵێ بە فڕۆکە بۆمبابارانتان دەکەین(٣٥).

ڕابەرانی ڕاپەڕینی مایس لە هەموو ئەو فەتوایانەی پیاوە ئاینییەکانی دژی ئینگلیز دابوویان زیاتر بایەخیان دایە ئەو فەتوایەی ڕۆژی نۆی نیسانی ساڵی ١٩٤١ شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی دەری کرد. ئەوان بە نیازی زیاتر وروژاندنی هەستی جەماوەر لەو سەدان فەتوایەی لەو ڕۆژانەدا دەرچوون(٣٦) تەنها سیازدە فەتوایان هەڵبژاردو دەستوبرد لە نامیلکەیەکی سەربەخۆی بیست و هەشت لاپەڕەییدا بە دەستوخەتی خاوەنەکانیان بڵاویان کردنەوە(٣٧). حەوتەمین فەتوایان

---

(٣٥) دیدەنی لەگەڵ شێخ ئەمینی شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی، ڕۆژی چواردەی مایسی ١٩٨٩.
(٣٦) لەو ڕۆژانەدا تەنانەت مەلای گوندەکانیش فەتوایان دەردەکرد.
(٣٧) ئەو نامیلکەیە لە کتێبخانە گشتییەکاندا دەست ناکەوێ، ئەو دانەیەی لای شێخ ئەمینی

فەتواکەی شێخ عەلائەدینە کە لە لاپەڕە نۆزدەی نامیلکەکەدا بەم جۆرە پێشکەش کراوە:

**«٧- فتوى العلامة الكبير السيد علاء الدين النقشبندي. علاءالدين العثماني رئيس الطريقتين النقشبندية والقادرية. بيارة حلبجة.العراق. في ٩/ ٤/ ١٣٦٠»** (بڕوانە وێنەکەی).

پێوەندیی نزیکی ڕەشید عالی گەیلانی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ناسراوانی کوردستان کاری کردە سەر هەڵوێستیان بەرانبەر ڕاپەڕینی مایس. بەر لە ساڵی ١٩٤١ بە ماوەیەک ڕەشید عالی و هاوبیرانی پێوەندییان بە ژمارەیەک سەرەک هۆزی کوردو عەرەبەوە کرد بە نیازی نانەوەی ئاژاوەیەکی فراوان بۆ خستنی یەکەم وەزارەتی عەلی جەودەت ئەییوبی کە ناحەزی بوون و بێ ڕەزامەندی ئەوان ڕۆژی بیستو حەوتی ئابی ساڵی ١٩٣٤ دامەزرا بوو[٣٨].

کار بەوەوە نەوەستا. هەمووی حەفتەیەکی نەبرد دوای ئەوەی یاسین هاشمیی هاوڕێ و هاوبیری نزیکی ڕەشید عالی گەیلانی ڕۆژی حەڤدەی مارتی ١٩٣٥ دووەم کابینەی خۆی دامەزراند کاتێک وەفدێکی یەکجار گەورەی هۆزە کوردەکان بە ٦٠ ئۆتومبیل بۆ دەربڕینی پشتگیریی کابینەی نوێ، کە ڕەشید عالی وەزیری کاروباری ناوخۆ بوو تێیدا، هاتە بەغدا. لەو وتارەیدا کە فایق تاڵەبانی بە ناوی ئەندامانی وەفدەکەوە لە بەردەم سەرەک وەزیراندا خوێندییەوە گوتی:

**«ئەم دەستەیەی وان لە بەردەم ئێوەی شکۆدارو نوێنەری ڕاستەقینەی هۆزەکانی کەرکووک و هەولێرو سلێمانی و مووسڵ و دیالەن بە هاندانی دەزگا ناوچەییەکان، وەک باوە، نەهاتوون، لە خۆیانەوە بۆ پیرۆزباییتان هاتوون، بۆ ئەوە هاتوون بڕوای کوڕگەلی باکوور بە وەزارەتی پایە بڵندتان ڕابگەیێنن ...»**[٣٩].

---

نەقشەبەندییە بێ بەرگە. لەسەر یەکەم لاپەڕەی نووسراوە **«الاهداء الى العرب والمسلمين في انحاء المعمورة»**. دەبێ مانگی مایسی ١٩٤١ لە بەغدا چاپ کرابێ، دیارە دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکە ژمارەکانی کۆکراوەتەوەو فەوتێنراون.

(٣٨) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الرابع، الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨. ص ٢٨، ٥٠.

(٣٩) هەمان سەرچاوە، ل ٨٠، ٨٦-٨٧.

لەو کتێبەیدا کە بە ناوی **«مێژوو سبەی دەستی پێ نەکردووە»**وە ساڵی ١٩٨٨ بڵاوی کردۆتەوە دوکتۆر نەجمەدین سەهرەوەردیی سکرتێری تایبەتی و زاوای رەشید عالی گەیلانی و بەشداری راپەڕینی مایس و یەکێک لە دەربەدەرەکانی دوای دامرکاندنەوەی، باسی پێوەندیی خەزووری بە کوردەوە بەم جۆرە کردووە:

**«... لەبەر دوو هۆی سەرەکی کوردەکان بە چاوی رێزەوە سەیری رەشید عالی گەیلانییان دەکرد. یەکەمیان لەبەر پایەی ئایینی وەک نەوەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی کە کورد وەک ئیمام باوەڕیان پێیەو دەیپەرستن. دووەمیان ئەوەیە کە رەشید عالی لەگەڵیان راستگۆ بوو، لە کاروباری کارگێڕیدا پشتی پێ دەبەستن و لە رۆژگاری فەرمانڕەوایی ئەودا زۆربەی متصرفەکان کورد بوون. هەروەها ژمارەیەکی زۆریان ئەفسەری لەشکرو پۆلیس بوون. لە ناوچەکانی باشووردا رەشید عالی بە تایبەتی ئیعتیمادی دەکردە سەر متصریفە کوردەکان»**[٤٠].

ئەم قسانەی سەهرەوەردی پێوەندیی کۆنی رەشید عالی گەیلانی بە کوردەوە نیشان دەدەن، ئەو پێوەندییەی، وەک وتمان، رۆژانی راپەڕینی مایس رەنگی خۆی دایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەوە بڵێین کە دانانی کورد بە متصرف لە شارەکانی باشوور بەر لەهەر شتێکی تر بەشێک بوو لە یارییە زیرەکەکانی فەیسەڵی یەکەم. بەو کارەی فەیسەڵ بە تیرێک دوو نیشانی دەشکاند. بەشی زۆری ئەو متصریفانە، وەک ماجید مستەفاو ساڵح زەکی بەگی صاحێبقڕان، لەوانە بوون کە لە بزووتنەوەی کوردایەتیدا بەشدارییان کردبوو، کوردایەتی لە مێشکیانا کنەی نەکرد. فەیسەڵی یەکەم دەیویست بەو جۆرە، وەک **«دیلی بەرێز»** لە کوردستانیان دوور بخاتەوە. هەمان کات ئەوانە خوێندەواری چاک و کۆنە ئەفسەری شارەزاو لێهاتوو بوون، دەیانتوانی لە کاروباری کارگێڕیدا خزمەتی چاک بە دەوڵەت بگەیەنن، ئەوساکەش عیراقی تازە دامەزراو پێویستی بەو جۆرە پیاوە لێهاتووانە زۆر بوو.

سەهرەوەردی راستییەکی زۆر لەوەیش گرنگتری بۆ تۆمار کردووین. لە هەمان

---

(٤٠) نجم الدين السهروردي، تأريخ لم يبدأ غدا. حقائق وأسرار عن ثورتي رشيد عالي الگيلاني ٤١، ٥٨ في العراق، الدوحة – قطر، ١٩٨٨، ص١٢٥.

شوێنی کتێبە گەورەکەیدا [٤١] کە دێتە سەر باسی ئەو هۆیانەی پاڵیان ناوە بە سەرکردایەتی ڕاپەڕینی مایسەوە بیر لەوە بکەنەوە بنکەی بەرگری لە بەغداوە بگوێزرێتەوە ناوچەکانی باکوور نووسیوییە دەڵێ: **«لەو هۆ یاریدەرانەی دەبوو ببنە مایەی بەردەوام بوونی بەرگری ئەوە بوو کە دانیشتوانی کوردی باکوور لە شەڕو بەرهەڵستیی ئینگلیزدا لە هەرە ئازاو دڵسۆزەکان بوون، هەڵوێستیان یەکجار شەرەفمەند بوو، هەرچەندە بزووتنەوەی جیاخوازی کورد[٤٢] لە عیراق بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود لە ساڵی ١٩٣٢وە دەستی پێ کردبوو»**[٤٣].

سەهرەوەردی، وەک وتمان، بە ویژدانانە لێرەدا دانی بە ڕاستییەکی بایەخداردا ناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دیسان کەوتۆتە چەند هەڵەیەکەوە کە نابێ هەروا بەسەریاندا تێپەڕین. *یەکەمیان ئەوەیە کە مێژووی خەباتی* **شێخ مەحمود زۆر لە** ساڵی ١٩٣٢ کۆنترە. شێخ مەحمود بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان و ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانی، واتە بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق بە گەلێک ساڵ هاتۆتە کۆڕی خەباتەوە. ئەو ساڵی ١٩١٩ دروشمی سەربەخۆیی دژی ئینگلیز هەڵگرت، واتە دوو ساڵ و چەند مانگێک بەر لەوەی ڕژێمی پاشایی لە وڵاتدا دامەزرێ[٤٤]. ئەو سەردەمەش هەموو گەلانی ناو دەوڵەتی ڕوخاوی عوسمانی عەودالی سەربەخۆیی بوون. بەڵام دوای ئەوە بە ماوەیەک هەموو کۆششی شێخ مەحمود بۆ مسۆگەر کردنی خودموختارییەکی ڕێک وپێک بوو. بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو مەبەستە شێخ ئامادە بوو لەگەڵ ئینگلیزدا ڕێک کەوێ، واتە پێچەوانەی ئەو ڕا هەڵەیەی لە ناو زۆر کەسدا باوە کە گوایە شێخ لە کورتبینییەوە هەمیشە ڕقەبەری ئینگلیزی کردووە. ئەوەتا ئینگلیزەکان لەو ڕاپۆرتە تایبەتییەیاندا کە داویانەتە **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** دانیان بەوەدا ناوە چۆن شێخ مەحمود سەرەتای ساڵی

---

(٤١) کتێبەکەی دوکتۆر نەجمەددین سەهرەوەردی ٥١٢ لاپەڕەیەو هەرچەندە لە کەم و کورتی و هەڵەی گەورە بێ بەش نییە، بەڵام بۆ لێکدانەوەی گەلێک لایەنی مێژووی هاوچەرخی عیراق سەرچاوەیەکی ڕەسەن و بەکەڵکە، تایبەت لەبەر ئەوەی گەلێک شوێنی بریتین لە یادداشتەکانی ڕەشید عەلی گەیلانی.

(٤٢) دەقی قسەکەی سەهرەوەردی وایە: **«حركة الاكراد الانفصالية»**.

(٤٣) نجم الدين السهروردي، المصدر السابق، ص ١٢٥.

(٤٤) ٢٣ی ئابی ساڵی ١٩٢١ فەیسەڵی یەکەم کرایە پاشای عیراق.

١٩٢٣ شێخ قادری برای ناردۆته کەرکوک و داوای کردووە کۆنگرەیەکی تایبەتی لە نوێنەرانی ئینگلیزو کوردو کاربەدەستانی بەغدا ببەسترێ بۆ دیارکردنی خودموختاری بۆ کورد، بەڵام ئەوان ئەو پێشنیارەیان ڕەت کردۆتەوە گوایە لەبەر ئەوەی **«هێشتا دوارۆژی ویلایەتی مووسڵ ئاشکرا نییە»**[٤٥].

وا دیارە سەرەڕەوەردیش، وەک گەلێک نووسەری تر، دروست لە سروشتی بزووتنەوەی جیاخوازی نەگەیشتووە[٤٦]. لە رووی زانستەوە دوو جۆر بزووتنەوەی جیاخوازی هەیە، یەکێکیان رەوایەو لەگەڵ ڕەوتی مێژوودا دەگونجێ، ئەوی تریان نارەوایەو لەگەڵ ڕەوتی مێژوودا ناگونجێ. بە وێنە عەرەبی ناو دەوڵەتی عوسمانی تا ساڵی ١٩١٦ جیاخواز نەبوون، جیابوونەوەیان لە ئەستەموول نەئەویست، ئەو پەڕەکەی داوای (**لامرکزی**)و خودموختارییان دەکرد. بەڵام سیاسەتی کورتبینی ئیتیحادییەکان و فشاری نەتەوەیی بێ ئەندازەیان ناچاری کردن خەبات بۆ جیابوونەوەو تەنانەت هاریکاریی ئینگلیزیش بۆ ئەو مەبەستە بکەن بێ ئەوەی مێژوو بتوانێ هیچ حوکمێکی خراپیان بەسەردا بدا.

کەچی گەر لە سویسرا هەمان کات بزووتنەوەیەکی لەو بابەتە لە ناو ئیتالییەکاندا، کە لە سەدا شازدەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە پێک دێنن، دروست بوایە بە هەنگاوێکی کۆنەپەرست دادەنرا، چونکە ئیتالییەکان وەک هەموو گەلانی ناو سویسرە تەواوی مافی کۆمەڵایەتی و ئابووری و رووناکبیری و سیاسیی خۆیان هەیەو لە هیچیان کەم نییەو سەربەخۆیی وڵاتەکەیان بە راستی هی هەموویانە، بۆیەکا جیابوونەوەیان زیانی هەیە نەک قازانج. هەر لەبەر ئەوەش ئیتالیاییەک، یا ئەڵەمانییەکی ناو سویسرا هەرگیز بیر لە جیابوونەوە ناکات.

بە هەمان دەستوورو لەبەر هەمان هۆ زۆربەی هەرە زۆری ئەو چەند ملیۆن ئیتالیاییەی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەژین بە دڵ و بە گیان دژی مۆسۆلینی و ئیتالیای فاشی وەستان چونکە بیروباوەڕی فاشیزم زیانی دەبەخشی بە

---

(45) "Iraq. Report on Iraq Administration", April 1922-March 1923, London, 1924,P.40

(٤٦) زۆر کەس نارەواو بێ ئەوەی بە وردی لە ناوەرۆکی باسەکەو سروشتی بزووتنەوەی جیاخوازی بگەن لە خۆڕا ئەوتۆمەتە دەدەنە پاڵ هەموو بزووتنەوەیەکی کوردایەتی.

سـەربەخـۆیی ولاتە یەکگرتووەکـانی ئەمـەریکاو ئەوانیش لە هەمـوو روویەکی نەتەوەییەوە لە ژێر سایەی ئەو سەربەخۆییەدا حەوانەتەوە.

نمونەیەکی لەوەیش سـەیرتر. لەبەر فـشـاری نارەوای ئینگلیـز بزووتنەوەی جیاخوازی ئەو یەک دوو ملیۆن کەسەی ئایرلەندەی باکوور رەوایە، کەچی کەسێک گـوێی لە دەنگی ئەو پازدە شـازدە ملیـۆن ئایرلەندییـەی ولاتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکا نییە چونکە لە هیچ بێ بەری نین. هەڵبەت ئەوی تینوو نەبێ داوای ئاو ناکات!!

لەو ساڵانەدا کە سەهرەوەردی باسیان دەکات بزووتنەوەی جیاخوازی لەناو کوردی عـیـراقدا لە هەمـوو پارچەکـانی تری کـوردسـتـان لاواز تر بوو، ئەویش تەنهـا لەبەر ئەوەی بارودۆخی ولات و خـەباتی کــورد کــارێکی ئەوتۆیان کــردبوو ئەوان، بە پێچەوانەی کوردی ئێران و تورکیاوە، بە بەشێک لە مافە رەواکانی خۆیان بگەن.

بێ گـومـان گـەر سـەرکـردایەتی راپەڕینی مـایس بە وردی لەم لایەنە گـرنگە بگەیشتایە دەیتوانی هێندەی تر پاڵ بە کوردەوە بنێ بۆ کۆڕی خەبات، چونکە هەموو ناسراوو رووناکبیرانی کوردی ئەو رۆژگارە باوەڕیان بە سەرکردایەتی راپەڕینی مایس نەبوو. هەبوون پێیـان وابوو دەبێ کورد کەڵک لەو هەل و مەرجە وەربگرێ کە بەهۆی راپەڕینی مایسەوە هاتبووە گۆڕێ و بە دڵ دەیانویست رابەرانی کورد لەگەڵ ئینگلیز رێک بکەون بەڵکە لەو رێگەوە شتـێک بۆ گـەلەکەیان مـسـۆگەر بکەن. هی وایان هەبوو بۆ ئەو مـەبەسـتـە بە تایبـەتی پێـوەندیی بە شـێخ مـەحـمـودەوە کردبوو. لە سلێمانی جموجۆڵێکی هەست پێ کراو کەوتبووە ناو ئەو جۆرە کەسانەوە.

لەگەڵ ئەوەش ئینجا کورد لە کاتی راپەڕینی مایسدا هیچ درێغییـەکی نەکردو وەک سەهرەوەردی دەڵێ بە شەرەفەوە ئەرکی سەر شانی خۆی راگەیاند. ئەوەش بۆ خۆی یەکێکە لە دەرسە بایەخدارەکانی مێژووی هاوچەرخی عـیراق. ئەوانەش کە دەیانەوێ بە زۆری زۆردارەکی کورد لەکەدار بکەن لە ناماقوڵی بەولاوە هیچی تریان بۆ نامێنێتەوە.

## تێبینی:

به نیازی ئەوەی لایەنەکانی باسەکەمان زیاتر بۆ روون ببێتەوە رۆژی پێنجی مایسی ١٩٨٩ پێوەندیمان لەگەڵ ئەحمەد خواجا کرد کە، وەک ئاشکرایە، یەکێک بوو لە نزیکەکانی شێخ مەحمودو دوای رێک کەوتنەکەی ساڵی ١٩٢٧ ئەویش لەگەڵ بابە عەلی هاتە بەغدا. بەپێی گێڕانەوەی خاوەنی **«چیم دی»** شێخ مەحمود ساڵی ١٩٢٨ هاتۆتە بەغداو دیدەنی فەیسەڵی یەکەمی کردووە. کەوابێ دەبێ چوونەکانی فەهمی سەعید رێگەیان بۆ ئەو زیارەتەی شێخ مەحمود خۆش کردبێ. دوور نییە ئەو وێنەیەش کە بڵاومان کردۆتەوە هەر ئەو سەردەمە گیرابێت، چونکە ئەحمەد عوسمان کە ئەو کاتە متصرفی سلێمانی بووە لەگەڵ شێخدا هاتۆتە بەغدا.

دیسان بەپێی گێڕانەوەی خاوەنی **«چیم دی»** رەشید عالی گەیلانی رێزی تایبەتیی بۆشێخ مەحمود هەبووەو وەک دەڵێ بە ئاگاداری خۆی لە کاتی راپەڕینی مایسدا پێوەندیی پێوە کردووە. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ بە درۆخستنەوەی ئەو تۆمەتەی دراوەتە پاڵ شێخ. بە داخەوە بە تەواوی بۆمان ساغ نەبۆوە فەهمی سەعید ئەو دوو جارە لە کوێ شێخ مەحمودی بینیوە. جاری یەکەمیان وا دیارە لە شاخ بووە. بەڵام جاری دووەم دوور نییە لە سلێمانی خۆی یەکتریان دیبێ. تا ئێستەش بە تەواوەتی بۆمان ساغ نەبۆتەوە ئەو وێنەیەی لەگەڵ ئەم وتارەدا بڵاومان کردۆتەوە لە کوێ گیراوەو* هەموو ئەوانەی تێیدا دەرچوون کێن. دانیشتووەکان لە

---

(*) لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٩ بوو سەردانێکی د. کەمالم کرد. لەبەر ئەوەی هەمان ئەو وێنەیەی دکتۆری بەڕێز لەم بابەتەدا باسی لێوەکردووە تازە لە ژمارە (٤٠)ی گۆڤاری **«رامان»**ی رێکەوتی ١٩٩٩/ ١٠/٥ بڵاکرابووەوە بۆیە هەندێ دانوستان لەبارەی رۆژی گیرانی وێنەکە لە نێوانمان پەیدابوو، جەنابی راکانمانی بەهەند هەڵگرت و بەبایەخەوە داوای کرد بەپاڵپشتی تۆماری رۆژنامەنووسیی کوردی هەندێ زانیاری بۆ بنێرم بۆیە لێرەدا دەڵێم ئەو وێنەیەی سەرەوە لەسەر دانەیەکی دیکە گیراوەتەوە کە لە ئەرشیفی کۆمەڵەی کەلەپووری کورد لە سلێمانی پارێزراوەو بەهۆی سەرۆکی کۆمەڵەکە کاک محەممەد مەردان وەرم گرتووەو هەمان ئەو وێنەیەیە کە د. کەمال بڵاویکردۆتەوە، بەڵام لە پشتەوەی وێنەکەی ئێرە نووسراوە: **«جەماعەتێ لە دەست و داتیرەی شێخ مەحمودو شێخ حەمە غەریبی زاوای و ئەحمەد بەگی هەولێری ١٩٢٧/١١/٢٠ و مەحمود ئەفەندی و کەریم جاو»** وەک دەبینێ دوا پیت بە (و) نووسراوە جا نازانم وشەکە (جاف یان جاو)بووە.
هەرچی ئەو وێنەیەیە کە لە **«رامان»**ی سەرەوە بڵاوکراوەتەوە ئەوا لە ژێرەوەی نووسراوە لە ماڵی **(سەید ئەحمەدی بابا رەسووڵ)** لە سلێمانی ئەم وێنەیە لە ١٩٢٧/٦/١٥)دا گیراوە.
کەسەکان: شێخ مەحمودی نەمر لە ناوەڕاست لای راست ئەحمەد عوسمان ئەربیللی **«موتەسەریفی**

دەستە چەپەوە شێخ حەمە غەریب و شێخ مەحمود و ئەحمەد عوسمانن، ریزی پێشەوەی راوەستاوەکانیش دیسان لە دەستە چەپەوە فەهمی سەعیدو دوکتۆر حەمدی ئاوچی و ماجید مستەفان، چوارەمیان لەوانەیە رەشەی شێخەلی یا شێخ قادری سەید ئەحمەدی خانەقا بێ. نازانین ئەوەی لای دەستی راست کێیە. دوانەکەی پشتەوە لەوە دەکات لە چەکدارانی شێخ بن.

---

**هەولێر»** لەگەڵ **«زەید»**ی کوریدا لای چەپ **«شێخ حەمە غەریب»**ی زاوای شێخ مەحمودی نەمر لێرەدا بە ئاشکرا دیارە **«هەولێر»**ەکەی کە لەسەرەوە نووسراوە دەبێ **«سلێمانی»** بێ، چونکە ناوبراو ئەوسا لەوێ بووە.

لە بارەی مێژووی ١٩٢٧/٦/١٥ من پێم وایە بەجیاوازی چەند رۆژێک لە هەمووان دروستترە ئەویش بە بەڵگەی ئەوەی **«ژیان»** پاشکۆیەکی بە مێژووی ١٩٢٧/٦/٢ بۆ ژمارە (٦٨)ی رێکەوتی ١٩٢٧/٥/٣١ی بەناونیشانی **«مەسئەلەی شێخ مەحمود دوایی هات و بەتەواوی عەرزی ئیتقیادی بە حکوومەت کرد»** بڵاو کردۆتەوە، هەروەها لە ژمارە ٦٩ی ١٩٢٧/٦/٧ لەژێر ناونیشانی **«هاتنەوە** هەواڵی هاتنی شێخ بابا عەلی کوڕی شێخ مەحمودو جەنابی ماجد مستەفا بۆ سلێمانی و بینینی جەنابی موتەسەریف راگەیەنراوە. دواتر لە ١٩٢٧/٦/٩ شێخ بابا عەلی چۆتە بەغداو ماجد مستەفا ئەفەندیش گەڕاوەتەوە ئەودیو. دیارە ئەو هاتن و چوونەش بەگوێرەی رێکەوتنێک، لە دوای هاتنی مەندوبی سامی لە ١٩٢٧/٥/١٧ بۆ سلێمانی و دواتر چوونی بۆ ناوچەی پێنجوێن، بووە.

بەگوێرەی ژمارە(٧٠)ی رێکەوتی١٩٢٧/٦/٢١ی رۆژنامەی **«ژیان»** جەنابی موتەسەریفیش لە ١٩٢٧/٦/١٦ تەشریفی بردۆتە ناوچەی پێنجوین و **«لە پاش ئیستیقبالێکی محتەشیم لەگەڵ جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندیدا ملاقاتی کردووە»** بەگوێرەی ژمارە (٧١)ی رێکەوتی ١٩٢٧/٦/٢٨ رۆژنامەی **«ژیان» «لەگەڵ جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی رۆژێک تەشریفیان ماوەتەوەو لە پاش رۆژەو دوا بۆ - ولە ژێر عەودەتیان فەرمووە»** هەرچی هاتنی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی بووە ئەوە لە ژێر ناونیشانی «هاتنەوەی جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی بۆ سلێمانی و بۆ بەغدا رۆیشتنی». لە ژمارە٧٢ی ١٩٢٧/٧/٥ ئاماژەی بۆ کراوە کە لە ١٩٢٧/٧/٢ هاتۆتە سلێمانی و دوای دوو رۆژ لەگەڵ جەنابی متەسەریف و ماجد مستەفاو هەندێک لە پیاوەکانی چۆتە بەغدا - بۆیە، بەچاوپۆشین لەو مێژووەی ١٩٢٨ کە : کەمال تۆماری کردووەو فەهمی سەعید دوو مانگ مۆڵەتی تێدا وەرگرتووە. زۆر رێی تێدەچێ ئەو وێنەیە ئەگەر لە ١٩٢٧/٦/١٦ لە پێنجوێن نەگیرابێ ئەوە هیچ گومانی تێدا نامێنێتەوە هەر ئەو دوو رۆژەی جەنابی شێخ کە لە تەمووزی ١٩٢٧دا لە سلێمانی بووە گیراوە، هەرچی پێکهاتنی شێخ مەحمود لەگەڵ حکومەتیشە هەرچەندە موتەسەریفی سلێمانی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ لەم هەوڵەدا پێشتر درێغی نەکردووە، بەڵام دوای هاتنی وەزیری بەرگری ئەوسا، کە نووری سەعید پاشا بووە، بۆ هەولێرو لای مەلا ئەفەندی ئەوسا ئەحمەد عوسمان ئەربیلی لە مانگی نیسانی ١٩٢٧ گوازراوەتەوە سلێمانی و نامەی مەلا ئەفەندیش بە مەبەستی پێکهاتنی شێخ مەحمودو حکوومەت لەگەڵ خۆی بۆ جەنابی شێخ مەحمود بردووە. لەبارەی ئەو خاڵەی دواییان بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەیەوە بنۆڕە: فەرهاد عەونی چەند لایەنێکی کوردایەتی لـــە ژیانی عیزەددینی مـەلا فەندیدا.هەولێر(گۆڤار) بەهاری ٢٠٠١.

**«عەبدوڵڵا زەنگەنە»**

# هەگبەکەی شێخ

من نامەوێت بڵێم شێخ مەحمود سەردارێکی ئەفسانەیی بێ هەڵەیە، رابەرێکی ئەو بابەتە لە ناو هیچ گەلێکدا دروست نەبووە و دروستیش نابێت، کەس نییە نەکەوێتە هەڵەوە، بەڵام پێویستە هەڵەی سەردار کوشندە نەبێت، یا نەیگەێنێتە رۆخی خیانەت، لە هەردوو حاڵەتدا رابەر لەبەردەمی مێژوودا بەرپرسیار دەبێت، حوکمی مێژووش حوکمی گەلە، بۆیەکا رەوانترین حوکمە.

بەش بە حاڵی خۆم وەک بە پەرۆشێکی مێژووی کورد رۆژ بە رۆژ سەنگی شێخ مەحمودم لە لا قورستر دەبێت. بێ ئەوەی مەبەستم بێت، یا تەنانەت بۆ خۆم هەستی پێ بکەم بەشێکی زۆری نووسینەکانی ئەم دواییانەم دەربارەی شێخن. لەوەدا من لایەنگیرنیم، لە ناو ئەو فایلانەدا کە دەستم کەوتوون و کاریان تێدا دەکەم ناوی شێخ مەحمود لە سەروی هەمووانەوەیە، لە هەمووان زۆرتر دووپات دەبێتەوە. بەشێکی زۆری ئەو فایلانە هەر بەناوی شێخ مەحمود خۆیەوەن. هیچ سەرچاوەیەک وەک بەڵگەنامەکانی ناو ئەو فایلانەش داستانی خەباتی سەختی شێخ مەحمودو گەلی کوردیان بۆ تۆمارنەکردووین. جاروبار لە ناو ئەو فایلانەدا شتی سەیرو دەگمەن وەبەر چاو دەکەون. لە فایلەکانی وەزارەتی ناوخۆی رۆژگاری پاشاییدا فایلێک هەیە لە سەری نووسراوە **«المكتب الخاص،١٩٤١، وزارة الداخلية، رقم الاضبارة ٢٦/س.ل/٢، القسم٢، العنوان: الشرطة في لواء السليمانية، الموضوع: إستخدام قوة الشرطة غير النظامية لمطاردة الشيخ محمود»** واتە: **«بیرۆی تایبەتی، ساڵی ١٩٤١، وەزارەتی کاروباری ناوخۆ، ژمارەی فایل ٢٦/س.ل/٢بەشی، ٢، ناونیشان: پۆلیسی لیوای سلێمانی، بابەت: بەکارهێنانی**

---

(*) لە گۆڤاری «رەنگین»، ژمارە ١٠٤ی ساڵی ١٩٩٧دا بڵاوکراوەتەوە.

**پۆلیسی باش بوەزغ بۆ راوودونانی شێخ مەحمود»**. دوو لیستەی سەیر لەناو ئەو فایلەدا هەن ، ئەمە پوختەی مێژووی هەردووکیانە. شێخ مەحمود دوای ئەوەی نیسانی سالی ١٩٣١ لە ئاوباریک بەزی و پاش ماوەیەک لە ژێر فشاری گەمە کۆمەکێی ئینگلیز و ئێران و رژێمی پاشایی عیراقدا ناچاربوو خۆی بدات بەدەستەوە ،بە دەستبەسەری رەوانەی باشوور کرا، رۆژێک لە عانەو رۆژێک لە ئوێ رۆژێک لە ناسرییەو شوێنی تر تا دواجار لە بەغدا گیرسایەوە. لێرە خانویەکیان بۆ گرتبوو کە کەوتۆتە سەر ئەو باریکە رێگەیەی لەکۆتایی شەقامی عومەری کوڕی عەبدولعزیزەوە بەدەستی چەپدا دەچێتە گەڕەکی ئەعزەمییە، ئەو خانووە تۆکمەیە تائێستاش ماوە، دەبوو بکرێتە کۆشکی خەبات یا کۆشکی برایەتی کورد و عەرەب. شێخ مەحمود چەند سالێکی بە دەستبەسەری لە بەغدا بردەسەر، بەلام خۆ هەلناگرێت هەموان رێزیان لێ دەنا ، تەنها خاکی کوردستانی لێ قەدەغەبوو. ئەگینا دەیتوانی بە ئارەزووی دلی خۆی بە هەموو لایەکدا بچێت. رەفعەتی کوڕە گەورەی کامیل جادرچیی بەناوبانگ لەو کتێبەیدا کە بەناوی **«وێنەی باوکم** (صورة أب)»وە بلاویکردۆتەوە دەلێ: **رۆژێکیان لە دەرگە درا، میوانێکمان هات. هەر ئەوەندەم زانی باوکم بەپەلە پڕۆزکێ خۆی گەیاندە دەرێ و زۆر بەگەرمی باوەشی کرد بەمیوانەکەماندا کە سەرو پێچێکی قەبەی بەسەرەو بوو، من گەلێک حەپسام. چونکە باوکم زۆر بەدەگمەن بۆ خۆی پێشوازی میوانی دەکرد، کە پرسیم ئەو کابرا عەجاییە کێیە، گوتیان ئەوە شێخ مەحمودە.** شێخ مەحمود دەرفەتی راپەڕینی مایسی سالی ١٩٤١ی بەهەل زانی و بەرەو کوردستان گەڕایەوە. تا ئێستا چەند قەوانێک لەسەر ئەوگەڕانەوەیەی شێخ مەحمود دانراوە. نەتەوە پەرستانی عەرەب ئەو گەڕانەوەیە بە دەسیسەی ئینگلیز دادەنێن، هەر چەندە بەلگەی ئەوتۆ لە ئاراد یە واینیشان دەدات لەوانەیە فەهمی سەعید، کە یەکێک بوو لە رابەرانی راپەڕینی مایس، لەگەل شێخدا بەجووتە، پێکرا پیلانی ئەو هەلهاتنەیان دارشتبێ. فەیسەلی کوڕی فەهمی سەعید سوورە لەسەر ئەوەی کە شێخ و باوکی هاوپەیمان بوون دەلێت ئەوکاتەی شێخ لە بەغدا بوو زوو زوو لەگەل باوکمدا یەکتریان دەدی . هەمیشە بەکوردی لەگەل یەک دەئاخاوتن. هەر چۆن بێت شێخ عەودالی شێخ .

ـخی کـوردسـتـان بوو، بێ ئەو هەڵی نەدەکرد. گـەڕانەوەی شـێخ کـاربـەدەسـتـانی ێووژاند، تایبەت دوای دامرکاندنەوەی راپەڕینی مایس کە لەناو کوردەواریدا هەر بە هەراکـەی رەشید عالی گەیلانی ناوبانگی دەرکردووە.

ئینگلیزو کاربەدەستانی رژێمی پاشایی لەوە دەترسان شێخ دیسان بگەڕێتەوە کۆڕی خەبات، بۆیەکا دەستوبرد کەوتنەخۆ. درێژەی ئەم باسە ئاو زۆر دەکێشێت، لە **«رەنگین»**ی خنجـیـلانەدا جـێگەی نابێـتـەوە. بەڵام **«رەنگین»** شـایانی باسی ـەرگوزشتـەی هەگبەکەی شێخە بەهەر چوار لادا کەوتنە سۆراخی شـێخ، بۆ کوێ چوو، کـێی دی، چیی نیـازە، دەبێت چی بکەین، هەمـوو ئەمـانە بوونە راپۆرت و ـبەتی لێدوان و کۆبوونەوەی تایبەتی. لەپڕ بەوەیان زانی ئۆتۆمـبیلێک شـێخی گـواسـتـۆتەوە، بەراست و بەچەپدا دەکەونە هەواڵی ئەو ئوتومـبـیلە تا دەیدۆزنەوە، بەڵام خۆشبەختانە بەر لەوەی ئەوانی بگەنێ شێخ خۆی دەرباز کرد بوو. دوای ئەوە **«کتابناوکتابکم»** دەستپێدەکات. بەپێی نامەیەکی بەپەلە کە بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس رۆژی سێی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١ ناردوویە بۆ وەزیری کاروباری ناوخۆ ئەو ئۆتۆمبیلەی شێخ مەحمودی گـواسـتۆتەوە ژمارەکەی ٢٤٣ بەغداد بووە. لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا جانتایەک و دوو بوخچە دەدۆزنەوە کەوا دیارە شێخ لەتاو گرتن فریا نەکەوتووە لەگەڵ خۆیدا بیانبات. یەکسەر کار بەدەستانی کەرکوک دوو لیستە دەنێرنە خزمەت وەزیری کاروباری ناوخۆ، **یەکەمیان** دەربارەی ئەو کەلوپەلانەیە کەلە ئەو جـانتـاکـەی شـێخـدا بوون، **دووەمـیـشـیـان** دەربارەی کـەلوپەلەکـانی ناو دوو بوخچەکەیە. ئەمەش دەقی ئەو کەلوپەلانەیە کە بە شێخ بوون:

**لیـسـتی یەکـەم، جـانتـاکـەی:** بەرمـاڵێکی قـەیفـەی بچـووک. یەک دەرپێ. شـەرواڵێک. یەک ئاوێنە. کـەمـێک تووتنی نێرگـەلە. کـەمـێک لۆکـە. چوار کـەللە شـەکر. سێ ئاوی زەمزەم. کەمێک قـاوە. سێ سەلکە سابوونی سپی. یەک سەلک سابوونی رەقی. کەمێک چا. قوتویەکی بەتاڵ. قورئانێکی پیرۆز. کتێبێک کە شیخ مەحمود خۆی داینـاوە. نامەیێک بەزمانی کوردی کە بۆ شێخ هاتووە. نامەیەک بە زمانی عـەرەبی کـەدایەرەی تەلەفۆن بۆ شـێخی ناردووەو داوای دینارێک و چەند فلـسێکی لێدەکـات. کـتێبێـک بەزمـانی کـوردی. جـووتێک پێـڵاو. خـەنجـەرێکی

بچووک کە هی بنەماڵەی ئەحمەد خورشیدە. یەک سابووندان. یەک قاپ.

**لیستەی دووەم: دوو بوخچەکەی:** سەرپۆشێکی سپیی نوێژ. میندەرێک. بەرماڵێکی تەنکی گەورە. پانتۆڵێکی خاکیی سەربازیی زستانە. فلچەیەکی جل. سێ فانیلەی لۆکە. جوتێک دەسەسڕ. چاکەتێکی زستانە. سێ کراسی خەتدار. لفکەیەک. بوخچەیەکی بچووک. پانتۆڵێکی زەرد باوی هاوینە. دەرپێیەکی لۆکە. خاولیەک. فانیلەیەک. جوتێک گۆرەوی کۆنە. دەرپێیەکی هاوینە. سدارەیەکی خاکی. کەمێک لۆکە. دوو بوخچە. یەک فایل. نێر گێلەیەکی تەواو. قوتوویەکی تەنەکە کە شەست وێنەی هەمە جۆری تێدایە. مقەسێکی بچووک. فلچەیەکی دان. چوارحەب لەناو پاکەتێکدا. یازدە جامی وێنە. دەفتەرێکی نفووس بەناوی شێخ قادر ئەمینەوە.

لە ژێر هەردووک لیستەکەدا ناوی دوو فەرمانبەری پۆلیس نووسراوە کە ڕۆژی بیست و دووی مایسی ساڵی ١٩٤١ ئۆتۆمبیلەکەیان پشکنیوەو ئەو کەلوپەلانەی شێخیان تێدا دۆزیوەتەوە، یەکەمیان ناوی سەید عەباس سەید عیسایە کە جێگری معاونی پۆلیسی کفری بووە، ئەوی تریشیان ناوی نازم محەمەد عەلی یە کە مەئموری مەرکەز بووە. دوورنییە تەمەندارانی شاری کفری ئەو دوو ناوەیان لە یاد بێت. کەلوپەلەکانی ناو هەگبەکەی شێخیش بەڵگەیەکی تری گەورەیی ئەو پیاوەن. مۆبۆتۆسیسی سیکۆی زائیر کە هەڵهات خاوەنی شەش ملیار دۆلار بوو. موخابن بۆ ئەو **«کتێبەی کە شێخ مەحمود خۆی دایناوە»**، لەگەڵ ئەو شەست وێنەو یازدە جامەی پێی بووە، ئاخۆ ئێستاکە لە قوژبنی کام ئەرشیڤدا بێ ناز هەڵگیراون و تۆزیان لێ نیشتووە، **ئاخۆ مژدەی دۆزینەوەشیان بە نسیبی چ کوردێکی دڵسۆز دەبێت.**

الاشياء الموجودة في البقجتين

| العدد | الاشياء |
| --- | --- |
| ١ | ازار ابيض مصلي |
| ١ | مندر |
| ١ | سجادة خفيفة كبيرة |
| ١ | سروال خاكي شتائي عسكري |
| ١ | فرشة ملابس |
| ٣ | فانيلة قطن |
| ١ | جفوف زوج |
| ١ | سترة سروال شتائي املح |
| ٣ | قميص مقلم |
| ١ | ليفة |
| ١ | بقجة صغيرة |
| ١ | سروال صغير صيفي |
| ١ | لباس قطن فانيلة |
| ١ | خاولي |
| ١ | فانيلة |
| ١ | جوارب عتيك |
| ١ | لباس فانيلة صيفي |
| ١ | سدارة خاكي |
| ١ | مقدار قطن |
| ٢ | بقجة- ٢ |
| ١ | ملفة |
| ١ | نركيلة كاملة |

١ قوطية تنكة- داخلها (٦٠)

رسم متنوع الحجم والاشكال

١ مقص صغير

٤ فرشة سنون

١١ حبابي صغيرة داخل قوطية

١ جامة تصوير

دفتر النفوس باسم شيخ قادر أمين لقد فتشنا في صندوق السيارة وعثرنا على هذه الاشياء واجرينا احصائها كما مذكور في هذه الورقة ١٩٤١/٥/٢٢٠

| | |
|---|---|
| **التوقيع** | **التوقيع** |
| **ناظم محمد علي** | **سيد عباس سيد عيسى** |
| **مفوض التحقيق** | **وكيل معاون كفري** |

# شێخ مەحمود
# لە نێوان حەسەنی و عەلی کەمالدا

عەبدولڕەزاق حەسەنی (١٩٠٣-١٩٩٧) یەکێکە لە مێژوونووسە هەرە بەناوبانگەکانی عێراقی هاوچەرخ، بە دەیان بەرهەمی بەکەڵکی دوای خۆی بەجێهێشت. **«تأريخ الوزارات العراقية»**کەی کە تا ئێستا حەوت جاران چاپکراوەتەوە، نووسینێکی مێژوویی دانسقەو سەرچاوەیەکی کەم وێنەی پڕ لە زانیارییە دەربارەی ڕۆژگاری پاشایی عیراق. ئەو بەرهەمەی حەسەنی کە دە بەرگە کاری دەزگایە نەک تاکە کەسێ، ئەوە چەند ساڵێکە بە لایەنی کەمەوە دە دوکتۆری زانکۆ بە دانانی بەرهەمێکی لەو بابەتەوە دەربارەی مێژووی وەزارەتەکانی دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژەوە خەریکن.

زۆر لە نزیکەوە خوالێخۆشبوو حەسەنیم دەناسی، کوردی خۆش دەویست، هەرچەندە لە نووسینەکانیدا کە هاتۆتە سەر باسی ڕووداوەکانی کوردستان دەستی کەم تەتەڵەی نەکردوە، بە داخەوە زۆر درەنگ هەستی بەو هەڵە گەورەیەی خۆی کرد. لەو نامەی دکتۆرایەدا کە دەربارەی حەسەنییەو مانگی نیسانی ساڵی ١٩٩٩دا بە سەرپەرشتی من تەواو بوو ئەم ڕاستییەمان تۆمار کردووە.

حەسەنی لەنزیکەوە پێوەندی بە ژمارەیەک نووسەرو سیاسەتمەداری کوردەوە هەبوە، هی وەک ئەمین زەکی و تۆفیق وەهبی و ماجید مستەفا، لەگەڵ ڕۆژبەیانیدا، کە پێکڕا لە چلەکاندا لە عەمارە بەند بوون، وەک برایان لێهاتبوو. شێخ ڕەوفی شێخ مەحمودی زۆر خۆشدەویست. مەسعود محەمەد ڕێزی دەگرت و زیارەتی دەکردو جار جارەیش ڕەخنەی بەجێی لە نووسینەکانی دەگرت.

---

(*) لە گۆڤاری **«ڕەنگین»**ی ژمارە (١٢٣)ی ڕێکەوتی نیسانی ١٩٩٩ لە ل ٦-٧دا بڵاوکراوەتەوە.

کەم کەس بە رادەی عەلی کەمال لە حەسەنییەوە نزیک بوو، چ لە بەغداو دوایی چ لە لەندەن زوو زوو یەکتریان دەدی، پێم وایە عەلی کەمال یاریدەشی دەدا، بە نامە لێکیان دەپرسییەوە. بایەخی مێژوویی یەکێک لەو نامانەی عەلی کەمال ناردوونی بۆ حەسەنی بۆ لێکدانەوەی هەڵوێستی شێخ مەحمود بەرانبەر راپەڕینی نیسان-مایسی ساڵی ١٩٤١ زۆرە.

وەک ئاشکرایە کاتێک ئەو راپەڕینە بەرپا بوو شێخ مەحمود لە بەغدا دەسبەسەر بوو، شێخ لەو رۆژانەدا دەرفەتی گەڕانەوەی بۆ رەخسا. ئەوانەی هەموو رابەرێکی کوردیان بەلاوە پیاوی ئەڵقە لە گوێی بیانییە گەڕانەوەی شێخیان کردە فیت و پیلانی ئینگلیز. گەلێک بەڵگەو زانیاری ئەو بۆچوونە بە درۆ دەخەنەوە، **هەرچەندە شێخ هەقی خۆی بوو لە پێناوی کوردا هەموو جۆرە یاری و تەڵەکەبازییەکی سیاسی بکات، ئەوە یەکێکە لە یاساو دەستووورە نەگۆڕەکانی خودی سیاسەت.**

هەرچۆن بێت بەپێی ژمارەیەک بەڵگەنامەو سەرچاوە رەشید عالی گەیلانی و عەقید فەهمی سەعید شێخیان هانداوە بگەڕێتەوە بەو نیازەی لە کاتی پێویستدا کوردستان بکرێتە دوا سەنگەری بەربەرەکانیی ئینگلیز کە ئەوساکە شێخ زۆر داخ لە دڵ بوو لێیان.

عەلی کەمال کە کوردێکی دڵسۆز بوو ئاگای لە کەینوبەینی گەڕانەوەکەی شێخ بوو، ئەوو ژمارەیەک لە هاوەڵەکانی مەیلیان وابوو شێخ دەست بخاتە ناو دەستی ئینگلیزەوە چونکە ئەوان بەرژەوەندی کوردیان لەوەدا وەدی دەکرد. حەسەنی وەک مێژوونووس و وەک برادەری عەلی کەمال ئاگاداری چەند لایەنێکی ئەم باسە بوو. حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٠یش دەربارەی هەمان بابەت چەند پرسیارێکی تایبەتی بە نامە دەنێرێت بۆ عەلی کەمال لە لەندەن. رۆژی هەشتی تەمموزی هەمان ساڵ عەلی کەمال بە نامە وەڵامی عەبدولڕەزاق حەسەنی دەداتەوە. لەم چەندانەدا دەقی ئەو نامەیەم دەستکەوت کە گەلێک زانیاری مێژوویی بایەخداری دەربارەی هەڵوێستی ئەو رۆژگارەی شێخ مەحمودی تێدایە کە بێ گومان یاریدەی مێژوونووسان دەدەن بۆ ساغ کردنەوەی سەرجەمی ئەم باسە. سەرەتا عەلی کەمال سوپاسی حەسەنی کردووە کە هانی داوە کتێبەکەی حەسەنی دەربارەی هەراکەی رەشید عالی گەیلانی


BAGHDAD- IRAQ

بخوێنێتەوەو دوای ستایشی کتێبەکە دەڵێت:

**ومنیش هێندێک پێوەندیم بەم باسەوە هەبوو، بۆ بەرژەوەندی خوالێخۆشبوو شێخ مەحمودی حەفیدو قوتارکردنی لەو بارە ناهەموارەی ژیانی کە لە بەغدا لە نێوان ساڵانی ١٩٣٣و ١٩٤١دا تێی کەوتبوو کارم دەکرد، بەڵام ئەو رووی نەدامێ. لەم دوواییيانەدا لە یاداشتەکانی محەمەد فەهمی سەعیدەوە، کە یەکێک بوو لە چوار رابەرەکەی (راپەرینی ١٩٤١)، بۆم دەرکەوت کە رەشید عالی شێخ مەحمودی هاندابوو بچێت بۆ باکوورو بۆ یاریدەدانی لەشکری عێراقی ئەگەر هاتوو لەو جەنگەدا کە لەگەڵ ئینگلیزدا دەیکرد ناچار بوو بکشێتەوە ئەوێ. لە راستیدا من**

**بووم ئەو کەسەی پاڵی دەنا بە شێخ مەحمودەوە کەڵک لەو دەرفەتە وەربگرێت کە بە هۆی شەڕی ئینگلیزەوە رەخسا بوو تا لە بەغدا دەرچێت. کە رۆژی هەشتی نیسانی ساڵی ١٩٤١ بە خاوو خێزانەوە لەگەڵ ماڵی مەحمود سنەوی مامدا بەرەو سلێمانی گەڕاینەوە خوالێخۆشبوو شێخ مەحمود رایسپاردم کە بە خوالێخۆشبوو شێخ لەتیفی کوڕی بڵێم بڕیاری داوە شەوێکی دیار کراو لە بەغداوە بگەڕێتەوە باکوورو داوای لە لەتیفی کوڕی کرد هەشتا چەکداری بۆ بنێرێتە وێستگەی شەمەندەفەری کنگرەبان. من راسپاردەکەم راگەیاندو کارەکە بەو جۆرە راپەڕێنرا. کە رەشید عالی بەوەی زانی چۆن لە سلێمانی ئێمە بە تێکدانی ئەو پلانەوە خەریکین کە بۆ راگوێزانی بەرگری لەشکر(دژی ئینگلیز) بۆ کوردستان دارێژراوە ماجید مستەفای نارد، کە ئەوساکە پارێزگاری عەمارە بوو، تا بزووتنەوەکەی ئێمە لە سلێمانی پووچەڵ بکاتەوە. بەو جۆرە کاتێک پارێزگاری سلێمانی خوالێخۆشبوو حوسێن فەوزی بە گەڕانەوەی شێخی زانی بۆ لیوای سلێمانی، پێشیان گوتبوو کە شێخ مەحمود گوێڕایەڵی عەلی کەمال و دەستەودایەرەکەی ئەوە، ناردی بە دووامداو داوای لێکردم بچمە لای شێخ مەحمود نەهێڵم کارێکی ئەوتۆ بکات هێمنی ناوچەکە بشێوێت، داوای لێکردم بچمە لای شێخ مەحمود بۆ دڵدانەوەی تا لەو شوێنەی لێیەتی بمێنێتەوە بێ نانەوەی هیچ ئاژاوەیەک.**

**کە من و تۆفیق قەزاز چووین بۆ دیدەنی شێخ مەحمود دیم بیروڕای وەک بیروڕای ئێمە نییەو گوتی ئەگەر ئێوە لەگەڵ ئینگلیز بن من لەگەڵ ئەڵمانم و ئەگەر ئێوە لەگەڵ ئەڵمان بن من لەگەڵ ئینگلیزم. سەرم لەم قسانەی شێخ سوڕما... بەڵام دوایی کە زانیم چی لە ناو یاداشتەکانی محەممەد فەهمی سەعیددا گوتراوە، کە هەر بۆ خۆیشی کوردەو خەڵکی سلێمانییەو لە ناوەندی سەربازیی بەغدا هاوڕێم بوو، لە هۆی پاشەگەزبوونەوەی شێخ مەحمود تێگەیشتم، وا دیارە ئەو لە هەمان کاتدا پێوەندیی بە دەستەودایەرەی رەشید عالییەوە هەبووە. هەرچۆن بێت دەبێت بۆ دوارۆژمان پەند لەم بەسەرهاتانە وەربگرین».**

ناوەرۆکی ئەم نامەیەش بەڵگەیەکی سەلمێنەری ترە بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەوانەی شێخ مەحمودیان لە خۆڕا کردۆتە داردەستی ئینگلیز. هەروەها هەست بەوەیش



عەلی کەمال

دەکرێت کە شێخ بڕوای بە دەستەی ڕووناکبیری کورد نەمابوو، ئەو قسەیەی کە دەڵێت **«ئەگەر ئێوە لەگەڵ ئینگلیز بن من لەگەڵ ئەڵمانم و ئەگەر ئێوە لەگەڵ ئەڵمان بن من لەگەڵ ئینگلیزم»** ئاو زۆر دەکێشێت. هەرچۆن بێت عەلی کەمالیش عاشقی کوردو کوردستان بوو، ئەو پیاوە بەپێی بۆچوونی خۆی هەمیشە لە سەنگەری کوردایەتیدا بوو، گۆڤاری **«گەلاوێژ»** بە بێ یاریدەی ئەو هەناسەی لێ دەبڕا، هەرچەندە خامەی کوڵ بوو بەڵام بە نووسین زوو زوو لەسەر کورد دەهاتە دەنگ، بە وێنە کە ساڵی ١٩٧٣ **ئەدمۆن غەرەیب** لەو کتێبەیدا کە بە ناوی **«الحركة القومية الكردية»**وە بڵاوی کردۆتەوە زوڵمی لە مێژووی کورد کردبوو عەلی کەمال پیاوانە لێی هاتە دەنگ و لە نامەیەکی شازدە لاپەڕەییدا بەرپەرچی دایەوە. نزیکەی بیست ساڵ لەمەوبەر دەربارەی عەلی کەمال بەگ لە **«مێژوو»**دا نووسیومە دەڵێم:

**«ئەوی تۆماری لێکۆڵینەوەو وتووێژەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی سەردەمی پاشایی لە ساڵەکانی ئینتیدابدا دەخوێنێتەوە سڵاوی ڕێز بۆ ژمارەیەکی زۆر کەم، تایبەت عەلی کەمال، وتفی لەعنەتی بۆ ژمارەیەکی زۆر زۆر لە نوێنەرانی کورد لەو**

**ئەنجومەندا دەنێرێت، ئەوانەی خۆڵی مردوویان بەسەردا کرابوو، نە دەنگیان هەبوو نە رەنگ. وا دیارە ئەو نوێنەرانە ئەرکی خۆیان لە دوو شتدا دەبینی: وەرگرتنی مووچەی مانگانەو مۆرکردنی هەموونەو پەیمان و یاساو بڕیارانەی زۆرتر وڵاتیان بە ئینگلیزەوە دەبەستەوەو بە جارێک مافی گەلیان پێشێل دەکرد».**

هەمان کات عەلی کەمال عاشقی **«شارە گەشاوەکەی»** بوو، مزگەوتەکەی نە بناری گۆیژەدا یەکێکن لە شایەتە زۆرەکانی ئەو عیشقەی کە وای لێکرد بەر نە مەرگی داوا بکات بە خاکی سلێمانی بسپێردرێت و بەشێک لە سامانی بەجێماوی بۆ رەشوڕووتی ئەو شارە تەرخان بکات. بەهەشتی بەرین جێگەی دڵسۆزانی وەک شێخ مەحمودو عەلی کەمال و فەهمی سەعیدو عەبدولڕەزاق حەسەنی بێت.

# ویژدان و مێژوو . . یا
# دادگەریی موشیری حەمەی سلێمان

بەداخەوە جاری واهەیە درۆیەکی هەڵبەستراوی فیتنەبازێکی ناحەز بەزۆری ...زداره‌کی دەکرێتە راستییەکی مێژوویی، هەموان لە ئاسمانەوە دەیقۆزنەوە، هی ...ین هەن مشتێکیشی دەخەنە سەرو وەک شایەر هەر دەیلێن و دەیلێنەوە، نان و ...ازی پێوە دەخۆن. ئێمە بەبێ بیرکردنەوەی قووڵ، بەدرێژایی دەیان ساڵ تاوانی ...شتمانفرۆشیمان داوەتە پاڵ زانایەکی دووربینی وەک مەولانا ئیدریسی ...بدلیسی، یا مەلای خەتێ و کەسانی تر.

**موشیری حەمەی سلێمانی هەمەوەندیش یەکێکە لەوانەی مێژوونوسیی کوردی لە خۆڕا، بە تۆمەتێکی هەڵبەستراو ناوی زڕاندووە. سەرگوزشتەی ئەو حیکایەتە بەم جۆرەی لای خوارەوەیە.**

بەهاری ساڵی ١٩١٩ شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزدا تێکچوو، بە یاریدەی مەحمود خانی دزڵی دەستی بەسەر شاری سلێمانی و دەورو بەریدا گرت، مێجەرسۆن خۆی دەرباز کرد، دانلێس و ئەوانەی لەگەڵی بون دەسگیرکران، ...اوچەکانی تریش کەوتنە خۆ. دەبوو ئینگلیز دەستوبرد ئاگری ئەم بزووتنەوەیە دابمرکێننەوە بەر لەوەی تەشەنە بکاتە هەموو ناوچەکانی کوردستانی باشوور. شەڕو پێکادان و پیلان و پیلانگێڕی دەستیان پێ کرد. یەکەم شەڕی قورس لەنێوان

* لە ژمارە (١٠٢)ی ساڵی ١٩٩٧ی گۆڤاری «رەنگین»دا بلاوکراوەتەوە.

هەردوولادا لەتاسلوجە قەوما، لەو شەڕەدا ئینگلیزەکان شکان، بەپێی سەرچاوەکانی خۆیان چوار زرێپۆش و نۆزدە ئۆتۆمبیلی فۆردیان تێکشکێنران. دوای سەرکەوتنی تاسلوجە شۆڕشگیرانی کورد ترسیان شکاو خۆیان بۆ کەرکووک ئامادە کرد، ئینگلیزەکانیش بۆ تەمیەی کوردو تۆڵەی تاسلوجە کەوتنە خۆ، هێزێکی گەورەیان لە کەرکووک گەلاڵە کردو بە چەک و تفاقێکی زۆرەوە رەوانەی سلێمانی یان کرد، جەنەراڵ فرێزەر کرایە فەرماندەی ئەو هێزە کە ئینگلیزەکان ناویان لێ نابوو **«هێزی کوردستانی باشوور»**. شۆڕشگیرانی کوردیش بە سەرکردایەتی شێخ مەحموود بەرەوکەرکووک کەوتنە رێ و کە بە هێرشی هێزەکەی جەنەراڵ فرێزەریان زانی خۆیان لەمدیوی دەربەندی بازیاندا قایم کرد.

رۆژی حەڤدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ هێزەکەی جەنەراڵ فرێزەر لە کەرکووکەوە کەوتە رێ و لای ئێوارێ گەیشتنە نزیک دەربەندی بازیان، دوای ئەوەی تاریکایی داهات بەپێی نەخشەو پلانێکی سەربازیی ورد بەشێکی زۆری ئەو هێزە، بێ ئەوەی ئەودیو هەست بەمدیو بکات، بە شاخ و گردو تەپۆلکەکاندا هەڵگەڕان، تۆپە دوورهاوێژەکانیشیان سەنگەری لە باریان لێدا. بەرەبەیانی رۆژی داهاتوو ئەو هێزە گەورەیە لە ناکاودا کەوتە هێرش و لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا هەمووشت بڕایەوە. شۆڕشگیرانی کورد زۆر خراپ شکان، چل وهەشت کەسیان لێ شەهید بوو. ژمارەیەکی گەلێک لەوە زۆرتریان لێ بریندار بوو، یا بە یەخسیری کەوتنە دەست ئینگلیزەکانەوە، شێخ مەحمود بۆ خۆی یەکێک بوو لەوانەی بە برینداری لەژێر تاشەبەردێکی گەورەدا دیل کرا، خەڵکی دوایی ئەو تاشە بەردەیان ناونا **«بەردەقارەمان»**.

دوای ئەو تێکشکانە گەورەیە بەندو باوی ئەوە بڵاوبۆوە گوایە موشیری حەمەی سلێمان، کە یەکێک بوو لە ناسراوانی هەمەوەند، لە پشتەوە رێگەی نیشانی ئنگلیز داوە بۆیەکا هێزەکەی جەنەراڵ فرێزەر توانیوییە زەفەر بە کورد بەرێ. ئەوانەی پێیان وایە کورد هەرگیز ناشکێ، تایبەت لایەنگرانی شێخ مەحمود، ئەم بەندو باوەیان لە ئاسمانەوە قۆستەوە چونکە بیانوویەکی باش بوو بۆ لێکدانەوەی تێشکانی کورد. دوایی مێژوونووسانی کوردیش سوک و باریک کردیانە راستییەکی



جەنەڕاڵ فریزەری فەرماندەی «هێزی کوردستانی باشوور»

ئەنقاو لەناو تۆماری مێژوونووسیی کوردیدا. من بۆ خۆم سێ جاران لە نووسینی بڵاوکراوەی خۆمدا ئەو قسەڵۆکە هەڵبەستراوەم تۆمار کردووە، داخەکەم هەرسێ جارەکەش بەزمانی رووسی بوون، جاری یەکەمیان لەلاپەڕە سەدو شازدەی نامەی دوکتۆراکەمدا بوو، واتا ناوەندی ساڵی١٩٦٣ ، لەوێدا زۆر بە توندی فەرمووە گەر خیانەتی موشیری حەمەی سلێمان نەبوایە هەرگیزاو هەرگیز ئینگلیز نەیاندەتوانی بەسەر کورددا زاڵ ببن. ئێستا سەرم سوور دەمێنێ چۆن مامۆستاکانم ئەو بۆچوونە سادەو ساکارەیان لێ قەبوڵ کردم. جاری دووەم ئەو بۆچوونەم بە کەمێک دەسکاریەوە لە لاپەڕە حەفتاو نۆی ئەو کتێبەمدا دووپات کردۆتەوە کە ساڵی ١٩٦٧ بە رووسی چاپ کرا. دوای ئەوەیش بە دوو ساڵ لە لاپەڕە سەدو پەنجاو یەکی بەرگی یەکەمی نامەی دوکتۆرای ناوک (علوم)ە کەمدا گەلێک ئەهوەنتر توخنی ئەو باسە کەوتووم.

ئەم باسەی موشیری حەمەی سلێمان پێویستی بە پێداچوونەوەیەکی قووڵە،

چونکه پێم وایه یەکێکه لەو لاپەڕانەی مێژووی کورد که بۆ خۆمان شێواندوومانە بۆ ساغ کردنەوەی ئەم هەڵسەنگاندنە سێ خاڵی سەرەکی دەخەمە بەرچاو.

**یەکەم-** حاڵی حازر هەموو بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئینگلیز وان لەبەر دەستی بەندە ژمارەیەکی بێ ئەندازە زۆری ئەو فایلانەم دیوە کە پێوەندییان بە شێخ مەحمودەوە هەیە، بەڵگەنامەکانی ناویان هەموو شتێکیان بە ناوو شوێن و ڕۆژ و سەعاتەوە تێدا تۆمار کراوە، تەنانەت، وەک لە وتارێکی تری خۆمدا گوتومە، حەمە نێرگەلەچیی پیاوی شێخیشان بەسەردا تێنەپەڕیوە. جا لەو سەدان بەڵگەنامەیەی ئەو ڕۆژگارە کە من دیومن ناوی موشیری حەمەی سلێمان بەخراپی نەهاتووە بەپێچەوانەوە لەم چەندانەدا لە بەڵگەنامەیەکدا وەک کوردپەروەر ناوی هاتووە یەکێکە لەوانەی سەرەتای سییەکان داوای مافە ڕەواکانی کوردی کردووە، ئەوەی پاڵی پێوەنام ڕۆژێک زووتر ئەم پێداچوونەوەیەی خۆم بڵاو بکەمەوە کە دەی ساڵە لە مێشکمدا پەنگی خواردۆتەوە. خۆزگە ئەو کوردانەی لە هەندەرانن بەوردی لەناو فایلەکانی وەزارەتی موستەعمەرات و فرۆکەوانیی بەریتانیادا بەدووی ئەم باسەدا دەگەڕان، چونکە من هەموویانم لەبەردەستدا نییە.

**دووەم-** جەنەراڵ فریزەر پێویستی نە بە موشیری حەمەی سلێمان، نە بە هیچ کوردێک بوو تا بەسەر هێزەکەی شێخ مەحموددا سەربکەوێت، هێزەکەی ئەو بریتی بوو لە دوو لیوای پیادەو سوارەی سیخ و گورگەی شەڕکەری شاخاویی مەشقکراوی پڕ لە چەک و تفاقی نوێ و ژمارەیەکی زۆر لە زرێپۆش و تۆپی هەمەچەشنە کە هاتبوونە جەنگی هێزێکی بچوکی بێ مەشقی کەم چەک و تفاقی کۆن کە تەنها باوەڕیان بە کەرامات و تەلیسمی گوللە بەندەکەی شێخ مەحمود بە ڕادەی یەکەم و بە کوردایەتی بە ڕادەی چوارەم لەسەنگەری شەڕەفدا کۆی کردبوونەوە. بە داخەوە شێخ مەحمود بۆ ئەو کارە گەورەیەی بەهەزار ناری عەلی و ئەمسەرو ئەوسەر ئینجا توانیبووی سێ سەد چەکدارێک کۆ بکاتەوە، زۆربەی ئەوانیش کوردی دزڵی ئەوتۆ بوون کە لە تفەنگی پەڕپوتی ماوزەرو بڕنەوو چەقۆو خەنجەرو توورەکەیەک نانە وشکە بەولاوە هیچی تریان پێ نەبوو.

**سێ یەم-** ئینگلیزەکان ئاتاجی ئەوە نەبوون موشیری حەمەی سلێمان، یا هەر



**میجەرسۆن**

کەسێکی تر رێگەیان نیشان بدات، کەس بە رادەی ئەوان شارەزای کون و کەلەبەری سەختترین و کەلاترین شوێنی کوردستان نەبوو. ئەوان لە سەدەی شازدەمینەوە کەوتبوونە کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی کوردو وڵاتی کوردان. هەر ئەو میجەرسۆنەی کە لەو رۆژانەدا حاکمی سیاسیی سلێمانی بوو سەرەتای سەدەی بیستەمین چەند مانگێکی بەناوی بازرگانێکی شیرازییەوە لە ناو کوردی سلێمانی و دەورووبەرویدا بردبووە سەر بێ ئەوەی کەسێک هەر بشزانێ کێیەو کێ نییە، بەپێی تەریەندی بازیانی بڕیبوو، ئێمە لە رێگەی ئەوو یەک دوانێکی وەک ئەوەوە خۆمان تەسی و بەوەمان زانی ئاری نەژادین نەک جنۆکە. ئینگلیزەکان لەو سەردەمەدا بە لایەنی کەمەوە سەدان و سەدان نەخشەی وردی کوردستانیان لەبەر دەستدا بوو، شوێن نەمابوو نەخشەی نەکێشن، هەموو شارو شارۆچکەو گوندو شاخ و داخ و گردو تەپۆلکەو دارستان و گۆم و رووبارو جۆگەی کوردستانیان بست بە بست پێوابوو. ژمارەیەکی زۆر لەو نەخشانەم دیوە، پیاو سەری لە وردەکاری یان سوڕدەمێنێ، ئێستاش نە باوکی جوگرافیازانی ناسراومان دکتۆر فوئاد حەمە خورشید، نە باوکی

کەمال مەزهەر ناتوانن نەخشەیەکی وا وردی وەک ئەو نەخشانە بکێشن. ناوی هەر گوندێک لە گوندەکانی کوردستان لەناو هەر کام لە بەڵگەنامە ئینگلیزەییەکان هاتبێ شوێنەکەی لە سەر نەخشە بە سانتیم و ملیم دەسنیشان کراوە، چ جای دەربەندێکی مێژوویی ناسراوی وەک دەربەندی بازیان کە سەرباری هەر شت ناوچەیەکی زۆر سەخت نییە، پێم وایە بەرزایی لوتکەی هەرە بڵندی لە چوار هەزار پێ تێناپەڕێت، لوتکەی سەرکەشی پیرەمەگروون دەبێت زۆر بچەمێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت نەوازشی خۆی عەرزی بەردە قارەمان بکات. من بەش بە حاڵی خۆم زۆر بەگەرمی داوای لێبوردن لە موشیری حەمەی سلێمان و بنەماڵەی موشیری حەمەی سلێمان و هۆزی سەربەرزی هەمەوەندو شۆڕەسوارانی دەکەم، ئەوە فەرمانی ویژدانی مێژووە کە ئیمڕۆکە بە هەمووانی رادەگەیەنم!!

بابەتی دوازدەمین*

# شێخ مەحمود لە تەرازووی مێژوودا

پێشکەشە بەبرای عەرەب
محەمەد ئیبراهیم محەمەد

من شێخ محەمەد سالح بەرزەنجیم خۆش دەوێت، وای بۆ دەچم هەستی کوردایەتی رەسەن و خۆشەویستی شێخ مەحمود لە قوڵایی دەروونیدا جۆش بدەن، هەر لەبەر ئەوەش بەش بەحاڵی خۆم حەزم دەکرد ئەو برایە لە ناو کۆڕی مامۆستایانی زانکۆدا بوایە نەک ئەو شوێنەی ئێستەی.

شێخ زۆر تورەیە لە ئەندازیاری نووسەر ئازاد هەمەوەندی لەسەر ئەوەی لە «رەنگین»دا وێراوییە بڵێت ستراتیجیەتی شێخ مەحمود لە شەڕی دەربەندی بازیاندا دروست نەبووە. پێم وایە کەمێکیش دڵی لە من رەنجاوە چونکە لە قەناعەتەوە هەڵەیەکی خۆمم راست کردۆتەوەو هەوڵم داوە کوردێک لە تۆمەتی خیانەت قوتار بکەم، وەک بڵێیت، خوا بیبڕێت، کورد لەسەر غایەن و خۆفرۆش پەکی کەوتبێت، هەر من و شێخ دەتوانین ئیمڕۆکە بەجووتە تۆمارێکی پڕ لە شەرمەزاری بە ناوی ئەو جۆرە کەسانەوە پڕ بکەینەوە.

بەڵێ کاکە شێخ وەک کاک ئازاد گوتوویەو وەک لە وتارە بەنرخەکەی لیوا روکن شێخ نەجمەدین نەقشبەندییەوە دەردەکەوێت، کە ئەویش هەر لە «رەنگین»دا بڵاوی کردۆتەوە، ستراتیجی شێخی نەمر لە دەربەندی بازیان دروست نەبوو، وانەبوایە هەڵبەت دوژمن بەسێ دەقیقە نەیدەشکاندو نەیدەگرت، بێگومان کشانەوەو

---

(*) لە ژمارە (١١٧)ی «رەنگین»ی ١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨دا بڵاوکراوەتەوە.

هەڵهاتن لەبەردەم دوژمنێکی بەتواناد الەوە چاکترە بەدیلی بکەویتە بەردەستی نە راستییە چەند تاڵ بێت دەبێت نۆشی کەین، بەڵام ئاخۆ ئەو هەڵەیە چی لەگەورەیی شێخ مەحمود کەم بکاتەوە، بۆچ کام سەردار، کام رابەری لێهاتوو لە سەرانسەری مێژوودا بێ هەڵە بووە. **ماوەیەک لەمەوبەر نامەیەکی شێخ مەحمودم لەنێو فایلەکانی وەزارەتی کاروباری ناوخۆدا دۆزییەوە کە کۆتایی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢ ناردوویە بۆ مەلیک فەیسەڵی یەکەم، خۆزگەو هەزارجار خۆزگە بەر نە نووسینی ئەو نامەیەی دڵی خامەی شێخ بە یەکجاری لەلێدان بکەوتایە**، پێم وایە شێخ قادری شێخ نوریی خزمی بۆ نووسینی ئەو نامەیە هانی داوەو هەر ئەویش نامەکەی لە رومادییەوە گەیاندۆتە کۆشکی پاشا لە بەغدا. **لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم کەم کەس دەیتوانی بەرگەی ئەو دەردەسەرییە بگرێت کە شێخ لەو رۆژانەدا دووچاری هات، کار گەیشت بەوەی بەچکە بێ ئابڕوکانی پارێزگاری شاری حللە بە رۆژی رووناک، لەسەر شەقامەکانی شار هوهای لێ بکێشن.**

هەر شارەزاو ئاگادارێک بیەوێت بۆی هەیە بە سەدان لاپەڕەی پڕ لە شانازی لەسەر شێخ مەحمود رەش بکاتەوە. لە رۆژی شکاندنی شێخدا، دوای ئاوبارێک ڤیڤیان هۆلتی سکرتێری نوێنەری باڵای **(المندوب السامي)** بەریتانی شێخی شوبهاندووە بە رابەری نیشتمانپەروەری ئیتاڵیایی گاریبالدی بەناوبانگ.

پێم خۆشە بەم بۆنەیەوە لەم کورتە وتارەمدا دوو سەرگوزشتەی پڕ مانا دەربارەی شێخ مەحمود بۆ خوێنەرانی بگێڕمەوە. بەر لە چەند مانگێک رۆژێکیان عەمید روکنێک بە بەرگی سەربازییەوە دڵی داخورپاندم هەرزوو میوانە چاوەڕواننەکراوەکە خۆی پێ ناساندم: من ناوم محەمەد ئیبراهیم محەمەدە، بێ ئەندازە کوردم خۆش دەوێت و بڕوایەکی زۆرم بە برایەتی کوردو عەرەبە، بەشێک لە بەرهەمەکانتم خوێندۆتەوە، بەپەرۆشەوە عەوداڵی مێژووی گەلی کوردم، عاشقی جوانمەردی و ئازایەتی رۆڵەکانیم، شێخ مەحمودی حەفیدم یەکجار خۆش دەوێت، سەردارێکی لێهاتوو بوو دوای ئەوە دوو ژمارەی رۆژنامەی **«العراق»**ی دامێ کە لە هەردووکیاندا وتاری خۆی دەربارەی شێخ و خەباتی رەوای گەلی کورد بڵاوکردبۆوە دوای سوپاسێکی زۆر لێم نەشاردەوە، پێم گوت خەون بەو رۆژەوە دەبینم کە هەموو


شوفیری شێخ مه‌حموود


محه‌مه‌د ئیبراهیم محه‌مه‌د

ڕووناکبیرێکی عه‌ره‌ب وه‌ک تۆ بڕوانێته کورد. له‌وساوه محه‌مه‌د ئیبراهیم محه‌مه‌د جاروبار لێم ده‌پرسێته‌وه‌و باسی ئه‌و به‌ڵگه‌نامه‌و زانیارییانه‌م بۆ ده‌کات که ده‌رباره‌ی مێژووی کورد بوون.

سه‌رگوزشته‌ی دووه‌میان هه‌ر زۆر سه‌یره. چه‌ند مانگێک له‌مه‌وبه‌ر، دره‌نگه شه‌وانی کاتێک خه‌ریک بوو بچمه ناو جێگه‌وه ته‌له‌فۆن لێیدا. که هه‌ڵمگرت یه‌کێک گوتی من ئیبراهیم راویم، براده‌رێک له سلێمانییه‌وه هاتووه تۆی ده‌وێت و زۆر گه‌ڕاوه ماڵه‌که‌تانی بۆ نه‌دۆزراوه‌ته‌وه. که ته‌له‌فۆنه‌که‌ی دایه ده‌ست ئه‌و براده‌ره به‌جۆرێک گوتی: من جه‌میلی کوڕی ئه‌حه خورشه‌م که **پێی وابوو ده‌بێ سه‌رجه‌می کوردو له‌سه‌رووی هه‌موویشیانه‌وه گشت مێژوونووسانی کورد له نزیکه‌وه بیناسن.**
ئینجا گوتی: مامۆستا که‌ریم زه‌ند ناردوومی بۆ لای تۆو وامانده‌زانی ماڵه‌که‌تان نزیکی نه‌فه‌قی شورته‌یه، سه‌عاتێک زیاتره ده‌گه‌ڕێم و ئیتر ناچار بووم له ڕێگه‌ی ئه‌م پیاوچاکه‌وه ته‌له‌فۆنت بۆ بکه‌م.

یه‌کسه‌ر چووم به‌دووی کاک جه‌میلداو هینامه ماڵه‌وه. کاک جه‌میل، که پێم وایه له چلی تێپه‌ڕاندووه، به‌ئه‌وپه‌ڕی سۆزه‌وه، له‌سه‌ر شێوازی گوتار خوێندنه‌وه به‌دووروودرێژی و به‌شانازییه‌وه که‌وته باسی ئه‌حه خورشه‌ی باوکی که شوفێری شێخ

مەحمود بووەو گوایە ئەو شێخی لە ڕۆژانی ڕاپەڕینەکەی مایسی ساڵی ١٩٤١دا لە بەغدا ڕزگار کردووەو ئەو ئوتۆمبیلەی من لەناو وتارەکەی خۆمدا کە دەربارەی ئەو باسە لە «ڕەنگین»دا بەناوی **«هەگبەکەی شێخەوە»**** باسیم کردووەو لە کفری گیراوە، شوفێرەکەی ئەحە لە باوکی کاک جەمیل بووە.

دوای ئەوە کاک جەمیل وێنەی باوکی و نامەیەک و دوو وتاری مامۆستا کەریم زەندی پێ گەیاندم جارێکیا بە پوختەی قسەکانی خۆی و ناوەڕۆکی ئەو دوو وتارە تۆمار بکەم چونکە بۆ مێژووی خەباتی شێخ مەحمود سوودی خۆی هەیە ئەحمە وەیسە مەحمود ورمزیاری، کە هەر بە ئەحە خورشە ناسراوە ساڵی ١٩٠٧ لە شاری هەڵەبجە لە دایک بووەو ساڵی ١٩٨٢ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە. لە دەستەی یەکەمی شوفێرەکانی کوردستانە، لە **«شارە»**کەی ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە ناوی هاتووە هەرزوو ئەحە خورشە بۆتە شوفێری تۆفیق قەزازی مامی سەعید قەزاز کە یەکێک بوو لە ڕابەری ڕاپەڕینی شەشی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٠و هەمیشە وەک بارونێکی ئەوروپایی ڕەفتاری دەکردو دەژیا. قسە قسە دێنێت - نامەیەکی سەیری تۆفیق قەزازم لایە کە لە بەندیخانەی کەرکووکەوە سەرەتای سییەکان ناردوویە بۆ نوێنەری باڵا لە بەغداو بەم ڕستەیە کۆتایی پێ هێناوە. **«نۆکەری بەریتانیای گەورە لە پێناوی کوردو کوردستاندا»**.

دوای تۆفیق قەزاز بەماوەیەکی کورت ئەحە خورشە، لەو سەردەمەدا کە شێخ لە بەغدا دەسبەسەر بووە، بۆتە شوفێری ئەو، زۆر دڵسۆزی شێخ بووەو ئەویش جێگەی بڕواو متمانەی تەواوی ئەم بووە.

شێخ دەرفەتی ڕاپەڕینی مایسی ساڵی ١٩٤١ی بەهەلزانی و خۆی لە بەغدا دەربازکرد وەک لە وتاری، هەگبەکەی شێخ دا گوتومە تا ئێستە چەند زانیاریەک لەسەر گەڕانەوەی شێخ بۆ کوردستان دانراوە.

نەتەوە پەرستانی عەرەب ئەو گەڕانەوەیە بەدەسیسەی ئینگلیز دادەنێن، هەرچەند بەڵگەی ئەوتۆش لە ئارادایە وای دەردەخەن لەوانە بێت فەهمی سەعید، کە یەکێک

---

(**) ئاماژەیە بۆ بابەتی نۆیەمی بەشی یەکەمی ئەو کتێبە کە لە ل(١٨٩، ١٩٤) دەیخوێنیتەوە.
عەبدوڵلا زەنگەنە



بوو لە رابەرانی مایس، لەگەڵ شێخدا بەجووتە، پێکرا پیلانی ئەو هەڵهاتنەیان داڕشتبێ فەیسەڵی کوڕی فەهمی سەعید سوورە لەسەر ئەوەی کە شێخ و باوکی هاوپەیمان بوون، دەڵێت ئەو کاتەی شێخ لە بەغدا بوو زوو زوو لەگەڵ باوکمدا. کە ئەویش لە دایکەوە کوردە. یەکتریان دەدی و هەمیشە بەکوردی لەگەڵ یەک دەئاخاوتن، فەیسەڵ بە شانازییەوە وێنەیەکی کۆنی باوکی و شێخ مەحمودی گەورە کردووەو لە کتێبخانەکەی ماڵەوەیدا هەڵیواسیوەو سێ دانەیشی لەو وێنەیە پێشکەش کردووە بەفوئاد عارف و خەسرەو تۆفیق و من. ئەو وێنە مێژووییەم لای مەحمود ئەحمەد عوسمانیش دیوە. کە باوکی لە بیستەکان پارێزگاری سلێمانی و بەرلەوە یەکەم پارێزگاری هەولێر بووە لە رۆژگاری پاشاییدا.

بەپێی بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری ناوخۆ ئەو ئۆتۆمبیلەی شێخی لە بەغداوە گواستۆتەوە ژمارەکەی ٢٤٣ بەغداد بووەو لە کفری دوای ئەوەی شێخ دەرباز بووە. گیراوە جەمیل سوورە لەسەر ئەوەی شوفێری ئەو ئوتۆمبیلە ئەحە خورشەی باوکی بووە، ئامادەیە بەپێوە بچێتە سەر قورئان تا ئەوەت پێ بسەلمێنێ.

ئا لەم وێنە ساکارەدا کوردایەتی رەسەن و گەورەیی شێخ مەحمود زۆر زەق خۆ دەنوێنن. بەڵێ ئیمڕۆکە هەموو کوردێکی دڵسۆز شانازی بەوەوە دەکات دەستی نە رزگارکردنی شێخ مەحموددا هەبوبێت.

داستانەکانی خەباتی رەوای شێخ مەحمود لەبن نایەن، ئەوەی تا ئێستە چەند رووناکبیرێکی کوردی وەک رەفیق حیلمی و ئەحمەد خواجاو هاواری شاعیرو هی تر دەربارەی شێخ گێڕاویانەتەوە بەشێکە لە تۆماری شکۆداری ئەو خەباتە، بەڵام ئەمە وا ناگەیەنێت کە شێخ مەحمود سەردارێکی ئەفسانەیی بێ هەڵەیە، هەروەک تا ئێستە چەند جارێک نووسیومەو گوتوومە رابەرێکی لەو بابەتە لەناو هیچ گەلێکدا دروست نەبووەو دروستیش نابێت، ئێمەی کوردیش کاتی ئەوەمان هاتووە بەچاوی رەخنەوە مێژووی رابوردوومان هەڵسەنگێنین، بێگومان بەو کارەمان دەتوانین خزمەتی ئیمڕۆو دوارۆژی نەتەوەکەمان بکەین هیچ رەخنەیەکیش لە گەورەیی رابەرێک وەک شێخ مەحمود کەم ناکاتەوە هەڵبەت سەنگی شێخ لە تەرازووی مێژوودا زۆر قورسە؟.

# نامەیەک بۆ هەڵەوەڕی بەڕێز

لەدوا ژمارەی گۆڤاری **«بەیان»**دا وتارێکم دەربارەی حەمدی شاعیر بڵاوکردۆتەوە، ئەو وتارەم پێشکەش کردووە بە **«هەڵەوەڕی خۆشەویست»**، هەڵبەت پێشکەش کردنێکی لەو بابەتە سەرنج رادەکێشێت و دەبێت سەرگوزشتەی خۆی هەبێت**.

ناوەندی مایسی ساڵی ١٩٩٨ لەرێگەی پۆستەوە نامەیەکم پێگەیشت، بەعەرەبی لەسەرپاکاتی نامەکە نووسراوە: بەغدا، کۆلیجی ئەدەبیات، بەشی مێژوو، برای خۆشەویست دوکتۆر کەمال مەزهەری بەڕێز. بەمۆرەکانی سەرپاکەتەکەوە دیارە کە نامەکە لە بەغداوە رەوانەکراوە.

دیارە هەڵەوەڕ نازناوە، دەستوخەتو ناوەڕۆکی نامەکەی دەڵێن ئەو کەسە خوێندەوارێکی چاک و دڵسۆزو بێ هەوایە، دیاریشە رووناکبیرێکی پێشکەوتنخوازە.

دوابەدوای ئومێدی تەندروستی و خۆزگەی گەشەکردنی بەرهەمەکانم بەهەستێکی ناسکەوە رووی دەمی تێکردووم و دەڵێت:

**«هەتا ماوەیەک لەمەوبەر جەنابتانم وەک قارەمانێک، زانایەک دەهاتە بەرچاو، هەرواشبووە، بەڵام هەندێک گۆڕان لە هەڵسوکەوت و نووسینەکانی ئەم دواییانەتدا بەدی دەکرێت کە جێگەی داخە، تۆ لەوە زیاتری بەرگری لەپیاوی خراپ و کۆنە پەرست بکەیت و بۆیان بپارێیتەوە، هەرچەندە بەمە بتەوێت دڵی هەندێک رازی بکەیت، بەتایبەتی ماڵەوەتان و خزمەکانی».**

---

(*) لە ژمارە(١١٦)ی گۆڤاری **«رەنگین»**ی ساڵی ١٩٩٨ لە ل ١١-١٢دا بڵاوکراوەتەوە.

(**) ئاماژەیە بۆ بابەتی یەکەمی بەشی چوارەم کە لە ل(٥٠٧، ٥١٦) ئەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە.

**«عەبدوڵڵا زەنگەنە»**

وەڵامی ئەم بۆچوونانە ئاو زۆر دەکێشێت، پێویستی بە دانیشتنی دووقوڵی و لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی زۆرە، ئەوەیش، بەداخەوە، دوورە دەستە، چونکە من هەڵەوەڕ ناناسم، بۆیەکا ناچارم لە ڕێگەی «ڕەنگین»ەوە ڕووی دەمی تێبکەم کە و دیارە یەکێکە لە خوێنەرانی.

دەبێت هەڵەوەڕ مەبەستی ئەو دوو وتارەم بێت کە لە **«ڕەنگین»**دا بڵاوە کردوونەتەوە، یەکەمیان دەربارەی موشیری حەمەی سلێمان، دووەمیشیان دەربارەی نوری سەعیدە، کە بەلای خۆمەوە هەردووکیان شیاوی ئەوەن شوێنی تایبەتییان لە مێژوونوسیی کوردیدا پێبدرێت، من لە هەردووکیاندا هەوڵم داوە لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامەو پشت بەرێبازی لێکدانەوەی زانستی هەڵەی خۆم ڕاستبکەمەوە. **بەداخەوە زۆر جاران خوێنەرانی ڕۆژهەڵات بەگشتی ناتوانن خۆیان لە هەستی تایبەتمەندی خۆیان و لێکدانەوەو بۆچوونی ڕابوردوویان قوتار بکەن و چاوێک بەو بڕیارانەدا بخشێننەوە کە ڕەگ و ڕیشەیان لەناخی دەروونیاندا داکوتاوە.** یەکێک لە دەرسە گەورەکانی مێژوو ئەوەیە کە مافی کەس زەوت ناکات، ساڵەهای ساڵ فەرەنسیەکان کەوتبوونە هەڵەوە، قێزیان لە تالیران دەهاتەوەو میرابۆیان دەپەرست. سەرجەمی جیهان بەچەپ و بەراستەوە بەئایندارو بێ ئاینەوە، بەپێشکەوتنخوازو کۆنەپەرستەوە بۆ ماوەی سەدان ساڵ زۆر نزم سەیری مەکیاڤێللییان دەکرد، تەنانەت خەڵکناسێکی بێ ئەندازە دوورو وردبینی وەک شکسپیری گەورەش کەوتە داوی ئەو هەڵەیەوە، کەچی ئیمڕۆکە هەمووان لەسەر گۆڕەکەی، لەنزیک شاری فلۆرەنسەی ئیتالیاوە ئەم چەند دێڕە پڕ مانایە دەخوێننەوە:

**«هیچ جۆرە وشەیەکی ستایش و پیاهەڵدان بۆی نییە بگاتە ئاستی قوڵەپێی ئەم کەڵە ناوە - نیکۆلۆ دی بیرناردۆ مەکیاڤێللی!»**

هەڵەوەڕی خۆشەویست: با پوختەی دوا تاقیکردنەوەی خۆمت لەم بوارەدا بۆ بگێڕمەوە، کە هەمان کات پوختەی نامەی دوکتۆرایەکی بەرزە کە گەورەترین مامۆستایانی زانکۆی بەغدا پلەی ئیمتیازیان پێی بەخشی.

شازدە یا حەڤدەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ خوالێخۆشبوو عەبدوڵلا میدیای چیرۆکنووس لە بەغداوە گەڕابۆوە، کوشتنی دوکتۆر فازیل جەمالی و ڕاکێشانی

ـشەکەی بەسەر شەقامەکانی بەغدادا گەورەترین دیاری بوو کە لەگەڵ خۆیدا بۆ
ـیـمەی لاوی دڵسۆزو خوێن گـەرمی هێنابۆوە، هەمـوومـان لە خۆشـیـدا پێـمـان
حەگەیشتـە سەر ئەرز، کە پاش یەک دوو ڕۆژ زانیـمـان فـازیل جەمالی نەکوژراوە
خەفەت هەمووماني داگرت.

پاش ٣٧ ساڵ وا ڕێککەوت ببمە سەرپەرشتکاری نامەی دوکتۆرای ڕەحیم کازم
کە دەربارەی ژیان و ڕۆڵی سیاسیی فازیل جەمالی بوو، بەو بۆنەیەوە دەیان و دەیان
ـێگەنامەی نهێنی و سەرچاوەی ڕەسەنی باوەڕپێکراوم خوێندەوە، کە دەبینم لەناو
عـەرەبی هاوچەرخـدا کـەم پیـاوی وا هەڵکەوتوون بتـوانن لەڕووی دووربینی
سـیاسـییـەوە شان لەشانی فـازیل جەمالی بدەن، زیرەک، وریا، دڵسـۆزی عـەرەب،
دوژمنی باوە کوشتەی زایۆنیزم و **(ئیسرائیل)**، موسڵمـان و لەخواترس، بێ تڕوفیز،
زمان پاک و داوێن خاوێن - ئەمـانە خوورەوشتی فـازیل جەمالی بوون، نوێنەری
**«ئیسرائیل»** لە کۆمـەڵەی نەتەوە یەککگرتووەکـان گـوتویە لەقسـەو توانجی کـەس
ـرادەی قسـەو توانجەکـانی جەمـالی سڵم نەدەکـردەوە. بۆ زڕاندنی ناوی جەمـالی
ڕۆژنامـەی بەناوبانگی **«مـەعاریف»**ی زایۆنی تۆمەتی نازیزمی داوەتە پاڵی، هیچ
کـم لە دیبلۆمـاسـییـە عـەرەبەکـانی ڕۆژگـاری خـۆی نەیتـوانی وەک ئەو خزمـەتی
ـمسەلەی سەربەخۆیی مەغریب و جەزائیرو تونس و لیبیا بکات، پاشای مەغریب
دوای ئەوەی بە دەسبەسەری دوورخرایەوە، نامـەیەکی تایبەتیی ناردووە بۆ جەمالی و
گـەلێک سـوپاسگوزاریی خـۆی نیـشـانداوە، بۆی نووسـیـوە یەکـێک لەو شـتـە
دەگمەنانەی لەم ڕۆژە سەختـانەی ژیاندا سەبووریم دەدات گوتارە بەنرخەکانی بەڕێزتانە
کـە بۆ بەرگـری کـردن لە گـەلەکـەم پێـشکەشـیـان دەکـەیت بەکـۆمـەڵەی نەتەوە
یەککگرتووەکان.

**هەڵەوەری بەڕێز:** دەتوانم گەلێک لاپەڕەی لەم بابەتەت دەربارەی دوکـتـۆر فـازیل
جەمالی بۆ ڕەش بکەمەوە، بەڵام با لەوە زیاتر درێژەی پێ نەدەم و بەم هەڵوێستەی
بیرمەوە کە لەدەست کەم کەس دەوەشێتەوە. کە ساڵی ١٩٩٥ بەڕێوەبەری شاری
سان فرانسیکۆ داوەتی ڕێزی بۆ نارد بۆ بەشداریکردن لەیادی جیهانی پەنجا ساڵەی
دامەزراندنی کۆمەڵەی نەتەوە یەککگرتووەکاندا، جەمالی بەنامەیەکی ڕازاوە وەڵامی

دایەوەو داوەتەکەی رەتکردەوە چونکە، وەک لە نامەکەیدا گوتبوی، ئێمە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکانمان بۆ دابین کردنی مافی زەوتکراوی گەل و نەتەوە ژێر دەستەکانی جیهان دەویست و هەرگیزاو هەرگیز بیرمان لەوە نەدەکردەوە ئەو دەزگ شکۆدارە ببێتە داردەستی زلهێزەکانی جیهان. هەروەها نووسیبووی من ناتوانم پێ بنێمە ناو خاکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە لە کاتێکدا گەلی عیراق بەدەست برسێتییەوە دەناڵێنێ. ئەمە، بێگومان، هەڵوێستێکی دەگمەنە، وابزانم رۆژنامەی «الجمهورية»ش ئاماژەی بۆ کردبوو، بریا هەڵەوەڕ بۆ خۆی نامەکەی دەخوێندەوە کە دەقەکەیم لایە چ بەئینگلیزی و چ بەعەرەبی.

سەرباری هەموو ئەوانە بەرهەمە بلاوکراوەکانی دوکتۆر فازیل جەمالی هەمیشە شایەتی ئەوەی بۆ دەدەن کە خوێندەوارێکی پایەبڵند، نووسەرێکی قەڵەمڕەوان. شارەزایەکی پسپۆڕ بوو لەبواری پەروەردەدا، حەزی یەکەمی ژیانیشی ئەوە بوو هەر مامۆستای زانکۆ بێت، کە بەر لە ساڵێک دوکتۆر فازیل جەمالی کۆچی دوایی کرد بەئەوپەڕی شانازییەوە لەگۆڕستانی شەهیدانی تونس بەخاک سپێردرا، بەشی هەرە زۆری رۆژنامە گەورەکانی جیهان بەو بۆنەیەوە گوتاری دوورودرێژی تایبەتییان بلاوکردەوە، لەوانە سەرجەمی رۆژنامەو گۆڤارەکانی تونس و مەغریب و «تایمس» و «نیویۆرک تایمس» و «الحياة» و «القدس العربي» کە لەندەن چاپ دەبێت و وەک هەڵەوەڕی بەڕێز توندڕەوە، خۆزگە هەڵەوەڕ ئەو گوتارانەشی، بەدەم چای شیرینەوە، دەخوێندەوە کە بەشی هەرە زۆریانم لایە، خانمیش لەدەمکێشانی چادا دەستڕەنگینە.

هەڵبەت جەمالیش، وەک هەر لێپرسراوێکی تر، کەوتۆتە هەڵەشەوە، هەر بۆ نموونە من بۆ خۆم هەمیشە گلەیی هەرە گەورەم لەو سیاسەتمەدارە ئەوەیە کە زۆر دەگمەن نەبێت هیچ کاتێک ئاوڕی دۆستانەی لەگەلی کورد نەداوەتەوە، یا بابڵێین زۆر باوەڕی بەگفتوگۆیەکانی رۆژئاواییەکان بوو، تایبەت بەیەکێکی وەک بێڤنی وەزیری هەندەرانی بەریتانیا، جەمالی چەند جارێک بەو جۆرە گفتانە هەڵخەڵەت. ئەو جاروبار هەستی تایبەتی و بەرژەوەندی دەوڵەتی لای رۆژئاواییەکان تێکەڵ دەکرد، یا هیچ نەبێت بەوردی لێکی جیانەدەکردنەوە. بێگومان مێژوونووس پێویستە گشت ئەم لایەنانە وەبەرچاو بگرێت، رەش و سپی بەوردی لێک



**شێخ مەحمود لەگەڵ سەفیری ئینگلیز**

جیابکاتەوە، خۆی نەداتە دەست هەستی تایبەتی، من وام کردووەو هەمیشە هەر واش دەکەم، منیش نەیکەم حوکمی مێژوو بۆ خۆی نەگۆڕە، لەسەر هەست و بۆچوونی هەڵەوەرو من پەکی نەکەوتووە، ئیمڕۆکەش بەدروستی ئەو حوکمە دەرنەچێت هەر رۆژێک دێت دەربچێت.

هەڵەوەڕ وا دیارە جاروبار دەستی تەتەڵە دەکات، تفەنگ بەتاریکیەوە دەنێت، یا دەبێت ئاگای لە کەسوکاری ماڵەوەم نەبێت، ئەوانیش وەک ئەو پێشکەوتنخوازن و لەو رێگەیەدا لە رۆژگاری پاشاییەوە زۆریان چێشتووە، چوونەتە زیندانەوە، لە سێدارە دراون، دەربەدەرییان دیوە، بەڵام ئاخۆ نووسینەکانی من چ پەیوەندییەکیان

بەو، یا بە خزمەکانی ئەوەوە هەبێت، با هەڵەوەڕی خۆشەویست لەوە دڵنیا بێت کە ئێستا ئەو کەسە دروستنەبووە بتوانێت دەست وەرداتە ناو نووسینەکانم. هەرگیزاوهەرگیزیش ئەو کەسە لە دایک نابێت، خۆ ئەگەر لەدایکیش بوو تازە فریای من ناکەوێت، مەگەر زەوی بەپێچەوانەوە بسوڕێتەوە!!

لە شوێنێکی تری نامەکەیدا هەڵەوەڕی بەڕێز داوام لێ دەکات لە تەلەفزیۆن و شوێنە گشتییەکاندا دەرنەچم، ئای هەڵەوەڕ چەند خۆم لەو جۆرە شوێنانە دەپارێزم. چونکە بڕوا بکە بەسروشت حەزیان لێناکەم، زۆریش رقم لە تەلەفزیۆن دەبێتەوە تەنها لەبەرئەوەی بەدڵی خۆم دەرناچم.

کاکە هەڵەوەڕ: من لەژیاندا هیچ شوێنێک نییە لام بگاتە ئاستی کتێبخانەکەم. یا بابڵێین کابە پیرۆزەکەم، هەرچەندە یەکجار لەخۆیشم دڵنیام و لەچوونە هیچ شوێنێک سڵ ناکەمەوە، هەمیشە ئەوی بەڕاستی بزانم و بتوانم بێ سێ و دوو گوتومەو دەیڵێم، بەڵام بێ ئەوەی لە رێبازی زانست لابدەم، خۆم بەوە زۆر بەختەوەرم، دەشزانم ناچمە خانەی ئەو کەسانەوە کە لەسەر دوویەت یاری دەکەن، یا ئەوانەی بەزمان شێرو بەکردار رێوین.

خۆزگە هەڵەوەڕم دەناسی، خۆم وای بۆ دەچم (ق، ب)ی هەستیارو دڵسۆز بێت کە جارێک لەژیاندا دیومە، هەر چۆن بێت و هەڵەوەڕ هەر کەسێک بێت من دوعای خێری بۆ دەکەم بۆ نامە پڕ لە سۆزەکەی کە چووە سەر کەڵەکەی ئەو نامانەی شانازییان پێوە دەکەم.

# پاشکۆکان

**تێبینی:**

بابەتی یازدەمین وەک لە پێشەوە ئاماژەی بۆ کراوە، کاتی خۆی لەلاپەڕەکانی: **(ویژدان و مێژوو)** لە گۆڤاری **«رەنگین»دا** بڵاوکراوەتەوە، دەنگێکی زۆری دایەوە، زۆربەی هەرە زۆری روناکبیران پەسندیان کرد، بەڵام هەندێ بەدڵیان نەبوو. جارێکیان لەبارەی ئەو هەڵوێستانە لە دکتۆر کەمال پرسی وای وەڵامدامەوە **«بێ گومان بنەمای هەڵوێستی هەردوو لا دڵسۆزییە».**

هەڵەوەر: ئازناوی روناکبیرێکە کە نامەی گلەیی بۆ دکتۆر ناردووە ئەویش بەم وتارە تایبەتییەی سەرەوە وەڵامی داوەتەوە.

هەرچی لیوا روکن محەمەد نەجمەدین نەقشبەندی و د. فوئاد حەمە خورشیدو ئازاد هەمەوەندی و محەمەد ساڵح عەبدولکەریم و یوسف ئەمین و ئەحمەد مەلا کەریم بوو شەش وتاری سەربەخۆیان لەبارەی هەمان **«بابەتی یازدەمین»** بڵاوکردۆتەوە، بۆ ئەوەی خوێنەران هەموو لایەنێکی بابەتەکەیان لا روون بێت، وام بەباش زانی رای ئەوانیش وەک **«پاشکۆ»** لێرەدا بڵاوبکرێنەوە.

«عەبدوڵڵا زەنگەنە»

# دیسانەوە دەربارەی موشیری حەمەی سلێمان*

لیوا روکن
محەمەد نەجمەدین نەقشبەندی

مێجەر ژەنراڵ تیۆدۆر فریزەر سەرکردەی هێرشی بەریتانیا بۆ سەر کوردستان، پێویستی بەموشیری حەمەیی سلێمان هەبوو رێی سەرکەوتنی لە بەڕێوەبردنی شەڕی دەربەندیی بازیاندا پیشان بدا؟

بەوە زۆر خۆشحاڵ بووم کە وتارەکەی دوکتۆر کەمال مەزهەرم لە **«رەنگین»**ی ژمارە ۱۰۲ی ئەمساڵدا بە ناونیشانی **«ویژدان و مێژوو.. یا دادگەریی موشیری حەمەی سلێمان»** خوێندەوە، دیم ئازایەتییەکی زۆری لە هەڵسانگاندنەوەی هەندێ رووداوی مێژوویدا بە مەبەستی راستکردنەوەی هەڵەو هێنانەوە سەر رێی هەندێ لە رێی لادان تیابوو. پێشینان وتوویانە **«لە راست بەولاوە هیچی تر راست نییە»**. جا منیش هەر بە رێی پشتگیری لە بۆچوونەکەیی دوکتۆر کەمال و هێنانەدیی هەمان ئامانجدا، بە پێویستی سەرشانی خۆمم زانی، پشت بە راستییە چەسپاوەکان و ئەو سەرچاوانەی لە بەردەستمدان، ئەو بارودۆخ و کارا (عامل - عوامل)یانە کە هەڵوێستی (موقف)ی ئەو رۆژەیان تێدا بوو لەرووی زانستی و سوپاییەوە شیبکەمەوە، بۆ ئەوەی بگەمە وەڵامی ئەو پرسیارەی لە سەرەتاوە کردم.

**«لە سەردەمی ئیفلاتوونەوە تا ئەمرۆ کە سەردەمی پەیمانی باکووری ئەتلانتیکە، مێژووی سەرکردایەتی لە جەنگدا، بە شێوەیەکی بنچینەیی، لە زنجیرەیەکی لە ژمارە نەهاتووی داواو هێنانەدی لە بارەی راستییەکانەوە پێکدێ»**.

---

* لە ژمارە (۱۰۵)ی گۆڤاری **«رەنگین»**ی رێکەوتی ١٤ی تەشرینی یەکەمی ۱۹۹۷دا بلاوکراوەتەوە.

بەش بە حاڵی جەنگە تەکتیکییەکان، سەرکردە لە کاری بڕیارداندا، پشتی بە دوو ڕەگەزی سەرەکی ئەستوورە: مەیدانی جەنگەکەی چۆن دێتە پێشچاوو. لە شیکردنەوەی هەردوو ڕەگەزی کات و جێگادا، چ بۆ هێزە دۆستەکان و چ بۆ هێزە دوژمنەکان، چاوەڕوانی چ دوا ئەنجامێکە؟ پاش ساڵی ١٨٥٠ی ز. ئەم مەودایە لە رووی رستەی ئەڵمانیی«**هەڵوێست هەڵسەنگاندن - تقدير الموقف**»دا کرایەوە کەواتە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی گشت ئەو کارایانەی کار دەکەنە سەر هێنانەدی ئەرکەکەی سەرکردە، هەر سەرکردەیێ بگری، دەبێ بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی هەر گیروگرفتێکی سوپایی کە لەوانەبێ بێنەڕێی، هەڵوێست هەڵسەنگێنێ، تا هێوی ئەوەی هەبێ بگاتە پلانێکی ڕۆشن و وردی وا سەرکەوتنی بۆ دابین بکا.

کەواتە پێویست بوو لەسەر ژەنراڵ فرێزەر، هەر کە ڕۆژی ١٦ی حوزەیرانی ١٩١٩ هێزەکانی گەیشتنە باکووری شاری چەمچەماڵ، پلانێکی تەکتیکی لەم هەڵوێستەدا ئامادە بکا بۆ هێرش کردنە سەر شوێنەکانی شۆڕش بەسەرکردایەتیی شێخ مەحمودی حەفید لە دەربەندی بازیان. بۆ ئەوەیش پێویست بوو ئەم کارایانەی خوارەوە لە پێش چاوی خۆیا دانێ بۆ ئەوەی دەستی بگاتە باشترینی ئەو بژار (خیار)انەی لە بەر دەستیا بوون و دەیتوانی هەرکامیان هەڵبژێرێ تا ئەرکەکەی سەرشانی خۆی وەدی بێنێ، ئینجا ئەو ڕێگایەی هەڵی دەبژێرێ بکا بە پلانێکی تەکتیکی ڕێکوپێک و ڕوون و پاش ئەمە جەنگی هێرشەکە لەبەر ڕووناکی ئەم پلانەدا بەڕێوەبەرێ.

**کارایی یەکەم: «بەراوردکردنی هێزەکان»** واتە بەجێهێنانی بەراوردێکی ورد لە نێوان هێزەکانی خۆی و هێزەکانی دوژمندا.

بەش بەحاڵی هێزەکانی خۆی پێکهاتبوون لە: تیپی یەکەمی لەشکری پێنج کە بە«**تیپی سووریی ڕۆژهەڵات**» بەناوبانگ بوو، هەروا بەتالیۆنی پیادەی بورمی لەتیپی٨٥/و بەتالیۆنی پیادەی یەکەمی پەنجابی لەتیپی/ ٨٧و بەتالیۆنی یەکەمی مەهراتی لەتیپی/ ١١ پەلی یەکەمی بەتالیۆنی/ ٤٩ی پیادەی بەنگالی و پەلی ٢٣٩ی بەتالیۆنی١١٨ی هیندیی مەترەلۆز. تۆپخانەکەیشی پێکهاتبوو لە بەتەریەی ٢٥ی چیایی هیندی کە پێکهاتبوو لە (٤-٦) تۆپی چیایی کە بەکۆڵی

ئیستر دەگوێزرانەوەو، چەند پارچەیەکی بەتەریەی (ب) و (د)ی کەتیبەی ٢٣٦ی قوتابخانەی میکانیکیی شاهانە، پۆلی ٣٦ی ئاسمانیی هێزی ئاسمانی شاهانەیش تەرخانکرابوو بۆ دابینکردنی ئەرکی هەواڵ زانین و پشتگیریی ئاسمانی. چەند ڕەگەزێکیش لە بەشی موخابەرەو ئەندازیاری و هەواڵ زانی و سوارەو زرێپۆش پشتی ئەم هێزەیان دەگرت و کۆمەڵە بەڕێوەبەرێکی لێهاتووی (**وەک کارمەندانی پزیشکی و ئازووقەو چەک پێدەرو ئاو بۆ دابین کەرو... تاد**)یشیان بۆ ئامادە کردبوو، هەروەها ستافێکی ئەرکانی بەتوانایان بۆ دانابوو، ئەفسەری سیاسی کرامەیان خستبووە پاڵ کە لە سەرەتادا (مێجەرسۆن) لەوێ بوو و پاشان (مێجەر ئەدمۆنس) هاتە جێی.

هێزی شۆڕشی کوردیش بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود پێکهاتبوو لە کۆمەڵێ جەنگاوەری عەشایری بەرزنجەو جاف و هەورامانی ئێران تێکەڵ لەگەڵ هێزێکی نیوە مەشقپێکراوی لێویی تفەنگی جۆراوجۆرو کۆن و خەنجەر بەدەست کە لە (٣٠٠) کەس تێنەدەپەڕین و هەندێکیشیان ئەسپیان لەژێرابوو.

ژەنراڵ فرێزەر گەیشتە ئەو ئەنجامە کە هێزەکەی چ بە چۆنێتی و چ بە چەندێتی لە هێزی دوژمن بالاترەو، دوژمنەکەیشی لە هەموو هۆیەکی سەرکەوتن بێ بەشە تەنها یەک هۆ نەبێ کە ئەویش گیانی (روحی) مەعنەوی و نەتەوەییەو، ئەو گیانەیشی ئەوەوە هێناوە کە ماوەیەکی کەم لەوە پێش توانیبووی لە ناو شیوو گردو زورگەکانی تاسڵووجەدا لە کاروانێکی میکانیکی بەریتانیایی بدا کە بۆ سلێمانی دەچوو و لەو ئەوانەدا بۆسەیان بۆ نابووەوە، لە راستیدا هێزەکەی شێخ مەحمود پێویستی بە سادەترین مایەکانی سەرکەوتنی وەک چەکی چاک و مەشقپێکران و شارەزایی لە جەنگ و سەرکردایەتیی لێهاتووی مەشقکردوو و ئاگاداری لە سەرەتاکانی تەکتیک هەبوو. هەروەها پێویستی بە پشتگرتنی بەتۆپخانە، ئەندازیاری و بەڕێوەبەرێتی هەبوو. هیچ شتێکیشی لە بارەی هێزی دوژمنەکەی و شوێنی جێگرتنی و کاتی هێرش و رێبازی پێشکەوتنیەوە نەدەزانی.

**کارایی دووەم:** سروشتی ئەو زەوییەیە جەنگەکەی تیا دەکرێ. لە کاتێکا ژەنراڵ فرێزەر نەخشەی وردی جۆربەجۆری گەورەو بچووکی ناوچەی کوردستانی باشووری لە

ژێر دەستا بوون لە ماوەیەک لەوەوبەر پێوانەکارانی ئەمبراتۆریی ئامادەیان کردبوو
و شارو گوندو زنجیرە چیاو رووبارو رێگاویان و کوێرەڕێ و دەربەندەکانیان بە ت
خۆماڵییەکانیان تیا دیارکرابوو و نەفسەرە سیاسییەکانی ناوچەکەیش زانیاری
زیاتریان دابوو بەبارەگای ژەنەراڵ. پاش ئەوەیش رەگەزەکانی هەواڵی زەوی
ئاسمان ناسین پەی دەر پەی بە ناوچەکەدا دەهاتن و دەچوون تا بە شێوەیەکی تەو
لە سروشتی زەویی ناوچەی شەڕەکە شارەزا بێن.

ئەمەیش، واتە سەرکردایەتیی هێزەکەی بەریتانیا هیچ رێگاو کوێرەڕێ
دەربەندێکی چیایی پێ نەگەڕابێ، ئەوەی لە سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکانی خۆیەوە بە
درێژی لە هەموو روویەکی ئاگادار نەبێ. جا لێرەدا من پرسیاری ئەوە دەکەم نەخێر
سەرکردە هەرگیز پێویستی بەوە دەبێ پرسیار لە کەسێک لە دەرەوەی هێزەکانی
بکات رێگایەک، یا راگوزەرێکی پیشانبدا لە کاتێکدا کە خۆی ئەم گشتە
زانیارییەی لە بارەی زەویی جەنگەکەو هێزەکانی دوژمنەوە هەبێ؟.

لە لێکۆڵینەوەی زەوییەکەوە سەر لەشکر فرێزەر گەیشتە ئەوە کە وا هیچ
کۆسپێکی سروشت کردی ئەوتۆی (بۆ نموونە وەک رووبار) نییە رێگا لە مانۆڕەکەی
ئەو بگرێ. دوژمنیش پەنای نەبردووەتە بەر دروستکردنی کۆسپی دەستکرد
تەنانەت کەندیشی لە شوێنەکەی خۆیا هەڵنەکەندووە، تەنها ئەوەندەی بەس بووە کە
نەفەرەکانی خۆیان لە پشت ئەو تاوێرە بەردانەوە حەشار بدەن کە بە شاخەکەوە
لەبەر ئەوەی کاتی ئەوەی نەبوو هۆی ئەوەی بەدەستەوە نەبوو کۆسپێ لەرێی نەف
پێ دروست بکاو، هێزەکانیشی مەشقی ئەم جۆرە جەنگەیان نەکردووە.

سەرکردەی هێزەکانی بەریتانیا سەرنجیدا کە وا سێ هێڵی (محور) لە(تەکیەی
کاک ئەحمەد)ەوە بۆ ناوچەی (دەربەند)و بەرەو رووی ملەکانی **(گۆیژە)** هەیە
هێڵی باکوور کە هەندێ رێ و کوێرەڕێ دەگرێتەوەو دەچنەوە سەر لووتکەی قۆچی
باکووری (دەربەند) **(لای کارگە گەچەکەی ئێستا)**. ئەمەیان بۆ پیادە دەست دەدا
بەتالیۆنێکی پیادە دەگرێت، ئەنجا هێڵی ناوەڕاست، واتە لەم بەرو ئەوبەری رێگای
گشتیی **(چەمچەماڵ - تەکیەی کاک ئەحمەد - دەربەند - دێی گۆیژە -
سلێمانی)** و یەک تیپی پیادە دەگرێت و لە کەلەبەرەکەی دەربەندەوە تێ دەپەڕێ

ئینجا هێڵی باشوور (لای ناوچەی ئێستای پۆلیسخانە کۆنەکەوە)و بەتالیۆنێکی پیادە دەگرێت. بەڵێ، ئەگەر بەرەو باکوور یان بەرەو باشوور بڕۆین ڕێگاو کوێرە ڕێی زۆری تریش هەن، بەڵام لەشکرەکە لە ناوچەی جەنگ دوور دەکەوێتەوە، لەبەر ئەوە پێویست بە لێکۆڵینەوەیان نەبووە، سەرکردە گەیشتە ئەو ئەنجامە کە باشترین و کورتترین هێڵ هێڵی ناوەڕاستە بۆ ئەوەی بەشی زۆری هێزەکەی لێوە بخاتەگەڕ، بەڵام پێویستە بەرلەوەی هەڵمەت بۆ ناو دەربەندەکە ببرێ دەست بەسەر هەردوو شانی باکوورو باشووری دەربەندەکە بگیرێ **(وا باوبوو کە موشیری حەمەی سلێمان سەرکردەی بەریتانیاییەکانی لەوە ئاگادار کردووە کە شۆڕشگێڕەکان لە ڕێگای چەمچەماڵ - گوندی عەسکەر- ئاغجەلەر- گوندی گۆپاڵەوە گەمارۆ بدات)**. جا با لەسەر باسەکەی خۆمان بڕۆین و بزانین ئاخۆ ژەنراڵ فرێزەز لە هێرشەکەیا ئەم هێڵەی گرتووەتەبەر؟

**کارایی سێهەم:** هەڵسەنگاندنی ئەرک، واتە تەرخان کردنی هێز بۆ ئەرکە پێویست و گرنگەکان بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی سەرشانی. ژەنراڵ فرێزەر لە کۆڵینەوە لە هێزەکانی دوژمن و سروشتی زەوییەکەوە سەرنجی ئەوەی دابوو کە پێویستە بەتالیۆنێکی پیادە تەرخان بکا بۆ هەر شانێ لە شانەکانی دەربەندو دوو بەتالیۆنیش بۆ لای ڕاست و چەپی ڕێگای گشتییەوە دانێ و پاشکەوتێکی زۆری وایشی هەبێ هیچ سەرکردەی لەشکرێک لە بارودۆخێکی وادا خەونیشی پێوە نەبینێ، ئەوجا پشتگیریی تۆپخانەو مەترەلۆزیشی تەرخان کردبوو بۆ دابین کردنی گەورەترین ئاگر باران بۆ پشتگیریی بەتالیۆنە هەڵمەت بەرەکانی و بۆی دەرکەوتبوو کە وا لە سنووری یەک بە دەدا زیاتری لە دوژمن هەیەو ئەمیش، واتە ئەم کارایە بەلای ئەمیدا ئەکشێنێتەوە.

**کارایی چوارەم:** کات و دوورو نزیکی. سەرکردە سەرنجیدا کە وا لە بارەی کات و دوورو نزیکییەوە جیاوازییەک لە نێوان سێ هێڵەکەدا نییە، چونکە بە کردەوە ناتوانێ هێڵی ناوەڕاست بگرێتەبەر ئەگەر شانەکانی دەربەندی نەگرتبێ. بەڵام ئەگەر بەراوردێ لە نێوان ئەم هێڵەو هەر هێڵێکی تری دووری وەک هێڵی (چەمچەماڵ - گوندی عەسکەر - ئاغجەلەر - گۆپاڵە)دا بکا جیاوازییەکی زۆر چ

له رووی کات و چ لەرووی دوورو نزیکییەوە لەنێوان هەردوو هێڵدا دەبینێ. لەبەر ئەوە گەیشتە ئەو ئەنجامە کە وا هێڵی ناوەڕاست لەگەڵ بەکارهێنانی هێڵی باکوورو هێڵی باشووریش زوو پێی مسۆگەر دەکا کە زەویش کارای گرنگ و هەموو شت برەوەیە بۆ دوایی پێهێنانی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمودو گێڕانەوەی کاروبار بۆ ئاستی خۆی. هەروا ئەم هێڵە ئاسانیی دەست بەسەراگرتن و سەرپەرشتی و فرکردنەوەی پشتگیری بە ئاگریشی بۆ دابین دەکا جا لە بارودۆخ و هەڵوێستی وێد ئەقڵ نایبڕێ سەرکردەیەکی دنیادیدەو خاوەن ئەزموونی گەورە پشت بە مانۆڕی گەمارۆدانێکی بەربڵاو لە باکوورەوە ببەستێ، لە کاتێکا کە مانۆڕی بەرەیی هەموو ئەم کارایانەی بۆ مسۆگەر دەکا.

**بژاری یەکەم:** هێرش بە هەوڵی سەرەکی لەسەر رێگای گشتییەوەو، بەهەوڵێکی ئایەختر لە هێڵی باکوورەوە.

**بژاری دووەم:** هێرش بە هەوڵی سەرەکی لەسەر رێگای گشتییەوەو، بە هەوڵێکی ئایەختر لە هێڵی باشوورەوە.

**بژاری سێیەم:** هێرش بە هەوڵی سەرەکی لەسەر رێگای گشتییەوەو، بە هەوڵێکی ئایەختر لە دوو هێڵی باکوورو باشوورەوە.

بێگومان دەبێ سەرکردە گەشتبێتە ئەوە کە بژاری سێهەم لە هەموو بژارەکان چاکترەو لە توانایا هەیە هەر سەرکەوتنێکی لەم رێگایەوە دەسگیر ببێ گەشەی پێبداو کەڵکی لێوەربگرێ و سەرپەرشتی و دەستی بەسەرداگرتن و هێشتنەوەی دوژمن لە جێی خۆیاو نەهێشتنی بزووتنی لە هەموو هێڵەکانەوە دابین بکا.

بەڵام ئاخۆ خۆی چۆنی کردووە؟ با بگەڕێینەوە بۆ سەر سەرچاوەکانی خۆیان: **(لە رۆژی ١٧ی حوزەیراندا هەموو هێزەکە بەرەو گوندی تەکیەی کاک ئەحمەد کە سێ میل لە دەربەندەوە دوورە، کەوتە رێ. هەر لە یەکەمین تیشکی سبەینێی رۆژی دادێ، پیادەکان بە بێ دەنگییەکی تەواوەوە لە هەموو لایەکەوە دەستیان کرد بەهەڵگەڕان بەسەر هەموو بەرزاییەکاندا، کە گەیشتنە لووتکەکەو لەگەڵ یەکەمین تاڵی رووناکیی بەرەبەیاندا تۆپخانە ئاگری بۆ سەر دەربەندو پشت دەربەند کردەوە. هێزە هێرش هاوردووەکان هێزی عەشایرەکانیان** (لەشکری شێخ مەحمود) **کە**



ئەفسەرو سەربازەکانی سوپای کوردستان

لەبەرانبەریاندا بوون گەمارۆ درابوو. شەڕەکە لە چەند وردکە (دقیقة)یەکدا برایەوە. لەشکری شێخ ٤٨ لاشەی لە مەیدانی شەڕدا جێهێشتبوو، زۆریشی لێ بریندار کرابوو کە یەکێکیان شێخ مەحمود خۆی بوو و بەبریندارى بە دیل گیرا. لیڤییەکان بێ ئەوەی تەقەیەک چییە لە تفەنگیانەوە بێ، خۆیان و چەکەکانیان بەدەستەوە. شەڕەکە بەم جۆرە برایەوە. پاش ئەمە ژەنراڵ فەرمانیدا بە رەعیلی ژمارە ٣٣ی سوارە کە لە ژێر سەرکردەیی مولازم ف.ب.ع دینهای دا بوو بە هەموو دەستوبردێکەوە بەرەو سلێمانی پەلامار بەرێ تا ئەو ئەفسەرانە بەرەڵڵا بکەن کە لەوێ دیل کرابوون. هەواڵی شەڕەکە لەگەڵ گەیشتنی ئەم رەعیلەدا گەیشتە سلێمانی».

کەواتە، ئاخۆ ژەنراڵ فرێزەر هیچ پێویستی بە موشیری حەمەی سلێمان بوو رێنموونیی بکا بۆ سەرکەوتن لە شەڕی دەربەندی بازیانداو، تەنانەت ئەگەر ئەم قسەو قسەڵۆکانەی لە بارەی موشیرەوە دەکرێن، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەی خۆی شوێن ئامۆژگارییەکانی موشیر کەوتووە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بە گوێرەی زانست و پشت بەو شارەزاییانەی ژەنراڵ لە هونەری جەنگدا وەک سەرلەشکرێکی لە جەنگدا

قاڵ بوو بوویەتی، نەخێرو هیچ پێویستییەکی نە بە موشیری حەمەی سلێمان و نە بە کەسی تر لە خەڵکی ناوچەکە نەبووەو خۆ ئەگەر بیشلێین موشیری ناوبراو ئەم پێشنیارەی پێشکەش کردووە، ئەقڵ دەیبڕێ سەرکردەیەکی لە کاری خۆیا قاڵ بوو بێ هەڵسەنگاندنێکی راست و دروستی بارودۆخ و هەڵوێست بەگوێی بکاو پشتی پێ ببەستێ؟

بەش بەحاڵی خۆیشم دەڵێم لە هیچ سەرچاوەیەکا پەنجە درێژ کردنێکم بۆ ناوی ئەو پیاوە بەرچاو نەکەوتووەو، بەپێویستی دەزانم داوای لێبووردن لە خۆی و بنەماڵە خاوەن قەدرەکەی و خێڵە ئازاو قارەمانەکەی بکرێ کە نموونەی ئازایەتی و کەڵەمێردی و شۆڕەسواری و قارەمانەتی بوون لە مێژوودا، باوەڕم پێەوە کە و ناوبراو بەرییە لەم تومەتەو کۆڵینەوەو شیکردنەوەی زانستییانەی سوپایی جەخت لەسەر ئەم دەکاتەوە.

هێزی پەلاماردەری ژەنەڕاڵ فریزەر سادە نەبوو تاکو پەنا بەرێتە بەر هاووڵاتییەکی ئەو ناوچەیە

# جوگرافیای سەربازی و موشیری حەمەی سلێمان؟*

دوکتۆر فوئادی حەمە خورشید
زانکۆی بەغدا

**پێشەکی:**

بەڕێز پرۆفیسۆر دوکتۆر کەمال مەزهەر لە ژمارە (١٠٢)ی گۆڤاری رەنگیندا وتارێکی بلاوکردەوە بە ناونیشانی **(ویژدان و مێژوو. یان دادگەریی موشیری حەمەی سلێمان)**و لە ژمارە (١٠٥)ی هەمان گۆڤاردا بەڕێز لیوا روکن محەمەد نجمەدین نەقشبەندی وتارێکی تریشی بلاوکردەوە بە ناونیشانی **(دیسانەوە دەربارەی موشیری حەمەی سلێمان)**.

بەڕێز د. کەمال بە بەڵگەی مێژوویی و بەڕێز لیوا روکن نەقشبەندی بە بەڵگەی زانیاری و هونەری سوپایی، هەردوو ئەو بەڕێزانە روونیان کردەوە کە هێزی ژەنەڕاڵ فریزەر دەرچووی قوتابخانەی جەنگی جیهانی یەکەم قەد پێویستی نەبووە بەیارمەتییەکانی موشیری حەمەی سلێمان بۆ پێکهێنانی سەرکەوتن دژ بە هێزەکانی شێخ مەحمودی نەمر لە شەڕی دەربەندی بازیان (١٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩)و بەگوێرەی زانست دەریان خست کە ئەو قسەو قسەڵۆکانەی لە بارەی موشیرەوە کراون تومەتێکی هەڵبەستراوەو هیچ رەگەزو بناغەیەکی نییەو، ناوبراو بەتەواوی بەرییە لەو تومەتە.

---

(*) لە گۆڤاری «رەنگین»، ژمارە (١٠٧)ی رێکەوتی ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٩٧، لە ل ٩-١١دا بلاوکراوەتەوە.

## دەنگ و ڕێ نیشاندەر

لێـرەدا من دەپرسم ئایا راسـتـە هێـزی ژەنەڕاڵ فـریزەر پێـویسـتی بە(ڕێ نیـشـان)دەرێـک نەبووە بۆ وەدی هێنانی سـەرکـەوتنێکی سـوپایی کـتـوپڕ دژ بە هێزەکانی شێخ مەحمودی نەمر لە دەربەندی بازیان؟

ڕێ نیشاندەر لە ڕووی جوگرافیای سەربازیەوە **(الجغرافية العسكرية)** ڕۆڵی کـاریگەری هەیە بۆ زێدە زانیـاری هەمـەجـۆرە دەربارەی هەلومـەرجی بەرەی هێـزی دوژمن، لە کـاتێکدا زانیـاریت دەربارەی مـۆڵگاکـانی دوژمنت تەم و مـژاوی بێت و هەڵوێسـتی ئەو بەتەواوی نەزانرێت، بۆیە ڕێ نیـشـاندەر هەمـان ڕۆڵی هەیە چ لە شەڕی پارتی زانی یان جەنگی تەقلیدی، جا با بزانین جوگرافیا دەربارەی ئەم بابەتە دەڵێ چی؟

## جوگرافیای سوپایی و موشیر

هێـزی پەلاماردەری ژەنەڕاڵ فریزەر ئەو هێزە سادەیە نەبوو تاکو پەنا بەرێتە بەر هاووڵاتیـیـەکی ئەو ناوچەیە بۆ پەیاکـردنی چەند زانیـارییـەک دەربارەی **(پیادەڕێ)** یەک بۆ هێزە زەبەلاحەکەی کە پێک هاتبوو لە یەک لیـواو سێ فەوج و دوو سەریە لەتەک چەندین بەشی تۆپی میکانیزمی و فڕۆکەی جەنگی و شارەزایانی موخابەرەی بێ تەل و ئەندازیارانی مین چاندن و ئەندازیارانی شاخ، چونکە ئەو هێزە داگیرکەرە پێشـەکی زانیـارییـەکی تـەواوی بەدەسـتـەوە هەبوو دەربارەی جـوگرافـیـای سـوپایی ناوچەی دەربەندی بازیان - گۆڕەپانی جەنگەکە - نەک هەر بە نەخشەو فۆتۆگرافی ئاسـمـانی **(بە فڕۆکە)**، بەڵکو لەڕووی مـەیدانیـشـەوە چەند ئەفـسـەری مـەساح و ئەفـسەری سیاسی پێشـەکی ئەو ناوچەیان بە باشی تا سلێمانی بینیوەو پشکنیوە. سەرەڕای هەمـوو ئەو زانیـارییـە جوگرافـیـاییـانە، چەندین ڕاپۆرتی نهێنی دەربارەی ناوچەکەو دانیشتووانی و هەڵوێستی خێڵەکانی لە ئەرشیفی موخابەراتی بەریتانیـ لە ژێر دەسـتی ژەنەڕاڵ فـریزەرو ئەرکـانی جـەنگی بوون کـاتی پلان دانانی ئەو هێرشەیان بۆ سەر بەردە قارەمان.




ژەنەڕاڵ فرێزەر لە بەشێک لە پلانی پەلاماردان پەنای بردە سەر دوو کەتیبەی شاخەوانی گورگەو کردیانی بە دوو بەش تاکو لەسەر دوو قۆڵە شاخاوییەکەی باکوورو باشووری دەربەند، کتوپڕ، پەلاماری ناو دەربەند بدەن. راپۆرتێکی نهێنی بەریتانی دەڵێت: ئەم (گورگ)انە لەرووی شارەزایی پەلاماردانەکانی سەرشاخ و هەردوو کێو هاوتای کوردانن. منیش دەڵێم نەک هەر ئەمە، بەڵکو بەرزاییەکانی دەربەندی بازیان لەرووی جوگرافیەوە هەر وەک گردۆڵەو تەپۆڵکەن گەر بەراوردیان لە تەک شاخە بەرزەکانی هیمالایاو دەوروبەری کەین، بۆیە پەلاماردەرانی گورگە لە هەر لایەک بیووایە بۆ بەرزاییەکانی باکوورو باشووری دەربەند، پیادە رێ هەبێ یان نەبێ، وەک ئاسکە هەر سەردەکەوتن، ئیتر سوپای فرێزەر چ پێویستییەکی

بەئامۆژگاری موشیری حەمەی سلێمان هەبوو!!؟

جگە لەمەش گەر بەراوردی تەرازوی هێز لەو شەڕەدا بکەین دەبینین کە وا هێزی پەلامـاردەری فـریزەر سـەدان جـار لە رووی ژمـارەو جـۆری چەک و چ لەرووی هاویشتنی ئاگرو بواری تەکنیکی و لوجستییەوە لە هێزی بەرنگاربوونەوەی شێخ مەحمودی نەمر، زۆر، زۆر گەورەترو بەهێزترو تواناتربوو، هەرچەندە مەعنەویاتی شێخی نەمرو هەڤالانی زۆر پتەو بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ژەنەراڵ فریزەر تاکتیکی غافلگیری و خەستی ئاگری بەکارهێنا دژ بە هێزە بچووکەکەی شۆڕش کە خۆی خزاندبووە ناو دەربەندەکە - لە قورنە مردووەکە - ئەمەش لە رووی جوگرافیـای سەربازییەوە خۆی لە خۆیەوە گەمارۆدانێکی خۆییە، بۆیە پلان دانان بۆ گەمارۆدانی ئەو هێزە بچووکە بۆ ژەنەراڵ فریزەر زۆر ئاسان بوو.

ئەم چەند روونکردنەوەیەی جوگرافیای سەربازی دەریدەخات کە هێزی فریزەر لە هەموو رووێکەوە پێویستی قەد بە ئامۆژگاری و یارمەتی هیچ هاوولاتییەکی ناوچەکە نەبوو، دەیسەلمێنێ کە ئەو ژەنەراڵە پەنای تەواوی بردبووە بەر پلانی سەربازی تایبەتی خۆی بۆ وەدی هێنانی سەرکەوتنێکی گورج و خێرا، بۆیە منیش باوەڕی ئێستام وایەو دەڵێم خوالێخۆشبوو موشیری حەمەی سلێمان بە تەحقیق بەرییە لەو تومەتەو عەیبیشە مرۆڤ ئەو قسەلۆکە بێ بناغەیە قەبووڵ بکات و مێژووی خەباتی پاکی میللەتەکەی و لاپەڕە پرشنگدارەکانی پڕ لە شانازی خێلی هەمەوەند بە ئاسانی و خۆڕایی لەکەدار بکات.

## هەڵەو تاوانی خۆم:

بەندە لە سالانی حەفتاکانەوە دوو وتاری دەربارەی شەڕی دەربەندی بازیان. یەکەمیان لە ژمارە (١١٢٨)ی رۆژنامەی **(التآخي)**و دووەمیان لە ژمارە (٤١٠)ی رۆژنامەی **(العراق)**دا بلاوکردەوە. لەو دوو وتارەدا، بە داخەوە ئاماژەم بۆ ئەو هەڵەیە کردووە کە گوایە موشیری حەمەی سلێمان رێ نیشاندەری دوژمن بووە!!.

ئەو کاتە بەندە هێشتا نووسەرێکی لاوو کەم ئەزموون بوو، ئەم درۆیەشم لە کتێبێکی خوالێخۆشبوو عەلائەدین سەجادی وەرگرتبوو، منیش بێ لێکۆڵینەوەیەکی



ئایا دەبێ کەریم بەگی فەتاح بەگ لەنێو ئەوانەدا نەبێت

زانستی کردمە بەڵگە وەک هۆیەک لە هۆیەکانی سەرکەوتنی دوژمن.

بەڵێ ئەوکاتە تواناو بوێری ئەوەم نەبوو رەخنەو راستکردنەوەی ئەو سەرچاوانە بکەم، بەڵکو هەر دەبوایە بە سەرسوڕمانی و بە وتەی (ئامین) سەیری ئەو کتێبانە بکەین!! ئەوەش هەڵەو تاوانی منە لەو کاتەدا.

بەڵام تۆمەتێکی هەڵبەستراوی وا زل و بێ مەعنا دژ بە خێڵی هەمەوەندی جەربەزەو قارەمان و بنەماڵەی خوالێخۆشبوو موشیری حەمەی سلێمان تاوانێکە مەگەر هەر مێژووی ئەو خێڵە مەزنە چاوپۆشیمان لێ بکات، ئەوەیش هەر شایانی ئەوانە.

# بۆ جاری سێیەم موشیری حەمەی سلێمان!!!
# با بزانین موشیر خۆی چۆن باسی شەڕی (بەردەقارەمان) دەكات؟!*

ئازاد هەمەوەندی

دوكتۆر كەمال مەزهەری زانای كورد لە ژمارە (١٠٢)ی ساڵی ١٩٩٧ی گۆڤاری (ڕەنگین)ی هێژادا، وتارێكی مێژوویی لە ژێر ناوی **(ویژدان و مێژوو یا دادگەریی موشیری حەمەی سلێمان!)** بلاوكردەوە، چەند جارێك خوێندمەوە، وەكو تەمەزرۆیەك لە خوێندنەوەو سەرنج و تاووتۆكردنی هەڵكەوت (واقیع)و ڕاستی مێژوویی تێر نەبووم.

بە ڕاستی لە قۆناغی زانكۆو لەناو نووسەران و خوێندكارانی كورددا بە ڕاشكاوی نەمدەوێرا بڵێم: من لە خێڵی هەمەوەندم! چونكە ناوی **(موشیری حەمەی سلێمان)** وەكو پەڵەیەكی شەرم وابوو بەم خێڵە جەربەزەیەوە. بۆ چاكتر شارەزایی لە یاخیبوون و جەربەزەیی و مل كەچ نەكردن بۆ دوژمنی كورد حەز دەكەم خوێنەری هێژای **(ڕەنگین)** ژمارە (٨٤)ی ساڵی (١٩٩٥)-وتاری دوكتۆر فوئاد حەمە خورشیدی بەڕێز لە ژێر ناوی **(جەربەزەیی خێڵی هەمەوەند بەشێكە لە مێژووی ئەم میللەتە)** بخوێنێتەوە، یان **(رحلة متنكر الى ما بين النهرين و كردستان)ی مێجەرسۆن** و **(خلاصەیەكی تاریخی كوردو كوردستان)**ی محەمەد ئەمین زەكی بەگ. پاشان خۆی سەر پشك بێت و وەكو دكتۆر كەمال مەزهەر لە دادگەیی هەمەوەند بە ویژدانەوە بڕیار بدات. هەر هەمەوەند بوو شێخ مەحمود (١٨٨٠-١٩٥٦)ی گەیاندە پایەی حوكمداری كوردستان لە كاتی **(كۆلۆنێل ولسن)**، كانونی یەكەمی

---

(*) لە ژمارە (١٠٩)ی ڕێكەوتی شوباتی ١٩٩٨ی گۆڤاری «ڕەنگین»دا بلاوكراوەتەوە.

. ١٩١٨

با بگەڕێینەوە سەر وتارەکەی کەمال مەزهەر کە دەڵێت **«لە لاپەڕە ١١٦ی نامەی دکتۆراکەمدا بوو، واتا ناوەندی ١٩٦٣، لەوێدا زۆر بەتوندی فەرمووەمە: ئەگەر خیانەتی موشیری حەمەی سلێمان نەبوایە هەرگیزاو هەرگیز ئینگلیز نەیاندەتوانی بەسەر کورددا زاڵ بن»**، دووەم جار لە نامەی دکتۆرای (ناوک)دا هەر جەخت - تاکید -ی لەوە کردووە.

بەڵام هیچ راپۆرتێکی رەسمی (دەسپیشاڵ ریپۆرت)ی ئەفسەرە رامیارییەکان وەکو - مێجەرسۆن - مێجەر ئەدمۆنز **(یەکەمیان وەکو سیخوڕ - جاسوس - زۆر لە کوردستان ژیاوە)** بەڵگە نییە بۆ تۆمەتی خیانەتی موشیری حەمەی سلێمان، پاشان دوکتۆر زۆر بە زیرەکی و وردیی سێ خاڵ بەراوردی لەشکری ئینگلیزو شێخ محمود دەکات و دەیسەلمێنێت کە وا موشیر بێ گوناهە لە دیل بوونی شێخی نەمردا. لە **(هاوکاری)**داو پاش ئەم وتارە کاک - ئەحمەد مەلا کەریم - مامۆستایەکی خانەنشینی شاری کەرکوکە وتارێکی کرچ و کاڵی نووسیوە دژی بیروڕای دوکتۆر کەمال مەزهەر هەموو بەڵگەکانیشی، ناڵەکانی چەمچەماڵە! بەڵام بەکاک ئەحمەد دەڵێین: تۆش وەکو شیعرەکەی شێرکۆ تفەنگ بەتاریکییەوە دەنێیت، چونکە لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەی زانستی و ئەکادیمی پێویستی بە بەڵگەو سەرچاوە هەیە.

وتاری دووەم لواء رکن - محەمەد نەجمەدین نەقشبەندی لە گۆڤاری **(رەنگین)**ی ژمارە (١٠٥)ی تەشرینی یەکەمی (١٩٩٧)دا لە ژێر ناوی **(دیسانەوە دەربارەی موشیری حەمەی سلێمان!)** وەکو پسپۆرێکی سەربازی راڤەیکردووەو مەیدانی شەڕەکەو بەراوردی هەردوو هێزەکەی ئینگلیزو شێخ مەحمودو هەڵسەنگاندنی ئەرک و کات و دوورو نزیکی دوژمن، ئەمانە بە سەرچاوەی سەربازی چوار کارا - فاکتەر -ی گرنگن بەر لە هێرش و پەڕەنگ دەستنیشان دەکرێن.

**کارای دووەم و سێیەم** لە وتارەکەی مامۆستا محەمەد نەجمەدین نەقشبەندی مەبەستمانەو بەراوردی دەکەین لەگەڵ قسەکانی موشیری حەمەی سلێماندا.

سێ تەوەرە یان سێ هێڵی شەڕ لە شەڕگەدا هەبوو:

**یەکەم:** هێڵی (محور) لە (تەکیەی کاک ئەحمەد)ەوە بۆ ناوچەی دەربەندو

ـەکانی (گوپاڵە) - ئەمە هێڵی باشوورە.

**دووەم:** لە باکووری دەربەندەکـەدا: هەندێ رچەڕێ و کـوێرەڕێ هەبووە بەرەو ـڕتکەی قوڵی باکووری دەربەندەکە (لای کارگەی گەچەکەی ئێستا)، ئەمەیان بۆ ـێدمو بەتالیۆنی پیادە دەستدەدات.

**سێیەم:** هێڵی ناوەڕاست ئەم بەرو ئەوبەری رێگای سلێمانی، بۆ ئەم مەبەستە لە کۆتایی مانگی تەشرینی یەکەمدا میوانداری (کەریم ئاغای هەمەوەند)مان کرد لە چەمچەماڵ و هەردوو ژمارەی دکتۆر کەمال مەزهەرو لواء رکن محەمەد نەجمەدین ـقشبەندیم لە گۆڤاری - رەنگین - پێشکەش کرد، وتی: - وتارەکەی دکتۆرم خوێندۆتەوە، وتارەکەی لواء رکن محەمەد نەجمەدین نەقشبەندی هەرچۆنێک بێت ـوپاسیان دەکەم.

حەز دەکەم هەندێ راستی مێژوویی هەیە وەکو خۆی چۆن لە مام موشیرم بیستووە نەیگێڕمەوە.

منیش کاغەزو پێنووسم ئامادە کردبوو. هەر لە قۆناغی ناوەندیەوە حەزم بەناوی **(ئاغاو بەگ و دەوڵەمەندو دەرەبەگ)** نەبووە، بەر لە هەموویان بابام!! **(پێنج ژنی هەبووەو زەوی لە باینجان و لای بیرە نەوتەکانی گەرمیان هەبووەو زمانزان و زیرەکبووە، برادەری - فەتاح ئاغا-ی باوکی کەریم ئاغا بووە لە گورگەیی پێکەوە ژیاون)**، بەڵام کاتێک کەریم ئاغای هەمەوەندم بینی، ئەم سەرۆک خێڵە، ساکارە ـزیرەکە، دەست و دڵی تێرە، لەسەر خۆیە، رووخۆشە، هەموو بۆچوون و بیرمی گۆڕی ـو ئاوەژووبوون! چونکە ناوی هەر سەرچاوەیەکم دەبرد دەیووت: هینی مێجەرسۆن ـیان رەفیق حیلمی یان..... هتد، بە راستی کەم ئاغا هەیە لە دوای نوێژی بەیانیان ـەگەڵ کازیوەدا دەست بە خوێندنەوەی مێژووی نەتەوەکەی بکات، لەبەر هۆشمەندی ـو لێهاتوویی خەڵکی چەمچەماڵ دەڵێن: کەریم ئاغا وەکو ئینگلیزە، زۆر زانە!، بە ـواتای زانینی زۆر.

+ خاڵۆ کەریم بۆ مێژوو راستی بفەرموون کە موشیری حەمەی سلێمان دژی کورد بووە؟

- مام موشیر وتی: بە پەنجا سواری جەربەزەی هەمەوەندەوە بۆ سلێمانی چووم

بۆ پشتگیری شێخ مەحمود، هەر هەمەوەند بوون دوای کوشتنی شێخ سەعیدی باوکی (١٩٠٨) یاخیبوون و ئاژاوەیان نایەوە لە شاری سلێمانیدا دژی عوسمانلیەکان، داوای ئازادکردنی شێخ مەحمودمان کرد لە بەندیخانەدا **(دەست بەسەریدا)**. هەر چاو نەترسی و شۆڕەسواری ئێمە بوو ئینگلیزی ناچار کرد بۆ داخوازی کورد مل کەچ بکات و کورد بوو بە حوکمەت و شێخ مەحمود بوو بە حوکمداری کورد.

+ ببورە خاڵۆ کەریم! وەک لە یادم بێت پاش شەڕی یەکەمی جیهانی شێخ مەحمود پەیوەندی لەگەڵیاندا هەبووەو مێجەر نوئێل کردیە حاکمی کوردستانی خواروو **(ساوثرن کوردستان)** دژی عوسمانییەکان، بەپێی ئەو سەردانەی **(سێر ئەرنولد. ن. ویلسن)** جێگری فەمانڕەوای شاهەنشایی گشتی لە ١/کانوونی یەکەمی ١٩١٨ بۆ شاری سلێمانی، بڕیاردرا هەر خێلێک کە لە هەرێمی نێوان زێی گەورەو سیروان (دیالی)دا دەژین بە هەموو ئازادیەک لە یەکێتی کوردی (کوردیش کۆنفیدراسی)دا دەژین بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود، بەڵام ئەمە گورزێکی کوشندە بوو لە ئاغاو دەرەبەگ درا ئەگەر بەراورد بکرێن لەگەڵ ژیانی ئاغاو دەرەبەگ لە کاتی عوسمانیدا.

زۆر ئاغای دزەیی بەم **(یەکێتی کوردی)**یە رازی نەبوون، کە وەک مێجەرسۆن باسیان دەکات ئەمانە بوون /حاجی پیرداود/ئەحمەد پاشا/ ئیبراهیم ئاغا.

– بەڵێ مام موشیر وتی: کەریم فەتاح بەگی هەمەوەندو زۆری تر ئامادەی ئەو کۆبوونەوەیە ببوون، هەموو کەسوکاری شێخ مەحمود پلەو پایەی ئەفسەرو وەزیریان وەرگرت، لەوانە شێخ قادری برای **(مقدم قادر)**و خزمی وای هەبوو لوولەی تفەنگ و ماوزەری بارووت پیسی نەکردبوو و تەقەی نەکردبوو، بەڵام بوو بەمێجەر ئەفسەرو وەزیر، منیش هیچ!!. تووڕە نەبووم، وتم: **(قوربان شێخ مەحمود ئەمە ناحەقیە، ئەگەر وابێت لەم ڕۆژەوە لەگەڵت نیم و لە پشتی تفەنگەوە نەبێت نامبینیت!!)**، حەقی خۆم بوو، من دوژمنی کورد نەبووم، گوناهم بە ملی شێخ مەحمود، براله خواش موعارزی هەیە کە وا شەیتانە – ئیتر گەورە نابێت هەر خۆی و کەس بە پیاو نەزانێت!!

- کاک کەریم ئاغا منیش چیرۆکی **(لەخەوما)**ی جەمیل سائیب -(١٩٢٥)م خوێندۆتەوە، ئەویش بەندیەکە دیوەخانەکەی شێخ مەحمود باسدەکات بەو جۆرە! هەروەها ئەدمۆنز دەڵێت: بۆیە شێخ نوری شێخ ساڵح بۆ ماوەی دوو ساڵ سەرنووسەری **(رۆژ کوردستان)** بووە چونکە **(بە عزمایەتی دەگەیشتەوە ژنی دووەمی شێخ مەحمود)**، لە رۆژنامەگەری کوردی (ئە کوردیش نیوز پەیپەر)دا باسدەکات، تەوریان بەرە بەیانی ٢٣/ ئایار/ ١٩١٩ شێخ مەحمودی نەمر شۆرشی بەرپاکرد وەکو نیمچە کودەتا (انقلاب)ێک دەستی بەسەر خەزێنەی شاردا گرت و فەرمانبەرو ئەفسەرە سیاسیەکان بەدیل گیران.

لە هەمووی ترسناکتر بۆ کوردستان و هەرێمی یەکێتی کوردی ئەوەبوو لە سەر بەرەی سیاسی ئالای بەریتانیا داگیراو ئالای ئایینی بەرزەوەکرا کە**(مانگی سوور بوو لەسەر قوماشێکی سەوز)**!! لە بارەی **(شەری بەردەقارەمان)**ی ١٧/ حوزەیران/ ١٩١٩ کە بە شەری **(دەربەندی بازیان)** ناسراوە لە لای ئینگلیز موشیری حەمەی ستێمان چۆن باسی دەکرد.

**(ئایا موشیر بووە بە کەوا سووری پێش لەشکری دوژمن؟!)**

- بەڵێ مام موشیر وەکو جارانی شێخ مەحمود و شێخ قادری برای و خزم و کەسوکاری ئەفسەر بوو، مام موشیر دەیگێرایەوە: ئەفسەری کورد واتا **(لەشەردا شەریک و لە خێردا تەریک)**، بەلام من چۆن دڵم یان چاوم بەرایی دەهات تەقە لە **(کەریم فەتاح بەگ)**و قەومەکانی خۆمان، یان هەر کوردێک بکەم ژەنەراڵ - فرێزەر وتی:

(- موشیر لە **(کانی بناو)**ەوە سەرکەوە بۆ سەر شاخەکان). **(هەر چەندە ئەمر بوو وتم سوار ناتوانێت لە پلەکاندا دابەزێت دوایی چەکداری شێخ مەحمود لەوێدا زۆرە!!.)**

فرێزەر وتی:

**(- مەترسێ چەکدار هیچ نییەو سەر شاخەکان هەمووی پیاوی خۆمانەو ئابلۆقە دراون و ئاگایان لە خۆیان نییە)** لەگەڵ زرمەی تۆپ و قرمەژنی گوللەدا - دوای مۆڵەتی دوو سەعات و نیو - هێرشکراو شەڕ تەواو بوو.

خوا ئاگای لێیە بۆ قەومەکەم راستی دەڵێم: چوار پێنج جار بانگمکرا - موشیر - موشیر - کوڕە موشیر!!

من ئەوی راستی بێت(٤٨) کوژراو هەبوو گورگەو سیخ بە نووکی قمعە دەیانپلانەوە بزانن بریندارەو بە دیل بیبەن، یان مردووەو بەجێی بهێڵن! مـ دەنگەکە بە کەریمی فەتاح بەگ یان هی تر تێگەیشتم، نزیک بوومەوە، حەپەسام.

- شێخ گیان بۆ جێماویت؟

- حەمە نێرگەلەی خوێریماینەکەمی رفاند!! موشیر لێم دوور مەکەوە نەک سیخ و گورگە بە رق و کینەدا زگم بە قەمە هەڵدڕن و بڵێن کوژراوە!

- نەخێر، چیت دەوێت بۆت دەکەم؟

- بڕۆ بانگی (....... کەریم ئاغا لە بیری نەماوە - ئازاد) بکە برادەرمە. ئەم پیسانە لە پاڵ ئەم بەردەدا نەمانکوژن.

ڕۆیشتم بانگمکرد (رەنگە مێجەرسۆن یا ئەدمۆنز بوبێت - ئازاد) ئەفسەرەکە دەستی لە مل کرد، منیش چوومە ژێر باڵی و بەرزمکردەوەو کەوتینە رێ. خو ئاگای لە خشەی مارو مێروو هەیە، راستە شێخ مەحمود لەگەڵمدا باش نەبوو، بەڵ (خزم گۆشتەکەت بخوات ئێسکت ناشکێنیت) من لە دڵەوە پێم ناخۆش بو سەرکردەو سەرداری کورد لە پاڵ تاشە بەردێکدا زەلیلی دەستی دوژمنی قەومەکەی بێت!!

+ زۆر سوپاس خاڵۆ کەریم، بە راستی ماندووبوویت! (دادگەی سەربازی بەریتانیا لە بەغدا فەرمانی لە سێدارەدانیان بۆ دەرکرد. پاشان حوکمەکەی سووک کرا بە پێنج ساڵ بەندی لە - هەنجام.

- پاشان لێبوردنی بۆ دەرچوو و ساڵی (١٩٢٢) گەڕایەوە بۆ شاری سلێمانی شاری (هەڵمەت و قوربانی)!.

**دواتر کاک ئازاد هەمەوەندی لەژێر ناونیشانی «ڕوونکردنەوە» لە ژمارە (١١٣)ی حوزەیرانی ١٩٩٨ لە گۆڤاری «ڕەنگین»دا نووسیویە!**

١- کاتێک ئێمە وتاری **(با بزانین موشیر خۆی چۆن باسی شەڕی بەردەقارەمان دەکات؟!)** بۆ گۆڤارە تاقانە مانگانەکەی کوردستان-ڕەنگین-ی هێژا(١٠٩)نارد، نەمانزانی جوگرافیاناس و بەتەنگەوە هاتووی مێژووی کورد **(د.فوادی حەمە خورشید)** پێش ئێمە وتاری لە بارەگای -**ڕەنگین**-دا هەیە، چونکە دەبوایە بەر لە ناونیشانی وتارەکە لە تایتلەکەی پێشتر بمانوسیبایە **(بۆ جاری چوارەم موشیری حەمەی سلێمان)** یەکسەر دوای وشەی (مێژوو)... چونکە وتارەکان بە ژمارە زنجیرە هەر یەکێک لە بوارێکدا لە (١٠٣) و (١٠٥) و (١٠٧)و (١٠٩)دا بلاوکرایەوە، ژمارە (١٠٧)ی دکتۆر فوادو (١٠٩)ی ڕەنگینم بۆ کەریم ئاغای هەمەوەند- ناردو داوای لێ بوردن لە دکتۆری زاناو هۆشمەند دەکەم.

٢- زاناو وەرگێڕو سکرتێری شێخ مەحمود **(ڕەفیق حیلمی)** لە **(یادداشت-کوردستانی عیراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود بەشی یەکەم -١٩٥٦)** غەم و پەژارەی بەرامبەر کەس و کاری شێخ مەحمود دەردەبڕێت و هەندێ زانیاری گرنگ ئاشکرا دەکات وەکو مووچەی شێخ (١٥٠٠٠) پانزە هەزار ڕوپیەو پاشان پێی دەڵێن: دابنشێ بەو مووچەیەوە باشترە چونکە بە کەڵکی مەلیکی نایەت! لەجیاتی **(کەریم فەتاح بەگی هەمەوەندو موشیری حەمەی سلێمان)**و (مەحمود خانی دزلی-ئێران) و سەرۆکە کوردەکان ئەمانە دەبن بەکاردەست لە حوکمدارێتی کوردستان یان ئینگلیز وتەنی کۆنفیدرالی کوردی Kurdish Confedracy بە ئارەزووی شێخی نەمر.

+ سەید عومەر - مامی شێخ مەحمودە- کرا بە متصرفی سلێمانی.

+ حاجی سەید حەسەن - مامی شێخ مەحمودە- کرا بە حاکمی شار.

+ شێخ قادری سعید -برای شێخ مەحمودە- کرا بە مقدم و سەرلەشکری شێخ(سوپاسالار).

+ سەید علی بیسملا - خزمی شێخ- لەبەر بۆرە خزمایەتی بوو بە قۆمیسەر.

**(رەفیق حیلمی)** دەڵێت: میجەر نوئیل حەزی دەکرد لە رقی تورکە عوسمانلییەکان کوردستانی تورکیاش بخەنە ژێر دەستی شێخ بەڵام نە شێخ دەگونجاو نە **(مقدم قادر)**ی برای حەزی بە خوێنەوارو ئۆفیسەرە کوردەکان- دەرچووی ئەستانبۆڵ- بوو. بۆیە **(مێجەر دانلیس)** کۆیانی کردەوەو هێزێکی سەربازی دروست کرد.

هەروەها پاش بەدیل گرتنی - شێخ مەحمود - هەمەوەندەکان - کەریم فتاح بەگ - لە ناوچەی چەمچەماڵ نەقیب کاپتن (بۆند Bond) دەکوژن و بۆ ناوچەی دەسەڵاتی عوسمانلیە (مەرە نەخۆشەکە!!!) هەڵاتن، چونکە ستراتیجیەتی شێخ وای فەرز کردبوو!!!

# روونكرنه‌وه.. یان تانه؟ فه‌رزكردنی ستراتیجییه‌تی شێخی نه‌مر به‌ بیركردنه‌وه بووه..*

محه‌مه‌د سالح عه‌بدولكه‌ریم

له گۆڤاره ره‌نگینه‌كه‌ماندا **«ره‌نگین»** چه‌ند جارێک نووسین له‌سه‌ر **«موشیری حه‌مه‌ی سلێمان»** بلاوكرایه‌وه، له پێش هه‌موویاندا نووسینه‌كه‌ی مامۆستای هێژا مێژوونووسی ناودار د. كه‌مال مه‌زهه‌ر كه پاشگه‌ز بوویه‌وه له‌و راو بۆچوونانه‌ی كه كه‌تی خۆی له‌به‌ر رۆشنایی سه‌رچاوه‌رووسییه‌كاندا دابووی له‌سه‌ر ناوبراو، دوابه‌دوای ئه‌و مامۆستای هێژا د. فوئاد حه‌مه خورشید.

ئه‌وسا كه‌سانێكی تر ره‌دی ئه‌اونیان دایه‌وه‌و دوای ئه‌میش **«ئازاد هه‌مه‌وه‌ندی»** نووسینێكی بلاوكرده‌وه.

ئێمه هه‌رچه‌ند تێبینیمان زۆر هه‌بوو له‌سه‌ر ئه‌و باسه‌و نه‌ک به پشت به‌ستن به‌سه‌رچاوه‌ی **«به‌لگه‌نامه»** به‌لكو به‌سه‌رچاوه‌ی ده‌ماوده‌م و چۆن باسی **«موشیری حه‌مه‌ی سلێمان»** ده‌كرێت و چی بووه‌و چی كردووه به‌رانبه‌ر به شێخ. به‌باشمان زانی بێ ده‌نگ بین و ئیتر چی له‌سه‌ر ئه‌و مه‌سه‌له‌یه نه‌نووسین، چونكه مێژووی پاكی هه‌ركه‌سێک وه‌كو خۆی به‌پاكی ده‌مێنێته‌وه. چ جا ئه‌و مێژووه په‌یوه‌ندی بێت به پایه‌دارێكی وه‌كو شێخی نه‌مره‌وه.

من لێره‌دا ته‌نها ئه‌وه‌نده ده‌لێم هه‌موو ئه‌وانه‌ی له‌سه‌ر موشیریان نووسیوه، با روو بكه‌نه شوێنی رووداوه‌كان و په‌یوه‌ندی بكه‌ن به‌وانه‌وه كه له‌گه‌ل شێخی نه‌مردا بوون،

---

(*) له ژماره (    ) رێكه‌وتی ١٩٩٨ی رۆژنامه‌ی **«هاوكاری»**دا بلاوكراوه‌ته‌وه.

یان نەوەی ئەو کەسانە بزانن چۆن باسی شێخی نەمر دەکەن کاتێک کە برینداربووە و موشیر بە برینداریتی تەسلیمی ئینگلیزەکانی کردووە، ئەمە لە لایەک لەلایەکی ترەوە نازانم سوودی ئەم هەموو تیروتوانجە نابەجێیانە چییە کە دەگیرێتە شێخی نەمر؟ وەکو ئەوەی لە رەنگینی ژمارە (١١٣)ی ١ی حوزەیرانی ١٩٩٨ی گۆڤاری **«رەنگین»**دا* دژی شێخ بە پێنووسی ئازاد هەمەوەندی، ئایا کاک ئازاد دەیەوێت هەمان رەفتارو کرداری کۆن تازە بکاتەوە، یان تەنها ئەوەی مەبەستە ناوی بەرز و گەورەی شێخ مەحمودی نەمر خوانەخواستە نزم و کەم بکاتەوە.

بەهەرحاڵ شێخ مەحمودی نەمر، هەر نەمرەو هەر بە نەمری دەمێنێتەوە و وێنەکەشی لە دڵ و ماڵی هەموو کوردێکی بەشەرەفدایەو هەموو کوردو کوردستانیش سوێند بە گۆڕی دەخۆن. تەنها ئەمە مەبەستە بۆ پاکی و بەرزی و نەمری و دلێری شێخ مەحمودی نەمر. ئەی ئەوانەی دوژمنی شێخ بوون، کێ و لە کوێ رۆژێک لە رۆژان باسیان لێوە دەکرێت، بەخراپە نەبێت.

لە کۆتاییدا مانگی چواردە بەسەرەوەیەو دەدرەوشێتەوەلە خواریشەوە چی دەبێت با ببێت.

ئەمە بێجگە لەوەی کە ستراتیجیەتی شێخی نەمر زۆر لەوە مەزنتر بووە کە لە کۆتایی نووسینێکی کاڵ و کرچی بێتامدا بە تەوسەوە باسی لێوە بکرێت.

---

(*) ئاماژەیە بۆ پاشکۆی ژمارە -٣- ل (٢٤٢،٢٣٥)ی ئەم کتێبە.

# لەسەر دەرکناری وتارەکەی مامۆستا دکتۆر کەمال مەزهەر دەربارەی «موشیری حەمەی سلێمان»*

یوسف ئەمین

لەوتارەکـەیدا کـە لە گـۆڤـاری رەنگینی ژمـاره (١٠٢)ی سـاڵی ١٩٩٧ لاپەڕە ٩٠) بەرچاو دەربارەی سـەرکـەوتنی ئینگلیـزەکـان لە شـەڕی دەربەندی بازیاندا خاڵەکـان زۆر راست و بەبایەخن پوختـەکەی ئەوە ئەگـەیینی کـە ئەگـەر (**موشیری حەمەی سلێمان**)یش نەبوایە ئینگلیزەکـان هەر سەرکـەوتنیان بەدەست ئەهێناو لە کۆتاییـدا داوای لێبوردن ئەکات لەناوبراو و بنەماڵەکەی و هۆزەکەی، لێرەدا چەند راسـتییەک و چەند پرسـیارێک دێتە کایەوە بەمەبەستی روون کردنەوەیان بەچاکی ئەزانم زۆر بەکـورتی لە شـەڕی دەربەندی بازیان بدوێم بۆ زانیـاریی خـوێندەوارانی خۆشەویست:

- لە ١٨ی حـوزەیرانی ١٩١٩ هێـزی ئینگلیـز لەگـەڵ هێـزی مـیللی کـورد بەسەرکردەی شێخ مەحـمود بەرەنگاری یەک بوون هێـزی شێخ مـەحـمود شکسـتی هێناو شێخ مەحمود بریندار کراو بەدیل گیرا (**موشیر ئاغا**) چاوی بەشێخ مەحمود نەکـەوێ لەناو بریندارەکـاندا بەگـورجی ئەچێـتـە لای ئینگلیـزەکـان و بەتایبـەتی ئەفسەری ئینگلیز (**ادمونس**) ئەباتە سەربەردە قارەمان کە شێخ لە بینا بە برینداری راکشابوو ئەڵێ (**ئەمە شێخ مەحمود**)ە کەوابوو رۆڵی (**موشیر ئاغا**) هەر رێگا پیـشـاندانی ئینگلیـزەکـان نەبووە بەڵکو پێ ناسـینی شـێخ مـەحـمود بووە بە

---

(*) لە ژماره (١٣٠)ی تشرینی دووەمی ١٩٩٩ی گۆڤاری «**رەنگین**»دا بلاوکراوەتەوە.

ئینگلیزەکان ئەم رۆڵە باسی نەهاتووە لەوتارەکەی مامۆستا د. کەمال مەزهەردا ئیتر نازانم لە کتێبەکانیدا کە بەروسی نووسیویێتی باسی کردووە یانا؟ هەرچۆنێک بێ باس نەکردنیش لە نرخی وتارەکەی کەم ناکاتەوە لێرەدا راستییەک هەیە ئەوەیە کە ناوبراو لەگەڵ هێزی ئینگلیزدا بەشداربووە کەم یا زۆر یاریدەی داون ئایا بە چ مەبەستێک؟ بۆ دراوبووە یان بۆ سەرداری (جاه) یان لە رقی شێخ مەحمود یان نە قینی ئەو سەرۆکە هەمەوەندانەی سەر بەشێخ مەحمود بوون ئەم پرسیارانە تا ئێستا روون نەکراونەتەوە هەڵبەت رۆژێ لە رۆژان دەرئەکەوێ، بەڵام ئەوەی جێگای چەند چۆن نەبێ و راستییەکە گومانی تیانییەو نالەقێ ئەوەیە ناوبراو دژی هێزی کورد بووە چۆتە ریزی دوژمنانی میللەتەکەی خۆی لەگەڵ ئەم راستییەدا چەند پرسیارێک دێنە کایەوە:

**١- ئایا رۆڵی (موشیر) تا چ رادەیەک بەکاربووە بۆ سەر ئاوەرووی رووداوەکان وەهیچ جەزرەبەیەکی داوە لە هێزی شێخ مەحمود؟ ئایا ئەگەر ئەو نەبوایە هیچ گۆڕانێک ئەبوو لەسەرجەم رووداوەکاندا؟**

**٢- یان (موشیر) تەنها کوردێک بووە دژی شێخ مەحمود یان کوردی ناسراوی تر هەبوون کە هەمان هەوڵ ویستیان بووبێ؟**

**٣- ئایا عەشیرەتی هەمەوەند هەموو وەک (موشیر ئاغا) دژی شێخ مەحمود بوون؟**

بۆ وەڵامی پرسیاری یەکەم دووبارە ئەبێ بگەڕێینەوە سەر باسی رۆڵی ناوبراو کە تائێستا ئەوەی خراوەتە پاڵ ئەوەیە:

أ- رێگا پیشاندانی ئینگلیز بۆ بەرپێچی ئەم رۆڵە ئاماژە ئەکەم بۆ خاڵەکانی وتارەکەی مامۆستا د. کەمال مەزهەر بەتایبەتی خاڵی سێیەم کە بەتێروپری وەڵامی ئەم رۆڵەیە..

ب- ناسینی شێخ مەحمود بە ئینگلیزەکان ئەم کردەوەیەی ناوبراو ئەوەندە کاریگەر نەبووە دەربارەی رووداوەکان چونکە ئەوەش نەبوایە شێخ هەر بەبرینداری ئەمایەوە وەهیچ هەڵێک نەبوو بۆ دەربازی و خۆشی توانای رۆیشتنی نەبووە کەوابوو ئەم رۆڵە لەوانەیە بەکارێکی باش بدرێتە (قلم) چونکە وەک ئەگێڕنەوە زوو تیمار نەکرێ و شۆربای بۆ ئەبەن هەتا ئەڵێن شۆرباکە بەهاراتی زۆر تیا ئەبێ وادیارە

ئـەشچێکە هندی بووە (نووسەر) بۆیە شێخ مەحمود توورە بووەو قاپەکەی فڕێ داوە بەروویانداو وتویێتی ئێوە دەرمـان خواردم ئەکـەن!! ئیتـر ئەم ڕۆڵە ئەگەر سـوودیشی نەبووبێ هیچ زیانێکی نەبووە ئەوەی لەو دێرانەی سەرەوەدا پێشکەش خوێنەرانی خۆشەویست کرا ئەوە ئەگەینی کە ڕۆڵی **(موشیر)** ئەوەندە بەکارو بەنرخ نەبووە بۆ ئینگلیز لە کاتێکا هەموو ئەزانین ئینگلیز لەو ڕۆژەدا **(امبراتور)**یەتێک بوو ڕۆژی لێ ئاوا نەئەبوو میللەتی کوردیش بێ چەک و بێ پیشەسازیو خاوەنی ئابوورییەکی لاواز لێی ناوەشێتەوە هیچ جۆرە سەرکەوتنی بەدەست بهێنێ بەسەر هێزی ئینگلیزی خاوەن تۆپ و فرۆکە کەوابوو ئەگەر **(موشیر ئاغا)**ش نەبوایە ئەنجامی ڕووداوەکان هەروەک ئێسـتا ئەبوو، بەڵام بۆچی ئەوەندە بایەخ درا بەهەڵوێسـتی ناوبراو ناوی زڕاو بوو بە بنیشتە خۆشی دەمی هەمـووان، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم خاڵە ئەبێ ئەوە بخەینە بەرچاو کـە لەو ڕۆژەدا لە گـەرمـەی ئەو کـارەسـاتە غـەمناکەدا کـە لەشکری میللەتی تیاشکاو سەرکردەکەی بریندارکراو بەدیلی گیراو سوارەو پیادەی هندوس و سیخ ڕژانە ناو شاری سلێمانی و بڵاوبوونەوە دەستە دەستە بەشەقام و کۆڵانە کش و ماتەکـاندا لەکـەش و هەوایەکی وادا شـتێکی زۆر ئاسـاییـە کـە هەسـتی **«تاڵی و نائومێدی»** بڵاوببێتەوەو گەلێ پرسیـار بێتەکایەوە وەک چۆن شێخ بریندارئەبوو چۆن هێزی کـورد ئەشکێ؟ ئالەم کـاتەداو لەم بارە ئاڵۆزە مـیللەتی کـورد پێـویسـتـیی بە بیانوویەک بوو بۆ تیمـارکردنی ئەم برینە گەورەیەی لەبەر ئەوە وەڵامی نـائومێدی و پرسیـارەکـان خرایە ملی **(موشیر ئاغا)**و سەپاندرا بەسەریا ئەم جۆرە لێکدانەوەیە ئەگونجێ لەگەڵ هەستی نیشتمانپەروەری و سەروەری نیشتمان، ئەم هەستە شتێکی ئاساییەو زۆر میللەتانی جیهـان دوچاری بوون بۆ نموونە **(فرەنسییە)**کان شکستی ناپلیـۆن لەشەڕی **(واترلو)**دا ئەخەنە ئەستۆی ئەو باران و ڕهێڵـەیەی شەوی شەڕەکە باری، بەم جـۆرە ڕۆڵی **(موشیر)** زل کـراو شێـوازی بەندو باو **(تواتر)**ی وەرگـرت سڕینەوەی یا کەم کردنەوەی لە یادی میللەتی کورددا بوو بەکارێکی گران لەم ڕووەوە هەر هەوڵێک بدرێ کارێکی جوان و بەجێیە کاک مامۆستا د. کـەمال مەزهەر بەم دوا وتارەی کـە ئامـاژەم بۆ کـردووە گـەردنی خۆی ئازاد کـردووە بەرامبـەر ناوبراو و بنەماڵەکەی و هزرەکەی وە ئەم هەڵوێستەی جێگای ڕەزامەندییەو ئاوڕدانەوەیەکی

پەسندە لە پێناو راستی و ژوان و مێژوو لە هەمان کاتدا وتارەکەی دەرگایەکی کردەوە بۆ نووسەران و کەسانێ کە هەر زانیارییەکیان هەبێ کەم یا زۆر لەم رووەوە بیخەنە بەرچاو، بەندە لە دەمێکەوە ئەگەڕام بۆ دەرفەتێک کە ئەو زانیارییە کەمەی هەمە بیخەمە بەرچاو بەهیوای بەشداربوونم لەکەم کردنەوەی ئەو تاوانەی خراوەتە گەردنی (موشیر) چونکە وائەزانم ناوبراو دوچاری زوڵمێکی نارەوا بووە هەر نەک تەنیا کوردێک نەبووە دژی شێخ مەحمود و شۆڕشەکانی و جێگای باوەڕ نییە ئەو رۆڵەی پێ هەڵساوە هیچ جۆرە کاریگەرییەکی هەبووبێ بۆ سەر چارەنووسی میللەتی کورد.

لە هاوینی ساڵی ١٩٧٠ لای شێخ لەتیف شێخ مەحمود لە دێی (سیتەک) باسی (موشیری حەمەی سلێمان) هاتە پێشەوە من وتم ئەم جۆرە کەسانە لە زۆر میللەتاندا نموونەیان هەیە وەک عەرەبەکان (ئەبو رغال) یان هەیە شێخ لەتیف وتی شتێکت بۆ ئەگێڕمەوە فەرمووی: ساڵی ١٩٦٥ لە دێیەکی کوردستانی ئێران بووە پیاوە ماقوڵان و ریش سپی دێیەکە هاتن بۆ لام پیاوێکی پیری تەمەن درێژی لەگەڵ بوو وتی یاشێخ من لە شەڕی دەربەندی بازیاندا بەشداربووم لەگەڵ شێخی گەورەدا کە شێخ برینداربوو (موشیری حەمەی سلێمان)خێرا خۆی گەیاندە ئینگلیزەکان و هێنانیە سەر شێخ وە (موشیر) بۆیە ئەمەی کرد چونکە وای ئەزانی تاقمێک لەسەربازە هندییەکان سیخ بوون یان هندوس یەکێک لەم تاقمانە رەوشت و عادەتیان ئەوە بوو کە بریندار بکوژن بۆیە (موشیر) خەبەری دا بە ئینگلیزەکان نەوەک خوانەخواستە یەکێک لەو تیرەیە شێخ مەحمود بکوژێت ئەمە وتەی شێخ لەتیف بوو دەربارەی وەڵامی پرسیاری دووهەم کە ئایا هەر (موشیر) تەنها کوردێک بووە دژی شێخ مەحمود؟ لەم رووەوە ئاشکرایە کە زۆر کەسانی ناسراو ناوداری کورد بگرە لە هەمە چەشنەی کۆمەڵ دژی شێخ مەحمود بوون هەریەکە لەبەر جۆرە سوودێکی تەسکی خۆی بەڵکو لەوانەدا هەن کە شێخن و بەخزمی شێخ مەحمود دائەنرێن، بەڵام کاسەکە لەسەری (موشیر ئاغا)دا شکا.

بۆ وەڵامی پرسیاری سێیەم کە ئایا بەهۆی هاوپەیمانی (موشیر) لەگەڵ ئینگلیزەکاندا هەموو عەشیرەتی هەمەوەند هەمان هەڵوێستیان بووە؟

لەم رووەوە ئەتوانم بڵێم: کەسانێکی زۆر لە عەشیرەتی هەمەوەند هەڵوێستیان بەپێچەوانەوەی هەڵوێستی **(موشیر)** بووە لە ناسراوەکانیان دا **(کریم بگ فتاح بگ)** کە بەتوندی لایەنگری شێخ مەحمود بووە هەروەها عەشیرەتی هەمەوەند قوربانی زۆریان داوە لە شەڕەکانی شێخ مەحموددا لەم بارەیەوە خوالێخۆشبوو **(ئەمین ئاغا رەشید ئاغا)** کە سەرۆکی یەکێک بوو لە چوار هۆزە سەرەکییەکەی عەشیرەتی هەمەوەندو ئەنجومەنی لوای **(محافظة)** کەرکوک بوو لە **(پرلمانی عراق پاشایەدا)** بۆ دەیان ساڵ لە ساڵی ١٩٥١ دا بۆی گێڕامەوە کە چۆن لە یەکێک لە دێیکانی ناوچەی بازیان بەرێکەوت لەگەڵ شێخ مەحمود چاویان بەیەک ئەکەوێ پاش چاک و چۆنی و رێزگرتن لە یەکتر ئەکەونە رازو گلەیی چونکە لە کۆنەوە ساردییەک لە نێوانیاندا هەبوو کە ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩١٩ ئەمین ئاغا فەرمووی لە بواری رازو گلەییدا بە شێخ مەحمودم وت ئێمەی هەمەوەند زۆرمان قوربانیدا لە شەڕەکانی جەنابتاندا ئەمجا ناوی شەهیدەکان ناوی باوکیان و جێگای شەهید بوونیان هەندێ لە شەڕی دەربەندی بازیان هەندێ لە ئاوبارێک ئەمانە هەموو یەکە یەکە ناویان ئەبات و بەشێخ مەحمود ئەڵێ ئایا ئەمانە هەمەوەند نەبوون؟ لە وەڵامدا شێخ مەحمود ئەیسەلمێنی و ئەڵێ راستە ئەمانە هەموو هەمەوەند بوون لەگەڵ مندا شەڕیان کردو شەهید بوون بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێ بەرامبەر **(موشیر)** زۆر هەمەوەندی تر هەبوون کە گیانی خۆیان بەخت کردووەو بوونە مایەی شانازی عەشیرەتە ئازاو شەرکەرەکەیان ئەو شۆڕەسوارانەی بۆ ساڵانێکی زۆر ترس و لەرزیان خستبووە دڵی **(جندرمة)**ی دەوڵەتی عوسمانییەوەو پاش هەموو هەوڵ و تەقەلای ئەو دەوڵەتە توانیان لە طرابلسەوە بێ پول و خەرجی بگەڕێنەوە سەر زەوی و زاری خۆیان.

# سمایل خانی شکاک یا سمکۆ
# دڵسۆزترین شۆڕشگێڕو کوڵۆڵترین ستەم لێکراوەمانە*

-حەمە بۆر-

لە ڕۆژایەکی (سمایل خان)، بە سەرەک خێڵی (شکاک) لە جێگەی (جەعفەر - یا جەوهەر - ئاغا)ی برای دانرا، کە ئێرانیەکان لە شۆڕشگێڕیدا کوشتویانە، (سمایل خان) لە درێژەپێدانی شۆڕشە کوردییە دڵسۆزانەو، زانستیانەکەی ڕانەوەستاوە.

سمکۆی ڕامیاری زان و، ڕۆشنبیرو، ڕۆژنامەنووس و، وریای باری فەرمانڕەوایانی ناوچەکە، زۆر زانستییانەو، هەل لەدەست نەدەرانە، پەی دەرپەی، لەگەڵ هەڵوێستی ئەو فەرمانڕەواییانەدا هەڵوێستی گونجاوی نوێی ئەگرت و، ماوەی (١٥) ساڵێک لە دژی هەریەکێ لە: (ئێران)ی (قاجاری)و (پەهلەوی)و (تورکیا)ی (عوسمانی)و (کەمالی)و (عیراقی پاشایەتی)و (ئینگلیز)و (ڕووس)یش، بەجەختەوە شۆڕشی قارەمانانەی گێڕاوەو، لەو ماوەیەدا، لە

---

(*) لە ژمارە (٧٥)ی کانوونی دووەمی ١٩٩٥ی گۆڤاری «ڕەنگین»دا بڵاوکراوەتەوە.

- لێرەدا دەبا وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆی کردووە، بابەتێکی ئەحمەدی مەلا کەریم نووسرابایەوە، سەرباری هەرەوەزی کارمەندانی «هاوکاری» لە سەرووییانەوە سەرنووسەری ڕۆژنامەکە کاک «عەبدوڵڵا عەباس»و دووجار هەڵدانەوەی لاپەڕەی ژمارەکانی نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٩٧ی ڕۆژنامەکە، بەڵام بەداخەوە، ئەو بابەتە هەر نەدۆزرایەوە، لە کۆتایی مارتی ٢٠٠١ کە سەردانی ئەو دەزگایەم کردو بەدوای ئەم بابەتەو هی دیکەدا گەڕام سەرنووسەری «هاوکاری» پێی گوتم ئەو بابەتە لەوانەیە لە پاشکۆی «عیراق» بڵاوکرابێتەوە، بەڵام وەک لە دووتوێی پاشکۆکانی ناو ئەو کتێبە دەیخوێننەوە نووسەرەکان ئاماژەیان بۆ ڕۆژنامەی «هاوکاری» کردووە، منیش پێم وایە هەر لە ژمارەکانی دوو مانگی یەکەمی ١٩٩٨ بڵاوکراوەتەوە، بەڵام بەداخەوە ئەرشیفی ڕۆژنامەکە هێشتا هەمووی لە بارەگا نوێیەکەی ڕۆژنامەکەدا لەبەردەست نەبوو. تا ئەو ژمارانەش تەماشا بکەم، بەهەر حاڵ، من بەردەوام پێم وایە ڕەخنەی بەجێ و دژە تەوەر هەموو لایەنێکی ژیان پێش دەخات، ئەو بابەتەی مامۆستا حەمە بۆریش پەیوەندی بە پەراوێزی ژمارە (١)ی بابەتی چوارەمی بەشی یەکەمی ئەم کتێبەوە هەیە، پێم وایە بابەتی سێیەمی بەشی یەکەم و بابەتەکانی دواتریش وەڵامی پڕ بە پێستی ئەم بابەتەیەو زۆر ڕای نادروست یەکالا دەکاتەوە.

«عەبدوڵڵا زەنگەنە»

یەکدوجار بەولاوە، ژێر نەکەوتووە. خاڵانەی کوشتنەکەی، ئەوانیش: (بەشەبەیخون و بووسە) بوون. گەلێ جاریش، لەهەمان کاتدا، لەگەڵ ئەم، یا ئەویاندا بۆ ماوەیەک رێک کەوتووەو، چەک و، تفاق و پارەی، بەسوودو بەرژەوەندیی شۆڕشەکەی لێ کێشاونەتەوەو، ئەوانیش زۆر چاک ناسیویانە، بەڵام ئەو ناچاری ئەوەی کردوون و، کەڵکی لە بارو هەڵویستیان وەرگرتووە.

ئەوەندەی بیزانم، لە فەرمانڕەواو، گەورەکانی کوردمانەوە، تەنیا (ئەحمەد پاشای دوا پاشای بابان) و (کوێر پاشای سۆران)و، یەکێکی دیکەمان، وەک (سمایل خان)، لە هەرە دڵسۆزترین خاوەنی، ئاواتی بەرینی، یەک پێ گرتنەوەو، راستی هەموو نیشتمان بوون و، گەزەکەیان کورت و، بێ پشتوانیی پاک و لێ براوی زانابوون، بەڵام لەناویاندا (سمکۆ) کوڵوڵترین و، ستەم لێکراوی مێژوویيە.

(سمکۆ) بەوە تاونبارکراوە، کە گوایە: بە (ناڕەوایی)، سەرۆکی ئاشوورییەکان (مار شەمعوون بنیامین)ی لە (کۆنەشار) لە رۆژی ٣ی نەورۆزی ١٩١٨زا، لەگەڵ چەند سەرۆکێکی ئاشوورییەکاندا کوشتوون، بۆ وتوو وێژ، لەمەڕ ئاکامی دواڕۆژی کوردو ئاشوورییەوە. (سمکۆ) لەو ژیانە شۆڕشگێڕییەیدا، ئەو خەوەی بە خۆشی لێکەوتووە، کە (هرچۆ)ی پیاوی، بەدیاریەوە بوویێ، چونکە بە پاک دڵسۆزی زانیوە. لە ساڵی ١٩٥٥ز.دا، ئەو (هرچۆ)ی خێڵی (هەرکی)یەم ناسی، کە ئەو سایە لە تەمەنی (٥٠) ساڵانیدا بوو، لە کوشتنەکەی (سمکۆ)شدا، لە: (٢٠ی خەرمانانی ١٩٣٠ز.دا) لە شاری شنۆ، لەگەڵیان بووە، لەو کۆشکەدا کە بۆین تەرخان کرابوو، وتوێژی، لەگەڵ سەرفەرماندەی ئەویدا بۆ رێک کەوتن تیابکات. کە لەگەڵ چوونە ناو کۆشکەوە بە سواری، کوتووپڕی دەستڕێژیان لەناو کۆشکەکەوە لێکردوون و، زەلام و، ولاخیان، بەسەریەکدا ترشاندووە، لەوانە (سمکۆ)یش کوژراوە، کە (هرچۆ)ی بە پاڵەوە بووەو، ویستوویە، تۆزە تۆزە بە پاڵ کەوتنەوە رایکێشێتە دەرەوە، بەڵام سمکۆ وتوویە: (دەردم کاری و کەڵکی بردنم پێوە نەماوە)، ئەگەر ئەتوانی (سەعات و ئەموستیلەو، خەنجەرو، تەسبیحەکەم، بگەیەنە (گولیزار)ی خوشکم، -کە ژنی سەید تەهای شۆڕشگێڕ بوو - چونکە سەعاتەکە هی باوکم و ئەموستیلەو خەنجەرەکە هی (جەوەر) ئاغاو، تەسبیحەکەش هی گولیزارە، با دەست دوشمن نەکەون، ئەم ئاگادارییەی (هرچۆ) پێی راگەیاندم؛ پاش ماوەیەکی کەم خودی (گولیزار خاتوون) بۆی جێگیر کردم.

(هرچۆ) لەمەڕ پیلانێکی کوشتنەکەی (مار شمۆن)ەوە بۆ گێڕامەوە کە (ئاغام)
«سمکۆ» بەر لەوە، سەرئەفسەرەکانی خۆی ئاگادارکردن، کە «ئینگلیزەکان»، لەگەڵ
...ێز شۆڕشگێڕی کورددا کۆشاون (بۆ پێگەیاندنیان)، بەمەرجێ، لە ناوچەکەدا،
...ساوڵە)ی سوودو بەرژەوەندیی (بەریتانیا)بێ، بە تایبەتی لە دژی نەتەوەی
عەرەب و، کەسمان، لە هەستی ئاینییەوە، نەچووینە ژێر ئەو فەرمانەوە، ئەوەتا؛
...گەڵ (ئاثووری)یەکاندا ڕێک کەوتووە، کە گوایە نەوەی (ئاشووریی) کۆنن جێی
...واتیان پێ ئەگرێتەوە، (بە هەمان مەرج) کە؛ ئێمە، نەمانویست، بۆ ئەوەی ئەم
...مری مارە پان کەمەوە، تا ناوچەکە، لەو مەترسییە رزگارکەم و هەموو
...مرئەفسەرەکانی ئاغام رایەکەیان پەسەندکردو، کاتێ جێبەجێیشیان کردو، بە
...شکری ئاثوورییەکاندا جاڕی داو، ئەم نهێنییەی پیلانەکەی پێ راگەیاندن و
...رمانی دا ئەوی چەک دائەنێ لە جێگەی چاکدا دایان ئەکات و ئەوی، لە پەیکاری
...ۆڵەدایە؛ با بیکاتو، ئیتر کەمێکیان نەبێ چەکیان فڕێداو نیشتەجێ کراون و،
...واتی تریش وازیان هێنا.
بەداخەوە، کە ئەوەتا، لەپرو پالەنتەی ئینگلیزو رووس و ئەوروپاییەکانەوە،
گوایە: لەسەر هاوئاینی خۆیان کە (ئاثووری)بوون، هەڵیان دەداتێ و، کوردو،
(سمکۆ)شیان پێوە لەکەدار کردووە، دەسیەو پروپاڵەنتەی ئەوان و، ئەوسای ئێران و
تورکیاو عیراق، ئەگەر شتێکی لەو چەشنە روویدابێ، کردوویانە مایەی: (بە
...رموایی «سمکۆ» تاوانبارکردن)، کە زۆریشی نەخایاند فەرمودەکەی (سمکۆ)
هاتەدی و (ئینگلیز) ئیسرائیلی دروست کردو، لەکاتی مۆرپێکردنی دەس لە
خەلیفەییەتی هەڵگرتنی (عەبدولحەمید)یشدا، رووی کردە یەکێ لەو لیژنەیەو، وتی:
تو... یەکێ لەوانەی کە ویستتان (فەلەستین)تان پێ بفرۆشم و من گوتم خاکی
گەلەو بە من ناکڕێ، ئەو کەسەیش: خودی (مستەفا کەمال - ئەتاتورک) بوو.
لە کاتێکا ویستم، ئەم ئاگادارییە لەسەر کوشتنەکەی سمکۆ رابگەیەنم (١٥-
٢٠) سەرچاوەیەکی عارەبی و کوردیم پشکنی، تێگەیشتم هەموانیان بە تێکڕایی
...داشتەکانی (رەفیق حیلمی)و (ئەحمەد تەقی)و (ئەحمەد خواجە)یان پاش و پێش
...، پچڕ پچڕ لەمەڕ (سمکۆ)وە، دووبارە کردۆتەوەو، چیم لێ هەڵنەکڕاند.
بۆیە بەم ئاگادارییەی دوایی، کۆتایی بەم نووسینەم ئەهێنم، لەمەڕ سەردانەکەی
(سمکۆ)وە، بۆ سلێمانی، کە لام وایە ئەم هەردوو ئاگادارییە بلاونەکراونەتەوەو بۆ

یەکەم جارە رائەگەیەنرێن، لە چاپەمەنیمانداو، ئەمیشیانم لە (مەلا مەحمودی بێخود) بیستووە لە سلێمانی لای (نەجمەدین مەلا) لە ساڵی ۱۹۳۹ز.دا. کە فەرمووی: (هۆی رێک نەکەوتنی شێخ و سمکۆ، بەم جۆرەی دوایی بووە؛ سمکۆ بە شێخی وتووە؛ پێشەکی ئەمەوێت بە سەربازێکی بچووکی خۆتم وەرگری، منیش هەموو تواناو سوپاو چەک و تفاقم ئەخەمە ژێر فەرمانی تۆوەو، خەباتمان لەیەکدمی لە دژی دوژمنی هاوبەشمان، بەرێزە، لە لاوازیانەوە تێیان هەڵچین، بەو مەرجەی ئەم رێڕەوەی شۆڕشەی ئێستە بگۆڕی، کە سوپاکەت و ولاخەکانیان، بەسەر زگی رەش و رووتی گوندەکانیانەوەو، خۆماڵە خۆماڵە ئەڕۆی بەڕێوە، هەمووی ئیسلامین، بەڵام؛ ئایین بەجێی خۆی و، ئەبێ لە رووی سوودو بەرژەوەندی نەتەوایەتییەوە، بنوارینە شۆڕشەکەمان، بە (راوێژ) بڕۆین بەڕێوە، نەک بە چرچە پسەپسی ئەم و ئەوی کولێرە کوژ، لە پەیکاری یەکخستنی (هەموو لایەنە کوردەکاندا بێ لەسەر ئامانجێکی گشتی، دووبەرەکی نەهێڵین و بێگانەیش هەر بێگانە بزانین و، بەس. نابێ هەل لەدەست بدرێت و پێویستە کەڵک لە بۆشایی هەڵوێستی دەوڵەتان وەربگیرێ، ئەمجا رۆچیتە شۆڕشگێڕییەکی زانستیانەو دوور لە هەموو (عاتیفە)و، بەزەییەک و، لە رێگەتا ئەگەر زانیت قاڵەی برات، لەتیفی کوڕت، خیانەتیان لێ دەرکەوت، لەسەریان مەوەستەو، بەر لە هەرکەس خۆت بیانشێلە، بێگومان بەوانە ئەگەینە ئاوات و ئەوسایە من؛ بەڵێنت ئەدەمێ خۆم سەحە قوڕت بۆ ئەگرمەوەو، بیگرە سەرت و، بکەوەرە: (رۆڵە رۆو برا رۆ...).

ئەمە بیری فەرموودەکەی بێخوودمان بوو، دیارە شێخی دڵ ناسکیشی. کە (عارف سائب)ی هۆنەرو (جەمال عیرفان)ی فەیلەسووفی بەکوشت ئەدا مەرجەکەی سمکۆی بۆ نەئەلواو، (خالیصی)ی تاڵەبانی و (ئەحمەد موختار جاف)ی بۆ تالان نەئەکرا..

بۆیە سمکۆ دوای سێ مانگە لەگەڵ شێخدا خەریک بوون، بە ناچاری، بەدڵی شکاوەوە گەڕایەوەو، مەگەر هەر (لە خەوما)کەی جەمیلی سائیبی خوێندبێتەوە دەسا با.. بەس بە نارەوایی (سمکۆی کوڵوڵ) تاوانباربکەین، کاتی ئەوەیە بەجوتی راستدا بچین، نەک پرووپاڵەنتەی دوشمن، دووبارەو هەزار بارە بکەینەوە.

شایانی سوپاسە کە بەڕێز د. عەبدولڕەحمان عەبدوڵلاسێ وێنەی لەمەر ئیسماعیل ئەغای شکاکەوە بۆ هێناوین و (حەمە بۆر)یشمان راسپارد شتێکمان لەسەر ئەو پێشەوایە بنووسێ. رەنگین (وێنەکانمان لە لاپەڕە ۳٤۳،۳٤۱ داناوە. عەبدوڵلا زەنگەنە

بابەتی یەکەم*

# چەند لاپەڕەیەک لە روخساری ڕێبازی رووناکی خوازی لەناو کورددا

## سەرەتایەک

رووناکی خوازی یا زانستپەروەری[1] چەرخێکی سەربەخۆیە لەمێژوودا کە سەرەتا، دەوروبەری کۆتایی سەدەی حەڤدەمین لە ئینگیلتەرەو دوای ئەو لە ئەورووپای سەدەی هەژدەمیندا سەری هەڵدا. بەو قۆناغەی مێژووی ئەورووپا دەگوترێ **«چەرخی رووناکی - عصر النور»**. هۆی سەرەکیی سەر هەڵدانی چەرخی رووناکی لە پەیدا بوون و بەرەوپێشچوونی چینی بۆرجوازی و ئامانج و خواست و ئاواتەکانیدا وەدی دەکرێ کە هەر هەموویان لەگەڵ بوون و بەرژەوەندیی ڕژێمی دەرەبەگیدا نەدەگونجان. جۆن لۆک و جان جاک رۆسۆو ڤۆلتێرو کانت و مۆنتسکیۆو دیدرۆو گۆڵباخ و گەلێک زاناو فەیلەسوفی تری ئەو رۆژگارە بوونە کۆڵەکەی رێبازو بزووتنەوەی رووناکی خوازی و رێگەیان بۆ بەرپابوون و پەرەسەندنی شۆڕشە بۆرجوازییە گەورەکانی گێتی خۆشکرد.

رووناکی خوازان، یا زانستپەروەرو عیرفانییەکانی ئەوسای ئەورووپای پێیان وابوو لە مێشک و عەقڵ وهۆش بەولاوە شتێکی تر لە گۆڕێدا نییە توانای لێکدانەوەی پەیوەندی و دیاردەکانی ناو کۆمەڵ و سروشتی لەباردا بێ، جڵەوی هەموو کارو رەفتارێک، وەک دەیانگوت، وا بە دەست خودی عەقڵەوە، بۆیەکا زۆرجار بە سەدەی هەژدەمینی ئەورووپا دەشگوترێ **«چەرخی هۆش یا عەقڵ»** (عصر العقل). جا بۆ ئەوەی عەقڵ دەوری تەواوی خۆی لەژیاندا ببینێ و رەوڕەوەی کۆمەڵ

---

*) لە گۆڤاری **«بەیان»**، ژمارە (١٧٩)ی رێکەوتی ساڵی ١٩٩٧، لە ل٣-٧دا بڵاوکراوەتەوە.

١) لە **«مێژوو»**دا **«زانیاری پەروەری»**م بەکارهێناوە بڕوانە: **کەمال مەزهەر، مێژوو. کورتە باسێکی زانستی مێژوو وکوردو مێژوو**، بەغدا، ١٩٨٣، ل ٦٠ - ٦٤ .

و مێژوو بە ڕێکوپێکی بەرەو پێش ببات تا ڕۆژگارێکی ئەوتۆ بێتە ئاراوە کەس تێیدا دەستدرێژی نەکاتە سەر ئازادی و ماڵ و موڵکی کەس ئەوا پێویستە ئەوپەڕی بایەخ بدرێتە پەروەردەو گۆشکردنی خودی عەقڵ خۆی. لێرەدا خوێنەر دەتوانێ دەورێکی سەرەکی بێ هاوتا ببینێ و خوێندەواری دەبێتە ئەو دەرمانە تەلیسماوییەی لە باریدایە گشت برینەکانی کۆمەڵ ونیشتمان سارێژ بکات کۆمەڵی خوێندەوار بەلای ڕووناکی خوازانەوە کۆمەڵێکی عاقڵەو بە عەقڵ کێشەکانی خۆی چارەسەر دەکات بۆیەکا هەمیشە بەرەو پێش دەڕوات و بۆێ هەموان دەدات. لەبەر ئەوە ئەوروپاییەکان لە جاران پتر کەوتنە بایەخدان بە خوێندەواری و دەرگەی فێرگەو قوتابخانەکانیان ئاواڵەتر کرد لە بەردەمی هەمواند

## سەرهەڵدانی ڕووناکی خوازی لەناو کورددا و ڕۆڵی بەدرخانییەکان:

ڕووناکی خوازی وەک دیاردەیەکی ژیاری تیشکی بە هەموو لادا هاویشت سەرەتای ئەوروپاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای گرتەوەو دوای ئەوانیش یەک لە دوای یەک پریشکی گەیشتە وڵاتانی هەر چوار لا، سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست لە ڕۆژهەڵاتیش بە توندی دەنگی دایەوە. هەر لەو ساوە ئەو تیشکە لە ڕێگەی تورکەوە گەیشتە کوردستانیش. بەدرخانییەکان و ژمارەیەک ڕووناکبیری دووربینی تری وەک حاجی قادری کۆیی پێشەنگی لێهاتووی بزوتنەوەی ڕووناکی خوازیی کوردن، هەر هەمووشیان بەرهەمی شارە پێشکەوتووەکانی کوردستان بوون و لەو منەوەرانەی کورد بوون کە ڕوویان کردە ئەستەمبوڵ و قاهیرەو شارە بەناوبانگەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا. شارەکەی حاجی، بە وێنە، لەگەڵێک ڕووی ئابووری وئاوەدانی و کۆمەڵایەتی و خوێندەوارییەوە بۆڕی زۆربەی شارەکانی تری کوردستانی باشووری دابوو، ئەوەی زانای عوسمانلی بەناوبانگ شەمسەددین سامی بەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمین لە «قاموس الاعلام»ە بەهادارەکەی خۆیدا بە ڕوونی باسی چەند لایەنێکی کردووە[٢] .

(٢) دەربارەی ئاوەدانی شاری کۆیە لەو ڕۆژگارەدا بڕوانە: مەسعود محەمەد، حاجی قادری کۆیی. لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٢، ل ٣٢٢ - ٣٣٠ .



کردستان

بسم الله الرحمن الرحيم

یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی

بەدرخانییەکان یەکەم ڕووناکی خوازی کورد بوون بە گشتی، چونکە ئەوان بەرهەمی ناوچە پێشکەوتووەکانی کوردستان بوون و بەر لەهەموان ڕوویان کردە ئەستەمبوڵ و قاهیرەو ئەوروپا. زانستپەروەریی بێ ئەندازەی بەدرخانییەکان بە ڕوونی لە **«کوردستان»ەی** یەکەم ڕۆژنامەی کورددا، کە ئەوان دەریان دەکرد، ڕەنگی داوەتەوە. لە یەکەم ژمارەیەوە **«کوردستان»** بە تورکی **«ووریاکردنەوەو هاندانی فێربوونی صەنعەت»** و لە سێیەم ژمارەیشییەوە، دیسان هەر بە تورکی **«هاندانی کورد بۆ تەحسیلی زانست و هونەر»ی** کردە دروشمی سەرەکیی خۆی و لە ژێر ناوی ڕۆژنامەکەدا ئەو دروشمەی چاپ دەکرد[٣].

---

(٣) **«کوردستان»**، قاهیرە، عدد١، ڕۆژا پێنجشمی دە ٣٠ ذو القعدة سنة ١٣١٥(٩ نیسان سنة؛ ١٣١٤)،عدد ٣، ڕۆژا پێنجشمی دە ٢٨ ذو الحجة سنة ١٣١٥(٧ مایس سنة ١٣١٤). هەروەها بڕوانە **«کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨ - ١٩٠٢»**، کۆکردنەوەو پێشەکی دوکتۆر کەمال فوئاد، بەغدا، ١٩٧٢ ل ١، ٩ .

به نیـازی هاندانی کـورد بۆ خـوێندن **«کـوردسـتـان»** زوو زوو پەنای دەبردە بەر ناوەرۆکی قورئانی پیرۆزو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (د.خ.)، وەک **«العلماء ورثة الانبیـاء»** و **«العلم علمـان-علم الأبدان وعلم الأدیان»** و **«إنما یخشی الله من عباده العلماء»** و **«شهد الله انه لا اله الا هو و الملائکة واولوا العلم»** و **«طلب العلم فریضة علی کل مسلم و مسلمة»** و **«اطلبوا العلم من المهد الی اللحد»** و هی تر. جاری وا هەبوو **«کوردستان»** ئەو جۆرە فەرمایشتانەی خواو پێغەمبەری دەکردە ناونیشانی وتارە سەرەکیەکانی خۆی، وەک ئەو وتارەی ژمارە هەشتی کە لە ژێر ناونیـشـانی **«هل یسـتـوي الذین یعلمـون والذین لایعلمـون»**دا بلاوی کـردۆتەوە[٤]،یا ئەو وتـارەی ژمـارەی داهاتووی کە لە ژێر ناونیشـانی **«رتبة العلم أعلی الرتب»**دا بلاوی کردۆتەوە[٥].

**«کوردستان»** لە زیرەکی و عـەقلەوە راگەیاندن و جێبەجێ کردنی ناوەرۆکی ئەو فەرمایشتانەی دەکردە ئەرک و فەرز بەسەر کوردەوەو بۆ ئەو مەبەستەیشی دیسان پەنای دەبردە بەر فەرمان و فەرمایشتەکانی ناو قورئانی وەک **« ومن لم یحکم بما أنزل الله فاولئك هم الفاسقون»** و **«ان الذین یکتمون ما انزلنا البیانات و الهدی من بعد ما بیناه للناس في الکتاب اولئك یلعنهم الله و یلعنهم اللاعنون»**[٦]. کـار دەگـات بەوەی **«کـوردسـتـان»** بە خـوێنەرانی بڵێ: **«بێ عـیلم و خـوێندن نوێژو رۆژی تەمام نابن»**[٧].

هەر بەو دەسـتـوورەش بەدرخـانییـەکـان لە رێگەی **«کـوردسـتـان»**ەوە بە گـەرمی داوایان لە زاناو پیـاوانی ئایینی کـورد دەکـرد هەوڵ بدەن خـەڵکی بۆ خـوێندن هان بدەن و بەرچاوی نەخـوێندەواران رووناک بکەنەوەو ئەوەیان دەکـردە ئەرکی ئایینی سەرشانیان، چونکە پێغەمبەر فەرموویە: **«ولا یکون المرء عالماً حتی یکون بعلمه عاملاً»**[٨].

---

(٤) **«کردستان»**، عدد ٨ (جنێف)، رۆژا دووشمبیدە ٥ رجب ١٣١٦ (١٨ تشرین ثانی ١٣١٤).
(٥) **«کردستان»**، عدد ٩ (جنێف)، رۆژا سیشمبیدە ٢٠ رجب ١٣١٦ (٣ کانون الاول ١٣١٤).
(٦) **«کردستان»**، عدد ٨ (جنێف).
(٧) **«کردستان»**، عدد ٣ (القاهیرە).
(٨) **«کردستان»**، عدد ١١(جنێف)، رۆژا پنجشنبە ٢٤ رمضان ١٣١٦ (٢٨ کانون ثانی ١٣١٤).

به هەمان دەستوور **«کوردستان»** لە کوردی دەگەیاند کە هەر خوێندەوارییە بۆتە هەوێنی پێشکەوتنی گەلان، بۆی دەگێرانەوە چۆن بە یاریدەی خوێندن و زانست ژاپۆن بەسەر چین و، میسر بەسەر سودان و، کریت و یۆنان بەسەر **«دەوڵەتی عەلییەی»** عوسمانیدا زاڵ بوون. کەوابێ **«کوردستان»** وەک هەر رووناکی خوازێکی رۆژهەلات و رۆژئاوا سەرفرازی و رزگاریی لە خوێندن و خوێندەواریدا بەدی دەکرد، بۆیەکا لە یەکەم ژمارەیدا داوای لە کورد کردووە رۆڵەکانیان لە باژێرو گوندەکانی کوردستان خۆیدا بخەنە بەر خوێندن و فێریان بکەن، وێرای قورئان رۆژنامەش بخوێننەوەو دوای ئەوەی تەمەنیان دەگاتە دە دوازدە ساڵان بیاننێرنە قوتابخانەکانی ئەستەموول و شام و بەغدا[9].

بانگەوازەکانی **«کوردستان»** لەم بوارەدا هەر ئەوسا تارادەیەک لەناو کوردا دەنگیان داوەتەوە، ئەوەی لە ناوەرۆکی ئەو نامانەدا خۆ دەنوێنێ کە خوێنەرانی رۆژنامەکە بۆیان ناردووەو ئەویش لە چەند ژمارەیەکیدا بلاوی کردوونەوە. لێرەدا وەک بەڵگە برگەیەک لەو نامەیە دێنینەوە کە **«خادم العلم الشريف علي بن حسين الأمدي»** لە ماردینەوە بە عەرەبی ناردوویە بۆ **«کوردستان»** و تێیدا دەڵێ:

**«لقد اطلعت على جريدتكم الغراء المسمات(كردستان)... فاذا هي موشحة بالمواعظ السديدة، والمقالات المفيدة حثاً للامة[10] الكردية على طلب العلوم والمعارف، وإيقاظاً لهم من سنة الغفلة والعطالة، وتنويراً لأفكارهم التي تتوقد بالفطنة والذكاء...»**[11] .

پاش ماوەیەک، دیسان لە ماردینەوە مەلا ساڵحی جەزیری لە نامەیەکیدا رووی دەمی کردۆتە عەبدولڕەحمان بەدرخانی سەر نووسەری ئەوسای **«کوردستان»** و پێی دەڵێ: **«ئەزبەنی تۆ مە لمعارفی تەشویق و[12] تەرغیب دکەی، لنجی یا مەعارفی تشتەک وەیە کو کەس نکارە ئینکار بکە»**[13] .

---

(٩) **«کردستان»**، عدد ١ (القاهيرە).
(١٠) لە دەقی نامەکەدا (الأمم) نووسراوە.
(١١) **«کردستان»**، عدد ٨ (جنێف).
(١٢) لە نامەکەدا لەبریتی واو وێرگولی داناوە .
(١٣) **«کردستان»**، عدد ١٤(جنێف)، رۆژا پنجشنبیدە ٩ ذی الحجە ١٣١٦(٧ نیسان ١٣١٥).

هەر بۆ ئەم لایەنەی باسەکەمان لە ژمارەی پێنجی **«کوردستان»**ەوە ئەم راستیە بایەخدارە دێنینەوە. لە لاپەڕە سێ و چواری ئەو ژمارەیەیدا **«کوردستان»** نامەیەکی سەید تاهیر بۆتیی بڵاوکردۆتەوەکە لە شاری ئەدەنەوە ناردوویە بۆ مقداد مەدحەت بەدرخانی سەرنووسەری **«کوردستان»** لە قاهیرەو تێیدا داوای لێدەکات لە هەر ژمارەیەکی رۆژنامەکەی چل تا پەنجا دانەی بۆ بنێرێ، چونکە ئەدەنە هەر ساڵەی دە تا پازدە هەزار کوردی دێتێ، بە رادەیەک **«ئەڤ بازار وەک کوردا لێهاتیە»**و سەرجەمی ئەو کوردانەش، وەک دەڵێ، بێ **«نڤیساندن و خویندنا»**و بێ **«مەعریفەت وصەنعەت مانە»**[(١٤)].

بەر لەوەی بچینە سەر لاپەڕەیەکی تری باسەکەمان بە پێویستی دەزانین سەرنج بۆ ئەو راستیە رابکێشین کە ئەو روخسارانەی رێبازی رووناکی خوازی بەدرخانییەکان بەرهەمی بیرو بۆچونی رۆژگارێکی گەلێک زووترن لە رۆژگاری دەرچوونی خودی رۆژنامەی **«کوردستان»** کە ئەو، واتا رۆژنامەی **«کوردستان»**. تەنها دەرفەتێکی دەربڕینیانی بۆ رەخساندن، ئەگینا ناشێ سەرەتای دروستبوونی ئەو بیروباوەڕانە لە ناوەندی سەدەی نۆزدەمین، یا هیچ نەبێ لە شەست و حەفتاکانی ئەو سەدەیە بەملاوەتر بێ. **«کوردستان»** بۆ خۆی دوای ماوەیەکی یەکجار دوورو درێژ لە هەوڵ و تەقللاو کۆشش لە دایکبوو. نابێ ئەوەیش لەیاد بکەین کە بەدرخانییە رووناکی خوازەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست بۆ خۆیان نەوەی بەدرخان پاشای گەورەن کە هەست بە جیاوازییەکی ئەو تۆ لە جۆری بۆچوون و بیرکردنەوەکانیدا لەگەڵ نوێخوازانی ئەوسای وڵاتی عوسمانیدا ناکرێ.

## حاجی قادر لە بواری رووناکی خوازی کورددا

دوای بەدرخانییەکان حاجی قادری کۆیی و نەوەی جەمیل پاشا دیارترین هەڵگری ئاڵاو دروشمی رووناکی خوازیی کوردن. وا دیارە حاجی قادر کە چۆتە ئەستەمبوڵ لە نزیکەوە پێوەندیی بە بەدرخانییەکانەوە کردووە، رۆژنامەی

---

(١٤) **«کردستان»**، عدده ٥ (قاهیره)، رۆژا پێنجشمی دە ٢٧ محرم الحرام سنه ١٣١٦(٤ حزیران١٣١٤).

«کوردستان» بە بۆنەی کۆچی دوایی حاجییەوە پارچەیەک لە شیعرە نوێخوازەکانی ...کردۆتەوەو، بەعالم و زاناو عیلم و مەعریفەتپەروەر ناوی هێناوە[15]. بەڵام ...حی بۆ خۆی بە تەنها دیاردەیەکی تایبەتی و سەربەخۆیە لە بواری رووناکی ...بیی کورددا، یەکەم کوردە داوا لە منەوەرانی نەتەوەکەی دەکات دەست لە «...ەی بێ نەتیجە» و «باسی زولفی درێژو چاوی بەخەو» و «قەیدو تذبیب و ...شی یەو ئیعراب» هەڵبگرن و روو بکەنە زانستی نوێ، حاجی پێی حەیفە کە

هەرکوردە لە بەینی کللی میللەت
بێ بەهرە لە خوێندن و کتابەت[16]

حاجی وەستایانە بەهەشت بە حۆری و غیلمانەوە بۆ زاناو هونەرمەندو ...ێنەمواران قۆرغ دەکات و سوورە لەسەر ئەوەی

ئەهلی جەننەت نە شوان و گاوانە
صاحیبی فەن و عیلم و عیرفانە[17]

لە هەمان بواردا حاجیی نوێخواز ئاوێک دەرێژێ کە دوایی دەبێتە یەکێک لە ...خسارە هەرە دیارەکانی بزووتنەوەی رووناکی خوازیی ناو کورد بەوەی کە سەرنجی ...وڵاتییەکانی بۆ دەوری گەورەی زانست لە پێشکەوتن و سەرکەوتنی گەلانی تردا ...دەکێشێ و پێیان دەڵێ

ئەهلی ژاپۆن بە فەن و صەنعەتی چاک
سەیری چۆن چینی گرت وکردییە خاک[18]

---

١٥) «کردستان» عدد٣ (قاهیرە).

١٦) «دیوانی حاجی قادری کۆیی» ، لیکۆڵینەوەی سەردار حەمید میران وکەریم مستەفا شارەزا، پێداچوونەوەی مەسعود محەمەد، بەغدا، ١٩٨٦، ل ٢٦٣،٢٣٥ .

١٧) هەمان سەرچاوە، ل ١٨٧ .

١٨) هەمان سەرچاوە، ل ٢٥٩ - ٢٦٠ . بۆ ئەو شیعرانەی حاجی و ساغکردنەوەیان بروانە محەمەد مەلا کەریم، هەنگاوێکی تر بە رێگادا بەرەو ساغکردنەوەی دیوانی حاجی قادری کۆیی، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٩، ل ٢٥٣ - ٢٥٤، ٢٥٧ .

به پەرۆشی شاعیری گەورەمان بۆ ئەوەی کورد بە جارێک رووبکەنە فێربوون و خوێندنی نوێ دەگاتە رادەیەکی ئەوتۆ کەمێک شووڵی لێ هەڵبکێشێ و بڵێ

قــەیدو تەذبیب و شــەرح و حــاشی یەکــان
بوونە ســەددی مــەعــاریفی کــوردان[19]

ئەگینا لە راستیدا حاجی قادر بۆ خۆی بەرهەمێکی دانسقەی **«قەیدو تەذیب و شەرح و حاشیەکان»** بوو، بەڵام ئەو لەو پەڕی خەمخۆری و دڵسۆزییەوە دەیویست کورد بەرەو ئاسۆیەکی نوێ بەرێ و دەستوبرد، بێ دواکەوتن بەرچاوی رۆڵەکانی رۆشن بکاتەوەو بەو جۆرە رێگەی بۆ قۆناغێکی نوێ خۆشکرد.

## قۆناغێکی نوێ لەبواری رووناکی خوازیی کورددا:

مەشروتەی ئێران (١٩٠٥ - ١٩١١)و پێشتر لەویش شۆرشی تورکە لاوەکان (١٩٠٨)و لە ئەنجامەکانیان بوونە هۆی دەست پێکردنی قۆناغێکی نوێ پڕ نە تەوژم لە رەوتی رووناکی خوازیی کوردو هەموو گەلانی تری ناوچەکەدا. رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانی ئەو رۆژگارە پڕن لە بەڵگەی سەلمێنەری ئەم بۆچوونە کە ئەوانیش،واتە رۆژنامەو گۆڤارەکان، خۆیان لە خۆیاندا بوونە یەکێک لە رووخسارە بایەخدارە نوێکانی ئەو رێبازە. سەروتاری ژمارە سێی گۆڤاری **«رۆژی کورد»**ی ئۆرگانی **«کۆمەڵەی هێڤی»** کە هاوینی ساڵی ١٩١٣ لە ئەستەمبوڵ دەست بە بڵاوکردنەوەی کرا باشترین و لە بارترین نموونەیە بۆ رووناک کردنەوەی مەبەست[20].

**«قەڵەم بەر لەشیر»** ناونیشانی ئەو وتارەیە کە هۆی هەموو دواکەوتن و گیرۆدەیی کورد لەوەدا دەبینێ کە **«بایەخیان بە شیر داوە نەک بە قەڵەم»**. بایەخدان بە زانیاری و زانست لای **«رۆژی کورد»** دەچێتە خانەی خواپەرستی و جێبەجێ

---

(١٩) **«دیوانی حاجی قادری کۆیی»**، ل ٢٢٧ .

(٢٠) کاتی خۆی لە شام خوالێخۆشبوو رەوشەن بەدرخان دەقی ئەو وتارانەی دامێ کە خوالێخۆشبوو سالح بەدرخانی باوکی لە هەردووک گۆڤاری **«رۆژی کورد»**و **«یەک بوون»**دا بە زمانی تورکی بڵاوکردبوونەوە .


روژ کرد

**دیاری قوتابییەکی د. کەمال مەزهەر بۆ یەکەمین جارە لێرەدا بڵاوی دەکاتەوە**

کردنی فەرمانەکانی ئایینەوە، خۆ ئەگەر وانەکەین ئەوساکە نابێ گلەیی لە بەختی خۆمان بکەین کە **«لەم ژیانە ناخۆشەدا دەژین»**[٢١].

گۆڤاری **«رۆژی کورد»** بیری دارشتنی ئەلفبایەکی لەبارو سەربەخۆی بۆ نووسینی کوردی هێنایە کایەوە، کە ئەویش لەوساوە بووە یەکێک لە روخسارە نوێکانی رێبازی رووناکی خوازیی ناو کوردو چەندین جار بە شێوازی جیاواز داوایی باسی لێکراو بەدرخانییەکان و شارەزایانی کوردی شوورەوی و زانای وەک تۆفیق وەهبی و کەسانی تر خۆیانیان پێوە خەریک کرد.

دەبوو گۆڤاری **«رۆژی کورد»** ئەو دەورە دیارە لە رەوتی رووناکی خوازیی کورددا بیبینی، چونکە ئەوانەی پێوەی خەریکبوون بۆ خۆیان قوتابی و شاگردی کورد بوون

---

(٢١) **«رۆژی کورد»**، ئەستەمبوڵ، ژمارە ٣، یەکی ئابی ١٣٢٩(١٩١٣).

که له ئەستەموولی پایتەخت دەیانخوێند. واش پێدەچێ ژمارەکانی **«رۆژی کورد»** دەگەیشتنە زۆر ناوچەی کوردستان، ئاگادارێکی وەک مینۆرسکی باسی ئەوەی کردووەو دەڵێ بۆ خۆم لە ناوچەیەکی دوور لە ئەستەموولی وەک سلێمانی هەواڵی ئەو گۆڤارەم بیستووە(٢٢).

**«یەک بوون»**ی دەستەخوشکی **«رۆژی کورد»** کە بەدرخانییەکان رۆڵی گەورەیان لە دەرکردنیدا هەبوو، تایبەت ساڵح بەدرخانی باوکی رەوشەن بەدرخان کە زنجیرەیەک وتاری بەنرخی تێدا بڵاوکردۆتەوە، بەهەمان دەستوور باسی خوێندن و خوێندەواریی کردووەو بە یەکە دەرمانی چارەکردنی دەردەکانی کۆمەڵی کوردەواری داناون. لە ژمارە دوویدا **«یەک بوون»** باسی ئەوە دەکات چۆن لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێمەی کورد **«هیچمان لە گەلانی تر کەمتر نییە»** کەچی هێشتا **«نەمانتوانیوە دەسەلات و توانای خۆمان لە ژیاندا نیشان بدەین»** چونکە **«بەجاری نەخوێندەوارو نەزانین»**(٢٣)، لەبەر ئەوە یەکبوون لە ژمارەی داهاتویدا بە گەرمی داوا دەکات هەوڵ بدرێت زوو بەزوو **«بە لایەنی کەمەوە لە صەدا چل یا لە صەدا پەنجای کورد فێری نووسین و خوێندنەوە بن»**. بۆ جێبەجی کردنی ئەم ئاواتە **«یەک بوون»** رووی دەمی دەکاتە لاوانی کورد داوایان لێدەکات **«دەست لە خۆشی ژیان هەڵبگرن»** و **«روو بکەنە شاخە بەرزە ساردەکانی کوردستان و ببنە مامۆستاو رێ نیشاندەر رۆڵەی ساکاری میللەت»**(٢٤).

لەبەر گەلێک هۆی ئاشکرا ئەو رۆژگارە کوردی ئەستەمبوڵ و کوردستانی باکوور پێشەنگی دەستەی رووناکی خوازی کورد بوون، دوای ئەوان ئینجا کوردی بەغدا و باشووریش دەستیان تێکەڵ کردو کەوتنە خۆ. کردنەوەی روشدییەو قوتابخانەی نوێ لە شارەکانی کوردستانی باشوور لە نەتەوەکانی سەدەی نۆزدەمینەوە زۆرو کەمە سەرنجی خەڵکیان بۆ بایەخ و پێویستی خوێندن و خوێندەواری راکێشا، بەڵام لە هەر شت پتر مەبەستی رووناکی خوازیی کوردی باشوور لەسەر لاپەرەکانی گۆڤاری

---

(٢٢) ث.ف، مینورسکی، الاکراد. ملاحظات وانطباعات، ترجمة الدکتور معروف خزندار، بغداد. ١٩٦٨، ص٤٤

(٢٣) **«یک بوون»**، ئەستەموول، ژمارە دوو، ١٩ی ئەیلولی ١٣٢٩(١٩١٣).

(٢٤) **«یک بوون»**، ژمارە سێ، ٣٠ی ئەیلولی ١٣٢٩ (١٩١٣).

**«بانگی کورد»**دا رەنگی داوەتەوە. چەند نموونەیەکی بایەخدار بۆ باسەکامان لە ژمارە سێی ئەو گۆڤارەوە دێنینەوە کە جەمال بابانی بەناوبانگ (١٨٩٣ - ١٩٦٠) لە هەشتی شوباتی ساڵی ١٩١٤ وە لە بەغدا بە کوردی و تورکی کەوتە بڵاوکردنەوەی. **«بانگی کورد»** لەو ژمارەیەدا بە گەرمی داوای دامەزراندنی کۆمەڵێک، یا رێکخراوێک دەکات تاکو **«بە تەشویق و کۆششی ئەو»** لە هەموو **«جێگەیە مەکتەبێ گوشاد بکرێ و قەومی کوردان لەم جەهالەتە تخلیص بکا»**.

بەلای **«بانگی کورد»**ە وە خوێندەواری هۆی یەکەمی پێشکەوتن و سەرکەوتنن، نموەتا **«قەومێکی بچوکی وەک ژاپۆنیا»** بە **«سایەی سەعی و تەقدیری قیمەتی ومختیان دەوڵەتێکی عظیمی وەکو رووسیەیان[٢٥] شکانو تارومار کرد»**[٢٦].

لە هەمان وتاریدا **«بانگی کورد»** پارچەیەک شیعری شیاوی لەگەڵ باسەکەیدا هێناوەتەوە بێ ئەوەی ناوی دانەری بڵێ، ئەمەش دەقەکەیەتی کە تا رادەیەکی زۆر بۆنی شوکریلفەزلیی[٢٧] لێوە دێ:

بۆ تەرەقی مولک و میللەت ئیتیحادمان لازمە
شەرەفی غیرەت چاکە با غەیبی نەکەین ئەم فرسەتە
مەحفەظەی دین و شەریعەتمان خۆ خاکی وەتەن
ئاوەدانی ی ئەو بە نووری عیلم و فەنن وسەنعەتە
ئیش ئەگەر وابێ وەتەن نورانی مەعموور دەبێ
رستگاریمان دەبێ ئێمەش لە دەست ئەم ظولمەتە
دوژمنیی عیلم و مەعاریف خانەمان وێران دەکا
زۆر خراپەو موهلیکە، دەرمانی کەین ئەم عیللەتە[٢٨]

---

(٢٥) مەبەستی جەنگی ساڵی ١٩٠٥ ی نێوان رووسیاو ژاپۆنە، لەو جەنگەدا ژاپۆنی ئاسیایی بەسەر رووسیای ئەوروپاییدا سەرکەوت، بۆیەکا لە ناو گەلانی رۆژهەڵاتدا دەنگێکی زۆری دایەوەو سەرنجی روناکبیرانی راکێشا.

(٢٦) **«بانگ کورد»**، بەغدا، ژمارە سێ. ١٣٣٢ (١٩١٤)، ل ٦٨ - ٦٩.

(٢٧) رێی تێ دەچێ شیعری حاجی قادری کۆیی بێ، بەڵام نە لە دیوانە بڵاوکراوەکانی حاجیدا ئەو شیعرە هەیە، نە لە بەرهەمانەدا کە لە سەر حاجی نووسراون.
سەرنجی هەموولایەک بۆ ئەوە رادەکێشم، کە ئەو شعرە هی «عارف سائیب»ە). عەبدوڵلا زەنگەنە

(٢٨) **«بانگ کورد»**، ژمارە سێ، ١٣٣٢(١٩١٤)، ل ٦٩ - ٧٠.

پزیشکی بزووتنەوەی رووناکی خوازیی کوردی وڵاتی عوسمانی لەو قۆناغەدا نە رێگەی بەدرخانییەکانەوە گەیشتە کوردستانی ئێرانیش. عەبدولرەزاق بەدرخان لەم بوارەدا شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، ئەو تۆوی رووناکی خوازیی بەدرخانییەکانی گواستەوە ناوچەی خۆی و دەوروبەری، ئەمەیش لە رووی هاوچارەنووسییەوە بایەخی مێژوویی گەورەی خۆی هەیە.

عەبدولرەزاق بەدرخان کە سەردارێکی زۆر چالاک و دووربین و مەفتوونی پێشکەوتنی ئەورووپاییەکان بوو[۲۹] دروست بایەخی خوێندەواریی دەنرخاند، لە کاری رۆژانەیدا بایەخی تایبەتیی دەدایێ. ساڵی ۱۹۱۳ لە شاری خۆی لەسەر ئەرکی خۆی و پارەی کۆکراوەی خەڵک یەکەم قوتابخانەی کوردو کۆمەڵێکی رووناکبیریی کوردیی دامەزراند. هەر ئەو یەکەم کەس بوو بیری لە دانانی ئەلفبای کوردی بە پیتی لاتینی یا سلاڤی کردەوە[۳۰].

بەم جۆرە لەو قۆناغەی مێژووییەدا کە دەکەوێتە نێوانی ناوەندی سەدەی نۆزدەمین و سەرەتای دەست پێکردنی جەنگی یەکەمی جیهانەوە بزوتنەوەی رووناکی خوازی لە ناو کوردا سەری هەڵداو چەند هەنگاوێکی باشی بەرەو پێش نا، بێ ئەوەی بگاتە ئاستی رێکخستن و ئەنجامدانی کاری بە کۆمەڵ[۳۱]، سەرجەمی دروشمەکانی ئاوات و خۆزگەو ئامۆژگاری بوون، بەڵام، بێ گومان، نیشانەی بەڵگەی سەرەتای وریابوونەوەی کوردیش بوون. دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهانی قۆناغێکی نوێ لەم بوارەدا دەست پێدەکات.

---

(۲۹) بەڵگەنامە رووسییەکان پڕن لە زانیاریی بایەخدارو دەگمەن لەم بارەیەوە .

(۳۰) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە: **الدكتور كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة محمد الملا عبدالكريم المدرس**، الطبعة الثانية، بغداد، ۱۹۸٤، ص ٥٠، ٦٤، ۱۰۲ - ۱۰٤، ۳٥۹.

(۳۱) شێوازی رێکخستن تا رادەیەک تەنها بە کارەکانی عەبدولرەزاق بەدرخانەوە دیارن، ئەوانیش نە مەودایەکی تەسکدا بوون.

بابەتی دووەم*

# بایەخی ((خۆیبوون))و گەورەیی مەسەلەی کورد لە شەش بەڵگەنامەی نهێنیدا

**سەرەتا:**

دامەزراندنی **«کۆمەڵەی خۆیبوون»** بەر لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٧ وەرچەرخانێکی دیارە لە مێژووی رێکخراوە سیاسیەکانی کوردستاندا چ لە رووی پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆیەوە، یا لە رووی سروشت و ئاستی تێگەیشتن و پلەی خوێندەواری رابەرانی و رابوردووی خۆیان و باووباپیرانیان و بنەماڵەیان لە کۆڕی خەباتی کوردایەتیدا، چ



دروشمی خۆیبوون

(*) لە ژمارە (١٣٨)ی گۆڤاری **«رۆشنبیری نوێ»**ی ساڵی ١٩٩٦دا بڵاوکراوەتەوە.

له شێوازی کاروتێکۆشانیدا، کەچی لەگەڵ ئەوەش تاوەکو ئێستە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی «**خۆیبوون**» وەک ڕێکخراوێک و ئەنجامەکانی دامەزراندنی و کەم وکورتییەکانی و گەلێک ڕووی تری پێویستی نەنووسراوە، **وێڕای ئەوەی چەند لایەنێکی مێژوویی ئەو ڕێکخراوە سەروبن کراوەو ئەویش تۆمەتی ئەوەی درلوتە پاڵ گوایە دەستنێژی ئینگلیز و فەرەنسەییەکان بووە، ئەو تۆمەتەی کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکان تورکەکان بەڕاست و بە چەپدا بڵاویان دەکردەوە و دوای ئەوان مێژوونوسان قۆستیانەوە، بێ تەتەڵەکردن و لێکۆڵینەوەی وەک خۆی دووپاتیان کردەوە.** بەڵام دوای ئەوەی بەڵگەنامە نهێنییەکان خرانە ڕوو زۆر لایەنی بایەخداری نەزانراوی خەباتی «**خۆیبوون**» ئاشکرابوون کە سەرجەمیان ئەو بۆچوونە پووچەڵ دەکەنەوەو بایەخ و گەورەیی «**خۆیبوون**» وەک بەشێک لە مەسەلەی کورد ساغ دەکەنەوە. ئەمەیش بەرکوڵێکی مێژووی ڕاستەقینەی ئەو ڕێکخراوە کوردستانییەیە لەبەر ڕۆشنایی ناوەڕۆکی شەش بەڵگەنامەی نهێنیی دەگمەندا[1].

## هەڵوێستی کوردی ئەمریکاو چێمبرلەنی بەریتانیاو مۆسۆلینی ئیتالیا بەرانبەر خۆیبوون

هەموان، چ ئینگلیز، چ فەرەنسەییەکان، چ سۆڤیەت و ئەوانی تریش بە وردی کەوتبونە سۆراخی هەر زانیارییەک پێوەندی بە «**خۆیبوون**»و ڕابەرانییەوە هەبێ کە ئەویش بۆ خۆی نیشانەی سەنگی زۆرو گەورەیی ئەو ڕێکخراوە کوردییە. ئینگلیزەکان بە پیشەی خۆیان هەنگاو بە هەنگاو تاقیبی «**خۆیبوون**»یان دەکرد. بۆیەکا بە سەدان و بە سەدان بەڵگەنامەی بایەخدار لە فایلە تایبەتیەکانیان دەربارەی هەڵگیراوە. یەکێک لەو بەڵگەنامانە بریتییە لە ڕاپۆرتێکی چوار لاپەرەیی کۆنسولی بەریتانی لە شاری دیترۆیتی سەر بە ویلایەتی میشیگەنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا جۆن کامیرۆن کە ڕۆژی هەژدەی نیسانی ١٩٢٩ بەپەنە

---

(١) ژمارەی ئەو بەڵگەنامانەی بۆ نووسینی ئەم وتارە بەکارهێنراون لەشەش بەڵگەنامە زۆرترە، بەڵام دەقی ناوەڕۆکی تەنها شەشیانمان لەم وتارەدا پێشکەش کردووە بۆیە ئەو سەرناوەمان بۆی هەڵبژاردووە.

..ردوویه بۆ ئۆستن چێمبرلەنی[٢] وەزیری هەندەرانی بەریتانیا لە لەندەن[٣]. ئەوە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی ئاشکرای بایەخ پێدانی دەوڵەتە گەورەکانە چ بە «خۆیبوون»و چ بە مەسەلەی کورد پێکرا، ئەوساکە هێشتا دەوڵەتێک لە ئارادا نەبوو بتوانێ لە رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەراست و لە زۆر مەڵەندی تری جیهاندا شان لە شانی بەریتانیای گەورەبدات. چێمبرلەن بۆ خۆیشی سیاسەتمەدارێکی گەورەو ناسراوی ئەو رۆژگارەی بەریتانیاو سەرجەمی گیتی بوو، ئەو لە ساڵی ١٨٩٢وە بووە ئەندامی پەرلەمان و لە ساڵی ١٩٠٣وە تاوەکو کۆچی دوایی لەساڵی ١٩٣٧دا چەند جارێک بووە وەزیزی دارایی و کاروباری هیندستان و دەریاو هەندەران . ئەوەش ئاشکرایە کە تەنها ئەو مەسەلانەی بایەخی تایبەتییان هەیە دەکرێنە راپۆرتی نهێنی و دەخرێنە بەردەستی خودی وەزیری هەندەران.

بە پێی پوختەی ناوەرۆکی بەڵگەنامەکە سورەیا بەدرخانی براگەورەی جەلادەت و دکتۆر کامەران بەدرخان، کەوا دیارە سەرۆکی «خۆیبوون» بووە، حەوت مانگی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بردۆتە سەر، لە ناوەندی تەشرینی یەکەمی ساڵی١٩٢٨وە تاوەکو ناوەندی نیسانی ساڵی ١٩٢٩. سورەیا بەدرخان لەو ماوە دوورودرێژەدا بۆ کاروباری «خۆیبوون» بە ناو کوردی ئەمەریکادا گەراوە کە بەپێی راپۆرتەکە ئەوساکە ژمارەیان خۆی داوە لە دە تا دوانزە هەزار کەس. سەیر ئەوەیە ئەو کوردانە هەموو ساڵێک پەنجا تا شەست هەزار دۆلاریان بە پیتاک لە ناو خۆیاندا کۆکردۆتەوەو بە ئەوپەری کورتبینییەوە داویانەتە مستەفا کەمال ئەتاتورک. رەنگبێ ئەو کارە لەسەرەتای بزووتنەوەی کەمالیەکاندا رەوا بووبێ، بەڵام دوای ئەوەی هێزەکانی تورکیا ساڵی١٩٢٥کوردستانیان لە خوێندا نقوم کرد ئیتر هیچ پاساوێک لە ئارادا نەما ئەو کوردانە بە مفتی پارەیەکی وا زۆر بدەنە دەست رابەرێکی وەک مستەفا کەمال کە تا ئەو رۆژگارە کەس لە مێژوودا بە رادەی ئەو

(٢) لەو رۆژگارەدا لە بەریتانیا دوو سیاسەتمەداری بەناوبانگ بەناوی چێمبرلەنەوە هەبوو، ئەوی تریان نێڤیل چێمبرلەنە(١٨٦٩-١٩٤٠)ە، ئەویش چەند جارێک بووە وەزیرو لەساڵی ١٩٣٧یشەوە تاکۆچی دوایی بووە سەرەک وەزیران.

(3) Public Record Office,Air 23/415,X/M04583,Kurdish Nationalist Movement 18.4.1929-13.12.1929, British Consulate, Detroit, Michigan,18th April,No.21,Confidential, To:Sir Austen Chamberlain, His Magesty s Principal


سورەیا بەدرخان

دوژمنایەتی کوردو کوردایەتیی نەکردبوو.

هەر چۆن بێ سورەیا بەدرخان بە یاریدەی گریگۆر ڤارتانیان، کە دوایی باسی ئەویش دەکەین، کوردی ئەمەریکای قایل کردووە بدەنە پاڵ «کۆمەڵەی خۆیبوون»و ئیتر ئەو پارەیە نەنێرن بۆ مستەفا کەمال و بیدەنە «خۆیبوون»، ئەوان بڕیار دەدەن لەوەدوا حەفتانە یەکی دۆلارێک لە کرێی رۆژانەیانی بۆ تەرخان بکەن. ئەو راستییە بایەخدارە یەکێک لە گرێکوێرەکانی «خۆیبوون»مان بۆ دەکاتەوە کە پێوەندیی بە داهاتی ماڵیی ئەو کۆمەڵەیەوە هەیە. چالاکیەکانی «خۆیبوون»و هات و چۆی رابەرانی و جێبەجێ کردنی نەخشە بەرفراوانەکانی پێویستیان بەپارەو دەرامەت بوو، ئەوەی ناحەزانی «خۆیبوون» قۆستبوویانەوەو دەیانویست بەو بیانووەوە تۆمەتی نۆکەرایەتی رۆژئاوای بدەنە پاڵ.

وا دیارە کوردەکانی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا لەوساوە بوونەتە

پشتیکی گەورەی **«خۆیبوون»**. شایەنی باسە دوکتۆر بلەچ شێرکۆ، کە نازناوی سورەیا بەدرخان خۆیەتی، لەسەر بەرگی پشتەوەی ئەو کتێبەی کە بەناوی **« القضية الكردية»**وە ساڵی ۱۹۳۰ بلاوی کردۆتەوە وێنەی یەکێک لەو کۆبوونەوانەی پەخش کردووە کە لە رۆژانی گەشتەکەیدا بۆ ئەمەریکا لە دیترۆیت سازی کردووە[٤].

دەیان لەو بەڵگەنامانەی تاوەکو ئێستە من دیومن بەوردی ئەوەمان بۆ روون دەکەنەوە چۆن ئەرمەن بە گەرمی هاریکاریی رابەرانی کوردیان کردووە بۆ دامەزراندنی **«کۆمەڵەی خۆیبوون»**و پەرەپێدانی چالاکییەکانی کە هەڵبەت ئەوانیش مەبەستیان بوو تورکیا بشلەقێنن. راپۆرتەکەی کۆنسولی بەریتانیش لە دیترۆیت جۆن کامیرۆن بێ ئەوەی مەبەستیبێ ئەم راستییەی لە سێ خاڵدا بۆ تۆمار کردووین، یەکەمیان دەربارەی گریگۆر ڤارتانیانە کەوا دیارە رابەرێکی ئەرمەنیی چالاک بووە و ئەوساکە ئەندامی **«لیژنەی فریاگوزاری ئەرمەن»**[٥]بووە لە هەندەران . گریگۆر ڤارتانیان ئەو ماوە دوورو درێژە لەگەڵ سورەیا بەدرخاندا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا شارەوشاری کردووە، لەگەڵیشی چۆتە لەندەن و رۆماو ئەثیناو پاریس و شوێنی تر. خاڵی دووەمیشیان بەشداری کردنی ئەرمەنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە لەو پیتاکانەدا کە سورەیا بەدرخان و ڤارتانیان بۆ پشتیوانی **«خۆیبوون»** لەوێ سازیان کردبوون. دوا خاڵیش ئەوەیە کە دوکتۆر تۆماس مزەردیچیانی ئەرمەنی بەشی هەرە زۆری زانیارییە دەگمەنەکانی ناو راپۆرتەکەی بە کۆنسولی بەریتانی لەدیترۆیت راگەیاندووە تا ئەویش بیانگەیێنێتە لەندەن. مزەردیچیان کە بە تۆماس ئەفەندی شۆرەتی دەرکردبوو، بەر لە جەنگی یەکەمی جیهان جێگری کۆنسوڵی بەریتانی بووە لە دیاربەکرو هەر لەوساوە جنسییەی بەریتانی وەرگرتووە.

بەپێی ئەو زانیاریانەی تاوەکو ئێستە لەسەر **«کۆمەڵەی خۆیبوون»** کۆم کردوونەتەوە وا دەردەکەوێ رابەرانی ئەو رێکخراوە حەزیان کردبێ جۆرە پێوەندییەکیان لەگەڵ وڵاتی شورەویدا هەبێ و هەوڵی زۆریان بۆ جێبەجێ کردنی ئەو

---

Secretary of State for Foreign Affairs, London, England.

(٤) الدكتور بلەچ شيركو، القضية الكردية. ماضي الكرد وحاضرهم،القاهرة، ۱۹۳۰.

(٥) واتە **«لجنة اغاثة الارمن في الخارج»** کە دەمێک ساڵ بوو بۆ یاریدەی ئەرمەنە ئاوارەکان دامەزرابوو، لقی لە زۆر وڵات هەبوو.

ویستەیان داوە کە ئینگلیزەکان جارەهای جار لە بەڵگەنامە نهێنی یەکانی خۆیاند باسیان کردووە و بە وردی کەوتونەتە سۆراخی هەواڵەکانی کە بە دڵ پێیان سەغڵەت بوون. ناوەرۆکی بەڵگەنامەکەی ئیمڕۆمان هیچ جۆرە گومانێک لەوەدا ناهێڵێتەوە کە سۆڤیەتیەکانیش ویستوویانە لە نزیکەوە پێوەندییان لەگەڵ «خۆیبوون»دا هەبێ. ئەوانیش وەک ئینگلیزو فەرەنسەیی و لایەنەکانی تر بە پەرۆشەوە کەوتوونەتە سۆراخی جم و جۆڵ و چالاکییەکانی، تومەس، وەک راپۆرتەکە بە وردی باسی دەکات، ڤارتانیان پیاوی سۆڤیەت بووە، تەنانەت ماڵیشی لە یەریڤانی پایتەختی کۆماری ئەرمەنستانی شورەوی بووە کە ئینگلیزەکان ئیدرێسی تەواوی دەسکەوتووە.

لەوەیش گرنگتر ئەوەیە کە بەپێی هەمان راپۆرتی رۆژی نۆزدەی نیسانی ۱۹۲۹بەر لەوەی سورەیا بەدرخان لە نیویۆرکەوە بە پاپۆر بچێ بۆ لەندەن نوێنەری وڵاتی شورەوی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا[٦] لەگەڵ ئەو و ڤارتانیان کۆبۆتەوە.

ئەم دوو راستییە بایەخدارەی ناو راپۆرتە نهێنیەکەی کۆنسوڵی بەریتانی لە دیترۆیت هەمان کات وەڵامێکی دەمکوتکەرە بۆ ئەو رۆژهەڵاتناسە سۆڤیەتیانەی کە لە هەموان زیاتر تۆمەتی نۆکەرێتیان دەدایە پاڵ «خۆیبوون» کە بێ گومان وەک رێکخراوێکی لە دونیا گەیشتوو هەوڵی دەدا پێوەندی لەگەڵ هەمواندا هەبێ - چ فەرەنسا، چ بەریتانیا، چ شورەوی، چ ئیتالیا و یۆنان، چ عیراق و ئیران وسوریەو لایەنی تریش، بەڵام ئەو وڵاتانە ئامادە نەبوون ئاوڕی تەواو لە «خۆیبوون» بدەنەوە لەبەر ئەوەی هیچ کامێکیان نەیدەویست لەو رۆژگارەدا کێشەی کورد بکاتە بار بەسەر خۆیەوە کەبارێکی زۆر گران بوو، زۆر دەکەوت لەسەر ئەو لایەنەی بیویستایە دەستی یاریدەی بۆ درێژ بکات. ئەوەی جێی داخە سۆڤیەتیەکان لە رۆژگاری خۆیاند دەرفەتیان نەئەدا کەس توخنی بەڵگەنامە نهێنیەکانیان بکەوێ، ئەگینە رۆژهەڵاتناسانی سۆڤیەت زۆر لێهاتوو بوون و هەروا بە ئاسانی نەدەکەوتنە هەڵەی مێژوویی گەورەی وەک ئەو هەڵانەی دەربارەی بزووتنەوەی نیشتمانی کورد تێی

---

(٦) ئەوساکە هێشتا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دانی نەنابوو بە وڵاتی شوورەویدا، لەبەر ئەوە هەر یەکەیان نوێنەرێکی باڵایان لای ئەوی تریان هەبوو بۆ راپەڕاندنی کاروباری خەڵکی و سەرپەرشتی کردنی پێوەندیی ئابووری نێوان هەردوولایان.

گەوتن.

هەر لەم بوارەدا راپۆرتەکەی جۆن کامیرۆن دوو خاڵی بێ ئەندازە بایەخداری
حزاتراوی تری بۆ تۆمار کردووین، یەکەمیان دەربارەی دەعوەتنامەی مۆسۆلینییە بۆ
سورەیا بەدرخان کە بۆ ماوەی پازدە رۆژ لەسەر حسێبی حوکمەتی ئیتالیا بەر لەوەی
بێتە ئەمەریکا چۆتە رۆمای پایتەختی ئەو وڵاتە و وادیارە لەوێ لەگەڵ خودی
مۆسۆلینیدا کۆبۆتەوەو لە ئەنجامدا گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە ڕابەری ئیتالیای
فاشی ئامادەیە یاریدەی کورد بدات. ئەم لایەنەی راپۆتەکەش، کە دیسان
گەورەیی «خۆیبوون»و مەسەلەی کورد پێکڕا دەردەبڕێ، کەمێک پێویستی بە لێدوان
و ئێکدانەوەیە.

بنیتۆ مۆسۆلینی (١٨٨٣-١٩٤٥)دامەزرێنەری «پارتی فاشی»یە کە لە
کۆتایی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ وە دەسەڵاتی لە ئیتالیا گرتە دەست،
پیاوێکی زۆرزان، پیلانگێری وەک خۆی کەم بوو، هەر لە سەرەتاوە چاوی بڕیبووە
ناوچەکانی بەلکان و دانوب و باکووری ئەفەریقا و شوێنی تر، زۆریش بە پەرۆش
بوو دەریای ناوەڕاست بخاتە ژێر رکێفی ئیتالیاوە، تەنانەت فاشییەکان لەنەخشەو
نووسینەکانی خۆیاندا بە دەستووری رۆمانە کۆنەکان هەر بە «دەریاکەمان» (بحرنا)
ناوی دەریای سپیی ناوەڕاستیان دەهێنا. لێرە دا مەترسی سیاسەتی فاشیبەکانی
ئیتالیا تورکیاشی دەگرتەوە، ئەوەی مستەفا کەمال لەو رۆژانەدا هەزارو یەک
حیسابی بۆ دەکرد، تەنانەت یەکێک لەو هۆ سەرەکییانەی پاڵی پێوەنا بۆ بەستنی
«پەیمانی سەعد ئاباد» ناکۆکی تورکیا و ئیتالیا بوو، مستەفا کەمال بە پێویستی
دەزانی پشتی خۆی بەو پەیمانە قایم بکات، هەر لە بەر ئەوەش هەوڵی دا بەریتانیاو
شورەوی لە «سەعد ئاباد»دا بەشدار بن. وادیارە مۆسۆلینیش پێی وابوو دەتوانێ لە
رێگەی قوولّ کردنەوەی کێشەی کوردەوە گورزێک لە توانای تورکیا بووەشێنی و
لەبەردەم ئیتالیادا لاوازی بکات . هەڵبەت لەبەر ئەم هۆیە بووە کە مۆسۆلینی
بایەخی داوە بە «کۆمەڵەی خۆیبوون»و بە تایبەتی داوەتی سورەیا بەدرخانی کردووە
بچێتە رۆما. بێ گومان دۆسییە تایبەتییەکانی ئیتالیای فاشی دەبێ زانیاریی
بەکەڵکیان لەم بارەیەوە تێدا هەڵگیرابێ.

خـالّی دووەمـیـان باسی داوەتنامـەیەکی ترە کـە لە سـەرەک وەزیرانی یۆنانەوە ئێلێفـتـێـریـۆس ڤـێنیـزێلۆسـەوە ئاراسـتـەی سورەیا بەدرخـان کـراوە بۆ ئەوەی دوای تەواوبوونی گەشتەکەی لە ئەمەریکا سەر لە ئەثینا بدات. راستە یۆنان هەمیشە بە هەست لەگـەلّ کـوردا بووە، چونکە ئەویش کـاتی خـۆی کـەمی بەدەست عوسمانییەکانەوە نەچێشت و دوای ئەوەیش لە رۆژگاری کەمالییەکانەوە تاوەکو ئێستـە ناکۆکی و دووبەرەکی و شەڕوشۆڕ لە نێوان تورکیاو یۆناندا هەر بەردەوام بوون و دیارە تا دەمارگرژیی نەتەوەیی هەردوولا و تایبەت ترو فیز خۆبەزلزانینی تورکەکان لەئارادا بمێنێ ئەوانیش هەر بەردەوام دەبن، بەلاّم بەر لەو بانگهێشتنەی ڤێنیزێلۆس هیچ کاتێک رابەرانی یۆنان ئاوڕێکی وایان لە کورد نەداوەتەوە. دەبێ ئەوەیش بلّـێین کـە ڤـێنیزێلۆس لەو قـۆناغـەدا گـەورەترین سیـاسـەتمەداری یۆنان و یەکێک لە پیاوە سیاسییە ناسراوەکانی ئەورووپا بوو، لە سالّی ١٩١٠وە تا سالّی ١٩٣٣ پێنج جار بووە سەرەک وەزیرانی ولاّتەکەی.

بەر لەوەی گـەشـتـەکـەمـان لەگەلّ «خۆیبوون» و سورەیا بەدرخاندا تەواو بکەین جارێکا با بێنە سەر خودی راپۆرتەکەی جۆن کـامـیـرۆنی کـۆنسـۆلی بەریـتـانیـا لە دیتـرۆت بۆ وەزیری هەندەرانی ولاّتەکـەی ئۆستن چێـمـبـرلەن کـە ئەمـە تەواوی دەقەکەیەتی:

**«کۆنسۆلخانەی بەریتانی، دیترۆیت، میشیگەن،**
**١٨ی نیسانی ١٩٢٩، ژمارە :٢١،**
**نهێنی،**

**بۆ :سێر ئۆستن چێمبرلەن (لەگەلّ میدالّ و ناونیشانەکانی) وەزیری سەرەکی و هەندەرانی حـوکـومـەتی خـاوەن شکۆ، لەندەن، ئینگلتـەرا. ئەزبەنی[7] خـۆم بە شەرەفـمـەند دەزانم ئاگادارتان بکەم لەوەی میری کورد سورەیا بەدرخان، سەرۆکی هۆزی بۆتان کە نیشتەجێی(مەلّبەندی) نێوان چۆمی بۆتان و ورمێیەو[8] کەماوەی حەوت مانگی رابوردوو لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو لە کۆتاییدا لە دیترۆیت**

---

(٧) ئەزبەنی بەمانای سێری ئینگلیزی دێ (ئەز یا من بەندەی تۆم).

(٨) لە هەندێ شـوێنی راپۆرتەکـەدا بە دەسـخـەتێکی جوان یەکـێک جـاروبار تێـبـینی خـۆی دەربارەی زانیارییەکانی ناو راپۆرتەکە نووسیوە، وای بۆ دەچم ئەو تێبینییانە یا هی سێر گیلبەرت کلایتۆنی

[illegible]

23 / [illegible] Part [illegible] [illegible]

British Consulate,
Detroit, Michigan.
18th April, [illegible].

[illegible]
Confidential.

Sir,

I have the honour to report that the Kurdish Prince, Sureya Bedr Khan, head of the Kurdish tribe of the Bohtan (living between the river Bohtan and Lake Urumiah) who has been in the United States during the past seven months, and latterly in Detroit, is sailing from New York tomorrow, the 19th April, in the "Ile-de-France" for Paris, accompanied by Grigor Vartanian, member of the delegation abroad of the Comite de Secours pour l'Armenie. Sureya's object is to gain the support of one or other of the Powers for a rising against the Turks, for which purpose he has been collecting funds among the Kurds (about 10,000 or 12,000 in number) in the United States. The Armenians in the United States are in sympathy with the Kurds and I understand are helping with funds. Vartanian lives in Erivan, Soviet Armenia.

[illegible]

بوو، سەبەینێ، نۆزدەی نیسان، لە نیویۆرکەوە بە ڕێگەی دەریادا بە پاپۆڕی «ئێلی دێ فرانس» بەرەو پاریس پێکرا لەگەڵ گریگۆر ڤارتانیان ئەندامی وەفدی کۆمیتەی فریاگوزاری ئەرمەن لە هەندەران(٩) دەکەونە ڕێ. سورەیا بەدرخان دەیەوێ پشتگیری دەوڵەتێک لە دەوڵەتان وەدەست بێنێ بۆ بەرپا کردنی ڕاپەڕینێک دژی تورکەکان. هەر بۆ ئەو مەبەستەش خەریکی پیتاک بوولە ناو کوردەکاندا کە ژمارەیان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەگاتە نزیکەی دە تا دوانزە هەزار کەس. ئەو

---

نوێنەری باڵای بەریتانیا لە عیراق، یا هی کاپتەن ڤیڤیان هۆڵتی سکرتێری بن، لێرەدا لە تەنیشت باسی هۆزی بۆتانەوە بەدەستخەت نووسراوە: **«زۆر روون نییە، ساڵی ١٨٤٠ ئەو بنەماڵەیە گوێزرایەوە، هۆزەکەشیان تێکشکێترا».**

(٩) ناوی کۆمیتەکە لە بەڵگەنامەکەدا بە زمانی فەرەنسی بەم جۆرە نووسراوە: "Comite du Secours Pour l Armenie"

**ئەرمەنیانەش کە لەولاتە یەکگرتووەکان دژین هەستیارن بەرانبەر کوردو وەک زانیومە بەپارە یاریدەیان دەدەن .ڤارتانیان لە یەریڤان، لە ئەرمینیای سۆڤیەتی دژی. سورەیا لە پاریسەوە دەچێتە لەندەن، دوور نییە ئالوگۆڕ لەپلانی گەشتەکەیدا بکات، لەوانەیە پێویست بێ بزانرێ ئەو ئالوگۆڕانە ئێستە چین» .**

سەرچاوەی زانیارییەکانم دوکتۆر ک.م.تۆماسە کە هاولاتییەکی بەریتانییە بە تەجەنوس و بەر لە جەنگ[10]جێگری کۆنسۆلی بەریتانیا بوو لە دیاربەکر، لەکاتی جەنگیشدا، وەک زانیومە، لای جەنەراڵ دیدس وکۆلۆنێل لۆرانس و[11]دەستی ئەرکانی جەنەرال ئەلینی وەک **(تۆماس ئەفەندی)** لە میسر ناسراوبوو. دوکتۆر تۆماس سەرۆکایەتی هۆزێکی ئەرمەنی لە باوباپیرانییەوە بۆماوەتەوە، ئەو هۆزە دراوسێی کورد و پێوەندی پێوەیان دۆستانە بوو، بەلام تورکەکان لە ناویان برد. ئەوە چەند ساڵێکە دوکتۆر تۆماس لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دژی، من و دەچێ بۆ نزیکەی چوارساڵ لە دیترۆیت دەیناسم، کەمێکیش یاریدەم داوە بۆ ئەوەی کێشەی خۆی و ئەرمەنەکانی تر بگەینمە ئەو کۆمیتە نێو دەوڵەتییەی لە ئەستەمووڵ دەڕوانێتە ئەو داوای تەعویزانەی دژی تورکەکان پێشکەشی کراون . ئەمەی لای خوارەوە پوختەی راگەیاندنەکەیەتی بەو جۆرەی بە خۆمی گوتووە:

سورەیا لەلایەن **«خۆیبوون»** ، واتە کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردانەوە نێردراوە، بۆ ولاتە یەگرتووەکانی ئەمەریکا. کوردی ئەم ولاتە هەموو ساڵێک ٥٠ هەزار تا ٦٠ هەزار دۆلاریان دەنارد بۆ مستەفا کەمال، بەلام سورەیا قەناعەتی گۆڕیون و وای لێ کردوون روو بکەنە سەربەخۆیی **(کورد)** و بڕیاریان داوە هەر یەکەیان هەفتەی دۆلارێک بدەن بۆ ئەوەی بدرێ بە **«خۆیبوون»**و بە کردار لەماوەی چوار مانگی رابردوودا ئەمەیان ئەنجام داوە، بەوکارەشیان هەموویان بوونەتە ئەندامی سوێند خواردووی ئەو کۆمەڵەیە. کاتێک سورەیا بە رێگەوە بوو بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا مۆسۆلینی داوەتی کردو پازدە رۆژی بە میوانی لای ئەو لە رۆما بردەسەر. ئەو (واتە سورەیا بەدرخان) گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە مۆسۆلینی حەز دەکات یاریدەی کورد بدات .ڤینیزێلۆسیش داوەتی کردووە لە رێگەی گەڕانەوەیەوە **(لە**

---

(١٠) مەبەستی جەنگی یەکەمی جیهانە.

(١١) مەبەستی لۆرانسی بەناوبانگە کە هەر بە لۆرانسی عەرەب ناو دەبرێ.

**یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە)** سەری ئەثینا بدات. لە موسڵ بەپێی قسەی دکتۆر تۆماس، ڕێگەی کارکردن نەدراوەتە **«خۆیبوون»**، بەڵام لە حەڵەب عەرەسەییەکان ڕێگەیان داوەتێ. حوکمەتی رووسیای سۆڤیەتیش حەز دەکات پەیوەندیی هەبێ پێیانەوە **(واتە رابەرانی خۆیبوون)**، نوێنەری سۆڤیەتی لە نیۆیۆرک تەرتیبی بینینی **(سورەیا بەدرخانی)** کردووە بۆ سبەی بەیانی بەر لەوەی لە ڕێگەی عەریاوە بکەوێتە ڕێ.

هۆزی بابانی کورد لە ئێران[١٢] لایەنگرن **(واتە لایەنگری خۆیبوونن)**. حوکمەتی رووسی داوای لە ڤارتانیان کردووە کە بەردەوام بێ لە پەیوەندی کردنیدا بە کوردەکانەوەو هەوڵ بدات ڕێککەوتننامەیەک ساز بکات لە نێوان ئەوان و حوکمەتی رووسیادا. ئەمەش ئەدرەسییە(ئەدرەسی ڤارتانیان):

لە ڕێگەی بەرلینەوە بۆ مۆسکۆ، یەریڤان ئەرمێنیای سۆڤیەتی، قەوقاس.

ژمارەی شەقام زانیاریی تر **(دەربارەی ئەدرەسەکە)** بە زمانی ئەرمەنی بەسەر نامەکەوە نووسێنراوە.

ڤارتانیان دەیەوێ دوکتۆر تۆماس بچێ بۆ یەریڤان و لەوێوە بۆ مۆسکۆ. لە وەڵامدا دوکتۆر تۆماس گوتوویە کە ئەو هاووڵاتی بەریتانییەو ناتوانێ بێ پرسی حوکمەتی بەریتانی هیچ بکات.

زۆر گرنگە سورەیا دەبێ هەتاهەتایە نەزانێ دوکتۆر تۆماس ئەم زانیاریانەی ڕاگەیاندووە، ئەمە مەرجی دوکتۆر تۆماس خۆیەتی. بەپێی قسەی سورەیا کورد دەتوانن ١٥٠ هەزار کەس کۆبکەنەوە **(بۆ ڕاپەڕین)** بە ڕابەری ئەفسەرانی پێشووی **(ناو لەشکری تورک)** کە چەند جەنەراڵێکیان لەگەڵدایە، ئەوەی ئەوان پێویستیان پێیەتی بریتیە تەنها لە تفاق و تەجهیزات[١٣].

سورەیا نامەیەکی لە **«خۆیبوون»**ەوە بۆ هاتووە کە لە حەڵەبەوە بۆی نێردراوە،

---

(١٢) لەم شوێنەی ڕاپۆرتەکەشدا بە دەسخەت نووسراوە **«هۆزێکی وا نییە»**، ڕاستیشە چونکە بابانەکان لە دەمێکەوە لە پێوەندیی هۆزایەتی قوتار بوبون و ببوونە بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداری ناسراو.

(١٣) دیسان لێرەدا تێبینییەکی زۆر ورد بە دەسخەت نووسراوە کە ئەمە دەقی یە: **«هەروەها ڕابەرێک»**، واتە کورد سەرباری تفاق و تەجهیزات پێویستیان بە ڕابەرێکی لێهاتووشە، شایانی وتنە خاوەنی ئەو تێبینییە نیشانەیەکی تەئکیدیشی داناوە(واتە!) بۆ چەسپ کردنی بۆچوونە دروستەکەی.

نامەکە باسی ئەوە دەکات چۆن تورکەکان خەریکن خۆیان بۆ هێرش ئامادە دەکەن. کوردیش ئامادەی بەرگرین و داوای لێ دەکەن ئەوی پێی دەکرێ لە لەندەن و لە پاریس دریغیی لێ نەکات. سورەیا لە نیویۆرک کتێبێکی لەسەر مەسەلەی کورد بلاوکردۆتەوە، دوکتۆر تۆماس سبەینێ دانەیەکیم بۆ دێنێ و منیش بۆتانی دەنێرم. بەلام هەرچی ئەم راپۆرتەمە ئیمشەو بە فرۆکە رەوانەی دەکەم، دەمەوێ فریای بخەم لەگەل بێرینگاریادا بینێرم[١٤]، دلنیام راپۆرتەکەم بەر لە گەیشتنی سورەیا دەگاتە لەندەن.

دوکتۆر تۆماس دەلێ ئەو لەپێناوی حوکمەتی بەریتانیادا ئامادەیە **«بۆ هەموو شوێنێک»** بچێ. تەمەنی شەست و پێنج حەفتا سالان دەبێ، بەلام هێشتا زۆر گورج و گۆل و وریایە، هەلبەت بێ ئەوەی بیەلم هەست پێبکات خۆم وا لێ کرد کە من هەر هیچ ئاگام لە سیاسەتی حوکمەتی خاوەن شکۆ نییە و نازانم ئەو سیاسەتە چۆن دەبێ لەم بوارەدا[١٥]. ناوی تەواوی دوکتۆر تۆماس بە ئەرمەنی بەم جۆرەیە: تۆماس ک.مزەردیچیان، دوور نییە ئەوکاتەی جێگری کۆنسولی بەریتانی بووە ئە دیاریەکر بەو ناوەوە ناسرابێ، بەلام ئێستا ناتوانم بە دلنیاییەوە وا بلێم، ئەوەندە هەیە لەکاتی جەنگدا لە میسر تۆماس ئەفەندییان پێ دەگوت.

شەرەفمەند دەبم، ئەزبەنی، نۆکەری هەرە دلسۆزو ئەلقە لەگوێتان بم. ئیمزا جۆن کامیرۆن[١٦].

---

(١٤) ئەوساکە فرۆکەش وەک پاپۆر ناوی هەبوو، لە دەقی راپۆرتەکەدا دەلێ: دەمەوێ فریای «Berengaria»ی بخەم کە وا دیارە ناوی فرۆکەیەکی بەریتانی بووە کە ئەو شەوە لە نیویۆرکەوە بەرەو لەندەن فریوە، ئەمەیش دیسان بایەخی زۆری ناوەرۆکی راپۆرتەکە نیشان دەدات، هەرچی بێرێنگاریاشە ناوی شاژنێکی ئینگلیزە، هەمان کات بێرێنگار تورسکی ناوی فەیلەسوفێکی فەرەنسییە کە سەدەی یازدەمین ژیاوە.

(١٥) دیارە مەبەستی سیاسەتی بەریتانیایە بەرانبەر مەسەلەی کورد کە بە قسەکانی جۆن کامیرۆن خۆیدا ئاشکرا دیارە ئەو زۆر باش ئاگاداری ئەو سیاسەتەیە.

(١٦) بروانە پەراوێزی ژمارە(٣).

## سۆڤێت و «کۆمەڵەی خۆیبوون»

ئەم راپۆرتە کە هیچ سنوورێک بۆ بایەخی بەنسبەت مێژووی کوردەوە نییە، وێنەی لێ دراوەتە چەند وەزارەت و لایەنێک و ژمارەیەکی زۆر لە باڵوێزخانەکانی بەریتانیا لە رۆماو لە ئەثینا و پاریس و ئەنکەرە وتاران و گەلێک شوێنی تری وەک بەغدا و دیمەشق و حەڵەب. وێنەکەی لای من لەسەر ئەو دانەیە گیراوەتەوە کە بەتایبەتی نێردراوە بۆ وەزارەتی فرۆکەوانی لە لەندەن لەناو دۆسیەی ژمارەی ٤١٥/٢٣، ئێکس ئێم ,٤٥٨٣ دا هەڵگیراوە کە بریتییە لە بەشی پێنجەمی زنجیرەیەک دۆسییەی ئارشیڤی ئەو وەزارەتە کە لەژێر ئەم سەرناوەدا لە لەندەن هەڵگیراوە: **«بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە هەژدەی نیسانەوە تا سیازدەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٩»**.

لە هەموو لاوە کاربەدەستانی ئینگلیز دەکەونە سۆراخی ئەو زانیارییە گرنگانەی جۆن کامیرۆنی کۆنسۆلی بەریتانیا لە دیترۆیت لە راپۆرتە نهێنییەکەی خۆیدا بۆ دیتنی ئۆستن چێمبرلەنی وەزیری هەندەرانی وڵاتەکەی تۆماری کردبوون. لە هەرشت پتر بایەخ پێدانی شوورەوی بە **«خۆیبوون»** سەرنجی راکێشاون و ئۆقرەی لێ بڕیون، دەستوبرد دەکەونە تاقیبی ڤارتانیان، دەیانەوێ بزانن کێیەو چیی بووەو چی کردووە .نامەو نامەکاریی دەستپێ دەکات، زۆر نابات ئینگلیزەکان لە فایلە کۆنەکانی خۆیاندا لە بەغدا زانیارییەکی بەنرخ دەربارەی ڤارتانیان دەدۆزنەوەو یەکسەر سکرتیری نوێنەری باڵای بەریتانی لەبەغدا **(المندوب السامي)** کاپتن ڤیڤیان هۆڵتی بەناوبانگ[17] هێزی ئاسمانی بەریتانی لەعیراق دەربارەی ئاگادار دەکات، ئەمیش دەقی ئەو بەڵگەنامەیەیە، لەبەر بایەخی زۆری وەک خۆی بڵاوی دەکەینەوە:

**«نهێنی، د. و. ژمارە : گ. و، ٥٨٢٠، سکرتاریەتی نوینەری باڵای حوکمەتی خاوەن شکۆ لە عیراق، بەغدا، ٣١ی مایسی ١٩٢٩ .**

---

(١٧) دەربارەی کاپتن ڤیڤیان هۆڵت بڕوانە ئەو وتارەمان کە بە ناونیشانی **«گاڵتەو گەپ و گەمەکانی نەوان شێخ مەحمودو فرۆکەوانە ئینگلیزەکان»*** وە لە ژمارە ١٣٦ی ساڵی ١٩٩٥ی گۆڤاری **«رۆشنبیری نوێ»** دا بڵاومان کردۆتەوە، بە تایبەتی لاپەڕە چواردەی ئەو ژمارەیە.

(*) «ئاماژەیە بۆ بابەتی سێیەمی بەشی یەکەمی ئەم کتێبە کە لە ل(٨٩،٣٣)دا دەیخوێنیتەوە- **عەبدوڵلا زەنگەنە**».

**بۆ سەرهەنگی فڕۆکەوان ڕۆبەرت جۆپ-سلەید (لەگەڵ میداڵەکەی)، بنکەی هێزی ئاسمانی، هنێدی[18] نیشانە بە یادداشتی ژمارە گ.و.٥٤٧٠ی ڕۆژی ٢٢ی مایسی ١٩٢٩ی سکرتاریەت. لەناو فایلەکانماندا ئەوەم دۆزیەوە کە شوباتی ساڵی ١٩٢٢مولحەقی سەربازیی بەریتانی لەتاران پێی ڕاگەیاندووین کە ڕۆتشتەینی وەزیری موفەوەزی ئەوسای یەکێتی سۆڤیەت (لەئێران) وەکیلێکی ئەرمەنی بەناوی ڕایزامیێکۆڤەوە ناردۆتە بەغدای کەناوی ڕاستەقینەی ڤارتانیان یا ڤارتانۆڤەو بەسەروسیماو قسەکردن وە تورک دەچێت .**

**لەو باوەڕەدانیم هیچ زانیارییەکی ترمان دەربارەی ڕاستی هاتنی ئەم پیاوە بۆ ئێرە هەبێ، بەڵام ئەوەی کە(ڤارتانیان) لە دەوروبەری ساڵی ١٩٢٢دا کاری بۆ ڕۆتشتەین دەکرد ڕاستییەکەی تەواو دەگەڵ ڕاپۆرتەکەی دیترۆیت -میشیگاندا دەگونجێ. دڵسۆزتان ڤ هۆڵت»[19].**

کار بەمەوە ناوەستێ. دوا بەدوای ئەوبروسکەیە سێر گیلبەرت کلاریتۆنی نوێنەری باڵا بۆ خۆی وەڵامنامەیەکی تێرو تەسەل دەربارەی هەمان باس دەنێرێ بۆ وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن. وەڵامنامەکەی کلایتۆن وێڕای باسی ڤارتانیان تیشک دەخاتە سەر پێوەندیی نێوان سۆڤیەت و **«خۆیبوون»**و بێ هیچ پێچ و پەنایەکیش ئەندازەی سەغڵەت بوونی بەرزترین دەزگاو کاربەدەستی ئینگلیزمان لەسەر ئەوە بۆ دەخاتە روو، ئەمەش دەقی ئەو بەڵگەنامە گرنگەیە:

**«نهێنی، بارەگای نوێنەری باڵا، بەغدا، ڕۆژی ٧ی حوزەیرانی ١٩٢٩، ئەزبەنی:**

**١- شەرف مەند دەبم ئیشارەت بدەم بە نامەی نهێنی ڕۆژی شەشی مایسی ١٩٢٩تان کە ڕاپۆرتی کونسوڵخانەی بەریتانیی لەدیترۆیت دەربارەی چالاکییەکانی سورەیا بەدرخان و ڤارتانیانی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێ ڕاگەیاندین.**

---

(١٨) ئەوساکە بە موعەسکەر رەشیدیان دەگوت هنێدی.

19) PRO, Air 23/415, X/M 04583, Kurdish Nationalist Movement, 18.4.1929-13-12-1929, Secret, D.O. No. G.O. 582, Secretariat of H.E. the High Commissioner for Iraq, Baghdad, 31 May 1929, To: Squadon Leader

٢- دوای ئەو بروسکەیەم کە بە ژمارەی ٢١٣ی رۆژی حەوتی مایسی١٩٢٩ ناردمە خزمەتتان. پشکنینەکانمان بەناو دۆسیەکانی ئەرشیفەکانی بارەگای نوێنەری باڵا(لەبەغدا) ئەوەی بۆ ساغ کردینەوە کە ساڵی ١٩٢٢ ڤارتانیان (نازناوی ڤارتانۆف ورایزامبیکۆف)ە، پیاوی (وەکیلی)م. ڕۆژشتیینی وەزیری مفەوەزی ئەوسای یەکێتی سۆڤیەت لەتاران بووە. ئەم راستییە ئەو گومانە پەرسەندووەمان بۆ جێگیر دەکات کە وا بەلشەفیکەکان لەنزیکەوە پێوەندی یان بە کۆمەڵەی خۆیبوونەوە هەیەو لەوانەیە رێ بەدی بکەن بۆ ئەوەی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بۆ مەبەستەکانی خۆیان بخەنە گەڕ.

٣- بە پێویستم زانی دایەرەی تەحقیقاتی جینائی حوکمەتی عیراق لە حاڵە سەرەکییەکانی ناو ئەو راپۆرتەی لەگەڵ نامەکەتاندا ناردبووتان ئاگادار بکەم. ئەوانیش هەر زانیارییەکی دروستیان دەستکەوت یەکسەر دەربارەی ئاگادارتان دەکەم.

٤- هەمان کات دایەرەی تەحقیقاتی جینائی داوای وێنەی سورەیا بەدرخان و ڤارتانیان دەکات بۆئەوەی یاریدەیان بدات بۆ دۆزینەوەیان، بەختەوەر دەبم گەرتوانن وێنەیانمان بۆ پەیدابکەن .

شەرمەزەند دەبم، ئەزیەنی، گەر بە دڵسۆزترین نۆکەری خۆتانم قەبووڵ بفەرموون.

گیلبەرت کلایتۆن، نوێنەری باڵای بەریتانیا لە عیراق»[20]

## مەسەلەی کورد لە نێوان سورەیا بەدرخان و گیلبەرت کلایتۆندا

هەر لەو رۆژانەدا دەزگا تایبەتیەکانی ئینگلیز لە لەندەن بەوەیان زانیوە کە سورەیا بەدرخان و گریگۆر ڤارتانیان نیازیانە پێکرابێنە عیراق و لەوێوە بچنە ئێران و هیندستان. وەزیری موستەعمەراتیش یەکسەر رۆژی شەشی مایسی ساڵی ١٩٢٩

Robert Jope Slade, D. S. O, Air Headquarters, Hinaidi.

(20) Ibid, Secret The Residency, Baghdad, Date 7th June, 1929.

(21) Ibid, Telegram from High Commissioner, Baghdad, To: Secretary of

بەنامەیەکی نهێنی نوێنەری باڵای بەریتانی لە بەغدا گیلبەرت کلایتۆن لەو هەواڵە ئاگادار دەکات. لە وەڵامدا نوێنەری باڵا رۆژی ۲۱ی مایسی هەمان ساڵ بەبروسکە داوا لە وەزیری موستەعمەرات دەکات بەهیچ جۆر هیچ کام لە باڵوێزخانە یـ کۆنسولخانەکانی بەریتانیا لە هیچ شوێن ڤیزەی هاتنی عیراق نەدەنە سورەیـ بەدرخان و ڤارتانیان، ئەمەش دەقی ئەو بروسکەیەیە:

**«بروسکە، بەشفرە، ئاسایی، لە: نوێنەری باڵاوە، بەغدا،**

**بۆ:وەزیری موستەعمەرات، لەندەن، ژمارە:۲۰٤،**

**رۆژی ۲۱ی مایسی ۱۹۲۹**

**داوامان ئەوەیە هەنگاوی تایبەتی بنرێ بۆ قەدەغەکردنی سورەیا بەدرخان (ژمارە سێی نێو ئەو لیستەیەی لەگەڵ راپۆرتەی نهێنی یەکەتاندا، ژمارە، ۲۳ی شوباتی ۱۹۲۳ناردبووتان) دەگەڵ ڤارتانیان لە ڤیزە وەرگرتن بۆ هاتنی عیراق.**

**نیشانە بەنامەی نهێنیی رۆژی شەشی مایسی ساڵی ۱۹۲۹تانە»**[۲۱].

کاربەدەستانی ئینگلیز لە بەغدا بەوە قایل نابن، ئەمان ترسی ئەوەیان لێ دەنیشێ سورەیا بەدرخان و ڤارتانیان بەقاچاغ، بێ ڤیزە، بێنە ناو خاکی عیراقەوە. لەبەر ئەوە سێر گیلبەرت کلایتۆن، وەک وتمان، لەنامەکەی رۆژی حەوتی حوزەیرانیدا داوای لە وەزیری موستەعمەرات دەکات وێنەی هەردووکیان بۆ بنێرن تـ بەسەر سنووری عیراقدا بڵاویان بکەنەوە نەبا ئەو دوانە بەدزییەوە، یا بەگـزێ بەناوی ترەوە لەسنوور خۆیان دەرباز بکەن. رۆژی ۲۲ی تەموز ئینگلیزەکان جارێکی دی لەبەغداوە داوای وێنەی بەدرخان وڤارتانیان دووپات دەکەنەوە. هەمان کـت فەرمانی تایبەتی بۆ ئەو دەزگایانە دەردەچێ تا بەوردی ئاگایان لە سنوور بێ و دەرفەتی دەربازبوونی سورەیا بەدرخان نەدەن. پاش ماوەیەک دوو وێنەی سورەیـ بەدرخان لە لەندەنەوە دەگاتە بەغداو ئینگلیزەکان وا دیارە ژمارەی تەواویان لەسەر دەگرنەوەو بەسەر دەزگا تایبەتیەکانیاندا بڵاویان دەکەنەوە[۲۲].

---

State for Colonies, Londod, No, 204, Dated 21st May, 1929.

22) Ibid, Secret, Secretariat of H.E the High Comm. for Iraq, D.O. No. S.O 960, Baghdad, 11 September, 1929, To: Air Commodore C.S Burnett.

23) Ibid Copy, No. 1040/C3/29, Personal and Confidential, To Sir Gilbert

سورەیا بەدرخان نیازی نەبووە بەدزی یەوە بێتە ناو خاکی عیراقەوە، ئەو دوای تەواوبوونی گەشتەکەی ئەمەریکاو ئەوروپا یەکسەر دەچێتە بێروت و لەوێ رۆژی هەشتی تەموزی ١٩٢٩داوای ڤیزەی ئاسایی لە کۆنسولخانەی بەریتانی دەکات، هەر ئەو رۆژە کۆنسۆلی بەریتانی لە بێروت هـ.ی.ساتۆ نامەیەکی نهێنی دەنێرێ بۆ سێر گلبەرت کلایتۆن لەبەغدا کە تێیدا دەڵێ:

**«خۆشەویستم کلایتۆن**

**ئیمرۆ بەیانی میر سورەیا بەگی بەدرخان هاتە دیدەنیم و گوتی کە ئەو لە میسرەوە، لەکاتی جەنگی (یەکەمەوە)تۆ دەناسێ و داوای لێ کردم نامەیەکیت پێ بگەیەنم . دوای ئەوەی نامەکەیم خوێندەوە بریارم دا بۆتی رەوانە بکەم، هیوادارم بەهەڵە نەچوبیم. هیچ گفتوگۆیەکم دەربارەی ناوەرۆکی نامەکەی لەگەڵدا نەکردو وام مامڵەی ئەو نامەیە کرد وەک داوایەک بێ بۆ ئەوەی رێگەی پێ بدری بێتە عیراق .وای بۆ دەچم خاوەنی ئەم نامەیە هەر ئەو سورەیا (ثریا) بەدرخانە بێ کە لە تەعمیمی پ.سی.دی، ژمارە س٣٦١٢١ی رۆژی شەشی شوباتی ساڵی ١٩٢٩دا داواکرابوو ڤیزەی پێنەدرێ . هەر چۆن بێ من پیرۆزبایی ئەو ئەتەکێت و راسگۆیی یەم لێی کرد کە لە داواکردنی ڤیزەکەدا نواندی»**(٢٣).

ساتۆ لەگەڵ ئەم نامە **«نهێنی تایبەتی»**یەی خۆیدا نامەکەی سورەیا بەدرخانیشی ناردووە بۆ کلایتۆن. نامەکەی سورەیا بەدرخان بەزمانی فەرەنسییەو سێ لاپەڕەی گەورەی پر کردۆتەوە کە لە رۆژی ٣٠ی حوزەیرانەوە بۆی ئامادەکردووە(٢٤). سورەیا بەدرخان بەزمانێکی بەرزی دیبلۆماسییانە لەگەڵ کلایتۆندا دەدوێ و بێ هیچ جۆرە مەرایی یەک پوختەی مێژووی مەسەلەی کوردی دێنێتەوە یادو داوای یاریدەی بەریتانیای گەورە دەکات تا کوردیش بتوانێ وەک گەلانی دی ناوچەکە خۆی لە جەوری تورکان قوتار بکات(٢٥). سورەیا بەدرخان هەمان کات باسی دامەزراندنی

---

Clyton..., Baghdad, From: H.E. Satow, Beyrouth, July 8th, 1929.
(24) Ibid
(٢٥) بەڕێز سینەم بەدرخانی برازای سورەیا بەردخان دەقی نامەکەی مامی بۆ وەرگێرام، زۆر سوپاسی دەکەم.

**«خۆیبوون»** و ئامانجەکانی و شێوازی کارکردنی لە نامەکەیدا تۆمار دەکات و داواش دەکات رێگەی بدرێتێ بێتە عیراق.

رۆژی حەڤدەی تەمووزی ۱۹۲۹ سێر گیلبەرت کلایتۆن بە نامەیەکی **«نهێنی دەستی»** وەڵامی نامەکەی ساتۆ دەداتەوە. کلایتۆن لەم نامەیەدا بە تەواوی پەردە لەسەر رووی راستەقینەی سیاسەتی ئینگلیز بەرانبەر **«خۆیبوون»**و مەسەلەی کوردی تورکیا هەڵدەداتەوەو تێناگەم بۆ رقی تایبەتی خۆی بەرانبەر سورەیا بەدرخان رادەمالێ و بە و جۆرە هەموو ئەو قسەو قسەڵۆکانەی لەم بوارەدا بۆ **«خۆیبوون»**و کورد هەڵبەستراون بە درۆیان دەخاتەوە..ئەمەش دەقی ئەو بەڵگەنامە بایەخدارەیە:

**«بە دستی ونهێنی،**
**ژمارە:س.و۱٤۲۷،**
**بارەگای نوێنەری باڵا ،بەغدا، رۆژی ۱۷ی تەموزی۱۹۲۹**
**خۆشەویستم ساتۆ**

**نیشانە بە بروسکەی ژمارە(۷۵ /س)ی رۆژی حەڤدەی تەموزی ساڵی ۱۹۲۹م لەگەڵ ئەم نامەیەدا وێنەی ئەونامەت بۆ دەنێرم کە باسی چالاکی یەکانی ئەم دوایی یانەی سورەیا (ثریا)بەدرخان دەکەن و ئاشکرا نیشانی دەدەن چۆن هاتنی ئەو پیاوە بۆ عیراق کارێکی یەکجار نابەجێیە. بەڵێڵی دێتەوە یادم کە من ئەو پیاوەم لەکاتی جەنگدا دیوە، ئەویش یەکێک بوو لەوەمەلەشوومە[۲٦] بێ شومارانەی لەو رۆژانەدا دەزگای ئیستخبارات پێوەندی پێوەدەکردن، بەڵام لە باروودۆخی ئێستەدا لەبەر ئامانج و پیلانە ئاشکراکانی نامەوێ هیچی تر دەربارەی کارە تایبەتیەکانی وەربگرم کە تا رادەیەک پیاو بێزار دەکەن.**

---

(۲٦) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا (Stormy Petrel) کە مەلێکی دەریایی باڵ درێژی دورەفڕە، زۆر نە وشکانی دوور نەکەوێتەوە، بە عەرەبی **(طائر نوء)**ی ناوە، ناوی ئەم مەلە بۆتە زاراوە لە زمانی ئینگلیزیدا، بە واتای ئاژاوەچی بەکار دەهێنرێ، دوای سوورەیا بەدرخان ئینگلیزەکان هەمان ناوی ناتۆرەیان لە شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەدی بارزانیش ناوە، بڕوانە: **«رۆشنبیری نوێ»***، ژمارە ۱۳٦، ساڵی ۱۹۹۵، ل ۱۷، ۲۲.

(*) «ئاماژەیە بۆ بابەتی سێیەمی بەشی یەکەمی ئەم کتێبە - عەبدوڵلا زەنگەنە».



**هەڵمەتپەرکنیەکی کوردەکانی دیاربەکر لە پێش قەڵای شار**

**نازانم تاچ رادەیەک ئەوەی ئەو دەیانڵێ دەربارەی ئەو قۆناغەی خۆ ئامادە کردنی کوردی گەیشتوتێ دەگەڵ راستیدا دەگونجێن، پێم وایە زێدەڕۆییان تێدا وەدی دەکرێ، تورکەکان پتر لەوەی ئەو دەیەوێ قەناعەتمان پێبکات بەسەر باروذۆخەکەدا زاڵن. هیوادارم وابێ، چونکە هەرچۆن بێ هەر راپەرینێک بەو شێوازەی ئەو بۆی دەچێ تەنها دەبێتە مایەی کارەسات و کۆیەند لەگشت لایەک، بۆیەکا زۆر پێویستە بە دڵسۆزی بەری لێ بگیرێ. دڵسۆزتان کلایتۆن»**(٢٧).

وادیارە یەکێک لەو هۆیانەی وایان لە کلایتۆن کردووە بەم جۆرە پوختەی بیروڕای خۆی بخاتە بەردەمی ساتۆ ئەوەیە کە رابەرانی **«کۆمەڵەی خۆیبوون»** شاری بێروتیان کردبووە یەکێک لە بنکە سەرەکییەکانی کاروباریان، ئەوان گرنگترین

---

(27) PRO, Air 23/415, XM 04583, Kurdish Nationalist Movment, Part II, 18.4.1929-13.12.1929, Personal and Confidential, No. S.O.1427, The Residency, Baghdad, Dated 17th July, 1929.

کۆنگرەی **«خۆیبوون»** یان لە هاوینە هەواری بحەمدونی لوبنانی ساز کرد . وێڕای ئەوە ساتۆ دیارە سورەیا بەدرخانی بەدڵ بووە، دوور نییە حەزی کردبێ ڤیزەی هاتنی عیراقی بداتێ، لەبەر ئەوە کلایتۆن وا بەتوندی دژی کارێکی وا وەستاوە. هەر چۆن بێ ناوەرۆکی ئەم بەڵگەنامـەیە، وەک صـەدان بەڵگەنامـەی دی، ئەو بۆچوونە نارەوایە پووچەڵ دەکـەنەوە کـە گـوایە دامـەزراندنی **«خۆیبوون»** و ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٣٠ی کوردستانی تورکیا بە فیتی ئینگلیزو دژ بە شوورەوی بوون. کار گەیشت بەوەی لە ڕۆژانی ڕاپەڕینەکـەدا فـەرمـانڕەوایی تورکـیـا بەهەمـوو جـۆر هەوڵـیـان دا بەگشت جیهـانی بسـەلمێنن گوایە لۆرانسی بەناوبانگ بە تایبەتی بۆ ئەو مەبەستە هاتۆتە کوردستان[٢٨].

## دواوشە:

بەڵگەنامەکانی ناو ئەم وتارە بەشێکی زۆر کەمن لە لێشاوی ئەو بەڵگەنامانەی ئینگلیز کە بۆ باسی **«کۆمەڵەی خۆیبوون»** و چالاکییەکانی و پرۆگرام و پێڕەوی و ژینامـەی ڕابەرانی تەرخـان کـراون و هەر هەمـووشـیـان **بۆچوونەکـانی ئەم وتارە دەسەلمێنن و ئەوەمان بۆ ساغ دەکەنەوە لاپەڕەکانی مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورد چەند شێوێنراون و چەند پێویستـیـان بەلێکۆڵینەوەی قووڵە**. گـەر بڵـێم تەنانەت ڕابەرێکی گـەورەی کـوردی وەک دوکـتـۆر عـەبدولڕەحـمـان قـاسـملۆی زاناش نە هەڵسەنگاندنیدا بۆ **«خۆیبوون»** دروست بۆباسەکە نەچووە[٢٩] **ئەوساکە باشتر تێ دەگەین ئەرکی سەر شانی مێژوونووسانی کورد چەند سەخت و چەند گرانە . خۆزگە ئەو کوردانەیش کە لە خۆیان و ئیمڕۆیان بەولاوە شتێکی دی نابینن لەوە دەگەیشتن کە تۆماری مێژوو زۆر گەورەیە، جێگەی هەمـوو چاکە و خراپەیەکی تێدا دەبێتەوە. نە خزمەت و دڵسۆزی، نە خیانەتکاری و خۆفرۆشی کەس فەرامۆش ناکات.**

---

(٢٨) ئەم باسەی لۆرانس، کە خۆی لە خۆیدا زۆر سەیرو سەمەرەیە، پێویستیی بە وتارێکی سەربەخۆیە

(٢٩) بڕوانە: **الدكتور عبدالرحمن قاسملو، كردستان والاكراد، دراسة سياسية واقتصادية، ترجمة ثابت منصور، بيروت (٢)، ١٩٦٨، ص٤٧-٥١.**

بابەتی سێیەم*

# خێر و بێری راپۆرنووسێکی کورد

-١-

لە مێژووی هەموو گەلێکدا خۆفرۆش و سیخوڕو راپۆرنووس هەڵدەکەوێ، جاری وا هەبووە ئەو جۆرە کەسانە گەیشتوونەتە بەرزترین پایەو مەقام، لە بن دەست پاشاو فەرمانڕەوایاندا گاڵەیان کردووە. **تاقیکردنەوەکانی مێژوو وای نیشاندەدەن ئەو دیاردەیە لە ناو گەلی هوشیاری بێ مافی وەک ئەرمەندا زۆر دەگمەنە. خوامبکات لەناو کوردیشدا وابێ.**

لە بەڵگەنامە ئینگلیزییەکاندا ئەوە ئاشکرایە کە ژمارەیەک کورد لە ژێرەوە کاریان بۆ ئەوان کردووە. یەکێکیان لە سلێمانی خوێندەوارێکی چاک و وریاو چالاک، لە نیشتمانپەروەرانی کوردەوە نزیک بووە، گەیشتۆتە لای خودی شێخ مەحمود، بەشداریی لە رێکخراوە کوردستانییەکاندا کردووەو بەدەستخەتێکی زۆر جوان و کوردییەکی تەواو رەوان راپۆرتی چروپری لەسەر نووسیون. لە فایلی ژمارە ٤١٤/٢٣، بەشی چوارەم، ئێکس - ئێم ٤٥٨٣ی وەزارەتی فڕۆکەوانی بەریتانیا کە بۆ باسی بەشێک لە **«بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد»** لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٨و سەرەتای ساڵی ١٩٢٩دا تەرخانکراوە ژمارەیەک بەڵگەنامەی بێ ئەندازە بایەخدار هەڵگیراون کە پەیوەندییان بەو راپۆرنووسەمانەوە هەیە، بەشێکیان نامەو یاداشتی تایبەتییە کە بە دەستوخەتی خۆی بۆ ئینگلیزەکانی نووسیون، بەشێکیشیان بریتین لە نامەی تایبەتیی رێکخراوە کوردییەکانی ئەو رۆژگارە کە لە رێگەی ئەوەوە بەنهێنی ناردوویانن بۆ شێخ مەحمود و مەحمود خانی کانی سانان، ئەویش وەک

(*) یەک لە دوای یەک لە ژمارە (٨٨، ٩٠، ٩١، ٩٢)ی گۆڤاری «**رەنگین**»ی ساڵی ١٩٩٦دا بڵاوکراوەتەوە.

هێلکەی پاک کراو خستوونییەتە بەردەمی دەزگا ئەمنییەکانی ئینگلیز تا بەر لەگەیاندنیان بەشوێنی مەبەست وێنەیان لەسەر بگرنەوە. ئەو بەڵگەنامانە پڕن لە زانیاریی یەکجار گرنگ و بایەخدار دەربارەی مێژووی بزووتنەوەی کوردایەتی لە کوردستانی عیراق کە تا ئیمڕۆ نەکەسمان دەیانزانین، نەهیچ سەرچاوەیەکی خۆبیانی باسیکردوون. بەشێک لەو زانیارییانە پەیوەندییان بە چالاکییەکانی «خۆیبوون»ەوە[1] لەناو کوردی عیراقدا هەیە. **بایەخی مێژوویی و سیاسیی ئەو زانیارییانە لە نرخاندن نایەت، بەر لەهەر شتێکی تر دانەبڕانی کورد لە یەکتر نیشان دەدەن.** کەسمان ئەوەمان نەدەزانی کە **«خۆیبوون»** چالاکییەکی فراوانی لە ناو کوردی عیراقدا نواندووە، لە نزیکەوە پەیوەندیی بە رابەرانیانەوە کردووە، لقی تایبەتیی لەشارەکانیان دامەزراندووە. ئینگلیزەکان زۆر بە پەرۆشەوە، بە هەر چوار لادا کەوتوونە سۆراخ و کۆکردنەوەی زانیاریی دەربارەی ئەو چالاکییانەی **«خۆیبوون»**کە دامەزراندنی لەو دەوروبەرەدا وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لە مێژووی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردا، ئەنقەرەی هەژاند و رێگەی بۆ راپەڕینی گەورەی ئارارات خۆشکرد. ئیمڕۆ بەهۆی ئەو راپۆرنووسەمانەوە، هەزار جار کاری راست بێ. بەوە دەزانین کە **«خۆیبوون»** لقێکی گەورەی لە سلێمانی هەبووە، ژمارەیەک رووناکبیری کورد پەروەری ناسراو ئەندامی بوون. یەکێک لە بەڵگەنامەکانی ناو ئەو فایلەی لە سەرەوە باسیمان کرد بۆ ئەم باسە تەرخانکراوە. ئەو بەڵگەنامەیە بریتییە لەیاداشتی ئەفسەری ئیستخباراتی بەریتانی لە سلێمانی کە رۆژی بیست و هەشتی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٨ بە نهێنی ناردوویە بۆ بارەگای هێزی ئاسمانی بەریتانی لە بەغدا. لە ناوەڕاستی یاداشتەکەدا بەپیتی لاتینی نووسراوە **«جمعیەتی خۆیبوون»**. ئەمەش دەقی سەرەتای خودی یاداشتەکەیە کە بە روونی بایەخپێدانی ئینگلیز بە هەڵسوکەوتی **«خۆیبوون»**و ئاگاداریی تەواوی کابرای لەمەڕ خۆمان لە نهێنییەکانی ئەو رێکخراوە نیشاندەدەن:

**«نەمتوانی زانیاریی زۆر دەربارەی ئەو کۆمەڵە پەیدابکەم، لەم دواییانەدا لەرێگەی یەکێک لە ئەندامەکانییەوە کە پیاوی خۆمەو لێرە نەبوو، بۆ کاروباری**

---

(١) لە **(خۆیی بوون)**ەوە هاتووە، پێم وایە بەدرخانییەکان بۆ واتای سەربەخۆیی دایانرشتووە.



لە راستەوە بۆ چەپ هادی سائیب، ئەنوەر سائیب، جەمیل سائیب، جەلال سائیب، عارف سائیب
منالەکان فەوزی سائیب، ؟، محەممەد عەلی سائیب

ئەرشیفی جەمال بابان

قانوونیی (خۆی) چووبووە هەڵەبجە و چەند رۆژێک لەمەوبەر بەپەلە بانگم کردەوە بۆ سلێمانی، ئێستا دەبێ بچێتە پیران[٢]، زانیاریم دەسکەوت. بەر لەوەی بڕوا بۆ پیران لیستێکی تەواوی ئەو ناوانەی دامێ کە تا ئێستا ئەندامی «خۆیبوون»ن، جگە لەو ناوانەی شوێنی تر کە دەیانزانێ».

ئەندامانی «خۆیبوون» لە سلێمانی هەژدە کەس بوون، لەناو لیستەکەدا ناوی حەڤدەیان تۆمار کراوە، راپۆرنووسەکەشمان هەژدەمین ئەندام بووە. یەکەم ناوی ناو لیستەکە مستەفا زەکی سائیب ئەفەندییە کە لە تەنیشتییەوە بە دەسخەت نووسراوە کوڕی مەلا ئەحمەدە. مستەفا زەکی سائیب سەرۆکی لقی «خۆیبوون» بووە لە سلێمانی، برای جەمیل و جەلال و ئەنوەر سائیبە، یەکەمیان خاوەنی چیرۆکی

(٢) دەچێتە خزمەت شێخ مەحمود کە ئەو ساکە پەنای بردبووە بەر گوندی پیرانی ئەودیو سنوور.

**«لەخەوما»**یە، دووەمیان باوکی هونەرمەندی گەورە شەماڵ سائیبە، سێیەمین دیپلۆماسییەکی ناسراو بووە.

**دووەم** ناو شێخ سەلامی شاعیرە کە بە پێی لیستەکە سکرتێری لق بووە، لای ناوەکەیەوە نووسراوە ئێستا بێ کارەیە.

**سێیەم** ناو غەنی شاڵییە کە ئەمین سندووقی لق بووە، لای ناوەکەیەوە نووسراوە بازرگانە. غەنی شاڵی باوکی کاک فایقی هاوڕێ و هاوپۆلم و دکتۆر خەسرەوی سەرۆکی جارانی زانکۆی سەلاحەدینە.

دوا بەدوای ئەو سێ ناوە، کە دەستەی بەڕێوەبەری لقی **«خۆیبوون»** بوون لە سلێمانی، لیستەکە دێتە سەر ناوی ئەندامانی ئەو لقە کە چواردە ڕووناکبیری ناسراوی شاربوون، وا لەخوارەوە بەڕێز وەک خۆیان چۆن لەناو لیستەکەدا هاتوون تۆماریان دەکەین، ئەو زانیارییانەش کە لە ناو دوو کەوانی گەورەدا لە لایانەوە نووسراون لێدوانی خۆمن بۆ زیاتر پێناسینی ناوەکان:

١- **عوسمان فایق ئەفەندی،** فەرمانبەرە لە تاپۆ (برای ماجید مستەفا و خاڵی لیوای خانەنشین فوئاد عارفە، ساڵی ١٩٧٦ کۆچی دوایی کردووە).

٢- **عەلی عیرفان ئەفەندی،** نووسەری ئەو ڕۆژنامەیەیە کە لە سلێمانی دەردەچێ (مەبەستی ڕۆژنامەی **«ژیان»**ە کە جێگەی **«ژیانەوە»**ی گرتەوە، لە ڕۆژی بیست و یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٦ وە تادەی مارتی ساڵی ١٩٣٨ لە سلێمانی دەردەچوو).

٣- **فوئاد مستی،** کاتبە لە لەشکری عیراقدا (برای مامۆستا تۆفیق وەهبی و باوکی ئەفسەری بەناوبانگ نەوشیروانە).

٤- **کەریمی سەعید بەگ،** جێگری سەرۆکی کۆمەڵی زانستییە (مەبەستی خوالێخۆشبوو کەریم زانستییە کە ڕۆژی چواردەی کانوونی دووەمی ١٩٩٦ کۆچی دوایی کرد، وادیارە لە ڕێکخراوە نهێنییەکانی ئەو ڕۆژگارەدا چالاک بووە[٣]).

---

(٣) لەو بارەیەوە بڕوانە ئەو وتارەی بە بۆنەی کۆچی دوایی مامۆستا کەریم زانستییەوە لە پاشکۆی ڕۆژنامەی **«عیراق»**دا ڕۆژی بیست و یەکی کانوونی دووەمی ساڵی دووەمی ١٩٩٦ بڵاوم کردۆتەوە.

**٥- سەید ئیبراهیم،** برای شێخ مەحموده(لە باوکەوە بران، لە دایکەوە لە میرانییەکانی شەقلاوەیە).

**٦- شێخ عەزیز ئەفەندی،** فەرمانبەرە لە تاپۆ (مەبەستی شێخ عەزیزی شێخ رەشیدی شێخ ئەحمەد فایزە کە لە باوکەوە لە شێخانی گڵەزەردەیەو لە دایکەوە خوشکەزای کاک ئەحمەدی شێخە، چەند جارێک بۆتە بەرێوەبەری تاپۆ لە سلێمانی و کەرکووک و هەولێر و رومادی بۆیە لەناو خەڵکدا بەشێخ عەزیزی تاپۆ ناوی دەرکردبوو، ساڵی ١٩٨٣ لە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵیدا کۆچی دوایی کرد).

**٧- واحید ئەفەندی،** مامۆستای قوتابخانەیە (مەبەستی عەبدولواحید نورییە کە ئەوساکە یەکێک بووە لە رووناکبیرە پێشکەوتخوازە ناسراوەکانی کورد، لە تەمووزی ساڵی ١٩٤٤ دا کۆچی دوایی کرد).

**٨- عەلی ئاغای حاجی سالح،** فەرمانبەرە لە دایەرەی واریدات (دوورنییە مەبەستی عەلی کاتبی باوکی جەزای خوالێخۆشبوو بێ).

**٩- عەزمی بەگی بابان** (هیچی لەلاوە نەنووسراوە، لە ئەشرافی شار، نوێخوازو دونیادیدە بووە، ساڵی ١٩٤٩ کۆچی دوایی کرد).

**١٠- شەوکەتی عەزمی بەگی بابان** (هیچی لە لاوە نەنووسراوە، کورە گەورەی عەزمی بەگی بابان بوو، چەند جارێک بۆتە مودیری ناحییەی عەربەت و بنگردو ماوەت و شوێنی تر، ساڵی ١٩٥١ کۆچی دوایی کرد).

**١١- جەلالی فەتاح ئەفەندی،** فەرمانبەرە لە شارەوانی (خاڵی ئەمینی میرزا کەریمی چیرۆکنووسە).

**١٢- ئەحمەد ئەفەندی عەزیز ئاغا**، فەرمانبەرە لە شارەوانی (باوکی نەژادە، پیاوێکی قۆشمە، لەناو خەڵکدا خۆشەویست بوو).

**١٣- شێخ مارف،** باجگرە لە بازیان (بۆم ساغ نەبۆوە کێیە، میرزا مارفی شاعیر لەو رۆژانەدا ناسراو بوو).

**١٤- کەریم رۆستەم** کە بە کەریم شالوم ناسراوە، ئەفسەر بوو لە لەشکری عوسمانیدا، زۆر نییە لە بەغداوە گەڕاوەتەوە سلێمانی (دەڵێن نازناوی شالومی

لەناوی جەنگێکەوە بۆ ماوەتەوە کە گوایە لەساڵانی جەنگی یەکەمدا قەوماوەو بەشداریی کردووە، رووناکبیرێکی دونیایی بووە، کارگێری ژمارە یەکی ئەو سێ ژمارەیەی **«بانگی کوردستان»** بوو کە مستەفا پاشا یامولکی لە بەغدا ساڵی ۱۹۲۶ دەریکردن).

ئەوانەی دەرەوەی سلێمانی کە بەپێی لیستەی راپۆرنووسەکەمان لە **«خۆیبوون»**دا ئەندام بوون و ئەو ناسیوتنی سیازدە کەسن، بەشێکیان دامەزرێنەرانی **«خۆیبوون»** خۆین. ناوەکانی ئەوانیش بە ریز وەک لە لیستەکەدا هاتوون لەگەڵ تێبینییەکانیدا وەک خۆیان دەیان نووسین، دیسان ئەو زانیارییانەی لەناو دوو کەوانی گەورەدا لە لایانەوە نووسراون لێدوانی خۆمن:

۱- **مەمدوح سەلیم بەگ،** رەنگبێ لە سوریا بێ (سەرەتای ساڵی ۱۹۷۲ لە دیمەشق دیم، کوردپەروەرێکی کەم هاوتاو خوێندەوارێکی چاک بوو، کۆتایی حەفتاکان لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد، مامۆستا مەسعود محەمەد بەو بۆنەیەوە شیوەنێکی بە سۆزی بڵاو کردەوە).

۲- **مستەفا شاهین بەگی بەرازی** (هیچی لەلاوە نەنووسراوە، بەشێک لە کوردی سوریا بەرازین، گەورە پیاوی زۆریان تێدا هەڵکەوتووە، بەپێی مامۆستا رۆژبەیانی بەرازییەکان لە بەلەدرووزەوە چوونەتە وڵاتی شام).

۳- **جەلادەت عالی بەگی بەدرخان،** ئێستا لە تارانە (مەبەست جەلادەت ئەمین عالی بەدرخانە، لەگشت رابەرانی **«خۆیبوون»** چالاکتر بوو، لە هەموویشیان زیاتر ناوی لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئینگلیزدا هاتووە، رۆژی پازدەی تەممووزی ساڵی ۱۹۵۱ لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد).

٤- **خەلیل رامی بەدرخان** (هیچی لە لاوە نەنووسراوە، لە هەمان بنەماڵەیە، برای ئەمین عالی و مامی جەلادەت بەدرخانە).

٥- **سورەیا بەدرخان** (لای ناوەکەیەوە بە دەستخەت نووسراوە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە، برا گەورەی جەلادەت بەدرخانە، بلەچ شێرکۆ نازناوی بوو[٤]، کتێبی **«القضية الكردية»** کە لە بڵاوکراوە هەرە بەبایەخەکانی

---

(٤) لە **«مێژوو»**دا کەوتومە هەڵەوە کە وتوومە بلەچ شێرکۆ نازناوی جەلادەت بەدرخانە (بڕوانە

**«خۆیبوون»**ەو ساڵی ١٩٣٠ بە عەرەبی و فەرەنسی لەقاهیرە بە سەرپەرشتی محەمەد عەلی عەونی چاپکراوە لە نووسینی ئەوە، ساڵی ١٩٣٨ لە پاریس کۆچی دوایی کرد).

٦- **دوکتۆر شوکری محەمەد**، جاران لە بەغدا بوو، وایێ دەچێ ئێستا لە سوریا بێ (مەبەستی دوکتۆر شوکری سەگبانە، پزیشک و خوێندەوارێکی چاک بوو، لە ناوەندی سییەکاندا هیلاک بوو، دەستی لە کوردایەتی هەڵگرت، گەڕایەوە تورکیاو لەوێ پاشگەزبوونەوەی خۆی بەنووسین راگەیاند، مامۆستا رەفیق حیلمی بە توندی وەڵامی دایەوە).

٧- **مستەفا شەوقی**، سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی **«خۆیبوون»**ە لە بەغدا (رووناکبیرێکی چاک، رۆژنامەنووس بوو، مستەفا پاشا یامولکی بە هۆی ئەوەوە ساڵی ١٩٢٦ لە بەغدا سێ ژمارەی لە **«بانگی کوردستان»** بڵاوکردەوە، بۆ خۆشی بەتەنها ساڵی ١٩٢٧ دیسان لە بەغدا گۆڤاری **«پەیژە»**ی بڵاوکردەوە، لە ژێر ناوی گۆڤارەکەدا نووسراوە: بە کوردی بۆ کوردایەتی ئەدوێ).

٨- **عەلی عەونی**، قاهیرە (مەبەستی محەمەد عەلی عەونییە کە وەرگێڕ بوو لە دیوانی پاشای میسر، بەڵگەنامەیەکی ئینگلیزەکانم لایە دەڵێ: محەمەد عەلی عەونی بۆ خۆی لە بنەماڵەی پاشای میسرە، خوێندەوارێکی زانابوو، سییەکان مێژووی کوردو کوردستانەکەی مامۆستا ئەمین زەکی بەگی کردە عەرەبی و ساڵی ١٩٣٩ لە قاهیرە بڵاویکردەوە. هەر لەوێش سەرەتا بە فارسی و دوایی بە عەرەبی **«شەرەفنامە»** کەی شەرەفخانی بەدلیسیی بڵاوکردەوە، دەستی لە نووسین و بڵاوکراوەکانی **«خۆیبوون»**دا زۆر بوو).

٩- **مامەند رەمزی ئەفەندی***، مامۆستای قوتابخانەیە لە هەولێر (لەوانەیە محەمەد

---

**«مێژوو»**، بەغدا، ١٩٨٣، ل١٨١، ١٨٩)، نیازمە لەو بارەیەوە روونکردنەوەیەک بڵاو بکەمەوە.

(*) لە ژمارەی (١٧، ١٨)ی ئەیلوول و تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٤ی گۆڤاری **«بەیان»**دا مامۆستا کەریم شارەزا لە ژێر ناونیشانی **(مامەند کەرکووکی کێیە؟)** بە دوو ئەڵقەی یەک لە دوای یەکتر لێکۆڵینەوەیەکی وردو شیاوی بڵاوکردۆتەوە، لە پەراوێزی ئەڵقەی دووەمی بابەتەکەدا هەر گۆڤاری **«بەیان»** لەسەر زاری مامۆستا نەریمان، تێبینییەکی نووسیوەو گومانی خستۆتە سەر بۆچوونەکانی مامۆستا کەریم، بۆیە ئەویش جارێکی دیکە لە ژێر ناونیشانی **«مامەند کەرکووکی، رەمزی رەحیمی جاو فرۆشە!»** زۆر بە وردی و بەسەلیقەوە بەدوای هەمان بابەتدا چۆتەوە، لەم سێ وتارەدا

ڕەمزی ئەفەندی بێ، بۆمان ساغ نەبۆوە کێیە).

**١٠- صدیق ئەفەندی،** حلە (دوور نییە مەبەستی سەدیق قادری بێ کە سەرپەرشتکاری گشتیی پۆلیس بوو لە حوکمەتەکەی شێخ مەحمودا، بۆ خۆی لە یاداشتەکانیدا دەڵێ من بەر لەهەر شت کوردو ئینجا موسڵمانم، سەر بە گوندێ مورتکەو هۆزی هەمەوەندم).

**١١- عەبدولخالق ئەفەندی،** کەرکوک (ئەوسا لە کەرکووک دوو عەبدولخالق ناوی کورد ناسراو بوون، عەبدولخالق قطب و دووەمیان عەبدولخالق ئەسیریی شاعیر. ڕۆژی دوازدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٦ چومە خزمەت عەبدولخالق قطب لە بەغدا، بەڕێزی لە بیری نییە لە **«خۆیبوون»**دا بەشداریی کردبێ، ولێ مەبەست عەبدولخالق ئەسیرییە کە بە کورد پەروەرێکی بە پەرۆش ناسراوە).

**١٢- سلێمان بەگ،** ڕەواندوز (مەبەستی سلێمان بەگی نەوەی میری ڕەواندوزە، بە سیلاح شۆڕ ناسرابوو، عەلی حەیدەری کوڕی چەند جارێک بووە نوێنەری ڕەواندوز لە پەرلەماندا، چەند جارێکیش بووە وەزیر و باڵیۆز، کە بۆ شایەتی هێنایانە بەردەم دادگەی گەل، مەهداوی لەسەر ئەوە تەریقی کردەوە کە گوتی: بە ڕەگەز کورد و بەهەست عەرەبم).

**١٣- عوسمان بەگ،** ڕەواندوز (بۆم ساغ نەبۆوە کێیە[٥]، پێم وایە حوسێن حوزنی موکریانیش کە ئەو ڕۆژگارە لە ڕەواندوز بە دەرکردنی **«زاری کرمانجی»**یەوە خەریکبوو لە نزیکەوە پەیوەندیی بە ڕابەرانی **«خۆیبوون»**ەوە هەبوو).

---

دەردەکەوێت کە ئەو **«مامەند ڕەمزی ئەفەندی»**یە کە دکتۆر کەمال بۆی ساغ نەکراوەتەوە کێیە هەرهەمان ئەو ڕەمزی ڕەحیم جاو فرۆشەیە، کە خەڵکی کەرکووک بووە، لەوێ دراوسێی **«ئەسیری»** شاعیر بووە. دەستێکی باڵای لە شیعردانان هەبووە، هاوکوفی شێخ نوری شێخ سالحی نوێخوازبووە، نازناوی شیعری **«مامەند کەرکووکی»** بووە. سەرەتا لە کۆیە دواتر لە هەولێر مامۆستایەتی کردووە، نیشتمانپەروەرێکی خوێنگەرمی سەردەمی خۆی بووە لەم بارەیەوە هیچی لە ئەسیری شاعیر کەمتر نەبووە، ئەو سەردەمەی کە ڕاپۆرتەکە باسی لێوە دەکا لە هەولێر مامۆستا بووە. دواتر وەک مامۆستا نەریمان گێڕاویەتیەوە لە **«هیوا»** چالاکی نواندووە.

زۆر لایەنی دیکەی ژیانی لەم سێ ژمارەیەی سەرەوەی **«بەیان»**دا نووسراوەتەوە.

**«عەبدوڵلا زەنگنە»**

(٥) هیوادارم خوێنەرانی ئازیز هەر هەڵەیەکی تێی کەوتبم بۆمی ڕاست بکەنەوە، ئەگەر زانیاری تریشیان لایە بڵاوی بکەنەوە، یا دەربارەی ئاگادارم بکەن.

له کۆتایی یاداشتەکەیدا ئەفسەری ئیستخباراتی بەریتانی لە زمان راپۆرنووسەکەمانەوە سێ راستیی بایەخداری تری بۆ تۆمار کردووین. ئینگلیزەکان بەوەیان زانیوە خۆیبوونییەکانی سلێمانی جاروبار لەناو خۆیاندا رستەی **«سنجوق ئەسێنێن»** بەکار دەهێنن، دوایی لە ڕێگەی ئەوەوە بۆیان ساغ بۆتەوە کە ئەو رستەیە کەلیمەی سرییانە بۆ خۆپێناسین، کە لە شوێنێکەوە دەچن بۆ شوێنیکی تر لە ناو خۆیاندا بۆ یەکتر ناسینەوە بەکاری دەهێنن، وەک ئەوەی بڵێین بۆ باسوق سنجوق کڕین هاتووین. بەهەمان دەستوور ئینگلیزەکان بەوەیشیان زانیوە کە لقی خۆیبوونی سلێمانی بۆ شوێنەونی ناوی **«شوعبەی فیدایی ژمارە یەک»**ی بۆ خۆی کردۆتە رەمز، لقی خۆیبوونیش لە هەولێر بۆ هەمان مەبەست **«شوعبەی ئەوەڵ»**ی هەڵبژاردووە، سکرتێری ئەمیان مامەند رەمزی بووە کە ئەمجارەیان یاداشتەکە دەڵێ مامۆستای قوتابخانەیە لە شەقلاوەی نزیک هەولێرەوە. هیوادارم خواو کورد لەو راپۆرنووسەمان خۆش بن چونکە بە راستی خێرو بێری بۆ مێژووی کورد زۆرە، ئەو راستییەی لە بەشی داهاتووی ئەم وتارەماندا جارێکی تر بە روونی هەستی پێدەکەین.

**-٢-**

لە بەشی یەکەمی ئەم گەشتەماندا باسی ئەو زانیارییە بەنرخانەمان کرد کە رووناکبیرێکی کوردی زیرەک و زۆر وریای سەر بە ئینگلیز لە راپۆرتە نهێنییەکانی خۆیدا دەربارەی چالاکییەکانی **«کۆمەڵەی خۆیبوون»** لەناو کوردی عیراقدا دەوروبەری کۆتایی بیستەکان پێشکەشی کردوون بە دەزگا تایبەتییەکانی بەریتانیا لە شاری سلێمانی. ئەو راپۆرنووسەمان، کە ئەندامی **«خۆیبوون»** و **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** بووە، لە نزیکەوە پێوەندیی بە ژمارەیەک رابەری کوردەوە کردووە، تایبەت بە شێخ مەحمودەوەو گەلێک زانیاریی بە کەڵکی دەربارەی بزوتنەوەکانی بە ئینگلیز راگەیاندووە کە هەموویان ئیمڕۆکە بوونەتە سەرچاوەی رەسەنی کەم هاوتا بۆ توێژینەوەی ئەو بزووتنەوانە.

لە هەمان فایلی ژمارە ٢٣/ ٤١٤، بەشی چوارەم، ئێکس - ئێم ٤٥٨٣ی وەزارەتی فرۆکەوانی بەریتانیادا کە بۆ باسی بەشێک لە **«بزووتنەوەی نەتەوەیی**

**کورد»** لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٨و سەرەتای ساڵی ١٩٢٩دا تەرخان کراوە دوو نامەی دەسخەتی زۆر گرنگی تێدایە کە **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** یەکێکیانی ناردووە بۆ شێخ مەحمود لە پیران و ئەوی تریانی ناردووە بۆ مەحمود خانی کانی سانان لە مەریوان. راپۆرتنووسەکەمان، کاری راست و خوای لێ رازی بێ، بەرلەوەی نامەکە بگەیێنێتە شوێنی مەبەست هەردووکیانی گەیاندۆتە کاربەدەستانی ئینگلیز تا وێنەیان بۆ خۆیان لێ بگرنەوەو ئینجا بۆ خۆی لۆش لۆش بێپەرواو بێ ترس رۆژی ٣٠ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٨ بەرەو پیران و مەریوان کەوتۆتە رێ. نامەکەی شێخ مەحمود بەدەسخەتی جەلال سائیب نووسراوە کە برای مستەفا سائیبی سەرۆکی «خۆیبوون» بوو لە سلێمانی(**جەلال سائیب باوکی هونەرمەندی ناسراو شەماڵ سائیبـە**). بە دووری نابینم راپۆرتنووسەکەمان بۆ خۆی هەموو نامە نێردراوە گۆڕکراوەکانی بۆ ئینگلیز نووسیبێتەوە، چونکە دەسخەتی هەموویان و ئەو راپۆرتە تایبەتییەی دەربارەی بارودۆخی سلێمانی پێشکەشی کردوون و لەهەمان فایلدا هەڵگیراوەو لە دوا بەشی ئەم زنجیرە وتارەدا باسی دەکەین، هەموویان وەک یەکن. دوور نییە لەناو پیرانی کوردا هەبن ئەو دەسخەتە و خاوەنی بناسنەوە، هەرچەندە بە مەزەندەی خۆم کابرا یەکێکە لە دوو سێ ناسراوی شار.

بەپێی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** بەر لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٨ دامەزرێنراوە، هەرچەندە، وەک لە بەشی داهاتووی ئەم وتارەدا باسی دەکەین، بەپێی یەکێک لە بەڵگەنامەکانی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** خۆی کە لەناو هەمان فایلدایە ئەو کۆمەڵە ساڵی ١٩٢٦ دامەزرێنراوە، ئەوەی جێگەی گومانە هەرچۆن بێ وا دیارە لەسەر هەڵوێست بەرانبەر بە ئاشوورییەکان و رێککەوتن لەگەڵ حوکمەتدا لەناو رابەرانی کۆمەڵەو رێکخراوە کوردییەکانی ئەو رۆژگارەدا ناکۆکییەکی زۆر بەرپابووە، دەستەیەک لە ئەندامانی ئەو رێکخراوانە بە رابەری ئیسماعیل حەقی شاوەیس کۆمەڵەیەکی نوێیان بە ناوی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** پەوە دامەزراندووە. بەو زانیارییانەدا کە تاوەکو ئێستا دەستم کەوتوون وا پێ دەچێ ئەم کۆمەڵەیەمان کەمێک توندڕەو بووبێ، بەڵام هەمان کات سەرڕاستی و لە خۆ بووردن و پێ داگرتنەکانی خوالێخۆشبوو ئیسماعیل حەقی شاوەیس لە رەفتارەکانیـ

ڕەنگیان داوەتەوە. شایانی باسە ناوی ئیسماعیل حەقی شاوەیس زووزوو لەناو
ـەنگەنامەکانی ئینگلیزدا دووپات دەبێتەوە.

نامەکەی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** بۆ شێخ مەحمود لاپەڕەیەکی قەوارە گەورەیە،
ـوەرۆکی ٢٩ دێڕی پڕکردۆتەوە. لەسەرووی نامەکەوە نووسراوە: **«ژمارە ٢٤٦٩،
ڕۆژ ١ ربيع الاخر ١٣٤٧»** کە دەکاتە حەڤدەی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٨. بەڵام لە
ـژێرەوەی نامەکەدا نووسراوە **«سلێمانی ٢٨ ربيع الاول ١٣٤٧»** کە دەکاتە شازدەی
هەمان مانگ و هەمان ساڵ، واتە شازدەی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٨. ئەمەش دەقی
ـمەکەیە بە ڕێنووسی باوی ئێستامان:

**«بۆ حەزرەتی عالی جەناب شێخ مەحمود دامە ئیقبال و هو. بەحەسەبی ئەوەی کە جەنابتان سەرکردەو زاتێکی گەورەی کوردن، بەناوی کوردایەتییەوە بەعزێ قەزییە هەیە عەرزتانی ئەکەین کە زۆر ئارەزوو ڕەجا ئەکەین بە ئەهەمییەت تەماشای بفەرموون چونکە ئەم مەعروزانە هی شەخسێک نین و بۆ یەکێک نین. ئەم ئارەزووە هی هەموو میللەتی کوردەو ئەم هاوارە بەیەک دەنگە، ئەمین بن لە هەموو کوردستانەوەیە لەبەر ئەوە لەپێش هەموو شتێکدا زۆر تکاتان لێ ئەکەین کە زۆر ئەهەمییەتی بدەنێ»...**

**«کۆمەڵەی زەردەشتی»** لە نامەکەیدا بە گەرمی داوا لە شێخ مەحمود دەکات بە هیچ جۆر لەگەڵ حوکمەتدا ڕێک نەکەوێ چونکە، وەک دەڵێ، نیازی لەگەڵ کوردا پاک نییە، لەبەر ئەوە **«ئێمە کە چەند فەردێکین لە ئەفرادی ئەو میللەتە کە جەنابتان گەورەی ئەون بە ناوی هەموو میللەتەوە ڕەجا ئەکەین ئەهەمییەت بدەن بەم مەعروزاتانەمان و ئەمە تەنها ڕێگەی ئەمەل و حەیاتمانە»**.

لە کۆتایی نامەکەدا نووسراوە: **«بە ناوی هەموو میللەتی کوردەوە جەمعییەتی زەردەشتی»**، لە دامێنیشیدا نووسراوە: **«صورەتێکی بۆ سکرتێرو موعتەمەدی عامی جەمعییەتی زەردەشتی لە بەغداد لەسەر ئەمرو تەحریراتی مەرکەزی عمومی، ژمارە ٣١٠٩، ڕۆژ ٩ سێپتەمبەری ١٩٢٨»**.

هەرچی نامەکەی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»**یە بۆ مەحمود خانی کانی سانان لە مەریوان بە زمانی فارسی و دەسخەتی مستەفا سائیب خۆیەتی. ئەمیان نزیکەی

دوو لاپەڕەی قەوارە گەورەیە، دەقی ناوەڕۆکەکەشی ٥٣ دێڕی پڕ کردۆتەوە لەسەروو نامەکەوە نووسراوە: **«ژمارە ٢٤٨٦، ڕۆژ ١٠ ربیع الاخر ١٣٤٧»** کە دەکاتە ٢٦ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٨. لەدامێنی نامەکەشدا بە کوردی نووسراوە **«صورەتێکی بۆ سکرتێرو موعتەمەدی عامی جەمعییەتی زەردەشتی لە بەغداد لەسەر ئەمرو تەحریراتی مەرکەزی عمومی، ژمارە ٣١٥٧، ڕۆژ ١٧ی سێپتەمبەری ١٩٢٨».**

جیاوازییەکی ئەوتۆ نییە لە نێوان ناوەڕۆکی هەردووک نامەکەی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»**دا ئەوە نەبێ کە لەمیاندا بەگەرمی مەحمود خانی کانی سانان هەن دەدات بۆ ئەوەی کۆشش بنوێنێ تا سەرنجی ئێرانییەکان بۆ بزووتنەوەی کورد ڕابکێشێ، وێڕای ئەوەی خۆیشی وەک کۆمەڵەیەکی سیاسیی کورد بە مەحمود خان دەناسێنێ. هەروەها **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** وێنەیەکی لە نامەکەی خۆی بۆ شێخ مەحمود ناردووە بۆ مەحمود خان و ئەوەشی پێ ڕاگەیاندووە کە پشدەرییەکان خەریکن خۆیان بۆ ڕاپەڕین کۆدەکەنەوە.

هەردووک نامەکەی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرن کە لە **«ڕەنگین»**دا جێگەیان نابێتەوە، ئەوەندە هەیە وا پێ دەچێ ئەم کۆمەڵەیە لە بۆچوونەکانیدا کەوتۆتە هەڵەی گەورەوە، ڕوداوەکانی کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکان ئەوە بە روونی نیشان دەدەن. **زۆری نەبرد کوشتنی سمکۆو هاریکاریی ئینگلیز و ئێران دژی شێخ مەحمود دەریان خست کە ئێران ئەو لایەنە نییە پشتی پێ ببەسترێ.**

پاش ماوەیەک ڕاپۆرنووسەکەمان لە پیران و مەریوانەوە دەگەڕێتەوە سلێمانی و وەڵامی شێخ مەحمود و مەحمود خانی کانی سانان بۆ **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە. دیسان بەر لەوەی وەڵامەکان بگەیێنێتە شوێنی مەبەست دەیابتە لای ئینگلیزەکان تا وێنەیان لەسەر بگرنەوە، ئەو دوو وەڵامنامەیەش پڕن لە زانیاریی گرنگ کە خێرو بێری ئەو ڕاپۆرنووسە نەبوایە وەک گەلێک لاپەڕەی تری بایەخداری مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورد لەگەڵ خاوەنەکانیاندا دەچوونە ژێر گڵەوە.

نە بەشی رابوردووی ئەم زنجیرە وتارەدا گەیشتینە باسی نامەکانی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٨دا بۆ شێخ مەحمود لە پیران و مەحمود خانی کانی سانان لە مەریوان. کاکی راپۆرنووس لەوسەر کە دێتەوە وەڵامی شێخ مەحمود و مەحمود خان لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە بۆ رابەرانی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»**و بە هەمان دەستوور بەرلەوەی بیانگەیێنێ دەیانباتە لای ئەفسەری ئیستخباراتی بەریتانی لە سلێمانی. بەداخەوە لەو فایلەدا کە ئەم باسەی تێدایە وێنەی ئەو دوونامەیەی تێدا نییە، بەڵام پوختەی ناوەڕۆکی هەردووکیانی بە ئینگلیزی تێدا هەڵگیراوە. ئەو لایەنەی باسەکەش پڕییە لە زانیاریی دەربارەی بزووتنەوەی کوردایەتیی لە کۆتایی بیستەکاندا. ئەفسەری ئیستخباراتی بەریتانی لە سلێمانی رۆژی ٣٠ی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٨ دەربارەی وەڵامەکانی شێخ مەحمود و مەحمود خان یاداشتێکی بۆ ئیستخباراتی بنکەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە بەغدا ناردووە. کەوابێ چوونی راپۆرنووسەکەمان بۆ پیران و مەریوان و گەڕانەوەی بۆ سلێمانی دەوروبەری مانگێکی خایاندووە. بە یاداشتەکەدا وادیارە مەحمود خانی کانی سانان خۆی لە داواکانی رابەرانی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** دزیوەتەوە، چونکە لە وەڵامەکەیدا هەر ئەوەندەی راگەیاندووە کە نامەکەی وەرگرتوون. رابەرانی کۆمەڵە دەستیان هەڵنەگرتووە، رۆژی ٢٠ی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٨ نامەیەکی تریان بۆ ناردووە، ژمارەی نامەی ئەمجارەیان ٢٥٧٣یە. لە نامەی دووەمیاندا داوایان لە مەحمود خانی کانی سانان کردووە نوێنەرێکی خۆی بنێرێتە لایان بۆ دامەزراندنی پەیوەندیی بەردەوام لە نێوان هەردوولادا. وا پێ دەچێ مەحمود خان ئەم نامەیەی خستبێتە پشت گوێ، یا وەڵامەکەی بەرێگەیەکی سەر راستدا ناردبێتەوە، چونکە ئەفسەری ئیستخباراتی بەریتانی لە سلێمانی لە یاداشتەکەی خۆیدا دەڵێ: **«هیچ وەڵامێکمان دەربارەی ئەو نامەیە پێ نەگەیشتووە»**.

هەرچی شێخ مەحمودە بایەخێکی زۆری داوە بەنامەکە، لە وەڵامیدا ئامادەیی خۆی نیشان داوە دەستی یاریدە بۆ **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** درێژ بکات، بەڵام داوای لە رابەرانی کردووە بە دوورو درێژی هەموو زانیارییەکی پێویستی لە بارەی

خۆیانەوە بۆ بنێرن، تایبەت دەربارەی ئامانجەکانی کۆمەڵەو ناوی ئەندامانی چ نە سلێمانی و چ لە شوێنی تر، وێڕای ئاگادارکردنەوەی لە گشت کارە بایەخدارەکانی بەتەواوی.

رۆژی ٢٥ی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٨ رابەرانی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** وەڵامنامەیەکیان ناردووە بۆ شێخ مەحمود و ئاگاداریان کردووە کە وێنەیەکیان نە نامەکەی ئەو بۆ **«سەرۆکی کۆمەڵە لە بەغدا»** ناردووە. هەروەها لەگەڵ نامەی دووەمیاندا پێڕەوی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** یان بۆ ناردووەو داوایان لێکردووە گەر پێی قایل دەبێ ئیمزای بکات و بۆیان بنێرێتەوە و لەو کاتەوە ئیتر گوایە شێخ دەبێتە سەرۆکی کۆمەڵەو ئەوجا ئەوانیش ناوی گشت ئەندامان و شفرە تایبەتییەکانی بۆ دەنێرن، خۆ ئەگەر ئیمزای ناکات دەبێ نموونەی پێڕەوەکەو هەموو نامەکانی کۆمەڵەیان بۆ بگێڕێتەوە تاوەکو ئەمانیش نامەکانی خۆی بۆ بنێرنەوە. ئەمانە هەموو دیاردەو ئەزموونی نوێن لە مێژووی چالاکیی رێکخراوە کوردییەکانی ئەو رۆژگارەدا. لە نامەکانیانەوە دیارە کە زەردەشتییەکان بە دڵ حەزیان دەکرد شێخ مەحمود ببێتە سەرۆکی کۆمەڵەکەیان، پێیان وابوو ئەوە دەبێتە هۆی سەرفرازی و سەرکەوتنی گەلی کورد.

بە هۆی نامەی دووەمی زەردەشتییەکانەوە بۆ شێخ مەحمود ناوەرۆکی پێڕەوی کۆمەڵەکەیانمان بۆ ماوەتەوە کە بێگومان بایەخی مێژوویی زۆر زۆرە. **یەکێک لە کەلێنەکانی مێژووی بزووتنەوەی کوردایەتی لە نەبوون و ون بوونی پرۆگرام و پێڕەوی رێکخراوە کوردستانییەکاندا وەدی دەکرێ.** بەپێی قسەی رابەرانی کە بۆ شێخ مەحمودیان نووسیوە **«کۆمەڵەی زەردەشتی »** ساڵی ١٩٢٦دامەزرێنراوە. ئێمە تا رادەیەک لەم ساڵە دوو دڵین، چونکە ئەوانەی ئەو کۆمەڵەیەیان دامەزراندووە ئەندامی خۆیبوون بوون و لێی جیابوونەتەوە، خۆیبوونیش دەورووبەری کۆتایی ساڵی ١٩٢٧ دامەزرێنراوە. دوور نییە نووسەر، یا نووسەرانی نامەکە بە دانانی ئەو ساڵە ویستبێتیان سەنگی خۆیان لای شێخ مەحمود قورستر بکەن.

بەپێی ناوەرۆکی نامەکان و زانیارییە تایبەتییەکانی ناو بەڵگەنامە تایبەتییەکانی ئینگلیز وا دەردەکەوێ سەرۆک و مەڵبەندی ناوەندیی **«کۆمەڵەی**

**ـردەشتی»** لە بەغداد بووبن و کۆمەڵە دوولقی هەبووبێ، یەکێکیان لە سلێمانی کە ـ خۆی گوتووە **«شوعبەی فیدایی»**، ئەوی تریشیان لە هەولێر. پێڕەوی **«کۆمەڵەی ـردەشتی»** لە شازدە بەند پێکهاتووە. **بەندی یەکەمی** دەربارەی پەیوەندی نێوان ـڕنو ئێرانییەکانە کە بەداخەوە کۆمەڵە دروست نەینرخاندووە. بە پێی **بەندی دووەم** ـێ گشت ئەندامان پابەندی فەرمان و بڕیارەکانی کۆمەڵە بن. بەپێی **بەندی سێیەم** ـێ سەرۆک بە تێکڕایی دەنگ هەڵبـژێردرێ. **بەندی چوارەم** پەیوەندییەکانی ـێمەنەی خستۆتە ئەستۆی سەرۆک. **ئەم بەندە چوار خاڵی تری لێبۆتەوە** کە بۆ باسی ـەرگرتنی ئەندام و پارەو داهاتی کۆمەڵەو دەسەڵاتە تایبەتییەکانی سەرۆک ـەرخانکراون. **بەندی پێنجەمیش** لە دوو خاڵ پێکهاتووە، هەردووکیان باسی ـڕیاری دارایی کۆمەڵە دەکەن کە دەبێ بخرێتە ئەستۆی ژمێریارێکەوە، ئەو ـمێریارەش دەبێ بەتێکڕای دەنگی ئەندامانی بەڕێوەبەری کۆمەڵە هەڵبژێردرێ و ـێ بێ ڕەزامەندیی سەرۆک هیچ پارەیەکی کۆمەڵە خەرج بکات. **بەندی شەشەم** ـفی بڕیاردانی کۆبوونەوەکانی دەستەی بەڕێوەبەری داوەتە سەرۆک. بەپێی **بەندی حەوتەم** ئەو ئەندامەی لە هەر کام لە کۆبوونەوەکاندا بەشدار نەبێ لە مافی ڕەخنە ـگرتنی بڕیارەکانی ئەو کۆبوونەوەیە بێبەش دەبێ. بەپێی **بەندی هەشتەم** دەبێ ـەستەی بەڕێوەبەر حەفتەی جارێک کۆببێتەوە. **بەندی نۆیەم** مافی دیارکردنی ـوێنی کۆبوونەوەکانی داوەتە دەست سەرۆک. **بەندی دەیەم** دەڵێ: هەر ئەندامێکی ـەستەی بەڕێوەبەر لە خۆیەوە کۆبوونەوە ساز بکات لە کۆمەڵە دەردەکرێ. بەپێی **بەندی یازدەمین** کۆمەڵە لە دیدو ڕوانگەی بۆ چوونەکانی خۆیەوە مامڵەی هەموو جۆرە موعارەزەیەک دەکات. بەپێی **بەندی دوازدەمین** نابێ هیچ کام لە ئەندامان ـمەی کۆمەڵەو پارەو پوولی لای خۆیان گل بدەنەوە. بەپێی **بەندی سیازدەمین** هیچ کـم لە ئەندامان بۆیان نییە ببنە ئەندامی هیچ کۆمەڵەو ڕێکخراوێکی تر. **بەندی چواردەمین** مەرجەکانی ئەندامەتیی کۆمەڵەی دیارکردووە. بەپێی ئەو بەندە ئەوی ـیعوێ ببێتە ئەندام دەبێ هەموو زانیارییەکی پێویست وەک ناوی تەواوی خۆی و ـنەماڵەی و کاری لەگەڵ وێنەی خۆیداو مۆری پەنجە گەورەی دەستی پێشکەش بکات. ئەو کەسە دوای دەرچوونی بڕیاری وەرگرتنی بە نووسراوی ئینجا دەبێتە

ئەندام. **بەندی پازدەمین** سەیر دێتە بەرچاو، بە پێی ئەو بەندە ئەوی بیەوێ ببێتە ئەندام دەبێ ئیمزای خۆی لە دامێنی لاپەڕەیەکی سپیدا بنووسێ و ئەو لاپەڕەیە بداتە دەستەی بەڕێوەبەر. ئەفسەری ئیستخباراتی بەریتانی لە سلێمانی وای بۆ چووە کە دەستەی بەڕێوەبەر بەهۆی ئەو لاپەڕەیەوە جۆرە ئیلتیزامێک دەخەنە ئەستۆی هەر ئەندامێکەوە سەرکێشی لە ئاستی کۆمەڵەدا بکات، گوایە ئەوان لە حاڵەتێکی وادا بۆخۆیان چۆنیان بوێ بەو جۆرە ئەو لاپەڕەیە پڕدەکەنەوە. بەپێی **دوابەندی** پێڕەوی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** ئەوی بەئەندام وەردەگیرێ پێویستە بە ئیمزا قایل بوونی خۆی بە ناوەرۆکی ئەم پێڕەوە رابگەیێنێ.

بەم جۆرە کاکی راپۆرنووس، بێ ئەوەی بۆ خۆی بیەوێ، بووە هۆی پاراستنی ئەم هەموو زانیارییە دەگمەنانە دەربارەی کۆمەڵەیەکی سیاسیی نهێنی کورد کە کەس تەنانەت ناویشمان نەبیستبوو. نرخی ئەم جۆرە زانیارییانە بۆ مێژوونووس و تێگەیشتنی رەوتی بزووتنەوەی کوردایەتی و رۆڵی رووناکبیران لەو بزووتنەوەیەدا بە درێژایی بیستەکان و سەرەتای سییەکان یەکجار زۆرەو هەموو فەزڵی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خێرو بێری ئەو راپۆرنووسەمان کە لە بەشی داهاتوودا باسی دو راپۆرتەکانی دەکەین.

**-٤-**

دوا بەشی ئەم زنجیرە وتارەمان بۆ زانیاری و سەرنجەکانی تری راپۆرنووسەکەمان تەرخان دەکەین. لەهەمان فایلی ژمارە ٤١٤/٢٣، بەشی چوارەم، ئێکس- ئیە ٥٨٣٤ی وەزارەتی فڕۆکەوانی بەریتانیادا کە بۆ باسی بە شێک لە **«بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد»** لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٨ و سەرەتای ساڵی ١٩٢٩دا تەرخانکراوە یاداشتێکی تری تێدایە کە بە کوردی و بەدەسخەتێکی جوان نووسراوەو گەلێک زانیاریی وردی دەربارەی بارو دۆخی سلێمانی تێدا تۆمار کراوە. کاکی راپۆرنووس سەرنجەکانی خۆی دەربارەی شارو دیاردەکانی کۆمەڵ و بیروڕای خەڵک خستۆتە چوارچێوەی ئەو یاداشتەوە کە بەڵگەیەکی شارەزایی و زیرەکی ئەو پیاوەیە. یاداشتی ئیمرۆمان نزیکەی دوو لاپەڕەی قەوارە گەورەیە کە ٤٨ دێڕیی پڕ کردۆتەوە

ـە سەروو یاداشتەکەوە نووسراوە **«راپۆر»**. دوو سەر ناوی تر لەو یاداشتەدا هەیە، یەکەمیان **«شایعاتی سلێمانی»**و ئەوی تریان **«تورکچییەکان»**.

**بەشی یەکەم**، واتە **«راپۆر»**، لە ٩ خاڵ پێکهاتووە. ئەمە پوختەی لایەنە گرنگەکانی ئەو خاڵانەیە:

**«١-.. بۆ رزگاری کوردەکانی عیراق.. بەندە تەعیین کراوم رۆژی ٣٠ی ئەیلوولی ١٩٢٨ بۆ ئەم مەسەلەیە بۆ حدودی ئێران بۆ لای مەحمود خانی کانی سانان حەرەکەت دەکەم، تەقریبەن دە رۆژ مودەتی سەفەر دەوام دەکات.**

**٢- ئەو تەحریراتەی کە لە تەرەف جەمعیەتەوە بۆ مەحمود خان نووسراوە سورەتێکی بە سەحیحی عەینەن تەقدیم کرا.**

**٣- تەحریراتێکی جەمعیەت کە لەمەوپێش بۆ شێخ مەحمود نێرراوە سورەتی ئەویش بە پێچراوەیی تەقدیم کرا».**

**خاڵی چوارەم و پێنجەمی** یاداشتەکە بۆ باسی پەیوەندییەکانی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** بەسەردارانی هۆزی پژدەرەوە تەرخانکراوە. برگەیەکی خاڵی پێنجەم دەڵێ: **«چوار پێنج بەگزادەی پژدەری بە قووەتی شەرەف و تەئمیناتی تەواو ئیتیفاقیان لەگەڵ جەمعییەت کردووە»**. ئەمەش دەقی تەواوی خاڵی شەشەمە کە باسی پێوەندی کردنی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»**یە بە سابیر بەگی کوڕی کەریم بەگی هەمەوەندەوە کە هەردووکیان لایەنگری شێخ مەحمودو دوژمنی باوە کوشتەی ئینگلیز بوون:

**«بۆ عەقدی موناسەبات و ئیتیفاق جەمعییەت کاغەزیان ناردووە بۆ سابیر بەگی کوڕی کەریم بەگ، ئەویش داخڵی جەمعییەت دەبێ و لەمەولا بە پرۆگرام و تەرتیباتی جەمعییەت حەرەکەت دەکات».**

**خاڵی حەوتەمی** یاداشتەکە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە رابەرانی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** لە دووربینییەوە بایەخی تایبەتییان داوە بە رەواندز بۆ ئەوەی ببێتە بنکەی پەیوەندی لەگەڵ کوردستانی باکووردا. دەقی ئەم خاڵە بەم جۆرەیە:

**«٧- داخڵی پرۆگرامیساڵی ١٩٢٨ی جەمعییەت بووە کە بۆ پڕۆپاگەندە لەگەڵ کوردستانی شیمالیدا شوعبەیەکی جەمعیەت لە رەواندز هەبێ، ئەم شوعبەیە**

**موسارەفاتی زیاتر لە شوعبەی سلێمانی بۆ تەرخانکراوە. ئەفرادی ئەم شوعبەیە هێشتا بەتەواوی تەحەقوقی نەکردووە».**

دوا دوو خاڵی ئەم بەشەی یاداشتەکە پەیوەندییان بەکاروباری کارگێری و دارایی خودی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»**یەوە هەیە، لەبەر بایەخی زۆریان وەک خۆیان ئەمانیش تۆمار دەکەین:

**«٨- لەسەر کولی فەردێ بە ئیعتباری عومومی لە مەنسوبینی جەمعییەت واجیبە مانگی ٥ رۆپی (دەی کردە ٣٧٥ فلس-ک.م) لە شوعبەی خۆیدا تەسلیم بە موعتەمەدی جەمعییەت بکات. لاکین سەرفی پارە لە مەرکەزی عومومییەوە ئەمری دەردەچێ، هیچ وەقتێ شوعبات ناتوانێ بەبێ ئەمری مەرکەزی عمومی سەرفیات بکەن.**

**٩- لە ئوموراتی جەمعییەت، بە ئیعتباری عمومی لە شوعباتدا موعتەمەدو مەئمورو دوو لە ئەعزاکان موجەزا دەبن، مەنسوبینی جەمعییەت مەعلوماتیان بەسەر ئوموری جەمعییەتدا لە مەوادی موهیمەدا نابێ. نیزامنامەی جەمعییەت هەموو مەنسوبێ دەیبینن».**

وەک گوتمان بەشی دووەمی یاداشتەکە دەربارەی **«شایعاتی سلێمانی»**یە. ئەمەیان لەپێنج خاڵی تێرو تەسەل پێکهاتووە کە هەموویان بۆ ئەوسای ئینگلیز پێوست و بەنرخ بوون و بۆ ئیمرۆی مێژوونووسیش زانیاریی بایەخدارو نەزانراون، لە بەر ئەوە دەقی هەر پێنجیان وەک خۆیان تۆمار دەکەین:

**«١- شایعە وەهایە سیاسەتی حوکمەتی ئینگلیز لەگەڵ عیراق و کوردستاندا دەگۆڕدرێ و مەندووبی سامی سێر هێنری دۆبس لە بەر ئەمە گۆڕراوە.**

**٢- بینا لەسەر حەوادیسات ئەهالی پژدەر ئیتاعەت ناکەن و تەیارە بەیاننامەی بۆ خستوون.**

**٣- بینا لەسەر قسەی خزمەتکارەکانی حامید بەگی قایقامی هەڵەبجە ئەمجارە کە چووە بۆ کەرکووک حوکمەت بانگی کردووە کە بیکەن بە موتەسەریفی سلێمانی، هەر چەندە ئەم قسەیە بەناو هەموو بازاڕدا بڵاو کراوەتەوەو هەموو کەسێک ئەم قسەیە تەکرار دەکاتەوە، لاکین وەکو مەعلوماتم هەیە حامید بەگ دەستی لەجێ**

**چوبوو، بۆ تەداوی رۆیشت بۆ کەرکووک و رۆژی ٢٨ رەجەبەتی کردووە. ئەم شایعەیە بەدرۆ مەشهور دەکەین.**

**٤- هیچ مەجلیس و مەوقعێک لە سلێمانیدا پەیدا نابێ کەلە عەلیهیی موتەسەریف ئەحمەد ئەفەندی قسە نەکات، بەئیعتباری عومومی لیوای سلێمانی لە عەلیهیی ئیدارەی ئەم پیاوە قسە دەکەن.**

**٥- موتەسەریفی مومالیە لەگەڵ مەبعوسی ئەربیل مەعروف چیاووکدا موناقەرەتێکی گەورەیان لە بەینیدا حاسڵ بووە وە بەقووەت لە عەلیهیی یەکن. مەعروف چیاووک مەبعوسی خسوسی و گەلێ کاغەزی لە عەلیهیی ئەم پیاوە بۆ ئەشرافەکانی سلێمانی ناردووە، مومالیە موحتەمەلە چوار رۆژی تر بە ناوی دیدەنی بەعزێ کەسەوە بێت بۆ سلێمانی».**

دوابەشی یاداشتی راپۆرنووسەکەمان دەربارەی تورکخواکانی ئەو رۆژگارەی سلێمانییە کە لەناو خەڵکدا بە تەوسەوە بە **«جل خوارەکان»** ناو دەبران. کۆتایی بیستەکان تورکخواکانی کوردستانی عیراق بە هۆی سیاسەتی نالەباری شۆڤێنی کەمالییەکانی تورکیاوە تەواو کزو ریسوا ببوون، ئەو راستییەی بە روونی لە دوا برگەی یاداشتەکەدا رەنگی داوەتەوە. ئەمەش دەقی ئەو بەشە گرنگەی یاداشتەکەیە:

**«تورکچییەکان: لەغایەت دەرەجە زیاد ئەو چوار پێنج کەسە کە تورکچی بوون ئێستاش بە شیدەت پڕۆپاگەندەی تورکچییەتی دەکەن. لاکین ئەم پڕۆپاگەندەیە لەبەر ئەمە کە لە عەسری حازردا زۆر بێ مەعنایە تەئسیراتی بە هیچ فەردێک نادات و هیچ کەسێک ئیعتیماد بە قەول و قسەی ئەمانە ناکات، بەڵکو بیلعەکس لە نەزەری عومومی ئەهالیدا مەهتوک و بەبێ ئیعتیبار تەماشا دەکرێن. پڕۆپاگەندەچییەکان خۆیان ئەمەندە تێگەیشتوو نین کە لە ئوسووڵی پڕۆپاگەندە بزانن، چونکە ئینسان لازمە لەگەڵ عەسرو موحیتدا پڕۆپاگەندە بکات و ئیستیفادە لە عەقڵی ئەهالی بکات. دەتوانم بڵێم قیسمی عەوامی ئەهالی لە تورکچییەکان تێگەیشتووترن. لە ناو ئەم تورکچییانەدا تایەر ئەفەندی کوڕی ئەمین ئەفەندی** (خاڵی دایکی کاک فوئاد عارفە- ک.م) **بووە، حەقیقەتەن ئەم پیاوە بە هۆش و تێگەیشتووە، لەپڕۆپاگەندەو ئینقلاباتدا ساحیب دەستەیە، ئەم پیاوە دووساڵە ئەم**

**مەسەلەیەی بەرداوە، ئەوانی تریان عادەتەن نیسبەتی پەتی پچڕاون».**

جارێکی تر باسی راپۆرنووسەکەمان لەو فایلەی وەزارەتی فڕۆکەوانی بەریتانیادا، کە لە سەرەتاوە باسیمان کرد، هاتۆتە پێشەوە. خاڵی یەکەمی ئەو یاداشتەی ئەفسەری ئیستیخباراتی بەریتانی لە سلێمانی رۆژی ٢١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٨ناردوویە بۆ ئیستیخباراتی سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە بەغدا بۆ باسی ئەو تەرخانکراوە. بەپێی زانیارییەکانی ناو ئەو یاداشتە رابەرانی **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** سەرەتای کانوونی یەکەم دیسان کابرای راپۆرنووسیان ناردۆتە لای شێخ مەحمودو ئەویش وەک جارەکانی تر هەموو نهێنی و راسپاردەکانی هەردوو لای وەک هێلکەی پاک کراو خستۆتە بەردەمی ئینگلیزەکان. ئەمجاریش شێخ مەحمود بەنامە پشتگیری کردنی خۆی بە **«کۆمەڵەی زەردەشتی»** راگەیاندووە.

بەداخەوە لێرەدا دەگەینە دوا هەواڵی دۆزراوەی چالاکییەکانی ئەو راپۆرنووسەمان کە هەموویان بەخێر گەڕان بۆ تۆماری مێژووی هاوچەرخی کورد، بریا ئەو راپۆرنووسەمان سەد ساڵ بژیایە، جارێکی دیش دەڵێمەوە هیوادارم خواو کورد لەو راپۆرنووسەمان خۆش بن. سوپاسیش بۆ ئینگلیزەکان کە ئەم هەموو سامانە دەگمەنەیان بۆ پاراستووین، **لەوانەیە سەرتان سوڕبمێنێ گەر بڵێم ئەوان تەنانەت حەمە نێرگەلەچیی پیاوی شێخ مەحمودیشیان لە نزیکەوە ناسیوەو بە وردی تاقییان کردووەو جێگەی تایبەتیان لەبەڵگەنامەکانی خۆیاندا بۆی تەرخانکردووە!!.**

بابەتی چوارەم*

# کوردایەتیی سەربازێکی ون و سوێندێکی پیرۆزی «خۆیبوون» لە دوو بەڵگەنامەدا

هەموو جۆرەکانی بەڵگەنامە سەرچاوەی رەسەنی تۆماری مێژوون، تایبەت مێژووی نوێ و هاوچەرخ. هی ئەوتۆ هەن ئەڵێن مێژووی بێ بەڵگەنامە مێژوونییە **(لا تاریخ بدون وثائق)**. لەناو خودی تۆماری بەڵگەنامەشدا بەڵگەنامەی دیپلۆماسی و ئەو بەڵگەنامانەی لە پایەی ئەودان شوێنی یەکەمیان پێ ئەبرێ. ئەمە نە خۆرانییە. بەرلە هەرشت پیاوی شارەزاو لێهاتوو، یا بابڵێین پیاوی دووربین و زۆرزان دەبێتە دیپلۆماسی کە یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی بریتییە لەگەڕان بە دووی دیاردەو ئاڵوگۆڕ و بڕیار و بیروڕای گشتی و رووداوەکانداو تەتەڵە کردنیان و ناردنی راپۆرتی تایبەتی دەربارەیان بۆ ئەو دەزگایانەی وڵات کە پێویستە لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو جۆرە زانیارییانە بن. بەهیچ جۆر ناشێ کاربەدەستی دیپلۆماسی دەست لەو زانیارییانە وەردا، یا لەکاتی تەتەڵە کردن و ئامادەکردنیاندا هەست و ئارەزووی خۆی لەگەڵیاندا تێکهەڵکێش بکات، پێویستە راستییەکان چۆنن وەک خۆیان، بێ هیچ جۆرە دەستکارییەک رایان بگەیێنێ، تەنانەت ئەگەرچی هیچ کامێکیشیانی بەدڵ نەبێ.

سروشتی نهێنی راپۆرتی دیپلۆماسی مەودا بۆ هیچ جۆرە دوودڵییەک ناهێڵێتەوە، واتە نووسەری ئەوراپۆرتانە بە راشکاوی راستییەکان وەک خۆیان تۆمار دەکات، چونکە دەزانێ ژمارەیەکی زۆر کەم لە گەورە لێپرسراوان نەبێ کەسی تر نایانبینێ، جاران ئەو بەڵگەنامانە دوای گەیشتنیان بە یەکجارەکی لە ئەرشیفی تایبەتیدا هەڵدەگیران، زۆر نییە دەرگەی ئەرشیفی هەڵگرتنی بەڵگەنامەکان بۆ

(*) لە ژمارە(٨٧)ی ساڵی ١٩٩٦ی گۆڤاری «رەنگین» لە ل٦-٧دا بڵاوکراوەتەوە.

مێژوونووسان خراوەتە سەرپشت. لەگەڵ ئەوەشدا بینینی بەڵگەی دیپلۆماسی بەر لە تێپەڕبوونی سی چل ساڵ بەسەر دانانیاندا قەدەغەیە، واتا دوای ئەوەی ناوەرۆکی دەبێتە بەشێک لە رابوردوو ئینجا دەخرێتە بەردەست.

لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی و گشتی کوردو کوردستان شوێنێکی زۆر دیاریان لە بەڵگە دیپلۆماسییەکانی جیهاندا هەیە. بەر لەهەر شتێک کوردستان وڵاتێکی دەوڵەمەندە، لە رووی ستراتیژییەوە یەکێکە لەبڕبڕە سەرەکییەکانی رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست، بەهۆی بێ مافیشەوە لە دێر زەمانەوە کورد بێ وچان لە کۆڕی خەباتدایە. دەمێ ساڵە ئەمانە سەرنجی هەموو وڵاتە گەورەکانیان راکێشاوە، بۆیەک بەدەیان هەزار بەڵگەی دیپلۆماسیی تایبەتی و گشتی دەربارەی کورد و کوردستان لە ناو دۆسییەکانی ئەرشیفە بەناوبانگەکانی جیهاندا هەڵگیراون. من بۆ خۆم بە تەنها هەزاران لەو بەڵگانەم بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی خوێندۆتەوە، وێنەی سەدانیانم بۆ کاری تایبەتی خۆم گرتووە. لەو بەڵگەنامانەدا شتی یەکجار سەیرو دەگمەن وەبەرچاو دەکەون، وێنەی راستەقینەی بەدرخانییەکان و شێخی بەردەقارەمان و سەردارانی بارزان و سمکۆو قازییەکانی ئێران و شێخ سەعیدی پیران و دەیان سەربازی ونی کوردان بە وردی لەسەر لاپەڕەکانیان کێشراون. **هەر کەسێک بیەوێ لە مەینەتییەکانی کوردو رۆژە خوێناوییەکانیان بە وردی تێبگات دەبێ بەر لە هەر شتێک بە تۆماری ئەو بەڵگەنامانەدا بچێتەوە.**

زۆر جار ناوەرۆکی ئەو بەڵگەنامانە ئەمحەپەسێنێ، وەک دەڵێن لە ئاستی خۆمدا واقم وڕ دەمێنێ. فەرموون ئێوەو دوانموونەیان.

لەم رۆژانەدا لەگەڵ بەشی شەشەمی فایلی ژمارە ١٤١٦/٢٣ی وەزارەتی فڕۆکەوانی بەریتانی خەریک بووم. **«بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لەچواردەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٩وە تاوەکو بیست و چواری مارتی ساڵی ١٩٣٠»** ناونیشانی ئەو فایلەیە کە ژمارەی لاپەڕەکانی ١٧٢ لاپەڕەی قەوارە گەورەیە. یەکێک لەبەڵگەنامەکانی ناو ئەو فایلە باسی سەربازێکی کورد دەکات کە لە مووسڵ بە کوردایەتییەوە خەریک بووە. وادیارە ئینگلیزەکان بە راست و چەپدا کەوتوونەتە سۆراخی تا دۆزیویانەتەوە، ئینجا بەهەموو لایەکدا هەواڵ و

[illegible]

23/416 PART VI E/M 04583



Extract from Police Abstract of Intelligence No.5.
dated 9th February,1930.

Para.153. Mosul. 1st February,1930.

Reference paragraphs 45 and 46, [illegible] has been identified as No.20418 soldier Clerk, [illegible] TAHIR AMIN,1st Battalion,'Iraq Infantry,Mosul.

Description:- Aged 29 years, born at Sulaimani, height 5'7", brown eyes, medium nose, wheat complexion, round

ناونیشـانیـان راگـەیاندووە تا بە وردی بیـخـەنە ژێر چاودێرییـەوە. ئەمـە دەقی بەڵگەنامەکەیە: «وەزارەتی فرۆکەوانی، ١٤١٦/٢٣، بەشی شەشەم، ئێکس/ئێم، ٠٤٥٨٣، وەرگیراو لە کورتەی راپۆرتی پۆلیسی ئیستخبارات، ژمارە پێنج، رۆژی حەوتی شوباتی ١٩٣٠. برگەی ١٥٣. مووسڵ. یەکی شوباتی ١٩٣٠. نیشانە بە برگەی ژمارە ٤٥و٤٦، پێناسەی ئەنوەر ئەفەندی بەم جۆرەیە: ژمارە ٢٠٤١٨ سەربازو کاتبە، ئەنوەر کوڕی تاهیر ئەمینە، سەر بە بەتالیۆنی یەکەمی پیادەی (لەشکری) عیراقە لە مووسڵ. نیشانەکانی: تەمەنی ٢٩ساڵانە، لە دایکبووی سلێمانییە بالای پێنج پێ و حەوت گرێیە، چاوی قاوەیی، لوتی مام ناوەندییە، گەنم رەنگە، پاشماوەی برینێک بە ناوچەوانییەوەیە، ئەبرۆکانی پەیوەست نین- لە دەقی بەڵگەنامەکەدا: نێوانی ئەبرۆکانی چاوی بێ موون-». پێم وایە تاهیر ئەفەندی هەر ئەوەندەی دەربارەی نیشانە تایبەتییەکانی ئەنوەری کوڕی دەزانی.

بۆ دۆزینەوەی ئەو سەربازە ونەمان پەنام بردە بەر بەڕێزان فوئاد عارف و دکتۆر عەبدولڕەحمان عەبدوڵڵا و عەبدولڕەحمان موفتی و دکتۆر ئەمین موتابچی. بە پێی پوختەی قسەی ئەوان لە سلێمانی لەو سەردەمەدا تاهیر ئەفەندیی ئەمین ئەفەندیی حەبیب ئاغای ڕەنگینە یەکێک لە ناسراوانی شارو تورکخوایەکی بەناوبانگ بووە، دەورو بەری ساڵی ۱۹۲۷ کۆچی دوایی کردووە، خاڵی دایکی فوئاد عارف نەعیمە خانی کچی مستەفا ئەفەندیی قازییە. بەڵام ئەم تاهیر ئەفەندییە وەجاخی کوێر بووە. دەبێ تاهیر ئەفەندییەکی تر هەبێ کە پیرانی سلێمانی، خوا زۆریان کات، خۆی یا ئەنوەری کوڕی بناسن. هیوادارم مامۆستا ئەحمەد خواجا ئاوڕێک لەم باسە بداتەوە.

بەڵگەنامە تایبەتییەکانی ئینگلیز گەلێک زانیاریی دەگمەن و بەنرخیان دەربارەی ڕێکخراوە سیاسییەکانی کورد بۆ تۆمار کردووین کە هی وایان تێدایە ئێمەی کورد تاوەکو ئێستا ناویانمان نەبیستووە، وەک **«کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان»** و **«یەکبوونی کوردان»**. هەردووکیان کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکان لە کوردستانی باشوور زۆر چالاک بوون. بەهەمان شێواز ئەوانەی مەبەستیانە دەتوانن بگەنە زانیاریی یەکجار دەگمەن و نەزانراو دەربارەی چالاکییەکانی **«خۆیبوون»**ی بەناوبانگ. باوەڕ ناکەم کەسێکمان ئاگامان لەوە بێ کە **«خۆیبوون»** لە بەغداو لە ناو کوردی عیراقدا چالاکییەکی گەرمی نواندووە، **لە نزیکەوە پەیوەندیی بە شێخ مەحمود و لەویش زیاتر پەیوەندیی بە شێخ ئەحمەدی بارزان و ئیسماعیل بەگی ئێزیدییانەوە کردووە**. دەربارەی **«خۆیبوون»**یش لەم کورتە وتارەدا نموونەیەکی لەبار بۆ ڕۆژگار دەخەمە بەرچاو. لە ڕۆژی دامەزراندنییەوەو بە درێژیی پتر لە دوو ساڵ **«خۆیبوون»** بەکاری ڕێکخستنی ڕاپەڕینی داهاتووی کوردستانی تورکیاوە خەریکبوو. ڕابەرانی **«خۆیبوون»** باش لەوە گەیشتبوون **دووبەرەکیی ناوخۆی کورد نەخۆشییەکی دژوارو کوشندەی کوردایەتییە کەخێری تەنها بۆ دوژمن داوەتەوە**، بۆیەکا بەگەرمی لە کۆششدا بوون بۆ وەشاندنی تۆوی برایەتی و ڕەواندنەوەی ناکۆکییەکانی ناو سەرەک هۆزو سەردارانی کوردی تورکیا. لە بوارێ ئەو کۆششەیاندا ڕابەرانی **«خۆیبوون»** سوێندێکی تایبەتییان ئامادە کرد، ئەمە دەقی



شێخ ئەحمەدی بارزانی و مستەفا بارزانی



ئیسماعیل بەگی ئیزیدی

ئەو سوێندەیە کە لەناو یەکێک لە بەڵگەنامە تایبەتییەکانی هەمان فایلدا بەم جۆرەی لای خوارەوە پارێزراوە:

**«ئەفسەری خزمەتە تایبەتییەکان، مووسڵ، ٢٦ی شوباتی ١٩٣٠، نهێنی، نیشانە بە ئای م/٤٢ب، بۆ:**

**ئەرکانی هێزی ئاسمانی (ئیستخبارات)، بنکەی هێزی ئاسمانی سەرکردایەتی عیراق،**

**بنکەی هنێدی -سێ دانە.**

**سەرپەرشتکاری پۆلیسی مووسڵ - یەک دانە.**

**سەرپۆلی ژمارە ٣٠ی فڕۆکە بۆمبا هاوێژەکانی سەر بە هێزی ئاسمانیی مەلەکی (بەریتانی) لە مووسڵ یەک دانە.**

**بابەت: بزووتنەوەی کوردایەتی . کۆمەڵەی خۆیبوون.. نموونەی سوێندی کۆمەڵەی خۆیبوون.**

**بەشەرەف و ئایینم سوێند دەخۆم لە ڕۆژی مۆرکردنی ئەم بەڵێنەوە تا ماوەی دووساڵ چەک دژی هیچ کوردێک بەکارنەهێنم مەگەر ئەو کوردە هێرش بێنێتە سەر ژیان و نامووسم، یا سەر ژیان و نامووسی ئەوانەی بەپێی ئیلتیزاماتی خێزانی یا نەتەوەییەوە من لێیان بەر پرسیارم، هەروەها ماوەی ئەو دوو ساڵە دەست لە هەموو تۆڵەیەکی خوێن و هەموو دووبەرەکییەکی تر هەڵئەگرم و گشت توانای خۆم دەخەمە گەڕ بۆ بەربەستکردنی خوێن ڕشتن لە نێوان هەر دوو کوردێکدا لەسەر ناکۆکیی تایبەتیی خۆیان. هەر کوردێک بەپێچەوانەی ئەم بەڵێنەوە ڕەفتاربکات بەغایەنی نەتەوە دادەنرێ، کوشتنی هەموو غایەنێکیش کارێکی پێویستە».**

مێژوو هەمووی دەرس و پەندی بەکەڵکە بۆ ئەوانەی لەهەر کەس زۆرتر دەبێ گوێ رایەڵی مێژوو بن،چونکە تۆماری مێژوو لەدوا ڕۆژدا بە وردی هەموو چاکەو خراپەیەکیان بۆ نەوەی داهاتوو دەگێڕێتەوە.

# هەولێر نەک بەغدا یەکەم شاری عیراق بوو لە بواری مانگرتندا بۆ داشکاندنی نرخی کارەبا

**پێشکەشە بە یادی براو هاوڕێم، ڕۆڵەی بەرەمتای هەولێر خوالێخۆشبوو دوکتۆر ڕشید قژجە قەصاب**


ئەحمەد چەلەبی دەباغ - هەولێری

بە هۆی ئینگلیزو ئەڵەمانەوە سەرەتای ئەم سەدەیە نوری کارەبا گەیشتە عیراق. دوای داگیرکردنی عیراق لەلایەن لەشکری ئینگلیزەوە خەڵکی پتر لە نیعمەتی کارەبا تێگەیشتن و زۆرتر ڕوویان تێی کرد، سەرباری ئەوە بەرژەوەندە تایبەتییەکانی ئینگلیز خۆیشیان پێویستیان پەوە بوو بایەخ بدەن بە بەکارهێنانی **کارەبا**. بەر لە کۆتایی بیستەکان یەک لە دوای یەک کارەبا گەیشتە شارەکانی کوردستانی عیراقیش. شایانی باسە تا سەرەتای سییەکان ۲۷۹ ماڵ و دوکان و دەزگا لە کەرکوک و ۳۳۰یش لە سلێمانی کارەبایان وەرگرتبوو. بەغداو بەسرەو موسڵ پێش ئەوان بە ماوەیەک کارەبایان بۆ هات.

بەر لە کۆتایی بیستەکان **ئەحمەد محەممەد چەلەبی دەباغ**، کە لە بنەماڵەیەکی ناسراوی هەولێرە، داوای مافی دامەزراندنی مەکینەی کارەبای کرد بۆ ناوشار. ئەنجوومەنی شارەوانی و موتەصەریف(پارێزگار)ی هەولێرو وەزارەتی کاروباری ناوخۆ بە گەرمی پشتگیریی داواکەیان کرد. بەپێی تەقدیری ئەحمەد چەلەبی خۆی

(*) لە گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ژمارە (۱٤۲)ی ساڵی ۱۹۹۹دا بلاوکراوەتەوە.

هێنان و دامەزراندنی مەکینەکەو ئەو خانووەی بۆی تەرخان کرا بەسەریەکەوە دەوروبەری صەدو پەنجا هەزار روپی، واتا نزیکەی یازدە هەزارو دوو صەدو پەنجا دیناری تێچوو کە بۆ رۆژگاری خۆی پارەیەکی یەکجار زۆر بوو. دوور نییە تەقدیرەکەی ئەحمەد چەلەبی زۆر دروست نەبێت، چونکە مەکینەی کارەباکەی سلێمانی کە شارەوانی بۆ خۆی هەر ئەو دەوروبەرە دایمەزراند بوو تەنها حەفتا هەزار روپیی تێچووبوو. هەر چۆن بێت ئەحمەد چەلەبیش کەمی خەرج نەکردبوو، تەنانەت رۆستەم چەلەبی، کە ئەویش لە ناودارانی هەولێرە **(مامی عوسمان و موحسین و نەجم و دوکتۆر رەشید قۆجە قەصابە)** سەرەتا دەیویست ببێتە هاوبەشی ئەحمەد چەلەبی، بەڵام دوایی لەبەر زۆری سەرمایەی پرۆژەکە، کە وا دیارە لە وێزەی ئەودا نەبووە، پەشیمان بۆتەوە[1].

ئیمتیازەکەی ئەحمەد چەلەبی لە سێ مەرجی سەرەکی پێکهاتبوو:

**یەکەم** - دەربارەی ماوەی خودی ئیمتیازەکە بوو کە بڕیار درا سێ ساڵ بێت.

**دووەم** - دەبوو ئەحمەد چەلەبی بەرانبەر مانگانەی ٦٠٠ روپێ بە گڵۆپ شەقامەکانی ناوشار رووناک بکاتەوە.

**سێیەم** - نرخی هەر کیلۆ واتێکی کارەبا بۆ خەڵکی ناوشار لە دە عانە تێنەپەڕێت[2].

بەو جۆرە پرۆژەی کارەبای ناوشاری هەولێر دامەزراو رۆژی هەشتی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ لە خوار دەرگای قەڵاتێ، بەر لە مزگەوتی حاجی قادری دەباغ بووە رۆژی حەشر، عەشاماتێکی زۆر رژانە ئەوێ، هەموو حەپەسا بوون، زۆری نەبرد ئاشی ئەلەکتریکی شار کەوتە کارو گڵۆپ داگیرسا.

یەکەم رۆژ کارەبای هەولێر گەیشتە ئەم چوار ماڵە: عەبدولحەمید بەگی پارێزگارو دەرویش لوطفی بەگی بەڕێوەبەری پۆلیس و یونس ئەفەندی ئەفسەری

---

(١) ملفات وزارة الداخلية(م. و. د.) مديرية المخابرات السرية والسياسية ١٩٣١، رقم الملف: ٣٧ أربيل/٢، العنوان: السياسة الداخلية، موضوع الملف: الحركات السياسة في لواء أربيل،
Office of the Administrative Inspector, Arbil and Kirkuk, Confidential, No. C / 389, 3rd October 1931, to the Adviser, Ministry of Interior, Baghdad,pp.1-6

(2) Ibid, pp.1-2



**حاجی شەریف دۆغرەمەچی لەگەڵ دکتۆر هاشمی کوڕی**

یۆیس و زیا ئەدهەم کە خاوەن ئاش بوو، جگە لە قوتابخانەی شوعبەو شەش چێخانە کە ئەمانە خاوەنیان بوون ـ حاجی وەلی قادرو فەتاح ساڵح و عومەر مەلاو عومەر رەشیدو جەمیل قاوەچی و عەبود سەلمان. تا ناوەندی ساڵی ۱۹۳۱، واتا لە ماوەی دەوروبەری دە مانگدا، ئەو دوکان و ماڵ و دەزگایانەی شاری هەولێر کە کارەبایان راکێشا ژمارەیان گەیشتە ۱۲۵، لەوانە، بە وێنە، حاجی رەشید ئاغای ڕەمیس کە پاش پێنج رۆژ لە دەستبەکارکردنی ئاشی ئەلکتریکەکە کارەبای ڕاکێشایە ماڵی خۆی، شەهاب چەلەبیش ڕۆژی شازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۳۰ ماڵەکەی کردە چراخان، هەر ئەو رۆژەش یانەی فەرمانبەرانی هەولێرو ماڵی زەکی ئەمین ئەفەندیی بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندیی شار کارەبایان وەرگرت. **هەرچی حاجی شەریف خەلیل دۆغرەمەچییە**، کە باوکی دوکتۆر هاشم دۆغرەمەچی و ئەندازیار محەمەد دۆغرەمەچییەو ناوی چەند جارێک لەم وتارەدا دووپات دەبێتەوە، رۆژی بیستو حەوتی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۳۰ کارەبای ڕاکێشاوەتە ماڵی خۆی. یەکێکی وەک داود ئاغای سەعید ئاغا دووهێڵی ڕاکێشاوە، **یەکەمیان** رۆژی دوازدەی شوباتی ساڵی ۱۹۳۱ بۆ محەلەکەی و

**دووەمیشیان** پاش سێ ڕۆژ بۆ ماڵەوەی. لەو ڕۆژانەدا ڕەفیق حیلمی مامۆستای ناوەندی دەبێت لە هەولێر، ئەویش ڕۆژی یەکی تەمموزی هەمان ساڵ کارەبا وەردەگرێت[٣].

**هەڵبەت دامەزراندنی ئاشی ئەلەکتریک لە گشت ڕوویەکەوە هەنگاوێکی ژیاریی گەورەبوو بۆ ژیانی هەولێرو هەولێرییەکان**، بەڵام ئەوساکە نرخی کارەبا بەنیسبەت کەمدەرامەتیی خەڵکییەوە زۆر بەرز بوو، کیلۆواتێکی لە هەولێر بە ده عانە، واتا بە چل فلس بوو، کەچی لە بەغدا کە کارەباکەی بەدەست کۆمپانیایەکی ئینگلیزییەوە بوو نرخی حەوت عانە، واتا بیستو هەشت فلس بوو. لە سلێمانی سەرەتا، واتا کۆتایی بیستەکان، نرخی کیلۆ واتێک دوازدە عانە **(چل و هەشت فلس)** بوو، بەڵام زۆری نەبرد کە نرخی کرایە هەشت عانە **(سی و دوو فلس)**. بێ گومان ئەوە یەکێک بوو لەو هۆیانەی ژمارەی ئەوانەی لە هەولێر کارەبایان وەرگرت نەدەگەیشتە نیوەی ئەوانەی کەرکوک، یا لە سلێمانی کارەبایان وەرگرتبوو.

هەرچۆن بێت لە هەموو لا خەڵکی نرخی کارەبایان پێ بەرزبوو. لە بەغدا ئەو ناڕەزاییە سەرئەنجام بووە هۆی تەقینەوەی مانگرتنێکی بەرفراوان کە ڕۆژی پێنجی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٣ دەستی پێ کردو ماوەی چەند ڕۆژێک کەس نە لەناو ماڵدا، نە لە دوکان و کارگەکاندا کارەبای بەکار نەدەهێنا **تا میری بە زەبری کوتەک ئەو بزووتنەوەیەی دانەمرکاندەوەو ڕابەرانی بۆ شاری سلێمانی دوورنەخستنەوە**[٤].

ئەو مانگرتنەی بەغدا لاپەڕەیەکی بایەخدارە لە مێژووی هاوچەرخی عیراقداو تا ئێستا بە ڕوداوێکی تاقانەو بێ هاوتا لە ناو تۆماری ئەو مێژووەدا لەقەڵەم دراوە. **کەچی لە ڕاستیدا، بەپێی بەڵگەنامە بڵاونەکراوەکانی خودی وەزارەتی کاروباری ناوخۆی عیراق، بەر لەوە بە نزیکەی دووساڵ و نیو لە هەولێر مانگرتنێکی لەو جۆرە سازکراوە کە دەبێت پایەو مەقامی یەکەمی پێ بدرێت لەناو لاپەڕەکانی ئەو تۆمارەدا.** لە سەرەتای ساڵی ١٩٣١وە هەولێرییەکان لەناو خۆیاندا کەوتنە مقۆ مقۆو توانج تێگرتن لەسەر نرخی کارەبا، تایبەت لەو ڕۆژانەشدا گرانی بە جارێک

---

(3) Ibid, List of Electric Consumers Past and Present, pp. 1-2.

(٤) بۆ باسی ئەو مانگرتنە بڕوانە: **عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية**، الطبعة السابعة، دار الشؤون الثقافية العامة،الجزء الرابع، بغداد، ١٩٨٨، ص١٠-١٢.

باڵی بەسەر دونیادا کێشابوو. تا ناوەندی ئەو ساڵە نارەزایی هەولێرییەکان نە بوارەدا گەیشتە ئاستی بزوتنەوەیەکی رێکخراو کە نوێنەرانی گشت دەستە چینەکانی ناوشار تێیدا بەشدار بوون، چونکە کەم کردنەوەی نرخی کارەبا سەرنەجـ لەگەڵ بەرژەوەندی ئەو رەشو روتانەشدا دەگونجا کە هێشتا لەناو ماڵدا قوتیمە فانۆسیان بەکاردەهێنا نەک کارەبا. **بەڵام بەرانبەر بەوان هی واش هەبوو دەیانویست بۆ خۆیان جێگەی ئەحمەد چەلەبی دەباغ بگرنەوە، یان هەر ناحەزی ئەو بنەماڵەیە بوون بۆیەکا بە گەرمی تێکەڵی بزوتنەوەکە بوبوون.**

لە ناوەندی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٣١وە ژمارەیەک کاسبکاری هەولێری دەستیان لە بەکارهێنانی کارەبا هەڵگرت. یەکەم کەس لەم بوارەدا **محەمەد ئەحمەدی چایچی** بوو کە لە رۆژی پازدەی ئەو مانگەوە کارەبای لە چایخانەکەی خۆی بری. پاش نزیکەی دوو حەفتە وەستا ئاکۆیی پێڵاودروو وەستا خەلیی سەعاتچی و سەرداود محەمەدی چایچی و جوبرائیل ناوێک لاساییان کردەوە ئەوانیش پێکرا کارەبایان لە دوکانەکانی خۆیان بری[٥].

تا دەهات ئەو بزووتنەوەیە پتر پەرەی دەسەند. پارێزگاری هەولێر بۆ یەکەم جـ لەو نامە نهێنییەیدا کە رۆژی بیستی تەموزی ساڵی ١٩٣١ ناردوویە بۆ وەزیری کاروباری ناوخۆ باسی ئەوەی کردووە چۆن **«پازدە بیست کەسێک لە کاسبکاران مانگرتنێکیان ساز کردووە»**[٦]. لە رۆژی چواری ئابەوە ئەو بزووتنەوەیە دەبێتە مانگرتنێکی گشتی بەوەی پەنجاو سێ کەس بەجارێک کارەبا لە ماڵ و دوکان و چایخانەکانی خۆیان دەبڕن. مانگرتنەکە بە کاسبکارانی ناو بازاڕەوە نەوەست **بەڵکو هەمان کات ژمارەیەک لە گەورە پیاوان و رووناکبیرانی شار بەشداریی تێیدا کرد،** لەوانە مامۆستا رەفیق حیلمی و بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندی زەکی ئەمین و محەمەد دۆغرەمەچی و داود ئاغای سەعید ئاغا. **جگە لە مامۆستایانی** قوتابخانەکان ژمارەیەک لە فەرمانبەرانیش بەشداریی مانگرتنەکەیان کرد، **کەمـ** ئەفەندی پشکنەری پۆست و تەلەفۆنی شار یەکێک لەو فەرمانبەرانە بوو، ئەویش نە

---

(٥) List of Electric Consumers..., pp. 1-2.

(٦) م.و.د.، الملف السابق، ص٦.



**مۆرەکانی سەر سکاڵانامەکە**

ڕۆژی دەی تەمموزی ساڵی ١٩٣١وە کارەبای لە ماڵی خۆی بڕی. مەلا فەندیش لایەنگر بوو، **تایبەت چونکە دانوی لەگەڵ عەبدولحەمید بەگی پارێزگارو جەمال رەفعەتی مودیری تەحریراتدا نەدەکوڵا**، ئەو کارەبای ڕانەکێشابوو بەڵام موحسین ئاغای خوشکەزای، کە بەڕێوەبەری شارەوانی بوو، لە ڕۆژی چواری ئابەوە بەشداریی لە مانگرتنەکەدا کرد. بەپێی گێڕانەوەی بەڵگەنامەکان مەلا فەندی زۆر جاران لە

باداواوه ئۆتۆمبیلی تایبەتیی خۆی دەنارد بەدووی رابەرانی مانگرتنەکەدا. دوایی جەعفەر ئەبولتمەنیش لە بەغدا بە هەمان دەستوور پێوەندیی هەبوو بە رابەرانی مانگرانی بەغداوەو ئەویش یەکێک بوو کە هەر لە سەرەتاوە کارەبای لە ماڵی خۆی بری.

**شایانی باسە مانگرانی هەولێر، تایبەت چایچییەکانی ناوشار، بڕیاریان دا لە رۆژانی مانگرتنەکەدا گرامافۆنیش بەکار نەهێنن، ویستیان لەو رێگەیەوە پتر سەرنجی هەموو لا بەلای بزوتنەوەکەیاندا رابکێشن. بەو جۆرە ناو بازار خامۆش بوو، دوای ئەوەی جاران لە هەر چوارلاوە، تا درەنگە شەوانێ دەنگی قەوان ناڵەی دەهات.**

تا ئەو دەورووبەرە دروشمی مانگرانیش قاڵبی تەواوی خۆی لە سێ خاڵی سەرەکیدا وەرگرت، کە ئەمەی لای خوارەوە پوختەیانە:

**١- داشکاندنی نرخی هەر کیلۆواتێکی کارەبا لە دە عانەوە بۆ چوار عانە، یا هیچ نەبێت بۆ شەش عانە، واتا لە چل فلسەوە بۆ ١٦، یا ئەو پەڕەکەی بۆ ٢٤ فلس.**

**٢- ئەگەر ئەو داخوازییە جێ بەجێ نەکرا ئەوساکە شارەوانی بۆ خۆی مەکینەی کارەبا بهێنێت، یا رێگە بدات خەڵکەکە بۆ خۆیان مەکینە بهێنن، یا هەردوو لا بە هاوبەشی.**

**٣- گواستنەوەی مودیری تەحریرات جەمال رەفعەت[٧] کە بە چاوساغ و لایەنگری ئەحمەد چەلەبی دەباغیان دادەنا.**

ناوەندی ئابی ١٩٣١، واتا لە گەرمەی رۆژانی مانگرتنەکەدا، نوری سەعیدی سەرەک وەزیران هاتە سەردانی هەولێر، رابەرانی مانگرتنەکە ئەوەیان بە هەل زانی و رۆژی پازدەی ئاب سکاڵانامەیەکی دوورودرێژیان بۆی ئامادە کردو بۆ رۆژی داهاتوو دەستەیەکی هەڵبژاردە سکاڵانامەکەیان پێشکەش بە نوری پاشا کرد. سکاڵانامەکە ناوی ٤٤٨ کەسی بەسەرەوەیە، ٣٨٠ کەسیان مۆرو ٦٨یشیان ئیمزایان کردووە.

---

(٧) رەفعەت ئەفەندی باوکیشی لە شارەوانی هەولێر فەرمانبەر بوو، دەڵێن بە ئەسڵ حەڵەبین. هەردووکیان لێهاتوو بوون.

بەشێک لە ئیمزاکان هی دیان و جووەکانی شارن. ناوەرۆکی سکاڵانامەکە خۆیشی بریتییە هەر لەو سێ داخوازییەی لە سەرەوە باسیانمان کرد[٨].

ئەم هەوڵ و کۆششەی هەولێرییەکان هیچی لێ سەوز نەبوو، تایبەت لەبەر ئەوەی عەبدولحمید بەگی پارێزگار بە توندی دژی مانگرتنەکە وەستاو لە هەموو رووییەکەوە لایەنی جەمال رەفعەت و ئەحمەد چەلەبی دەباغی دەگرت. لەوەیش بەولاوە ئینگلیزەکان بایەخێکی زۆریان بەو مانگرتنەی هەولێر دا، دەقی سەرجەمی سکاڵانامەو داخوازێکانی مانگرەکانیان کردە ئینگلیزی و بەوردی لێیان کۆڵینەوە. تەنها ئەو راپۆرتە نهێنییەی میستەر لاینی پشکنەری کارگێڕی کەرکوک و هەولێر رۆژی سێی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣١ دەربارەی مانگرتنەکەی هەولێر ناردوویە بۆ ئەدمۆندسی راوێژکاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆ لە بەغدا بریتییە لە هەشت لاپەڕەی قەوارە گەورە[٩]. ئینگلیزەکان پێیان وانەبوو ئەو جۆرە بزووتنەوەیە بۆ شارێکی وەک هەولێر هەروا کارێکی ئاسایییە. لە راپۆرتێکی نهێنی خۆیاندا لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٣١دا لەو بارەیەوە نووسیویانە دەڵێن:

**«داخوازییەکی لەو بابەتە**(واتا داوای داشکاندنی نرخی کارەبا لە رێگەی مانگرتنەوە) **بە گشتی دیاردەیەکی نائاساییە بۆ شوێنێکی وەک هەولێرو نیشانەی ئەوەیە کە جۆرە بزووتنەوەیەکی رێکخراوی گێرە شێوێن لە ئارادایە»**[١٠]. ئەم تێبینییە بۆ رۆژگاری خۆی بایەخی تایبەتیی هەیە، رەنگبێ بەنیسبەت هەولێرەوە یەکەم ئاماژەی لەو بابەتە بێت بۆ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی سیاسیی رێکخراو بە نهێنی.

مانگرانیش دەستیان هەڵنەگرت، ئەمجاریان رۆژی بیستو حەوتی ئاب دوو سکاڵانامەی تریان نارده بەغدا، یەکێکیان دیسانەوە بۆ نوری سەعیدی سەرەک وەزیران، ئەوی تریشیان بۆ موزاحیم پاچەچی وەزیری کاروباری ناوخۆ. سکاڵانامەی

---

(٨) م. و. د.، الملف السابق، من متصرفية لواء أربيل الى وزارة الداخلية ببغداد، الرقم١٣٢/س/سري، التأريخ ٢٦ آب ١٩٣١، الموضوع: تقديم صورة مضبطة، ص ٤-٦.

(9) Office of the Adm. Insp., Arbil and Kirkuk, Confidential, No. C/389, 3rd Oct. 1931, pp. 1-8.

(10) Ibid, p.3, Extract from Confidential Report on the Arbil and Kirkuk Liwas for the month of August, 1931, Arbil Town.

ئەمجاریان ئیمزاو مۆری ٥٠٥ کەسی پێوەیە، واتا ٥٧ کەس پتر لەوانەی سکاڵانامەی یەکەمیان دایە نوری سەعید لە هەولێر، ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەی سووربوونی کاسبکارانی هەولێرە لەسەر داخوازییەکانیان. وا دیارە رابەرانی مانگرتنەکە ئەمجاریان وێنەی هەردوو سکاڵانامەکەیان داوەتە رۆژنامەکانی بەغداش، چونکە رۆژنامەی **«العراق»** دوو جاران لەو رۆژانەدا بەتایبەتی باسی سکاڵانامەی دانیشتوانی هەولێری کردووە[١١].

هەردوو سکاڵانامەکە بە خەتێکی جوان و رێکوپێک نووسراونەتەوە، لە رووی ناوەرۆکەوە هێمن و لەسەرخۆن، عەرەبییەکەشیان هەرچەندە بێ هەڵە نییە، بەڵام بەگشتی مستەواکەی باشە. پوولێک وا بە دامێنی هەر یەکێکیانەوە کە نرخی یەک روپێ، واتا ٧٥ فلسە، **هەردوو پوولەکەش مۆری حاجی شەریفی دۆغرەمەچییان بەسەرەوەیە کە دیارە لەناو مانگرەکاندا پایەو مەقامی تایبەتیی خۆی هەبووە، بە بەڵگەنامە نهێنییەکاندا وا دیارە دەمراستی مانگرەکان و رابەری بزوتنەوەکەیان بووە**، یەکێک لە بەڵگەنامەکان بە **«سەرۆکی کۆمەڵەی عەتتاران»** ناوی هێناوە. حاجی شەریف بۆ رۆژگاری خۆی پیاوێکی دونیادیدەو وریا و لەناو خەڵکدا رێزدار بووە، ئاگادارانی هەولێر دەڵێن **«عاشقی عەدالەت بووە»**[١٢]. بەپێی بەڵگەنامەکان لە رۆژانی مانگرتنەکەدا کاسبکارانی شار بەسەرپەرشتی حاجی شەریف زوو زوو بە رۆژ کۆبوونەوەی تایبەتییان لە چایخانەکەی عەبۆ سازدەکرد، شەوانیش بۆ هەمان مەبەست دەچوونە قەراغ شار. لێرەدا ناوی کەریم گورجیش هاتووە.

بەپێی ئەو نامەیەی پارێزگاری هەولێر رۆژی ٢٦ی ئابی ساڵی ١٩٣١ ناردوویە بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ جگە لە حاجی شەریفی دۆغرەمەچی ئەم چوار کەسەش هاندەری مانگرتنەکە بوون:

**١- مەلا ئەمینی بەقاڵ.**

**٢- یاسینی حاجی ئەلیاسی بەزاز.**

---

(١١) **«العراق»** (جریدة)، بغداد، ١و٨ أیلول ١٩٣١.

(١٢) دیدەنی لەگەڵ دادوەر فەتاح مەحمود حاجی عەبدورەحمان ئاغا، رۆژی دوازدەی مایسی ١٩٩٨.



لەم شوێنە، لە بەرامبەر دەرگاکەی قەڵات، لە خوارەوە مەکینەکەی کارەبا دانرابوو

٣- حاجی یونس ئاسنگەر.

٤- حاجی محەمەد قەرۆکی ئاسنگەر(١٣).

زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی دوو سکاڵانامە تازەکەیان مۆر، یا ئیمزا کردووە بریتین لە عەتتارو بەقاڵ و بەزاز و ئاسنگەرو سەرتاش و دارتاش و چایخانەچی و خەفاف و قەصاب و چێشتخانەچی و دوکاندارو کاسبکاری تر، بەڵام، هەمان کات، ژمارەیەک لەوانەش کە پێیان دەگوتن پیاو ماقووڵ و ئەفەندی داویانەتە پاڵیان و هەردووک سکاڵانامەکەیان ئیمزاکردووە، وەک حاجی عومەر مستەفا و ساڵحی سۆفی بەگ و محەمەد و وەهابی شێخۆو نادر عەبدولقادری باوکی فایق و دوکتۆر نامیق و دوکتۆر تەحسین و پارێزەر طەلعەت نادر.

نوری سەعید هیچی نەکرد لەوە بەلاوە کە داوای لە پارێزگاری موسڵ کرد جەلال بابان بنێرێت بۆ هەولێر بۆ تۆژینەوەی سەرجەمی کێشەکە، وا پێ دەچێت نوری سەعید ویستبێتی ئەو کارە راسپێرێتە فەرمانبەرێکی کورد، بۆیەکا لەناو هەمواندا جەلال بابانی پێشنیار کردووە کە ئەوساکە پشکنەری کارگێری **(مفتشي اداري)** موسڵ بووە. بەڵام سەرئەنجام کارەکە خرایە ئەستۆی پشکنەری کارگێری هەولێر و

---

(١٣) م. و. د.، نفس الملف السابق، من متصرفية لواء أربيل الى وزارة الداخلية ببغداد، الرقم١٣٢/س/سري، التأريخ ٢٦ آب ١٩٣١، الموضوع: تقديم صورة مضبطة، ص٦.

کەرکوک کە ئەوساکە میستەر لاین بوو، لاین لە کەرکوک دادەنیشت و جارویار سەری هەولێری دەدا[١٤].

هەڵوێستی وەزیری کاروباری ناوخۆ بە جۆرێکی تر بوو. ئەوساکە، وەک وتمان. موزاحیم پاچەچی وەزیری کاروباری ناوخۆ بوو، پاچەچی سیاسەتمەدارێکی هەلپەرست و توندڕەو بوو. بەرلەوەی ببێتە وەزیری کاروباری ناوخۆ یەکێک بوو لە رابەرە ناسراوەکانی **«پارتی نیشتمانی»** (الحزب الوطني) کە نیشتمانپەروەری گەورە جەعفەر ئەبولتەمەن سەرۆکی بوو، پاچەچی لە هەمووان رەقتر دژی بەستنی پەیمانی ساڵی ١٩٣٠ی نێوان عیراق و بەریتانیا وەستا، بەڵام نوری سەعید کە چاک لە دیوی ناوەوەی ئەو جۆرە کەسانە تێدەگەیشت بە ئاسانی بەلای خۆید رایکێشا بەوەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣١ کردییە وەزیری کاروباری ناوخۆ.

هەڵبەت سیاسەتمەدارێکی وا هەلپەرست **«دڵسۆزیی»** خۆی لە ئاستی گەل و نیشتماندا بە کورد تاقی دەکاتەوە، لەبەر ئەوە سەیر نییە پاچەچی ویستی دەستوبرد کۆتایی بە مانگرتنەکەی هەولێر بهێنرێت، هەرچەندە هەولێرییەکان لە خودی ئەو سکاڵانامەیەشدا کە دابوویانە ئەو چەند جارێک زۆر بە نەرمونیانی باسی دڵسۆزیی خۆیانیان بۆ میری تۆمارکردبوو. لەگەڵ ئەوەش پاچەچی بە نامەیەکی نهێنی داوای لە پارێزگاری هەولێر کرد بە رەقی رەفتاری مانگرانی ئەو شارە بکات. ئەمەش دەقی نامەکەیەتی:

**«بۆ پارێزگاری هەولێر، نهێنی**

**ژمارە: س/ ٢٦٨٧**

**رۆژ: ٣١ی ئابی ١٩٣١**

**نیشانە بەنامەی ژمارە ١٣٢ی رۆژی ٢٦ی ئابی ١٩٣١تان. ئێمە گشت تێبینییەکانتانمان رەچاو کردو پێتان رادەگەیێنین کە چاو لە هیچ جۆرە بزووتنەوەیەک، یان هەنگاوێک ناپۆشین ببێتە هۆی جۆرە بزووتنەوەیەک، یان لاوازکردنی دەسەڵاتی میری، تکامان وایە بایەخی تەواو بدەن بەم لایەنە، ئیمزا:**

---

(١٤) الملف نفسه، ص١٠.

(١٥) الملف نفسه، ص٧.

**وەزیری کاروباری ناوخۆ**[15].

لەبەر رۆشنایی ناوەرۆکی ئەم نامەیەدا کاربەدەستانی هەولێر کەوتنە خۆ، فشارێکی زۆریان خستە سەر مانگرانی شارو دەستیان کردە ئامادەکردنی سکالانامەی ساختە دژیان و بۆ پشتگیری کردن لە جەمال رەفعەت، پۆلیس نزیکەی دە کەسیشیان راپێچ کرد بۆ تەحقیق لەگەڵیاندا. لەگەڵ ئەوەش بێنەوبەرەی ئەو کێشەیە تا دەوروبەری کۆتایی ساڵی ١٩٣١ درێژەی کێشاو تا دەهات ئاڵۆزتر دەبوو. مانگران سووربوون لەسەر داواکانیان، رۆژی نۆی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣١ دوو بروسکەی تریان نارده بەغدا، **یەکەمیان** بۆ نوری سەعید و **دووەمیان** بۆ موزاحیم پاچەچی، **ئەمجارەیان بروسکەکەنیان لە کەرکوکەوە نارد نەک لە هەولێرەوە، وا دیارە ترسی ئەوەیان هەبووە نەبا بروسکەکان لە هەولێرەوە نەگەنە شوێنی مەبەست.** هەردوو بروسکەکە بەم ناوانەوە لێدراون: لە بریتی دەستەی(صنفی) قەتارچی مەلا محەمەد، لە بریتی دەستەی خەفافەکان مەلا خضر، لە بریتی دەستەی بەرگدرووان حاجی عەلی، لە بریتی دەستەی عەتتارەکان حاجی شەریفی دۆغرەمەچی، لە بریتی دەستەی گۆزەچییەکان سۆفی ئیسماعیل، لە بریتی دەستەی سەرتاشەکان عەبدولوەهاب، لە بریتی دەستەی زیندرووەکان عومەر دای، لە بریتی دەستەی کوڵهەڵگران(**حەماڵەکان**) عیزەدین، لە بریتی دەستەی ئاسنگەران حاجی یونس، لە بریتی دەستەی مزگەران حاجی کەریم، لە بریتی دەستەی ناڵبەندان عەبدوڵلا، لە بریتی دەستەی دەلالان محەمەد فارس، لە بریتی دەستەی قەصاب داود ئاغا، لە بریتی دەستەی لبادکەران شێخ یونس، لە بریتی دەستەی دارتاشان فیض الله، لە بریتی دەستەی نانەوایان محەمەد صالح، لە بریتی جووەکان صالح یوسف نوری.

ئەمانە لە بروسکەکەیاندا دوو تەقەلا بێ سودەکەیان وەبیر سەرەک وەزیران و وەزیری کاروباری ناوخۆ هێناوەتەوەو بە ناوی **«سەرجەمی کاسبکاران و کرێکارانی هەولێرەوە»** داوایان لێ کردوون عەدالەت فەرامۆش نەکەن و داخوازییەکانیان جێ بەجێ بکەن و رادەیەک بۆ فشارو دەسدرێژی کاربەدەستانی میری دابنێن.

دیسانەوە نوری سەعید هیچی نەکرد لەوە بەولاوە کە ئەویش دەقی بروسکەکەی

لەگەڵ نامەیەکی تایبەتیدا نارد بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ، تەنانەت نامەکەیش ئیمزای سکرتێری ئەنجوومەنی وەزیرانی بەسەرەوەیە نەک ئیمزای نوری پاشا خۆی[١٦].

**بەڵام هەر لەو ڕۆژانەداو لەبەر هەر هۆیەک بێت نارەزایی گەیشتە دەشتودەری هەولێریش**، ڕۆژی یازدەی تەشرینی دووەم، واتا تەنها دوو ڕۆژ دوای بروسکەکانی کاسبکارانی شار، ئەم سەرەک هۆزانەش، دژی پارێزگاری هەولێر، بروسکەیەکی تایبەتییان ئاراستەی نوری سەعید کرد: سەرۆکی میر یوسفی خۆشناو صالح بەگی میران و سەرۆکی گەردی جەمیل ئاغا و سەرۆکی کوڕێ مەجید ئاغا و سەرۆکی میر مەحمەلیی خۆشناو قادر بەگی میران، جگە لە ئاغایانی دزەیی خورشیدی بایز ئاغا و حسەین ئاغای مەلاو سلێمان ئۆمەر ئاغاو ڕەسوڵ محەمەد صادق ئاغا.

سەر ئەنجام میری ناچار بوو لە کەلی شەیتان بێتە خوارێ و جەمال ڕەفعەت لە هەولێر رابگوێزێت و ئەحمەد چەلەبی دەباغیش ناچار بکات دوو عانە لە نرخی هەر کیلۆواتێکی کارەباکەی دابشکێنێت. بەو جۆرە مانگرتنەکەی هەولێر کۆتایی هات. ئەو مانگرتنەی لە هەموو ڕوویەکەوە هیچی لە مانگرتنە بەناوبانگەکەی بەغدا کەمتر نییە، بەڵکو لەبەر سێ هۆی بایەخدار تەرازووی مێژوو بەلای ئەودا دەشکێتەوە، **یەکەمیان** دەستپێشکەری کردنی هەولێرییەکانە لەو بوارەدا. **دووەمیشیان** کۆڵنەدانی مانگرانی هەولێرە لە ماوەی شەش مانگی ڕەبەقدا، لەگەڵ وەدی هێنانی بەشێک لە داواکانیان، **بەرانبەر دامرکاندنەوەی کتوپڕی مانگرتنەکەی بەغدا کە لە ڕاستیدا هیچی ئەوتۆی لێ سەوز نەبوو**، ئەو مانگرتنەی هەر لە سەرەتاوە ڕۆژنامەکانی بەغدا ناویان لێ نا **«ڕۆژی شانازی نیشتمانی»**[١٧].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە چاو لەوە نەپۆشین کە لەو ڕۆژانەدا هەندێک دەست لە ژێرەوە، بۆ بەرژەوەندی خۆیان، کنەیان دەکرد، جەمال ڕەفعەتیش کارگێڕێکی دەست خاوێن و لێهاتوو بوو، بەڵام زۆر بەخۆی دەنازی، **ئەحمەد چەلەبی دەباغیش**

---

(١٦) الملف نفسه، ص٢٥-٢٦، ديوان مجلس الوزراء، بغداد، الرقم ٤١٢٨، التأريخ ٩ تشرين الثاني ١٩٣١.

(١٧) بۆ نموونە بڕوانە: **«العالم العربي»** (جريدة)، بغداد، العدد ٢٩٨٦، ٢ كانون الاول ١٩٣٣.



**قەسری باداوە لە هەولێر ساڵی ١٩٣٩**
**مەلا ئەبو بەکر ئەفەندی لەناوەڕاست راوەستاوە بەڕێزان فەتاح خۆشناو محەمەد نەقیب یونس عومەر و کەسانی دیکە دیارن، لە دانیشتووەکانیش عزەدینی مەلا فەندی و حەمید حەسونەو کەسانی دیکە دیارن**



**نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧ ناودارانی شاری هەولێر، ئەحمەد چەلەبی دەباغ، شەهاب چەلەبی دەباغ و کەسانی دیکە دیارن**

**خزمەتێکی گەورەی هەولێری کرد بەوەی مەکینەی کارەبای بۆ هێنا**، بەڵام ئەویش دەبوو باری سەختی رەشوڕوتی هەولێر فەرامۆش نەکات، هەرچەندە بەپێی دەفتەری تایبەتیی خۆی پرۆژەکەی زەرەری دەکرد نەک قازانج، بەڵام وایێ دەچێت وانەبوبێت. چونکە کە نوری سەعید هاتە هەولێر بە گەرمی داوای لێ کرد ماوەی ئیمتیازەکەی لە ٣ ساڵەوە بۆ بکەنە ٢٥ساڵ، بەپێی یاسای نەگۆڕی ئابووریش هەر پرۆژەیەک زیان بکات دادەخرێت نەک بەپەرۆشەوە کۆشش دەکرێت بۆ درێژەپێدانی بەو رادەیە.

**هەرچۆن بێت مانگرتنی کاسبکارانی هەولێر لە ساڵی ١٩٣١دا لاپەڕەیەکی بایەخداری ونی مێژووی هاوچەرخی کورد و عیراقە.**

# لاپەڕەیەکی ون لە خەباتی دەستەی ڕووناکبیری کوردی عیراق «یانەی سمکۆی شکاک»

**پێشەکی:**

چەند ساڵێک لەمەوبەر بۆ یەکەم جار هەواڵی کۆششی دامەزراندنی **«یانەی سمکۆی شکاک»**م لە بەڕێز دکتۆر عەبدولرەحمان عەبدوڵلا بیست. بەپێی گێڕانەوەکەی ئەو لە ناوەندی سیەکانداو بەر لە کۆدێتاکەی بەکر صدقی ژمارەیەک لە خوێندکارانی کورد هەوڵیان داوە لە بەغدا یانەیەکی ڕووناکبیری کوردی لەسەر شێوازی یانەی **«المثنى»**ی قەومییە عەرەبەکان دابمەزرێنن و هەر هەموویان ناوی سمکۆی شکاکیان بۆی هەڵبژاردووە. بۆ یەکەم جار ئەم زانیارییە دەگمەنە بەکەڵکەم تێکەڵ بە ناوەڕۆکی **نامەی ماجستێری عەبدولئیلا حەمید** کرد کە دەربارەی کێشەی کوردی ئێرانەو من سەرپەرشتکاری بووم، لەوێدا کردومانەتە بەڵگەی هاوچارەنووسیی نەتەوەی کوردو نیشانەی گەورەیی و خۆشەویستی سمکۆ لای هەموو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز[1].

دوای ئەوە کەوتمە عەودالی هەر هەواڵێک، یا هەر زانیارییەک پێوەندی بەمێژووی **«یانەی سمکۆی شکاک»**ەوە هەبێت وەک دیاردەیەکی بایەخدار

---

(*) لە گۆڤاری **«ڕۆشنبیری نوێ»** ژمارە (١٤٣)ی ساڵی ١٩٩٩، لە ل٧-١٢دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) عبدالاله حميد فاضل، القضية الكردية في ايران في ضوء المصادر والمراجع العراقية ١٩٢١-١٩٤٧، رسالة ماجستير غير منشورة، معهد التاريخ العربي والتراث العلمي للدراسات العليا، بغداد ١٩٩٨، ص٦٥ .

لەمێژووی چالاکی هەمەجۆری رووناکبیرانی کوردا. بەداخەوە لە ناو بەڵگەنامە بەریتانیێکاندا هیچم دەربارەی ئەو باسە چنگ نەکەوت، بەڵام خۆشبەختانە لە ئەرشیفی وەزارەتی کاروباری ناوخۆدا کە فایلەکانی رۆژگاری پاشاییان تێدا هەڵگیراوە ئەو فایلەم دۆزیەوە کە گشت بەڵگەنامەکانی بۆ باسی دامەزراندنی ئەو یانەیە تەرخان کراون، تەنانەت لەسەر بەرگی فایلەکە بەکوردی نووسراوە **«یانەی سمکۆی شکاک»**[2]. بەیاریدەی ئەو فایلە دەتوانین مێژووی تەواوی **«یانەی سمکۆ»** تۆمار بکەین.

## هۆ بابەتییەکانی بیرکردنەوە لە دامەزراندنی یانەی سمکۆ

لە کۆتایی بیستەکانەوە بەشێک لە رووناکبیرە تێگەیشتووکانی عیراق هاتبوونە سەر ئەو بیرەی کە ئەوانیش، وەک ئەوروپاییەکان، دەتوانن لەرێگەی یانەو دەستەی رووناکبیرییە تایبەتییەوە رۆڵی خۆیان لە وریاکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵک ببینن. لە سییەکاندا ئەم بۆچوونە تەواو گەیی و بووە هۆی دامەزراندنی ژمارەیەک دەستەو یانەی رووناکبیری چالاکی وەک **«جماعة الاهالي»** کە سەرەتای ساڵی ۱۹۳۲دوای ژانێکی دوورودرێژ لەدایک بوو. ئەم دەستەیەو تایبەت رۆژنامەکەیان کە ئەویش هەر ناوی **«الاهالي»** بوو، تا رادەیەک هەستی ژمارەیەک لە رووناکبیرانی کوردیان راکێشا چونکە بیرتەسک و توندڕەو نەبوون، بەراستی دیوکراسیخواز بوون و ئەگەر ئاوڕیان لەمەسەلەی کورد بدایەوە لەوانەبوو لە کوردستانیشدا جێ پێی خۆیان بکەنەوە، بەڵام ئەوان ئەوساکە هێشتا نەگەیشتبوونە ئەو ئاستەی بتوانن بەوردی و دروستی مەسەلەی ئاڵۆزی نەتەوەیی هەڵسەنگێنن. عەبدولفەتاح ئیبراهیم، کە ڕابەرێکی دووربینی **«الاهالي»** بوو، ئیمڕۆ بێ سێ و دوو دان بەو راستییەدا دەنێت[3]. هەرچۆن بێت دەستەی **«الاهالي»** لەهەموان لە کوردەوە نزیکتر بوون، هەر ئەوانیش بوون کەدوای ئاڵوگۆڕێکی دوورودرێژ بوونە

---

(۲) ملفات وزارة الداخلية (م.و.د.)، المكتب الخاص، ۱۹۳۵، رقم الملف:۳۷/٤۱، موضوع انفك الجمعيات و النوادي، نادي سمكو شكاك.

(۳) دیدەنی لەگەڵ عەبدولفەتاح ئیبراهیم رۆژی یازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۹۸ .



«پارتی نیشتمانی دیموکراسی» (الحزب الوطني الديمقراطي)کە کامیل جادرچی بناوبانگ سەرۆکی بوو[٤].

٢٤ی تشرینی یەکەمی سالی ١٩٣٤ «یانەی خامە» (نادی القلم) لە بەغدا

(٤) بۆ درێژەی مێژووی ئەو دەستەیە بڕوانە: فؤاد حسن الوکیل، جماعة الاهالي في العراق، بغداد- ١٩٧٩.

لەلایەن دەستەیەک ڕووناکبیری ناسراوی وەک محەمەد ڕەضا شەبیبی و محەمەد باقر شەبیبی و مێژوونووس عەباس عەزاوی و ئیبراهیم حیلمی و ڕەفائیل بەطی و دوکتۆر مەتی عەقراوی و چەند کەسانێکی تری وەک ئەوان دامەزرێنرا. ئەم یانەیە لە هەر شت پتر بایەخی دەدا بە ئەدەب و پێوەندی نێو ڕووناکبیران خۆیان[٥]. هەر چەندە ئەم یانەیەش هیچ جۆرە ئاوڕێکی لە ژیانی روناکبیری کورد نەدایەوە، بەلام دامەزراندنی و جۆری کاری و ئەو نامیلکانەی بلاویکردونەوە تا رادەیەک سەرنجی ڕووناکبیرانی کوردیان ڕاکێشا، جگە لەوەی شاعیری گەورەی عەرەبی بەڕەگەز کورد جەمیل صدقی زەهاوی بە یەکەم سەرۆکی **«یانەی خامە»** هەلبژێردراو ئەو ساکەش زەهاوی سووکە پێوەندییەکی لەگەل **«یانەی سەرکەوتنی کوردان»**دا هەبوو.

شوباتی سالی ١٩٣٥یش دەستەیەک ڕووناکبیری نەتەوەپەرستی وەک صائیب شەوکەت و فەهمی سەعید و دەروێش مەقدادی و دوکتۆر خالد هاشمی داوی دامەزراندنی **«یانەیەکی ڕووناکبیری وەرزشی»**یان کردو ناوی **«المثنى بن حارثة الشيباني»**یان بۆ هەلبژارد کە سالی ٦٢٥ لە شەڕی بوەیبدا، لە نزیک ڕووباری فوراتەوە لەشکری فارسی شکاند. پاش چەند مانگێک وەزارەتی کاروباری ناوخۆ ئەو داوایەی پەسەند کردو بەو جۆرە یانەی **«المثنى»** زۆر بە گورجوگۆلی هاتە مەیدانەوە، یەکسەر دەستیکردە بلاوکردنەوەی چەند نامیلکەیەکی بە هەستی نەتەوەیی جۆشدارو، جگە لەوەی لە ئابی سالی ١٩٣٦وە کەوتە بلاوکردنەوەی گۆڤاری **«المثنى بن حارثة الشيباني»** کە سەرجەمی وتارەکانی زۆر بەسۆزەوە بۆ هاندانی هەستی نەتەوەیی تەرخان کرابوون[٦]. **«یانەی المثنى»** زۆر بایەخی دەدا بەیەکگرتنی عەرەب و کێشەی فەلەستین کە ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات ئالۆزتر دەبوو[٧].

**«یانەی المثنى»** نەک هەر هیچ ئاوڕێکی دۆستانەی لەکورد نەدایەوە، بەلکو

---

(٥) بۆ درێژەی مێژووی ئەو یانەیە بڕوانە: **«نادي القلم العراقي. مجموعة نادي القلم العراقي»**. المجموعة الاولى، بغداد ١٩٣٨ .

(٦) بۆ درێژەی مێژووی **«یانەی المثنى»** بڕوانە: **عماد احمد الجواهري،نادي المثنى وواجهات التجمع القومي في العراق ١٩٣٤-١٩٤٢، بغداد١٩٨٤ .**

(٧) دەربارەی هەلوێستی **«یانەی المثنى»** بەرانبەر کێشەی فەلەستین بڕوانە: **الدكتور عباس عطية جهار، العراق والقضية الفلسطينية ١٩٣٢-١٩٤١، بغداد،١٩٨٣، ص٤١١، ٤١٤.**

هەمان کات زۆریەی رابەرانی بەرانبەر بە کورد تەواو شۆڤینی و کوردنەویست بوون، لەگەڵ ئەوەشدا دڵسۆزییان بۆ نەتەوەی خۆیان و جۆری کارکردنیان سەرنجی رووناکبیرانی کوردیان راکێشا، تایبەت ئەوانەی کە لە بەغدا دەیانخوێند. ئەو رووناکبیرانە دەستەیەکی وەک **«الاهالی»**، یا یانەیەکی وەک **«یانەی خامە»** و **«یانەی المثنی»** یان بۆ خۆیان، بۆ کورد دەویست.

ئەو دوو نامیلکەیەش کە سەرەتای سییەکان بە ناونیشانی **«یادگاری لاوان»**[^8] و **«دیاری لاوان»**ەوە[^9] بلاوکراونەتەوە جۆرە لاسایی کردنەوەیەکی چالاکییەکانی **«الاهالی»** و **«المثنی»**و ئەوانیترە. هەر ئەوانەیش ئەو دوو نامیلکەیەیان دەرکرد کە دوایی بوونە دەستەی دامەزرێنەری **«یانەی سمکۆی شکاک»**. بۆنی ئەوە لە **«نامیلکەی کۆمەلایەتی»** یەکەی رەفیق حیلمیش دێت کە نووسینی فەیلەسوفی نەتەوە پەرستانی تورکیای نوێ ضیاء گیۆک ئالپی بە رەگەز کوردەو باسی کۆمەڵ و رەوشتی کۆمەلایەتی دەکات[^10].

## هەوڵی دامەزراندنی «یانەی سمکۆی شکاک»

بەو جۆرە بیری حەوت کەس لەو قوتابییە کوردانەی لە بەغدا دەیانخوێند دێتە سەر ئەوەی کە دەبێت ئەوانیش یانەیەکی رووناکبیریی سەربەخۆ بۆ کورد دابمەزرێنن. ئەو حەوت کەسە ئەمانە بوون- ئیبراهیم ئەحمەد و فازیل تاڵەبانی و عارف تاڵەبانی و شاکیر فەتاح و بەهادین عارف کە هەرپێنجیان قوتابیی کۆلێجی یاسا بوون و عەبدولرەحمان عەبدوڵلا کە قوتابی کۆلێجی پزیشکی بوو، لەگەڵ شێخ رەوفی شێخ مەحمود کە لە فێرگەی ئەمریکی لە بەغدا دەیخوێند.ئیبراهیم ئەحمەد خاوەن پێشنیاری پرۆژەکە و هێزی بزوێنی ئەم دەستەیە بوو کە پاش چەند کۆبوونەوەیەکی سەرپێی بریاردەدەن ئەو یانەیەی دەیانەوێت دایمەزرێنن ناوی لێبنێن **«سمکۆی شکاک»**کە برینی کوشتنی بەغەدر لەلایەن رەزا شاوە هێشتا لە ناخی دەرونیاندا سارێژ نەبوبوو.هەمان کات پێوەندی بەرابەرانی **«الاهالی»**ەوە دەکەن و

[^8]: (٨) ساڵی١٩٣٣ لە بەغدا چاپکراوە.
[^9]: (٩) ساڵی١٩٣٤ لە بەغدا چاپکراوە.
[^10]: (١٠) ساڵی١٩٣٤ لە موسڵ چاپکراوە.

ئەوانیش گفتی یاریدەدانیان دەدەنێ. ڕۆژی چواری مارتی ساڵی ١٩٣٥بەئیمزای هەر حەوتیان وەک دەستەی دامەزرێنەر داوایەکی ڕەسمییان پێشکەش بە وەزیری کاروباری ناوخۆ کرد کە ئەوساکە عەبدولعەزیز قەصاب بوو. داواکەیان لە شەش خاڵی سەرەکی پێکهاتوە، یەکەمیان بریتییە لەناوی ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر، دووەمیان ناوی یانەکە، واتا **«یانەی سمکۆی شکاک»**.دەقی خاڵی سێیەم دەڵێت:

**«مەبەستەکانی یانە بریتین لەبڵاوکردنەوەی ڕووناکبیری نەتەوەیی کوردو بوژاندنەوەی گیانی وەرزشی لە نێو لاوانی کورداو کۆشش بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕەوشت و ژیانی کۆمەڵایەتی و زانست لە کوردستان بەتایبەتی و لە عیراق بە گشتی»**(١١).

بە پێی خاڵی چوارەم بەغدا مەڵبەندی یانە دەبێت و بەپێی خاڵی پێنجەم ناوەکانی دەستەی کارگێری پاش هەڵبژاردنی پێشکەش دەکرێن بە وەزارەتی کاروباری ناوخۆ، لە دوا خاڵیشدا دەڵێن وا لەگەڵ داواکەماندا پێڕەوی سەرەکیی یانەکەتان پێشکەش دەکەین. لە ژێریشەوە ئەم تێبینییە نووسراوە: **«یانەکە بەم ناوەوە ناونراوە وەک نیشانەی نەمری یادی ڕابەری کوردی بەناوبانگ سمکۆی شکاک»**(١٢).

## پێڕەوی یانە

پێڕەوی سەرەکیی **(النظام الاساسي)** یانەی سمکۆی شکاک لە نۆزدە بەندی ڕێکوپێکی پێکەوە بەستراو پێکهاتووە کە ئەمە دەقەکەیەتی وەک خۆی بە عەرەبی بڵاوی دەکەینەوە:

النظام الاساسي لـ**(یانەی سمکوی شکاک)**

المادة -١- تالف في بغداد بموجب هذا النظام ناد باسم **«یانەی سمکۆی شکاک»**.

---

(١١) م. و. د.، المكتب الخاص، رقم الملف :٣٧١٤١، موضوع الملف: الجمعيات والنوادي. نادي سمكو شكاك، وزارة الداخلية، شعبة الاوراق، رقم الواردة ٦٤٤٤، التاريخ ١٩٣٥/٣/٤ .

(١٢) م.و.د.، الملف نفسه، الوثيقة نفسها.

مادة -٢- غاية النادي نشر الثقافة الكردية واحياء الروح الرياضية بين الشبان الاكراد والعمل لرفع المستوى الاخلاقي والاجتماعي والعلمي في كودرستان خاصة وفي العراق عامة، **ولا دخل للنادي في السياسة والدين**، ولا يتعاطى فيه اي انواع من انواع القمار والمشروبات الروحية.

مادة -٣- للنادي الحق بامتلاك الاموال المنقولة وغير المنقولة والتصرف بها، وله ما للشخصيات الحكمية من الحقوق حسب القوانين المرعية.

المادة -٤- **يحق لكل شخص عراقي ان يطلب الانتماء الى النادي** اذا توفرت فيه الشروط الاتية:

أ- ان يكون قد اكمل العشرين من العمر.

ب- غير محكوم عليه بجناية او بجنحة مخلة بالشرف.

ج- غير ساقط من الحقوق المدنية.

المادة -٥- يجب ان يقدم طلب الانتماء الى الهيئة الادارية تحريراً، ولايصبح الطالب عضواً في النادي بعد قبوله، ولا يطلب من الهيئة بيان اسباب الرفض، ولا يعتبر عضواً من لم يدفع اجرة الدخول و بدل الاشتراك الشهري مقدماً.

المادة -٦- في النادي هيئتان: **الهيئة العامة والهيئة الادارية.**

المادة -٧-١- **الهيئة العامة:** تتالف من اعضاء النادي الذين سددوا ما عليهم من بدل الاشتراك، وتجتمع في شهر مارت من كل سنة بناء على دعوة الهيئة الادارية تسبق الاجتماع بعشرة ايام على الاقل.

ويعتبر الاجتماع منعقداً عند حصول النصاب، واذا لم يحصل هذا النصاب فيدعى الاعضاء الى اجتماع ثان خلال اسبوع، ويعتبر النصاب حاصلاً في هذا الاجتماع مهما كان عدد الحاضرين .

٢- يتراس المعتمد، او السكرتير اجتماعات الهيئة العامة.

٣- تصدر المقررات من الهيئة العامة باكثرية اراء الحاضرين في الاجتماع.

٤- يبين منهاج الاجتماع في كل دعوة اليه.

المادة -٨- تنظر الهيئة العامة في اجتماعها السنوي في الامور الاتية:

ا- التقرير السنوي الذي ترفعه الهيئة الادارية .
ب- حسابات السنة التي تسبق الاجتماع، وميزانية السنة التي تليه.
ج- انتخاب هيئة ادارية جديدة.
د- الاقتراحات التي ترغب الهيئة الادارية، او اي عضو اخر عرضها على الهيئة العامة.

المادة -٩- تجتمع الهيئة العامة بصورة فوق العادة بقرار من الهيئة الادارية، او بناء على طلب يوقع من عشرة اعضاء فاكثر يقدم الى الهيئة الادارية، وذلك للنظر في الامور المستعجلة التي لايمكن تاجيلها الى الاجتماع السنوي، على ان تنحصر المذاكرة في هذا الاجتماع في الموضوع الذي دعيت الهيئة العامة من اجله.

المادة -١٠-١- **الهيئة الادارية:** تتالف من سبعة اعضاء تنتخبهم سنوياً الهيئة العامة بالتصويت الخفي من بين اعضاء النادي في اجتماعها السنوي.
٢- تنتخب الهيئة الادارية من بين اعضائها معتمداً وسكرتيراً ومحاسباً.

المادة -١١-١- تعقد جلسات الهيئة الادارية برئاسة المعتمد وحضور ثلاثة من اعضائها، وتصدر القرارات منها باكثرية اراء الحاضرين. واذا تساوت الاراء فيرجح الجانب الذي فيه المعتمد.
٢- اذا لم يحضر العضو في الهيئة الادارية ثلاثة اجتماعات متوالية بدون عذر مشروع يعد مستقيلاًمنها، ويخلفه فيها من حاز دونه من الاصوات في الانتخاب السابق، ويجري عين الترتيب في حالة استقالة واحد من اعضاء الهيئة الادارية او فصله من العضوية في النادي .

المادة -١٢- تنظر الهيئة الادارية في طلبات الانتماء الى النادي، وتقرر قبولها او عدمه، وتقوم بادارة شؤون النادي واعماله الاخرى حسب النظام المصرح.

المادة -١٣-١- المعتمد هو الذي يمثل النادي، ويقوم بالمعاملات الرسمية التي تتعلق به، ويشرف على حساباته وادارته، وهو المسؤول عن تنفيذ مقررات الهيئة الادارية والهيئة العامة .
٢- ينوب السكرتير عن المعتمد في كافة اعماله عند غيابه، ويقوم عدا ذالك

بالمراسلات وتنظيم اجتماعات الهيئة الادارية و تحرير محاضرها ويمسك السجلات الاتية:ـ

ا- سجل عام يحتوي على اسماء جميع اعضاء النادي وهوياتهم.

ب- سجل لمقررات الهيئة الادارية.

ج- سجل لقررات الهيئةالعامة.

٣- المحاسب هو المسؤول عن امور النادي المالية، وهو يقوم بمسك دفاتر الواردات ومصاريف النادي، ويمسك سجلاً خاصاً باثاثه، ويحفظ المستندات بجميع المدفوعات والواردات، ويوقع على الوصولات بالنيابة عن النادي على ان يشترك معه المعتمد في التوقيع على الصكوك.

المادة -١٤- مالية النادي تتكون من :ـ

**١- اجرة الدخول، وهي لاتقل عن ربع دينار.**

**٢- بدل الاشتراك وقدره (١٥٠) فلساً.**

**٣- واردات النادي والاعمال التي يقوم بها، والتبرعات التي يقبلها.**

المادة -١٥-١- **على المعتمد والمحاسب ان يودعا اموال النادي في احد المصارف المحلية باسم النادي، وتسحب الاموال بتوقيعهما.**

**٢- لايجوز صرف اموال النادي الا بقرار الهيئة الادارية، عدا المصروفات النثرية التي تحدد مقدارها الهيئة الادارية كلما اقتضى ذلك.**

**٣- لايجوز باي حال الاتجار والمضاربة وغيرها باموال النادي.**

المادة -١٦- على المحاسب ان ينظم ميزانية النادي السنوية حسب تعليمات الهيئة الادارية، ويقدم اليها خلال اول اسبوع من كل شهر بياناً في واردات ومصارف النادي خلال الشهر المنصرم.

المادة -١٧-١- **للهيئة الادارية ان تقرر فصل العضو عند فقدانه احد** الشروط الواردة في **المادة الرابعة من هذا النظام.**

**٢- عند تقديمه طلباً بالانفصال، وقبول هذا الطلب من الهيئة الادارية.**

**٣- عند عدم دفعه بدل الاشتراك الشهري بعد تبليغه بالدفع خلال شهر من تاريخ الاستحقاق.**

**٤- عند قيامه باعمال لا تأتلف مع نظام النادي وسمعته بعد انذاره مرتين من قبل الهيئة لاادارية.**

المادة -١٨- في حالة انحلال النادي تقرر الهيئة الادارية اعطاء ممتلكاته وأمواله الى احدى المؤسسات الخيرية في العراق.

المادة -١٩- يجري تعديل هذا النظام باقتراح من الهيئة الادارية، او بطلب عشرة من اعضاء النادي و موافقة ثلثي الهيئة العامة.

**مادة مؤقتة**

تكون الهيئة المؤسسة هيئة ادارية مؤقتة الى حين انتخاب الهيئة الادارية الاولى.

## هەڵوێستی ڕژێم

هیچ شتێکی نائاسایی، یامەترسیدار بۆ ڕژێم و یەکیەتی نیشتمانی لە ناوەرۆکی ئەم پێڕەوەدا وەدی ناکرێت و گەلێک لە پێڕەوی یانەی **«المثنى»** ئەهوەنترەو زۆر کەمتر لەو بۆنی سیاسەتی لێ دێت، کەچی وەزارەتی کاروباری ناوخۆ سەری دونیای لێ هاتەوە یەک، بەتایبەت دوای ئەوەیش کە لەرۆژی حەڤدەی مارتی ١٩٣٥وە یاسین هاشمی کابینەی نوێی دامەزراندو ڕەشید عالی لەوکابینەیەدا بووە وەزیری کاروباری ناوخۆ، ئەو **دوانەش ڕۆژێک لە ڕۆژان سەرەنجیان بەرانبەر بە کورد چاک نەبووەو بەشێک لە ئوباڵی ئاڵۆزبوونی کێشەی کورد دەکەوێتە ئەستۆی هەردووکیان، هەر چەندە هیچ کامێکیشیان بە ڕەگەز عەرەب نیەو هەن سوورن لەسەر ئەوەی هاشمی لە باوباپیرەوە کوردە[١٣]. بەڵگەنامەیەکی گرنگی ئینگلیزەکان دەڵێت یاسین هاشمی پشتاوپشت خەڵکی کەرکوکەو لەوانەیە بە ڕەگەز سەلجوقی بێت[١٤].**

---

(١٣) یەکێک لەوانە مامۆستا ڕۆژبەیانییە کە کەسوکاری لە نزیکەوە دەناسێت.

(١٤) **«تقرير عن الشخصيات الرئيسة في العراق سنة ١٩٣٥. من السير ارجيبولد كلارك الى مستر ايدن»**، في **«العراق في الوثائق البريطانية سنة ١٩٣٦»**، اختيار وترجمة وتحرير نجدة فتحي صفوة، منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة البصرة، ١٩٨٣، ص٧٨ .



**دوا وێنەی «سمکۆ» کە لە قەراغ شاری (شنۆ) بەر لە کوشتنەکەی بە چەند ساتێ، کە خوسرەوی (کوڕ)ی بە تەنیشتەوەیە.**

وەزارەتی کاروباری ناوخۆ بەر لە هەرشت کەوتە سۆراخی ئەو حەوت کوردەی بە ناوی دەستەی دامەزرێنەرەوە داوای دامەزراندنی یانەکەیان کردبوو، داوا لە تەحقیقاتی جینائی، واتا دایەرەی ئەمنی ئەوسا دەکات زانیاریان لەسەر کۆبکاتەوە، ئەمیش لەوەڵامدا رۆژی ۲٦ی مارت لیستەیەک دەربارەی هەر حەوتیان دەنێرێت بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ کە شتێکی ئەوتۆی تێدانییە تەنها دەربارەی باوکی ئیبراهیم ئەحمەد نەبێت کە بە هاندەری ئەو سکاڵانامانەی داناوە کە ئەوساکە نیشتیمانپەروەرانی کورد زوو زوو رێکیان دەخستن و دەیانناردن بۆ بەغدا، جگە لەوەی دەڵێت **«ئەحمەد بەگی فەتاح زادەی باوکی ئیبراهیم یەکێکە لە هاورێکانی شێخ مەحمودی رابەری کورد»**[١٥].

(١٥) م.و.د.، نفس الملف السابق، ادارة التحقيقات الجنائية المركزية، العدد ش خ/ ١٣٧٣، التاريخ ٢٦ اذار١٩٣٥، الى وزارة الداخلية، الموضوع طلب تاسيس نادي، ص٤-٥ .

بەلام هەرچی بەرێوەبەری گشتیی پۆلیسە لەو یادداشتەیدا کە هەمان رۆژ لەگەڵ ئەم لیستەیەدا ناردوویە بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ نووسیویە دەڵێت:

**«بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ**

**بابەت: داوای دامەزراندنی یانەیەک.**

**نیشانە بە نامەی ژمارە ٤٧٣٤تان کە رۆژی حەوتی مارت ناردووتانە. دوای تەحقیق دەربارەی ئەندامانی «یانەی سمکۆی شکاک» دەردەکەوت کە هەموویان ئەو مەرجە یاساییانەیان تێدایە کە بەندی شەشەمی یاسای دامەزراندنی جەمعیات لە ساڵی ١٩٢٢دا دیاری کردوون، بەلام هەموویان لاوی خوێنگەرم و لە کوردایەتیدا سەرگەرمن و لەوانەن کورد هان ئەدەن بۆ ئەوەی لە دەزگاکانی میریدا[١٦] ئەو شوێنانە وەربگرن کە شایستەیانن و بۆ دامەزراندنی حوکومەتێکی کوردی تێدەکۆشن . لەبەر ئەوەو لەبەر رۆشنایی ئەوەی لەسەرەوە وتمان بە چاکی نازانین رێگە بەو ناوبراوانە بدرێت یانەی ناوبراو دابمەزرێنن. ئیمزا بەرێوەبەری گشتی پۆلیس»[١٧].**

وێڕای ئەوە وەزارەتی کاروباری ناوخۆ یادداشتێکیش دەربارەی هەمان بابەت دەنێرێت بۆ پارێزگاری بەغدا تا ئەویش بیروڕای خۆی نیشان بدات . وەلامی ئەمیان کەمێک دوادەکەوێت، بۆیەکا رۆژی ٢٨ مارت وەزارەت یادداشتێکی وەبیرهێنەرەوە دەنێرێت بۆ پارێزگارو داوای لێدەکات بێ دواخستن وەلامی ئەو یاداشتەی بداتەوە کە رۆژی حەوتی مارت دەربارەی **«یانەی سمکۆی شکاک»** بۆی ناردووە[١٨]. لەگەڵ ئەوەشدا ئنجا پارێزگاری بەغدا تا رۆژی دەی حوزیران وەلام ناداتەوە، لەو رۆژەدا ئەم وەلامەی لای خوارەوە دەنێریت بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ :

**«بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ**

**بابەت : داوای دامەزراندنی یانەیەک**

**نیشانەی بە نامەی ژمارە ٤٧٣٤تان کە رۆژی حەوتی مارتی ١٩٣٥**

---

(١٦) لە دەقی یادداشتەکەدا نووسراوە **«لە ولاتدا»** کە دیارە مەبەست دەزگاکانی میرییە لە ولاتدا.

(١٧) م.و.د.، نفس الملف السابق، وزارة الداخلية، مديرية الشرطة العامة، الى وزارة الداخلية الموضوع :طلب تاسيس نادي، ص٥ .

(١٨) م.و.د.، الملف نفسه، وزارة الداخلية، تذكير، الرقم م.خ / ٥٤٠، في ١٩٣٥/٣/٢٨، ص٦



وێنەی خوسرەوی کوڕی سمکۆ لەگەڵ براکەیداو،
(هرچۆ)ی پیاویان بە تەنیشتەوەیە

ناردوویانە. لەبەر ئەوەی بەندی دووەمی پێڕەوی یانەی ناوبراو دەڵێت کە مەبەستی لە دامەزراندنی «بڵاوکردنەوەی رووناکبیری نەتەوەی کوردە»، وە چونکە بڕگەی پێنجەمی بەندی چوارەمی یاسای جەمعیات رێگە نادات ئەو جۆرە دەزگایانە لەسەر بنەمای نەتەوایەتی دابمەزرێنرێن، بۆیەکا پێشنیار دەکەین ئەو داوایەی لەم بارەیەوە پێشکەش کراوە قەبووڵ نەکرێت. ئیمزا پارێزگاری بەغدا»[19].

لە دامێنی ئەم وەڵامەی پارێزگاری بەغدادا جێگری وەزیر بەخەتی سەوز ئەم

(١٩) م.و.د.، الملف نفسه، متصرفية لواء بغداد، الى وزارة الداخلية، الرقم٩٤٤٢، التاريخ/ ١٩٣٥
٦/١٠، الموضوع: طلب تاسيس نادي، ص٧ .

تێبینییە بۆ رەشید عالی گەیلانی دەنووسێ: «...ئەو برگەیەی پارێزگار باسی کردووە پێوەندی بە کۆمەڵە سیاسیەکانەوە هەیە، لە کاتێکدا لە پێڕەوی یانەی (سمکۆ)دا باسی ئەوە نەکراوە کە ئەو رێکخراوێکی سیاسییە، هەروەها ئەوەشی تێدا نییە کە ئەو رێکخراوێکی سیاسی نییە، لەبەر ئەوە حوکمەت دەتوانێت وای لە قەڵەم بدات کە ئەو رستەیەی باسی «بڵاوکردنەوەی رووناکبیری نەتەوەیی» دەکات لە پێڕەوکەدا لایەنی سیاسیش دەگرێتەوەو بەو جۆرە رێگە نەدات بەدامەزراندنی یانەکە......».

وەزارەتەکەی یاسین هاشمی بەم جۆرە فێڵوفەرەج و تەڵەکەبازییە پرۆژەی دامەزراندنی «یانەی سمکۆی شکاک» زیندە بەچاڵ دەکات. ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری یانەکە بۆ خۆیشیان سەری دونیایان لێ هاتبۆوە یەک ئەگەر هاتو میری رێگەی دامەزراندنی یانەکەیدا ئەوساکە دەبێت ئەوانی بێ دەرامەت کارەکە چۆن مەیسەر بکەن، تایبەت کە پارەدارانی کوردیش ئەوساکە هەموویان پولبەرستی بێ هەستوهۆشی نەتەوەیی بوون و لە «دەستەی الاهالی» بەولاوە کەسێک، یالایەنێک نەبوو ئاوڕیان لێ بداتەوە(٢٠).

هەرچۆن بێت پرۆژەی دامەزراندنی «یانەی سمکۆی شکاک» لاپەڕەکی بایەخدارە لە مێژووی خەباتی رووناکبیرانی کوردی عیراقدا لە ناوەندی سیەکانداو هەڵبژاردنی ناوی سمکۆیش نیشانەیەکی دی هاوهەستی و هاوچارەنووسیی کوردەو رێگە پێنەدانی نیشانەی کورتبینی کاربەدەستانە کە هەر خۆشیان لەو کاتەدا کە «یانەی سمکۆی شکاک» یان قەدەغە کرد رێگەی دامەزراندنی یانەی «المثنی» یان دا بە نەتەوەپەرستانی عەرەب، ئەویش بەپێی بەندە گرنگە نەگۆڕەکانی یاسای «بانێکو

---

(٢٠) دیدەنی لەگەڵ دوکتۆر عەبدولرەحمان عەبدوڵڵا رۆژی چواردەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٧ .
* لەبارەی ئەو وێنەیەی لە لاپەڕە ٣٤٣ بڵاوکراوەتەوە هونەرمەند عەبدولقادر عەلی مەردان سەرنجی بۆ ئەوە راکێشام کە هەمان وێنە لە کتێبی (من عمان الى العمادية او جولة في كردستان الجنوبية)ی عەنی سیدۆ گۆرانی بڵاوکراوەتەوە، دوای بەراوردکردن دەرکەوت لەوێ لەژێر وێنەکە نووسراوە (اولاد السيد طه وهم بالملابس الوطنية الخاصة بعشيرة الشكاك الكوردية).
«عەبدوڵڵا زەنگەنە»

دوو هەوا».

بابەتی حەوتەم*

# «هاوار»و کوردی عیراق

لە زۆر بوواری کوردایەتیدا بەدرخانییەکان یەکەم بوون. ئەوان بناغەی ڕۆژنامەنووسیی کوردییان داڕشت، هەر ئەوانیش دەورێکی گەورەیان لە بەرەو پێشبردنیدا بینی.

گۆڤاری **«هاوار»** کۆرپەیەکی نازداری بەدرخانییەکانە، جەلادەت بەدرخان لە ماوەی یازدە ساڵدا، لە پازدەی مایسی ساڵی ١٩٣٢وە تا پازدەی ئابی ساڵی ١٩٤٣، پەنجاو حەوت ژمارەی لە شام لێ چاپکرد. بیستو سێ ژمارەی یەکەمی بە پیتی هیجاو لاتینی و دوا سیو چوار ژمارەی تەنها بە پیتی لاتینی لە چاپخانەی تەرەقی چاپکراون، هەموویشیان بەسەریەکەوە ٨٠٨ لاپەڕەن[١]. ژمارە یەکی **«هاوار»** شازدە لاپەڕەیە، یازدەی بە لاتینی و پێنجیشی بە پیتی هیجایە[٢]. دوا ژمارەشی هەشت لاپەڕەیەو گشتی لاتینییە[٣].

---

(*) لە گۆڤاری **«بەیان»**، ژمارە (١٨٣)ی ڕێکەوتی ساڵی ١٩٩٩، لە ل٤-٩دا بلاوکراوەتەوە.

(١) بڕوانە: **«تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا»**، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل٢٣٥.

(٢) **«هاوار»**، ساڵ ١ هژمارا، یەکشەمب، ١٥ گولان ١٩٣٢.

(3) "Hawar" Sal 11, Hejmar 57, Yekshemb, 15 Tebax 1943. - (Hawar),

(٤) برای بەڕێز مامۆستا سەلاح سەعدوڵلا سەرنجی بۆ ئەم ڕاستییە ڕاکێشام*.

* (بەڕێز دکتۆر کەمال وا دیارە بە وەرگێڕی بابەتەکەی بۆ زمانی عەرەبی گوتبوو: **«دوای دەرچوونی وتارەکە، برای خۆشەویست زەنگەنە سەرنجی بۆ ڕایەکی دروستتر ڕاکێشاوم کە بەسەر مندا تێپەڕیبوو»** بۆیە ئەویش لە تەک ئەویەڕاوێزە لە ژمارە (٣-٤)ی گۆڤاری **«بەیێن العربی»**دا نووسیویە: **«ویقول الباحث کاتب المقال ان الاستاذ عبدالله زنگنه ذکر له فیما بعد ان أول من استعمل هذه الکلمة بمعناها المتداول الیوم هو حسین حزني المکریاني في مجلته زاری کرمانجی»**).

**«عەبدوڵلا زەنگەنە»**

شایانی باسە جەلادەت بەدرخان یەکەم کەسە کە وشەی گۆڤاری بەکارهێناوە[٤].

وا دیارە لە سەرەتای دەرکردنی «هاوار»ەوە هەوڵی داوە وشەیەکی کوردی بەرانبەر وشەی «المجلة»ی عەرەبی دابڕێژێ. لە یەکەم چوار ژمارەدا وشەی کۆمەڵی بەکارهێناوەو لە ژێر ناوی «هاوار»ی ئەو چوار ژمارەیەدا رستەی «کوملا کردی»ی داناوە. لە پێنجەمین ژمارەیدا ئەو رستەیە بۆتە «کۆڤارا کردی». بەو جۆرە رۆژی لە دایکبوونی وشەی «کۆڤار» لە فەرهەنگی کوردیدا بەر چوارشەممەی بیستی تەمووزی ساڵی ١٩٣٢ دەکەوێت[٥]، دەشێ «کۆڤار» لێکدراوی دوو وشەی (کۆ) (جمع)و (ڤار، وار) (شوێن - وەک شوێنەوار) بێت.

وشەی کۆڤار لە زۆربەی فەرهەنگە کوردییەکاندا (لای تۆفیق وەهبی[٦]و علی سیدۆ گۆرانی و کوردۆییێڤ و سەلاح سەعدوڵلا) وەک خۆی ماوەتەوە[٧]و وا دیارە دوای پەڕینەوەی لە شامەوە بۆ ناو کوردی عێراق بۆتە «گۆڤار»، پێم وایە سازو ئاوازی ئەمیان سووکتر دێتە گوێ و ئەو جۆرە ئاڵوگۆڕەش لە هەموو زمانێکدا روو دەدات.

جەلادەت عالی بەدرخان خۆی و رەوشەن ساڵح بەدرخانی هاوسەری و دوکتۆر کامەران عالی بەدرخانی برای و قەدری جەمیل پاشاو جگەرخوێن و عوسمان سەبری و قەدری جان و دوکتۆر ئەحمەد نافیزو مستەفا ئەحمەد بۆتی و ئەحمەد نامی و نورالدین یوسف لە نووسەرە سەرەکییەکانی «هاوار» بوون. لە هەموان زۆرتر جەلادەت بەدرخان وتاری لە «هاوار»دا بڵاوکردۆتەوە. ژمارەی ئەوتۆ هەیە شەش وتاری ئەوی تێدایە[٨]، جارویاریش نازناوی هەرەکۆڵ ئازیزانی بەکارهێناوە.

بەشی زۆری وتارەکانی جەلادەت بەدرخان دەربارەی ئەدەب و زمانی کوردین. لەم

---

(٥) «هاوار»، ساڵ ١، هژمار ٥، چارشمب، ٢٠ تیرمە ١٩٣٢.

(٦) مامۆستا تۆفیق وەهبی وشەی «کۆوار»ی بەکار هێناوە. بڕوانە:
Taufiq Wahby and C.J. Edmonds, Kurdish - English Dictionary, Oxford, 1966, P.78

(٧) علي سيدو گوراني، القاموس الكردي الحديث. كردي - عربي، عمان، ١٩٨٥، ص٣١٤؛
K.K Kurdoev, Ferhanga Kurdi - Rusi, Moscow, 1960, L.449; Salah Saadalla, Saladin s English - Kurdih Dictionary, Baghdad, 1998, P. 454.

(٨) بە وێنە بڕوانە: «هاوار»، ساڵ ١، هژمار٣، چارشمب، ١٥ حزيران ١٩٣٢.

HAWAR

هاوار

رووەوە تەنها دوکتۆر کامەران بەدرخانی برای شان لە شانی ئەو دەدا.

بەشی هەرە زۆری وتارەکانی **«هاوار»** بە زمانی کوردین، جار جارەش وتاری بە عەرەبی و بە تورکی بلاوکردۆتەوە. بە دەگمەن نەبێت دوا بەشی گشت ژمارەکانی **«هاوار»** بە زمانی فەرەنسییە، لەو بەشەدا هەر جارەی چەند وتارێکی جەلادەت بەدرخان و دوکتۆر کامەران بەدرخان و جارجاریش وتاری رۆژی لیسکۆ بە زمانی فەرەنسی بلاوکراوەتەوە، کە بەشی هەرە زۆریان دەربارەی زمانی کوردین.

گۆڤاری **«هاوار»** لەناو کوردی عیراقدا یەکسەر دەنگی داوەتەوە. وا دیارە ژمارە یەکی بێ دواکەوتن گەیشتۆتە دەست ژمارەیەک رووناکبیری کورد چ لە بەغداو چ لە چەند شارێکی کوردستان خۆی. هەمووی بەسەر یەکەوە مانگێکی نەخایاند کاتێک هەر **«هاوار»** بۆ خۆی پیرۆزنامەیەکی پڕ لە سۆزی حامید فەرەجی بلاوکردەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

**«پیرۆزنامە. برای گەورەو خۆشەویست میر جەلادەت عالی بەدرخان. لە پاش**

**دەستگوشین، دەمێک بوو چاوەڕوانی ستارەیەکی گەلاوێژی کوردمان دەکرد، تاکو دوێنێ بە چاوی خۆمان دیمان کە ئەویش گۆڤاری هاوارە کە چاوی هەموو کوردێکی روون کردەوە، هیوامان وایە کە بە تینی پرشکی گشت کوردستان رووناک بکاتەوەو هەموو کوردێک بە دەم ئەم هاوارەوە بچێت تا بکەوینە سەر رێگای راست و بۆ یەکیەتی کوردان هەوڵ بدەین. بە ناوی گشت لاوێکی کوردی عیراقەوە پیرۆزی هاوارتان پێشکەش دەکەم. رەجا ئەکەین لەمەودوا هەوڵ بدەن بۆ تەوحیدی لەهجات تاوەکو هەموو کوردێ وەک یەک ئیستیفادە لە (هاوار)تان بکەن. ئامادەین بۆ هەموو خزمەتکاریتان. ئیتر یاریدەو دەوامی(هاوار)تان لە یەزدان طەلەب دەکەین. حامد فرج»**[9].

ئەم پیرۆزنامەیەی حامید فەرەج هەمان کات یەکەم نووسینی رووناکبیرێکی کوردی عیراقە کە **«هاوار»** بە بایەخێکی زۆرەوە بڵاوی کردۆتەوە، دوای ئەوە دەرگەی **«هاوار»** بۆ ژمارەیەک نووسەرو شاعیری بەناوبانگی کوردی عیراق دەگرێتەوەو بەشێکیان بۆ یەکەم جار لەسەر لاپەڕەکانی **«هاوار»**دا بەرهەمە هەرە بەناوبانگەکانی خۆیان بڵاوکردۆتەوە[10] و ئەوە بۆتە هاندەرێکی نوێ بۆ گەشەپێکردنی ئەدەبی هاوچەرخی کوردی عیراق.

**«هاوار»** یەکەم چاپەمەنیی کوردییە کە **«وەفدی کوردستان»**ەکەی پیرەمێردی بڵاوکردۆتەوەو لە ژێرەوەی ئاشکرا مەبەستی شاعیرو هۆی دانانی نووسیوە[11]. ئەوەی ئەوساکە لەناو خودی عیراقدا بۆ بڵاوکردنەوە نەدەشیا. هەر لەو ژمارەیشیە **«هاوار»** پارچە هۆنراوەیەکی زۆر دوورودرێژی پڕ لە سۆزی **«لاوێکی کورد عەونی»**ی بە ناونیشانی **«بۆ خاوەنی هاوار»**ەوە بڵاوکردۆتەوە کەسەرجەمی ستایش و پیاهەڵدانە بە جەلادەت بەدرخان و بەدرخانییەکاندا، بە شانازییەوە باسی مێژووی ئەو بنەماڵەیەو خزمەتە گەورەکانیان دەکات و بە **«نەوەی شێرانی**

---

(٩) حامد فەرەج، پیرۆزنامە، - **«هاوار»**، ساڵ ١، هژمار ٣، چارشمب، ١٥ حزیران ١٩٣٢، ل ٣ شایانی باسە **«هاوار»** بۆ خۆی رویەلی لە بریتی لاپەڕە بەکارهێناوە.

(١٠) پتر لە بیست ساڵ لەمەوبەر لەو کتێبەمدا کە بە ناوی **«تێکۆشانی راستی»**یەوە بڵاومکردۆتەوە ئاماژەم بۆ ئەم راستییە کردووە.

(١١) **«هاوار»**، ساڵ ٢، هژمار٢٢، شمبە، ١ تیرمە ١٩٣٣، ل٤.

**کورداتیان»** لە قەڵەم دەدات چونکە، وەک دەڵێت، هەر ئەوانن **«کەە بە شیرو کەە بە خامە»** بۆ **«نەجاتی کورد سەرو ماڵیان فیدا کەن هەر لە بۆتان تاکو بابان»**، ئەوکا لە خواوەندی گەورە دەپاڕێتەوە کە **«کامەران و سەرفرازیان بکات»**. دیارە **«لاوی کورد عەونی»**ش عوسمان عەونیی شاعیرە، کە هەر بۆ خۆیشی لە ژێرەوەی هۆنراوەکەیدا نووسیوییە **«کۆیسنجەق ٢٤ کانوون دووەم ١٩٣٣»**[12] هەڵبەت دەرچوونی **«هاوار»**ویابەتەکانی هەستی شاعیری کۆیەیان بزواندووە.

ژمارەیەکی زۆر لە شیعرو پەخشانی رازاوەی گۆران بۆ یەکەم جار لە **«هاوار»**دا چاپکراون، یەکەمیان **«ئەی چاو»**ەکەیەتی کە سەرەتا بە ناوی **«ئاواتی دووری»**یەوە بڵاوی کردۆتەوە. دوای تەواو بوونی بەیتەکان گۆران روونکردنەوەیەکی کورتی نووسیوە کە تێیدا دەڵێت: **«ئەم شیعرانە لەسەر ئسولی فەقەرە رێکخراون، هەر فەقەرەیەک عیبارەتە لە چوار بەیت، بەیتی یەکەم و چوارەم لەسەر وەزنی عەروز وترلون، دووەم و سێیەمیش لەسەر وەزنی پەنجە»**[13].

لە ژمارەی داهاتووی **«هاوار»**دا گۆران **«ئیلهامی هاوار»**ی بۆ **«مەفکورەی بەحرخانییەکان»** بڵاوکردۆتەوە کە بەم بەیتە نازدارانە دەستی پێکردووە:

دەروێشـــێکم دی لەســـەر دوخـــمـــەی شـــاخ
شـــای صـــەلاحـــەددین، بەکـــوڵ ئـەگـــریـــا
هـــاواری ئـەکـــــرد، ئـــــەی لاوانـــەوە
دڵـــــی ئـیـنـســـــانـی ئەتـــــاوانـــەوە[14]

---

۱۲) «هاوار»، هەمان ژمارە، ل٣-٥*.

* «دوای بڵاوبوونەوەی ئەم بابەتە دەوڵەمەندەی د. کەماڵ، مامۆستا فەرهاد عەونی بەهەڵەداوان بەهۆی کاک دلێری برای کاتی خۆی پەیوەندی پێوە کردم و داوای ئەو ژمارەیەی «هاوار»ەی لێکردم کە شیعرەکەی خوالێخۆشبوو(عەونی)ی باوکی تێدا بڵاوکراوەتەوە رێنماییم کردن کە لای مامۆستا (دیار دۆسکی) لە دهۆک هەیە، ئەوەبوو دەستی کەوت، لە پەراوێزیدا بابەتێکی دەوڵەمەندی بەناونیشانی (سەرەتەڵەمێک دەربارەی پێنج خشتەکییەکی -عەونی- لەسەر شیعرێکی (مامەند کەرکوکی) لە ژمارە (٥)ی زستانی ٢٠٠٠ لە گۆڤاری (هەولێر) بڵاوکردۆتەوە دیارە -مامەند کەرکوکی- ئەو زاتەیە کە لە بابەتی سێیەمی بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا لە ل(   )پەراوێزمان بۆی کردووە -عەبدوڵڵا زەنگەنە».

۱۳) «هاوار»، ساڵ ١، هژمار ٩، ئەین(هەینی)، ٣٠ ایلول ١٩٣٢، ل٥.

۱٤) «هاوار»، ساڵ ١، هژمار ١٠، یکشمب، ٢٣ چریباری ١٩٣٢، ل٥.

دیسان گۆران لە ژمارە دوازدەی **«هاوار»**دا شیعری **«ئەی گەلاوێژ»**و پەخشانی **«چاو»**ی بڵاوکردۆتەوە. لەمیاندا دەڵێت: **«هەندێ وەک شەو رەشن، هەندێکیش چەشنی پیرۆزە شین، هەندێ چاوی تریش هەن ئەڵێی چاوی هەڵۆن، چەشنی یاقوت ئاگریان لێ ئەبێتەوە. لای من وایە چاوی رەش بە جیلوەی حوزن و دڵۆپی فرمێسکەوە ئەرائیچەی هەموو چاوە جوانەکانە... ئەوەندە شیرین... ئەوەندە بێ وێنە»**.

ژمارەیەک بەرهەمی تری گۆران بۆ یەکەم جار لە **«هاوار»**دا بڵاوکراونەتەوە، هی وایان تێدایە کە تاوەکو ئێستا نە لە دیوانەکەیدا، نە لە هیچ شوێنێکی ترد ئەوەندەی من بیزانم، چاپ نەکراوەتەوە. بێکەسیش **«ئەی وەتەن»**ەکەی بۆ یەکەم جار لە **«هاوار»**دا بڵاوکردۆتەوە، بەڵام لێرە سەرناوی **«یادی وەتەن»**ی بۆ هەڵبژاردووە[١٦].

ژمارەیەک لە روناکبیرانی کوردی عیراق بە ناوی خواستەنییەوە بەرهەمەکانی خۆیانیان لە **«هاوار»**دا بڵاوکردۆتەوە. **«کورد لە زوبێر»** یەکێکە لەو کەسانە کە نە ژێر ناوی **«هەر بژی»**دا رووی دەمی کردۆتە جەلادەت بەدرخان و بە بۆنەی دەرچوونی **«هاوار»**ەوە وا بە سۆز و ناڵەوە باسی باری ناڵەباری کوردی عیراق دەکات:

سەروەری عالی مەقامی قەومی کورد غەمخوری کورد
باعیسی فەخری گرۆهی میللەتی غەمباری کورد
گەر دەپرسی تۆ لە حاڵی میللەتی مەقهوری خۆت
هەوری بەدبەختی و خەفەت گرتی دڵی هوشیاری کورد
ئەو کەسانەی ئەرزەلن ئەمڕۆ لە سایەی جەهلەوە
بوون بە حوککام و ئەمیرو ئاغەوو سەرداری کورد
فیکری دینی بوو بە زەهری قاتلی ئەمسالی من

---

(١٥) **«هاوار»**، ساڵ ١، هژمار ١٢، یکشمب، ٢٧ چریاپاشی ١٩٣٢، ل٤-٥.
(١٦) **«هاوار»**، هەمان ژمارە، ل٢.
(١٧) ئەوساکە بە تەوسەوە ناوی جلخواریان نابوو لە تورکخواکانی کورد، **«هاوار»** وشەی کوردەکەی لابردووە.



جەلادەت بەدرخان



کامەران بەدرخان

بـۆیە پاشکەوتین لەجەمعی سـەرسەری و جلخواری کـــورد[17]
لـەحـــزەیــە چـاوت هـــەڵهـێنـــە سـەیـری ئـەحـواڵی بـکە
دە بـــزانــە بـۆچ غـەریـبـە لــە زوێـــر سـەیـاری کـــورد[18]

ئەم هۆنراوە ڕێکوپێکە لە نووسینی سەلامی شاعیـر دەکات[19]، سەنگ و ڕەنگ و ناوەرۆک و دارشتن و دیدو بۆچوون وا دەڵێن، سـەرباری ئەوە سـەلام لە تێگەیشتنی وردەوە یەکێک بوو لە دوژمنە سەرسەختەکانی تورکخواکانی ئەو رۆژگارە کە لە ناو کوردەواریدا ئەوساکە بە جلخوار ناسراوبوون و ئەمیش لە **«هەر بژی»** یەکەیدا لەگەڵ **«جەمعی سەرسەریدا»** دایناون. هەرچۆن بێت لە ناو ژمارەکانی **«هاوار»**دا ناوی ژمارەیەک سەربازی ون هاتووە کە بەشێکیان سەر بە دەستەی ڕووناکبیری کوردی عیراقن، ئەو باسەی پێویستی بە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو بەراوردکردنی ورد هەیە.

---

(١٨) **«هاوار»**، سالٌ ١، هژمار ١٢، یکشمب، ٢٧ چرییاپاشی ١٩٣٢، ل٨.
(١٩) بۆ ئەم بۆچوونە پرسم بە مامۆستایان محەممەدی مەلا کەریم و عەبدولڕەزاق بیمار کردووە.

**«سین ومیم»** دوو سەربازی ونی دڵسۆزی تری کوردی ئەو ڕۆژگارەی عیراقن کە **«هاوار»** هەستی بزواندوون و خامەی ڕەنگینیانی هێناوەتە دەنگ، سینیـ نووسەرێکی بوێری شێواز ڕەوان و میمیشیان شاعیرێکی دڵسۆزو شەرمنە هەردووکیان بەدەرچوونی **«هاوار»** شاگەشکە دەبن. سین هۆنراوەیەکی میمی هاوڕێی دەدزێت و پێشەکییەکی بە ناونیشانی **«هیواو دڵداری»**ەوە بۆ دەنووسێت و هەردووکیان پێشکەش دەکات بە **«خوێندەوارانی بەنرخی هاوار»**. لەوێدا سین دەڵێت:

**«هۆنینەوەی فرمێسک وەک ڕیزکردنی مرواری نییە، بە خوێنی دڵ وێنەی ژین بگیرێت جیایە لەگەڵ ئەوەی کە بە مەرەکەبی سوور بنووسرێت، لە کوروەی دڵەوە هاڵاوی غەم بێتە دەرێ جوێیە لەگەڵ ئەوەی کە لە چیمەنی خەیاڵ چەند گوڵێکی ئاڵی جوانەمەرگ بدزرێت، شنەی سووری بەیان دوورە لە گێژەڵوکەی رەشەبا»**.

ئینجا سین **«خوێندەوارانی بەنرخی هاوار»** سەرپشک دەکات ڕای خۆیان دەربڕن لە هۆنراوەکەی میمی هاوڕێی دەربڕن و پێیان دەڵێت هەرچەندە **«شیعرەکان زۆر جوان ڕێکنەخراون، نارێکن... بەڵام توخوا ئێوە بڵێن فرمێسکەکانی خوێنینی چاو. دڵۆپانی شەونمی گوڵ، هەنسکانی بە کوڵی شیوەن، خەوانی خۆشی رابردوو. هیوایانی شیرین لەمەودوا لەوە جوانتر ڕیز ئەکرێن؟، ئەگەر ئەکرێ ئێوە خۆتان لەباتی من و میمی هاوڕێشم بیکەن، سەرەڕای چاکە گەلێک سوپاسیشتان ئەکەین»**.

لە شیعرەکەی میمیش ئەم چەند بەیتە دێنینەوە:

گریان کردەوەی بێ دەسەڵاتە
دوو بەرگەی کتێب بگرەو بخوێنە
بێ دەسەڵاتان ئەمرن لەژێر بار
هاوڕێی دانا بە نەزان مەدوێنە
گەردن ئازاد کە لە کۆتەی دیلی
یا ئازا بژی، یا خود مەمێنە[٢٠]

---

(٢٠) **«هاوار»**، ساڵ ١، هژمار ١٩، دوشمب، ١٧ نیسان ١٩٣٣، ل٦-٧.

ژمارەیەکی زۆر لە شیعرە نایاب و دانسقەکانی عەبدولخالق ئەسیریی کەرکوکی بۆ یەکەم و بەشێکیشیان بۆ دواجار لە **«هاوار»**دا بڵاوکراونەتەوە. شایانی باسە ئەسیری بەرهەمەکانی خۆی لە **«هاوار»**دا بەناوی سەید حوسێن زادە عەبدولخالق ئەسیرییەوە بڵاوکردۆتەوە. ئەسیری سەرەتا لەوە تورەیە کە هۆنراوەی سنوورەکەی ئەمویان بە ناوی حاجی قادری کۆییەوە لەگەڵ **«شەرفنامە»**دا لە قاهیرە چاپکردووە. لە ژمـــارە دەو یازدەی **«هاوار»**دا سێ روونکردنەوەی بەکـــەڵک لەم بارەیەوە بڵاوکراوەتەوە، هی تۆفیق وەهبی و ئەسـیری و جەلادەت بەدرخان یەک لە دوای یەک[٢١].

عەبدولخالق ئەسیری لە روونکردنەوەکەی خۆیدا گوتویە:

**«من مەلا عەبدلخالق ئەسیریی شاعیری کوردانم، ئەم غەزەلـە کـە بەغەڵەت و پەڵەت و ناتەواو لە ئاخری شەرەفنامە دەرج کراوە بە ناوی حاجی قادری کۆییەوە هی منە، لاوانی کـوردی کـەرکـوک و سلێـمـانی و کـۆیە ئاگـایان لەمـە هەیە، لە چاپەری شەرەفنامە لەمەدا خەتای نییە، تەحقیقمان کرد کاری کێیە، ئەوا بە ناوی خۆمەوە لە مجلەی «هاوار»دا لە چاپدرا، هەر کسێ لە لاوانی کەرکوک و سلێمانی و کۆیە وەسیقەیەکی هەیە کە (هی) حاجی قادرە بینووسێ بۆ ئیسپاتی ئامادەم»**.

گـەلێک نموونەی تری لەو بابەتانەی باسـیـانمان کـرد لەناو **«هاوار»**دا وەدی دەکرێن، کە سەرجەمیان نیشانەی بەرەوپێرەوەچوونی گەرمی رووناکبیرانی کوردی عیراقن بـە بۆنەی لەدایکبوونی **«هاوار»**ەوە کە بێ گومان یەکێکە لە لوتکەکانی مێژووی رۆژنامەنووسیی کوردی. لێرەدا پێویستە ئەوەش بێنینەوە یاد کە **«هاوار»** لە مـاوەی پتـر لە سێ ساڵی یەکـەمی ژیانیـدا تاکـە گـۆڤـاری کـوردی بوو کـە لە بارودۆخێکی یەکجار سەختـدا وەک مۆم لە ناو شەوەزەنگی دواکەوتوویی کورددا دەسوتا. هەڵبەت ئەمە بۆ کـاربەدەسـتانی رۆژگـاری پاشایی دەستی نەئەدا، زۆری نەخـایاند **«هاوار»**یش بووە زادی راپۆرتە نهـێنیـیـەکـان، **«نامـەی ئێـمـەو نامـەی بەرێزتان»** دەست پێ دەکـات تا رۆژی بیـست و چواری کـانوونی دووەمی سـاڵی

---

(٢١) **«هاوار»**، ساڵ ١، هژمار ١٠، ل٨؛ هژمار ١١، پێنجشمب، ١٠ چریاپاشی ١٩٣٢، ل٥٤.

١٩٣٣ فەرمانی وەزیری ناوخۆ ناجی شەوکەت، کە هەر بۆ خۆیشی سەرەک وەزیران بوو، بۆ قەدەغەکردنی **«هاوار»** دەردەچێت[٢٢].

ئەم بڕیارە دەبێتە هۆی نیگەرانی میر جەلادەت بەدرخان و گشت ڕووناکبیرانی کوردی عیراق. میر ڕۆژی دوازدەی مارتی هەمان ساڵ نامەیەکی تایبەتی دەنێرێت بۆ وەزیری ناوخۆی عیراق. ئەو نامەیە ئیمڕۆ لە هەموو ڕوویەکەوە بەڵگەیەکی مێژوویی زۆر بایەخدارە، بۆیەکا دەقەکەی بە عەرەبی وەک خۆی بڵاو دەکەینەوە:

«لجناب معالي وزير الداخلية العراقية الافخم. المعروض. لقد علمت من الرسائل الواردة علي من بعض القراء في العراق بان كل ما صدر من اعداد مجلتي (هاوار) بعد العدد الرابع عشر[٢٣] لم يصل اليهم، ولما فتشت عن سبب ذلك علمت ان الحكومة العراقية الجليلة هي التي امرت بمنع دخولها العراق. ومصادرة الاعداد المرسلة بعد العدد الرابع عشر.

ليس فقط في المدة التي بدأت باصدار مجلتي و حصرت كل مساعي الفكرية في نشر الاداب والعلم، بل في غضون السنين الخمس التي قضيتها قبل صدورها في البلاد الشامية، في كل تلك المدة لم ادخل الكردستان العراقي في خطة مساعي، واكتفيت بأن انظر الى سيره و رقيه في طريق التكامل التي ستناله تلك القطعة من وطني العزيز ضمن نطاق الحرية التي خولتها له حقوق الاقليات في عهد سليل الشجرة الطاهرة الهاشمية وارث نبينا الكريم جلالة الملك المعظم، ولا ازال الى اليوم مكتفيا بذلك..

وان علاقتي مع اكراد العراق جارية على ساحة ادبية تماما، كما ان ذلك يرى واضحا من موضوعات مجلتي المذكورة، واني لم اكتب في «هاوار» من يوم انتشارها الى الان سطرا واحدا ضد العراق، وان هذه الاعداد السبعة عشر المنتشرة الى اليوم لاقوى برهان على ذلك.

---

(٢٢) ملفات وزارة الداخلية، المكتب الخاص، رقم الملف: بلا، موضوع الملف: الحركة الكردية، أمر وزارة الداخلية المرقم ١٠٩٨ والمؤرخ في ٢٤ كانون الثاني ١٩٣٣.

(٢٣) ژمارە چواردەی **«هاوار»** ڕۆژی ٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢ چاپ بووە، واتا بیست و چوار ڕۆژ بەر لە دەرچوونی فەرمانی قەدەغەکردنی، هەرچی ژمارە پازدەیشیێتی ڕۆژی ٢٣ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٣ دەرچووە، واتا ڕۆژێک بەر لە دەرچوونی ئەو فەرمانە.


هاوار

كوفارا كردى

ولما كان لابد لكل مجلة من تثبيت خطة تسير عليها في نشرها، عينت خطتي لمجلتي هذه للكردستان العراقي بصورة خصوصية، والمادة التي تتعلق بها هي عبارة عن عدم التدخل بسياسة الحكومة العراقية، ومتابعة الحوادث بمنظار الهدوء والسكون، ولم اتحول عن خطتي هذه الى الان، ولن اتحول اللهم إن كنت مكرها بتغييرها، ودليلي على ما ادعيه البراهين الاتية:

لقد منع دخول مجلتي العراق اعتبارا من العدد الرابع عشر الذي انتشر بتاريخ ٣١ كانون اول سنة ١٩٣٢، ومر عليه ما يربو على شهرين، وانتشرت ثلاث نسخ في خلال هذه المدة، فلم اكتب فيها شيئا عن العراق، ولم اعلن القرار الصادر بمنع دخولها كما هي الاصول المتبعة لدى ارباب الصحف، ومما يدل على تمسكي بعهدي وبنيتي الحسنة انني لم ادخلها العراق سرا منذ صدور قرار المنع، ولم

اتوسل الى اسباب ادخالها قط، ولا يخفى على معاليكم إن النجاح في ادخالها ليس بالامر العسير. هذا وقد ذكرت في مجلتي بالمناسبات العديدة ان كل ما تصبو اليه هذه المجلة هو العمل على النهوض باللغة الكردية و ادابها، وذلك ما يتوافق مع سياسة الحكومة العراقية الجليلة، لانها قبلت و ادخلت تعليم هذة اللغة في برنامج المعارف، كما أمرت بطبع الكتب المدرسية بنفس اللغة في مطابعها والتي تدرس في مدارس الكردستان العراقي منذ عدة سنوات خلافا لما عملته الحكومة التركية، وسائر الحكومات التي استولت على الكردستان، حيث انها رفضتها وقاومتها بالنار والحديد. فكل ما عرضته آنفا يدل على استمرار اخلاصي، وحسن نيتي نحو الحكومة العراقية، من جهة ثانية ليس في دخول مجلتي العراق اي ضرر يتحاذر من عاقبته، بل لدخولها منافع شتى، من جملتها ادخال السرور الى قلوب الاكراد الذين هم من الاتباع المخلصين لصاحب الجلالة (الملك فيصل الاول) واما منعها فيولد استياء في قلوبهم طبعا.

فأرجو ملاحظة كل ما تقدم بعين العطف والاعتبار، والتكرم باصدار امركم العالي باجازة ادخال مجلتي هاوار الى العراق كما كان سابقا، وارسال الاعداد المصادرة الى اصحابها، هذا وإن لم يقترن رجائي بالقبول لدى معاليكم فأرجوكم أن تتكرموا باعادة الاعداد الي والامر لمعاليكم سيدي المعظم. التوقيع صاحب مجلة هاوار جلادت بدرخان».

بێ گومان خوێندنەوەی مێژوویی ناوەرۆکی قووڵی ئەم نامەیە کارێکی زۆر ئاسانە کە بەر لە هەر شت کورتبینی فەرمانڕەوایانی ڕۆژگاری پاشاییان تێدا وەدی دەکرێت، **«هاوار»** وەک خاوەنی نوسیوییە گۆڤارێکی ئەدەبی ڕووناکبیریی بوو، لە قازانج بەولاوە زیانی نەبوو. خاوەنی کە کاتی خۆی داوای مافی دەرکردنی کردو وەزارەتی ناوخۆی سووریەش لە بڕیاری ڕێگەدانی دەرچوونیدا ئەم ڕاستییەیان تۆمار کردووە. لە ژمارەی یەکەمیدا **«هاوار»** بە عەرەبی وتارێکی بلاوکردۆتەوە بە ناونیشانی **«هدفنا و خطتنا»**، لەوێ گوتویە:

«لقد أسسنا مجموعة (هاوار) لغاية علمية وادبية محصنة، فهي إذن لن تتدخل في الشؤون السياسية مطلقا. اننا نريد ان نخدم في هذه المجموعة اللغة



ETAT DE SYRIE

دولة سورية

وزارة الداخلية

حضرة الامير جلادت بدرخان المحترم

[illegible] الطلب الذي قدمتموه بشأن اصدار جريدة ادبية علمية مصورة اسمها (هاوار) تصدر [illegible] باللغة الكردية في دمشق [illegible] الاعتبار باللغة العربية او الافرنسية دون ان [illegible] السياسية [illegible] لحضرتكم هذا [illegible] بالاستلام

دمشق في [illegible] تشرين الاول [illegible]

وزير الداخلية

الكردية، والادب الكردي، وقد وضعنا لذلك برنامجا نسير عليه في بحثنا ودرسنا »(٢٤).

هیچ کام لەم بەڵگەو بۆ چوونانە دادیان نەداو وەزیری ناوخۆی نوێش حیکمەت سلێمان وەک ناجی شەوکەت سوور بوو لەسەر قەدەغەکردنی «هاوار»، لەو هەموو قسە رێکوپێکانەی میر جەلادەت بەدرخان تەنها ئەو ڕستەیە سەرنجی ڕاکێشابوو کە دەڵێت ئەگەر بمانەوێت دەتوانین بە دزییەوە ژمارەکانی «هاوار» بگەیێنینە ناو خاکی عیراق، شایانی باسە وەزیر خەتی سووری بە ژێر ئەو ڕستەیەدا ڕاکێشاوە... یاریدەری وەزیریش لەسەرەوە، لای چەپی نامەکەی جەلادەت بەدرخانەوە ئەم تێبینییەی نووسیوە:

**«ربما تودون إطلاع مأموري الادارة الذين يخصهم الامر عن نية المستدعي، او امكانِ دخول هذة المجلة خلسة الى العراق»..**

(٢٤) «هاوار»، سال ١، هژمار ١، يكشمب، ١٥ گولان ١٩٣٢، ل٤-٥.

حیکمەت سلێمان بە ئیمزای خۆی ڕۆژی بیستی مارتی ساڵی ۱۹۳۳، واتا ئەو ڕۆژەی کە تێیدا بووە وەزیر، نامەیەکی نهێنی ناردووە بۆ بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس و داوای لێ دەکات ئاگادار بن نەهێڵن جارێکی تر بە هیچ جۆر گۆڤاری **«هاوار»** پێ بنێتە ناو خاکی عیراقەوە[٢٥].

بەو جۆرە ڕووناکبیرانی کوردی عیراق لە **«هاوار»** بێبەش کران.. لەوساوە قۆناغێکی نوێ لە مێژووی ئەو گۆڤارەماندا دەست پێ دەکات، دابڕینی نووسەرانی کوردی عیراق لێی کارێکی زۆری تێ کرد. زۆر بە خێرایی بەرهەمی نووسەرو بوێژانی کوردی عیراقی لێ بڕا، وا دیارە جار جارە وتارێک، یا پارچە هۆنراوەیەکیان دزەیان دەکردو سنووریان دەبڕی و دەگەیشتنە **«هاوار»** کە ئەویش تەواو ڕووی لە کزی کرد، لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا بیست ژمارەی لێ دەرچوو. دوای ئەوە لە ماوەی پتر لە دە ساڵدا هەمووی بەسەریەکەوە سی و حەوت ژمارەی تری لێ چاپ بوو. لە ژمارە بیستو چواریشییەوە، کە ڕۆژی یەکی نیسانی ساڵی ۱۹۳٤ دەرچووە، ئیتر تەنها بە پیتی لاتینی چاپ دەبوو. لەو ژمارانەیدا، وەک وتمان، بە دەگمەن بەرهەمی کوردێکی عیراق لە **«هاوار»**دا وەدی دەکرێت، وەک ئەو وتارەی تۆفیق وەهبی کە بە ناونیشانی **«مامە یارە»**وە لە ژمارە بیستو شەشدا بڵاوکراوەتەوە[٢٦].

هەرچۆن بێت **«هاوار»** دەسکەوتێکی گەورەو دیارە لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا. کاتی خۆی لە **«تێگەیشتنی ڕاستی»**دا گوتومە: **«هاواری بەدرخانییانیش سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ئەدەبی کوردییە. ئەدەبی کوردی لە هاواردا پێشنیاری سەروتارێکی زانستیی بەکەڵکە دەیخەمە بەرچاوی شارەزایان»**[٢٧]. ئێمڕۆش دوای تێپەڕ بوونی پتر لە بیست ساڵ بەسەر ئەو پێشنیارەداو دوای دۆزینەوەی چەند بەڵگەنامەیەکی نهێنی دەربارەی **«هاوار»**و دوای ئەوەی جارێکی تر بە ژمارەکانی ئەو گۆڤارەدا چوومەوە دەڵێم **«هاوار»** بە لایەنی کەمەوە چوار نامەی ماجستێر

---

(٢٥) ملفات وزارة الداخلية، المكتب الخاص، رقم الملف: بلا، موضوع الملف: الحركة الكردية، شعبة المخابرات السرية، الى مديرية الشرطة العامة، العدد ٥٩٢/٧، ٢٠ مارت ١٩٣٣.

(26) **"Hawar"**, Sal 4, Hejmar 26, Yekshemb, 18 Tebax 1935, L. 1-3.

(٢٧) **«تێگەیشتنی ڕاستی ...»**، ل١٥٧.



**لاوێکی کورد = عەونی سالی ١٩٣٣**

هەڵدەگرێت، یەکەمیان دەربارەی **«هاوارو شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا»**، دووەمیشیان دەتوانرێت بۆ ئەدەب و سێیەمیان بۆ زمان و چوارەمیان بۆ مێژوو تەرخان بکرێن.

یەکێک لە شانازییە هەرە گەورەکانی **«هاوار»** لەو هەوڵوکۆششە زۆرەدا وەدی دەکرێت کە بۆ یەکگرتنی زمانی کوردی دانی. لێرەدا حەز دەکەم ئاماژە بۆ وتاری **«لاوێکی کورد پەروەر»**ی سلێمانی بکەم کە بەم ناونیشانەوە بڵاوی کردۆتەوە: **«کاغەزی ئاشکرا بۆ گەورەی تاقانەی کوردان تۆفیق وەهبی بەگ»**[٢٨]. لاوی کوردپەروەری سلێمانی لەو وتارەیدا رووی دەمی کردۆتە زانای زمانەوانمان و بە ئەوپەری سۆزەوە پێی دەڵێت:

**«بە ناوی کوردایەتییەوە، بە ناوی کوردخواهییەوە زۆر تکاتان لێ دەکەم... وەکو**

---

(٢٨) **«هاوار»**، سالّ ١، هژمار ١٥، دوشمب، چلەیی پاشی ١٩٣٣، ل٢-٤.



**حازم شەمدین ئاغا**

**برا دەست بدەنە دەست ئومەرایانی بۆتان، پێکەوە زمانی ئەم قەومە زیندوو بکەنەوە، شێوە جیاجیاکانی نزیک بکەنەوەو لە هەمووی شێوەیەکی هەمووانی بۆ کوردستان پێک بێنن، تاکو هیچ نەبێت بۆ ئیمڕۆ (سوق العکاظ)ێکی کوردی پێکبهێنرێت».**

ئەم قسانە دڵسۆزی و دووربینی سەرداری بادینی حازم شەمدین ئاغا دێننەوە یاد که ئەویش کۆتایی بیستەکان بە تەنها لە زاخۆی دەلال ئاڵایەکی وا پیرۆزو پێویستی بەرز کردبۆوە. لە «هاوار»دا گەلێک شتی لەو بابەتە هەیە کە هەموویان دەرس و پێویستە بخرێنە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەوە.

**بابەتی هەشتەم***

# لە نێوان خواجا ئەفەندی و ئەمین زەکی بەگدا

دەمێ ساڵە عەودالی ئەوەم بەلایەنی کەمەوە نامەیەکی ماجستێر بۆ مێژوونووسی گەورەی کوورد محەمەد ئەمین زەکی بەگ تەرخان بکرێت، هەرچەندە ژیان و چالاکییە سیاسییەکان و بەرهەمە مێژووییەکانی ئەو زانا لێهاتووەمان شیاوی ئەوەن پتر لە نامەیەکی ماجستێر یا دکتۆرایان لە سەر بنووسرێت.. لەم چەندانەدا، دوای کەمێک بێنەو بەرە، لە سەر نووسینی دوو نامەی ماجستێر رێککەوتین، یەکەمیان نامەی قوتابی کورد عیسام کازمە **دەربارەی چالاکییەکانی پەرلەمانتارە کوردەکانی رۆژگاری مەلیک فەیسەڵی یەکەم**، کە ئەمین زەکی لە ریزی هەرەپێشەوەیان بوو، ئەوی تریان نامەی قوتابی دارا جەمال غەفورە **دەربارەی ژیان و رۆڵی سیاسی ئەمین زەکی بەگ بەتەنها**. لێکدانەوەی وردو هەمەلایەنی بەرهەمەکانی ئەمین زەکیش بەلایەنی کەمەوە پێویستی بە نامەیەکی ماجستێری سەربەخۆیە. چ داراو چ عیسام سەرەتا هیچیان دەربارەی ئەمین زەکی بەگ نەدەزانی، **بەڵام هەدووکیان ئێستاعاشقی ئەو زانا مرۆڤە گەورەیەن و بە پەرۆشەوە کەوتوونەتە لێکۆڵینەوەی باسەکەیان و گەلێک سەرچاوەی دەگمەنیان لە بواری کارەکەیاندا دەسکەوتووەو** دیدەنی دەستەیەک لە کەسانی ئاگاداری وەک مامۆستایان فوئاد عارف و مەسعود محەمەد و رۆژبەیانی و دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی و جەمال بابانیان کردووە. منیش مەبەستمە بەپێی توانا یاریدەیان بدەم، بۆیەکا ناو ناوە بە وردی دەچمەوە سەر ئەو بەڵگەنامەو سەرچاوانەی هەمن و لەوانەن سوودیان بۆ هەردوو نامەکە هەبێت، بە دەم ئەو کارەوە چەند بابەتێکی

(*) لە گۆڤاری **«رەنگین»** ژمارە (١٣٨)ی ساڵی ٢٠٠٠دا بڵاوکراوەتەوە.

دەگمەنی لەیاد کردووم کەوتەوە بەرچاو لە هەموویان گرنگتر نامەیەکی تایبەتیی مامۆستا ئەمین زەکییە بە دەستوخەتی خۆی بۆ خواجا ئەفەندیی مامۆستای خۆی و **بەشێک لەدەستەی یەکەمی رابەرانی چەرخی سەرهەڵدانی کوردایەتی نوێ کە یەکێکیان شێخ مەحمودەو خواجا ئەفەندی هەر زوو بۆی قراندووە کە ئاگرێک بەرپا دەکات هەرگیز کوژاندنەوەی بۆ نەبێت.** خواجا ئەفەندی دڵسۆزی بنەماڵەی شێخان بوو، خۆی بەمووریدی کاک ئەحمەدی شێخ دادەنا، **«مەناقیبی کاک ئەحمەدی شێخ»** تاکە بەرهەمی بڵاوکراوەی ئەو زاتەیە کە ساڵی ۱۹۳۹ لە سلێمانی چاپی کردووە.

خواجا ئەفەندی نازناوی عەزیزی کوڕی عوسمان ئاغای خان نەوەی خان ئەحمەد خانە کە یەکێک بووە لە حوکمدارانی ئەردەلان و لە ناوچەی شارزوورو ماوەتە دەستی رۆیشتووە و تێکەڵ بە هۆزی گەلاڵی بووە.

خواجا ئەفەندی سەدو یەک ساڵ ژیاوە، لە ساڵی ۱۸٤۱وە تاوەکو ۱۹٤۲، لە رۆژگاری عوسمانییەکانداو بۆ ماوەیەک دوای ئەوانیش قوتابخانەی تایبەتی خۆی هەبوو، هەر عوسمانییەکانیش بۆخۆیان نازناوی خواجا ئەفەندییان داوەتێ، ئەوساکە هەرخوێندەوارێکی لێهاتوو توانای مامۆستایی هەبوێت دەروازەی باڵا **(الباب العالي)** ئەو نازناوەی پێ بەخشیوەو موچەی تایبەتیی بۆ بڕیوەتەوە، بەوجۆرە عەزیزی عوسمان ئاغا بووە خواجا ئەفەندی و هەر بەو ناوەوە لە ناو خەڵکدا دەناسرا.

خواجا ئەفەندی یەکێکە لە پێشەنگەکانی چەرخی ڕووناکبیری **(عصرالتنویر)**ی کورد، ئەوجۆرە کەسانە لە رۆژهەڵات و لەناو کوردیشدا هەر بە **(منور)** دەناسران چونکە، وەک پێشەنگە دووربینەکانی ئەورووپاو سەدەی حەڤدەمین و هەژدەمین. خوێندن و خوێندەوارییان بە تاکە دەرمانی گشت کێشەکانی ناو کۆمەڵ دادەنا. خواجا ئەفەندی زوو زوو، چ لە دیوەخانی ئاوەدانی تایبەتی خۆی و چ لە کاتی وانە وتنەوەدا، دەیفەرموو **«لە رۆژی قیامەتدا نەخوێندەوار بەکوێری دەسوڕێتەوە»**. لە بەر ئەوە ئەمین زەکی بەگ زۆر بەچاوی قەدرەوە تەماشای خواجا ئەفەندی دەکرد. تایبەت چونکە ئەو بۆ خۆیشی تا دوا رۆژی ژیانی دانی بەهیچ رێگەیەکی تردا نەدەنا هەرچەندە تاقیکردنەوەکانی ژیان ماوەیەک بوو کوردی خستبوویە سەر



ئەمین زەکی بەگ

رێبازێکی تر، رێبازی ئەوەی تێبگات چارەسەرکردنی راستەقینەی گشت کیشەکان، بە خودی خوێندن و خوێندەواری خۆیشییەوە، بەستراوە بەسروشتی رژێمەوە بەر لە هەر شتێکی تر.

هەرچۆن بێت بیست و حەوتی کانونی یەکەمی سالّی ۱۹۳۹ لە بەغداوە ئەمین زەکی بەگ سوپاسنامەیەکی تایبەتی ی ناردووە بۆ خواجا ئەفەندی کە وا دیارە ئەو کتێبەی سەعید سدقی کابانی بۆ ناردووە کە سالّی ۱۹۲۸ لە بەغدا بەناونیشانی(**مختصر صرف و نحوي كوردي**) بلاّوی کردۆتەوە. لەبەر گەلێک هۆی زانراو ئەو نامەیەی ئەمین زەکی بەگ ئیمرۆکە بەلّگەنامەیەکی بایەخدارە، یەکێک لەو هۆیانە دەرخستنی شێوازی زمانی کوردی و نامەنووسیی باوی سییەکانە لەناوچەی سلێمانی و دەوروبەریدا. لە دەقی نامەکەیدا ئەمین زەکی بەم جۆرە رووی دەمی کردۆتە خواجا ئەفەندی:

**«مامۆستای خۆشەویست إلتفاتنامەیەکتان و رسالە باشەکە گەیشت، مژدەی سیحەت و دەوامی عومرو مەحەبەتتان دلّی گەشاندەوە.. ئەلّێن دار کە کۆن بوو ئیتر بەر نادا، وادیارە ئەم قسەیە راست نییە، ئەوە ماشاءالله داری بەردار بوون و**

**بەردارن، لاوانی پێشوو ئیمڕۆ وان لە تریشقەی نووری زانستیی ئێوە بەشدار بوون و ئەبن، کەوابوو ئەبێ بۆ عومر درێژیتان دووعاگۆبن. زۆر زۆر سەلام لە موئەلفی قەواعیدی زمانی کوردی جەنابی سەعید ئەفەندی کە لە ئیفادەو بەرەکەتدا لەسەر شوێنی ئێوە ئەڕوات. ئیتر هەر بژی خواجا ئەفەندیان. قوتابیتان».**

خاوەنی **«چیم دی»** ئەحمەد خواجا کە سەرەتا ناوی ئەحمەد سەبری بووەو هەر بەو نـــاوە لێکدراوەیشـەوە بەشداری لـــە دەرکـردنی رۆژنامـــەی **«ئومێدی ئیستقلال»**دا کردووە، کوڕی خواجا ئەفەندی بوو. وا دیارە دوای ئەوەی نامەکەی ئەمین زەکی بەگم بۆ باوکی دەستکەوتووە چەند پرسیارێکم ئاراستەی ئەو کردووە کە بەنامەیەکی دوورو درێژ رۆژی هەشتی مارتی ساڵی ١٩٨٢ وەڵامی داومەتەوە. لە نامەکەیدا ئەحمەد خواجا چەند جارێک بەرێزێکی زۆرەوە ناوی ئەمین زەکی بەگی هێناوە کە وا دیارە زۆر ئاگاداری بووەو چاودێری کردووەو لە کاتی تەنگانەدا فریای کەوتووە. یەکێک لەو خاڵانەی ئەحمەد خواجا لە وەڵامی پرسیارەکانی مندا باسی کردووە دەربارەی ئەوەیە چۆن بۆ یەکەم جار ساڵی ١٩٢٨ لە بەغدا لەگەڵ بابە عەلیی کوڕی شێخ مەحمودا بە جووتە ئەمین زەکی بەگیان دیوەو چۆن دوای ئەوجارە هەرچەند ئەحمەد خواجا چۆتە خزمەت ئەمین زەکی دیوێتی سەرقاڵی خوێندنەوەو نووسین بووە، کە جارێکیان لێی پرسیوە **«قوربان خەریکی چیت»** لە وەڵامدا پێی وتووە **«خەریکی ئاوەدان کردنەوەی کەلاوەکانم»**، دیارە مەبەستی زیندووکردنەوەی مێژووی کوردو کوردستان بووە.

لە خاڵێکی وەڵامەکانیدا خوالێخۆشبوو ئەحمەد خواجا ئەم راستییە بایەخدارەی تۆمار کردووە کە دەقەکەی وەک خۆی دەنووسمەوە:

**«لەسەرەتای مانگی ئابی ساڵی ١٩٢٨دا بڕیاردرا کۆمەڵێکی سیاسی دابمەزرێنرێت. بۆ بنچبەستی ئەم بڕیارە رەشید نەجیب و مەحمود جەودەت وخەلەف شەوقی داودی و ئەحمەد خواجا گەیشتنە خزمەت ئەمین زەکی بەگ. بە تەواوی پێویستییەکانیەوە باسی کۆمەڵەکە کرا. ئەمین زەکی بەگ ماوەیەک دۆش داما، لەدواییدا فەرمووی: من ناڵێم تێ مەکۆشن چونکە بەبێ تەشەبوس هیچ ناکرێت. بەڵام ئێوە ئەمینن کە بتوانن ئیدارەی ئەو کۆمەڵە بکەن؟ ئێمەیش زۆر خەریکبووین**

**و هیچیشمان پێ نەکراو نەتیجەیش بە باش نەگەڕا، من ناتوانم تێکەڵتان ببم، بفیکری من ناجح نابن، مەنعیشتان ناکەم چونکە واجیبتانە، وە لە لزومیشدا لێتان دوور نابم. شەرتی یەکەم ئەسرارە، سرتان دەرنەچێ، لە ئێستاشەوە تێتان ئەگەیێنم و بەسەری پێتان ئەڵێم ئەم نەوعە تەشەبوسانە بە نەزەری ئینگلیزەکان مەرغوب نییە، موکافەحە ئەکرێن. لە دواقسەدا گوتی: کاک مەحمود جەودەت ئەبێ لەسەر خۆ بێت، عەسەبییەت بێ فائیدەیە.**

**گەڕاینەوە، کۆمەڵ بڕیارەکەی بەجێ هێناو «حزبی پشتیوان» دامەزرا. ئیتر بەباش نەزانرا لەم بابەتەوە ئەمین زەکی بەگ تێکەڵ بکرێ، وە یان پرسیاری لێ بکەن».**

ئەمین زەکی بەگ باوەڕی بەو جۆرە ڕێبازە نەبوو، بەلای ئەوەوە، وەک گووتمان، خوێندن و خوێندەواری تاکە چرای ڕێگەی سەرفرازی گەل بوو. لەم بارەیەوە، نەشوێنێکی تری وەلامەکانیدا ئەحمەد خواجا ئەم سەرگوزشتەیەی بۆ تۆمار کردووین:

**«جارێکیان ئەمین زەکی بەگ لەگەڵ خۆی بردمی بۆ وەزارەتی ئەوقاف، ئەوسا ئەو وەزیری ئەوقاف بوو بە وەکالەت. کە دانیشتین فەرمووی: خاڵۆ باوکت باوکمە تۆیش برامی. بۆ ئێمە ئیمڕۆ چەکبازی و خۆ بە کوشتدان بەکارنایەت، لە شوۆن یێکەس تر کوردە، کەوابوو دەردی دەرمانی ئێمە خوێندنە، عیلم و سەقافەت ئەبێ بەهۆی ڕزگاری. قەسەم بەسەری باوکت ڕۆژێک ئەبێ لە عالەمدا ژێردەستی و ئەسارەت نامێنێ، هیندوو هەموو ڕەشەکانی ئەفریقا دێنە ڕیزی بەریتانیا، بەڵام ئەویش بزانە کورد لە هەموویان مستەحەقترو لە پێشترە، لە بەر ئەوە من ئەڵێم تێکۆشن بۆخوێندن».**

ئەمین زەکی بەگ حەوت جار بووە ئەندامی **«ئەنجومەنی نوێنەران»** (مجلس النواب)، جاری یەکەمیان لەیەکەم خولی ئەو ئەنجومەنەدا بوو کە ڕۆژی شازدەی تەموزی سالی ١٩٢٥ دەستی بەکارەکانی کرد، دوا جاریشیان لە خولی دەیەمینی ئەنجومەندا بوو کە ڕۆژی نۆی تەشرینی یەکەمی سالی ١٩٤٣دەستی پێکرد، بەلام زۆری نەخایاند بەپێی فەرمانێکی تایبەتی کۆشک کرایە ئەندامی **«ئەنجومەنی**

**پیران»** (مجلس الاعیان) که ئەندامەکانی لەلایەن مەلیکەوە دادەنران و هەرکەسێک پایەو مەقامێکی تایبەتی نەبووایە بۆ ئەو شوێنە هەڵنەدەبژێردرا.

وەک پەرلەمانتار لە رۆژگاری پاشاییدا، یا هیچ نەبێت تا چلەکان، نە لە تەو کورد و نە لە ناوعەرەبدا یەکێک نەبوو بتوانێت شان لە شانی ئەمین زەکی بەگ بدات، دوو راپۆرتی زۆر نایابی پێشکەش کردووە بە ئەنجومەن، **یەکەمیان** دەربارەی خوێندن و پەروەردەیە لە ناوچە کوردەواریەکانداو **دووەمیان** دەربارەی کارو باری لەشکرە. دوو رۆژ بەر لە تەواو بوونی خولی یەکەمی ئەنجومەن رۆژی بیستو هەشتی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٢٨، ئەمین زەکی بەگ نامیلکەیەکی ئامادە کرد بەناونیشانی **«محاسەبەی نیابەت»** کە هەمان ساڵ لە بەغدا بەچاپی گەیاندووەو تە سی و یەک لاپەڕەی قەوارە مامناوەندیدا هەر لەسەر بەرگی نامیلکەکەوە رووی دەمی کردۆتە **«موەکیلە موحتەرەمەکانی»** و پێیان دەڵێت: **«ئەوی حیسابی پاکە لە محاسەبە بێ باکە»**، ئینجا بەوردی نوێنەری سلێمانی باسی ئەو کارانەی دەکات کە لە گشت بوارەکاندا لە ماوەی دوو ساڵ و نیوی خولی یەکەمی ئەنجومەندا بۆ خزمەتی شارەکەی کردوون و کۆتایی نامیلکەکەی بەم دوعایە دێنێت کە ئیمڕۆکە هەموو کوردێک زۆر لەوسا پتر پێویستی پێیە:

**«ئیتر تەمەنام لە قاپی خوای تبارک و تعالی ئەمەیە کە خاسیەتی برایەتی و ئیدراک و فزیلەتی دووربینی و ئیخلاسمان زیاترکاو دڵمان لەگەڵ یەکتریدا چاکو پاک بفەرموێ، لەمسیبەتی حەسەد و غەرەز و لە بەڵای نیفاق و ئیختلاف بە دورمان بکات، والسلام علی من إتبع الهدی، ١٩٢٨/١/٢٦ محەمەد ئەمین زەکی».**

بەڵگنامەیەکی نهێنی ئینگلیزەکان بە تایبەتی و بە سەر سورمانێکی زۆرەوە باسی **«محاسەبەی نیابەت»**ی کردووەو بەرز نرخاندوویەو دەڵێت ئەو جۆرە رەفتارە تەنها لە ناو پەرلەمانتارەکانی وڵاتە رۆژئاواییە پێشکەوتووەکاندا باوە.

پاش چەند ساڵێک ئەمین زەکی بەگ **«دوو تەقەلای بێسوود»**ی بڵاوکردەوە کە دەربارەی ئەو کۆششانەیەتی لە ئەنجومەنی نوێنەران و دەزگاکانی میریدا بۆچارەسەر کردنی چەند لایەنێکی کەموکورتییەکانی ناوچە کوردەوارییەکان داونی، ئەو کارەی

رقی ناپیرۆزی کاربەدەستانی هەڵساندو کتێبەکەیان قەدەغە کرد. چەند بەڵگەنامەیەکی دەگمەنم لەو بارەیەوە دەسکەوتووە، هیوادارم لە دەرفەتێکی تردا بتوانم بێمەوە سەر ئەم باسە.

ئەمین زەکی بەگ، بێ گومان، یەکێکە لە گەورەپیاوە دڵسۆزەکانی کوردو چ ژیانی و چ بەرهەمو خزمەتەکانی تری شایانی هەموو جۆرە بایەخپێدانێکن و ئەم کارە پێویستە هێشتا زۆری بەدەمەوە ماوە. هەر بۆنموونە دەڵێم: بەبۆنەی دەرچوونی گۆڤاری **«نزار»**ەوە لەنیسانی ساڵی ١٩٤٨دا رۆژنامەنووسی عیراقی عەلی شاکیر تکریتی دیدەنییەکی تایبەتیی لەگەڵ ساز کردووە کە، **پێم وایە، پێویستی بە خوێندنەوەیەکی مێژوویی و فیکری قووڵە، چونکە بەشێک لە ناوەرۆکی ئەو دیدەنییە جێگەی گومانە.**

بابەتی نۆیەم*

# هەڵوێستێکی جوامێرانەی ئافرەتانی سلێمانی

ساڵانی شەڕی دووەمی جیهان (١٩٣٩-١٩٤٥) برسێتی و نەبوونی باڵیان بەسەر هەموو ناوچەکانی کوردستاندا کێشابوو. زۆربەی هەرە زۆری خەڵک بەدەست گرانییەوە دەیاننالآند. بەپێی ژمارە هەشتی رۆژنامەی «الشرارة» ساڵی ١٩٤٢ نرخی نان لە کەرکوک چوار هێندی نرخی بوو لە بەغدای پایتەخت. هەمان رۆژنامە لە ژمارە بیستی خۆیدا باسی ئەوەی بۆ کردووین چۆن رۆژێکی پایزی ساڵی ١٩٤٢ لە ماوەی تەنها شەش سەعاتدا نرخی تەنێک گەنم لە ناو بازاڕی سلێمانیدا پێنج دینار بەرزبۆتەوە. پێنج دیناری ئەو رۆژگارە پارەیەکی یەکجار زۆر بوو، دەگمەن مووچەی مانگانەی وردە فەرمانبەرانی ئەوسا دەگەیشتە دە دینار. ئەو بارودۆخە سەختە پاڵی بە ژمارەیەک دایک و باوکی نەدارەوە نا دەست لە کۆرپەکانیان هەڵگرن. زۆرنووسی دڵسۆز محەممەد تۆفیق وردی لە لاپەڕە شەشی کتێبی **«شۆڕشی چواردەی تەممووز مێژووی عیراقی گۆڕی»**دا دەڵێ:

**بەچاوی خۆم ئەمدی چۆن خەڵکی لەتاو نەبوونی ناچار منداڵەکانیان ئەفرۆشت.**

بەپێی گێڕانەوەی **«الشرارە»**ش جاری وا هەبوو کڕیارو فرۆشیاری ئەو زاروڵانە لەناو خۆیاندا رێککەوتنامەی تایبەتییان مۆر ئەکرد.

ئێمە لەم کورتە وتارەدا تا ساڵی ١٩٤٢مان مەبەستە کە دەکاتە نیوەی ماوەی شەڕی دووەم.

---

(*) لە ژمارە (٨٥)ی گۆڤاری «رەنگین»ی ساڵی ١٩٩٥دا لە ل٦-٨ دا بلاوکراوەتەوە.

ڕۆژی دووی شوباتی ئەو ساڵە موتەسەریفی سلێمانی مستەفا قەرەداغی لە ڕۆژنامەی حوکمەت **«الوقائع العراقیة»**دا بەیاننامەیەکی بڵاوکردۆتەوە کە ئەمە دەڵییە:

**«بیستوومە گەلێک لە خانمانی شاری سلێمانی زۆر بە پەرۆشن بۆ بەشداریکردن لەو باربووە گشتییەدا کە بەپێی بانگەوازی ژمارە ٥٨٤ی ڕۆژی هەشتی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی و بەیاننامەی ژمارە ٨١٧ی ڕۆژی سیازدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ی وەزارەتی کاروباری ناوخۆ بڕیاردراوە بۆ یاریدەی هەژاران ساز بکرێ. لەسەر ئەو داواو ئارەزووە بڕیارماندا لیژنەیەک لەو خانمانەی ناویان لە خوارەوە تۆمار کراوە دامەزرێنرێ بۆ سازکردنی باربوویەکی گشتی بەناوی یاریدەی هەژارانی شاری سلێمانییەوە بەو مەرجەی کارەکەیان لەماوەی حەفتەیەکدا تەواو بکەن، لە ئێوارەی ٣٠ی یەکەوە تا ئێوارەی ٦ی دووی ساڵی ١٩٤٢»**.

سەرۆکی لیژنە سەعدییە خان بوو، چواردە ئەندامی لەگەڵ بوو کە ئەمە ناوەکانیانە بەڕیز وەک چۆن لەو ژمارەیەی **«الوقائع العراقیة»**دا تۆمار کراون:

**«حەپسە خانی هاوسەری حەفیدزادە شێخ قادر، بەهییە خانی هاوسەری حەفیدزادە شێخ مەحمود، زەهرە خانی هاوسەری عیزەت عوسمان، ڕەحمەخانی هاوسەری میرزا فەتاح، شوکرییە خانی هاوسەری بەڕێوەبەری پۆلیسی شار جەمیل ڕەشید، سەدیقە خانی هاوسەری حەمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغا، مەلیحە خانی هاوسەری عەبدوڵڵا نوری، فاتمە خانی هاوسەری حاجی مەلا محیەدین، فاتمەخانی هاوسەری قادر ئاغای حاجی مەلا سەعید، ئەختەر خانی هاوسەری حاجی حەمە ساڵح بەگ، فاتمە خانی هاوسەری حاجی برایم ئاغا، بەهییە خانی کچی سەعید ئەفەندی عوسمان ئاغا، ئامینە خانی هاوسەری مستەفا مەزهەر، فاتمە خانی هاوسەری میرزا کەریمی حاجی شەریف»**.

ناوەکانی ناو ئەم لیستەیە شایانی پێداچوونەوەو لێدوانێکی خێران. سەرۆکی لیژنەکە سەعدییە خان هاوسەری مستەفا قەرەداغی خۆی بوو، هەرچەندە ئافرەتێکی لێهاتوو بوو، بەڵام لەبەرئەوەی ژنی موتەسەریف بوو کرایە سەرۆک. سەعدییە خان



لە بنەماڵەیەکی ناسراوە، کچی مەحمود فەخریی میللییە کە ئەویش کاتی خۆی موتەسەریفی هەولێر بوو، هەروەها دایکی ڕۆژنامەنووسی بەناوبانگ کامەران قەرەداغییە.

**یەکەم ناوی ئەندامەکان حەپسە خانی نەقیبە** کە یەکێکە لە شاژنانی کوردستان، ناوی لە تۆماری مێژووی هاوچەرخی کوردا گەورەو دیارە، ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرو ڕۆژنامەنووسان بەرێزەوە باسیان کردووە.

کوردایەتی حەپسە خان لەناو دەیان بەڵگەنامەی نهێنیی ئینگلیزەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، کاک فوئاد عارف هەموو کوردێکی دڵسۆزی خۆش ئەوێ، بەڵام کەم کەس وەک حەپسە خانی نەقیب چۆتە ناو ناخی دەروونییەوە، لە دانیشتنە ئاوەدانەکانی خۆیدا هەمیشە بەرێزو تەقدیرەوە باسی ئەکات.

**دووەم ناو بەهیە خانی کاکەمینی عەتارە**، دایکی شێخ ڕەئوف و بابە عەلی و حەلاوە خانە، ئافرەتێکی هێمن و لەسەرخۆ، هاوغەم و هاودەردی شێخ مەحمود بوو.

**ئەندامی سێیەمی لیژنەکە زەهرە خانی هاوسەری عیزەت بەگی وسمان پاشای**

**جافه**، بۆ رۆژگاری خۆی ئافرەتێکی مۆدێرن بوو، ژیانی لە ئەستەمبووڵ بردبووە سەر. کچی مستەفا پاشا یامولکییە کە بە نەمرود ناوی دەرکردبوو، مامۆستای قوتابخانەی **«الزهراء»** بوو کە یەکەم قوتابخانەی کچانە لە مێژووی شاری سلێمانیدا.

**چوارەم ناو رەحمە خانی کچی حەسەنە**، میرزا فەتاحی مێردی برای میرزا فەرەجی حاجی شەریفە کە بازرگانێکی ناوداری کوردبوو لە بەغداو یەکێک بوو لەنوێنەرانی سلێمانی لە **«ئەنجومەنی دامەزراندن»** (المجلس التاسيسي)دا کە یەکەم دەزگای یاسادانەری عیراقییە.

ماڵی میرزا فەتاحی مێردی رەحمە خان و برای میرزا فەرەج لەکۆتایی ساڵی ١٩١٨وە تا کۆتایی بەهاری ساڵی ١٩١٩ بارەگای حوکمڕانیی شێخ مەحمود بوو. ئەمین زەکی بەگیش کە ناوەندی ساڵی ١٩٤٨ مەرگ بۆ دواجار هێنایەوە سلێمانی لای میرزا فەتاح میوان بوو، ئەمین زەکی لەگەڵ رەحمە خاندا دوورە خزمن. شەوو رۆژ ماڵی میرزا فەتاح جمەی ئەهات، بەدەیان کەس دەهاتنە خزمەت ئەمین زەکی. پیرەمێرد هەر بۆ نووستن ئەچۆوە ماڵی خۆی، شێخ مەحمود هەرچەندە لە سەرنجی سیاسیی ئەمین زەکی زۆر رازی نەبوو، بەڵام لەداری کەلییەوە بەتایبەتی بۆ بەخێرهاتنی هاتە سلێمانی.

ئەمین زەکی دوای ئەوەی ماڵئاوایی لەسەرچنارو ئەزمڕو سەراوکرد شەوی نۆ لەسەر دەی تەمووزی ساڵی ١٩٤٨ لەماڵی رەحمە خان بۆ دواجار چاوی لێکنا. سەرلەبەری جەماوەری سلێمانی بە ئەوپەڕی پێزانینەوە بە خاکی سەیوانیان سپارد.

لێرەدا دێمە سەر دواناوی لیستەکە چونکە پەیوەندی بەهەمان بنەماڵەوە هەیە، ئەویش فاتمە خانی کچی فەتاح ئەفەندییە، میرزا کەریمی حاجی شەریفی مێردی برا بچوکیی میرزا فەتاح و میرزا فەرەجە، فاتمەخان دایکی ئەمینی میرزا کەریمی چیرۆکنووسە. کەمالی کوڕیشی سەرنووسەری گۆڤاری **«نەورۆز»** و رۆژنامەی **«بڕوا»** بوو کە هەردووکیان دوای شۆڕشی چواردەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ بۆ ماوەیەک لە سلێمانی پەخشبوون.

**پێنجەم ئەندام شوکرییەخانی کچی عاشق ئەفەندیی کەرکووکییە**، جەمیل

رەشیدی مێردی بەڕێوەبەری پۆلیس بوو، لەبەر ئەوەی کوردی ئەزانی سییەکان و چلەکان چەند جارێک لە هەولێرو کەرکوک و سلێمانی ئەو پۆستەی پێ سپێردرا. ئەلێن زۆر رقی لە چەپڕەوو چەپڕەوی دەبووەوە.

**شەشەم ناوی ئەندامی ناو لیستەکە سەدیقە خانی هاوسەری حەمەی ئەورەحمان ئاغایە** کە یەکێکە لە ناودارانی سلێمانی. بیستەکان و سییەکان حەمە ئاغا سەرگەرمی کوردایەتی بوو، چەند جارێک ناوی لەناو بەڵگەنامە تایبەتییەکانی ئینگلیزدا هاتووە، یەکێک بوو لە گیراوەکانی راپەڕینی شەشی ئەیلول، خەزووری خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانییە.

**دوای ئەو ناوی مەلیحەخان دێ** کە یەکێکە لە خزمانی حەپسە خانی نەقیب، مامۆستا بوو لە قوتابخانەی **«الزهراء»**، عەبدوڵلا نووریی مێردی بۆی موسڵمان بوو.

**هەشتەم ئەندامی لیژنەکە فاتمە خانی هاوسەری حاجی مەلا محیەدینە**، واتە دایکی تەها محیەدین و ئەمین ئاغاو قادر ئاغا کە پەنجاکان سەرۆکی شارەوانی سلێمانی بوو.

**نۆیەم ئەندام فاتمە خانی هاوسەری قادر ئاغای حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکلی زادە**، کچی ئەحمەد ئاغای کەرکوکلی زادەو دایکی دوکتۆر سیروانی ئەندازیارە، ئەمانیش لەناسراوانی شارن.

**دەیەمین ناو ئەختەر خانی کچی حاجی مەلا محیەدینە**، حەمە ساڵح بەگی حەمە عەلی بەگی مێردی دە جار بووە نوێنەری سلێمانیی لەپەرلەماندا، واتە یەک فاسیلە لە شازدەی تەمووزی ساڵی ١٩٢٥وە تاکو سی و یەکی مایسی ساڵی ١٩٤٦ کە دەکاتە ٢١ ساڵ لە تەمەنی ٣٣ ساڵەی ئەو پەرلەمانە. هەرچەندە حەمە ساڵح بەگ لەو ماوە دوورو درێژەدا لەکاتی کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی نوێنەراندا هیچی نەگوتووە، بەڵام یەکێکە لەو شەش نایبە کوردەی شوبات و مارتی ساڵی ١٩٣٠دوو یاداشتی مێژوویی بایەخداریان دەربارەی مافی کورد دایە نوێنەری باڵای بەریتانی (**المندوب السامي البريطاني**)و سەرەک وەزیرانی عیراق. ئەختەر خان دایکی حەمە عەلیی حەمە ساڵح بەگە کە ئێستا سکرتێری جێگری سەرکۆمارە.

**یازدەمین ناو فاتمە خانی کچی حاجی سەید مستەفاو هاوسەری حاجی برایم ئاغایە** کە هەردووکیان لە بنەماڵە دەوڵەمەندو ناسراوەکانی شارن، فاتمە خان دایکی حەمە سەعید خەفافە کە ئێستا نیشتەجێی لەندەنە، کاتی خۆی یەکێک بوو لە ئەندامە چالاکەکانی ژووری بازرگانی بەغدا.

**بەهیە خان کچی سەعید ئەفەندی عوسمان ئاغاش کە دوازدەمین ئەندامە،** لە نەوەی خواجا ئەفەندیی بەناوبانگە، برازای ئەحمەد خواجای مێژوونووس و هاوسەری تۆفیق قەزازە، شەفیقە سەعیدی خوشکی یەکێکە لەمامۆستە پێشەنگەکانی ئافرەتی کورد.

**دانەرانی لیستەکە لە سیازدەمین ناوی ئەندامی لیژنەکەدا بەهەڵەچوون، لەبریتی ئایشەخان ئامینە خانیان نووسیوە،** ئایشە خانی هاوسەری مستەفا مەزهەر کچی سەعید ئەفەندی و خوشکی ساڵح سەعیدە کە ماوەیەک مودیری مەعاریفی سلێمانی بوو. هەرچی مستەفا مەزهەرە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکان **«مودیری مەعاریفی کوردستان»** بوو، لە کەرکووک دائەنیشت، بەدەرگای ماڵەکەید ئەو ناونیشانەی هەڵواسیبوو. مستەفا مەزهەر لەچلەکاندا مودیری مەعاریفی سلێمانی بوو، هەر پێنج کچەکەی، مونیرەو نەسرین و گەلاوێژو پاکیزەو نیهایەت. لە مامۆستا ناسراوەکانی شارن، سەرداری برایان تاقانەیە.

شایانی باسە لەناو هەموو شارو شارۆچکەکانی عیراقدا تەنها ئافرەتانی سلێمانی بەدەنگ بانگەوازەکەی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی و بەیاننامەکەی وەزارەتی کاروباری ناوخۆوە چوون، بەهەموو ژمارەکانی ساڵی ١٩٤٢ی **«الوقائع العراقیة»**دا چوومەوە، لە شارەکانی دی تەنها پیاوان لیژنەی باربوویان دامەزراندووە. ئەندامانی لیژنەی باربووی پیاوانی سلێمانیش کە لەهەمان کاتد بەسەرۆکایەتی مستەفا قەرەداغی دامەزرێنرا بریتی بوون لەحاجی سەعید ئاغاو عیزەت بەگی وەسمان پاشاو حەمە ساڵح بەگی حەمە عەلی بەگ و شێخ قادری برای شێخ مەحمودو حەمە ئاغای ئەورەحمان ئاغاو میرزا فەتاحی حاجی شەریف و حاجی برایم ئاغاو قادر ئاغای حاجی مەلا سەعیدو ئیسحاقی عەلەکەو مەحمود ئەفەندیی سەرۆکی شارەوانی.

# کۆمەڵەی زەردەواڵە

ڕۆژبەڕۆژ زۆرتر باوەڕ بە بایەخی بێ ئەندازەی بەڵگەنامە مێژووییەکان بۆ زانین و لێکدانەوەی ڕوداوەکان دێنم. ئەمە بۆچوونێکی گشتییەو بۆ مێژووی هەموو گەلێک دروستە، **بەڵام بایەخی ئەو جۆرە بەڵگەنامانە بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەو گەلانەی دووچاری چەوساندنەوەی نەتەوەیی هاتوون زۆر تایبەتییە، چونکە پاراستنی کەلەپووری سیاسیی ئەو جۆرە گەلانە کارێکی ئاسان نییە.**

جاری وا هەیە لەناو ئەو بەڵگەنامانەدا شتی ئەوتۆ دەدۆزمەوە کە کەسمان هیچمان دەربارەی نەبیستووە. بەڵگەنامەکانی کۆشک و وەزارەتی ناوخۆی ڕۆژگاری پاشایی لەم بووارەدا بایەخیان زۆرەو لە گەلێک ڕووەوە هیچیان لە بەڵگەنامە بەریتانییەکان کەمتر نییە. لەم کورتە وتارەدا چەند نموونەیەکی نوێ دەخەمە بەرچاو.

تۆفیق قەزازی مام و خەزووری سەعید قەزازی بەناوبانگ تا ناوەندی چلەکان کوردایەتی کردووە، یەکێک بوو لە ڕابەرەکانی ڕاپەرینی شەشی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٠ لە سلێمانی، لەسەر ئەو ڕاپەرینەو چەند جارێکی تر گیراوەو دوور خراوەتەوە بۆ کەرکوک و مووسڵ و بەسرە. لەبەر ئەوە پتر لە فایلێک لە فایلەکانی وەزارەتی ناوەخۆی ڕۆژگاری پاشایی بۆ ئەو بەڵگەنامانە تەرخان کراون کە باسی تۆفیق قەزازو چالاکییەکانی دەکەن. وا دیارە تۆفیق قەزاز دوای بەربوونی بۆ ماوەیەک بە نهێنی یاریدەی لێقەوماوانی شەشی ئەیلولی داوە.

یەکێک لەو فایلانەی کە بەم ناونیشانەوەیە" **«المکتب الخاص، ١٩٤٥، وزارة**

---

(*) لە گۆڤاری **«ڕەنگین»**ی ژمارە(١٢٥)ی حوزەیرانی ١٩٩٩، لە ل٦-٧دا بلاوکراوەتەوە.

**الداخلية العراق، رقم الاضبارة:٧٩/١٤/٦٣، العنوان: الشخصيات الكردية، الموضوع: السيد توفيق قزاز»** باسی دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نهێنی زۆر سەیرمان بۆ دەکات کە توفیق قەزاز بەهاری ساڵی ١٩٤٥لە سلێمانی بە ناوی **«کۆمەڵەی زەردەواڵە»**وە دایەزراندووە. **وا دیارە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە ویستوویانە وەک زەردەواڵە بەو کەسانەوە بدەن کە سەر بە میری بوون.** وەک بەڵگەنامەکە دەڵێت پەخشەیەکی تایبەتیشیان هەر بە ناوی **«زەردەواڵە»**وە هەبووەو ژمارەکانیان بە نهێنی بە ناو شاردا بڵاوکردۆتەوەو گەیاندویاننەتە هەڵەبجەش. فایقی کوڕە گەورەی تۆفیق قەزازو عەلیی پیاوی بە ئەمەک و دڵسۆزی ئەرکی بڵاوکردنەوەی پەخشەکەیان کەوتۆتە ئەستۆ.

بەڵگەنامەکە ناوی ئەندامانی **«کۆمەڵەی زەردەواڵە»**ی بۆ تۆمار نەکردووین. بەڵام چەند جارێک باسی کۆبوونەوەی یەک لەسەر یەکی تۆفیق قەزازو شێخ قادری برای شێخ مەحمود و ئەحمەد تەقی و حەمەی ئەورەحمان ئاغاو کوێخا ئەمین جافەتی و مەلا تایەری خوردەڵۆکی بۆ کردووین، جارێک لەو جارانە لە سەرچنار کۆبوونەتەوەو بۆ رۆژی داهاتوو شێخ قادرو حەمە ئاغاو ئەحمەد تەقی بە تایبەتی چوون بۆ کەرکوک. وادیارە رابەرانی کۆمەڵە لە هەموان زۆرتر بایەخیان بە بەگزادەی جاف داوەو ویستوویانە دژی میری هانیان بدەن. لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە بەپێی گێڕانەوەی بەڵگەنامەکە **«کۆمەڵەی زەردەواڵە»** پێوەندی بەو کوردانەی بەغداوە هەبووە کە بە ئاژاوەچی و گێرەشێوێن ناویان دەبات.

**حاڵی نۆیەمی** بەڵگەنامەکە باسی گرتنی توفیق قەزاز لە گوندێکی نزیک سەراوی سوبحان ئاغای نزیک هەڵەبجە دەکات و لە بەندی داهاتویدا هۆی ئەو گرتنەی بۆ باس کردووین کە وا لە خوارەوە بە عەرەبی، لەگەڵ دەسکارییەکی کەمی رێنووس و رێزمانەکەیدا، وەک خۆی بڵاوی دەکەینەوە:

**«بما ان جماعه من اقارب توفيق القزاز قد قامت خفيه باخراج مجله بعنوان**(کۆمەڵی زەردەواڵە) **أي مجموعة الزنابير، ويستبان ان هذه الجماعة العصابة هي متفقة مع المفسدين الموجودين في بغداد، ويظهر من فحوى المواد المذكورة أعلاه أن توفيق القزاز قد وضع أساسا للفساد والمشاغبة مابين الاهالي**



**تۆفیق قەزاز**
**نۆکەری بەریتانیای گەورە لە پێناوی کوردو کوردستاندا**

والعشائر، وبدعاياته هذه تسبب اغراء الناس لهدم نظام الدولة، وادارة افسادات، وعلمنا ان بقاء هذا الرجل طلقاً في السليمانية يلد خطراً وخيماً على سلامة الدولة و مصالحها و الأمن العام، وقد يشوش الرأي العام بتحريضاته، فعليه، استنادا الى السلطة المخولة لي بموجب الفقرة السابعة من المادة الخامسة من مرسوم صيانة الأمن العام، وسلامة الدولة رقم ٥٦ لسنة ١٩٤٠ قررنا تبعيده من السليمانية الى البصرة ليبقى تحت الحراسة الى ان يصدر القرار الاخير من هذه المتصرفية. التوقيع: حاكم الجزاء - متصرف السليمانية».

پارێزگاری سلێمانی کە بە خوێنی سەری تۆفیق قەزاز تینو بوو مەسەلەکە گەورە دەکات و کەینو بەینی تەمەنی ئەو ڕۆژگارە دێنێتە ناوەوەو گەلێک تۆمەت دەداتە پاڵ تۆفیق قەزاز. هەر لەو ڕۆژانەشدا حەمە ئاغای عەتتار لە ناو شاردا دەکوژرێت و ئەو باسە دەبێتە وێردی سەر زمانی هەمووان، هەر یەکە بە جۆرێک لێکی دەداتەوە. دەستەو دایەرەی تۆفیق قەزازیش دەست هەڵناگرن، بۆ خۆیشی لە بەسرەوە هەر ڕۆژەی بروسکەیەکی بێزاری دەنێرێت بۆ سەرەک وەزیران لە بەغدا. بەڵام سەیر

ئەوەیە کـە بلاوکـردنەوەی پەخـشـەی نهـێنی چ لە بەغـداو چ لە ناو شـارەکـانی کـوردسـتـاندا وەک خـۆی بەردەوام دەبێت، ئەوەی پارێزگـای سلێـمـانیی ناچار کـرد ئێوارەی رۆژی بیست و هەشتی نیسانی ١٩٤٥ کۆبوونەوەیەکی گەورە لە باخچەی شـارەوانی سـاز بکات و هەر بۆ خـۆیشی لە بەڵگەنامـەیەکی نهـێنی بایەخـدارد پوختەی ئەو باسەی بەم جۆرە بۆ تۆمار کردووین:

**«بۆ وەزارەتی ناوخۆی، ژمارە ٧٩٠، رۆژ ١٩٤٥/٥/١**

**بابەت: سازکردنی کۆبوونەوەیەک**

**بە بۆنەی تاوانی کوشتنی حەمە ئاغـای عەتتارەوەو گرتنی بەشێک لە دەستەی فاسیدو گومانلێکراوو دوورخستنەوەی تۆفیق قەزاز هێمنی گەڕاوەتەوە بۆ لیوای سلێـمـانی، بەڵام لەبەر بلاوکـردنەوەی پەخـشـە لە بەغـداو گـەیشـتنی بۆ ئێـرە بە پێویستمان زانی خەڵکی بە ئاگا بێنین دەربارەی ئەو گۆبەندو تاوانانەی دەستەیەکی فاسید لە بەغداو کلکەکانیان لە بەغداو لیواکان ناویاننناونەتەوە، بۆیەکا خەڵکیمان بانگهـێشت کرد بۆ باخچەی شارەوانی لـــە سەعـــات شـەشــی پاش نیــوەرۆی رۆژی ١٩٤٥/٤/٢٨ ، کۆبوونەوەکە گشتی بوو، باخچەکە بە پیاوان و ژنان تەنرلو ناچار بووین ژمـارەیەک بڵندگۆ دابنێین و لەکاتی دیاریکراودا وتارێکمان بە رستەی گـشــتی رێکخـراو، بێ ناوهێنانی کـەس پێـشکەش کـردو تێـیـدا باسی هۆی بانگهێشتنەکەمان کردو شەرحی هەموو لایەنەکانی ئەو رووداوە ناخۆشانەمان کرد کـە لە لیـوای سلێـمـانی قـەومـان (وەک) بلاوکـردنەوەی چەند پەخـشـەیەکی سەرلێشێـوێنەر بۆ رای گشتی لە لایەن دەستـەیەکی فـاسیدی ناسراوەوە بە نیـازی نانەوەی ئاشوبەو تێکدانی ئەمنیـەتی لیواو ئاسوودەیی گشتی بۆ وەدەستـهێنانی قازانجی خۆیان، دوای ئەوە هەمان دەستە دەستی خۆیان بە خوێنی بێ تاوانان سوور کرد، ئەو کارەی حوکمەت نەیتوانی لە ئاستیا بێدەنگ بێت و ناچار بوو بە توندی بەرەنگاری بێتـەوە. دوای ئەوەی هەموو شـتێکمان بۆ خـەڵکەکە روون کـردەوەو لە راستی رووداوەکان تێگەیشتن چەند جارێک پشتگیری خۆیان بەرانبەر عەدالەت و هەنگاوەکـانی حوکـمـەت دەربڕی و لە کـۆتاییـدا بانگیـان بۆ ژیانی خـاوەن شکۆ مەلیک و پایەدار جێنشین کرد. بۆ ئاگاداری ئەوەی بوو پێشکەشمان کرد. ئیمزا:**

**پارێزگاری سلێمانی»**.

لەم کۆبوونەوەیەدا پارێزگاری سلێمانی توخنی باسی **«کۆمەڵەی زەردەواڵە»** نەکەوتووە، تەنها ئاماژەی بۆ ئەو پەخشانە کردووە کە بە نهێنی لە بەغداو سلێمانی و شارەکانی تری کوردستان بلاودەکرانەوە. کە گەڕامەوە بۆ ژمارەکانی **«ژین»**ی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٥ دەبینم پارێزگاری سلێمانی سەرجەمی لاپەڕەی یەکەمی ژمارە ٧٨٣ی ڕۆژی بیست وشەشی نیسانی ڕۆژنامەی **«ژین»**ی ئەو ساڵەی تەرخان کردووە بۆ بلاوکردنەوەی باسی ئەو ڕووداوانەی سلێمانی کە باسیانمان کرد، لەگەڵ ئەو هەنگاوانەی میری ناونی بۆ دامرکاندنەوەیان. لەو ژمارەیەی **«ژین»**دا باسی **«کۆمەڵەی زەردەواڵە»** بەم جۆرو شێوازە کراوە کە دەقەکەی وەک خۆی بلاودەکەینەوە:

**«تۆفیق قەزاز لە خزمەکانی دەستەیەکی بەدزییەوە بە ناوی کۆمەڵی زەردەواڵەوە ڕێکخستووەو مجەلەیەکیان بەو ناوەوە دەرکردووە، وا دەردەکەوێ کە ئەم یاخیانە لەگەڵ مفسیدەکانی بەغدا یەکن. بەمانەی کە لەسەرەوە نووسراون دەردەکەوێ کە تۆفیق قەزاز بناغەی فەسادو پشێوی لە مەیانەی ئەهالی و عەشایەردا داناوە، کە بە دعایەو چاوچۆیی و تەفرەدانی خەڵکی نیزامی دەوڵەتی تێکبداو فەسادێک بگێڕێ و کە زانرا ئەم پیاوە بە سەربەستی لە سلێمانیدا بمێنێتەوە عاقیبەتێکی خەتەرو وەخیم پەیدا ئەبێ و سەلامەت و ئەمنیەتی عامەو مەسلەحەتی دەوڵەت ئەکەوێتە تەشویشەوەو ڕای عام بەم تەحریضانە دائمییە ئەگۆڕێ، لەبەر ئەوە قەرارمان دا بە دوور خستنەوەی لە سلێمانی و دەستبەسەر بێ لە بەسرە تا قەراری ئەخیر لەم متصرفیەتە دەردەچێ»**.

هەڵبەت بایەخی سیاسیی **«کۆمەڵەی زەردەواڵە»** شتێکی ئەوتۆ نییە، بەڵام هەرچۆن بێت یەکێکە لە هەزاران لاپەڕەی ونی مێژووی گەلەکەمان کە پێویستیان بە گەڕان و خۆماندووکردنی بێ وچانەو مێژوونووسی ورد بۆی هەیە لە ڕێگەی ئەو جۆرە باسانەشەوە بگاتە ئەنجامی بایەخدار.

بابەتی یازدەمین*

# رزگاری لە کفری

بەر لەوەی جەنگی دووەم کۆتایی بێت رووناکبیرانی کوردیش وەک رووناکبیرانی تری ناوچەکە کەوتنە خۆو ژمارەیەک رێکخراوی نهێنییان دامەزراند کە بوونە دیاردەی دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێ لە مێژووی هاوچەرخی گەلی کوردا. **«پارتی رزگاری»** یەکێک لەو رێکخراوانە بوو کە دوای تەواوبوونی جەنگیش ماوەیەک ژیاو دوایی رێگەی بۆ دامەزراندنی ئەو دەستەو رێکخراوانە خۆش کرد کە بوونە هێزی بزوتنی یەکەمی مەیدانی فیکری و سیاسیی کوردستانی عیراق.

تا ئێستا ژمارەیەک لە نووسەرانی خۆمان و دەرەوە زۆروکەم باسی **«رزگاری»** یان کردووە کە هەمان کات ناوی چۆتە ناو یادداشتی دەستەیەک لەو سیاسەتمەدارە کوردانەی رۆڵیان هەبووە لە چالاکییەکانی **«رزگاری»**دا، بەڵام نووسینەوەی مێژووی ئەو رێکخراوە بایەخدارەی کورد هێشتا زۆری بەبەرەوە ماوە، بە تایبەت چونکە، وەک من بیزانم، تا ئێستا هیچ بەڵگەنامەیەکی رەسمی بۆ دیارکردن و لێکدانەوەی چالاکییەکانی **«رزگاری»** بەکار نەهێنراوە، هەرچەندە بەڵگەنامە تایبەتییەکانی دەزگاکانی رۆژگاری پاشایی لە عیراق پڕن لە زانیاری وردو دەگمەن دەربارەی دامەزراندن و پرۆگرام و پێڕەوو ناوی رابەران و ئەندامە چالاکەکان و گەلێک رووی تری ونی **«پارتی رزگاری»**. ئینگلیزەکانیش بەشی خۆیان بایەخیان داوە بە بزووتنەوەی کوردایەتی ئەو رۆژگارەو ئەوانیش لە بەڵگەنامە تایبەتییەکانی خۆیاندا باسی **«رزگاری»**یان کردووە.

یەکێک لە فایلە تایبەتییەکانی وەزارەتی کاروباری ناوخۆی رۆژگاری پاشایی بۆ

---

(*) لە ژمارە (١٢١)ی گۆڤاری **«رەنگین»**ی، ١٤ی شوباتی ١٩٩٩،لە ل ٦-٧دا بلاوکراوەتەوە.

**«پارتی رزگاری»** تەرخان کراوەو بە دەیان بەڵگەنامەی بایەخدارو دەگمەنی تێدایە کە ژمارەی لاپەڕەکانیان لە سەد لاپەڕە پترە. بایەخی بەڵگەنامەکانی ناو ئەو فایلە بۆ نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخی گەلی کورد لە نرخاندن نایەت. دەتوانرێت لە ڕێگەی ئەو بەڵگەنامانەوە گەلێک لاپەڕەی ونی خەباتی رزگاری و شێوازی چالاکییەکانی و ناوەرۆکی بەشێک لە پەخشە (**نەشرەکانی**)و ناوی ئەندامە دیارەکانی بەپێی ناوچە جیاوازەکانی کوردستان دیار بکرێت. با بەرکوڵی ئەو فایلە ئەم کورتە وتارە بێت دەربارەی رزگاری و ناوی ئەندامە دیارەکانی لە ناوچەی کفری کە هەمیشە یەکێک بووە لە لانە چالاکەکانی کوردایەتی رەسەن و کەم نـــاوچەی کـــوردەواری تـر وەک ئەو پاڵپشتی بابان و شێخ مەحمودی کردووە.

سەرجەمی حەوت لاپەڕەی ئەو فایلەی گوتمان بۆ باسی لقی رزگاری لە کفری و دەوروبەری تەرخان کراون کە پڕیانە لە زانیاری وردو دەگمەن. لە ڕێگەی ژمارەیەک سپلە کوردەوە، کە ناوی گشتیان تۆمار کراوە، دەزگاکانی میری بەوە دەزانی کە لقێکی فرەچالاکی **«پارتی رزگاری»** لەناو خودی شاری کفری و ژمارەیەک لە گوندەکانی دەوروبەریدا لە کاردان. بەڕێوەبەری گشتی پۆلیسی لیوای کەرکوک دوو جاران، یەکەمیان رۆژی هەشت و دووەمیان رۆژی چواردەی ئەیلولی ساڵی ١٩٤٦. ئەفسەری پۆلیسی شاری کفری لەوە ئاگادار دەکات کە رزگاری گەیشتۆتە کفری و دەوروبەری و داوای لێ دەکات بەپەرۆشەوە بکەونە سۆراخی ئەو باسە. پۆلیس و سیخۆڕەکانی ناو شاری کفری بە پەلە بەهەر چوار لادا دەکەونە خۆ. دوو حەفتە ناخایێنێ دەگەنە ئەنجام و بەوە دەزانن رزگاری تەواو پەلی هاویشتووە چ لە ناو شاری کفری خۆیداو چ لەناو ژمارەیەک لە گوندەکانی دەوروبەریدا. رۆژی بیستو یەکی ئەیلولی ساڵی ١٩٤٦ ئەفسەری پۆلیسی کفری یادداشتێکی دووروودرێژی چوار لاپەڕەیی دەنێرێت بۆ بەڕێوەبەری گشتی پۆلیسی کەرکوک.

بە پێی پوختەی زانیارییە زۆرەکانی ناو ئەو بەڵگەنامانە حاجی عەلیی حاجی محەمەد سەلیم ئاغای موختاری گەڕەکی سادەی ناو شار سەرۆکی لقی **«پارتی رزگاری»** بوو لە ناوچەی کفری. ئەندامە چالاکەکانی ناو شاریش بریتی بوون لە محێدین حاجی مستەفای بەزاز کە بەرپرسیاری بڵاوکردنەوەی پەخشەکانی حزب

بووەو سابیری حاجی فەتحوڵڵای بەزاز کە بەرپرسیاری کاروباری دارایی لق بووەو حەسەنی وەستا ئەحمەدی بەزازو حەسەنی حاجی سەمین کە پێکرا بەرپرسیاری کاروباری پرۆپاگەندەو ڕاگەیاندن بوون و حوسێنی وەستا ئەحمەدی بەزازو فەقێ محەمەدی سەعاتچی و حاجی فەتاحی حاجی ئەمینی بەزازو سەعیدی حەمە ڕەشی بەزازو ئەحمەد ڕەشیدی بەقاڵ و سەعیدی بەرگدروو حەسەنی حاجی ئەمینی بەزازو محێدین حاجی محەمەد سەلیم ئاغای برای سەرۆکی لق و شێخ نەجیبی کوڕی شێخ عەلی تاڵەبانی کە ئەوساکە لە کفری فەرمانبەر بووە.

له دەرەوەی شاریش ئەم ئەندامانە چالاک بوون:

له زەرداو شێخ عەتاو شێخ موکەڕەمی کوڕانی شێخ جەمالی تاڵەبانی، له گوندی قەره بولاغ شێخ نەجیب و شێخ نازیی کوڕانی شێخ وەهابی تاڵەبانی، له گوندی دوازده ئیمام عەزیز عەبدولڕەحمان کە هەر بۆ خۆیشی ئیمامی مزگەوت و بەرپرسیاری هێنانوبردنی نامەکانی لق بووه، له کەلار مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی مستەفای سەید ئەحمەد، واتا مستەفا نەریمانی بەناوبانگ بەرپرسی بووه، له سلێمان بەگیش مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی ئەحمەد محەممەد قەرەداغی و ناوی کوڕانی وەستا ئەحمەدی بەزازیش محەممەدو حەسەن و حوسێن هاتووه، یەکەمیان ساڵی ١٩٤٦ مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بووه له کەرکوک و کاتی حەوانەکان گەڕاوەتەوه کفری.

دوو لاپەڕەی قەوارە گەورەی بەڵگەنامەکان بۆ باسی شێوازی کارکردنی **«رزگاری»** له ناوچەی کفریدا تەرخان کراون. جگه له پرۆگرام و پێڕەوی گشتیی **«پارتی رزگاری»** لقی کفری پێرۆکەیەکی تایبەتیی بۆ ئەندامەکانی خۆی دارشتبوو. لەوێدا **«کوردو کوردستان و برایەتی»** دروشمی لقه. بەرپرسی، واتا حاجی عەلیی حاجی محەممەد سەلیم ئاغا، سەرۆکەو پایەو مەقامی لای ئەندامان زۆر بەرزەو کەس له قسەی دەرناچێت، دەستەی سەرۆکایەتیش له سێ ئەندام پێکهاتووه، خۆی و دوو ئەندامی که پێکرا چوار دەنگیان هەیه- سەرۆک دوو دەنگ و دوو ئەندامەکەش هەر یەکەیان دەنگێک.

**جگه له ناو شار لقی کفری چوار رێکخراوی تری هەبووه.** له شۆڕتەپەو شیرین تەپەو بانه بۆرو کەڵەشێر تەپه که کەوتۆته نێوانی قەره بولاغ و کەلارەوە. هەر یەک لەم چوار رێکخراوه بەرپرسیاری خۆی هەبوو، ئەمانیش له بەڕێوەبردنی لقدا دەنگی خۆیان هەبوو.

**ئەندامانی لق دەبوو خاوەن رەوشتی بەرزو دڵسۆزو راستگۆو فیداکار بن و بێ پشوو هەوڵ بدەن بۆ راکێشانی هەموو کوردێکی خاوێن بۆ ناو ریزەکانی رزگاری.** دەستەی سەرۆکایەتی کۆبوونەوەیەکی تایبەتیی بۆ هەر ئەندامێکی نوێ ساز دەکرد.

حزبی دیموکرات کوردستان

کومیتەی حزبی دیموکراتی کوردستانی عراق

کۆمیتەی حزبی دیموکراتی کوردستانی عیراق لە مهاباد
پێش ١٩٤٦/٨/١٦

رزگاری

ئورگانی پارتی دیموکراتی کورد

ژمارە (1) سالی (یەکەم)

رزگاری ژمارە (١)ی لە ١٩٤٦/٩/٢ دەرچووە

**لەو کۆبوونەوەیەدا سەرۆکی لق بانگی کوردایەتیی دەدا بە گوێی ئەو ئەندامەدا کە دوابەدوای ئەو بە خواو بە قورئان، بە شەرەفی خۆی و بنەماڵەی و بە پیرۆزی ئاین و گەل سوێندی دەخوارد هیچ نهێنییەکی رزگاری نەدرکێنێ و تا مردن دڵسۆزی کوردو کوردستان بێت.**

بەپێی بەڵگەنامەکان لقی کفری لە نزیکەوە پێوەندیی هەبووە لەگەڵ ڕێکخراوەکانی رزگاریدا چ لە سلێمانی و چ لە هەولێر، وێڕای کۆمەڵەی **«ژ. ک.»** لە مەهاباد، **ئەمەیش بەڵگەو نیشانەی ئاوابوونی قۆناغی گۆشەگیریی ڕێکخراوە کوردییەکانە کە جاران ناوچەیی بوون نەک کوردستانی.** وێڕای ئەوە ئەزموونی رزگاری لە کفری ئاڵوگۆڕێکی بایەخداری تر دەخاتە روو **کە بریتییە لە راکێشانی شار بۆ گوند لە بواری خەباتدا**، واتا رامالینی پاشماوەی شورەی دەرەبەگی لە نێوان شارو لادێدا، لە نێوان ڕووناکبیرو گوندنشینیدا.

رزگاری لە کفری چالاک و هوشیار بوو، بۆیەکا دەزگاکانی میری ئەندامانی ئەو ڕێکخراوەیان بە وردی خستە ژێر چاودێرییەوەو زەفەریان بە چەند کەسێکیان بردو دەستیان کەیشتە ژمارەیەک پەخشەو بەیاننامەی نهێنییان، بێ ئەوەی بتوانن ریشەکێشی بکەن، یا لە پەلوپۆی بخەن. بەپێی گێڕانەوەی بەڵگەنامەکان تەنها **«شێخ موکەڕەمی کوری شێخ جەمالی تاڵەبانی چەند جارێک»** لەسەر رزگاری گیراوەو هەموو جارێکیش **«شێخ وەهابی تاڵەبانی»**ی مامی بەفریایا کەوتووە. کاربەدەستانی کفری پەیتا پەیتا ئەم باس و خواسانەیان دەکردە راپۆرتی نهێنی و ئاراستەی کەرکوک و بەغدادیان دەکردن و جارویار وێنەیان لێ دەدانە هەولێرو سلێمانیش. دەزگاکانی میریش لەو شارانە، تایبەت وەزارەتی کاروباری ناوخۆو تەحقیقاتی جینائی، واتا ئەمنی ئەوساکە، بە بایەخێکی زۆرەوە مەسەلەکەیان هەڵدەسەنگاندو ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە دەکەوتنە کارو داوایان لە پۆلیسی کفری دەکرد چاوێک بکەنە چوار چاوو هەموو توانای خۆیان بخەنە گەڕ بۆ لەناو بردنی تۆوی رزگاری لە کفری و دەوروبەریدا. بە داخەوە ژمارەیەکی کەم لە نەفام و سپڵەی ناوچەکە دەستیان خستە ناو دەستی ئەو دەزگایانەوە بۆ لەناو بردنی رزگاری لە کفری، **بەڵام بەهۆی وریا بوونەوەی کۆمەڵاتی خەڵکەوە ئەو کارە بۆ کەس نەچووە سەرو خەباتی ئەندامانی رزگاری لە کفری بە فیڕۆ نەڕۆیشت.** رزگاری لە کفری ڕێگەی بۆ بەرەو پێشچوون خۆشتر کرد، هەروەک چۆن بۆ خۆیشی بەری **«پارتی**

**هیوا**» بوو، سەرجەمی ئەو ئەندامانەی ناویانمان لەم وتارەدا هێناوە کاتی خۆی ئەندامی چالاکی هیوا بوون.

**بابەتی دوازدەمین***

## لە سەربازە ونەکانمان

لە کتێبخانەی **(کۆڕی زانیاری)** لەگەڵ لاپەڕە زەردەوە بووەکانی ڕۆژنامە کۆنەکاندا خەریک بووم کە لە ژمارەی ڕۆژی شەممەی حەوتی شوباتی ساڵی ١٩٤٨ی ڕۆژنامەی «**النهضة**»ی بەغدادیدا ئەم هەواڵەم بەرچاو کەوت:

**«تۆماری نەمریی ناوی ئەو قارەمانە شەهیدانەی بە خوێنی گەشیان ئازادی نیشتمانیان بۆ هێناین».**

دوای ئەوە ڕۆژنامەی «**النهضة**» بە ریز ناوی بیست کەسی لەوانەی بڵاوکردۆتەوە کە لە ڕۆژانی ڕاپەڕینی گەلی عیراق دژی پەیمانی نەگریسی پۆرتسمۆث لە بەغدای پایتەخت بە گوللەی دوژمنانی گەل مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ شەهید کراون. «**النهضة**» وێنەی زۆربەشیانی بڵاوکردۆتەوە. هی وایان تێدایە گەلێک ناسراون، وەک جەعفەری برای «**شاعیری گەورەی عەرەب**» جەواهیری کە ڕۆژی بیست و حەوتی کانوونی دووەم لەو شەڕەدا پێکرا بوو کە بە «**شەڕی شەهیدان**» ناسراوە. «**شەڕی شەهیدان**» لای ئەو پردەوە قەوما کە بەو بۆنەیەوە دوایی ناوی «**پردی شەهیدان**»ی لێ نرا.

نۆزدەمین ناوی ئەو لیستەیە بەر ئێمە کەوتووەو بەم جۆرە تۆمار کراوە:

**«١٩ - جوامێر، دانیشتووی بەغدایە، کرێکارە، لە شەڕی خوێنینی سەرفرازی دا شەهید بوو، ناوی خۆی لەگەڵ نەمران دا تۆمار کرد».**

کاکە جوامێر تەنانەت ناوی باوکیشی ونە. ئەویش،وەک زۆر ڕەنجی فیداکاریی

---

(*) لە گۆڤاری «**ڕەنگین**»، ژمارە (٢١)ی ڕێکەوتی تەمووزی ١٩٨٩، لە ل٣٠دا بڵاوکراوەتەوە.

تری کورد، لاپەڕەیەکی ونی مێژووە. بەڵام، کاکە جوامێری جوامێر ئەو شانازییەی بەسە لە ڕۆژگارێکدا بەو ناوە ناسکەی خۆی کردە پێناسی خەباتی بێ وچانی ڕۆڵە دلێرەکانی کوردستانی ئازیز کە ناوی کوردیی تێدا دەگمەن بوو. جوامێر وەک سەربازێکی ون نیشانەی نیشتمانپەروەرێتی خاوێن و ڕەسەنی گەلی کوردە.

بە کاکە جوامێرەوە ژمارەی کوژراوانی کورد لە کاتی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا دەبێتە سێ کەس. یەکەمیان قادر چاوشین بوو کە لە بەغداد پێکراو تەرمەکەی برایەوە سلێمانی و بە ئەوپەڕی ڕێزەوە کیژو کوڕگەلی شار بە خاکی پیرۆزی سەیوانیان سپارد.

دووەمیان برای کوردی فەیلی حوسێن عەلی بوو کە سەرەتا لە کاتی خۆنیشاندانەکانی بەغدادا بریندار کراو ڕۆژی سیازدەی شوبات گیانی سپارد. ئەمیان ناسراو بوو، نوێنەرانی کۆیەو هەولێریش بەشداریی ناشتنیان کرد. ئەوان. **«گەلاوێژ»** وتەنی، لەگەڵ **«کوڕ گەلی کورددا تەرمەکەی حوسێن عەلیی تازە پێگەیشتوویان بردە شارە پیرۆزەکەی نەجەف، ئەو شارە کە ئامۆزای پێغەمبەری لێ میوانەو ئەهلەکەشی ئەهلی دانش و عیرفانە»**.

ژمارەیەک لاوی کوردیش لە ڕۆژانی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨دا بریندار کران. لە هەمان ژمارەی ڕۆژنامەی **«النهضه»**دا ئەحمەد وەلی یەکێکە لەو برینداراانەی ناویان هاتووە. بەو جۆرە ئارەق و خوێنی گەشی لاوانی کورد دەوری خۆیان لە کوژاندنەوەی پەیمانی داسەپێنراوی پۆرتسمۆثدا بینی. عەبدولئیلای وەصی لە ژێر فشاری بێ شوماری جەماوەردا ناچار بوو ڕۆژی بیست و حەوتی کانوونی دووەم دەستی وەزارەتی بێزراوی ساڵح جەبر لە کار بکێشێتەوەو دوای ئەوە بە ڕۆژێک داوای لە محەمەد سەدر کرد کابینەی نوێ دامەزرێنێ. وەزارەتی سەدر سەرەتای مانگی شوبات بانگی پووچ کردنەوەی پەیمانی پۆرتسمۆثی دا.

ئاخۆ لەو ڕۆژەوەی جوامێر گیانی خۆی بەخت کرد تا ئیمڕۆکە ژمارەی سەربازە ونەکانی کورد گەیشتبێتە چەند... کەی بێ هەمووان، وەک شاعیر دەڵێ: **«بێ ترس سەر دائەنێین و تاجە گوڵینەکانمان دانێین»**و ژمارەی سەربازە ونە سەربەرزەکانمان بزانین...

بابەتی سیازدەمین*

# دەربارەی یاداشتەکانی
# ئەحمەد موختار بابان و وێنەیەکی سەیر

دوای کەوتنی میرنشینی بابان ژمارەیەکی زۆر لە بابانەکان گەیشتنە پایەو مەقامی بەرز، تایبەت لەئەستەمبوڵ و لەبەغدا.. ئەو کەسانە بۆ ڕۆژگاری خۆیان خوێندەواری چاک و وریاو ئاگادارو دونیادیدەبوون، دەستیان دەدا کەلێنێکی کارگێڕی چاک بۆ دەروازەی باڵا (**بابی عالی**) پڕ بکەنەوە. تەنانەت ئەحمەد پاشای دوا میری بابان پاش نۆ ساڵ لەوەی بە یەخسیری ڕاپێچ کرایە ئەستەمبوڵ سوڵتان ساڵی ١٨٥٦ کردییە والی‌ی یەمەن و ئینجا والی‌ی وان و ساڵی ١٨٦٤یش بەپلەی وەزیری دیسانەوە ناردییەوە بۆ یەمەن و پاشان کردییە والیی ئەرزەڕۆم و دواجاریش بەر لە کۆچی دوایی لەساڵی ١٨٧٥دا کردییە والیی ئەدەنە. مستەفا پاشای کوڕی ئەحمەد پاشا لەلەشکری عوسمانیدا گەیشتنە پلەی بەرزی میرلوا.

عەبدوڵڵا موسیب پاشای برا بچوکی ئەحمەد پاشاش بەپلەی وەزیر ساڵی ١٨٧٧ بووە والیی بەسرە. شاری حلە لە ڕۆژگاری عوسمانیەکاندا بەدەگمەن پارێزگارێکی بەزەبرو بەهەیبەتی وەک محەمەد ڕەشیدپاشای کوڕی سلێمان پاشای کوڕی ئەوڕەحمان پاشای بابانی بەناوبانگی بەخۆیەوە دیبوو، خەڵکی ئەو شارە نازناوی خدێوو میریان بەمحەمەد ڕەشید پاشا بەخشیبوو. لەبەر ئەوە سەیر نییە دوای ئەوەی دەروازەی باڵا دوو جاران ئەو پیاوەی کردە پارێزگاری شاری حلە ئینجا ساڵی ١٨٨٢ ویلایەتی بدلیسی پێ سپارد.

---

(*) لە ژمارە (١٢٠)ی گۆڤاری «**رەنگین**»ی ساڵی ١٩٩٩دا بلاوکراوەتەوە.

**لەناو باپانەکاندا پیاوی دیپلۆماسیی بەناوبانگیش هەلکەوت،** خەلیل خالد پاشای کوڕە گەورەی ئەحمەد پاشای دوا میری بابان چەند جارێک لەبەلکان بووە بالیۆز، ئەوەی سەرنج رادەکێشێت خەلیل خالد پاشا بۆ ماوەی نزیکەی دە ساڵ لە حەفتاو هەشتاکانی سەدەی نۆزدەمیندا بووە بالیۆزی دەوڵەتی عوسمانی لە تاران، واتا لە رۆژگاری قاجارێکاندا، کاتێک پەیوەندی نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی تەواو ئالۆز بوو. لەم بوارەدا، **واتا لە مەیدانی دیپلۆماسییەتدا هەمیشە ناوی شەریف پاشا بەزەقی دێتە پێشەوە، چونکە کەم کەس بەرادەی ئەو ناوی بەکێشەی کوردەوە لکاوە.** شەریف پاشای کوڕە گەورەی سەعید پاشای کوڕی حوسێن پاشای کوڕی ئەحمەد ئاغای خەندان زوو ناوی کەوتە ناو ناوانەوە، تایبەت دوای ئەوەیش کە ئامینەی کچی محەمەد عەبدولحەلیم پاشای کوڕی محەمەد پاشای والیی میسری هێنا کە ئەویش بە رەگەز کوردە. لە ساڵی ١٨٩٨وە شەریف پاشا بووە بالیۆزی دەوڵەتی عوسمانی لە سوید و دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهانیش بووە نوێنەری کورد لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس.

ئەم چەند ناوە **مشتێکن لە خەرواری باپانە ناسراوەکان.** تەنانەت شاعیری گەورەی عەرەبی بە رەگەز کوردیش جەمیل سدقی زەهاوی لە نامەیەکی تایبەتیی خۆیدا کە لە یەکێک لە گۆڤارە میسرییەکاندا بلاویکردۆتەوە، دەڵێت **ئێمە لە بنەماڵەی بابانین و کاتی خۆی باوە گەورەمان لە ناوچەی سلێمانییەوە کۆچی کردۆتە ناوچەی زەهاوی کوردستانی ئێران.**

جا هیچ سەیر نییە ئەگەر پێنج کەس لە بنەماڵەی بابان بووبنە وەزیری ئەو دەوڵەتەی بەناوی عیراقەوە دوای برانەوەی جەنگی یەکەمی جیهان بەماوەیەک دامەزرا. یەکەم کەسیان حەمدی پاشای بابان بوو کە پیاوێکی زۆر خوێندەوارو یاسازانێکی چاک و خاوەن کتێبخانەیەکی ئاوەدان و دیوەخانێکی کراوە بوو. عەبدولرەحمان نەقیب بەشانازییەوە ناوی خستە لیستی یەکەم وەزارەتی عیراقیەوە کە بۆ خۆی رۆژی ٢٥ی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠ دایمەزراند، بەڵام حەمدی پاشا خۆی لەوە بەگەورەتر دەزانی کە ببێتە وەزیر، بۆیەکا بەشداریی هیچ کام لە کۆبوونەوەکانی ئەو کابینەیەی نەکرد.

ئەو چوار بابانەکەی تر کە لە رۆژگاری پاشاییدا بوونە وەزیر جەمال و جەلال و محەمەدو ئەحمەد موختار بوون. شایانی باسە دەرگەی سەرجەمی وەزارەتەکان لەبەردەم ئەو کوردانەدا ئاواڵە بوو، تەنانەت چ جەلال بابان و چ ئەحمەد موختار بابان بوونە وەزیری بەرگریش، یەکەمیان ساڵی ١٩٣٣ دوو جاران لە وەزارەتەکەی رەشید عالی گەیلانیدا بووە وەزیری بەرگری، دووەمیشیان، واتا ئەحمەد موختار بابان ساڵی ١٩٥٧ لەوەزارەتەکەی عەلی جەودەت ئەیوبیدا بووە وەزیری بەرگری.

لە رۆژگاری پاشاییدا لەناو کوردا کەس بە رادەی ئەحمەد موختار بابان لەکۆشکەوە نزیک نەبوو، ئەو لە سەردەمی فەرمانڕەوایی مەلیک فەیسەڵی یەکەمەوە بووە یەکێک لە فەرمانبەرانی کۆشک، لەسەردەمی مەلیک فەیسەڵی دووەمیشدا چەند جارێک بووە سەرۆکی دەربار(دیوان) کە بۆ ئەوسا پایەو مەقامێکی بەرز بوو، **شانی دەدا لە شانی سەرەک وەزیران و دەستی لە زۆر وەزیر پتر دەڕۆیشت.**

لە ساڵی ١٩٤٢وە ئەحمەد موختار بابان نزیکەی دە جاران لەگەڵ نوری سەعید و جەمیل مەدفەعی و عەلی جەودەت ئەیوبی و دوکتۆر فازیل جەمالیدا بووە وەزیر، چەند جارێکیش بووە جێگری سەرەک وەزیران و دواجاریش لە مایسی ساڵی ١٩٥٨دا بووە سەرەک وەزیران. بەر لەوە ئەحمەد موختار بابان یەکێک بوو لەدادوەرە ناسراوەکانی عیراق، ماوەیەکیش پارێزگاری کەربەلا بوو، بێگومان بیرەوەری و یاداشتی پیاوێکی وا ئاگادار دەبێت زۆر دەوڵەمەندو بایەخدار بێت، بۆیەکا زانکۆی ئەمەریکی لە بیروت سەرەتای حەفتاکان بایەخێکی زۆری دابوو بەکۆکردنەوەی بەشێک لە یاداشتەکانی ئەحمەد موختار بابان. ئەوە چەند ساڵێکە منیش بەشێک لەکاتی خۆمم بۆ دارشتنەوەو روونکردنەوەی ئەو یاداشتانە تەرخانکردووە کە پێم وایە کەلێنێکی دیار لە کتێبخانەی مێژوویی عیراقدا پڕ دەکەنەوە.

ساڵی پار رۆژنامەی بەناوبانگی **(الحیاة)**ی لەندەنی بە شانازییەوە دوو لاپەڕەی دوو ژمارەی یەک لەدوای یەکی بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو بەشەی یاداشتەکان تەرخانکرد کە دەربارەی سیاسەتمەداری ناسراوی عیراق دوکتۆر فازیل جەمالییە.

ماوەیەک لەمەوبەر بە ئەرشیفی وێنەکان سەرابی کچی ئەحمەد موختار بابانەوە خەریک بووم بەنیازی ئامادەکردنی چەند وێنەیەک تا لەگەڵ یاداشتەکاند بڵاویکرێنەوە، لەو ئەرشیفەدا وێنەیەکی یەکجار سەیر سەرنجی راکێشام. بایەخی مێژوویی ئەو وێنەیە کەم نییە، بۆی هەیە تیشک بخاتە سەر سروشتی سیاسی و جۆری رەفتاری رژێمی پاشایی کە زۆر لایەنی ئاتاجی پێداچوونەوەو هەڵسەنگاندنن، ئەمەی لای خوارەوەیش پوختەی مێژووی ئەو وێنەیەیە.

رۆژی پازدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ لە بەندەری پۆرتسمۆث، کە کەوتۆتە باشووری بەریتانیاوە، ساڵح جەبری سەرۆک وەزیران بەناوی عیراقەوە پەیمانێکی نوێی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا مۆرکرد، ئەوەی بووە هۆی بەرپابوونی راپەڕینێکی گەورە کە سەرانسەری وڵاتی گرتەوە. شوێنی کورد لەو راپەڕینەدا دیارو بەرچاوبوو، هەموو شارەکانی کوردستان بەجارێک خرۆشان، لۆنگریگی شارەزا دەربارەی سلێمانی لەم بارەیەوە نووسیوییە دەڵێت:

**«ئەو پەیمانە بەهێزەی ساڵی ١٩٤٨ لەنێوان نەتەوە پەرستان و کۆمۆنیستانی کوردی سەر بە رووسدا بەسترا ئاژاوەیەکی بێ کۆتایی لەسەر شەقام و قوتابخانەکانی شاری سلێمانیدا نایەوە».**

دانیشتوانی سلێمانی هەر رۆژەی خۆ نیشاندانێک، کۆبوونەوەیەک یا مانگرتنێکیان ساز دەکرد. لە گەرمەی رۆژانی راپەڕینەکەدا نیشتمانپەروەرانی سلێمانی بەنامەیەکی تایبەتی ئەم داخوازییانەیان خستە بەردەمی وەزارەتەکەی ساڵح جەبر:

**١- دانی مافە دیموکراسیەکانی گەل.**

**٢- رێگەدان بەژیانی پارتایەتی سەربەخۆ.**

**٣- رێگەدان بەدامەزراندنی جڤاتی کرێکاران.**

**٤- ئازادکردنی گشت بەندە سیاسیەکانی وڵات.**

**٥- لابردنی پەیمانی ساڵی ١٩٣٠.**

نێرەرانی نامەکە بەم جۆرە کۆتاییان پێ هێنابوو: **«دانیشتوانی شارەکەمان دەست لە خەباتی خۆیان هەڵناگرن هەتاوەکو ئەم داخوازییانە جێبەجێ دەکرێن»**. بۆ هەمان

مەبەست شوبات و نیسانی ساڵی ١٩٤٨ چەند وەفدێکی تایبەتی لە کوردستانەوە هاتنە بەغدا. ڕۆژی سیازدەی شوبات نوێنەرانی هەولێرو کۆیە پێکرا ڕژانە سەر شەقامەکانی بەغداو دوای سەردانی گۆڕی شەهیدان لەگەڵ دانیشتوانی پایتەختدا بەشداریی ناشتنی نیشتمانپەروەری کورد حوسێن عەلی یان کرد کە بەر لەوە لە یەکێک لە خۆپیشاندانەکانی بەغدادا بریندار کرابوو.

ڕۆژی ٢٦ی شوباتیش وەفدێکی پێنج سەد کەسی لە زاخۆو ڕانیەو سلێمانییەوە گەیشتنە بەغدا. گۆڤاری **«گەلاوێژ»** بەم جۆرە ئەو باسەی بۆ تۆمارکردووین.

**«١٩٤٨/٢/٢٦ کوڕ گەلی سلێمانی گەیشتن، تەنها ئەوان (٣٠٠) کەسێک بوون. لەگەڵ لاوانی زاخۆو ڕانیە یەکیان گرت. کە کۆبوونەوە دیەنی (٥٠٠) کوردی جوامێری دلێری دڵ بریندارت دەدی.. لەدەشتی مەلیک فەیسەڵدا لەپاش ئەوە کە ریزیان بەست روەو گۆڕستانی (باب المعظم) بەشارع رشیدا لە سەعات دوو نیوی پاش نیوەڕۆوە بەڕێکەوتن... لە پێشەوە بەیداخی عیراقی، لە پاشا هەندێ لە پیاو ماقوڵ و ریش سپییەکان بەجلوبەرگی کوردییەوە چوار چوار بەشوێن بەیداخەکەوە، ئینجا بەیداخی پۆستەی سلێمانی، ڕانیە، زاخۆ بەشوێن ئەوانا کچانی کورد چەپکە گوڵیان بەدەستەوە، لەپاشا لاوان بەجلوبەرگی کوردی و بەیداخی پرسەوە... ئەمانە کە بەم ڕێکوپێکییە ڕێکخرابوون هەر لە بەینی بیست هەنگاوێکدا دوو کورد، یەکێک لەلای ڕاست و یەکێک لەلای چەپ بەجلوبەرگی کوردی و بەفیشەک و دەمانچەی برنەوەوە ئەڕۆیشتن.. عالەمی بەغدا هەر لەساحەی مەلیک فەیسەڵەوە تا گۆڕستانی (باب المعظم) بە ژن و پیاوەوە ئەمبەرو ئەوبەری شارع رشیدیان گرت و سەیری ئەم دیەنەو نمایەشەیان دەکرد، سەعات چوار گەیشتنە گۆڕستان و چوونە ژوورەوە».**

دەقاودەق وێنەی ئەم گێڕانەوە وردە لای سەراب خانی کچی ئەحمەد موختار بابان هەڵگیراوە. بەڵام سەیرەکە ئەوەیە کە سەرابی کچی سەرۆکی دیوانی کۆشک یەکێکە لەو کچە کوردانەی لەو خۆپیشاندانەدا بەشدارییان کردووە. سەراب ئەو کچە دە دوازدە ساڵانەیە کە بەڕێکوپێکی و مات مات لە پێشی پێشەوەی وەفدەکەی سلێمانییەوە دەڕوات. لە ریزی پێشەوە، لە دوای سەرابەوە جەلیل



هۆشیارو ئەحمەد حەسەن قادرو حەمەی وەستا قادری شیرگەرو فیکرەت رەئوف دەبینرێن، ئەو دوانەیش کە لافیتەکەیان هەڵگرتووەو دەمانچەیان بەقەدەوەیە ئەمین ئاغای حاجی مەلا محیەدینی برای تەها محیەدین و کەمالی حاجی شەفیقی برا گەورەی دکتۆر جەلالی حاجی شەفیقی سەرۆکی زانکۆی سلێمانین.

شایانی باسە پاش ماوەیەک ساڵح جەبر بەمیوانی دەچێتە ماڵی ئەحمەد موختار بابان، لەوێ سەراب دەبینێت، کە باوکی پێی دەڵێت ئەوە سەرابی کچمە ساڵح جەبر پێی دەڵێت: **جەناب زۆر چاکی دەناسم، دەزانم ئەو کچەی لە پێش خۆپیشاندانەکەی سلێمانییەوە دژی ئێمە دەڕوات سەرابە کە وێنەکەی بەگەورەیی لای ئارشاک لەسەر شەقامی رەشید هەڵواسراوە.** ئەوساکە ئارشاک بەناوبانگترین وێنەگری بەغدا بوو.

# چەپڕەویی بازرگانێکی گەورەی کورد

میرزا فەرەجی حاجی شەریف یەکێک بوو لە بازرگانە هەرە گەورەکانی کوردستان، باووباپیرانی لە قەلاچوالانەوە هاتبوونە سلێمانی. ئەوساکە ئەوەی خوێندەوار بوایە میرزایان پێ دەگوت. حاجی شەریف هەر زوو، لە ناوەندی سەدەی نۆزدەمینەوە، رێگەی بازرگانیی توتنی لە نێوان سلێمانی و بەغدادا گرتە بەر، خوا موەفەقی کرد، دەوڵەت و سامانێکی زۆری بەسەردا رژاند. دوای کۆچی خۆی فەرەج و فەتاح و کەریم و محیەدین، کە هەر چواریان میرزایان پێوەیە، جێگەیان گرتەوە. میرزا فەرەجی برا گەورەیان بووە دەمڕاستیان، بۆیەکا لە هەموویان زۆرتر ناوو شۆرەتی دەرکرد. کار گەیشت بەوەی بازاڕی کوردستان، لەبەر مەوادی تەسکی، ئیتر بەتەنها دادی سەروەت و سامانی میرزا فەرەج نەدات، بۆیەکا رووی کردە بەغداو لەوێشەوە پەلی هاویشت بۆ بازاڕەکانی دەرەوەی وڵات و کەوتە هاوردنی کەلوپەلی جیاواز، تایبەت شەکرو چا.

میرزا فەرەج پەیوەندیی بە گشت گەورە پیاوانی عیراقەوە هەبوو، چ کوردیان، چ عەرەبیان. سەرەتا لە گەڵ شێخ مەحمود زۆر رێک بوو، تەنانەت خانووە گەورەکەی ئەو لە گەڕەکی گوێژە کرایە بارەگای شێخ، لە نزیکیشەوە پەیوەندی لەگەڵ مەلیک فەیسەڵی یەکەم و نوری سەعیدو جەعفەر عەسکەری و یاسین هاشمی و رەشید عالی گەیلانی و ئەمین زەکی بەگ و حیکمەت سلێمان و گەورە پیاوی تردا

(*) لە ژمارە (١١٢)ی ئایاری ١٩٩٨ی گۆڤاری «رەنگین»دا بلاوکراوەتەوە.

هەبوو. کە دەورووبەری کۆتایی سییەکان حیکمەت سلێمان دوورخرایەوە شاری سلێمانی ماڵەکەی میرزا کەریمی بـرای میرزا فەرەجیان بۆ تەرخان کرد.

میرزا فەرەج بووە یەکێک لە نوێنەرانی سلێمانی لە **«ئەنجومەنی دامەزرێن»** (المجلس التاسيسي) دا کە یەکەم پەرلەمانی عیراق بوو، ساڵی ١٩٢٤ یەکەم دەستووری بۆ وڵات دانا. دوای ئەویش بووە ئەندامی یەکەم **«ئەنجومەنی نوێنەران»** (مجلس النواب) کە رۆژی شازدەی تەمووزی ساڵی ١٩٢٥ یەکەم کۆبوونەوەی خۆی سازکردو رۆژی سێی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٧یش دوا کۆبوونەوەی. بایەخی مێژوویی ئەو خولی یەکەمەی **«ئەنجومەنەی نوێنەران»**، کە خودی مەلیک فەیسەڵ بانگی دەستبەکاربوونی راگەیاند، زۆرە، سێ ناسراوی کوردی تر لەگەڵ میرزا فەرەجدا نوێنەری سلێمانی بوون، ئەمین زەکی مێژوونووس و ئەحمەد موختار جافی شاعیرو حەمە ساڵح بەگی حەمە عەلی بەگ.

میرزا فەرەج خاوەنی یەکێک لە خانە بازرگانییەکانی بەغدا بوو، خانەکەی کەوتبووە سەر شەقامی ئەمین کە ئێستا پەیکەرەکەی رەسافیی بە سەردا دەنوارێ. سەرەتای ئەو بەشەی شەقامی ئەمین بە چێشتخانەی تاجیرانی بەناوبانگ دەستی پێدەکرد کە ئەویش خاوەنەکەی کورد بوو، دوای ئەو خانەکەی میرزا فەرەج دەهات. ئینجا خانی ئەحمەد ئاغای کەرکوکلی زادەو دوای ئەو مۆزەخانەکە بوو کە ئێستا کراوەتە **«مەتحەفی بەغدادی»**، لەو بەریشەوە خانەکەی عەبدوڵڵا لوتفی بوو کە هەموویان کورد بوون و شوێنیان لە ژیانی ئابووریی سەرجەمی عیراقدا دیار بوو. ژمارەیەک لە رووناکبیرە ناسراوەکانمان ئەوخانەی میرزا فەرەج بۆیان بووە شوێنی ژیان تا لە بەغدا خوێندنی باڵایان تەواو کرد، لەوانە عەلی سائیبی کوڕی جەمیل سائیب و فایق هوشیارو جەمالی میرزا فەتاح و ئەحمەدی میرزا کەریم کە هەموویان بوونە پارێزەرو کارگێری ناسراو . شایانی باسە حەپسە خانی هاوسەری میرزا فەرەج خوشکەزای پیرەمێردی شاعیر بوو.

میرزا فەرەج تا دەهات دەوڵەمەندتر دەبوو، ناوو شۆرەتی زۆرتر دەردەکرد. کۆشکەکەی لەسەر دیجلە، لە ئاستی مەدینەی طبی ئێستادا، ببووە دیوەخانێکی گەورە پیاوانی هەمەڕەنگ. محەمەد مەهدی کوببە کە سەرۆکی **«پارتی**



میرزا فەرەج

**سەربەخۆیی»** (حزب الاستقلال) بوو هاوڕێیەکی نزیکی میرزا فەرەج بوو، کوببە بۆ خۆی لە لاپەڕە دووسەدو چل و یەکی بیرەوەرییەکانیدا بە تایبەتی باسی ئەوەی کردووە.

کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ محەمەد مەهدی کوببە بووە وەزیری ئازوقەپێدان **«تەموین»** لە وەزارەتە بەناوبانگەکەی محەمەد سەدردا. ئەرکی سەر شانی کوببە ئاسان نەبووە، **ئەوساکە بڕستەتی زۆری بۆ خەڵکەکە هێنابوو، قات و قڕ بوو، نە گەنم، نە جۆ، نە برنج دەست نەدەکەوت، شەکر ببووە دەرمانی چاو، زۆربەی ئەو شتانە وەک ساڵانی جەنگ بە کوپۆن دابەش دەکران. هێنانی شەکر لە هەندەرانەوە ببووە کێشەیەکی گەورە.** وەزارەتی ئازوقەپێدان لەگەڵ ئینگلیزەکاندا ڕێکەوتبوو دەستو برد بیست هەزار تەن شەکری لەندەنی بگەێننە عیراق، تەنی بە سی و هەشت دینار. کوببە لە یاداشتەکانیدا دەڵێت ڕۆژێکیان لە باڵوێزخانەی بەریتانیاوە پێیان ڕاگەیاندم کە دەبێت بۆ هەر تەنێک دوو دینار زیاد بکەین، واتە چل هەزار دینار بخەینە سەر ئەو پارەیەی بۆ کڕینی بڕی یەکەمان تەرخان کردبوو کە بۆ ئەو ڕۆژگارە پارەیەکی یەکجار زۆر بوو، کەچی ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا پاش یەک دوو ڕۆژ دیسان پێیان ڕاگەیاندین کە نرخی تەنێک شەکر لە لەندەن گەیشتۆتە چل و سێ تا چل و چوار دینار. کە پێم گوتن ئێمە ئامادەین بەو نرخە شەکرەکەتان بکڕین و بەو ڕەفتارەتان ناچارمان دەکەن ڕوویکەینە وڵاتی تر، لە وەڵامدا گوتیان لای ئێمە نەبێت شەکری سپی لە شوێنێکی تر دەست ناکەوێت.

محەمەد مەهدی کوببە لەسەر قسەکانی دەڕوات و دەڵێت: **منیش ناردم بەدووی بازرگانی ناسراوو هاوڕێی نزیکمدا میرزا فەرەجی حاجی شەریف تا بزانم ئەو دەڵێت چی.** میرزا فەرەج پێی دەڵێت: **پێم وایە دەتوانن شەکری سپی لە وڵاتی شووڕەوی بکڕن و من لەو بارەیەوە لەگەڵ مولحەقی بازرگانی باڵوێزخانەی شوورەویدا قسە دەکەم.** بۆ ڕۆژی داهاتوو میرزا فەرەج لەگەڵ مولحەقدا دێنە لای کوببە، کابرای سۆڤیێتی ئامادەیی خۆی نیشان دەدات چەند شەکریان دەوێت هێندەیان پێ بفرۆشن بە نرخێکی لەبار. **کارەکە لەگەڵ سۆڤیێتەکاندا سەر ناگرێت، چونکە ئەوساکە تا بڕیارێکیان دەردەکرد گیانی پیاویان دەردەهێنا، زۆر بەداخەوە ئەو وڵاتە گەورەیە خۆی خۆی لە ناو زەلکاوی ئەوراقی ڕۆتینیدا خنکاند!!.** بەڵام پۆڵۆنییەکان، کە هێشتا تووشی ئەو دەردە کوشندەیە نەهاتبوون، یەکسەر بەدەنگ عیراقەوە دێن، دەستوبرد بیست هەزار تەن شەکر، تەنی بەسی و شەش دینار بۆ دەگەێننە بەندەری بەسرەو بەو جۆرە، وەک کوببە دەڵێت، توانیویانە باری گرانی سەرشانی عیراق لەسەدو شەست هەزار دینار قوتار بکەن .

پاش چەند ڕۆژێک کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران دەبێت، محەمەد مەهدی کوببە دەڵێت: لە سەرەتای کۆبوونەوەکەدا (**مصطفى العمری**) وەزیری کاروباری ناوخۆ ڕاپۆرتێکی دایەرەی ئەمنی بەسەردا دابەشکردین، کە سەیر دەکەم لەو ڕاپۆرتەدا ناوی پتر لە بیست کەسی تێدایە کە گوایە کۆمۆنیستن و داوا دەکات لەسەر ئەوە **«کلک و گوێ»** بکرێن، دەبینم یەکێک لەو ناوانە بازرگانی بەناوبانگ میرزا فەرەجی حاجی شەریفە. هەڵبەت سیخوڕێکی نەفامی گوێرەکە میرزا فەرەجی لەگەڵ مولحەقی بازرگانی شوورەویدا بینیوە لە گەرمەی خزمەتێکی گەورەیدا بۆ خۆی و بۆ برسی و هەژارانی عیراق، کە بێگومان ئەوخوێرییە بۆ خۆیشی هەر یەکێک بووە لەو قوڕ بەسەرانە، **بەڵام وایزانیوە شانە هەنگوێنی لە کلۆرە دارا دۆزیوەتەوە، بە پەلەپرووزکێ قۆستوویەتییەوەو کردویە بەو ڕاپۆرتە ناپیرۆزەی. بەوەش باش بوو ئەوساکە یاسا ڕێزی هەبوو، ئەگینا لەوانەبوو جارێکی تر کەس میرزا فەرەج نەبینێتەوە**، هەر چەندە، ئەوەی من بیزانم، لە یەکێک لە برازاکانی بەولاوە کەسێکی تر لە بنەماڵەی شەریف ڕۆژێک لە ڕۆژان توخنی بیروباوەڕی مارکسی

بابەتی پازدەمین*

# لاپەڕەیەک لە ژیانی سیاسیی کوردستان کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکان

ساڵح جەبر یەکێکە لە سیاسییە ناسراوەکانی رۆژگاری پاشایی، هەرچەندە کەسێک نەبوو لە هیچ روویەکەوە لەو رۆژگارەدا بتوانێ شان لە شانی نوری سەعید بدات بەڵام ساڵح جەبریش کەم نەبوو، زۆری لەو نەگەڕابۆوە، ببووە دووەم ناوی گۆڕەپانی سیاسیی عیراق لە چلەکان و پەنجاکاندا، ناوەندی سییەکان ئینگلیزەکان چەند جارێک لە راپۆرتە دیپلۆماسییە تایبەتییەکانی خۆیاندا بەم جۆرە باسی ساڵح جەبریان کردووە:

**«کوڕێکی لاوە، لە بەهرەی زیرەکی بێبەش نییە، خەریکە خۆی دروست دەکات».**

ساڵی ١٩٣٦، دوای سەرکەوتنی کۆدیتاکەی بەکر سدقی، ساڵح جەبر بۆ یەکەم جار بووە وەزیر، لە وەزارەتەکەی حیکمەت سلێماندا پۆستی وەزارەتی دادوەری (**عەدل**)ی پێدرا. یەکێک بوو لەو چوار وەزیرەی زوو لە دەست تاکڕەویی بەکر سدقی بێزار بوو، لەگەڵ جەعفەر ئەبولتەمەن و کامیل جادرچی و یوسف عیزەددین دەستی لە وەزارەت هەڵگرت، بەپێی گرۆبای وەزیر مفەوەزی ئەڵەمانیای نازی لە بەغدا هۆیەکی سەرەکیی وازهێنانی ساڵح جەبر لەسەر ئەوە بووە کە ئەو وەک وەزیری دادوەری سوور بووە لەسەر لەسێدارەدانی مەحمود جەودەت، بەڵام بەکر سدقی رێی نەداوەتێ.

هەر چۆن بێ لەوساوە ناوی ساڵح جەبر بەتەواوەتی کەوتە ناو ناوانەوە، تایبەت چونکە دوان لەو وەزیرانەی دەستیان لە کار هەڵگرت، واتە جەعفەر ئەبولتەمەن و

---

(*) لە ژمارە (٩٤)ی ساڵی ١٩٩٦ی گۆڤاری «**رەنگین**»دا بلاوکراوەتەوە.

کامیل جادرچی، نیشتمانپەروەری گەورە بوون، سێیەمیشیان، واتە یوسف عیزەددین ئیبراهیم کە بەڕەگەز کوردە، وەک پیاوێکی سەر راست و نیشتمان و زانیاری پەروەر ناوی دەرکردبوو، تەنانەت لە کابینەکەی حیکمەت سلێماندا پۆستی وەزارەتی مەعاریفی پێ درابوو.

دوای کوشتنی بەکر سدقی و کەوتنی وەزارەتەکەی حیکمەت سلێمان بە ماوەیەک سالح جەبر بەتەواوی دەستی لەگەڵ نوری سەعیدو عەبدولئیلادا تێکەڵ کرد، کە راپەرینەکەی مایسی ساڵی ١٩٤١ بەرپابوو سالح جەبر پارێزگاری (موتەسەریف)ی بەسرەبوو، دژی ئەو راپەرینە وەستاو دایە پاڵ عەبدولئیلا کە ئەویش پەنای بردبووە بەر بەسرەو خەریک بوو لەوێوە هەرایەکی ئەوتۆ بنێنەوە کە لەوانە نەبوو شۆڕشگێڕانی بەغدا خۆیانی لە بەردا بگرن، تایبەت چونکە هێزێکی گەورەی سوپای عیراقی لەوێ بوو، وێڕای ئەوەی شوعەیبەی نزیک بەسرەش بنکەیەکی سەربازیی گەورەی ئینگلیز بوو لە عیراق، گەر رەشید جەودەت نەبوایە. کە سەرلەشکر بوو لە بەسرە، ناحەزانی راپەرینی مایس زەفەریان پێی دەبردو زۆر لەوانەبوو هەر لەو ساوە دایبمرکێننەوە، رەشید جەودەت قایل نەبوو لەگەڵ عەبدولئیلاو لایەنگرانیدا رێک بکەوێ، سالح جەبری بە دەسبەسەری ناردە بەغدا بەو جۆرە پیلانی لێدانی راپەرینی مایسی لە بەسرەوە پووچەڵ کردەوە، ئەومبوو عەبدولئیلا ناچار بوو لە عێراق هەڵبێ، کەس گومانی لە نیشتمانپەروەریی رەشید جەودەت نییە، بەڵام بەدووری نابینم یەکێک لەو هۆیانەی پاڵیان پێوە نا نەداتە پێ عەبدولئیلا هەڵوێستی رابوردووی سالح جەبر بوو بەرانبەر لە سێدارەدانی مەحمود جەودەتی برای، هەرچەندە مەحمود جەودەت دوای کەوتنی بەکر سدقی و کابینەکەی حیکمەت سلێمان خنکێنرا.

دوای دامرکاندنەوەی راپەرینی مایس سالح جەبر لە جاران زیاتر شۆرەتی دەرکرد، بیست و نۆی مارتی ساڵی ١٩٤٧ بۆ یەکەم جار، دوایی کەوتنی نۆیەمین کابینەی نوری سەعید، بووە سەرەک وەزیران. **لە رۆژانی فەرمانڕەوایی ئەودا بوو کە بەشێک لە بارزانییەکان بە ناچاری، دوای کەوتنی کۆماری مەهاباد، گەڕانەوە ناو خاکی عیراق لەگەڵ ئەوانیشدا ئەفسەران عیزەت عەبدولعەزیزو مستەفا خۆشناوو**

**خەیروڵلا عەبدولکەریم و محەممەد قودسی ناوەندی نیسان ساڵی ١٩٤٧ خۆیان دا بەدەستەوە.** بەر لە پێکهێنانی کابینەکەی ساڵح جەبر بە ماوەیەک لە پاش ملە فەرمانی خنکاندنی ئەو چوار ئەفسەرە دەرچووبوو، پاش گەڕانەوەیان درانە دادگەو ئەمجار لە روو دیسان فەرمانی خنکاندنیان درا.

ئەو بڕیارە کوردستانی خرۆشان، لە هەموو لاوە دەنگ بۆ رزگارکردنیان لە پەتی قەنارە بەرزبۆوە. ژمارەیەک لە گەورە پیاوانی وەک ئەمین زەکی و تۆفیق وەهبی و بابە عەلی و عەلی کەمال و مەعروف جیاوک و ماجید مستەفا، سەرباری شەپۆلی بروسکەی خۆنیشاندەرانی کوردستان، **وایان لە ساڵح جەبرکرد بەوە قایل بێ بڕیاری خنکاندنی ئەو ئەفسەرانە بکرێتە حوکمی سەرلەبەری ژیان، بەڵام عەبدولئیلا کە**

**جێ نشینی مەلیک بوو سوور بوو لەسەر خنکاندنیان**(**)، پێم وایە عەبدولئیلا دەیویست بەو جۆرە کەمێک لەو برینە سارێژ بکات کە بە سووچی پێداگرتنی ئەو خنکاندنی ئەفسەرە عەرەبەکانی رابەری راپەرینەکەی سالی ١٩٤١ لە ناخی دەروونی نەتەوە پەرستانی عەرەبدا دروستی کردبوو. شەوی نۆزدەی حوزەیرانی سالی ١٩٤٧ عیزەت عەبدولعەزیزو مستەفا خۆشناوو خەیروڵلا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی برانە سەرپای قەنارەو بە ئەوپەڕی سەربەرزییەوە چوونە ناو ریزی شەهیدانی کوردستانەوە. لە مەرگدا هاوسەنگی کوردو عەرەب خۆی نواند، چوار بەچوار. **لە سێدارەدانی ئەو چوار ئەفسەرە هێندەی تر چارەی سالح جەبرو کابینەکەیان لای کورد رەش کرد، تایبەت چونکە زۆرینەی خەڵک ئاگاداری دوا هەلوێستی سالح جەبر نەبوون.** ئەم راستییە دوایی لە زۆر رووداودا رەنگی دایەوە. کە یەکەمیان بەشداری بوونی بەرفراوانی کورد بوو لەو راپەرینە گشتییەدا کە دژی پەیمانی پۆرتسموث سەرەتای سالی ١٩٤٨ سەرانسەری عیراقی گرتەوە، ئەو راپەرینە زامی لە سێدارەدانی ئەفسەرەکانی لە ناخی دەروونی زۆر کوردا کولاندەوە.

راپەرینی کانوونی دووەمی سالی ١٩٤٨ بووە هۆی کەوتنی کابینەکەی سالح جەبرو پووچەڵ کردنەوەی پەیمانی نوێی نێوان عیراق و بەریتانیا کە دەبوو جێگەی پەیمانی سالی ١٩٣٠ بگرێتەوە. پاش ماوەیەک لە گۆشەگیری جارێکی تر سالح جەبر هاتەوە مەیدان. ئەمجاریان بووە یەکێک لە نەیارانی نوری سەعید، ناکۆکییەکی بێدەنگی قووڵ لە نێوان هەردووکیاندا بەرپابوو، تایبەت دوای ئەوەی لەسەر پێکهێنانی پارتێکی هاوبەش رێک نەکەوتن هەرچەندە نوری سەعید بەدڵ سالح جەبری بۆ نانی ئەو هەنگاوە هان دەدا.

---

(*) بەپێی گێڕانەوەیەکی عیزەددینی مەلا فەندی بێ دەبێ بەپێچەوانەوە عەبدولئیلا لەسەر خاتری ئەو قایل نەبووبێ بڕیاری خنکاندنی ئەو ئەفسەرانە بکرێتە حوکمی عورفی، بەلام سالح جەبر گوتوویە ئەگەر ئەو چوار ئەفسەرە ئیعدام نەکەن گوایە ئەو ئیستیقالە لە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دەدا. هەروەها سەرۆکی ئەوکاتی سوپاو وەزیری بەرگری راشکاوانە گوتوویانە کە «ئەم چوار ئەفسەرە لە سوپا یاخی بوونەو بۆ راگرتنی هەیبەتی سوپا پێویستە ئیعدام بکرێن.

بۆ وردەکاری هەموو لایەنەکانی ئەم رووداوە بنۆڕە، فەرهاد عەونی، چەند لایەنێکی کوردایەتی لە ژیانی عیزەددینی مەلا فەندیدا، هەولێر **«گۆڤار»** ژمارە (١٠) بەهاری ٢٠٠١».

**«عەبدوڵلا زەنگەنە»**



نوری سەعید، بۆ سالح جەبر، تەشرینی دووەمی سالی ١٩٤٩ **«پارتی یەکبوونی یاسایی»** (حزب الاتحاد الدستوري)ی دامەزراند پاش ماوەیەک، حوزەیرانی سالی ١٩٥١، سالح جەبریش **«پارتی نەتەوەی سۆشیالیزمی»** (حزب الامة الاشتراكي) دامەزراند، نوری سەعید هیچ کوردێکی لە دەستەی دامەزرێنەری پارتەکەی خۆیدا دانەنابوو، بەلام سالح جەبر لە ناو دەستەی دامەزرێنەری پارتەکەی خۆیدا، کە یازدە کەس بوون، سێ کوردی ناسراوی دانابوو، یەکەمیان شێخ حەبیبی تالەبانی کە چەند جارێک بووە نوێنەری کەرکووک لە پارلەماندا، ئەوی تریان محەمەدلنەقیب کە ئەویش چەند جارێک بووە نوێنەری هەولێر لە پەرلەماندا، سێیەمیشیان عیزەددینی نەقیبی مەندەلی بوو کە وەک دوانەکەی تر چەند جارێک بووە نوێنەری دیالە لە پەرلەماندا هەروەها دوایی تۆفیق وەهبی بەگی کردە جێگری

سەرۆکی پارتەکەی.

ڕاستە نە نوری سەعید، نە سالّح جەبر لە پرۆگرامی کاری پارتەکانیاندا هیچی ڕاستەوخۆیان بۆ کورد نەگوتبوو، بەڵام سالّح جەبر زۆر بەپەرۆش بوو بۆ ئەوەی گەورە پیاوانی کورد لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، ئەمیان لەبەر چەند هۆیەک، لە نوری سەعید پتر پێویستی بەپشتیوانی کوردبوو. بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستەی بەهاری ساڵی ۱۹۵۲ گەشتێکی دوورو درێژی بە کوردستاندا کرد، چووە کەرکوک و هەولێرو کۆیەو سلێمانی. گەورە پیاوانی ئەو شارانە بەگەرمی پێشوازییان لێ کرد. بەپێ ڕاپۆرتە تایبەتییەکانی دەزگاکانی وەزارەتی کاروباری ناوخۆ لە هەولێر ڕۆژی پێنجی مایسی ساڵی ۱۹۵۲ پەنجاو دووکەس لە ناسراوانی شار چوون بەرەو پیری، بیست و دوویان لە ئاغایانی دزەیی بوون. یەکەم ناوی ناو لیستەکە مەعروف ئاغای حاجی پیرداود ئاغایە. بیست و یەکەمین ناو ئیسماعیل ئاغای حاجی عەلۆ ئاغای دزەییە. چل و پێنجەمین ناو تەحسینی یاسین ئاغای ئەسعەدییەکە ئەوسا پارێزەرو ئیستە دادوەرە.

پەنجاو یەکەمین ناویش شێخ موحێیەدینی شێخ سالّحی بەرزەنجی خزمی شێخ مەحمودە.

گەورە پیاوانی سلێمانیش حەشریان بۆ سالّح جەبر کرد. شێخ بابە عەلی و شێخ ڕەوفی کوڕانی شێخ مەحمود سەردەستەیان بوون. پیاوی ناسراوی وەک حەمەی ئەورەحمان ئاغاو مەجید بەگی حاجی ڕەسول بەگیش، کە زۆری ژیانیان بە کوردایەتی بردەسەر، لەوانە بوون کە دایانە پاڵ سالّح جەبر. لە هۆڵی سینەمای ڕەشید کۆبوونەوەیەکی گەورەیان بەبۆنەی هاتنی سالّح جەبرەوە سازکرد.

هەڵوێستی جەماوەری کوردستان و هێزە سیاسییە کاریگەرەکانی، کە ئەوسا زۆر توندڕەو بوون، وا نەبوو نیشتمانپەروەرانی سلێمانی توخنی کۆبوونەوەکەی هۆڵی سینەمای ڕەشید نەکەوتن کە لەبەر ئەوە دەنگێکی ئەوتۆی نەدایەوە. کۆبوونەوەیەکی ساردوسڕ بوو. بەبۆنەی گەشتەکەی سالّح جەبرەوە، **«پارتی دیموکراتی کورد – عیراق بەیاننامەیەکی چاپکراوی دوورو درێژی بە کوردی بڵاوکردەوە»** سەرتاپای هێرشێکی توندو تیژە بۆ سەر ڕژێمی پاشایی و سالّح جەبرو ئەو



**شێخ مه‌حمود و سالح جه‌بر**
**٣-٣-١٩٥٢**

کوردانه‌ی دابوویانه پالی. پارتی له به‌یاننامه‌که‌یدا به‌م جۆره له سێداره‌دانی ئه‌فسه‌ره‌کان دێنێته‌وه یادی کۆمه‌لانی خه‌لکی کوردستان:

**«هێشتا هاواری بری سالح جه‌بری خائن له کوردستاندا ده‌نگ داده‌ته‌وه‌و منداله‌کانی مسته‌فا خۆشناوو دایکه‌کانی محه‌مه‌د قودسی و خه‌یروللا عه‌بدولکه‌ریم و که‌س و کاری عیزه‌ت عه‌بدولعه‌زیز، شه‌هیده، جوانه مه‌رگه‌کانمان، جلی ره‌شیان دانه‌که‌ندووه... هێشتا عه‌شیره‌تی قاره‌مانی بارزان ده‌ربه‌ده‌ری جێگای خۆیانن و له شوێنی تر سوالکه‌ریشیان ده‌ست ناکه‌وێت و به‌شی زۆریان له برسانا مردن و له‌سه‌رمان ره‌ق بوونه‌وه، ئه‌مانه هه‌مووی له سایه‌ی مامه سالح جه‌بری خائنه‌وه‌بوو...».**

لایه‌نێکی تریش بۆ ئه‌وه‌ی ناوی خۆی بێنێ به‌هه‌مان بۆنه‌وه به ده‌سخه‌ت له سلێمانی به‌م ناونیشانه‌وه به‌یاننامه‌یه‌کی بلاوکردۆته‌وه.

**«سالح جه‌بری خوێنخواری کورد میوانی شێخه خوێنرێژه، پیاو کوژه‌کانه».**

وێنه‌ی ئه‌و به‌یاننامه‌یه به پۆسته له سلێمانییه‌وه نێردراوه بۆ ناوچه‌کانی تری

کوردستانیش. مامۆستا تۆفیق وەهبی یەکێکە لەوانەی لەو بەیاننامەیەدا هێرشێکی گەورەی کراوەتە سەر. کۆتایی بەیاننامەکەش بەم رستەیە هاتووە: **«ئیتر چاکەو خراپەی خۆت لێک بدەرەوە ئەی کورد»**.

بەو جۆرە نە سالح جەبرو نە پارتەکەی نەیانتوانی جێگەیان لەناو کوردا بیێتەوە. سالح جەبریش بۆ خۆی تەنها گەورە پیاوانی کوردی مەبەست بوو، دەیویست بەوان سەنگی خۆی لای کۆشک و ئینگلیز بەرانبەر نوری سەعید قورستر بکات، بوونی تۆفیق وەهبیش وەک جێگری سەرۆکی **«پارتی نەتەوەی سۆشیالیزمی»** هیچ دەورێکی نەدی، تۆفیق وەهبی بەگ ئیتر ببووە بەشێک لە دەزگای رژێمی پاشایی و تێکەڵی ئەو مل ملانێیە ببوو کە بۆ دەسەڵات و کورسیی وەزارەت لە ئارادا بوو. هەر لەبەر ئەوەش سەر ئەنجام تۆفیق وەهبی بووە هۆی هەڵتەکاندنی **«پارتی نەتەوەی سۆشیالیزمی»**، هەر ئەوەندە هەستی کرد رۆژگار هێشتا لەگەڵ نوری سەعیددایە لە سالح جەبر هەڵگەڕایەوە. نوری سەعید دوای ئەوەی رۆژی سێی ئابی ساڵی ١٩٥٤ دوازدەمین کابینەی خۆی، دامەزراند یەکسەر بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پارتەکەی خۆی راگەیاند بەو هیوایەی لایەنەکانی تریش وا لێ بکات لاسایی لەو بکەنەوەو دەست لە ژیانی پارتایەتی هەڵگرن کە بەبیری خۆی لەگەڵ ئەو کارانەدا نەدەگونجا کە پێوەیان خەریک بوو، تایبەت بەستنی پەیمانی بەغدا. تۆفیق وەهبی دەستوبرد بەدەم بانگەوازەکەی نوری پاشاوە چوو، ئەویش رۆژی هەژدەی ئابی هەمان ساڵ بانگەوازێکی لە رۆژنامەکانی بەغدادا بڵاوکردەوە کە تێیدا، بێ ئەوەی سالح جەبر ئاگای لێ بێ، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی **«پارتی نەتەوەیی سۆشیالیزمی»** راگەیاند.

بانگەوازەکەی تۆفیق وەهبی بە جارێک سالح جەبری شڵەژاند، دوای دوو رۆژ سەرکردایەتی **«پارتی نەتەوەیی سۆشیالیزمی»** کۆکردەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاردرا تۆفیق وەهبی و کەمال سنەوی و فازیل معلە، کە هەرسێکیان ئەندامی سەرکردایەتی بوون، لە پارت دەرکرێن، جگە لە عەدنان قازی کە ئەندامی لیژنەی کارگێڕی لقی بەغدای پارت بوو.

شایانی باسە دوای ئەو هەنگاوە نە نوری سەعید، نە لایەنگرانی نە ئەوانی



سالح جەبر و شێخ محیدین شێخ سالح
مایسی ۱۹۵۲



لە ڕاستەوە: مستەفا بەگ ناسراو بە ڕوشدی بەگ دەکاتە کوڕی میرانی بایز بەگ، بایز بەگ کوڕی عەبدولڕەحمان بەگ، سلێمان بەگ کوڕی میرانی بایز بەگ، سالح جەبر سەرۆکی وەزیران، عەبدولڕەحمان بەگ کوڕی حەمەدەمین بەگی سیساوە، عوسمان بەگ کوڕی میرانی بایز بەگ، نەناسراوە.

تریش هیچ کامێکیان تۆفیق وەهبییان نەکردە وەزیر لە کابینەکانی خۆیاندا، تەنها عەلی جەودەت ئەیوبی، دوای ئەوەی بووە سەرەک وەزیران بە ماوەیک ڕۆژی سی و یەکی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٧ تۆفیق وەهبیی کردە ئەندامی **«ئەنجوومەنی پیران»** (مجلس الاعیان) لەگەڵ ئەودا چوار گەورە پیاوی عەرەبیشی کردە ئەندامی هەمان ئەنجومەن کە یەکێکیان فازیل جەمالیی بەناویانگ بوو.

هەرچۆن بێ ساڵح جەبرو پارتەکەی لە ناو زۆرینەی کوردا لە نوری سەعید و پارتەکەی نەبێزراوتر بوون. لە پەنجاکاندا ساڵح جەبر چەند جارێک دەستی لەگەڵ هێزە نیشتمانییەکانی ئەو ڕۆژگارەدا تێکەڵکرد، تایبەت دژی بڕیارە ناهەموارەکانی دوازدەمین کابینەی نوری سەعید **(لە سێی ئابی ساڵی ١٩٥٤وە تا حەڤدەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٥)** کە لە ڕاستیدا بوونە تیری کوشندە بۆ جەستەی ڕژێمی پاشایی خۆی. نوری سەعید، ئەو پیاوە گەورەیە، لە پەنجاکاندا کەوتە هەڵەی ئەوتۆوە کە بەجارێک چارەی لانی زۆربەی خەڵک ڕەش کرد، کار گەیشت بەوەی ڕۆژانی ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٥٢ تاقمێک لاوی خوێن گەرم تەختەی ناوی پارتەکەی، پارتی یەکبوونی یاساییان لە بارەگاکەی کردەوەو دەروازەی کارخانەی گشتیدا لە حەیدەرخانە هەڵیانواسی.

**ئەم جۆرە ڕاستییانە، بێگومان تیشک دەهاونە سەر جۆری خەبات و ململانەی سیاسی و هۆیە بزوێنەکانی لە کوردستانی سەرەتای پەنجاکاندا کە کاتی شیکردنەوەو لێکدانەوەیان هاتووە. بەندە بەچرای ڕۆنگەرچەکەوە بە دووی بەڵگەمە دەگمەنەکانی ئەو ڕۆژگارە پڕ لە ئاڵ و گۆڕەدا دەگەڕێم، خۆزگە ئەوانەی شتێکیان لەم بارەیەوە لا دەست دەکەوێ بڵاویان دەکردەوە.**

بابەتی شازدەمین*

# دوو کورتە گفتوگۆی جیاواز دەربارەی نوری سەعید

لەناو گشت سیاسەتمدارانی رۆژگاری پاشاییدا کەسێک نییە بە رادەی نوری سەعید لەسەری نووسرا بێت، تا ئێستا سەدان وتارو چەندین کتێب و نامەی ماجستێرو دوکتۆرا لە عیراق و دەرەوەی عیراق بۆ لێکۆڵینەوەی لایەنی جیاوازی ژیان و رۆڵی سیاسیی ئەو پیاوە تەرخان کراوە. کار گەیشت بەوەی لەیلا یاسین ماوەی پتر لە دوو ساڵ تەنها بە دووی رۆڵی نوری سەعید لە پەیمانی بەغدادا بگەڕێت و سەرلەبەری نامەی دوکتۆراکەی بۆ ئەو باسە تەرخان بکات.

دوا وتار دەربارەی ئەو پیاوە کە من ئاگاداریم وتارێکی سەیرو خۆشە کە عادل تەقی بەلداوی و مەحمود عەبدولواحید مەحمود لە ژمارە یەکی ئیمساڵی گۆڤاری «آفاق عربیة»دا بلاویان کردۆتەوەو **گەلێک بەڵگەنامەی دەگمەنیان بۆ نووسینی بەکارهێناوە بۆ باسی پیلانێک کە گوایە دەستەیەک کورد پاییزی ساڵی ۱۹۳۷ بۆ کوشتنی نوری سەعید لە بیروت دایانڕشتووە**(۱).

هەر بەو جۆرەش کەس لە گەورە پیاوانی رۆژگاری پاشایی بە رادەی نوری سەعید ناوی لە ناو بەڵگەنامەو راپۆرتە دیپلۆماسییە نهێنییەکانی بەریتانیادا نەهاتووە. بێ گومان نوری سەعید لە ناو بەڵگەنامەو راپۆرتە نهێنییەکانی وڵاتە رۆژئاواییەکانی تریشدا دیسان پلەو مەقامی یەکەمی بەردەکەوێت.

---

(*) لە گۆڤاری «رەنگین»ی ژمارە (۱۰۹)ی رێکەوتی ١٤ی شوباتی ۱۹۹۸، لە ل۹دا بلاوکراوەتەوە، لە سەرەوەی وتارەکە نووسرابوو: **«نووسەر بەرپرسیاری ناوەرۆکی وتارەکەیەتی»**.

(۱) عادل تقي البلداوي و محمود عبدالواحد محمود، أضواء على محاولة اغتيال نوري السعيد في وثائق عراقية جديدة، -«آفاق عربية»(مجلة)، بغداد، العدد الاول، كانون الثاني- شباط ۱۹۹۷، ص۲٦-۳۲.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئینجا گێڕانەوەی تەواوی سەرگوزشتەی ژیانی نوری سەعید هێشتا ناو زۆر دەکێشێت. هیچ دوور نەڕۆین زۆربەی هەرە زۆری رووناکبیرانمان تاوەکو ئێستایش یاسین هاشمی بە نیشتمانپەروەرو دوژمنی سەرسەختی ئینگلیزو نوری سەعیدیش بە نیشتمانفرۆش و نۆکەری ئەڵقە لە گوێی ئینگلیز دادەنێن، **کەچی لە راستیدا هەردووکیان وەک یەک دڵسۆزی عیراق و عەرەب بوون، هەردووکیان وەک یەک بە ناچاری دەستیان دەخستە ناو دەستی ئینگلیزەوە، هەردووکیشیان وەک یەک پاریەدەری دڵسۆزی مەلیک فەیسەڵی یەکەم بوون و ئەمیش وەک یەک پشتی پێ دەبەستن، بەڵام نوری سەعیدیان، لە راستیدا، راستگۆتر لەگەڵ خۆی و دونیاداو دەسپاکترو دووربینترو هەڵبەت هەر لەبەر ئەوانەیش کەڵکبەخشتر بوو.**

بۆ روونکردنەوەی مەبەستی ئەم بۆ چوونە تەنها نموونەیەک دێنمەوە. بەڵگەنامەیەکی نهێنیی زۆر بایەخداری ئینگلیزەکان کە خودی باڵوێز نووسیویە باسی ئەوەی بۆ کردووین **چۆن هەر ئەوەندە یاسین هاشمی لە وەزارەتدا نەبێت دەبێتە یەکە نیشتمانپەروەرو ناحەزی ئینگلیزو هەر کە هاتیشە سەر حوکم دەبێتە ماستی مەیبو.** راستێکەشی وابوو. بەوێنە کە ساڵی ۱۹۲۲ باسی مۆرکردنی یەکەم پەیمانی نێوان عیراق و بەریتانیا هاتە پێشەوە بزوتنەوەیەکی بەرهەڵستیکردنی زۆر بەرفراوان بەرپابوو کە دەوروبەری دوو ساڵی خایاند، **یاسین هاشمی رابەرێکی زۆر دیاری ئەو بزوتنەوەیە بوو، گوتەو نووسین و هەڕەشەو گوڕەشەکانی ئاگریان لێ دەباری، ئەوساکە ئەو لە وەزارەتدا نەبوو. دوای مۆرکردنی پەیمانەکە یاسین هاشمی بووە سەرەک وەزیران، واتا ئەو یەکەم کەس بوو کە سووک و باریک کەوتە جێ بەجێ کردنی بەندەکانی ئەو پەیمانە، لەوەیش زیاتر یاسین هاشمی یەکەم ئیمتیازی نەوتی لەگەڵ ئینگلیزدا مۆر کرد، ئەو ئیمتیازەی ناخی دەروونی سەرجەمی نیشتمانپەروەرانی عیراقی هەژاند.**

لەم پێشەکییە پێویستەوە دەچمە ناو ناخی خودی باسەکەمەوەو بە کورتی دوو گفتوگۆی زۆر جیاوازی خۆم لە بارەی نوری سەعیدەوە دەگێڕمەوە. لە وڵاتی شوورەوی خوێندن و کاری زانستی لە نزیکەوە لەگەڵ زانایەکی بەناوبانگدا

کوێکردمەوە کە ئێستا پرۆفیسۆرەو یەکێکە لە شارەزا هەرە گەورەکانی جیهان لە بواری مێژووی ئێراندا، ناوی س. ل. ئاگاییڤە. ئێستایش لەبیرمە رۆژێکیان، لە ناوەندی شەستەکاندا، لە یەکێک لە ڕاڕەوەکانی کتێبخانەی لینین بە پیاسە هیلاکی کاری خۆمان دەرەواندەوە، لە میانەی قسەدا کەوتینە باسی چەند لایەنێکی مێژووی هاوچەرخی عیراق. ئاگاییڤ زۆر لەسەر خۆ پێی گوتم:

**«کەمال من لەوە دڵنیام ڕۆژێک دێت پەیکەرەکەی مەلیک فەیسەڵی یەکەم دەگێڕنەوە شوێنەکەی جارانی خۆی، هیچ بە دووریشی نابینم ڕۆژێکی تر پەیکەرێکی قەشەنگ بۆ نوری سەعیدیش داتاشن».**

من هەرگیز چاوەڕوانی ئەم قسانەی ئاگاییڤ نەبووم، لە ڕاستیدا چوم بە ئاسماندا، پێم گوت زۆر پێم سەیرە زانایەکی مارکسیی وەک تۆ قسەی وا هەڵەق و مەلەق بکات، قسەکانیم خستە خانەی کفرەوە، کەچی هەمووی بەسەر یەکەوە بیست ساڵی نەخایاند کە بەشی یەکەمی خەمڵەکەی هاتە دی و پەیکەرەکەی مەلیک فەیسەڵی یەکەم بە شیاوی گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی(٢)، دەمێکیشە لاپەڕە تازە دۆزراوەکانی ژیان و بیرو بۆچوونەکانی نوری سەعید تەنگیان بە هەڵسەنگاندنی جارانی ئەو پیاوە هەڵچنیوە، جا با بزانین ڕەوڕەوەی مێژوو لەم بووارەدا بەرەو کوێ دەچێت.

**من بەش بە حاڵی خۆم دوای ئەوەی لە نزیکەوە شارەزای نوری سەعید بووم گشت سەرنجەکانی پێشووم بەرانبەری گۆڕی، هەرچەندە، بێ گومان، ئەمە وا ناگەیێنێ نوری سەعید فریشتە بووە، یا هەرگیز دەستی تەتەڵەی نەکردووە، کەسێکی واش کە فریشتەو بێ هەڵە بێ نە هەڵکەوتووە، نە قەتیش هەڵدەکەوێت.**

لێرەوە دەچمە سەر گفتوگۆی دووەمم کە لەگەڵ مێژوونووسی گەورەی عیراقی عەبدولڕەزاق حەسەنیدا بوو. کەس بە ڕادەی ئەو لەسەر مێژووی هاوچەرخی عیراقی نەنووسیوە، کەسیش بە ڕادەی ئەو لە سەرەتای بیستەکاندا لە بەرهەمەکانی خۆیدا بە ئاشکراو بێ هیچ پێچ و پەنایەک حەشری بە نوری سەعید نەکردووە، هەزارو یەک پلارو توانجی تێ گرتووە، گەلێک قسەی ناشرینی پێ گوتووە بێ ئەوەی، وەک

---

(٢) پێم وایە بەر لە شۆڕش رووی پەیکەرەکە لە پردی ئەحرار، لە باکوور بوو، ئێستە رووی لە باشوورە.

خۆی دەڵێت، **ئەو لە گوڵ کاڵتری بە ئەم گوتبێ.**

رۆژێکیـان لە ماڵی مامۆستا عەبدولڕەزاق حەسەنی لە دانیشتنێکی کراوەدا کە ئەحلام خانی کچی و شەهلا خانی خێزانی منیش لەوێ بوون، کەوتینە باسی نوری سەعـیدو من بەشـێک لە ئۆباڵی زڕاندنی ناوی ئەو زاتەم خسـتە ئەسـتۆی ئەوەوە، **زۆرم پێ سـەیر بوو کـە ئەویش لە نرخـاندنی رابردووی بەرانبـەر نوری سـەعـیـد پەشیمانەو** لە ناو گەلێک شتی تردا ئەمەی لای خوارەوەی بۆ گێڕاینەوە.

فەرمووی: رۆژێکیـان، لە کۆتایی چلەکاندا، بە پەلە پڕۆزکێ هاتنە لام گـوتیـان جـەنابی سـەرەک وەزیران تۆی دەوێت، رۆح هاتە سـەر کـونە لوتم، کـەس و کـارم زەندەقیان چوو. کە گەیشتـمە خزمەتی بە گەرمی بەخـێرهاتنی لێ کردم، ئـــاهێکم پێدا هـــاتەوە، دوای چا خواردنەوە رووی تێکردم و گوتی:

**عـەبدولڕەزاق تۆ بۆ بەدزیی ئێـمـەوە وردە فـەرمانبـەرەکـانمان دەفریوێنی و بە پارە دەنگوباس و وێنەی بەڵگەنامـەکـانی ئەنجـومـەنی وەزیرانـیـان لێ دەردەهێنی، بۆ چ نایەی لە ئەنجومـەنی وەزیران کـار بکەیت تا بۆ خۆت لە نزیکەوە ئاگـاداری هەمـوو کەین و بەینێکمـان بیت چونکە بەرهەمـەکـانت خزمـەتێکی چاکی مـێژووی عـیراق دەکەن.**

حەسـەنی گـوتی وەک لەسـەریانەوە بەرم دەنەوە وابوو، من چاوەڕوانی گـرتن، یا هیچ نەبێت گوێ راکێشـان بوم کەچی وا دەمخەنە سەر ئەو خەزنەیەی کە هەرگیـزاو هەرگیـز خەویشم پێوەی نەدەدی. گـوتی کە عەرزی نوری سەعیدم کرد ئەوە گەورەییـە لەوەوە یەکسەر بانگی نوری لقاضیی کرد کە ئەوساکە کاربینی ئەنجومەنی وەزیران بوو، پێی گـوت هەر ئێـسـتـا فـەرمـانی گـواسـتنەوەی عـەبدولڕەزاق لە وەزارەتی دارایییەوە بۆ ئێرە دەربکەن. نوری لقاضی دەڵێ قوربان میلاکمـان نییە، ئەویش پێی دەڵێ مـیلاکی بۆ دابنـێن. لە وەڵامـدا نوری لقاضی دەڵێ: قـوربان ئەگـەر بێتیش بۆ ئێرە ژوورمان نییە لێی دابنیشێت. حەسەنی دەڵێ لێرەدا نوری سەعید کەمێک بە رووگرژییەوە بە نوری لقاضیی گوت:

**ئەوە ئاسـانە، دەتوانن ژووری هاوینانی سـەرەک وەزیران لـــە زسـتـاندا بدەنە عەبدولڕەزاق و هاوینانیش ژووری زستانەکەی ئەوی بدەنێ.**



مەلیک فەیسەڵی یەکەم



نوری سەعید و مەلیک فەیسەڵی دووەم

بەو جۆرە لەوساوە عەبدولڕەزاق حەسەنی بۆ ماوەی چواردە ساڵی ڕەبەق بووە سەرپەرشتیاری فایلە تایبەتییەکانی ئەنجومەنی وەزیران و وەک بۆ خۆی دەیگوت ئەو ساڵانە بەختەوەرترین ماوەی ژیانی فەرمانبەریی بوون و کەڵکێکی بێ ئەندازەی لێ وەرگرتوون بۆ نووسینەکانی.

لە نووسینێکی تری خۆمدا گوتومە **بەوەی باشە مێژوو ڕێگە نادات مافی ون بێت، سەرئەنجام ڕاست و ناڕاست وەک خۆیان، زوو بێت یا درەنگ هەر ساغ دەبنەوە.**

# شەنشەل و کورد

ڕۆژی بیست و شەشی شوباتی ساڵی۱۹۹۷ لە هۆڵی ئیدریسی کۆلیجی ئادابی زانکۆی بەغدا نامەی ماجستیری قوتابی سەمیر عەبدولڕەسول عەبدوڵلا عوبەیدی خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە. **«محمد صدیق شەنشەل و رۆڵی سیاسی ئەو لە عیراق تا ساڵی ۱۹۵۹»** ناونیشانی نامەکەیەتی[1] کە دکتۆر غازی دەحام فەهد ئەلمەرسومی سەرپەرشتکاری بووە. دکتۆران ریاض رەشید حەیدەری و عەلاء جاسم محەمەد ئەندام و من سەرۆکی لیژنەکە بووم.

محەمەد صدیق شەنشەل، کە هەر بە صدیق شەنشەل ناسراوە، یەکێک بووە لە سیاسەتمەدارە نەتەوە پەرستە بەناوبانگەکانی عیراق و عەرەب، ساڵی ۱۹۱۰ لە مووسڵ لە دایک بووەو سەرەتای ساڵی ۱۹۹۱ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە، یاسای لەبەغاو دیمەشق و پاریس خوێندووە، هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی دووەمی جیهان بووە هۆی ئەوەی نەتوانێ لە فەرەنسا نامەی دکتۆراکەی تەواو بکات.

لە سییەکانەوە صدیق شەنشەل لە نزیکەوە دەستی لەگەڵ نەتەوە پەرستانی ئەو رۆژگارەی عیراقدا تێکەڵ کرد، لە رۆژانی راپەڕینی مایسی ساڵی ۱۹٤۱یشەوە بووە یەکێک لە رابەرانی خەباتی ئەو رێبازە. کاتی ئەو راپەڕینە بۆ ماوەی نزیکەی دوو مانگ شەنشەل بووە کارگێڕی گشتی راگەیاندن، لەو ماوە کورتەدا چالاکییەکی کەم وێنەی نواند، ئالوگۆڕێکی بنەڕەتی لە پرۆگرامەکانی

---

(*) لە گۆڤاری **«رۆشنبیری نوێ»** ژمارە (۱۳۹)ی ساڵی ۱۹۹۷، لە ل٤-۷دا بڵاوکراوەتەوە.

(۱) سمير عبدالرسول عبدالله العبيدي، محمد صديق شنشل و دوره السياسي في العراق حتي عام ۱۹۵۹، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة بغداد، شباط، ۱۹۹۷، ص۱۹٤.

ئێزگەو کات و مەودایدا کرد، وای کرد ئێزگەی بەغدا بە هەشت زمانی بیانی پرۆگرامی بلاو بکاتەوە، بە ئینگلیزی و فرەنسی و ئەلمانی و ئیتالی و فارسی و تورکی و ئۆردۆ و پشتو. لەگەڵ دامرکاندنەوەی راپەرینەکەشدا صدیق شەنشەل بە دەستبەسەری رەوانەی ئێران کراو دوای داگیرکردنی ئەو وڵاتە لە لایەن لەشکری ئینگلیزو سۆڤیەتەوەو کەوتنی رەزا شا ئەویش، وەک سەرجەمی رابەرەکانی تری راپەرینی مایس کە پەنایان بردبووە بەر ئێران، گیراو نێردرایە باشووری ئەفەریقاو تا مارتی ساڵی ١٩٤٢ی لەوێ بە بەندی بردە سەرو دوایی بە دەسبەسەری هێنرایەوە عیراق و تا ئەیلولی ساڵی ١٩٤٥ لە بەندیخانەدا مایەوە.

لە ساڵی ١٩٤٦ەوە صدیق شەنشەل بووە یەکێک لە رابەرە هەرە ناسراوەکانی **«پارتی سەربەخۆیی»** (حزب الاستقلال)، ئەو و فایق سامەرائی دووەم کەسایەتی ئەو پارتە بوون دووای محەمەد مەهدی کوببە کە سەرۆکی بوو. پەنجاکان شەنشەل بە جارێ هەڵتۆقی- دوو جار بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران **(مجلس النواب)** هەڵبژێردرا- ساڵی ١٩٥٠ و ساڵی١٩٥٤، گوتەکانی لە هۆڵی پەرلەمان و گوتارەکانی لەسەر لاپەڕەی رۆژنامە نیشتمانییەکاندا لە سەرانسەری وڵاتدا دەنگیان دایەوە، ئەو ئەفسەرانەی بۆ بەرپاکردنی شۆڕش خۆیان گەلاڵە دەکرد لە هەمویان زیاتر بە صدیق شەنشەلیاندا راپەرموو بیکەنە نوێنەری خۆیان و بە نهێنی بینێرنە قاهیرە بۆ دیدەنی جەمال عەبدولناسر، هەر بەو دەستوورەش شەنشەل چالاکیەکی زۆری لە بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو**(جبهة الاتحاد الوطني)**دا نوواند کە ساڵی ١٩٥٧ لە لایەن **«پارتی سەربەخۆیی»** و **«پارتی نیشتمانی دیموکراسی»**ی کامیل چادرچی و بەعس و شیوعیەوە دامەزرا. کە شۆڕشی گەلاوێژیش بەرپا بوو شەنشەل بووە یەکەم وەزیری راگەیاندنی رژێمی کۆماری. **هەرچەندە لە دەستدرێژی و تاوانجی منالکارانەی چەپرەوانی ئەو رۆژگارە رزگاری نەبوو بەڵام شەنشەل تێکەڵ بە تەوژمی توندرەوی نەتەوەپەرستانی قۆناغی دوای شۆڕش نەبوو،** هەر زوو لەگەڵ عەبدولسەلام عارف تێکچوو. دانووی لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمیشدا نەدەکولا، چەند جارێک لە سەرەتای شۆڕشەوە ویستی دەست لە وەزارەت هەڵبگرێ، دواجار سەرەتای شوباتی ساڵی

محمد صديق شنشل
ودوره السياسي في العراق حتى عام ١٩٥٩



١٩٥٩ وازی هێناو لەوساوە ئیتر ئەوەندە توخنی سیاسەت نەکەوت.

هەموو ئەو باسانەو گەلێک لایەنی تری ژیان و بەسەرهات و چالاکییەکانی تری صدیق شەنشەل بە دوورو درێژی و پشتیوانی بەڵگەنامەی نهێنی و سەرچاوەی رەسەنی زۆر لەو نامەی ماجستێرەدا لێیان کۆڵراوەتەوە، **بەڵام خاوەنی نە زۆر و نە کەم توخنی کوردو مەسەلەی کورد نەکەوتووە، ئەوەی بەلای منەوە گەورەترین کەلێنی زانستیی نامەکە بوو.**

من وا چاوەڕوان بووم ئەو دوو مامۆستایەی لەگەڵمدا بوون بە توندی لەسەر ئەوە رەخنە لە خاوەنی نامەکە بگرن، کەچی ئەوانیش کەسێکیان توخنی ئەو باسە نەکەوتن، **بۆیەکا لە کاتی لێدوانەکەی خۆمدا زۆر بە توندی رەخنەم لەوانیش گرت و ئەو چاوپۆشییەیانم بە شوورەیی زانستی لە قەڵەمدا.** زۆر بەداخەوە هەست بەو جۆرە بایەخ پێنەدانە، یا بە شێواندنی زەق لە نێوان بەشێکی زۆری مامۆستاو شاگردانی ماجستێرو دکتۆرادا دەکرێ، بۆیەکا هەر هەموویان شتێکی ئەوتۆ دەربارەی مێژووی کورد نازانن، یا بە هەڵەگەڕاوەیی دەیزانن، ئەوەی، بێگومان، لەگەڵ بەرژەوەندیی راستەقینەی نیشتمان و وڵاتدا ناگونجێ.

دەبوو، وەک لەوێ گوتم، خاوەنی ئەم نامەیە بە وردی بە دووی پێوەندی

شـەنشـەل بە کـوردەوەو سـەرنجی بەرانبـەر مـەسـەلەی کـورد بگەڕێ بۆ ئەوەی هەڵوێسـتـە راسـتـەکـانی ببنە نموونەو هەڵەکـانیـشی ببنە پەند. بەر لە هەرشت پێویست بوو ئەوەمـان نیشان بدات کە نەتەوەپەرستـەکانی سی و چلەکان، کە شەنشەل بۆ خۆیشی یەکێکیان بوو، **زۆر کەمتـەرخەم بوون بەرانبەر کێشەی کورد، بەشی هەرە زۆریان لە تۆمـەت دانەپاڵو قسـەی هەست بزوێن و بریقـەدار بەولاوە هیچی تریان بۆ کورد لێنەوەشاوەتەوە، بۆیەکا نەیانەدەتوانی جێ پێیەک بۆ خۆیان لە ناو کـوردا بکەنەوە.** جـاری وابوو **«پارتی سـەربەخـۆیی»** لە پەخـشـەو نووسینەکـانیـدا کـوردی بە کۆسپ و تەگەرە لە قەڵەم داوە[٢]. دەبوو خاوەنی ئەم نامەیە پێمـان بڵێ **«صدیق شەنشـەل کە بووە کـارگێڕی گشـتیی راگەیاندن لە سەردەمی راپەڕینی مایسی ساڵی١٩٤١دا[٣] چی بۆ پێشخستنی ئێزگەی کوردی کرد، ئەوەی من بیزانم شتێکی ئەوتۆی بۆ نەکرد هەر چەندە کورد لە رقی ئینگلیز دەورێکی باڵایان لەو راپەڕینەدا بینی»[٤].**

هەر چۆن بێ سـەرنجی صـدیق شـەنشـەل بەرانبـەر بە کـوردو کـێشـەی کـورد لەسـەرنجی زۆربەی هەرە زۆری نەتەوەپەرسـتـانی عـەرەبی چل و پەنجـاکان چاکـتـر بوو، ئەو بە چاوی رێزەوە سـەیری کـوردی دەکـرد، حـەزی دەکـرد برایەتی کـوردو عەرەب پتەو بێ، پێشی وابوو پێویستە لە قەوارەی عـیراقدا ژمارەیەک لە مافە سـەرەتاییـەکـانیـان بۆ دابین بکرێ، ئەو باسـانەی لەبەر بایەخی مـێـژوویی و سیـاسـیـان دەبوو لە نامـەکەدا جێگەی شیـاویان بۆ تەرخان بکرێ، دەبوو بزانین هەڵوێسـتی صـدیق شـەنشـەل بەرانبـەر بەشـداری کـردنی **«پارتی دیموکـراتی کـوردسـتان»** لە بەرەی نیشـتـمـانی یەکگرتووی سـاڵی ١٩٥٧دا چۆن بوو، **چونکە لەو بوارەدا نەتـەوەپەرسـتـانی عـەرەب کـەوتنە هەڵـەیەکی تەکـتـیکی و سـتـراتیـژی**

---

(٢) وەک نموونە بڕوانە: **محمد مهدي كبة، مذكراتي في صميم الاحداث، دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٥، ص١٩٩.**

(٣) لەناو کوردەواریدا هەر بزووتنەوەی رەشید عالی گەیلانی ناسراوە، چونکە گەیلانی لە سەردەمی راپەڕینەکەدا سەرەک وەزیران بوو، جگە لەوەی بۆ خۆی لەناو کوردا پیاوێکی ناسراو بوو.

(٤) بە کـوردی و بە عـەرەبی زنجیـرەیەک وتارم دەربارەی ئەو باسە لە گۆڤـاری **«رۆشنبیری نوێ»** و رۆژنامەی **«العراق»**دا بڵاو کردۆتەوە.



**گەورەوە بەوەی رازی نەبوون ئەو هێزە نیشتمانییە کاریگەرە راستەوخۆ بێتە ئەندامی بەرە.** لەو مەسەلەیەدا صدیق شەنشەل لە زۆربەی هاوەڵەکانی نەرمتر بوو، ئەو، وەک فەیسەڵ فەهمی سەعید[5] دەڵێ: **«هەمیشە بە چاوی ریزەوە سەیری کوردی دەکردو باوەڕی پێیان بوو»**. بە پێی گێڕانەوەی فەیسەڵ فەهمی سەعید شەنشەل جاروبار رەخنەی لە سیاسەتی رژێمی پاشایی بەرانبەر بە کورد دەگرت و زۆر نیگەران بووە لەو هێرشە ناڕەوایەی چەکدارانی میری کردیانە سەر تەرمەکەی شێخ مەحمود لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٦دا[6].

کۆششی صدیق شەنشەل بۆ دامەزراندنی ئیزگەی کوردی لە قاهیرە چاکترین هەڵوێستی ئەو پیاوە بوو لەبواری پێوەندی نێوان عەرەب و کوردا بەر لە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ. وەک لە سەرەتادا گوتمان ئەو ئەفسەرانەی بۆ بەرپاکردنی

(٥) کوڕی عەقید فەهمی سەعیدە کە یەکێک بوو لە رابەرانی راپەڕینی ١٩٤١، باوکی لە نزیکەوە پێوەندیی بە صدیق شەنشەلەوە هەبووە، لە نێران پێکرا دەربەدەربوون، بۆیەکا شەنشەل وەک برازا سەیری فەیسەڵی دەکردو ئەمیش وەک مام سەیری ئەوی دەکردو بایەخی زۆری دەدا بە بیرەوەرییەکانی.

(٦) دیدەنی لەگەڵ فەیسەڵ فەهمی سەعید، رۆژی دووی مارتی ساڵی ١٩٩٧.

شۆڕش خۆیان ئامادە دەکرد بە نهێنی، لە ڕێگەی صدیق شەنشەلەوە پێوەندییان لەگەڵ جەمال عەبدولناسردا دامەزراند.

بەر لە شۆڕش بە ماوەیەکی کورت صدیق شەنشەل لە ڕێگەی سووریاوە چووە میسرو لە قاهیرە بۆ باسی بارودۆخ و دووا ڕۆژی عیراق لەگەڵ جەمال عەبدولناسردا لە ماڵی خۆیان کۆبۆوە. وا دیارە لەو دانیشتنەدا صدیق شەنشەل جەمال عەبدولناسری قایل کردووە ئیزگەیەکی کوردی لە قاهیرە دابمەزرێنێ. ئەو ئیزگەیە بەر لە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بە چەند مانگێک کەوتە کارو دەنگێکی باشی لەناو کورددا دایەوە، تایبەت کوردی عیراق و ئێران چونکە لەو ڕۆژگارەدا پەیوەندی بەغداو تاران بە قاهیرەوە گەلێک ئاڵۆز بوو. دامەزراندنی ئیزگەی کوردیی قاهیرە شای ئێرانی وروژان و پاڵی پێوە نا بایەخێکی تایبەتی بە ڕاگەیاندنی کوردی بدات. دەنگو باوی ئەو ئێزگەیە کەوتە سەر زاری هەموان، شاگردانی زانکۆی بەغداو دانیشتووانی سلێمانی بە تایبەتی دڵیان بەوە خۆش بوو کە کاک هوشیار بابانی هاوشاریان پرۆگرامەکانی ئەو ئێزگەیەی دەخوێندەوە، ناوبراو ئەوساکە لە قاهیرە دەیخوێند.

هەر چۆن بێ ئەو هەنگاوە دووربینی و هەڵسەنگاندنی دروستی چ جەمال عەبدولناسر، چ صدیق شەنشەل بۆ سەنگی کورد و ئەو دەورەی گەلی کورد دەتوانێ لە کۆڕی خەباتی نیشتمانیدا ببینێ، نیشان دەدات، بۆیەکا خستنە پشتگوێی لە لێکۆڵینەوەیەکی وەک نامەی ماجستێرەکەی سەمیر عەبدولرەسولدا دەچێتە خانەی کەمتەرخەمییەوە، ئەوەی زۆر بە توندی و لەبەر چاوی هەموان نامە دەستییەوەو وەک ڕەخنە بۆم نووسی.

ئەو جۆرە هەڵوێستانەی صدیق شەنشەل بوونە هۆی ئەوەی سیاسەتمەداری کوردی ئەو ڕۆژگارە بە چاوی قەدرو ڕێزەوە سەیری بکەن و پێوەندی لەگەڵ دابمەزرێنن(٧) . ئەمە بە ئاشکرا لەو سەردەمەدا دەرکەوت کە شەنشەل بە دوورخراوەیی لە قەڵادزێ بردیە سەر، ئەوە بوو بە فەرمانێکی تایبەتی دەورووبەری کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٦ ئەو دوورخرایەوە قەڵادزێ و فایق

---

(٧) دیدەنی لەگەڵ لیوای خانەنشین فوئاد عارف، ڕۆژی بیست و هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٩٧.



**عەبدولکەریم قاسم**

سامەرائی هاوەڵ و هاوبیریشی دوورخرایەوە هەڵەبجە. شەنشەل تا تەمموزی ساڵی ١٩٥٧ لە قەڵادزێ مایەوە. دانیشتووانی قەڵادزێ بە گەرمی پێشوازییان لێی کردووە، ڕێزێکی زۆریان گرتووە، زوو زوو نان و خوانیان بۆ ڕازاندۆتەوە، کە چۆتە ناو بازاڕ بەرزەپێ لەبەری هەڵساون، ڕووناکبیرو ناسراوانی شار چوونەتە لای و تەنیاییان ڕەواندۆتەوە. لەو بارەیەوە عەبدوڵڵا ئاغای پشدەری، کە ئەوساکە لاوێکی کوردپەروەری خوێن گەرم بووە، دەڵێ: **«هەر من بە لایەنی کەمەوە سێ جاران چوومەتە خزمەتی»**[8]. مامۆستا مەسعود محەمەدیش، کە بەر

(٨) دیدەنی لەگەڵ عەبدوڵڵا ئاغای پشدەری، ڕۆژی بیست و هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٩٧.

لەوە لە نزیکەوە صدیق شەنشەلی ناسیوەو ئەو ڕۆژانە بۆ کاروباری پارێزەری(**محاماة**) لە قەلادزێ بووە، بایەخی تایبەتی پێداوە، تا لەوێ بووە چەند جارێک چۆتە لای، دواتریش نیوانیان هێندەی تر گەرم بووە. ئەو پێی وایە صدیق شەنشەل لە هەموو نەتەوەپەرستانی عەرەب پتر بۆ کورد بە پەرۆش بووە[9].

لە قەلادزی صدیق شەنشەل دەست دەداتە خوێندنی زمانی کوردی، کاک شەوکەت غەفوور بابان کە ئەوساکە لەوێ بەڕێوەبەری قوتابخانە دەبێ ئەرکی فێرکردنی شەنشەل دەگرێتە ئەستۆ، وەک ئەو دەیگێڕێتەوە شەنشەل بە دڵ حەزی دەکرد فێری کوردی ببێ[10]. لەوەوە پێوەندی ئەو دووانە بەهێز دەبێ، تەنانەت کاک شەوکەت بۆی دەبێتە تەتەری ئاڵوگۆڕ کردنی نامەی نێوان ئەوو فایق سامەرائی هاوبیری لە هەڵەبجە، شەنشەل بۆ خۆی لە بیرەوەرییەکانیدا باسی چەند لایەنێکی ئەو ڕۆژانەی ژیانی لە قەلادزێ کردووە[11]. لێرەدا پێویستە ئەوەش بێنینەوە یاد کە لەو ڕۆژانەدا عومەر عەلی پارێزگاری سلێمانی بوو کە گەورە ئەفسەرێکی توندو تیژ، جەربەزەو ناحەزی نیشتمانپەروەرانی وەک صدیق شەنشەل بوو.

وەک گوتمان صدیق شەنشەل دوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بووە وەزیری ڕاگەیاندن کە ئەوسا وەزیری ئیرشادیان پێ دەگوت. بە نیازی پتەوکردنی پێوەندی نێوان کۆماری عێراقی تازە دامەزرێنراو و کۆماری عەرەبی یەکگرتوو[12] ڕۆژی هەژدەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨، واتە چوار ڕۆژ دوای سەرکەوتنی شۆڕش، وەفدێکی بالا بە سەرۆکایەتی عەبدولسەلام عارف چووە دیمەشق و لەوێ دیدەنی جەمال عەبدولناسری کردو نامەیەکی دەستخەتی عەبدولکەریم قاسمی بۆ برد. وەزیران صدیق شەنشەل و عەبدولجەبار جۆمەرد و

---

(٩) دیدەنی لەگەڵ مەسعود محەمەد، ڕۆژی سێی مارتی ساڵی ١٩٩٧.
(١٠) دیدەنی لەگەڵ شەوکەوت غەفور بابان، ڕۆژی شەشی مارتی ساڵی ١٩٩٧.
(١١) سمیر عبدالرسول عبدالله العبیدی، سەرچاوەی ناوبراو، ل ١٢٤-١٢٦.
(١٢) کە شوباتی ساڵی ١٩٥٨ میسرو سوریە بوون بە یەک ناویان بوو بە کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو.

محەمەد حەدید ئەندامی ئەو وەفدە بوون. ئێوارەی ئەو ڕۆژە کۆبوونەوەیەکی جەماوەری زۆر گەورە لە دیمەشق ساز کرا. لەوێ جەمال عەبدولناسرو عەبدولسەلام عارف و عەبدولجەبار جومەرد و صدیق شەنشەل یەک لە دوای یەک قسەیان کرد، لەناو هەمویاندا تەنها صدیق شەنشەل بە گەرمی باسی کوردی کردو هاریکاری کوردو عەرەبی بە ماکی سەرکەوتنی شۆڕش و پاراستنی لە قەڵەم دا[13].

هێمنی صدیق شەنشەل لەگەڵ توندڕەوی و هەڵەشەیی عەبدولسەلام عارفدا نەدەگونجا، بۆیەکا هەر زوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە هاوبیر بوون، تێکچوون. عەبدولسەلام بە ئارەزووی خۆی دەستی دەخستە ناو کاروباری وەزارەتی ڕاگەیاندنەوە، هەڵبەت صدیق شەنشەلیش بەوە ڕازی نەدەبوو. بۆ نموونە دوای شۆڕش بە دەورروبەری دوو حەفتە عەبدولسەلام عارف لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆیەکی ڕۆژی ئابدا لەپڕ، بە هیلیکۆپتەر هاتە سلێمانی، لەبەر ئەوەی خەڵکێکی ئەوتۆ بە هاتنەکەیان نەزانی بۆیەکا ئەوانەی پێشوازییان لێکرد زۆر نەبوون، هەرچەندە ئەوساکە هێشتا بە دڵ، وەک ڕابەرێکی ئازای شۆڕش، خۆشیان دەویست، بە فەرمانی عەبدولسەلام لە ڕۆژنامەی( **الجمهورية**)دا هەواڵێک بلاو کرابۆوە کە گوایە ٩٠ هەزار کەس لە دانیشتووانی سلێمانی پێشوازییان لێکردووە، ئەو ژمارەیە نە لەگەڵ قەوارەی ئەوسای شاری سلێمانی و نە لەگەڵ هاتنە کتوپڕەکەی عەبدولسەلامدا نەدەگونجا، بۆیەکا عەقید نوعمان ماهیر کەنعانی کە بەڕێوەبەری ڕەقابە بوو ویستوویە ژمارەکە بکاتە نۆ هەزار، لەسەر ئەوە عەبدولسەلام دەستی لەکار کێشاوەتەوە کە هەمووی چوار پێنج ڕۆژ لەوەوبەر پێی سپێردرا بوو[14]، **هەرچەند نوعمان ماهیریش وەک خۆی نەتەوەپەرستێکی توندڕەو بوو، تەنانەت کتێبێکی خراپیشی بە عەرەبی و بە**

---

(١٣) بڕوانە ڕۆژنامەی **«الجمهورية»**، بەغدا، ژمارە سێ، بیستی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨.

(١٤) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە : **«وزارة الدفاع. القيادة العامة للقوات المسلحة. محاكمات المحكمة العسكرية العليا الخاصة»**، الجزء الخامس، بغداد١٩٥٩، ص٣٦١-٣٦٢؛ جاسم كاظم العزاوي، ثورة ١٤تموز. اسرارها، احداثها، رجالها حتي نهاية عبدالكريم قاسم، بغداد، ١٩٩٠، ص١٧٠.

**ئینگلیزی لەسەر کورد داناوە**[15].

بەهەمان دەستوور صدیق شەنشەل لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمیشدا نەدەگونجا، لەبەر ئەوە چەند جارێک ویستی بە هێمنی لە وەزارەت بکشێتەوە تا دوا جار شوباتی ساڵی ١٩٥٩ لەگەڵ پێنج وەزیری تردا وازیان لە وەزارەت هێنا، یەک لەو وەزیرانە بابە عەلی شێخ مەحمود بوو کە لە نزیکەوە پێوەندیی لەگەڵ صدیق شەنشەلدا هەبوو.

پوختەی ئەم وتارە نیشانی دەدات چۆن صدیق شەنشەل لە زۆربەی نەتەوەپەرستەکانی تر باشتر بۆ مەسەلەی کورد چووەو رێزی کوردی گرتووە، بەژێر لێوەوە کردنی ڕاستییەکی وا لە نامەیەکی زانستیدا جێگەی داخ و سەرزەنشتی و ڕەخنەی توندوتیژە، پێویستە لە هۆی ئەو جۆرە کەم تەرخەمییە بکۆڵرێتەوە کە لەوە گەورەترە ئۆباڵی بکەوێتە ئەستۆی شاگردێکی وەک سەمیر عەبدولڕەسولەوە، **دەبێ وەستاکان بە قوڵی لە پێناوی یەکیەتی نیشتمانیی ڕاستەقینەدا بەخۆیاندا بچنەوە ئەگینا دوایی کاڵەک بە ئەژنۆ دەشکێن.**

---

(١٥) نعمان ماهر الكنعاني، ضوء على شمال العراق، بغداد، ١٩٦٥.
N.M.al Kanaani, Limelight on the North of Iraq, Baghdad, 1956.

**بابەتی هەژدەمین***

# پێرێسترۆیکەو کورد

لەم رۆژانەدا نامەیەکی رازاوەی پڕ لە سۆزی برایەتیی دوکتۆر رەحیمی قازیم پێگەیشت. دیارییەکی بە نرخ بوو **«بۆ رۆڵەی خۆشەویست و لەبەر دڵاتی»**. گەلێکیش بەوە بەختەوەر بووم کە زانیم ماوەیەکە بەدانانی کتێبێکی بایەخدارەوە بەناوی، **«پێرێسترۆیکەو گلاسنەست لە یەکیەتی سۆڤیەت و مەسەلەی کورد»**ەوە خەریکە. هەڵبەت بەرهەمێکی واو بە قەڵەمی رەوانی شارەزاو ئاگادارێکی وەک دوکتۆری برا کارێکی پێویستەو کەلێنێکی باش پڕ دەکاتەوە.

**(پێرێسترۆیکە)** وشەیەکی لێکدراوی روسییە کە مانای بنیات نانەوەو دروستکردنەوە دەگەیەنێ، هەرچی **(گلاسنەست)**یشە بەمانای ئاشکرا کردن و نەشاردنەوە، واتە دیزە بەدرە خۆنەنەکردن دێ، بەو جۆرە گلاسنەست تەواو پێچەوانەی دیکتاتۆرییەتە.

وەک بابایەک کە دە ساڵی رەبەق لە وڵاتی شوورەوی ژیاوم و خوێندوومە ئەو مافە بە خۆم دەدەم کە بڵێم پێویستی مێژوویی و تاقیکردنەوەی تایبەتی پێرێسترۆیکەیان هێناوەتە کایەوە، بۆیەکا وا پێ دەچێ گەلێک لایەنی هەنگاوی گەورە بن بۆ پێشەوە، بەڵام هەمان کات لەو بوارەدا هەست بەجۆرە بەرەڵڵایی و پاشەکشێ و گێرەشێوێنییەک دەکرێ، خوام بکات ئەنجامی بەخێر بگەرێ، جەواهیر لال نەهرۆ دروستی بۆ چووە کە فەرموویە **گەر شوورەوی نەبوایە دەبا دروستمان بکردایە!، ئەگینا، بەراستی، گورگەکان ئێسک و پروسکیان دەهاڕین، زۆر سەیرە**

---

(*) لە سێ ژمارەی رۆژنامەی **«هاوکاری»**دا، رۆژانی ٢٥ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٩و ١ و ٤ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٩٠دا بڵاوکراوەتەوە.

**جیاوازکاری و چەوساندنەوە لە یەکسانی چاکترن.** بەڵام ئەمە وا ناگەیێنێ راستکردنەوەی هەڵە گەورەکانی ستالین و لادانی برێجنێڤ کارێکی پێویست نەبێ.

هەرچۆن بێ دەمەوێ بڵێم **زۆر بەداخەوە گەلی کوردیش کەمی بەدەست سیاسەتی ستالینەوە نەچێشت، ئەو کارەی تاوەکو ئێستا دیزە بەدەرخۆنە کراوە، کە لەوێ بووین جاروبار قسەی سەیرمان بەرگوێ دەکەوت.** خاوەنی **«دمدم»** نووسەری گەورەی کورد عارەبی شەمۆ **(شامیلۆڤ)** لە هەمووان یەکرووتر، بێ سڵ و پێچ و پەنا داخی زۆری دڵی خۆی هەڵئەڕشت. لەیەکەم بینینییەوە ئەو کورە شوانە بەکوڵ دەکەوتە باسی ئەوەی چۆن کەم کەس بەرادەی ئەو پێشوازیی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو دەسکەوتە گەورەکانی کردووەو بە دیداری لینین شادبووە، کەچی ئەویش بۆتە یەکێک لە قوربانییەکانی ستالین و پتر لەپازدە ساڵی بەدەستبەسەری لە سەهۆڵبەندانی سیبریا بردۆتە سەر، بۆ خۆی بەتەوسەوە دەیگوت نیوەی رێگەی شەمەندەفەری ئەو ناوچەیە دەسنێژی منە. **دەمانبیست لەوێ کورد راگوێزراون و هەوڵی تواندنەوەیان دراوە، راستە ئەو کاتەی ئێمە لەوێ بووین باری کوردی ئەرمەنستان لە هەر شوێن چاکتر بوو، کاریان راست ئەرمەنەکان بایەخیان پێدابوون. پێم وایە هەڵوێستی ئەرمەنەکان بەرانبەر کوردی وڵاتەکەیان یەکێکە لە دەرسە گەورەکانی مێژوو، چونکە، خوا هەڵناگرێ، کاتی خۆی کەمان پێ نەکردن، بەدرێژایی مێژوو کورد برا بچووکی هەمووان بووە تەنها ئەرمەن نەبێ.** هەڵبەت جیاوازیی ئایین دەوری بووە، بەڵام بەفیتی رەگەزپەرستانی بێگانە دەستی سەدان گێلە کورد لە کوشتاری ئەرمەندا بەزاخدا چوو. سەعاتە رێیەک نابڕی کاتێک لە ناوچە کوردەوارییەکانی ئەرمەنستانەوە دەگەیتە ناوچە کوردەوارییەکانی ئازەربایجان. لێرە یەکسەر هەموو شتێک ئاوەژوو دەبێتەوە، جلوبەرگ و خوێندن و ئێزگەو رۆژنامەی کوردی دەبنە ئاواتە نەهاتووە دییەکان. هەرچەندە، وەک دەڵێن. ژمارەی کوردی ئازەربایجان زیاترو مەڵبەندەکانیان پێکەوە لکاوترن وەک لە ئەرمەنستان. کوردی ئازەربایجان نیشتەجێی سێ مەڵبەندی سەرەکین– کەڵبەجەر **(کەو لەزێر)**و لاچین**(شین)**و قوباتلی.

سەرەتای کار ئەمە وا نەبوو. دوای دامەزراندنی دەسەڵاتی شوورەوی لە



نەخشەی کوردستانی سوور

ئازەربایجانی باکوور بۆ ماوەیەکی کورت کوردی ئەم مەڵبەندانەش بەئاواتی خۆیان گەیشتن. دوا بەدوای چەند لێدوان و لێکۆڵینەوەیەک لەلایەن دەزگا لێپرساوە بەرزەکانی ئازەربایجانەوە کاری دیارکردنی چارەنووسی کارگێڕی دانیشتوانی ناگۆرنە قەرەباخ و ناوچە کوردەوارییەکانی ئازەربایجان سپێردرایە کۆمیتەیەکی تایبەتی. ئەم کۆمیتەیە بۆ ماوەی چەند مانگێک بەمەسەلەی کوردی ئازەربایجانەوە خەریک بوو تا رۆژی حەوتی تەمموزی ساڵی ١٩٢٣ئەم بڕیارەی خوارەوەی دەرکرد کە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی مێژوویی بایەخداری ونە:

**«٢- دەربارەی کوردستان: دامەزراندنی رژێمی ئۆتۆنۆمی کوردستان کە دەبێ مەرکەزو سنووری لەگەڵ سنووری رژێمی ئۆتۆنۆمی ناگۆرنەی قەرەباخدا دیار بکرێن».**

هەر ئەو دەورویەرە ناوچەیەکی کارگێڕی سەربەخۆ بەناوی **«کوردستانسکی ئویەزد»** (ناوچەی کارگێڕی کوردستان)ەوە دامەزرا. دوای مانگێک، واتە ئابی ساڵی ۱۹۲۳، گ. حاجیێڤ کرایە سەرۆکی شارۆچکەو لاچینیش مەرکەزی، ی پایتەختی. هەر ئەو دەوروبەرەش ئەلیاسۆڤ کرایە بەڕێوەبەری کاروباری پەروەردەو فێرکردنی ناوچەی کارگێڕی کوردستانی سەر بەکۆماری ئازەربایجانی شوورەوی. لەوساوە زاراوەی کوردستانی ئازەربایجان دروستبوو.

**«کوردستانسکی ئویەزد»** لەپێنج دایەرە، یا مەڵبەندی سەرەکی پێکهاتبوو کە ئەوسا ناویان کەڵبەجەروکوردحاجی و موورادخانلی و قەرەقشلاغ و قوتورلی بوو. بەپێی سەرژمێری ساڵی ۱۹۲٦ ژمارەی کوردی **«کوردستانسکی ئویەزد»** بریتی بوو لە ۳۷ هەزارو ۱۸۲ کەس، کە بەسەر یەکەوە لە سەدا حەفتاو دووی دانیشتوانی ناوچەکەیان پێکدەهێنا. بەڵگەنامەی رەسمیی تر هەیە کە بیستەکان لە سەدا ۹۹,۲ی دانیشتوانی لاچین و لە سەدا ۹۹,۵ ی دانیشتوانی کەڵبەجەری بە کورد لە قەڵەم داوە.

**وا چاوەڕوان دەکرا ئەم کۆرپەیە زوو پێ بگرێ و ببێتە نموونەیەکی راستەقینەی برایەتی و دەرس و پەندێکی مێژوویی گەورە بۆ رەگەز پەرستە نەفام و نەخۆشەکانی رۆژهەلاتی گیرۆدە. داخی گرانم ئەو ئاواتە نەهاتەدی. هەزار جار ئەفسوس رۆژی بیست و یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۲٤ لینین لە ناوەختدا سەری نایەوە.**

بە دوا کۆچی ئەو پیاوە ئەوروپاییە دووربینە کە ماوەیەکی باش لە دەرەوەی رووسیا، بەتایبەتی لە جنێڤی سویسرەو میۆنیخی ئەڵمانیاو لەندەنی ئینگلتەرە ژیابوو، جڵەوی کاری ولاتی شوورەوی بەرفراوان[1] کەوتە دەست ستالینی رۆژهەلاتی کە لە بەندی و دەربەدەری و راوودوونانی چارە زاڵمەکان بەولاوە شتێکی تری ئەوتۆی نەدیبوو. **وا دیارە ئەو ستالینەی هەموو بە هەستێکی زۆر خاوێنەوە عەودالی بڕیارو هەنگاوەکانی بووین و کە رۆژی پێنجی مارتی ساڵی ۱۹۵۳کۆچی دوایی کرد بەکوڵ بۆی گریاین فیرعەونێک بوو بۆ خۆی. بە هاتنی ئەوگەلێک شت لە ولاتی شوورەوی گۆڕراو قۆناغێکی پڕ جەورو ستەمی دوور لە ناوەرۆکی**

(۱) ولاتی شوورەوی گەورەترین دەوڵەتی جیهان بوو، پانتایی نزیکەی ۲۲,۵ ملیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشە بوو کە نزیکەی شەش یەکی هەموو وشکانی جیهانی دەگرتەوە.



لینین

**ڕاستەقینەی سۆشیالیزمی زانستی دەستپێکرد.**

پریشکی ئەو ئاگرە دۆزەخییە کوردی ئازەربایجانیشی گرتەوە. ساڵی ١٩٢٩ بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی **«کوردستانسکی ئویەزد»** دەرچوو. زۆری نەخایاند لیژنەیەکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخی نەتەوەیی ناوچە کوردەوارییەکانی ئازەربایجان بە سەرۆکایەتی بوکشپان دامەزرا.

ئەندامانی ئەم لیژنەیە لە کوردناس ی. مارەگولۆڤ و مامۆستای فێرگەی سەرەتایی گوندی مینکەند کە سەرپاکی دانیشتوانی کوردن سەمەد شاسوارو پسپۆری زمانی تورکی ئیدریس حەسەنۆڤ و پسپۆری ئەتنۆگرافی عەلی ئەکبەرۆڤ پێکهاتبوو. کاری ئەم لیژنەیە مانگێک و شەش ڕۆژی خایاند، لە دووی ئابەوە تاوەکو هەشتی ئەیلولی ساڵی ١٩٣١ . دوای ئەوە ڕاپۆرتێکی گەورەی لەسەر مەسەلەی کوردی ئازەربایجان دانا کە ساڵی ١٩٣٢ بوکشپان لە کتێبێکی

سەربەخۆی نەوەت و دوو لاپەڕەییدا لە باکۆ بەناوی **«کوردی ئازەربایجان»**ەوە لە چاپیدا[٢].

خوا هەڵناگری شەقڵی هیلاکبوون و ماندوێتییەکی زۆر بەراپۆڕتی لیژنەی ناوبراوەوە دیارە. وا پێ دەچێ بوکشپان خوێندەوارێکی چاک و کۆمۆنستێکی کەلەڕەق بووبێ.

**«کوردی ئازەربایجان»** پڕییە لە زانیاری بایەخدارو دەگمەن دەربارەی هەموو کوردی رووسیای رۆژگاری چارو سەرەتای دەسەڵاتی شوورەوی لەو وڵاتەدا. بەڵام بەداخەوە لە گەلێک بۆچوونیدا هەست بەدوورکەوتنەوەو پاشگەزبوونەوەیەکی ئاشکرا لە رێبازی دروستی لێنینیزم دەربارەی مەسەلەی نەتەوەیی دەکرێ، بەڵکو تارادەکی زۆر لەگەڵ ئەو قسانەی ستالینیشدا ناگونجێن کە بوکشپان سەروو لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکەی پێ رازاندۆتەوەو دەڵێ:

**«شۆڕشی ئۆکتۆبەر زنجیرە کۆنەکانی پساندو بەوەی کە ژمارەیەک گەل و کەمینەی لەبیرکراوی هێنایە کۆڕەوە بووە هۆی ژیانێکی تازەو پێشکەوتنێکی نوێ بۆیان»**.

بەداخەوە، وەک دواییش دەیبینین، سەرئەنجامی بۆچوونەکانی بوکشپان و راسپاردەکانی لیژنەکەی بەنیسبەت کوردی ئازەربایجانەوە تەواو بەپێچەوانەی ئەو قسانەوە شکانەوە، وەک بەڵگەش بۆ دەرخستنی ئەم رایە چەند نموونەیەکی کەم لە راپۆڕتی لیژنەکە خۆی دەخەمە بەرچاو.

بوکشپان کە هەڵوەشاندنەوەی ناوچەی کارگێڕیی کوردستانی ئازەربایجانی پێ رەوابوو بە ئاشکرا هەوڵیداوە ژمارەی کوردی ئەو ناوچەیە کەم بکاتەوە، تەنانەت زۆر بەوردی بە دوای ئەوانەشدا گەڕاوە کە بەڕەگەز کوردن و لەبەر هەرهۆیەک بێ زمانی زگماکی خۆیان دۆڕاندووەو یەک یەک سەرژمێری کردوون و جیایکردوونەوە. بەپێی قسەی ئەو، کە رێی تێناچێ، دوای دامەزراندنی **«کوردستانسکی ئویەزد»** ژمارەیەکی زۆر لە ئازەرییەکانی ئەو ناوچەیە خۆیان بەکورد لە قەڵەم داوە.

---

(2) A.Bukshpan, Azerbaijanskie Kurdi-Lachin, Kelbajari, Nakhkrai. Zametki, Baku, 1932.

أ- بوکشپان، کوردی ئازەربایجان- لاچین، کەلبەجەر، ناوچەی قەرەباغ، تێبینی، باکو،١٩٣٢.

АКАДЕМИЯ НАУК АРМЯНСКОЙ ССР
СЕКТОР ВОСТОКОВЕДЕНИЯ

Х. М. ЧАТОЕВ

УЧАСТИЕ КУРДОВ СОВЕТСКОГО СОЮЗА
В ВЕЛИКОЙ ОТЕЧЕСТВЕННОЙ ВОЙНЕ
1941—1945 гг.

ИЗДАТЕЛЬСТВО АН АРМЯНСКОЙ ССР
ЕРЕВАН 1970

وینەی لاپەڕەی یەکەمی کتێبی دکتۆر چەتۆییێڤ دەربارەی بەشداریی کوردی شورەوی لە شەڕی دووەمی جیهاندا، ئەو کتێبە بە رووسی ساڵی (١٩٧٠) لە یەریڤان چاپکراوە، چەتۆییێڤ بە دەستخەتی خۆی پێشکەشی دکتۆر کەمال مەزهەری کردووە.

ҺҮСЕЈН АЛЫШАНОВ
(КҮРДОҒЛУ)

МУАСИР КУРД ШАИРИ
АБДУЛЛА ГОРАНЫН
ПОЕЗИЈАСЫ

کتێبەکەی حسەین عەلیشانۆف کورد ئۆغلی دەربارەی گۆران کە ساڵی (١٩٦٩) لە باکۆ چاپکراوەو دوایی مامۆستا شوکور مستەفا کردی بە عەرەبی.

هەمـان کـات بوکـشـپـان زۆر بەتوندو تیـژی پەلامـاری مـامـۆسـتـای زانکۆی ئازەربایجان پرۆفیسۆر ژوزێی داوەو گەلێک تۆمەتی ناڕەوای داوەتە پاڵ و کۆلێک توانجی نابەجێی تێگرتووەو کۆمەڵێک قسەی رەقی پێگوتووە تەنها لەسەر ئەوەی لە کۆبوونەوەیەکدا باسی ئەوەی کردووە چۆن کوردی عیـراق هەرچەندە لە ژێر باری گرانی حوکمی ئینگلیـزدان، بەڵام منداڵیـان پلەی سـەرەتایی و ناوەندی بەزمـانی خۆیان دەخوێنن و لەبەرئەوە ئەوان بوونەتە هەست راکێشەری کوردی ئێران و تورکیا، لەسەر ئەوەی کفری کردووەو گوتوویە تا ئێستا ئەلف بای کوردی نییەو نازانرێ کەی دادەنرێ.

بەهەمـان دەسـتـوور بوکشـپان پەلامـاری پرۆفیـسۆر گـورگەکـریاژنیشی داوە کە



АКАДЕМИЯ НАУК АЗЕРБАЙДЖАНСКОЙ ССР
ИНСТИТУТ НАРОДОВ БЛИЖНЕГО И СРЕДНЕГО ВОСТОКА

АЛИШАНОВ ГУСЕЙН ГАСАН оглы

ПОЭЗИЯ СОВРЕМЕННОГО КУРДСКОГО ПОЭТА
АБДУЛЛЫ ГОРАНА

Автореферат

Баку — 1966

کورتەی نامەی دکتۆرای حسەین عەلیشانۆف کورد ئۆغلی دەربارەی گۆران کە لە باکۆ سالی (١٩٦٦) چاپکراوەو بە دەستخەتی خۆی رۆژی ١٧ مارتی هەمان سال پێشکەشی دکتۆر کەمال مەزهەری کردووە، نامەکەی بە سەرپەرشتی دکتۆر رەحیمی قازی نووسراوە.

رۆژهەڵاتناسێکی ناسراوی ئەوسای شوورەوی بوو[٣]. گورگەکریاژن دوای ئەوەی هاوینی ساڵی ١٩٢٩ بەناوچە کوردەوارییەکانی شوورەویدا گەڕاوە راپۆرتێکی تایبەتی دەربارەی گەشتەکەی نووسیوە، وا دیارە ئەویش وەک پرۆفیسۆر ژۆزێ هەندێک قسەی رەوای بۆ کورد کردووە کە بەلای بوکشپانەوە لادانی سەقەتن لە رێبازی مارکسیزم لینینیزم[٤].

---

(٣) ڤلادیمیر ئەلێکسەندەرڤیچ گورگەکریاژن (١٨٨٧-١٩٣١) رۆژهەڵاتناسێکی بەناوبانگی رووسیاو شوورەوییە، ئەندامی دەستەی کارگێڕی **«کۆمەڵەی رۆژهەڵاتناسی زانستی»** بوو کە لە ساڵی ١٩٢٢ لە مۆسکۆ دامەزرا. یەکەم مێژوونووسی جیهانە کەلەساڵی ١٩٢٢وە سروشتی رزگاریخوازی شۆڕشی بیستی گەلی عیراقی لە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵدا دەستنیشان کرد.

(٤) بوکشپان هەر لەو کۆبوونەوەیدا زۆر بەتوندی چووە بەگژ پرۆفیسۆر ژۆزێداو دوای ئەوە رۆژی ٢٢ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣١ لە رۆژنامەی **«باکینسکی رابۆچی»** دا وتارێکی رەقی دەربارەی هەمان باس بڵاوکردۆتەوە کە تێیدا پرۆفیسۆر ژۆزێی بە دوژمنی چینایەتی لە قەڵەمداوە.


АКАДЕМИЯ НАУК АРМЯНСКОЙ ССР
ФУНДАМЕНТАЛЬНАЯ НАУЧНАЯ БИБЛИОТЕКА
ИНСТИТУТ ВОСТОКОВЕДЕНИЯ

КУРДЫ
СОВЕТСКОЙ АРМЕНИИ

БИБЛИОГРАФИЯ
(1920—1980)

Составил: ДЖАЛИЛЕ ДЖАЛИЛ

ИЗДАТЕЛЬСТВО АН АРМЯНСКОЙ ССР
ЕРЕВАН 1987

وێنەی بەرگی یەکەمی کتێبی «کوردی ئەرمینای سۆڤیەتی. بیبلیۆگرافیا ۱۹۲۰ - ۱۹۸۰» ئامادەکردنی دکتۆر جەلیلی جەلیل، یەریڤان، ۱۹۸۷.


А. Букшпан.

Азербайджанские курды

Лачин,
Кельбаджары, Нахкрай

ЗАМЕТКИ

وێنەی بەرگی یەکەمی کتێبە دەگمەنەکەی بوکشپان «کوردەکانی ئازەربایجان»، باکۆ، ۱۹۳۲.

لەگەڵ ئەوەش لەدوو توێی راپۆرتەکەی بوکشپاندا گەلێک راستی و بەڵگەی بایەخدار بەرچاو دەکەون کە هەموویان ئەوە نیشاندەدەن چۆن نەدەبوو چارەنووسی کوردی ئازەربایجان بەو دەردە ببرێ کە برا. بەر لەهەرشتێک ناوی ژمارەیەک گوندی وەک زەردی و کەمالی و قالەجەو ساوجبولاق و ئاقجەکەندو شیلانلی و گەلێکی تری بۆ تۆمار کردووین کە، وەک دەڵێ: **سەد دەر سەدی دانیشتوانیان کوردن و بەکوردی دەدوێن.**

هەروەها بوکشپان ئەوەی بۆ تۆمار کردووین چۆن کوردی ئازەربایجان تینووی خوێندن بوون بەزمانی زگماکی خۆیان و بەدڵ دەیانویست بایەخی پێویست بدرێتە ژیانی رووناکبیریی نەتەوەییان. لەم بارەیەوە بوکشپان نووسیوییە دەڵێ:

**«لە هەموو کۆبوونەوەکانی پارت و کەمسەمۆڵدا(٥) جگە لەو کۆبوونەوانەی توانیمان بۆ هەژارو کەڵخۆزی و جوتیارە رەنجدەرە کوردو تورکەکان لەکاتی کاری**

**لیژنەکەماندا سازیان بکەین، دەنگی نارەزایی توندوتیژی رەوا دژی ئەو سیاسەتە بەرز دەبۆوە کە کۆمیتەی پەروەردەو فێرکردنی گەل تا ساڵی ۱۹۳۰ پەیرەوی دەکرد، ئەو سیاسەتەی بووە هۆی نەک تەنها بەفیڕۆچوونی چەند ساڵێک، بەڵکو بووشە کۆسپ لەبەردەم دامەزراندنی قوتابخانەو پێشخستنی ژیانی ڕووناکبیری کورد بەزمانی زگماکی خۆیان».**

لە هەمان شوێندا بوکشپان دەڵێ: **«بەهۆی سیاسەتی بۆگەنی ژمارەیەک لە رابەرانی پێشووی کۆمیتەی پەروەردەو فێرکردنی گەلەوە ئێمە تاوەکو ئێستا شتێکی یەکجار کەمان بۆ پێشخستنی زمان و قوتابخانەو ئەلفباو نووسینی کوردی و هەموو کاروباری ژیانی ڕووناکبیری کورد کردووە.. لەم بوارەدا ئێمە تاوانکارانە دواکەوتووین».**

بۆ چارەسەرکردنی ئەم هەڵەیەی بوکشپان بەتاوان لە قەڵەمی داوە کاربەدەستانی ئازەربایجانی شوورەوی حوزەیرانی ساڵی ۱۹۳۱ ژمارەیەک بڕیاری تایبەتییان دەرکرد، وەک کردنەوەی چەند قوتابخانەیەکی سەرەتایی کوردی کە بڕیار بوو ت ساڵی ۱۹۳۳ - ۱۹۳٤هەموو ناوچە کوردەوارییەکان بگرێتەوە. ئەلفبای کوردی بەپیتی لاتینی دانراو سێ کتێبی خوێندنی کوردی لەچاپدرا. هەروەها بڕیاردرا بەشی کوردیی سەربەخۆ لە فێرگەی پەروەردەی شائومیان بکرێتەوەو زمانی کوردی بکرێتە زمانی لێکۆڵینەوەو لێدوانی کۆبوونەوەکانی پارت و کەمسەمۆڵ[٦].

شایانی باسە ئەم بڕیارانە بوونە هۆی نارەزایی و نیگەرانی رابەرە رەگەز پەرستەکانی پارتی موساوات کە، وەک دواییش باسیدەکەین، دوژمنی باوەکوشتەی شوورەوی بوون. ئۆرگانی ئەو پارتییە گۆڤاری **«بیلدیریش»** کە لەدەرەوەی ئازەربایجانی شوورەوی چاپدەبوو، لە ژمارەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۳۱یدا بە رقەوە نووسیبووی:

**«بۆ ئەو کوردانەی ژمارەیان لە شەش تا دە هەزار تێپەڕ ناکات و لەتورکی بەولاوە زمانێکی تر نازانن زمان و نووسین و قوتابخانەو سەقافەتیان بۆ دروستکردوون».**

---

(٥و٦) کەمسەمۆڵ کورتکراوەی ناوی یەکیەتی لاوانی شیوعییە.

кورتەی نامەی دکتۆرای زومرد شەفییڤا (شەفیخوڤا)، باکو، ١٩٦٧، نامەکە بە سەرپەرشتی دکتۆر ڕەحیمی قازی نووسراوە.
(بە خەتی خۆی ڕۆژی ٥/ ئەیلولی هەمان ساڵ پێشکەشی کردووە بە کەمال مەزهەر)

АКАДЕМИЯ НАУК АЗЕРБАЙДЖАНСКОЙ ССР
ИНСТИТУТ ЛИТЕРАТУРЫ И ЯЗЫКА им. НИЗАМИ

*На правах рукописи*

ШАФИЕВА З. Т.

# ЖАНР ПОЭМЫ В СОВРЕМЕННОЙ КУРДСКОЙ ПОЭЗИИ

АВТОРЕФЕРАТ

диссертации, представленной на соискание ученой степени кандидата филологических наук

Научный руководитель:
кандидат исторических наук
*Р. Гази*

بۆ ماموستای خۆشەویست
کاکاڵ! هیوای سەرکەوتنت لە ڕێگەی
خزمەتی کوردستان.

زومرد
١٩٦٧ ٩/٥

БАКУ—1967

راستە ئەمانەی وتمان هەنگاوی چاکبوون بۆ پێشەوە، بەڵام هێشتا زۆر لەوە کەمتربوون کە رابەرانی ئەرمەنستان بۆ کوردی لای خۆیانیان کردبوو. بەڵام بەداخەوە زۆری نەبرد کاتێک ئەو شتە کەمەش لە سایەی باقیرۆڤی رەگەز پەرستەوە وەک ناوچەی کارگێڕی کوردستان زیندە بەچاڵکراو لەگەڵ کوردا نەخشەو ئاواتی موساواتییەکان هاتەدی.

میر جەعفەر عەبباسەڤیچ باقیرۆڤ کە ساڵی ۱۹۳۳ بووە سکرتێری یەکەمی پارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجان سەرباری ئەوەی ستالینێک بوو بۆ خۆی، لە رەگەز پەرستیشدا بۆ ئەوسای وڵاتی شوورەوی بێ وێنە بوو، هەر ئەو بوو کە دەیویست بە زۆری زۆردارەکی کۆماری مەهاباد بکاتە کلکی ئەو رژێمەی جەعفەر پێشەوەری دوای شەڕی دووەمی جیهان لەئازەربایجانی ئێران دایمەزراند، بەڵام هەڵوێستی پیاوانەی قازیی محەمەدی پێشەوا رێگەی نەدا. **راست گوتراوە ئەوی دوژمنی گەلی تر بێ ناتوانێ پیاوانە دڵسۆزی گەلەکەی خۆی بێ و نەبێتە هۆی نەگبەتی و قوربەسەریی رۆڵەکانی. باقیرۆڤ یەکێکە لەو نموونەو دەرسانەی مێژوو.** پاش کۆچی دوایی ستالین بەماوەیەکی کەم میر جەعفەر عەبباسەڤیچ باقیرۆڤ کە شانی چەپی لەبەر ئەو سەبەتە میدال و نیشانانەی پێی درابوو خواربووبۆوە بە تۆمەتی خیانەت لەگەڵ لاڤێرنتی پاڤلەڤیچ بێریای وەزیری کاروباری ناوخۆی بەناوبانگی رۆژگاری ستالین لە سێدارە درا. **هەر بژی حوکمی رەوای ژیان و مێژوو...**

*

* *

بریا ئەو حوکمە نارەوایەی لە رۆژگاری ستالیندا بەتایبەتی بەسەر کوردی ئازەربایجاندا درا لە ژێر سایەی **پێریسترۆیکەی گۆرباچۆڤدا** راستدەکرایەوە، لەگەڵێک رووەوە کوردی ئازەربایجان شایانی ئاوڕدانەوەیەکی لەو بابەتەن. بەر لەهەر شتێک هەموو کوردی رووسیا کە سەرپاکیان هەژارو بێ ماف و دەرەتان بوون بەگەرمی پێشوازیی شۆڕشی ئۆکتۆبەریان کردو دڵسۆزانە بەرەنگاری دوژمنەکانی


بێریا


باقیرۆف

هاتن، ئەوەش بۆ خۆی دیاردەیەکی ئاسایی دروستبوو، چونکە لە لایەکەوە ئەو کوردانە بەکەوتنی رژێمی (چار) هیچیان لەکیس نەدەچوو. لە لایەکی تریشەوە دەمێکبوو رابەرانی ئۆکتۆبەر بە گەرمی، بێ جیاوازی باسی مافی رەوای گشت نەتەوەو کەمینەکانی رووسیایان دەکرد. **شایانی باسە لینین بۆ خۆیشی لە سەرەتاوە لە بروسکەیەکی تایبەتیدا کە بۆ نەریمان نەریمانۆڤی یەکەم سەرۆکی کۆماری ئازەربایجانی شوورەوی ناردووە داوای چاودێری کردنی کوردی لێ کردووە**، پێم وایە لینین هەر بۆ خویشی یەکەم کەسە **کە زاراوی کوردستانی بۆ ناوچە کوردەواریەکانی شوورەوی بەکار هێناوە**، ئەمەش دەقی ئەو بروسکەیەیە کە لینین رۆژی حەڤدەی تەشرینی دووەمی سالّی ۱۹۲۱ بۆ نەریمان نەریمانۆڤی ناردووە:

**«حەز دەکەم بانقی میری تازەکراوەی ئازەربایجان ببێتە پالّپشتێکی پتەو بۆ سیاسەتی ئابووریی نوێی کرێکاران و جوتیارانی کۆماری (ئازەربایجانی) شوورەوی برا، بەختکردنی چل ملیۆن (روبل) بۆ برسییانی قەراغ قۆلگاو کوردستان باشترین نیشانەی ئامادەییە بۆ بەرەو پێشچوون لە ژێر ئالاّی سووری ئینتەرناشیۆنالی زەحمەتکێشاندا. لینین»**(۷).

(7) V. I. Lenin, Poln.Sobr. Soch.; Tom, 54, Moscow, 1965, PP. 21-22.

لێرەدا بەپێویستی دەزانین ئەوەیش بڵێین کە چل ملیۆن روبل پارەیەکی یەکجار زۆر بوو بۆ ئەوسای وڵاتی شوورەوی کە لە رووی ئابوورییەوە کەوتبووە ژێر بارێکی بێ ئەندازە قورسەوە.

ئەوەی بۆ ئەم باسەی ئێمە سەرنجی تایبەتی رادەکێشی ئەوەیە کە دوژمنانی دامەزراندنی دەسەڵاتی شوورەوی لە ئازەربایجانی باکوور هەمان کات ئاشکرا دوژمنایەتی کوردی ئەو وڵاتەشیان دەکرد. هەڵوێستی موساواتییەکان سەنگی مەحەکی ئەم بۆچوونەیە.

پارتی موساوات چالاکترین دوژمنی دەسەڵاتی شوورەوی بوو لە ئازەربایجان. ئەم پارتییە ساڵی ١٩١١ بە ناوی پارتی دیموکراتی موسلمانانەوە دامەزراو تا شۆڕشی ئۆکتۆبەر بەریا نەبوو رۆڵێکی ئەوتۆی نەدی، بەڵکو لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهاندا بە ئاشکرا داوای لە هەموو موسڵمانان دەکرد بەگەرمی پشتی لەشکری چار بگرن. لە یەکەم رۆژی سەرکەوتنی ئۆکتۆبەریشەوە رابەرانی دەستیان تێکەڵی تورک و ئینگلیز کردو هەموو توانایان بۆ بەربەرەکانیی شوورەوی تەرخانکردو لە ئەیلولی ساڵی ١٩١٨وە دەسەڵاتی خۆیان دامەزراند. حوکمەتی موساوات تا رۆژی بیست و هەشتی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ ژیا، واتە تا ئەو کاتەی لایەنگرانی شوورەوی سەرکەوتن وکۆماری ئازەربایجانیان دامەزراند.

دوای ئەوە موساواتییەکان پەنایان بردە بەر خاکی تورکیاو ئێران، تایبەت لە ئێران بنکەو دامودەزگای خۆیانیان دامەزراندو کەوتنە چالاکی دژی دەسەڵاتی شوورەوی و بوونە یەکێک لەو گرێیانەی ماوەیەکی زۆر پەیوەندیی نێوان مۆسکۆو تارانیان ئاڵۆز کردبوو، جاروبار لایەنگرانیان لەناو خاکی ئازەربایجانی شوورەویدا شەڕی چەتەگەرییان دەکرد.

لەو ماوە کورتەی دەسەڵاتیاندا موساواتییە رەگەز پەرستەکانی ئازەربایجان بێ پەروا پەردەیان لە رووی راستەقینەی شۆڤێنی خۆیان راماڵی، ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی ناوچە کوردەوارییەکان لە تاو ئەوان و داشناقەکانی ئەرمەنستان ناچار بوون هەڵێنە ناو خاکی تورکیاو ئێرانەوەو دوای نەمانی دەسەڵاتی ئەوان ئینجا توانییان بەرە بەرە بگەڕێنەوە مەڵبەندەکانی جارانیان، وەک بوکشپان باسی دەکات



**لە ڕاستەوە بۆ چەپ، د. شامیل عەسکەر، کوردۆ یێف، د. کەمال مەزهەر، د. ڕەحیمی قازی «ساڵی ١٩٦٦»**

سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوەیی کورد لە ژێر سایەی ڕەشی موساواتییەکاندا گەلێک لە سیاسەتی ڕووسیای ڕۆژگاری چارەکانی تێپەڕاند، بوکشپان لەم بارەیەوە نووسیویە دەڵێ:

**«ڕاوودوونانی کوردو گاڵتە پێکردن بەزمان و دابونەریتیان پەرەی سەند، کورد بوونە گاڵتە جارو مایەی نوکتە لەسەر دانان لە لایەن موساواتییەکانەوە کە توانییان جاروبار بەشێکی کەم لە خەڵکی هەرە دواکەوتوو ڕابکێشنە ئەم گێژاوەوە، هەر ئەو دەورویەرە دانیشتوانی ژمارەیەک گوندی کورد سوێندیان خوارد دەست لە زمانی کوردی هەڵگرن، ئەو زمانەی ببووە مایەی توانج و تەشەری پێکەنیناوی وەک (کەرە وەرە)، ئێمە بۆ خۆمان تووشی چەند حاڵەتێک هاتین کە دیمان چۆن کورد هەبوون سوێندیان خواردبوو واز لە زمانی زگماکی خۆیان بهێنن، وەک دانیشتوانی گوندی کەمالیی ناوچەی لاچین»**[٨].

لایەنگرانی موساوات دوای دامەزراندنی دەسەڵاتی شوورەویش لە ئازەربایجان هێشتا هەر دەستیان هەڵنەگرت، م. گ. وەلییێڤ، کە نازناوی بەهارلی بوو، لە لاپەڕە پەنجای ئەو کتێبەدا کە ساڵی ١٩٢١ لە باکۆ بەناوی **«ئازەربایجان. کورتەی**

(8) A. Bukshpan, Op. Cit., P.72.

**جوگرافیای سروشتی و ئەتنۆگرافیاو ئابووریی»** یەوە بلاویکردۆتەوە بێ شەرمانە ئەم شەکرەی شکاندووە:

**«زمـــانی تورکی تا دێ زیاتر ســـەرکـــەوتن وەدەست دێنی لە رێگەی تەنگە هەڵچنینییەوە بە گەلێک زمانی یەک کەوتەی ئەوتۆ کە رۆژیان بەسەر چووە، وەک زمانی تات و تالش و لەزگین و کوردی وەی تر».**

موساواتیی ئەوتۆ هەبوو بەوەیش قایل نەبوو، بەڵکو بەزۆری زۆردارەکی کوردی دەکردە هاوڕەگەزو خوێنی ئازەری[٩]. سەیر ئەوەیە داشناقە ئەرمەنییەکان کە لە هەموو شتێکدا لە گەڵیان هاوبیربوون لە عاستی رەگەزی کوردا یەکیان نەدەگرتەوە، ئەوانیش بە زۆری زۆردارەکی کـوردیان دەکـردە هاوڕەگــەزو خـوێنی خـۆیان، لەو بەیاننامەیەیاندا کە شوباتی ساڵی١٩٣١ لە قاهیرە بلاویان کردبۆوە گوتبوویان: **«کورد کە دراوسێمانن، لەسەر خاکێک پێکرا دەژین و بە خوێنیش خزمین»**. بریا خوێنی کورد لای هەمووان وا شیرین نەدەبوو، هەڵبەت کوردی ئازەربایجان حەقی خـۆیان بوو چارەی مـوسـاواتیــیـە رەگــەز پەرسـتــەکـانیـان نەوێ و بەدەنگ بانگەوازیەکانیانەوە نەچن، بەڵکو دوژمنایەتی ئەوان و دۆستایەتی دوژمنەکانیان بکەن کە لە سەنگەری شوورەویدا کۆبوونەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەش زۆر بەداخەوە بەنیسبەت کوردی ئازەربایجانەوە نەخشەو ئاواتی موساواتییەکان هاتنە دی، هەرچەندە بەپێی هەموو سەنگ و کێشێکی رەوا نەدەبوو وابێ.

راستــە هەستی نەتەوەیی لەناو بەشی زۆری کـوردی ئازەربایجانی شوورەویدا نەگەیشتبووە ئاستی ئەو هەستە لە ناو کوردی ئەرمەنستاندا، هاو ئایینی لەسەر رۆخی جیهانی عیسایی دەوری خۆی لەمەدا دیبوو، بەڵام وا چاوەڕوان دەکرا دەسەڵاتی شوورەری ئەو هەڵەیەی مێژوو لەگەڵ کوردا راستبکاتەوە بەو دەستوورەی لەگەڵ هەموو گەلانی قەوقازو پشت قەوقازو ناوەندی ئاسیادا کردی، ئەوانەی گەلی وایان تێدا بوو ئەوساکە گەلێک لە کورد دواکەوتووتربوون، هی وایان هەبوو، وەک قەرە قەڵباخییەکانی سەر سنووری ئەفغانستان، کورد لە چاویاندا بە رادەی ئینگلیز

---

(٩) بە وێنە بڕوانە: **«ئازەربایجان گەنجلەری»** (لاوانی ئازەربایجان)، باکۆ، ژمارە ٧٦٤١، ٢٠ی مایسی ١٩٦٩.

پێشکەوتوو بوو.

بێگومان کورد، وەک هەر گەلێکی تر، شایانی ئاوڕدانەوەیەکی وابوو کە زۆر لەوانە بوو کار بکاتە سەر چارەنووسی و نەبێتە ئەو گەلە دێرینە بەخت ئاڵۆزاوەی ڕۆژنامەی **«ئیزڤێستیا»** دەورووبەری ساڵێک لەمەوبەر بەکوڵێک داخ و زوخاوەوە لە دیدەنییەکی تایبەتیدا لەگەڵ کوردناسی سۆڤیەتی پرۆفیسۆر گاسرەتیاندا باسی کردبوو.

بەلشەڤییەکانی ئەرمەنستان یەکسەر، دوای ئەوە بیست و نۆی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٠. دەسەڵاتیان وەرگرت، دەستوبرد کەوتنە ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەیە، هەر ئەو ساڵە ئەلفبای تایبەتییان بۆ کورد داناو یەکەم کتێبی قوتابخانەیان بەناوی **«شەمس»**ەوە پێ چاپکرد. بێ دواخستن پێنج فێرگەی سەرەتاییان لە گوندە کوردەوارییەکاندا دامەزراندو بەپەلە ژمارەیەک مامۆستای تایبەتییان بۆ ئامادەکردن. هەشت ساڵی نەبرد کاتێک ژمارەی ئەو فێرگانە گەیشتە هەژدە، ساڵی١٩٣١ فێرگەی باڵای پەروەردەی پشت قەوقازی کوردی واتە **(دار المعلمین الابتدائیة الکردیة في ما وراء القفقاس)**یان دامەزراند کە یەکەم دەزگای لەو بابەتەیە لەمێژوودا.

تاوەکو ناوەندی سییەکان ژمارەی شاگردانی فێرگەی باڵای پەروەردەی پشت قەوقازی کوردی لە سەد تێپەڕی، هەر بەو هۆیەشەوە تا ساڵی ١٩٣٤ ژمارەی فێرگە کوردییە سەرەتاییەکانی ئەرمەنستان گەیشتە چل وپێنج فێرگەو ژمارەی شاگردانیان خۆیدا لە ٢٣٦٥ منداڵی گوندە کوردییەکان کە بەو جۆرە نەخوێندەوارییان تێدا قەڵاچۆ کرا دوای ئەوەی عارەبی شامۆ، وەک بۆ خۆی نووسیویە، تا ساڵی ١٩٢١ تاکە خوێندەواری هەموو کوردی ئەرمەنستان بوو، ئەنجامیش زۆری نەبرد کاتێک لەناو ئەو کوردانەدا نووسەرو شاعیرو هونەرمەندو مامۆستاو پزیشک و ئەندازیارو پسپۆری هەڵکەوتووی خۆیان بۆ دروستبوو کە نە زمان نە دابونەریتی نەتەوەیی خۆیان نەدۆڕاندو بەزمانی زگماکی خۆیان ڕۆژنامەی **«ڕیا تازە»**و دەیان بەرهەمی کوردی هەمەجۆریان دەخوێندنەوەو هەموو ڕۆژ لە ڕێگەی ئێزگەی یەریڤانەوە بە کاڤۆکی و لاوک وحەیرانی کوردی زاخاوی مێشکیان

دەدەنەوە.

لەبەر ئەوە ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمەنستان رۆژنامەی **«کۆمۆنیست»** بۆی هەیە لەژمارەی رۆژی هەشتی کانوونی دووەمی سالّی ١٩٦٦یدا، لە یادی سی و پێنج سالّەی دامەزراندنی فێرگەی بالآی پەروەردەی پشت قەوقازی کوردیدا. بەشانازییەوە ئەو ژمارانە بلاویکاتەوە کە ئێمە لەم کورتە وتارەدا هێناومانەوە. رۆژنامەی ناوبراو ناونیشانێکی جوانی بۆ وتارەکەی هەلّبژاردووە: **«ئاسنگەری کادری نیشتیمانیی کورد. بەبۆنەی یادی سی و پێنج سالّەی دامەزراندنی فێرگەی بالآی پەروەردەی پشت قەوقازی کوردییەوە»**.

کەچی کوردی ئازەربایجان، زۆر بە داخەوە، لە بارودۆخێکی تردا دەژین. هەرچەندە ئازەری و کورد دوو هاوسێی دێرین و چاکەیان بەسەر یەکەوە زۆرە. گەورەترین شاعیری ئازەری بەلای خۆیانەوە نیزامی گەنجەوییە (١١٤١-١٢٠٩) کە بە دەستوخەتی پیرۆزی خۆی نووسیویە، **«دایکم لە ئەشرافی کوردانە»**. خوالێخۆشبوو دوکتۆر عەلی گەلاوێژ زوو زوو دەیگوت: **من وای بۆ دەچم نیزامی لە باوکیشەوە کورد بووبێ، چونکە ئەو رۆژگارە زۆر زەحمەت بوو کچە میرزادەیەکی کورد مێرد بە غەیرەیەک بکات.** دەبێ دایکی گەنجەوی لە بنەمالّەیەکی بەناوبانگ بووبێ بۆیەکا وا بەشانازییەوە هەر باسی ئەوی کردووە.

ئەی دەبێ بەرانبەر خەباتی هاوبەشی رۆژانی مەشروتەو مەهابادی خوێنێن و برایەتی نەمران قازی و پێشەوەری چ بلّێین. چارەنووسی هاوبەش و ئایینی ئیسلام و جەوانمەردی و گەلێک دابونەریتی بەرزی رۆژهەلآت ئازەری و کورد لە بەرەیەکدا کۆ دەکەنەوە، ئەو راستییەی نەدەبوو فەرامۆشبکرێ.

پێویستە ئەوەیش بلّێین کە هەستی نەتەوەیی رەوا لە قوولآیی دەروونی زۆر کوردی ئازەربایجانی شوورەویدا لەگەلّ خوێنیاندا قولّپ دەدات. من لێرەدا وەک بەلّگە چەند نموونەو راستییەک دێنمەوە.

بەپێی قسەی بوکشپان لە سالّی ١٩٢٤وە کوردی ئازەربایجان دروشمی خوێندنیان بەزمانی خۆیان بەرزکردۆتەوە. ئەلیاسۆڤیش کە وەک وتمان یەکەم لێپرسراوی کاروباری پەروەردەو فێرکردنی ناوچەی کارگێری کوردستانی ئازەربایجان

بوو، رۆژی حەڤدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣١ لەبەر دەم بەشدارانی کۆبوونەوەیەکی تایبەتی کەمینەکانی کۆماری ئازەربایجاندا بەداخەوە باسی ئەوەی کردووە چۆن ئەو ئەلفباو کتێبی خوێندنی کوردییەی ساڵی ١٩٢٤ پێشنیار کراون خراونەتە پشتگوێ.

**تا ئێمرۆش ژمارەیەکی زۆر لە کوردی ئازەربایجان هەستی نەتەوەیی خۆیان لە دەست نەداوە،** یەکێک لەوانە کە لە نزیکەوە دەیناسم شامیل عەسکەر (عەسکەرۆڤ)ە کە کەم زیرەک و هەڵکەوتووی وەک خۆی هەیە. بڕوانامەی سێ کۆلیج و دوکتۆرایەک وان لە تەنکەی باخەڵی کاکە شامیلدا کە هەمان کات شاعیرێکی ناسراوو لێهاتووە، جاری وا هەیە رۆژنامە هەرە بڵاوەکانی ئازەربایجان لاپەڕەیەکی تەواو بۆ قەسیدەیەکی تەرخاندەکەن.

شامیل عەسکەر ئازەربایجانی نیشتمانی دەپەرستێ، بەڵام لە هەمان کاتدا هەستی کوردایەتیی بێ سنوورە، بێگومان پیاوی دڵسۆزو راستگۆ دەبێ وابێ، چونکە ناشێ هیچ جۆرە دژایەتییەک لە هیچ کات و شوێنێک لە نێوان ئەو دووانەدا هەبێ، هەر لەبەر ئەوەشە کاتێک هەستی ناسکی شامیل وەک شاعیر دێتە جۆش و خرۆش بە دڵ باسی ئازەربایجانی رازاوەو بەکوڵ باسی **«سکاڵای چیاکانەی** کوردستان دەکات.

خوا لێی نەسێنێ تا من لەوێ بووم کاکە شامیل چوار کوڕی هەبوو کە بۆ هەریەکەیان ناوی سەردارێک یا شاعیرێکی بەناوبانگی کوردی هەڵبژاردووە، ئەوی بیرم بێ یەکێک لە کوڕەکانی ناوی هەژارو یەکێکی تریان ناوی جگەرخوێنە. نامەی دوکتۆراکەشی، کە ساڵی ١٩٦٩ تەواوی کرد، لەسەر جگەرخوێنی شاعیرە، شارەزایان دەیانگوت نامەکەی **رۆمانێکی شیعری و دەستکەوتێکی زانستیی گەورەیە لە مەیانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی گەلانی رۆژهەڵاتدا.**

لە ژیاندا کەسم نەدیوە بەرادەی شامیل سەلیم عەسکەر (عەسکەرۆڤ) عەوداڵی هەموو هەواڵێک و مێژووی کوردو کوردستان بێ، ئەوەی هەستی بزواندم و بۆ دووەم جار لەژیاندا ئەو هەستەم خستە قاڵبی نیمچە شیعرێکەوە کە لەسەرەتاکەیدا لە زمان ئەوی خۆشەویستەوە دەڵێم:

پیرەمەگرون، پیرەمەگرون
شاخی بەرزی کوردستانم
باسی کە بتۆم
منیش وەک تۆ کورد
زوبانم(١٠)

زوو زوو بە کاکە شامیلم دەگوت: **خۆزگە هونەرمەند دەبووم و وێنەی ئەو دەموچاوە پڕ هەست و عەزم و زیرەکییەتم دەکردە پەیکەرێک و ناوم لێدەنا کورد.**
دوا جار ئەو کوردە دڵسۆزەم لە پاریس دی، ئەویش یەکێک بوو لەوانەی بانگکرابوو بۆ بەشداریکردن لەو کۆنگرە جیهانییەدا کە بەناوی **«کوردو شار»**ەوە لە سێڤەری نزیک پاریسەوە ئەیلولی ساڵی ١٩٩٦ ساز کرا. دکتۆر شامیل ئێستا لە جاران کوردترە، ئەوە چەند ساڵێکە لە باکۆی پایتەختی ئازەربایجان ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆ بە ناوی **«کورد»**ەوە، بە هەردووک زمانی کوردی و ئازەری بڵاودەکاتەوە(١١).
دووەم کوردی ئازەربایجان کە دەمەوێ لێرەدا باسی بکەم بەهۆی مامۆستا شوکور مستەفاوە تا ڕادەیەک لای خۆمان ناسراوە. ئەمیان حوسێن حەسەن عەلی شانۆڤە کە ساڵی ١٩٦٦ دوکتۆرای لەسەر گۆرانی شاعیر وەرگرت، نامەکەی هێند پەسند بوو پاش ماوەیەکی کەم لە کتێبێکی سەربەخۆدا بە زمانی ئازەری بڵاوکراوەیەوە(١٢).
حوسێن عەلی شانۆڤ کوردیزانێکی چاک و شاعیرێکی دڵ تەڕو هونەرمەندێکی لێهاتووە، هەر ئەوەی شایانە سەرنووسەری ڕۆژنامەیەکی وەک **«ڕێیا تازە»**. یا سەرۆکی دەزگایەکی ڕووناکبیریی وەک **«فێرگەی باڵای پەروەردەی پشت قەوقازی کوردی»** بێ... لە گەلێک ڕووەوە لەگەڵ دوکتۆر شامیل عەسکەردا یەک دەگرنەوە

---

(١٠) وەک بیستم سەرەتای حەفتاکان تۆمەتێکی ناڕەوای درایە پاڵ.
(١١) مامۆستا شوکور مستەفا کردییە عەرەبی و ساڵی ١٩٧٥ چاپیکرد، بڕوانە: **حسن علی شانوف (کورداوغلی)، شعر الشاعر الکردی المعاصر عبدالله گوران، بغداد، ١٩٧٥، ١٩٤ص.**
(١٢) دەربارەی ڕۆژنامەی **«کورد»** بڕوانە وتاری **«ڕۆژنامەیەکی نوێ بەزمانی کوردی»** کە شەرمین مەحمود لە ژمارە ٧٢٩ی **«پاشکۆی عیراق»**دا ڕۆژی بیست و نۆی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٧ بڵاویکردۆتەوە.

هەر بۆ خۆیشیان هاوەڵ و هاوڕێی گیانی بەگیانین و هەڵبەت لە خۆڕا نییە کورد ئۆغلی، واتە کوڕە کوردی کردۆتە نازناوی خۆی.

ئاواتی خوشکە زومرود شەفییڤا بۆ **«مامۆستای خۆشەویستی» «هیوای سەرکەوتنە لە ڕێگەی خزمەتی کوردستاندا»**[۱۳] دوکتۆرە زومرود کە لە هەموو روویەکەوە لە کچە مەهابادییەکی ئەودیو، یا هەولێرییەکی ئەمدیو دەکات، ساڵی ۱۹۶۷ ئینستیتوتی ئەدەب و زمانی سەر بەکۆڕی زانیاری ئازەربایجانی شوورەوی دوکتۆرای داین. **«بابەتی ئەدەبیی شیعری کوردیی هاوچەرخ»** ناونیشانی نامەکەیەتی کە دوکتۆر رەحیمی قازی رابەری بوو، هەرچەندە خوشکە زومرد یەکجار هێمن و کەم دووە، بەڵام بەئاسانی دەتوانی هەست بەکوردایەتیی ناخی دەروونی بکەیت.



لەوڵاتی شوورەوی جگە لە ئەرمەنستان و ئازەربایجان کورد لە گورجستان (**جۆرجیا**) و تورکمانستانیش هەن. بەشی هەرەزۆری کوردی گورجستان بەکۆمەڵ پێکەوە لەشاری تبلیسی پایتەخت دەژین. ئەمانە یا لەدەست جەوروستەمی تورکە عوسمانییەکان هەڵاتوون، یا کوردی ئازەربایجانن و لە ڕێگەی ئەرمەنستانەوە بۆ کارکردن هاتوونەتە ئەوێ، بۆیەکا بەشی زۆریان کرێکارن بەئایین یەزیدین.

کوردی گورجستان تا رادەیەکی زۆر زمان و داب و نەریتی نەتەوەیی وئایینیی خۆیان پاراستووە. بەو ژمارە کەمە دا کە من دیومن وا دەردەکەوێ هەستی نەتەوەیی لەناو کوردی گورجستاندا بەهێز بێ. کەرەم ئەنقۆسی شتێکی ئەوتۆی لەشامیل عەسکەرو کورد ئۆغلی نەگەڕاوەتەوە.

---

(۱۳) دوکتۆرە زومرود بەدەسخەتی خۆی ئەو دەستەواژەیەی لەسەر ئەو دانەی کورتەی نامەی دوکتۆراکەی نووسیوە کە رۆژی پێنجی ئەیلولی ساڵی ۱۹۶۷ بۆ یادگار داوییە بەمن.

چارەنووسی کوردی تورکمانستان یەکێکە لە داستانە پڕ لە کارەساتەکانی مێژووی گەلی کورد. دەوروبەری کۆتایی سەدەی شازدەمین شاعەبباسی یەکەم، کە بە دەستەڵاتترین پادشای سەفەوی بوو، ژمارەیەکی زۆر لەکوردی کوردستانی ئێرانی گواستەوە ناوچەی خۆراسانی بەنیازی بەرهەڵستی هێرشی یەک لەسەر یەکی هۆزە ئۆزبەکییە چاونەترسەکان بۆ سەر سنووری باکووری - ڕۆژهەڵاتی ئێران. بەو کارەی شاعەبباس دەیویست بە تیرێک دوو نیشان بپێکێ، لە لایەکەوە بەشێک لە هۆزە کوردە بەهێزەکان خەریک بکات و لە کوردستانیان دوور بخاتەوە. لە لایەکی تریشەوە بەوان بەربەستی دەستدرێژیی ئۆزبەکەکان بکات کە لە ڕۆژهەڵاتەوە تەواو تەنگیان بە دەوڵەتە بەرفراوانەکەی هەڵچنیبوو.

بەشی زۆری ئەو کوردانەی شا عەبباس رای گواستنە خۆراسان لە هۆزی زەفەرانلوو شەدەلو بوون و ژمارەیان هێندە زۆر بوو مۆرکیان بنیشێتە سەر چەند ناوچەیەکی وەک بۆجنورد و قوچان و دەرگەزە و شیروان، بە رادەیەک شارەزای ئەوتۆ هەن دەڵێن لەو ناوچانە لەوساوە **«کوردستانی خۆراسان»** دروست بوو[١٤].

کوردی خۆراسان، وەک هەموو کوردی کوردستانی ئێران، زۆریان بەدەست جەورو ستەمی فەرمانڕەوایانی سەفەوی و قاجارییەوە چێشت، ئەوەی بووە هۆی بەرپابوونی زنجیرەیەک راپەڕینی خوێناوی لەناویاندا. هەر ئەو باری قورسی ژیانە بەشێک لە کوردی خۆراسانی ناچارکرد دەوروبەری کۆتایی سەدەی نۆزدەمین پەنا بەرنە ناو خاکی تورکمانستانەوە کە لەکۆتایی سەدەی نۆزدەوە کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی رووسیاوە.

کوردی تورکمانستان نیشتەجێی شاری ئەشخەباد (**عیشق ئاباد**) و ناوچەکانی دەوروبەرین. بەپێی سەرچاوە سۆڤیێتییەکان ئەو کوردانە تائێستاش داب و نەریتی باووباپیرانیان پاراستووە. وەک:

أ) مەمێد نەزاروٚڤ باسی دەکات هەر منداڵێک لەناو کوردی تورکمانستاندا لە تەمەنی حەوت تا نۆ ساڵاندا خەتەنە نەکرێ گلاوە، نابێ ئاژەڵ سەربڕێ و بەر

---

(١٤) بەوێنە بڕوانە:
"Izvestia An. Turkmenskay SSR", Ashqabad, No1,1963, P.40.



عارەبی شامۆ لەگەڵ ژنەکەیی و
خوشکێکی ساڵی ١٩٧٢

لەکەسانی تر دەست بۆ زەواد بەرێ و گەلێکیش زەحمەتە کوردەواری ژنی بدەنێ[١٥]. کوردی گورجستان و تورکمانستان لەیەکترو لەکوردی مەڵبەندەکانی تری شوورەوی دابڕاون، بەڵام بەشێکی زۆر لە کوردی ئازەربایجان و ئەرمەنستان هاوسێن و پێکەوە لکاون، بە وێنە تەنها سنووری کارگێڕی کوردی ناوچەی کەڵبەجەڕی ئازەربایجان و کوردی ناوچەی بەسارگێچاری ئەرمەنستان لێک جیا دەکاتەوە، گۆمی سیڤانیش ئەمان لە کوردی ناوچەی ئەلەگەز **(ئالەگوز)** جیادەکاتەوە.

لە ناوچە کوردەوارییەکانی دەورووپشتی یەرێڤانی پایتەخت و ئێچمادزینیشەوە زنجیرە شاخی ئارارات و لوتکەی بەرزی ئاگری داغی ناو خاکی تورکیا زۆر بەئاسانی بەچاو دەبینرێن. لەو لاشەوە کوردی زەنگەلانی ناوچەی قوباتلی زۆر لەو ناوچانەی ئێرانەوە دوورنین کە شۆرە سواری شوکاکی و جەلالی بە درێژایی

(١٥) أ. لەمەمێد نەزارۆڤ، داب و نەریتی منداڵ بوون لە ناو کوردی تورکمانیادا، بەزمانی، رووسی، گۆڤاری **«هەواڵەکانی کۆڕی زانیاری تورکمانستانی شوورەوی»**، ئەشخەباد، ژمارە دوو، ساڵی ١٩٦٤، ل ٩٣.

مێژووگاڵەیان تێدا کردووە، **کەساڵی ١٩٧٣ لەگەڵ مام هەژاری شاعیردا بە ناو کۆڕی زانیاری کوردەوە چووینە ئەڵەگەز دەتگوت چووینەتە پردێ یا مەخمور، یا بانەو بۆکان، لەژیاناندا کەسمان وا گەرم ، وەک براو هاوپشت پێشوازیان لێ نەکراوە.**

دیارە هەر ئەو تێکەڵی و نزیکییە وایان لە کوردناسی گەورە پرۆفیسۆر م.س. لازەریێف کردووە لەڕووی ئەتنۆگرافیەوە بە بەکارهێنانی زاراوەی کوردی ئەرمینیە و کوردی ئازەربایجان قایل نەبێ، چونکە شتێکی ئەوتۆ نییە لێکیان جیا بکاتەوە(١٦).

بەر لەوەی کۆتایی بەم کورتە وتارە بێنین پێویستە ئەوەیش بڵێین کە لەگەڵ جێگیربوونی **پێریسترۆیکەی میخائیل گۆرباچۆڤدا ناوی کوردی شوورەویش کەوتە سەر زاران و لاپەڕەی گۆڤارو رۆژنامەکانی جیهان، هەروەها جاروبارێش دەنگی کوردی ئەو وڵاتەش دەبیسترێ.** بەپێی ئەو قسانەی هارڤی مۆریس لەزمان پرۆفیسۆر نادر نادرۆڤەوە دەیانگێڕێتەوە لەسەرژمێرێکی ساڵی ١٩٨٩ دا **ژمارەی ئەو کەسانەی لە نۆ کۆماری شوورەوی خۆیان بەکورد نووسیوە گەیشتۆتە نزیکەی ملیۆن و نیوێک** ، هارڤی مۆریس لە پاریس دیدەنیی پرۆفیسۆری کورد نەژاد نادر نادرۆڤی کردووەو وەڵامی پرسیارەکانی لەڕێگەی ئاژانسی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بڵاوکردۆتەوە. **«الشرق الاوسط»** کە لەیەک کاتدا لە طهران و ریاض و جەددە و داربیضاء وقاهیرەو مارسێلیاو پاریس و لەندەن نیویۆرک چاپ دەبێ یەکێکە لەو رۆژنامە بڵاوانەی ئەو دیدەنییەی چاپکردووە(١٧).

هەمان کات پرۆفیسۆر نادر نادرۆڤ باسی ئەوەی کردووە چۆن ساڵی ١٩٣٢ لەگەڵ دایکێکی بێوەژن و هەشت برای هەتیویدا ناچار کراون لە ئەرمەنستانەوە بچنە کازاخستان، ئەو کارەی بە بەشێک لەسیاسەتی نەتەوەیی نالەباری ستالین لە قەڵەم داوە کە ، وەک دەڵێ، دەیویست کوردو کەمینەکانی وڵات بەزۆری

(١٦) بڕوانە ئەو لێکۆڵینەوەیەی لازەریێف دەربارەی کتێبی **«کوردەکانی پشت قەوقاز»**ی ئاریستۆڤا لەژمارە دووی ساڵی ١٩٦٧ی گۆڤاری **« ئەتنۆگرافیای شوورەوی»**دا بەزمانی رووسی بڵاوی کردۆتەوە (ل١٨٣-١٨٥).

(١٧) بڕوانە: **«الشرق الأوسط»**، لندن، ١٧ تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٩.

زۆردارەکی پەرش و بلاویکاتەوە، **بەلای ئەوەوە کورد کەمینەیەکی لەیادکراوی ولآتی شـووڕەوی بوون تاوەکـو گـۆرباچۆڤ بانگی پێـریسـترۆیکەی دا.** وا دیارە لەژێر سایەی پێریسترۆیکەدا کوردی شووڕەویش بۆ خۆیان کەوتوونەتە کارو ژمارەیەک بنکەی رووناکبیرییان لە مۆسکۆی پایتەخت و چەند شارێکی تر دامەزراندووە و ئەیلولی ئیمسـاڵ یەکەم کۆنگرەیان بۆ باسی ژیانی نەتەوەییـان لە مۆسکۆ سـاز کـردووە.شایانی باسە کـوردی شـووڕەوی لەکـاتی هەراویگرە بەرفـراوانەکـەی ئەم دواییـەی نێـوان ئەرمـەن و ئازەریدا بێ لایەن بوون، بەلام لەگـەڵ ئەوەش ئینجا پریشـکی ئەو دوویەرەکـیـیـە ئەوانیـشی گـرتۆتەوە، چونکە ئەو هەرایە، وەک ئاشکرایە، ئەرمـەنی ناگـۆرنەی قـەرەباخ نایانەوە کـە لەگـەڵ کـوردا لەناو خـاکی ئازەربایجـانی شووڕەویدا هاوسێن. وا دیارە بەشێک لەکـوردە مـوسـوڵمـانەکـانی ئەرمەنسـتـان [18] ناچار بوون هەڵبێنە ناو خاکی ئازەربایجانەوە، پرۆفیسۆر نادر نادرۆڤ ژمارەی ئەو کوردە هەڵاتووانە بە هەژدە هەزار کەس لەقەڵەم دەدات.

بریا دوکـتـۆر رەحـیـمی قـازی وەک شـارەزایەکی ئاگـادارو لێـهـاتـوو هەمـوو ئەم لایەنانەی باسـەکەی بە وردی بۆشی دەکـردینەوە، جگە لە پێـوەندیی پێـریسـترۆیـکە بەخودی مەسـەلەکەوە وەک مـەسـەلەیەکی نێـودەوڵەتی کە وای بۆ دەچم مەبەستی سـەرەکـیی دوکـتـۆری برای بێ، دیارە لەم بوارەدا مـەودای قـسـەکـردن بۆ ئەو زۆرترە. وڵاتی شـووڕەوی دەمـێـکە بۆتە هێـزێکی دەوڵەتی کـاریگەر بۆ سـەر هەمـوو ئەو مـەسـەلانەی لە جـیـهـاندا روو دەدەن، چ جـای کـێـشـەو بێنەوبەرەکـانی رۆژهەڵاتی ناوەراست، **بیستووماته کاتی خۆی تەنها فەرەنسەیی و ئێرانییەکـان نەبوون کە پشتی کەمالییەکانیان گرت بۆ دامرکاندنەوەی راپەرینی نەتەوەیی ئاگری داغ کە سـاڵی ١٩٣٠ بە رابەری خۆیبوون بەرپا بوو، بەڵکو، وەک دەڵێن، شـووڕەویش، بەداخـەوە، رێگەی داوەتە هێـزی چەکـداری تورکـیـا لەپشـتـەوە، لە رێگەی ئەرمەنستانەوە هێرش بەرنە سەر شۆرشگێرانی کورد لە ئارارات و تەنانەت بەناو ناوی فۆرەشیلۆڤیش لەم مەسەلەیەدا دێ کە دوور نییە وا بێ چونکە ئەو رۆژگارە پێـوەندی نێـوان شووڕەوی و کـەمالیـیـەکـان زۆر باش بوو، جگە لەوەی سـەرجـەمی**

---

(١٨) بەشی هەرە زۆری کوردی ئەرمەنستان بەئاپین یەزیدین.

**راپەرینە کوردەکانی ئەوسا بەلای شوورەوییەکانەوە کۆنەپەرست و دەسکردی ئینگلیز بوون.**

هەڵوێستی شوورەوی تەواو پێچەوانەی ئەو هەڵوێستە بوو بەرانبەر کۆماری مەهاباد کە زۆری بۆ کرد ، هەمان کات مەسەلەی کەوتنی مەهاباد پێویستی بە هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی قووڵە، **چونکە ناحەزانی شوورەوی پێم وایە لەخۆڕا دەیانەوێ ئۆباڵی ئەو کەوتنە بخەنە ئەستۆی ئەوەوە.**

هەڵبەت دوکتۆر رەحیمی قازی وەک ئامۆزای پێشەوا وەک یەکێک لەو پەنجا قوتابییەی رابەرانی مەهاباد بۆ خوێندن ناردیاننە باکۆو وەک مرۆڤێکی دڵسۆزو وەک پسپۆری مێژوو لەبارترین کەسە بۆ توێژینەوەی ئەو باسە وردو گرنگانە، تایبەت دوای ئەوەش کە گەیشتن بە بەڵگە نهێنیە تایبەتییەکانی دەزگاکانی شوورەوی زۆر لە جاران ئاسانتر بووە، هەر چۆن بێ لە قووڵایی دڵەوە سەرکەوتنی بۆ دەخوازین.

حەز دەکەم لەدوا وشەی ئەم کورتە وتارەدا بڵێم ئەم قسانەی من لێرەدا کردوومن لە مناڵدانی پێریستۆریکەوە نەهاتوونەتە دەر، **بەڵکو دەوروبەری سی ساڵ لەمەوبەر، دوای ئەوەی ساڵی ١٩٦١ لەگەڵ دوکتۆر رەحیمی قازیی خۆیدا چوومە ناوچە کوردەوارییەکانی ئازەربایجانی شوورەوی، بەهەستێکی خاوێن و دڵسۆزەوە بەشی زۆریم کردە وتارێک و ناردم بۆکاک ئەحمەد زرنگی سەرنووسەری رۆژنامەی «ژین»، لەبەر هەر هۆیەک بێ، لێرە یا لەوێ، وتارەکەم نەگەیشتە جێگەی خۆی، بەڵام لەسەر ئەو «کفرە» گەورەیەم کاتی خۆی سزایەک درام دەرووغی هەڵتەکاند، بەوەی باشە دوکتۆر عیزەددینی هاورێم بیری تیژەو ئەوەی لەم بارەیەوە روویدا چاکی بیرە، لەم رۆژانەدا لە هەولێری ئازیز پێکەوە یادمان دەکردەوە.**



کۆبونەوەیەکی کوردەکانی ئەرمینیا – سالی ۱۹۲۷

**دوو تێبینی :**

**یەکەم:** کتێبە بەنرخەکەی بوکشپان **«کوردەکانی ئازەربایجان»** سالی ۱۹۳۲ لە باکۆ دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە، کە ئەوەیش بۆ خۆی نیشانەی بایەخی باسەکەیەتی، ئەگینا دوو هەزار دانە لەبەرهەمێکی لەو بابەتە بۆ رۆژگاری خۆی ژمارەیەکی زۆر بوو، ئەو کتێبەی دوکتۆر جەلیلی جەلیل کە لە خالی دووەمدا باسی دەکەم هەرچەندە پەنجاوپێنج سال دوای کتێبەکەی بوکشپان بلاوکراوەتەوە، کەچی تەنها دوو صەد دانەی لێ چاپکراوە، من بۆ خۆم زۆر بە زەحمەت دانەیەکم لەو کتێبەی بوکشبان دەستکەوت، وادیارە کاتی خۆی قەدەغەکراوە، چونکە بەشی زۆری بابەتەکانی لەگەل سیاسەتی شۆڤێنی و توندرەوی باقرۆڤی سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجانی رۆژگاری ستالیندا نەدەگونجا، تەنانەت ئەمەی لای خوارەوە دەقاودەق ناونیشانی بەشی سێیەمی ئەو کتێبەیە:

**«پانتایی و سنووری کوردستانی ئازەربایجان» (ل۱۰).**

ناونیشانی دوا بەشیشی بەم جۆرەیە:

**«کێشەی کورد لە ئازەربایجان» (ل٨٢).**

**دووەم:** کاتێک بەپرۆڤەکانی ئەم وتارەمدا دەچوومەوە ناچار بووم بگەڕێمەوە بۆ سەر بەشێک لەو سەرچاوانەی کاتی خۆی کەڵکم لێیان وەرگرتووە بۆ نووسینی. لەناو ئەو سەرچاوانەدا کتێبی **«کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێتی بیبلۆگرافیا ١٩٢٠-١٩٨٠»** سەرنجی راکێشام کە ساڵی ١٩٨٧ دوکتۆر جەلیلی جەلیل ئامادەی کردووە[١٩]. ناوەرۆکی ئەم کتێبەش بۆی هەیە چەند لایەنێکی باسەکانی ناو ئەم وتارە روونتر بکاتەوە، تایبەت ئەو لایەنانەی پێوەندییان بەکوردی ئەرمەنستانەوە هەیە، بۆیەکا، وەک سەرەتا، پوختەیەک دەربارەی ناوەرۆکی دەخەمە بەرچاو.

ئەوکتێبە بریتییە لە٥٣٦ لاپەڕەی بە بارست گەورەو **«کۆڕی زانیاری ئەرمەنستانی شوورەوی»** بڵاوی کردۆتەوەو بەپێشەکییەکی و رووسی پێشگوتنێکی کوردی دەست پێدەکات(ل ٥-١١)، ئینجا ناوی ٥١٢٥ سەرچاوەی هەمەجۆر لە کتێب و لێکۆڵینەوەو وتارو کورتە وتارو هەڵسەنگاندنی بۆ تۆمار کردووین کە بە کوردی و ئەرمەنی و رووسی و ئازەری لەماوەی شەست ساڵدا، لە ساڵی ١٩٢٠ وە تا ساڵی ١٩٨٠، لە وڵاتی شوورەوی دەربارەی کورد بەگشتی و کوردی ئەرمەنستان بە تایبەتی بڵاوکراونەتەوەو بەشێکی زۆریان لەیەرێڤان چاپکراون و ١٠٨٢ یان بە زمانی ئەرمەنین.

هەمان کات صەدو چلوهەشت لەو سەرچاوانە دەربارەی مێژووی کوردو کوردستانن(ل١٥-٢٩). شایانی باسە چلوسێ لەو سەرچاوانە بریتییە لە کتێب و وتار کە سەرجەمیان بۆ رۆڵی کورد لە لەشکری سووردا لە ساڵانی جەنگی دوومی جیهاندا تەرخان کراون، ئەوەیش بۆ خۆی بەڵگەی دڵسۆزی کوردە کە دەبوو نەخرێتە پشت گوێ. تەنها ئەو کتێبەیان کە دوکتۆر خالید موورادەڤیچ چەتۆیێڤ **(واتا خالیدی موورادی چەتۆ)**ی سەرۆکی بەشی کوردیی ئینستیتوتی رۆژهەڵاتناسی ئەرمەنستانی شوورەوی ساڵی ١٩٧٠ لە یەرێڤان بەناونیشانی **«بەشداریی کوردی**

---

(19) "Kurdi Sovetskay Armenii. Bibliographia 1920-1980", Sostavil Jalile, Erevan, 1987.



**لە چەپەوە دانیشتن: عەرەبی شەمۆ، هەژار موکریانی، جەمیلە جەلیل، د. کەمال مەزهەر**
**پ. شاکری خدۆ، حاجی جوندی، جاسمی جەلیل، خالیدی چەتۆییڤ**

**یەکیەتی شوورەوی لەجەنگی نیشتمانیی**[٢٠] **گەورەدا ١٩٤١-١٩٤٥»** وەچاپی کردووە بریتییە لە ١٧١ لاپەڕە کە باسی قارەمانێتی ژمارەیەکی زۆر لە سەربازو ئەفسەرە کوردەکانی شوورەوی لەو قۆناغە سەختەدا دەکەن[٢١].

بەشەکانی تر کتێبەکەی دوکتور جەلیلی جەلیل بۆ ئەتنۆگرافیا و زمان و

---

(٢٠) ئەو قۆناغەی جەنگی دووەمی جیهان کە بە هێرشی ئەڵمانیای هیتلەری لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١ دا بۆ سەر یەکیەتی سۆڤیەت دەستی پێکرد، لە مێژوو نووسیی شوورەویدا ناونراوە **«جەنگی نیشتمانی گەورە»**.

(21) Kh. M. Chatoeev, Uchastie Kurdov Sovetskovo Soiozav Velikay Otechestvennay Voene 1941-1945, Erevan, 1970.

زمانەوانی و ئەدەب و هونەرو فۆلکلۆر و زانست و پەروەردەو ژیانی سیاسی و کۆمەلآیەتی کوردەواری و بابەتی تر تەرخان کراون. دوو بابەتی ناو ئەوکتێبە بە تایبەتی سەرنج رادەکێشن، یەکەمیان ئەو بەشەیە کە بۆ باسی **«یەکەم کۆنفرانسی کوردناسی»** تەرخان کراوە، ئەو کۆنفرانسە تەمموزی ساڵی ١٩٣٤ لە یەریڤان ساز کراوە. لەو بەشەی کتیبەکەدا ناوی ٢٦ وتاری تێدا تۆمار کراوە کە بەشێکیان لە نووسینی کوردناسی بەناوبانگ ڤیلچێڤسکی و نووسەری کوردی ناسراو شامیلۆڤن( ل٣٩٥-٣٩٨).

بابەتی دوومیان دەربارەی **«ئافرەتی کورد»**ە،ئەمیان ناوی ٦٣ وتاری تێدا تۆمار کراوە (٤٣٩-٤٤٥).

بەو جۆرە کتێبی **«کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێتی. بیبلیۆگرافیا ١٩٢٠-١٩٨٠»** سەرچاوەیەکی بیبلیۆگرافی بایەخدارە بۆ پسپۆرو مامۆستاو شاگردانی خوێندنی بالآو نووسەرانی کوردو سەرجەمی کوردناسان.

# رۆژنامەی «زوراء» لە رەواندز

وەک دەزانین **«زوراء»** یەکەم رۆژنامەیە لە مێژووی عیراقدا. مەدحەت پاشا بەو چاپخانەیەی لە پاریسەوە هێنابووی رۆژی پێنجەمی (ربیع الاول)ی ساڵی ١٢٨٦ی کۆچی، پازدەهەمی حوزەیرانی ساڵی (١٨٦٩)ی عیسایی یەکەم ژمارەی **«زوراء»**ی چاپکرد. **«زوراء»** رۆژنامەیەکی هەفتەیی عەرەبی و تورکی بوو، بەڵام جاری وا هەیە بەشە تورکییەکەی دوو سێ هێندەی بەشە عەرەبییەکەیەتی، لەلای سەرەوەی **«زوراء»** نووسرابوو:

**«ئەم غەزەتەیە هەفتەی جارێک، رۆژی سێ شەممان چاپ دەبێ. هەموو دەنگ و باس و بەسەرهاتێکی ناوخۆ و هەندەرانی تێدایە».**

**«زوراء»** ماوەیەک هەفتەی دووجار دەردەچوو. تا داگیرکردنی بەغدا رۆژی یازدەی مارتی ساڵی ١٩١٧ لەلایەن ئینگلیزەوە رۆژنامەی **«زوراء»** تا رادەیەکی زۆر بەرێکوپێکی دەردەچوو، تا وەستانی هەمووی بەسەریەکەوە ٢٦٠٦ ژمارەی لێ چاپ بوو. کەوابێ **«زوراء»** دەوروبەری چل و هەشت ساڵ ژیاو بەو جۆرە بۆتە بەتەمەنترین رۆژنامەی هەموو عیراق تا ئیمڕۆکە.

هەرچەندە **«زوراء»** سەرچاوەیەکی مێژوویی رەسەن و لاپەڕەیەکی بایەخداری رۆژنامەنووسیی عیراقە، بەڵام تاوەکو ئێستا زۆر کەمی لێکۆڵراوەتەوە. لەسەر لاپەڕەکانی «**زوراء**» شتی سەیرو چاوەڕواننەکراو بۆ رۆژگاری خۆی بڵاودەکرایەوە،

---

(*) لە ژمارە (١١٧٢)ی رێکەوتی سیازدەی نیسانی ساڵی ١٩٩٠ی رۆژنامەی **«هاوکاری»** بڵاوکراوەتەوە. جارێکی دیکە هەمان بابەت بەناونیشانی **«چەند زانیارییەک دەربارەی رۆژنامەی «الزوراء» و دەنگدانەوەی ئەو رۆژنامەیە لە شاری رەواندز»** تێروتەسەلتر لەوەی **«هاوکاری»** لە ژمارە (١٤٦)ی ساڵی ٢٠٠٠ی گۆڤاری **«رۆشنبیری نوێ»**دا لەگەڵ (ملخص البحث)ێکی درێژی بە زمانی عەرەبی بڵاوکراوەتەوە.

تایبەت لە ساڵانی فەرمانڕەوایی مەدحەت پاشادا (١٨٦٩-١٨٧٢) کە بۆ خۆی پیاوێکی نوێخوازو دیموکراسی و دەستووریەروەر بوو.

بە دووری نابینم سەیر بێتە بەرچاو ئەگەر بڵێم **«زوراء»** باسی شۆڕشی فەرەنسیی ساڵی ١٧٨٩ و **«کۆمۆنەی پاریس»ی** ساڵی ١٨٧٠و ڕووداوەکانی و چەند مانگرتنێکی کرێکارانی ئەوروپای کردووە، دەربارەی ئەو مانگرتنانە نووسیویە دەڵێت کرێکارە مانگرتووەکان **«دەیانویست پارەی ڕۆژانەیان بۆ بەرز بکرێتەوە»**.

سەیرتر ئەوەیە کە **«زوراء»** باسی **«مافی مرۆڤ»ی** لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بە شێوازێکی ڕازاوە کردووەو جاروباریش توخنی باسی وەک **«ڕژێمی کۆماری»** و دەسەڵاتی زۆردارو زۆرداری و تەنانەت باسی سۆشیالیزمیشی کردووە.

**«زوراء»**، تایبەت لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی مەدحەت پاشادا، چەند جارێک بە ڕێکوپێکی باسی ئازادیی بیروباوەڕی کردووەو هەمیشە بەریتانیاو سویسرەی وەک نموونە دەهێنانەوەو باسی ئەوەی دەکرد چۆن لەو دوو وڵاتەدا مافی ڕەخنەگرتن لە کاربەدەستان ئاواڵەیە.

هەر لەو بوارەشدا **«زوراء»** بایەخی تایبەتیی دەدا بە ئازادی ڕۆژنامەنووسیی کە، وەک دەیگوت، بۆتە هۆی ئەوەی لە شارێکی وەک لەندەندا ١٥٩ ڕۆژنامەو لە ئیسکۆتلەندا ١١٠ ڕۆژنامەو لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا نزیکەی هەزار ڕۆژنامە لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی نۆزدەمیندا دەرچێت **(بڕوانە ژمارەی ڕۆژی هەشتی کانونی یەکەمی ساڵی ١٨٧٤)**.

لەوەیش زیاتر، چەند جارێک **«زوراء»** ئاوڕی لە کەڵە نووسەری وەک فیکتۆر هۆگۆ و تۆلستۆی و ئەلیکسەندەر دۆماو ژمارەیەک ناوداری تری بواری ئەدەب داوەتەوە. بە وێنە لە یەکێک لە ژمارەکانیدا باسی **«حکمە الشعر»** و**«شعر الحکمە»ی** لای هۆگۆ کردووە.

لە ژمارەیەکی تریدا **«یاسای ڕاکێشان» (قانون الجاذبیة)**ی نیوتنی بە **«گەورەترین موعجیزەی ڕۆژگار داناوە»**.

ئەو جۆرە بابەتانە هەڵبەت بوونە هۆی ئەوەی دەستەی هەڵبژاردەی کۆمەڵ



زوراء

**(النخبة)** روو بکەنە رۆژنامەی **«زوراء»**. خوێنەرێک لە ژمارەی رۆژی یازدەی ئەیلولی ساڵی ١٨٧٢دا نووسیوییە چۆن زۆر بە پەرۆشەوە حەفتانە چاوەڕوانی دەرچوونی ژمارەکانی ئەو رۆژنامەیەیە چونکە، وەک گوتویە، بە نرخێکی هەرزان هەواڵەکانی ئەوپەڕی گێتیمان پێ رادەگەیەنێت و هەر لەبەر ئەوەش **«دانیشتوانی بەغدا بە خوێندنەوەیەوە خەریکن»**. ئەو سامانە زۆرو کەم بەشی کوردیشی پێوەیە، لەوانەیە مێژوونووسان لە رێی ناوەرۆکی ژمارەکانی زەوراوە بگەنە راستی و زانیاریی بایەخدار. وەک بەڵگە ئەم هەواڵەی ناو زەورا خۆی دەربارەی بەشدارانی رۆژنامەکە لە رەواندز دێنینەوە. ژمارە ٧٦٣ی ساڵی نۆیەمی زەورا کە رۆژی حەوتەمی (جمادي الاخره)ی ساڵی ١٢٩٥ی کۆچی، واتە هەشتی حوزەیرانی ساڵی ١٨٧٨ی عیسایی دەرچووە ئەم هەواڵەی بلاوکردۆتەوە:

**«ساڵی رابردوو ژمارەی بەشدارانی رۆژنامەکەمان لە قەزای رەواندز بریتی بوو لە پازدە زات و ماڵ، ئیمساڵیش هەژدە زاتی تر بەشداربوون، واتە ئێستا لەو قەزایە بیست ونۆکەس کڕیاری زەوران»**.

ئەم هەواڵە دانسقەیە بۆی هەیە یاریدەی وەڵامدانەوەی گەلێک پرسیارمان بداتەوە. بۆ شارۆچکەیەکی وەک رەواندز بوونی بیست و نۆ بەشدار لە رۆژنامەیەکدا

کە بەتورکی و زۆرجار بەعەرەبییەکی شەق و پەق چاپکرابێ، بۆ رۆژگاری خۆی ژمارەیەکی زۆرەو وا دەگەیەنێ سەرەتای دروستبوونی توێکڵی دەستەی رووناکبیری نوێی ئەو ناوچەیە دەگەڕێتەوە ناوەندی سەدەی نۆزدەمین. ئەم راستییەش بایەخی خۆی هەیە بۆ لێکدانەوەی چەند لایەنێکی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردایەتیی ئەو مەڵبەندە بەرابەری میری ئەمری رەواندز، میر محەمەدی کوڕی مستەفا بەگی میری سۆران کە لە مێژووداو لەناو خەڵکدا لەبەر ئەوەی چاوی چەپی کوێر بووە جاروبار بە پاشاکوێرە ناودەبرێ.

لەلایەکی ترەوە ئەو هەواڵەی ناو رۆژنامەی **«زوراء»** دەربارەی بەشدارانی رەواندز لەو رۆژنامەیەدا بایەخی خۆی هەیە بۆ لێکدانەوەی مێژووی چالاکیی رۆژنامەنووسی دڵسۆزی کورد خوالێخۆشبوو داماو حوسێن حوزنی موکریانی کە لە ناوەندی بیستەکاندا لەناو هەموو کوردستاندا رەواندزی کردە بنکەی چاپخانە ناوازەکەی کە **«زاری کرمانجی»** و **«روناکی»** و گەلێک بەرهەمی مێژوویی و ئەدەبیی بایەخداری پێ چاپکرد.

لە ژمارەی دووەمیدا، واتە ۲۳ی حوزەیرانی ساڵی ۱۸٦۹ **«زوراء»** دیسان باسی شاری رەواندزی کردووە. لەو ژمارەیەیدا ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە **چۆن مەدحەت پاشا دەستی قایمقامی رەواندزی لەکار کێشاوەتەوە لەسەر ئەوەی بەرتیل خۆر بووەو** بەناوی باجی میرییەوە سەرانەی لە دانیشتوانی ناوچەکە سەندووە.

**ئەم هەواڵەش بایەخی خۆی بۆ مێژوونووس هەیە، چونکە یاریدەی دەدات لە هۆیەکانی نارەزایی و وەڕسبوونی کوردەواری لە دەست عوسمانییەکان باشتر تێبگات. هەڵبەت فەرمانڕەوایەکی دزو ناقۆڵای عوسمانی برینی کوردی دەکوڵاندەوەو دادپەروەری میری رەواندزی دەهێنانەوە یاد کە بەپێی گێڕانەوەی گەڕیدەکانی ئەو رۆژگارە ببووە نموونەی بێ هاوتا** لەناو هەموو عیراقدا کە ئەو ساکە بەدەست بەرەڵلایی دەرەبەگی و دەسدرێژی دزو جەردەو کاربەدەستانەوە دەیناڵاند.

بریا ژمارەیەک لە نووسەرە چالاکەکانمان روویاندەکردە ژمارەکانی رۆژنامەی **«زوراء»** و ئەو زانیارییانەی ناویان بۆ تەتەڵە دەکردین کە پەیوەندییان بەژیانی رووناکبیری و مێژووی کوردەوە هەیە.

بابەتی دووەم*

# کەواکیبی پوختەی ژیان و بیروباوەڕی و پێوەندیی بە کوردەوە

## کورتە باسێکی ژیان و بەرهەمەکانی کەواکیبی:

عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ ئەحمەدی بەهائی کوڕی محەمەد کوڕی مەسعودی کەواکیبییەو زۆرتر هەر بە کەواکیبی یا عەبدولڕەحمانی کەواکیبی ناسراوە. تێکەڵوپێکەڵییەکی زۆر هەیە دەربارەی ساڵی لە دایکبوونی کەواکیبی، بەپێی دکتۆر عەبدولڕەحمانی کوڕەزای خۆی کەواکیبی ساڵی ١٨٥٥ لە دایکبووە. ئەگەر کەواکیبی ڕۆژی بیستوسێی شەوالی ساڵی ١٢٧١ی کۆچی لە دایکبووبێت ئەوساکە ڕۆژی لە دایکبوونی دەبێتە نۆ، یا دەی تەمموزی ساڵی ١٨٥٥[1] نەک دوا ڕۆژانی نیسانی ساڵی ١٨٥٤ وەک توێژەرێکی ژیانی بە هەڵە لێکیداوەتەوە[2].

هەرچۆن بێت کەواکیبی لە شاری حەڵەبی سوریا، لەناو بنەماڵەیەکی زانیارو جاویدا چاوی هەڵهێناوە. تەمەنی منداڵی و خوێندنی سەرەتایی لە حەڵەب و ئەنطاکیا بردەسەر. **هەر زوو قورئانی خەتم کردو لە بواری زانستەکانی ئاییندا خۆی قاڵ کردو بەشی خۆی فێری لایەنە سەرەکییەکانی زانستە نوێکانیش بوو.** وەستابوو لە زمانی عەرەبیدا، بەڵام چاک فێری فارسی و تایبەت تورکیش بوو، هەن دڵنیان لەوەی کە فەرەنسیشی دەزانی و گوایە هەر بە خودی زمانی فەرەنسی خۆی

---

(*) لە گۆڤاری «**ڕۆشنبیری نوێ**»، ژمارە (١٤٤)ی ساڵی ١٩٩٩، لە ل٥-١٠دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) «**الاعمال الكاملة للكواكبي**»، اعداد وتحقيق محمد جمال طحان، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٥، ص١٧.

(٢) نضر علي امين محي الدين الشريف، عبدالرحمن الكواكبي، دراسة سياسية - فكرية، اطروحة دكتوراه غير منشورة، كلية الاداب - جامعة بغداد، ١٩٦٦، ص٤٧-٤٨.

بەرهەمەکانی مۆنتسکیۆی[٣] خوێندۆتەوە[٤]، ئەو باسەی دوایی ئاورێکی تری لێ دەدەینەوە. کەواکیبی وەک شاعیر نەناسراوە، هەرچەندە شیعری تێکهەڵکێشی نووسینەکانی کردووە، تەواو شارەزای ئەدەبی عەرەبی بوو، هەر زوو خەیاڵی دایە شیعرو بە هەزاران بەیتی هەڵبژاردەی کەڵە شاعیرانی عەرەبی لەبەرکردو بەپێی بابەت لای خۆی تۆماری کردن[٥].

کەواکیبی کرمی کتێب بوو، بێ وچان دەیخوێندەوە، عەودالی بەرهەمی زانستی و کۆمەلایەتیی هەمەجۆر بوو، لە هەرەتی لاوییەوە رۆژنامەو رۆژنامەنووسی سەرنجیان راکێشا، خوی دایە خوێندنەوەی رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەستەمولّ و شام. تایبەت ئەوانەیان کە لە بیروت چاپ دەبوون. زۆری نەبرد بۆ خۆی بووە یەکێک لە نووسەرانی رۆژنامەی **«الفرات»** کە دەروازەی بالاّ **(الباب العالي)** لە دیمەشق وەک **«الزوراء»**ی لای خۆمان پەخشی دەکرد.

بیروباوەڕو بۆچوونەکانی کەواکیبی لەوانە نەبوون لەسەر لاپەڕەکانی **«الفرات»**دا جێگەیان ببێتەوە، بۆیەکا پاش ماوەیەک بۆ خۆی دەستی کردە دەرکردنی رۆژنامەی **«الشهباء»**[٦] و ئینجا **«اعتدال»**و دواییش لە قاهیرە بووە یەکێک لە نووسەرە بەناوبانگەکانی **«المؤید»** کە ئەوساکە ئەفغانی و محەمەد عەبدە پێکرا دەریان دەکرد. وێڕای ئەوە کەواکیبی ژمارەیەک وتاری لە رۆژنامەو گۆڤارە عەرەبییە بەناوبانگەکاندا بلاوکردۆتەوە، هی وەک **«الأهرام»** و **«لسان العرب»** و **«المقطم»**.

کەواکیبی پیاوێکی کراوەی بیر فراوان، شەیدای یەکسانی و برایی و دوژمنی باوەکوشتەی زۆرداری و زۆرداران بوو، راستە دلسۆزی ئیسلام بوو، **بەلام**

---

(٣) مۆنتسکیۆ **(شارل لوی دی سکوندا)** نووسەرو فەیلەسوفێکی فەرەنسەیی و جیهانی بەناوبانگە. سالی ١٦٦١ لە دایک بووەو سالی ١٧٥٥ کۆچی دوایی کردووە. **«گیانی یاسا»** و **«نامە فارسیەکان»** لە نووسینە سەرەکییەکانی مۆنتسکیۆن.

(٤) نوربير تابييرو، الكواكبي - المفكر الثائر، ترجمة علي سلامة، منشورات دار الاداب، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٨١، ص٦٤.

(٥) قدري قلعجي، السابقون، بيروت، دار العلم للملايين، ١٩٥٤، ص٧.

(٦) **«شهباء»** یەکێکە لە ناوەکانی شاری حەلەب کە کەواکیبی عاشقی بوو و وەچەند وتارێکی دەربارەی نووسیوە، دەشگوترێت **«حلب الشهباء»**.



**کەواکبی**

**موسڵمانێکی لە سەرەخۆی بێ ترۆفیز بوو، قیزی لەو توندڕەوە گەوجانە دەهاتەوە کە زیانیان بۆ ئیسلام دەقاتی قازانجیانە..** ئەوانەی لە نزیکەوە دەیانناسی، لەسەروو هەمووشیانەوە محەمەد کورد عەلی، دەڵێن هەمووان، چ موسڵمان و چ گاورو چ جو، وەک یەک دڵیان بە کۆڕی کەواکیبی دەکرایەوە[٧]. کەوابێ کەواکیبی زۆر پێش قۆناغ و رۆژگاری خۆی کەوتبوو، **نا بەڵکو پێش گەلێک لە گەوجانی کۆتایی سەدەی بیستەمینیش کەوتبوو، ئەوانەی زۆر بە هاسانی دەستیان دەچێتە گیانی لێهاتووان و دڵسۆزان و لەسەر هیچ بەلێشاو خوێنی یەکتر دەرێژن.**

به هەمان شێواز کەواکیبی لایەنگری هەژاران و لێ قەوماوان بوو، لە حەڵەب کە بە کاری پارێزەرییەوە خەریکبوو ببووە پارێزەری زۆرلێکراوو بێ دەرامەت و نەداران، ئەوانەی نازناوی **«باوکی کەساسان»**یان بۆیێ داتاشیبوو[٨]، هەزارو یەک کاری بۆ ئەو جۆرە داماوانە ڕادەپەڕاند بێ ئەوەی پولێکیان لێ وەربگرێت، **سەرباری**

---

(٧) **«الاعمال الكاملة للكواكبي»**، ص٢٢.

(٨) جورج انطونيوس، يقظة العرب. تأريخ حركة العرب القومية، ترجمة الدكتور ناصرالدين الاسد والدكتور احسان عباس، الطبعة الرابعة، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٧٤، ص١٦٩-١٧٠.

**ئەوەی هەمیشە دڵنەوایی دەکردن و هانی دەدان باوەڕیان بە خۆیان و بە دوارۆژ بێت.**

جگە لە وتارەکانی، کەواکیبی دوو شاکاری بەناوبانگی هەیە، یەکەمیان ناوی **«أم القرى»** (دایکی شاران یا شاری شاران)ە[9] کە وا دیارە لە حەڵەب کۆتایی نەوەتەکانی سەدەی ڕابوردوو نووسیوییەو بۆ یەکەم جار ڕۆژی حەڤدەی مارتی ساڵی ١٨٩٩ پوختەیەکی لە **«المؤيد»**ی میسریدا بە ناوێکی ونەوە[10] بڵاوکردۆتەوە چونکە ناوەڕۆکی ئەو وتارەی لە ژێر سایەی عوسمانێکاندا بۆ بڵاوکردنەوە نەدەشیا. کەوابێ کەواکیبی لە هەمان ڕۆژگاردا وەک میقداد مەدحەت بەدرخانی خۆمان پەنای بردە بەر شاری قاهیرە بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی، چونکە ئەوساکە قاهیرە بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم شارێکی دوورە دەست بوو. تا ئێستا نزیکەی بیست جاران **«دایکی شاران»** چاپکراوەتەوەو بە دەیان شارەزای موسڵمان و ڕۆژهەڵاتناس بەرز هەڵیانسەنگاندووە.

**«دایکی شاران»** (أم القرى) بریتییە لە لێدوانێکی فیکری دەربارەی باری ناهەمواری ئەوسای جیهانی موسڵمانان و ئەو ڕێبازەی دەتوانێت لە کێشە دژوارەکانی قوتاری بکات و سەرفرازی بۆ بهێنێت. کەواکیبی بە خەیاڵ[11] لە ڕۆژانی حەجدا کۆنگرەیەک لە شاری مەککە بۆ بیستودوو زانای ئایینی ساز دەکات کە هەر یەکەیان گوایە نوێنەری یەکێکن لە وڵات و شارو نەتەوە موسڵمانەکان و بە خۆیەوە دەبنە بیستوسێ ئەندام و ناوی خۆی بە **«السيد الفراتي»** دەبات و گوایە ئەو سکرتێری کۆنگرەکەیەو نوێنەری شاری مەککەش سەرۆکێتی. ئەو نوێنەرانە دوازدە جاران کۆدەبنەوەو زۆر بە وردی لە باری جیهانی ئیسلام دەدوێن و کۆن و ئەوساو دوارۆژی هەڵدەسەنگێنن و لە کۆتاییدا بڕیار دەدەن کۆمەڵێکی تایبەتی بۆ جێ بەجێ کردنی بڕیارەکانی کۆنگرەو ئەرکەکانی قۆناغ دابمەزرێنن. دوای ئەوە هەر بیستوسێ

---

(٩) **«أم القرى»** بە شاری مەککە دەگوترێت و لە قورئانی پیرۆزیشدا بەو جۆرە ناوی مەککە هاتووە. کەواکیبی بە واتای شاری شاران بەکاری دەهێنا.

(١٠) بە ناوی ع. حەڵەبییەوە بڵاویکردۆتەوە. «مەبەستی دکتۆر لە سەدەی رابردوو.. لێرەدا سەدەی نۆزدەمینە - عەبدوڵلا زەنگەنە».

(١١) ژمارەیەک لە ڕۆژهەڵاتناسان بە هەڵە وای بۆ چوون کە گوایە ئەو کۆنگرەیە لە راستیدا بەستراوە. ئەوەی بایەخێکی تایبەتی دەداتە شێوازی نووسینەکەی کەواکیبی.



**لوتسکی**
**١٩٠٦ - ١٩٦٢**

ئەندامەکە بۆ جاری سێزدەمین کۆدەبنەوە بۆ ماڵئاوایی.

شاکاری دووەمی کەواکیبی ناوی «**طبائع الاستبداد**»ە [١٢]، واتا سروشت یا سروشتەکانی زۆرداری. هەن پێیان وایە «**طبائع الاستبداد**» نەک «**أم القرى**» شایانی ئەوەیە پلەی یەکەمێتی بدرێتێ لەناو سەرجەمی بەرهەمەکانی کەواکیبیدا. ناوی کتێبەکە یەکسەر ناوەرۆکی دەخاتە ڕوو، بەڵام گرنگ ئەوەیە کەس لە جیهانی ئیسلامدا بەر لە کەواکیبی و وەک ئەو باسی ڕژێمی سیاسیی تاکڕەوی نەکردووە، ئەو لەم بووارەدا بۆڕی ئەفغانی و محەمەد عەبدەی داوە، چونکە بە پێچەوانەی ئەوانەوە بڕوای بە هیچ جۆرە زۆردارێک نەبوو، ئەگەرچی ئەو زۆردارە عادیل و ڕووناکبیریش بێت.

کەواکیبی وەک زانایەکی قووڵ لایەنە جیاوازەکانی بابەتی زۆردارو زۆرداریی هەڵسەنگاندووەو لە گشت ئەو فاکتەرانە کۆڵیوەتەوە کە بۆیان هەیە زۆردارو زۆرداری دروست بکەن. کتێبی «**سروشتەکانی زۆرداری**» یەکەی بریتییە لە نۆ بەش

---

(١٢) ناوی تەواوی کتێبەکە بەم جۆرەیە: «**طبائع الاستبداد ومصارع الاستعباد**».

کە ئەمانە ناونیشانەکانیانن - **زۆرداری چییە، زۆرداری و ئایین، زۆرداری و زانست، زۆرداری و ناووشۆرەت، زۆرداری و سامان، زۆرداری و ڕەوشت، زۆرداری و پێشکەوتن، زۆرداری و ڤوتاربوون لە دەستی**[١٣].

ئەم جۆرە لێکدانەوەیە نزیککەوتنەوەیەکی تەواوە لە لێکدانەوە ئەوروپاییەکان کە واپێ دەچێت کاریان کردبێتە سەر بیروباوەڕو بۆچوونەکانی کەواکیبی. لەم بووارەدا، وەک لە سەرەتادا گوتمان، رۆژهەلاتناسی فەرەنسی نۆربێر تابییرۆ لەوە دڵنیایە کە کەواکیبی بەرهەمەکانی مۆنتسکیۆی[١٤] خوێندۆتەوەو لە راستیشدا هەست بە شەقڵی بۆچوونەکانی ئەو زانایە لە بەرهەمەکانی کەواکیبیدا دەکرێت. ئەویان بەر لەم بە نزیکەی دوو سەدە لەو بەرهەمەیدا کە ناوی **«نامە فارسییەکان»** بە توندی رەخنەی لە کۆمەڵگای هاوچەرخی خۆی گرتووەو لە **«گیانی یاسا»** (روح القوانين)دا کە بەناوبانگترین بەرهەمییە، بێ سنــــوور دژی فەرمانـــڕەوای زۆردارو تاکڕەو دەدوێ و بە گەرمی داوای جیاکردنەوەی راستەقینەی دەسەلاتەکان و ژیانی پەرلەمانی دیموکراسی دەکات. مۆنتسکیۆ پێی وابوو ئەندامی پەرلەمان پێویستە نوێنەری سەرجەمی نەتەوە بێت نەک بەشێکی، رژێمی نموونەیی بەلایەوە رژێمی ئەوسای ئینگیلتەرە بوو. بۆ چوونەکانی مۆنتسکیۆ تەواو کاریان کردە سەر رابەرانی چ شۆڕشی فەرەنسی، چ شۆڕشی ئەمەریکای باکوور کە بووە هۆی دامەزراندنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. دوور نییە کەواکیبی کەڵکی لە نووسینەکانی رۆسۆش[١٥] وەرگرتبێ، تایبەت لەو شوێنانەدا کە باسی چاوچنۆکی زۆرداران دەکات. شایانی باسە کەواکیبی بۆ خۆی لە پێشەکی **«سروشتەکانی زۆرداری»**دا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەوروپایی و ئەمەریکاییەکان بایەخی زۆریان بە هونەری سیاسەت و فەرمانڕەوایی داوەو زۆریان دەربارەی نووسیوە[١٦]. هەر لەو

---

(١٣) بۆ دەقی ناوەرۆکی **«سروشتەکانی زۆرداری»** بڕوانە: **«الاعمال الكاملة للكواكبي»**، ص٤٣٠-٥٣٤.

(١٤) بڕوانە پەراوێزی ژمارە٣.

(١٥) جان جاک رۆسۆ فەیلەسوفێکی فەرەنسی و جیهانی ناسراوە، ساڵی ١٧١٢ لە شاری جنێڤ لە دایکبووە، ساڵی ١٧٧٨ لە پاریس کۆچ دوایی کردووە، بەپێی رۆسۆ ئادەمیزاد بە سروشت خێرخوازە بەڵام دەوروبەر سەری لێ دەشێوێنێ.

پێشەکییەشدا کەواکیبی گەیشتۆتە لوتکە کاتێک پێمان دەڵێت: **«بێ گومان سیاسەت زانستێکی زۆر بەرفراوانەو گەلێک هونەرو باسی وردی هەمەجۆری لێ دەبێتەوەو بە دەگمەن هی واهەڵدەکەوێت شارەزای ئەم زانستە بێت، هەروەک چۆن کەسێکیش نییە گیرۆدەی نەبێت»**[17]، ئەوەیش بۆ خۆی عیللەتی سەرەکیی زۆرداریە، چونکە لە راستیدا **زۆرداران فریان بەسەر زانستی سیاسەتەوە نییەو هەرمەکی و بەپێی بۆچوون و دیدو ئارەزووی خۆیان حوکم دەکەن بێ ئەوەی ئاوڕ لە هیچ و لە کەس بدەنەوە، بۆیەکا هەمیشە زیانیان دەقاتی قازانجیانە بۆ گەل و بۆ نیشتمان.**

نووسینەکانی کەواکیبی لە هەر لاو لایەنێک پتر دەوڵەتی عوسمانی و خودی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمیان دەگرتەوە کە تورک و عەرەب وئەرمەن و کوردو هی تر بەسەر یەکەوە گیرۆدەیان بوون. هەرچەندە کەواکیبی لە نووسینەکانیدا توندڕەو نەبوو، بەڵام پلارو توانجی رەوای زۆریشی دەگرتە فەرمانڕەوا کورتبینەکانی **«دەروازەی باڵا»** (الباب العالی). لە **«دایکی شاران»**دا بەوردی بیستویەک هۆی بێ فەڕی رژێمی عوسمانیی بۆ دەسنیشان کردووین، لەوانە جەورو ستەم و تەخشان و پەخشان و گوێ نەدانە تایبەتمەندێکانی ئەو گەلانەی چارەنووس خستبوونییە ژێر چەپۆکی ئەو رژێمەوە[18].

لەبەر ئەوە کەواکیبی زۆری بەدەست کاربەدەستانی رژێمی عوسمانییەوە چێشت، جارێکیان دەستیان لە کارکێشایەوە، چەند جارێکیش دایانە دادگەو هەوڵی کوشتنیان دا، جارەهای جاریش لەسەر نووسینەکانی پەڵپوبیانویان پێ دەگرت. یەکەم جار لەسەر ئەرمەن یەخەیان گرت. کەواکیبی وەک رووناکبیرێکی ژیرو کراوە دژی سیاسەتی چەوتی **«دەروازەی باڵا»** بەرانبەر بە ئەرمەنەکان وەستا. لە ژمارە دووی **«الشهباء»**دا کە ناوەندی مایسی ساڵی ١٨٧٧ چاپ بووە، واتا لە گەرمەی دواجەنگی بەناوبانگی نێوان رووسیاو تورکیادا، زۆر بە نەرمی گلەیی لە رەفتارێکی یەکجار نابەجێی کاربەدەستانی شاری عەینتاب کردووە کە ئەوساکە لە

(١٦) **«الاعمال الکاملة للکواکبي»**، ص٤٣٤.
(١٧) هەمان سەرچاوە، ل٤٣٣.
(١٨) هەمان سەرچاوە، ل٣٦١-٣٦٤.

رووی کارگێڕییەوە سەر بە حەڵەب بوو. شەش کەس لە ئەرمەنەکانی عەینتاب دەچنە بارەگای لەشکر بۆ ئەوەی خۆیان بە پێشمەرگە دژی رووسیای هاوئایین و هاومەزهەبیان ناونووس بکەن، کەچی ئەو گەوجانە بەر لە هەر شت داوایان لێ دەکەن ناوی خۆیان بگۆڕنە ناوی ئیسلامی، ئەوانیش چاویان دەچێتە پشتی سەریان و لەسەر ئەوە لە پێشنیارەکەی خۆیان پاشگەز دەبنەوە[19].

جەنابی والیی حەڵەب بەو هەڵوێستەی کەواکیبی شێتگیر دەبێت و فەرمانی داخستنی «الشهباء»و دادگاکردنی خاوەنی دەردەکات. دوای شەش مانگ هاتوچۆو ئەمسەرو ئەوسەر ئینجا والی وازی لە کەواکیبی هێناو رێگەی پێ دا دیسانەوە رۆژنامەکەی دەربکات. شایانی باسە **کەواکیبی هەڵوێستی خۆی بەرانبەر ئەرمەن نەگۆڕی و ناوی ئەو کەسەشی نەدرکاند کە هەواڵی شەش ئەرمەنەکەی پێ گەیاندبوو تەنها بەو رەفتارەی شەرەفی رۆژنامەنووسی لەکەدار بکات** وەک بۆ خۆی لە ژمارە سێی **«الشهباء»**دا نووسیوییە[20]. لە یەکێک لە چاپەکانی **«دایکی شاران»**یشدا کەواکیبی بەتایبەتی باسی ئەوەی کردووە چۆن عەرەب لە کوشتارەکانی ئەرمەندا بەشدارییان نەکردووە، چونکە **«ئیسلام دژی خوێنڕێژی و جەنگە»**[21]. لەبەر ئەوە کاربەدەستان کەواکیبییان بە دۆستی ئەرمەن لەقەڵەم دەدا، تەنانەت کە پارێزەری ئەرمەنی سیرۆنی مەرعەشی دەسرێژی لە جەمیل پاشای والیی حەلەب کرد، کە پیاوێکی زۆردارو دوژمنێکی سەرسەختی ئەرمەن بوو، کەواکیبییان بە هاندەری سیرۆن داناو لەسەر ئەوە گرتیان[22].

لانەدانی کەواکیبی لەو رێبازەی بۆ خۆی هەڵیبژارد بوو سەرئەنجام بووە هۆی داخستنی «الشهباء» کە هەمووی بەسەر یەکەوە شازدە ژمارەی لێ دەرچوو. کەواکیبیش دەستی هەڵنەگرت، ئەمجاریان رۆژنامەیەکی تری بە ناوی

(19) بۆ دەقی ئەو رووداوەو رەخنە لەسەرەخۆکەی کەواکیبی بڕوانە لاپەڕە ١٤٥-١٤٦ی هەمان سەرچاوە.

(20) دەقی رستەکە بە عەرەبی دەڵێت: **وبعد المحاكمة في مجلس الادارة، وامتناعنا عن الاباحة باسم مخبرنا محافظة على ناموس الجرنال كان ما كان من تعطيل الشهباء**، هەمان سەرچاوە. ل١٤٨.

(21) هەمان سەرچاوە، ل٤٨.

(22) هەمان سەرچاوە، ل٢٩.

**«إعتدال»**ەوە دەرکرد کە ژمارەی یەکەمی کۆتایی تەمموزی ساڵی ١٨٧٩ دەرچوو. کەواکیبی **«اعتدال»**ی بە عەرەبی و تورکی چاپدەکردو بەئەنقەست ئەو ناوەی بۆ هەڵبژارد تا نیشانی بدات ڕۆژنامەکەی توندڕەو نییە، واشبوو. لەگەڵ ئەوەشدا کاربەدەستانی ئەوسای حەڵەب تەنها دوو مانگو نیو خۆیان پێ ڕاگیراو دوای دەرچوونی دەیەمین ژمارەی **«اعتدال»**یشیان داخست[٢٣].

داخستنی **«اعتدال»** بووە هۆی ئەوەی کەواکیبی زۆرتر خۆی بۆ دانانی کتێبەکانی تەرخان بکات، هەرچەندە، وەک گومان، دەستی لە ڕۆژنامەنووسی هەڵنەگرت و زنجیرەیەک وتاری لە ڕۆژنامەو گۆڤارو عەرەبییە بەناویانگەکاندا بڵاوکردەوە، تایبەت ئەوانەیان کە لە میسر دەردەچوون. لەولایشەوە داخستنی **«اعتدال»** نەبووە هۆی ئەوەی **«دەروازەی باڵا»** دەست لە یەخەی کەواکیبی بەردات، وادیارە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بۆ خۆی تاقیبی چالاکێکانی کەواکیبیی دەکرد[٢٤].

ئەو هەموو فشارو ڕاوودونانە سەرئەنجام کەواکیبییان ناچار کرد حەڵەبی خۆشەویستی بە جێ بهێڵێت و بە نهێنی لەگەڵ کوڕە گەورەکەیدا کۆچوبار بکات بۆ میسرو دوا سێ ساڵی تەمەنی بە ئاسودەیی و قەدرو ڕێزەوە لەگەڵ هاوبیرانی خۆیدا لەوێ بەرێتە سەرو بێ ترس و لەرز شاکارەکانی بخاتە ژێر چاپەوە[٢٥].

بەڵام سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لەوێش دەسبەرداری نەبوو، تا **بەپێی ژمارەیەک سەرچاوەی باوەڕپێکراو، توانی لە ڕێگەی پیاوەکانییەوە لە قاهیرە ڕۆژی چواردەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٠٢ دەرمانخواردی بکات و بەو جۆرە عەرەب و موسڵمان و جیهان ڕووناکبیرێکی گەورەیان لەکیس چوو. دەڵێن پیاوەکانی سوڵتان توانییان بگەنە بەشێک لە دەستنووسەکانی کەواکیبی**[٢٦].

---

(٢٣) هەمان سەرچاوە، ل٤٣، ٢٥٢-٢٥٨.

(٢٤) هەمان سەرچاوە، ل ٢٤-٢٩؛ الدكتور اسعد السحمراني، الاستبداد والاستعمار وطرق مواجهتها عند الكواكبي والابراهيمي، دار النفائس، بيروت، ١٩٨٤، ص٤٩-٥٠.

(٢٥) قدري قالعجي، المصدر السابق، ص٩-١٠ ؛ نضر علي امين محي الدين الشريف، المصدر السابق، ص٨٨-٩٥.

ژمارەیەکی زۆر لە شارەزایان و رۆژهەڵاتناسان بەرز بیروباوەڕی کەواکیبییان نرخاندووە. جۆرج ئەنطونیۆس لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا دەربارەی وریابوونەوەی عەرەب لە هەموو رووپەکەوە زۆری بەسەر شانوباهوی کەواکیبیدا هەڵداوەو بە دۆستی نزیکی هەژاران و رێبەری گەورەی بزووتنەوەی نەتەوەیی عەرەب و وریاکەرەوەی دیاری موسڵمانان ناوی دەبات[٢٧]. عەرەبناسی فەرەنسەییش نۆربێر تابییرۆ نازناوی پێشڕەوی لە بواری نوێخوازیدا بۆ کەواکیبی هەڵبژاردووە[٢٨]. هەرچی گەردلێڤسکییە، کە عەرەبناسێکی ناسراوی رووس و شورەوی بوو، گومانی لەوەدا نییە کە کەواکیبی دامەزرێنەری راستەقینەی بیری نەتەوەیی عەرەبە[٢٩]. کاتلۆفیش بە هەمان دەستوور بیروباوەڕی کەواکیبی هەڵدەسەنگێنێ و بەتایبەتی لایەنی مرۆڤپەروەریی ئەو بیروباوەڕەی دەستنیشان کردووە[٣٠]. ئەمەی دواییان تا رادەیەک لە پێوەندی کەواکیبیدا بە کوردیشەوە خۆ دەنوێنێ.

### کەواکیبی و کورد:

لە سەرەتاوە بە پێویستی دەزانم ئەو راستییە بنووسم کە من تاکە مەبەستم لەم جۆرە باسانە روونکردنەوەی لایەنی مێژووییە، نەک کورد هەڵکێشان، چونکە باش و دروست لەوە گەیشتووە کە هەر نەتەوەیەک دەرفەتی لە باری بۆ هەڵبکەوێت دەتوانێت سەلاحەددین و غەیری سەلاحەددین دروست بکات، **کورد چ لەم بوارەداو چ لە بوارەکانی تری ژیاندا، بە شایەتی خودی مێژوو، هیچی لە کەس کەمتر نییە.**

ژمارەیەک لە سەرچاوە بایەخدارەکان دەڵێن کەواکیبی بە رەگەز کوردە. ئەلبێرت

---

(٢٦) نوربير تابييرو، المصدر السابق، ص٩؛ **«الاعمال الكاملة للكواكبي»**، ص٣٠-٣٣.

(٢٧) جورج انطونيوس، المصدر السابق، ص ١٧-١٩، ١٦٨-١٧٢ وغيرها.

(٢٨) نوربير تابييرو، المصدر السابق، ص١٨٣.

(29) V.B.Lutskii, Novaya Istoria Arabskikh Stran, Moskva, 1966,P.211

(30) L.N.Kotlov, Stanovlenie Natsionalno - Osvobditelnovo Dvijenie na Arabscom Vostoke (Seredina XIXv.1908 g.), Moskva, 1975, P.251.

حۆرانی، کە مێژوونوسێکی بەناوبانگە، پێی وایە کەواکیبی لە باووباپیرانەوە کوردە[٣١]. عەرەبناسی فەرەنسەیی نۆربێر تابییرۆ لە نامەی دوکتۆراکەی خۆیدا کە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٣ پێشکەشی زانکۆی لیۆنی کردووە دەڵێت کەواکیبی باوکی ئێرانی و دایکی کوردە[٣٢]. ئەوەی کە باوکی ئێرانییە پێویستی بە سووکە شیکردنەوەیەک هەیە.

زۆربەی شارەزایان دەڵێن کەواکیبی پشتاوپشت دەچێتەوە سەر صەفەوێکان، ئەمانیش بە شێوازێکی دەستکردو لەبەر ئامانجی سیاسیی رووت لە پڕێکا بوونە نەوەی ئیمام موسای کازم، هەرچەندە لە ڕاستیدا خەڵکی ئەردەبیلن و بە ڕەگەز دەبێ ئازەری بن و تەنانەت ئێراناسی شارەزاش هەن ئەو دەوڵەتەی سەرەتای سەدەی شازدەمین دایانمەزراند تاوەکو کۆتاییی ئەو سەدەیەو گواستنەوەی پایتەختەکەی لە تەورێزو قەزوینەوە بۆ شاری ئەسفەهان بە دەوڵەتێکی ئازەریی دادەنێن نەک فارسی[٣٣]. هەمان کات مێژوونووسی ناسراوی ئێرانی کیسرەوی لەو کتێبەیدا کە ساڵی ١٩١٥ لە تاران بە ناوی **«مێژووی پێنج سەد ساڵەی خوزستان»**ەوە چاپیکردووە دەڵێت صەفەوێکان بە رەگەز کوردن[٣٤].

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ راستییەکی مێژوویی تریش بکەین کە بۆی هەیە تیشکێکی تر بخاتە سەر باسەکەمان. صەفەوێکان کە بە زۆر شیعەگەرییان بەسەر ئێراندا داسەپاند کورد لە هەموان پتر بەرگرییان کردو ژمارەیەک لە بنەماڵە کوردەکان کۆچیان کردە ئەو ناوچانەی ئەوساکە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوون، وەک بنەماڵەی حەیدەری. وا دیارە بنەماڵەی کەواکیبیش لەبەر هەمان هۆ لە سەدەی پازدەمینەوە ئێرانیان جێ هێشتووەو هاتوونەتە ناوچەی حەڵەب. **ئاگاداران**[٣٥] **لای**

---

(٣١) البرت حوراني، الفكر العربي في عصر النهضة ١٧٩٨- ١٩٣٩، ترجمة كريم عزقول، بيروت، ١٩٦٨، ص٣٢٣.

(٣٢) نوربير تابييرو، المصدر السابق، ص٥٢.

(33) M.S.Ivanov, Ocherk Istorii Irana, Moskva, 1952, P.61.

(٣٤) دەربارەی ئەو باسە بڕوانە: **حسين محمد القهواتي، العراق بين الاحتلالين العثمانيين الاول والثاني ١٥٣٤-١٦٣٨.** دراسة في الاحوال السياسية والاقتصادية، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب - جامعة بغداد، ١٩٧٥، ص٢٩.

**ناصح حەیدەری لە هەولێر شەجەرەی بنەماڵەی حەیدەرییان دیوەو دەڵێن کەواکیبیان لەو شەجەرەیەدا لقێکن لە حەیدەرییەکان.**

مایەوە سەر ئەوەی بڵێین کەواکیبی بەسەرو سیماو خوورەوشت زۆر وە کوردێکی باکووری پەتی دەچوو، ئەوانەی لە نزیکەوە دەیانناسی دەڵێن پیاوێکی دەموچاو خڕی سپیکەلەی کوڵم ئاڵی چاو کەژاڵی برۆپڕی بە بەژنوباڵاو دڵناسک و بەوەفاو تووڕەو چاونەترس و بە جەرگ بوو(٣٦).

**هەرچۆن بێت باووباپیرانی کەواکیبی لەناو بۆتەی عەرەبدا توانەوەو بۆ خۆیشی**

---

(٣٥) یەکێک لەوانە مامۆستا طاهر حەیدەرییە. بۆ ساغ کردنەوەی ئەم باسە روو دەکەینە مامۆستا مومتاز حەیدەری*.

* بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەو راسپاردەیەی د. کەمال لە ٢٠٠١/٥/١٤ رووم کردە کاک مومتاز حەیدەری و ئەویش گوتی:

«ئەو ناوە لە شەجەرەکەی ئێمەدا نییە، بەڵام مام ناسیح حەیدەری کە بیرتیژی بنەماڵەکەی ئێمەو شارەزای رەچەڵەکی حەیدەرییان بووە. چەند جار گوتوویەتی کەواکیبی لە حەیدەرییەکانە، بەڵام لەبەر ئەوەی دەمێکە دابڕاون، بۆیە ناوی لە شەجەرەی بنەماڵەکەی ئێمەدا دانەنراوە. بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونەی مام ناسیح دەڵێم: چەند لقێکی دیکەی حەیدەرییەکان هەن دیسان لە شەجەرەکەی ئێمەدا نین، بۆ نموونە مەلا ساڵحی حەیدەری زاناو شاعیر کە نەوەی ئەو لە ناوچەی پیرەمەگروندا نیشتەجێن، تەنانەت ئەو مەلا ساڵحە چۆتە قاهیرە لەوێ زاناکانی عەرەبی ئەوەندە بایەخیان پێی نەداوەو بەهەندیان هەڵنەگرتووە گوایە لەبەرئەوەی خەڵکی گوند بووە، ئەویش شیعرێکی لەسەر ئەو رووداوە بەفارسی داناوەو تیایدا گوتوویەتی راستە من بۆ خۆم لێرەم، بەڵام گیانم لەماوەرانەو تیایدا شانازی بەوێ کردووە.

نابێ ئەوەش لە بیر بکەین مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن زادە ئەو چەند دێرە شیعرەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لای ئێمەش پارێزراوە.

نموونەیەکی دیکەش لە لقی حەیدەرییان کە دابڕاون. ئێستا وا لە چەمچەماڵ دادەنیشن و بەم دواییە پەیدا بوونەتەوەو یەکدیشمان ناسیوەتەوە، بەشایەدی مامۆستا عەبدولسەلام حەیدەری کە ئێستا لە ژیاندایەو دانیشتووی بێتواتەیە، ئەوانە دەگەڕێنەوە سەر محەمەد پیرەدینی کە یەکەم زانای حەیدەرییان بووەو هاتۆتە کوردستانی باشوور.

لقێکی دیکەی حەیدەرییان کەوتوونەتە تورکیا، هەروەها لە شاری مەهاباد حەیدەری هەن. تەنانەت کوچەیەک لە شارەکەدا بەناوی ماوەران هەیە، زانای گەورەی کورد ئایەتوڵڵا مەردۆخیش لە کتێبەکەی بەناوی مێژووی کوردو کوردستان بنەماڵەی حەیدەرییانی کە لەسەردەمی شا ئیسماعیلی سەفەوی مەهابادیان جێهێشتووەو روویان لە شوێنانی دیکە کردووە بە ١٥٠٠ ماڵ مەزەندە کردووە.

بۆیە من دەڵێم بۆچوونەکانی بەرێز دکتۆر کەمال راستن و قسەکەی پێشووی خۆشم دووبارە دەکەمەوە خۆم چەند جار ئەو رایەم لەمام ناسیح بیستووە».

**«عەبدوڵڵا زەنگەنە»**

(٣٦) **«الاعمال الكاملة للكواكبي»**، ص٢٢.

**عەرەبی لە هەمووان خۆشتردەویست**، لە نووسینەکانیدا عەرەب یەکەمیین نەتەوەی ئیسلامین و شایانی ئەوەن ببنە ڕابەری سەرجەمی موسڵمانان. بێ گومان هەستی ئایینی و مێژووی ئیسلام و ڕقی ڕەوای کەواکیبی لە عوسمانیێکان کاریان کردۆتە سەر دروستبوونی ئەم جۆرە بۆچوونەی لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا. بەڵام کەواکیبی هەمان کات پایە و مەقامێکی دیاری داوەتە کورد، ئەوەی لە هەر شت پتر لە **«دایکی شاران»** (أم القری)دا ڕەنگی داوەتەوە.

وەک وتمان **«دایکی شاران»** بریتییە لە ناوەڕۆکی گفتوگۆی بیستوسێ زانای موسڵمان کە بەپێی کەواکیبی خۆی لەم شارو وڵاتانەوە لە ڕۆژانی حەجدا هاتوونەتە شاری مەککە بە نیازی بەستنی کۆنگرەیەکی تایبەتی: حەڵەب و دیمەشق و میسر و فەڵەستین و یەمەن و عیراق و نەجد و مەدینە و مەککە و تونس و مەراکیش و ئینگیلتەرەو تورکیا و **کوردستان** و فارس و تەتەرستان و کازاخستان و ئەفغانستان و هیندستان و سەند و چین[٣٧]. ئەم نوێنەرانە هەریەکەیان بەپێی شارەزایی و ناوبانگ نازناوێکی هەیە تا دوژمن زەفەریان پێ نەباو نەزانێ کێن، ئەمەیش دەقی ناوەکانە کە لە یەکەم کۆبوونەوی کۆنگرکەدا پێشکەش دەکرێن:

**«السيد الفراتي والفاضل الشامي والبليغ القدسي والكامل الأسكندري والعلامة المصري والمحدث اليمني والحافظ البصري والعالم النجدي والمحقق المدني والاستاذ المكي والحكيم التونسي والمرشد الفاسي والسعيد الانكليزي والمولي الرومي والرياضي الكردي والمجتهد التبريزي والعارف التتاري والخطيب القازاني والمدقق التركي والفقيه الافغاني والصاحب الهندي والشيخ السندي والامام الصيني»**[٣٨].

کەوابێ **نوێنەری کوردستان** زانای ماتماتیکە. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت **کەواکیبی بۆ خۆی لە تەمەنی خوێندن و فێربووندا پایەخی تایبەتی دەدا بە ماتیماتیک**[٣٩].

لە یەکەم کۆبوونەوەی کۆنگرە خەیاڵییەکەی کەواکیبیدا کە گوایە ڕێکەوتی

---

(٣٧) هەمان سەرچاوە، ل ٧٨؛ نوربیر تابییرو، المصدر السابق، ص٥٧.

(٣٨) **«الاعمال الكاملة للكواكبي»**، ص٢٧٨.

(٣٩) نوربیر تابییرو، المصدر السابق، ص٥٢.

پازدەی ذی القعدەی ١٣١٦ دەبێت، واتا بیستوهەشتی مارتی ساڵی ١٨٩٩، تەنها سەرۆکی کۆنگرە **«الاستاذ المکي»** دەدوێ و لە وتارێکی دوورودرێژدا ئەو لایەنە سەرەکییانە دەستنیشان دەکات کە بەلایەوە پێویستە ئەندامانی کۆنگرە لێیان بکۆڵنەوە[٤٠]. دوای دوو رۆژ لە کۆبوونەوەی دووەمدا دیسانەوە سەرۆکی کۆنگرەو ئینجا بە ریز **«الفاضل الشامي»** و **«الصاحب الهندي»** و **«الحافظ البصري»** و **«البلیغ القدسي»** و **«الحکیم التونسي»** و **«المولی الرومي»** و **«المرشد الفاسي»** قسە دەکەن[٤١]. لەو کۆبونەوەیەدا مەولای رومی فریا ناکەوێت قسەکانی تەواو بکات، لەبەر ئەوە لە کۆبوونەوەی سێیەمدا کە بەر رۆژی داهاتوو، واتا سیویەکی مارتی ١٨٩٩ دەکەوێت، رێگەی دەدەنێ جارێکی تر بدوێت. دوای ئەو لە کۆبوونەوەی سێیەمدا بە ریز، یەک لە دوای یەک **«الریاضي الکردي»** و **«الکامل الاسکندري»** و **«الفقیه الافغاني»** و **«السعید الانکلیزي»** و **«الامام النجدي»** دەدوێن[٤٢].

نوێنەری کوردستان لە دووانە دوورودرێژەکەی خۆیدا هۆی سەرەکیی گیرۆدەیی کێشەکانی جیهانی موسڵمانان دەگێڕێتەوە بۆ دواکەوتنی زانستە سروشتیەکان لە ناو خەڵکی ئەو جیهانەدا، بە پێچەوانەی رۆژئاواییەکانەوە کە لە ژێر سایەی ئەو زانستانەدا بە تەواوەتی حەوانەتەوەو رەورەوەی ژیاریان بەرەو پێش بردووە، بۆیەکا، وەک دەڵێت، پێویستە موسڵمانانیش روویکەنە زانستە سروشتییەکان، تایبەت کە قورئانیش بۆ ئەوە هانیان دەدات[٤٣]. لە کۆبوونەوەی چوارەمیشدا کاتێک باسی صۆفیگەری دێتە پێشەوە دوو جاران چ **«العالم النجدي»** و چ **«العلامة المصري»** بە رێزەوە ئاماژە بۆ کوردو نوێنەری کوردستان دەکەن[٤٤].

شایانی باسە کەواکیبی بەشێک لە ناوەرۆکی **«دایکی شاران»**ی لە گۆڤارە

(٤٠) **«الاعمال الکاملة للکواکبي»**، ص٢٧٨-٢٨٤.

(٤١) هەمان سەرچاوە، ل ٢٨٥-٢٩٨.

(٤٢) هەمان سەرچاوە، ل ٢٩٩-٣١٢.

(٤٣) بۆ دەقی قسەکانی **«الریاضي الکردي»** بڕوانە هەمان سەرچاوە، ل ٣٠٢-٣٠٤.

(٤٤) هەمان سەرچاوە، ل ٣٢٧ و ٣٢٩.



ئایا تۆفیق وەهبی و کەواکبی ماسۆنی بوون؟

عەرەبییەکاندا بلاوکردۆتەوە بەر لەوەی بیکاتە کتێب. ناوەرۆکی یەکەم وتاری کە ڕۆژی بیستوپێنجی تەمموزی ساڵی ١٨٧٩ لە «المؤید»ی میسریدا بلاوی کردۆتەوە بریتییە لە پوختەی بۆچوونەکانی «الاستاذ المکی» لە یەکەم کۆبوونەوەدا، جگە لە ڕاکـــانی «الریاضي الکردي» و «الکامل الاسکندري» لە کـــۆبـوونەوەی سێیەمدا[٤٥]. لە ژمارە پێنجی «الشهباء»یشدا کە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٧٧ چاپ بووە، باسی ژمارەی دانیشتوانی وڵاتی عوسمانیی کردووە، لەوێدا ژمارەی دانیشتوانی «ویلایەتی کوردستان»، کە دیارە بەشێکە لە کوردستانی گەورە، بەم جۆرەیە:

| | |
|---|---|
| ساڵی ١٦٨٨ | ١ ٣٧٠٠٠٠٠ |
| ساڵی ١٨٧٢ | ٨٠٠٠٠٠ |
| ساڵی ١٨٧٦ | ١ ١٤٠٠٠٠[٤٦]. |

(٤٥) هەمان سەرچاوە، ل٤٣.
(٤٦) هەمان سەرچاوە، ل ١٧٨، ١٨٥-١٨٦.

ئەم ژمارانە پێویستیان بە لێکدانەوەی تایبەتییە کە ئێرە جێگەی نییە.

**هەر ئەوەندەیش دەمێنێ بڵێم کەواکیبیش جاروبار تۆمەتی ماسۆنییەتی دەدرێتە پاڵ، ئەو لایەنەش پێویستی بە لێکدانەوەی وردە، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە کەڵە پیاوانی ئەم جیهانەی وەک رابەرانی بزووتنەوەی یەکیەتی ئیتالیاو رابەرانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسی و هی وەک ڤۆلتێر و مۆزارتی مۆسیقاری هەرە بەناوبانگ و کوتۆزۆڤی ناپلیۆن بەزێن و ئەفغانی و محەممەد عەبدەو جەرجی زەیدان و فازیل جەمالی و تۆفیق وەهبی لەمەڕ خۆمان هەمان تۆمەتیان دەدەنە پاڵ و زۆربەیشیان بێ سێ و دوو، بە شانازییەوە دانیان بە راستی ئەو تومەتەدا داناوە.**

# لە لاپەڕە بایەخدارەکانی پێوەندیی نێوان کورد و عەرەب

لە دێرزەمانەوە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و عەرەبستان لێک نزیکن. کورد لە ریزی پێشەوەی ئەو گەلانەدان کە دڵسۆزانە خزمەتی ئیسلامیان کردووە. لە خۆڕا نییە کورد لە دەروونی عەرەبدا وێنەی کەسێکی جوامێرو دڵسۆزو ئازاو بەوەفایە. **هەموو کوردێک بە ئاسانی هەست بەو راستییە دەکات، هەرچەندە، بێ گومان، ئەمە وا ناگەیێنێت بەرانبەر بەو جەماوەرە بەرفراوانە دەیان گەوجی ئەوتۆش نین کە بە خوێنی سەری کورد تینوون، ئەوانەی رۆژێک لە رۆژان چ بۆ خۆیان و چ بۆ غەیرە لە زیان بەولاوە هیچ خێرو بێرێکیان لێ نەوەشاوەتەوە.** ئەوەش بۆ خۆی دیاردەیەکی گشتییە نەک تایبەتی، لە ناو ئەڵمانیادا بەرانبەر کەڵەپیاوانی وەک گۆتێبورگ و هیگل و مارکس و گۆتەو باخ و بیتهۆڤن جانەوەرو درۆزنی وەک گۆبڵزیش هەڵدەکەوێت.

لەم کورتە وتارەدا چەند نمونەیەکی کەم زانراو دەربارەی پێوەندیی نێوان کوردو عەرەب دەخەمە بەرچاو. هەموومان دەزانین شۆڕشی تەموزی ساڵی ١٩٠٨ لە وڵاتی عوسمانی بووە هۆی دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێ لە ناوەرۆک و شێوازی خەباتی رەوای گشت نەتەوە ناتورکەکانی ناو ئەو وڵاتەدا. نیشتمانپەروەرانی عەرەب لە هەموو لاوە بە گەرمی کەوتنە خۆ. حوزەیرانی ساڵی ١٩١٣ دەستەیەکی چالاکیان لە

---

(*) لە ژمارە (١٢٩)ی گۆڤاری «رەنگین»ی رێکەوتی ١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٩، لە ل٦-٧دا بڵاوکراوەتەوە.

پاریس کۆنگرەیەکی بایەخداری تایبەتییان بەست کە لە مێژوودا بە **«کۆنگرەی یەکەمی عەرەب»** ناسراوە.

**کۆنگرەی یەکەمی عەرەب** شەش رۆژی خایاندو بیستوچوار لاوی نیشتمانپەروەری عەرەب، کە نیوەیان موسڵمان و نیوەکەی تریان عیسایی بوون، تێیدا بەشدار بوون، زۆربەیان لە شامەوە هاتبوون، دوانیشیان نوێنەری بوون، یەکێکیان تۆفیق سوێدی بوو کە ئەوساکە لە فەرەنسە یاسای دەخوێندو دوایی چەند جارێک بووە وەزیرو سەرەک وەزیران. هەموو رۆژێکیش نزیکەی دوو سەد عەرەبی تر بۆ گوێگرتن ئامادەی کۆبوونەوەکانی کۆنگرەکە دەبوون.

بەشدارانی **«کۆنگرەی یەکەمی عەرەب»** نە لە وتارەکانیاندا، نە لە گفتوگۆکانیانداو نە لە دوا بڕیارەکانیاندا هیچ جۆرە توندڕەوییەکیان نەنواند، دروشمی جیابوونەوەیان لە دەوڵەتی عوسمانی نەهێنایە گۆڕێ، ئەوپەڕەکەی داوای یەکسانیی تورک و عەرەبیان کرد، دەیانویست منداڵانی عەرەب بە زمانی زگماکی خۆیان بخوێنن و فەرمانبەرانی وڵاتەکەیان لە خۆیان بن، ئەو داخوازییە رەوایانە ئیتحادییە کەلەڕەق و نەفامەکانی ئەستەمولیان شێتگیر کرد چونکە پێیان وابوو دەبێت تورک ئاغاو عەرەب و هەموو ئەوانی تر نۆکەر بن، بۆیەکا هەزارو یەک ناوو ناتۆرەیان لێ نان و کەوتنە پیلانگێڕان دژیان و بە زۆری زۆردارەکی ویستیان ئەو نیشتمانپەروەرە دڵسۆزانە بکەنە نۆکەرو داردەستی بیانییان هەرچەندە زۆر لە خۆیان خاوێنتر بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا ئیتحادییەکان ناچار بوون هەنگاوێک بکشێنە دواوە، سێیان لە رابەرانی کۆنگرەکە بانگکردە ئەستەمبوڵ و زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێ کردن و هەژدەی ئابی هەمان ساڵ، واتا دوو مانگ دوای تەواوبوونی کارەکانی کۆنگرە، رێککەوتننامەیەکیان لەگەڵ مۆرکردن گوایە بۆ جێ بەجێ کردنی داخوازییە رەواکانی عەرەب، بەڵام زۆری نەبرد دەستی ئیتحادییەکان کەوتە روو، هەمووان لەوە گەیشتن کە رێککەوتننامەی ئاب تەڵەیەکی فێڵبازانەیە بۆ لێدانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی عەرەب.

هەرچۆن بێت پڕیشکی **«کۆنگرەی یەکەمی عەرەب»** لە پاریس کوردیشی گرتەوە.

ڕۆژی هەژدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٣ یەکەم دانیشتنی کۆنگرە بە وتاری سەرۆکی هەڵبژێردراوی کۆنگرە عەبدولحەمید زەهراوی دەستی پێ کرد. لە وتارەکەیدا زەهراوی بەم جۆرە ناوی کوردی هێنا:

**«فأساس تربيتنا السياسية من الان بث هذه الفكرة (فكرة اللامركزية)، والتعصب لها، وقد وجدنا اللامركزية من خير الوسائل لظهور اثر هذا الاشتراك بادارة السياسة فيها، ولا يحتاجون فيها شروح وايضاحات، وهكذا نود ان تنمو هذه الفكرة عند كل عثماني، لان الارمن والكرد، مثلا، لسان حالهم كلسان حالنا ايضا».**

شایانی باسە عەبدولحەمید زەهراوی یەکێک بوو لەوانەی دوایی کەوتە داوی ئیتحادییەکانەوەو بەگفتە ساختەکانیان دەسخەڕۆ بوو، بەڵام ئەوە دادی نەداو مایسی ساڵی ١٩١٦ جەمال پاشای خوێنڕێژ (السفاح) لەگەڵ شەش نیشتمانپەروەری تردا لە دیمەشق وەبەرچاوی خەڵکەوە لە سێدارەی دا.

**«کۆنگرەی یەکەمی عەرەب»** هەستی ژمارەیەک ڕووناکبیری بە ڕەگەز کوردی دیمەشق و بەغداو موسڵی بزواند، کە بەنامەو بروسکەی تایبەتی پشتگیریی خۆیان بۆ کارەکانی دەربڕی، لەوانە جووتە برا محەمەد کورد عەلی و ئەحمەد کورد عەلی کە هەمیشە شانازییان بەوەوە دەکرد کە بەڕەگەز کوردن. یەکەمیان پاش ماوەیەک بووە یەکەم سەرۆکی یەکەم کۆڕی زانیاری لە دیمەشق. محەمەد کورد عەلی جارەهای جار لە نامەو کۆڕە تایبەتییەکانی خۆیدا بە شانازییەکی زۆرەوە ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە بە ڕەگەز کوردە. بەکر سدقیش لە بەغداوەو داود ئەفەندی ئەیوبیش لە موسڵەوە نامەی پشتگیرییان ناردووە.

بە هەمان دەستوور دوابەدوای شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨ لە هەموو لاوە دەنگی نیشتمانپەروەرانی عەرەب بەرز بۆوە بۆ ئەوەی عەرەبی بکرێتە زمانی دادگەکانی وڵاتە عەرەبییەکان. لێرەشدا بەشێک لەو نیشتمانپەروەرانە کوردیان فەرامۆش نەکردووە.

ڕۆژنامەی **«الرقیب»** کە بەپێی مێژوونووس عەبدولڕەزاق حەسەنی چاکترین و ئازاترین ڕۆژنامەی عیراقیی ئەو ڕۆژگارە بووە، لە ژمارە شەستو شەشی خۆیدا کە

رۆژی بیســـتــویەکی تەشــرینی دووەمی ســالّی ۱۹۰۹ لە بەغــدا چاپ بووە، لەم بارەیەوە بە زمانی باوی ئەوساکە نووسیوییە دەڵێت:

**«ان اللازم على حكومتنا الدستورية ان لا تعين للولايات الا من يحسن التكلم بلغة اهاليها الوطنية، ولا نخص بذلك العرب، فلا يمكن ان يتعين، مثلا، لاطراف السليمانية وكركوك وما جاورها متصرفا او قائمقاما او حاكما شرعيا، او رئيس محكمة الى غير ذلك ما لم يعرف لغة البلاد الكردية تماما ليستطيع منهم دعوى المدعي ومرافعة المدعي عليه، ويعلم بحق كيف ينفذ حكمه، فلا نخص بذلك بلادنا العربية فقط».**

ئەو جــۆرە رووناکــبــیــرانە ئەوســاکــە بە وردی چەوســاندنەوەی نەتەوەییــان هەڵدەســەنگاند، چونکە بۆ خــۆیشــیــان وەک کــورد کــەوتبــوونە ژێر چەپۆکی هەمــان چەوســاندنەوەوە. بە داخەوە بەشــێکیــان دوای ئەوەی بۆ خــۆیان قــوتار بوون بــوونە میراتگری ئیتحادییەکان کە نەدەبا وابێت. هەرچۆن بێت لاپەڕەکانی پێشوو بوونەتە هۆی پتەوکردنی برایەتیی کوردو عەرەب.

# مەعروف جیاوک و
# سەید تەهاو هەڵوێستێک

لەو ڕۆژەوەی **«ئەنجومەنی نوێنەران»** (مجلس النواب) لە عیراق دامەزرێنرا، واتا لە شازدەی تەمووزی ساڵی ١٩٢٥وە تا پێچانەوەی دامودەزگاکانی لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨دا هەمیشە ژمارەی نوێنەرانی شارەکانی کوردستان لەو ئەنجومەنەدا لە ١٠ کەس زیاتر بوو. بەڵام، عەلی کەمال و ئەمین زەکی و مەعروف جیاوکیان لێ دەرکەی ئەوانی تریان زۆر دەگمەن نەبێ ورتەیان لە خۆیان بڕیبوو، هی وایان تێدابوو لەبەر مووچەی مانگانەکەی دەبووە نایب، هی واشیان هەبوو دەتگوت لە جنسی کوردان نییە.

بە تۆماری ساڵانەی گفتوگۆکانی **«ئەنجومەنی نوێنەران»**دا دیارە کە مەعروف جیاوک یەکێک بوو لە نوێنەرە هەرە قسەزان و چالاکەکانی ئەو ئەنجومەنە. جیاوک لە هەموو گفتوگۆکاندا بەشداریی ئەکردو زۆر جار، بۆ ڕۆژگاری خۆی، بیرورای یاسایی چاک و تا رادەیەک قووڵی دەرئەبڕی.

مەعروف جیاوک دوو جار بووە نوێنەری هەولێر، یەکەم جار لە دەورەی دووەمی ئەنجومەندا کە لە مایسی ساڵی ١٩٢٨وە دەستی پێ کردو یەکی تەمووزی ساڵی ١٩٣٠ کۆتایی هات، دووەم جاریش لە دەورەی سێیەمی ئەنجومەندا کە لە یەکی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠وە دەستی پێ کردو پێنجی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٢ کۆتایی هات. لەو دوو دەورەیەدا مەعروف جیاوک دەیان جار لە

(*) لە گۆڤاری «ڕەنگین»، ژمارە (٨٣)ی ڕێکەوتی ١٥ی ئەیلوولی ١٩٩٥، لە ل٦دا بڵاوکراوەتەوە.

گفتوگۆکانی ئەنجومەندا بەشداریی کردووە، زۆر جار قسەی نەستەق و نوکتەی تێکهەڵکێشی گفتوگۆکانی ئەکردو ئامادەبووانی ئەهێنایە پێکەنین.

لە کۆبوونەوەی رۆژی ٢٦ی ئابی ساڵی ١٩٢٨ی ئەنجومەندا **(عطا الخطیب)**ی نوێنەری کوت باسی مووچەی مانگانەی سەید تەهای نەهری قایمقامی رەواندوزی هێنایە گۆڕێ و مەحمود رامزی نوێنەری بەغداش پشتگیریی لێ کرد. لە گەرمەی بێنەوبەرەی کێشەی مووسڵدا ئینگلیزەکان سەید تەهایان کردە قایمقامی رەواندوز چونکە، بەڕێز ناحەزی کەمالییەکانی تورکیاو سەر بە بنەماڵەیەکی ناسراوی کوردستان و سەردارێکی لێهاتوو بوو. لەو رۆژە ناسکانەدا بۆ بەرهەڵستی کردنی پڕۆپاگەندەی بەرفراوانی کەمالییەکان لە بوواری تەقەلای بێوچانیاندا بۆ وەرگرتنی ویلایەتی مووسڵ سەید تەها لەبارترین کەس بوو بۆ فەرمانڕەوایی رەواندوزو دەوروبەری کە تورکیا بە تایبەتی چاوی تێ بڕیبوو.

ئەو کارەی ئینگلیزو دەستەو دایەرەی مەلیک فەیسەڵ لە سەید تەهایان دەویست کارێکی هەر وا ئاسان و ئاسایی نەبوو، سەید تەها خاوەن دیوەخان و پێوەندی و هەمان کات دەربەدەری دەستی کەمالییەکان بوو. لەبەر ئەو هۆیانە بڕیار درا مووچەی مانگانەی دەوروبەری هەزار روپێ بێ نەک ٥٠٠ روپێ وەک قایمقامەکانی تر. لەو رۆژە چارەنووس سازەی مێژووی عیراقدا سەید تەها بەپێی تواناو لە قەناعەتەوە درێغیی نەکرد، دەوری زۆری لە کەم کردنەوەی مەترسی لە ئۆزدەمیرو تورکخواکاندا بینی، ئەو ناوچەو کەسانەی سەر بەو بوون هەموویان دەنگیان بۆ عیراق دا. یەکێک لە یاریدەرە نزیکەکانی سەید تەها و حوسێن حوزنی موکریانی(داماو) بوو.

**(عطا الخطیب)** ئەو رۆژە چەند جارێک مەسەلەی مانگانەکەی سەید تەهای هێنایە پێشەوە، زۆریش دۆستانە لەو بارەیەوە نەئەدوا، تەنانەت وەزیری کاروباری ناوخۆی ئەوسا ناجی شەوکەت ناچار بوو مەسەلەکەی بۆ روون بکاتەوە. مەعروف جیاوکیش لێی هاتە دەنگ و وتی:

**«پێم وایە نوێنەری بەڕێز (عطا الخطیب) نازانێ پایەو مەقامی بڵندی میری(کوردان) سەید تەها ئەفەندی چییە. سەید تەها پیاوێکی گرنگ ناسراوە،**



سەید تەهای نەهری



مەعروف جیاوک

**شوێنی تایبەتیی لەناو کورداندا هەیە، ئەگەر ئەو نەبوایە ئەو ناوچەیە ئێستا سەر بە وڵاتێکی تر ئەبوو، بێ ئەو کوردستانی باشوور توشی بەزم و رەزم ئەهات... من پێم وایە ئەگەر حوکمەت سێ چوار هەزار روپێشی بداتێ هێشتا بۆ ئەو هەر کەمە».**

عطا الخطیب لە وەڵامدا ئەڵێ: **«هاورێی بەرێز مەعروف عەلی ئەصفەر گوتی ئەگەر ئەو میرە سەروەرە نەبوایە ناوچەکە ئێستا لە شوێنێکی تر ئەبوو. منیش بە هاورێم ئەڵێم نەخێر برای بەرێز سەید تەها ئەفەندی بە تەنها ئەو ناوچەیە ناپارێزێ، بەڵکە هەر یەکێک لە برا کوردەکانمان سەید تەهایەکە بۆ خۆی، لەوانەیە لەویش بە توانا و ئازاتر بێ، هەر هەمووشیان خۆیان گیان فیدای ئەم نیشتمانە ئەکەن و ئەوی کرا ئەوان کردیانە.** ئەم قسانە نوێنەرەکان ئەبزوێنێ و بەگەرمی ئەکەونە چەپڵەرێزان.

جیاوک وازی نەهێنا، لە کۆبوونەوەی رۆژی سیی ئاب و ئینجا لە کۆبوونەوەی یەکی ئەیلولی هەمان ساڵدا، واتا پاش کەمتر لە حەفتەیەک، ئەویش باسی مووچەی مانگانەی ساطع ئەلحصریی هێنایە کایەوە کە قیبلەی نەتەوەپەرستانی

عەرەبی ئەو رۆژگارە بوو. مەعروف جیاوک لەو بارەیەوە گوتی: **«تێ ناگەم چۆن ئەشێ ئەو پیاوە مانگی ۱۲۰۰ روپێ وەرگرێ، واتە هێندەی وەزیرێک، نازانم ئاخۆ ئەو کابرایە لە سەرانسەری جیهان و عیراق و هەموو گەردووندا بێ هاوتایە تا ۱۲۰۰ روپێ وەربگرێ، کەچی زانایانی عیراق مانگی ۲۰۰ روپێ یا شتێک زیاتر وەربگرنە.**

مەعروف جیاوک لە دانیشتنی رۆژی یەکی ئەیلولی ئەنجومەندا دوو جار داوای داشکاندنی مانگانەی ساطع ئەلحصری کرد، بەڵام داواکەی لە دەنگداندا دۆڕاندی.

(بۆ درێژەی ئەو گفتوگۆیانە بڕوانە: **«الحكومة العراقية. محاضر مجلس النواب. الدورة الانتخابية الثانية. اجتماع سنة ۱۹۲۸ غير الاعتيادي»**، بغداد، ۱۹۲۸، ص۷٦۱-۷٦٤، ۸۳٦، ۸٦۷، ۸٦۹).

بابەتی پێنجەم*

# لە نێوان سمکۆ و بابەکر ئاغای پشدەریدا
# «نامەیەکی مێژوویی سمکۆ»

**پێشکەشە بە برازای خۆشەویستم**
**شلێری دارای رشید جەودەت**

دەمێ ساڵە ناوی سمکۆی شکاک کەوتۆتە ناو ناوانەوە. بەر لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهان بە ماوەیەک وەزارەتی هەندەرانی رووسیا لەناو یەکێک لە بەڵگەنامەکانیدا گوتوویە:

**«لەدەوروبەری ساڵی ١٩١٤وە ناوی سمکۆ بۆتە یەکێک لە ناوە زۆر ناسراوەکان لای دەزگا دیپلۆماسێکانی رووسیاو بەریتانیاو ئێران و تورکیا، لە باڵیۆزخانەی هەر یەک لەو وڵاتانەو هەریەک لە وەزارەتی هەندەرانیان دۆسیەیەکی گەورە بۆ سمکۆ تەرخان کراوە».**

ئەم قسەیە تەواو راست و دروستە، تەنها من بۆ خۆم بەسەدان و بەسەدان جار ناوی سمکۆم لەناو بەڵگەنامە نهێنییەکانی بەریتانیاو عێراقدا بینیوە، بەڵگەنامەی ئەوتۆیان تێدایە پتر لەدوو سێ لاپەرەی پرکردۆتەوە، ئەمەش ژمارەیەکی گەورەیە، چونکە بەڵگەنامەی دیپلۆماسی بەچڕوپڕی بۆ تاکە رووداوێک، یا دیاردەیەک تەرخان دەکرێت. هەر لەبەر ئەوەشە کە سمکۆ شوێنێکی دیاری لەناو ئەو بەرهەمانەدا بەردەکەوێت کە بۆ لێکدانەوەی مێژووی هاوچەرخی کورد تەرخان

---

(*) لە گۆڤاری **«رەنگین»**ی ژمارە (١١٨)ی ١٩٩٨دا بڵاوکراوەتەوە.

کراون. تەنها لازەریڤ لە بەرهەمە نازدارەکەی خۆیدا **«زۆرانبازی لەسەر کوردستان»** کە تەنها بۆ دوا دەسالّی سەدەی نۆزدەمین و سەرەتای سەدەی بیستەمینی تەرخان کردووە، بەلایەنی کەمەوە بیستوهەشت جاران ناوی سمکۆی هێناوە.

بابەکر ئاغای پشدەری لە سمکۆ کەمتر ناسراوە، بەلاّم ئەویش کەم نەبوو، پیاوێکی زیرەک و زۆرزان، داناو دووربین، بلیمەت و هوشیار بوو. سالّی ١٩٣٥ بەلّگەنامەیەکی دیپلۆماسی ئینگلیزەکان بەم جۆرە باسی بابەکر ئاغای پشدەری کردووە: **«پیاوێکی بەتوانست و بەڕێزە، هەرکەسێک لە نزیکەوە ناسیبێتی خۆشی ویستووەو ڕێزی لێ ناوە»**.

لەبەلّگەنامەیەکی تریاندا، هەر هەمان سالّ، باسی دووبەرەکیی نێوان بابەکر ئاغاو هەباسی مەحموود ئاغای پشدەرییان کردووەو دەلّێن هەر چەندە ئەو دووانە بەخوێنی سەری یەکدی تینوون **«بەلاّم هەردووکیان بەپەرۆشن بۆ ئەوەی دووبەرەکییەکەیان نەبێتە هۆی لاواز بوونی هۆزی پشدەر»**. خۆزگە گشت رابەرو سەرەک هۆزانی کوردو لە سەرروو هەمووشیانەوە بابانەکان وا ژیرو بەئاگا دەبوون.

لۆنگریگیش گەلێک بەشانو باهوی بابەکر ئاغایدا هەلّداوە، هەلّسەنگاندنی ئەو پیاوەش بایەخی خۆی هەیە، چونکە کەم کەس بەڕادەی ئەو شارەزای مێژووی نوێ و هاوچەرخی عێراق بووە، وێڕای ئەوەی زۆر لەنزیکیشەوە کوردی ناسیوە، چونکە لەگەلّ تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بووە ئەفسەری سیاسی کەرکوک و دەوروبەری. بابەکر ئاغای پشدەری وەک پیاوێکی دانا هەر زوو لەوە گەیشت کە کەمالییەکانی تورکیا لەگەلّ نەتەوەی کوردا نیازپاک نین، لەبەر ئەوە بە گفتەکانیان هەلّنەخەلّەتاو دژی تورکخوازەکانی کوردستان وەستا، ئەوانەی زۆری نەبرد لەناو کوردا ڕیسوا بوون و بە تەوسەوە خەلّکی ناویان لێ نان **«جل خوارەکان»**.

بابەکر ئاغا پێی وابوو لەوانەیە کورد بتوانن لەڕێگەی ئینگلیزەوە شتێک بۆ خۆیان هەلّبکرێنن، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا رۆژێک لە رۆژان دژی شێخ مەحمود نەوەستا، بەلّکو بەپێچەوانەوە لەگەرمەی هاشوهۆشی بێ ناوەرۆکی سەرەک هۆزەکانی تردا ئەو، وەک پیاوێکی راستگۆ، پەیمانی پێ دا دوای هەمووان دەسبەرداری بێت.



**سمکۆ و خەسرۆی کوڕی**

سمکۆ بە پێچەوانەی بابەکر ئاغاوە، **ماوەیەکی زۆر بەگفتی تورک هەڵخەڵەتا، بەهاندانی ئەوان مار شەمعونی رابەری ئاشورییەکانی کوشت، ئەو کارەی بووە پەڵەیەکی رەش لەناو تۆماری مێژووی نەتەوەی کوردا.** بەڵام شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران و رەفتاری بێ ئەندازە دڕندانەی کەمالییەکانی لەگەڵ رابەرانی کوردی باکووردا هەموو ئەو کوردانەی وەخەبەر هێنا کە تورک دەستخەڕۆی کردبوون. حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥ بڕیاری خنکاندنی شێخ سەعیدی پیران و دوکتۆر فوئادو نزیکەی پەنجا نیشتمانپەروەری دڵسۆزی تری کوردی باکوور دەرچوو. ئەم هەواڵە بەجارێک ناخی دەروونی هەموو کوردێکی دڵسۆزی هەژاند، کوردی بەغدا رۆژی

بیستوشەشی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥ کۆبوونەوەیەکی گەورەیان لە پارکی مۆد ساز کردو بروسکەی نارەزایی خۆیان دایە کۆمەڵەی نەتەوەکان و گشت دەوڵەتە گەورەکان.

وا دیارە ئەم بەسەرهاتە دڵتەزێنانە سمکۆیان بە جارێک شێتگیر کردووە، پاڵیان پێوەی ناوە بەرانبەری تورک بە هەڵویستی خۆیدا بچێتەوە. سمکۆ زوو دەبزوا، زوو بڕیاری دەداو دەستوبرد ئەوەی دەکرد کە بەڕاستی دەزانی و پێی دەکرا. لەو کاتەدا لەناو هەمووناندا دووربینی بابەکر ئاغای پشدەریی دێتەوە یاد، یەکسەر نامەیەکی تایبەتی بۆ ئەوو، لە ڕێگەی ئەوەوە ژمارەیەک نامەی تر بۆ رابەرانی کورد بە ڕەشید جەودەتدا دەنێرێت. سمکۆ زۆر بڕوای بە ڕەشید جەودەتی برای مەحموود جەودەت بوو، دەیزانی کورد پەروەرێکی بێ غەل و غەشە بۆیەکا ئەوی بۆ ئەو کارە هەڵبژاردووە. ڕەشید جەودەتیش، کە دەرچووی فێرگەی سەربازیی عوسمانی بوو، بڕوای تەواوی بە کوردایەتی سمکۆ بوو، لەبەر ئەوە ماوەیەک بوو لەگەڵ فوئاد مەستیی برای تۆفیق وەهبیدا دابوویە پاڵ ئەو تا مرد ڕەشید جەودەت بەڕێزەوە ناوی سمکۆی دەهێنا، کوڕە گەورەکەی خۆی بە ناوی خەسرەوی کوڕی ئەوەوە ناونا.

ئینگلیزەکان وێنەی ئەو نامەیەیان دەستکەوتووە کە ڕۆژی بیستوشەشی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٥ سمکۆ ناردوویە بۆ بابەکر ئاغای پشدەری، واتا لەو ڕۆژانەدا کە لە دیاربەکر بڕیاری خنکاندنی شێخ سەعیدی پیران و هاوەڵەکانی دەردەچێت. ئینگلیزەکان یەکسەر نامەکەی سمکۆ دەکەنە ئینگلیزی و وێنەی لێ دەنێرنە لەندەن و بەغدا. دانەیەک لەو نامەیە بەئینگلیزی لەناو فایلی ژمارە (١١/١٦/٦/٥) لە ئەرشیفی وەزارەتی کاروباری ناوخۆی ڕۆژگاری پاشاییدا لە بەغدا هەڵگیراوە. بەئینگلیزی لەسەر ئەو فایلە نووسراوە **«کەسایەتییەکان سمکۆ»**. ئەمەیش دەقی وەرگێڕدراوی ئەو نامەیەیە کە خۆی لە خۆیدا بەڵگەنامەیەکی مێژوویی بایەخداری پڕ لەدەرس و پەندە.

**«سۆمای**

**٢٦ی حوزەیرانی ١٩٢٥**

**بۆ بابەکر ئاغا**



سمکۆ و سوارەکانی
خۆی لەگەڵ شەش کەسەکەی پێشەوەیانە

برای بەڕێزم

پتر لە جارێک باسی دروستی و تێگەیشتنی خۆمم کردووە دەربارەی ئەو سیاسەتەی ئێوە چەند ساڵێکە لە پێناوی بەرژەوەندی و بەرەوپێشچوونی نەتەوەکەماندا پەیڕەوی دەکەن. ڕەفتاری دڵڕەق و دڕندەی تورک لەگەڵ گەلەکەماندا، تایبەت لەم چەند مانگەی ڕابوردوودا، لەوانەی گەیاندین کە باوەڕمان پێ یان بوو، لەوە دڵنیام لەمەودوا لەسەر ڕێبازی خۆت سوورتر دەبیت و کۆششێکی زۆر بۆ ڕزگارکردنی نەتەوەکەمان دەکەیت. تورکەکان هەمیشە نەیارمان بوون، ئەویش نەک تەنها لەبەر ئەوەی بڕیاریان داوە نەتەوەکەمان قڕ بکەن، بەڵکو لەبەر ئەوەیش کە بەتەواوەتی دەسبەرداری ئیسلام بوون و تەختوتاراجی خەلافەتیان هەڵتەکاندووە. نامەی نەصیحەتم بۆ ژمارەیەک لە هاوڕێ هەڵخەڵەتاوەکانمان نووسیوە، ئەوانەی باوەڕیان بەتورکەو تائێستەش هەر خزمەتی دوژمنی باوەکوشتەی ئاین و نەتەوەکەمان دەکەن. ڕەشید جەودەت ئەفەندی ئەو نامانەتان بۆ دەهێنێت، ئێوەش بۆیانی ڕەوانە بکەن، ئەو نامانە سەرنجیان بۆ ئەو ڕاستیهانە ڕادەکێشن کە بۆمان شیکردوونەتەوە. لەسەر تۆیش پێویستە لە مەودوا خۆتیانی لێوە نزیک بکەیتەوەو

**وایان لێ بکەیت لە دیوی ناوەوەی ئەو سیاسەتە تێبگەن کە تۆ پەیڕەوی دەکەیت، بەوجۆرەش ئێوەو ئەوان دەتوانن بەرەیەکی گەورەی ئەوتۆ پێکبهێن کە ببێتە پاڵپشتمان بۆ سەندنی تۆڵەی شەهیدەکانمان و ئەوانەی خۆبەخت دەکەن. من تەواو لەگەڵ سیاسەتی تۆ دام، چونکە ئەو ڕێگە دروستەی تێدا وەدی دەکەم کە بۆی هەیە بمانگەیەنێتە رزگاری گەلەکەمان. رەشید جەودەت ئەفەندی بە دوورودرێژی باسی دەرندەیی تورکەکانت بەرانبەر بە کورد پێ رادەگەیەنێت. لەگەڵ ڕێزی زۆرم، هیوای سەرکەوتنت لە قوڵایی دڵەوە بۆ دەخوازم. ئیمزا سمکۆ».**

هەڵبەت بایەخی مێژوویی و سیاسیی ناوەڕۆکی ئەم نامەیە لە زۆر شتدا خۆ دەنوێنێت کە دەرککردنیان کارێکی ئاسانە، لەسەرو هەموویشیانەوە گەورەیی و دڵسۆزی سمکۆ و هاوچارەنووسیی نەتەوەی کورد بە ئاشکرا خۆدەنوێنن.

بابەتی شەشەم*

# کورد لە دروشمی
# رژێمی پاشاییدا

لە سەرەتای سییەکانەوە ئەوە ئاشکرابوو کە عیراق لە ماوەی دوو ساڵدا سەربەخۆیی سیاسی وەردەگرێ و دەبێتە ئەندامی **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»** (عصبة الامم)، ئەو ئاواتەی عیراقییەکان لەسەرەتای بیستەکانەوە بێ وچان خەباتیان بۆ جێبەجێ کردنی دەکرد.

لەبەر ئەوە دەبوو دروشمێکی تایبەتی بۆ دەوڵەتی عیراقی سەربەخۆ دابنرێ. دانانی ئەو دروشمە کەوتە ئەستۆی پەرلەمان. لەبەر گەلێک هۆ شوێنی تایبەتی بۆ گەلی کوردی عیراق لەو دروشمەدا تەرخانکرا:

**یەکەم:** ئینگلیز ئەو کارەیان بەپێویست دەزانی، بەرژەوەندیی ئەوان لەوەدابوو جۆرە تەباییەک لە نێوانی کوردو عەرەبی عیراقدا هەبێ، لێرەدا نابێ باری سەرنجی ژیاریی و تاقیکردنەوە زۆرەکانی ئەوان وەبەرچاو نەگرین. لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەوسای عیراق و بەریتانیادا شتی سەیر لەم بارەیەوە وەبەرچاو دەکەوێت. وێنەی نامەیەکی نهێنیی دەگمەنی سێر هێنری دۆبسی نوێنەری باڵا **(المندوب السامی)**م لایە کە رۆژی هەژدەی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٦ دەربارەی کورد ناردوویە بۆ مەلیک فەیسەڵی یەکەم. ئەو نامەیە حەوت لاپەڕەی قەوارە گەورەیە، لای راستی دەقی نامەکە بە ئینگلیزی و لای چەپی بریتییە لە

---

(*) لە ژمارە (١١٠)ی رێکەوتی چواردەی مارتی ١٩٩٨ی گۆڤاری **«رەنگین»**دا بلاوکراوەتەوە.

وەرگێڕانی ناوەرۆکی نامەکە بە زمانی عەرەبی لەو نامەیەدا دۆبس چەند پێشنیارێکی خستۆتە بەردەم **«خاوەن شکۆ»** چونکە ئەو دەتوانێ، وەک دەڵێ، **رۆڵێکی گەورە لە راگرتنی دڵی کوردا ببینێ و بەو جۆرە ببێتە هۆی پتەوکردنی یەکێتی کوردو عەرەب،** هەروەک چۆن کاتی خۆی مەلیکەی بەریتانیا ڤیکتۆریا **«بووە فاکتەری سەرەکیی پتەوکردنی بناغەی یەکێتی نێوان هەردوو گەلی ئینگلیزو سکۆچ»** لە وڵاتەکەیدا. بەو بۆنەیەوە دۆبس لە نامەکەیدا داوای لە مەلیک فەیسەڵ کردووە لە بەغدای پایتەخت کۆمەڵێکی تایبەتی دابمەزرێنێ بۆ پەرەپێدانی دۆستایەتی نێوان کوردو عەرەب و دوو لقی بۆ بکاتەوە، **یەکێکیان لە موسڵ و ئەوی تریان لە کەرکووک.** هەروەها داوای لێکردووە بە زاری خۆی ئەوە رابگەیەنێ کە دوو ئەستێرەکەی ناو ئاڵای عیراق **«رەمزی یەکێتی هەردووک گەلی برای عەرەب و کوردن».** ئینجا پێشنیاری کردووە مەلیک فەیسەڵ هەموو ساڵێک **گەرمای هاوین لە شەقڵاوە لە ناو کوردا بەرێتە سەرو هەوڵبدات فێری زمانی کوردی بێ و بەتالیۆنێکی تایبەتی بە جلوبەرگی کوردییەوە بخاتە سەر حەرەسی کۆشک.**

**دووەم:** لەناو فەرمانڕەوایانی ئەوسای عیراقدا پیاوی عاقڵ هەبوون کە لەگەڵ کوردا زۆر توندڕەو نەبوون، مەلیک فەیسەڵ بۆخۆی **یەکێک بوو لەو کەسانەی بەچاوی گەلێکی سەربەخۆ سەیری کوردیان دەکرد،** ئەو پێی چاک بوو کێشەی کورد بە ئاشتی لەناو سنووری عیراقدا حەل بکرێ و چەند مافێکی سەرەتایی رەوای کورد بۆ ئەو مەبەستە جێبەجێ بکرێن.

**سێیەم:** لە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکانەوە بزووتنەوەی کوردایەتی بەتەوژمێکی نوێ و گڕوتینێکی زۆرەوە خۆی لە گۆڕەپانی ژیانی سیاسیی رۆژانەی وڵاتدا نواند، شێخ مەحمود هاتەوە کۆڕی خەبات، شێخ ئەحمەد کەوتبووە خۆ، رووناکبیرانی کورد دەستیان دابووە دامەزراندنی کۆمەڵەو رێکخراوی تایبەتیی خۆیان و بەشێوازێکی نوێ خەباتیان بۆ جێبەجێ کردنی داواکانی کورد دەکرد، سەردارانی کورد دەیان نامەو بروسکەی تایبەتییان دایە **«کۆمەڵەی نەتەوەکان»**.

لەو بارودۆخە ناسکەدا نەدەبوو کورد وەلانرێ، ئەو راستییەی لە چەند بوارێکدا خۆی نواند کە بوونی کورد لە دروشمی رژێمی پاشاییدا یەکێکیان بوو.



دوای ئەوەی ئەو لایەنانەی دانانی پرۆژەی یاسایەکی تایبەتی وێنەی دروشمی داهاتووی عیراقیان پێ سپێردرابوو لە کاری خۆیان بوونەوە مەسەلەکە لەلایەن **«لیژنەی کاروباری کارگێڕی سیاسی»**یەوە سێ جار خرایە بەردەم ئەنجوومەنی نوێنەران **(مجلس النواب)** بۆ وتووێژو لێکۆڵینەوە دەربارەی. بەپێی دەستوور دەبوو ئەنجومەنی نوێنەران لە سێ کۆبوونەوەی خۆیدا بە وردی لە پرۆژەی هەر یاسایەک بکۆڵێتەوەو دەنگی لەسەر بدات، گەر لە هەرسێ کۆبوونەوەکەدا پەسندکرا ئەوسا دەبووە یاساو دەنێررایە ئەنجومەنی پیران **(مجلس الاعیان)**و دوای ئەویش مەلیک مۆری دەکرد.

پرۆژەی یاسای دروشمی دەوڵەتی عیراق لە پێنج بەند پێکهاتووە، بەندی دووەمیان بۆ ناوەرۆکی سەرەکیی ئەو یاسایە تەرخانکراوە، لەوێدا هەرچی

پەیوەندیی بەوێنەی دروشمەکەوەو مەبەستەکانییەوە هەیە نیشاندراوە. لەو بەندەدا ناوی کورد بەم جۆرە هاتووە:

**«... لای سەرەوەی (دروشمەکەی بریتییە لە) تاجی عیراق کە لەسەر دوو ئەستێرەی حەوت گۆشەی رازاوە بەرەنگەکانی ئاڵای عیراق وەک نیشانەی هەردووک رەگەزی عەرەب و کورد وەستاوە».**

ئەنجومەنی نوێنەران لە سێ دانیشتنی خۆیدا لە پرۆژەی یاسای دروشمی دەوڵەتی عیراق کۆڵییەوە، ئەوساکە جەعفەر عەسکەری سەرۆکی ئەنجومەن بوو. دیسان نەتەوە پەرستە توندڕەوەکان ویستیان تەگەرە بخەنە بەردەم ئەو بەشەی یاساکە کە پەیوەندی بەکوردەوە هەبوو، بەتایبەتی لەکاتی خوێندنەوەی دووەمی پرۆژەکەیدا. ئەنجومەنی نوێنەران کۆبوونەوەی رۆژی دووشەممەی یەکی کانوونی یەکەمی ١٩٣٠ی خۆی بۆ دووەم خوێندنەوەو لێدوانی پرۆژەی ئەو یاسایە تەرخانکرد، نوری سەعید کە ئەو سا لە ئەنجوومەندا نوێنەری بەغداو هەمان کات سەرەک وەزیران بوو ئامادەی کۆبوونەوەی ئەو رۆژەی ئەنجومەن بوو. لەو دانیشتنەدا پێنج نوێنەرو نوری سەعید وەک سەرەک وەزیران و عەبدوڵڵا دەملوجی وەک وەزیری هەندەران قسەیان کرد. چوار لەو نوێنەرانەی قسەیان وەرگرت - مەعروف رەسافیی نوێنەری عەمارەو ئەحمەد جەلیلی نوێنەری موسڵ و سابیت عەبدلنوری دیسان نوێنەری موسڵ و زامل مەنناعی نوێنەری مونتەفیک - هەریەکەیان بە بیانوویەکەوە دژی ئەو بەشەی پرۆژەی یاساکە وەستان کە باسی کوردی تێدا هاتبوو. ئەحمەد جەلیلی و مەعروف رەسافی لە هەمووان توندڕەوتربوون، یەکەمیان چەند جارێک قسەی وەرگرت، **جەنابی رەسافیش کە بۆ خۆی بەرەگەز کوردەو هەموو بەشۆڕشگێڕو پێشکەوتنخوازیان دادەنا، داوای کرد ئەو بەشەی پرۆژەکە بەجارێک لابرێت.**

سەیر ئەوەیە هیچ کامێک لە نوێنەرانی کورد لەو خولەی ئەنجوومەندا لەو توندڕەوانە نەهاتنە دەنگ، هەموویان نقەیان لە خۆیان بڕیبوو هەرچەندە هیچ نەبێ دەیانتوانی بڵێن باسی کورد لە یاسای دروشمی وڵاتدا بۆی هەیە یەکێتی نیشتمانی و برایەتی عەرەب و کوردو هاوچارەنووسییان پێوە بکات.

بۆ مێژوو ناوی نوێنەرانی کورد لەو خولەی ئەنجومەندا تۆمار دەکەم کە ئەمانە




بوون:

**ئیبراهیم یوسف و داود حەیدەری و سەلاح بابان و جەمال بابان و ئەحمەد موختار بابان و عەلی دۆغرەمەچی و شێخ حەبیبی تاڵەبانی و مەعروف داود و ئەحمەد ساڵح و حەمە ساڵح بەگی حەمە عەلی بەگ و سەیفوڵڵا خەندانی حزمی شەریف پاشای بەناوبانگ و سلێمان فەتاح و غیاسەدینی نەقشبەندی کە ژمارەیان بەسەریەکەوە دەکاتە سیازدە، ژمارەی سەرجەمی نوێنەرانی عیراق ئەوساکە ٨٤ کەس بوو.**

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو توندڕەوانە کە کەمینەیەکی بەهات و هاوار بوون هیچیان بۆ نەچووە سەر، لە هەرسێک دانیشتنەکەی ئەنجوومەندا زۆرینەی هەرە زۆری نوێنەران دەنگیان بۆ گشت بەندەکانی پرۆژەی یاسای دروشمی دەوڵەتی عیراقدا.

دوا خوێندنەوەی پرۆژەکە بەر کۆبوونەوەی رۆژی پێنج شەممەی چواری کانوونی

یەکەمی ساڵی ۱۹۳۰ کەوت. لە کۆبوونەوەی ئەو ڕۆژەدا کەس قسەی نەکردو بەو جۆرە پڕۆژەکە بووە یاساو نێردرایە ئەنجومەنی پیران، لەوێش یاساکە بێ تەگەرە تێپەڕی و دوای ئەوەی مەلیک فەیسەڵی یەکەمیش مۆریکرد لە **«الوقائع العراقية»**دا بڵاوکرایەوەو بووە یەکێک لە یاساکانی ڕژێمی پاشایی و نموونەیەکی چاک بۆ دەربڕینی هاوبەشی یاسایی کورد و عەرەب لەم وڵاتەدا.

(بۆ درێژەی وتووێژو لێدوانی ئەنجومەنی نوێنەران و فەرمایشتی توندڕەوەکان دەربارەی پڕۆژەی یاسای دروشمی دەوڵەتی عیراق بڕوانە: **«الحكومة العراقية. محاضر مجلس النواب. الدورة الانتخابية الثالثة. اجتماع سنة ۱۹۳۰»**، بغداد، طبعت ملحقة بجريدة الوقائع العراقية، ص۱۳۷-۱۳۹ ،۱٤۱-۱٤۲).

**تێبینی:**

هەردوو دروشمی پاشایی و کۆماری بەهۆی برادەران زیوەر ئەحمەد خاوەنی کتێبخانەی زانستی و کەریم چۆلی خاوەنی کتێبخانەی چرا دەست کەوتوون.

بابەتی حەوتەم*

# حاجۆ ئاغای هەڤیرکی
# سەربازێکی ونی ڕاپەڕینی ئاراراتە

ڕاپەڕینی ١٩٢٧-١٩٣١ لە کوردستانی تورکیا کە زۆر جاران بە ڕاپەڕینی ئارارات و ئاگری داغیش ناودەبرێت، لاپەڕەیەکی بایەخدارە لە مێژووی هاوچەرخی گەلی کورددا، تایبەت چونکە ڕێکخراوێکی لێهاتووی وەک **«خۆیبوون»**و ڕووناکبیرێکی بەجەرگی وەک جەنەراڵ ئیحسان نوری پاشا[١] ڕابەرییان دەکرد. ئەوە بۆ خۆی وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە ڕەوتی خەباتی ڕزگاریخوازی کوردی تورکیادا.

تا ئێستە شتێکێ ئەوتۆ دەربارەی ئەو ڕاپەڕینە نەنووسراوە[٢]، هەرچەندە ئەگەر بە وردی بە دووی ڕووداوەکانیدا بگەڕێین و سەرچاوە ڕەسەنەکانی وەدەستبهێنین

---

(*) لە ژمارە (١٤١)ی ساڵی ١٩٩٨ی گۆڤاری **«ڕۆشنبیری نوێ»**دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) ئیحسان نوری ساڵی ١٨٩٣ لە شاری بتلیسی **«مەڵبەندی شێرەپیاوانی کورد»** لە دایک بووە، ساڵی ١٩١٠ کۆلێجی سەربازی لە ئەستەموڵ تەواوکردووە، لە دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمەوە خۆی بۆ کوردایەتی تەرخان دەکات، دوای ئەوەی چل و شەش ساڵی ژیانی بە دەربەدەری بردە سەر ساڵی ١٩٧٦ کۆچی دوایی کرد. دەربارەی پوختەی ژیانی بڕوانە: **ئیحسان نوری بتلیسی، شۆڕشی نەتەوەیی کورد لە تورکیا، وەرگێڕانی م. جەمیل ڕۆژبەیانی، بەغداد، ١٩٩٣، ل٤-٨.**

(٢) ژمارەیەک لە نووسەرانی کوردو بیانی وەک نوری دەرسیمی و ئاسرەتیان و سافرستیان بە گشتی دەرسی چەند لایەنێکی ڕاپەڕینی ئاراراتیان کردووە، بەڵام لێکۆڵینەوەی ئەو ڕاپەڕینە، وەک زۆربەی ڕاپەڕین و بزووتنەوەکانی تری کورد، هێشتا زۆری پێ دەوێت.

ئەوساکە دەتوانین چەند کتێبێکی گەورەی لەسەر دابنێین. ئەوەندەی من ئاگادارم بە صەدان و صەدان بەڵگەنامەی نهێنی بەریتانی پڕ لە زانیاریی دەگمەن و بایەخدار لەسەر ئەو ڕاپەڕینە هەیە، بە صەدان جاریش ناوی لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە عەرەبی و ئینگلیزییەکان هاتووە. هەڵبەت بەو ڕادەیەو، رەنگبی زیاتریش، تورک و سۆڤیەت و فەرەنسییەکان بایەخیان پێی داوە.

داستانەکانی ڕاپەڕینی ئارارات زۆرن، سەرهەڵدانەوەی کوردی تورکیا دوای ئەوەی کەمالییەکان ڕاپەڕینە گەورەکەی شێخ سەعیدی پیرانیان لە گۆماوی خوێندا نقوم کرد، بۆ خۆی داستانێکی مێژوویی گەورەی پڕ لە شانازییە، چونکە کەس چاوەڕوانی ئەوە نەبوو دوای تەنها پێنج ساڵ لەو گورزە جەرگبڕەی تورکەکان لە کوردیان وەشاند دیسان لە کوردستانی تورکیادا ڕاپەڕینێکی وا بەرفراوان و ڕێکخراوتر لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٢٥ بەرپا بێت.

یەکێک لە لاپەڕە ونەکانی ئارارات ڕۆڵی حاجۆ ئاغای هەڤێرکییە لەو ڕاپەڕینەدا. ئینگلیزەکان لە ڕاپۆرتە نهێنییەکانی خۆیاندا دەیان جار باسی ئەو ڕۆڵەی بەرچاوەی حاجۆ ئاغایان کردووە کە ئێمەی کورد تا ئێستە هیچ دەربارەی نازانین. تەنها لەناو یەکێک لە فایلەکانی وەزارەتی فڕۆکەوانی بەریتانیادا نزیکەی پەنجا جار ناوی ئەو زاتەو کوڕەکانی و هۆزی هەڤێرکی هاتووە[٣].

حاجۆ ئاغا سەردارێکی ناسراوی هۆزی هەڤێرکییە کە بە هەوێرکانیش ناودەبرێ و یەکێکە لە هۆزەکانی ناوچەی تورعابدینی کوردستانی تورکیا. حاجۆ ئاغاو بەشێکی زۆر لە ئەندامانی هۆزەکەی لە ژێر فشاری تورکەکاندا ناچار بوون پەنا بەرنە بەر سووریا، لێرە لە ناوچەی توربا سپی **(قبور البيض)**ی سەر بە قامیشلی نیشتەجێ بوون.

لە هەرەتی لاوییەوە حاجو ئاغا تێکەڵ بە بزووتنەوەی کوردایەتی بووە. ئەو یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی **«خۆیبوون»**و دوایی بووە یەکێک لە ڕابەرە هەرە چالاک و دڵسۆزەکانی، خۆی و کوڕو براو پیاوەکانی گەلێک کاری بایەخداری ئەو ڕێکخراوەیان ڕاپەڕاند. حاجۆ ئاغا سێیەم ناوی ئەو هەشت ڕابەرەی خۆیبوونە کە

(3) Public Record Office, AIR 23/243, Part IV, X/M 04583.



**وێنەی دەستەیەک لە رابەرو بەشدارو لایەنگرانی راپەڕینە گەورەکەی شێخ سەعیدی پیرانە. ئەویانەیان کە لە ناوەڕاستدا، لە پشتی پشتەوە وەستاوەو ژمارەی (١)ی لەسەر دانراوە دکتۆر کامەران عالی بەدرخانە، ئەویانەشیان کە لە پێشییەوە وەستاوە جەلادەت بەدرخانی برایەتی، هەرچی ئەوەشیانە کە لە ریزی پێشەوە، لە ناوەڕاستدا دانیشتووە خەلیل رامی بەدرخانی مامیانە، جل کوردییەکەی تەنیشتی حاجۆ ئاغایەو ئەوی تریان کە لای دەستی راستی خەلیل رامی بەدرخانەوە دانیشتووە قەدری جەمیل پاشایە. مەمدوح سەلیم لە پشت حاجۆ ئاغاوەو لە تەنیشت جەلادەت بەدرخانەوە وەستاوە.**

ڕێکەوتننامەیەکی تایبەتییان لەگەڵ ڤاهان پاپازیانی نوێنەری ڕێکخراوی بەناوبانگی «**داشناک**»ی ئەرمەنەکاندا مۆر کردووە، ئەمانەش بە ڕیز ناوەکانن وەک لە ناو بەڵگەنامەیەکی فەرنسیدا تۆمارکراون: شێخ عەلی ڕەزا ئەفەندی پاڵو، مستەفا شاهین بەگی بەرازی، حاجۆ ئاغای هەڤێرکی، ئەمین ئاغای سەرەک هۆزی ڕامان، کەریم ڕۆستەمی خەڵکی سلێمانی، مەمدوح سەلیم، جەلادەت عالی بەدرخان، دوکتۆر شوکری سەگبان[٤].

(٤) بەهەشتی شەهید دوکتۆر صادقی شەرەفکەندی، سکرتێری گشتیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران مارتی ساڵی ١٩٨٧ ئەو بەڵگەنامەیەی بۆ ناردم.

(٥) ئەو وێنەیەی حاجۆ ئاغا کە لەگەڵ ئەم وتارەدا بڵاوکراوەتەوە لە ئەلبومی تایبەتیی بەرێز سینەم

**حاجۆ ئاغای هەڤێرکی لای گشت نیشتمانپەروەرانی کوردی ڕۆژگاری خۆی و عەرەبی ناوچەی قامیشلی ڕێزدارو گەلێک خۆشەویست بوو، لەگەڵ جەلادەت بەدرخاندا وەک برا وابوون[٥]. دەڵێن پیاوێکی یەکجار جوامێرو بەخشندە، دەرگەی ماڵی بۆ هەمووان ئاواڵە بوو.**

حاجۆ ئاغای هەڤێرکی لە سەرەتای کارەوە بە گورجی بە بەرپاکردنی ئاگری ڕاپەڕینی ئاراراتەوە خەریک بوو، واتە لە دەوروبەری کۆتایی ساڵی ١٩٢٧وە، کاتێک نەتەوەپەرستانی کوردی باکوور بە وردی نەخشەیان بۆی کێشاو لە ناوچە هەرە سەختەکانی کوردستانی تورکیادا جەنگی چەتەگەری سەری هەڵدایەوە. ڕاپۆرتێکی بەریتانی بەر لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٩ باسی جموجۆڵی هەشتا دەستەی چەتەگەری تەنها ناوچەی جزیرو شەرناخی بۆ تۆمارکردووین. سەرەتای ئەو بەڵگەنامەیە بە ناوی حاجۆ ئاغای هەڤێرکی و ڕەسووڵ محەمەد ئاغای سەرۆکی هۆزی جیلان دەست پێ دەکات کە هەردووکیان دەوری بالایان لە ڕێکخستنی ئەو دەستە چەتەگەرانەی جزیرو شەرناخدا هەبووە[٦]. شایانی باسە سەرجەمی بەڵگەنامە بەریتانییەکانی ناو ئەو فایلە بە ناوی کوردستانی ڕۆژئاواوە باسی ئەو ناوچانەی کوردستانی تورکیایان کردووە.

تا ساڵی ١٩٣٠ ڕاپەڕینی ئارارات دەگاتە لقەپۆپە، شۆڕشگێرانی کورد دەست بەسەر ناوچەیەکی بەرفراواندا دەگرن، چیای سەختی ئارارات دەکەنە بنکەو لەوێ ئالای خۆیان هەڵدەکەن و ڕۆژنامەی **«ئاگری»** بلاودەکەنەوە. لەوساوە حاجۆ ئاغای هەڤێرکیش بە جارێک خۆی بۆ خزمەتی ئارارات تەرخان دەکات، زۆر لە نزیکەوە هاریکاریی بەدرخانییەکان و کوڕانی جەمیل پاشاو کوڕانی ئیبراهیم پاشای میللی و ڕەسوڵ محەمەد ئاغای جیلانی دەکات. لەگەڵ ئەوان و چەند ڕابەرێکی تری

---

خانی جەلادەت بەدرخان وەرگیراوە.

«ئەو وێنەیەمان لە ژمارە (١١٥٧)ی ڕۆژی ١/٣/ ١٩٩٠ی ڕۆژنامەی هاوکاری وەرکرتووە، کە لەگەڵ بەشی سێیەمی **«وتارێکی بێ ناونیشان»**ی د. کەمال مەزهەر بلاوکراوەتەوە - **عەبدوڵلا زەنگەنە**».

(6) AIR 23/243, Part IV,X/M 04583,Special Service Officer, Mosul, No.49/M/I, Dated 7.12.1929, Western Knrdistan, Bands of brigands in Jezireh Shemakh area.

(7) Ibid, Secret, Reference: I/M/13, August 11th 1930, Subject: Kurdish Situation in Western Knrdistan.



قەدری جەمیل پاشا، هەمزە بەگی موکسی، ئەکرەم جەمیل پاشا، حاجۆ ئاغا هەویرکان

کوردی سوریاو ژمارەیەک ئەفسەری کوردی هەڵهاتوو لە لەشکری تورکیا لە ناوچەی حەسەکە سەرەتای ئابی ساڵی ۱۹۳۰ کۆبونەوەیەکی تایبەتی ساز دەکەن و پلانی یاریدەدانی شۆڕشگێرانی ئارارات دادەنێن. حاجۆ ئاغای هەڤێرکی یەکەم ناوە لەناو ئەو لیستە تایبەتییەدا کە ئینگلیزەکان دەربارەی ئەو کۆبوونەوەیە دایانناوە[۷].

حاجۆ ئاغا بەر لەهەموان، بە ئەوپەڕی چاونەترسییەوە دەکەوێتە جێ بەجێ کردنی بڕیارەکانی ئەو کۆبوونەوەیەو گشت فەرمان و بڕیارەکانی تری **«خۆیبوون»**، ژیانی خۆی و کوڕەکانی و سەروەت و سامانی بۆ ئارارات تەرخان دەکات، پێوەندی

به رابەرە ناسراوەکانی کوردەوە دەکات، بە نامەی تایبەتی داوایان لێ دەکات بدەنە پاڵ شۆڕشگێڕانی ئارارات، یا هیچ نەبێت پشتگیریان لێ بکەن. ئینگلیزەکان لە راپۆرتە تایبەتییەکانی خۆیاندا باسی دوو نامەی لەو بابەتە دەکەن، **یەکەمیان نامەیەکە ناردوویە بۆ شێخ ئەحمەد لە کوردستانی باشوور، ئەوی تریشیان نامەیەکە ناردوویە بۆ ئاغایانی میدیات لە کوردستانی باکوور**[8].

کار بە نامەو نامەکارییەوە ناوەستێ، شەوی حەوتی ئابی ساڵی ۱۹۳۰ حاجۆ ئاغای هەڤێرکی و سیان لە کوڕەکانی - حەسەن و چەچان و جەمیل، **لەتەک پەنجا** سوارەو دوو صەد پیادەی هەڤێرکی[9]و صەد چەکداری هۆزی جیلان بە سەرۆکایەتی رەسوڵ ئاغاو عەگید ئاغا لە ئاستی ئەزنیردا سنووری نێوان سوریەو تورکیا دەبڕن. حاجۆ ئاغا لەوێوە دەچێتە ناوچەی چیای توورو لەگەڵ سەرحان[10] ئاغای مامیدا کۆدەبێتەوەو دیسان دەگەڕێتەوە ناو خاکی سوریا[11].

ئەم چالاکییانەی حاجۆ ئاغای هەڤێرکی کاربەدەستانی تورکیا دەوروژێنن و داوا لە فەرەنسییەکان دەکەن، کە ئەوسا سوریەیان بە دەستەوە بوو، دەستوبرد رادەیەکیان بۆ دابنێن. **فەرەنسییەکان بە دەنگیانەوە دێن و حاجۆ ئاغاو دەستەیەک لە نیشتمانپەروەرانی کوردی سوریا لە ناوچەی سنوور دوور دەخەنەوە، سەرەتا خۆی و کوڕەکانی بە دەسبەسەری دەبەنە بێروت، هاوڕێکانیشی بە سەر دیمەشق و دێرەزووردا دابەش دەکەن و دەکەونە سۆراخی جم و جۆڵی ئەندامانی هۆزی میللی لە ناوچەکانی سنووردا.** لە نەوەی حاجۆ ئاغا تەنها نایفی کوڕی لەناو شۆڕشدا دەمێنێتەوە، ئەویش کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۳۰ بە یەخسیری دەکەوێتە دەست تورکەکان و

---

(8) Ibid, Reference: I/M/13A, August 8th and 24th 1930.

(۹) بەشێک لە راپۆرتەکان ژمارەی ئەوانەی لەگەڵ حاجۆ ئاغادا سنووریان بڕیوە بە دووصەد کەس نەک دووصەدو پەنجاو سێی ئابیش نەک حەوتی ئاب بە رۆژی پەڕینەوەیان دادەنێن.

(۱۰) بەشێک لە راپۆرتەکان بە سۆران ئاغاو سۆران بەگ ناوی دەبەن.

(11) AIR 23/243, Part IV, X/M 0458, Secret, S.S.O. Mosul, Reference: I/M/13A, Dated August 11th and 9th September 1930, Subject: Kurdish Situation in Western Kurditan.

(12) Ibid, Translation, No. 24/549, Dated 31-8-1930, To the Caimaqam, Tel-Afar Qadha, Subject: Syrian Frontier; Extract From S.S.O. Mosul, Report



ئیحسان نوری پاشاو ژنەکەی

لەدیاریەکر لە سێدارەی دەدەن[١٢].

بێ گومان ئەمەی لەم وتارەدا باسمان کرد بەشێکە لە ڕۆڵی حاجۆ ئاغای هەڤێرکی لە ڕاپەڕینی ئاراراتدا، هیوادارم دەستی مێژوونووسانی کورد بگاتە لاپەڕە ونەکانی تری مێژووی خەباتی شکۆداری ئەو نیشتمانپەروەرەمان.

**ڕاپەڕینی ئاراراتیش، وەک سەرجەم بزووتنەوەکانی تری کورد لە پیلان و توانج ڕزگاری نەبووە، تورکەکان دەیانگوت ئارارات دەستێژی ئینگلیزەو خەریک بوو بە زۆری زۆردارەکی لۆرانسی بەناوبانگ لە عەرەب بسەننەوەو بیکەنە لۆرانسی کورد،** گوایە ئەو زاتە کوردی هەلفریواندووەو دژی تورک هانی داون، هەرچەندە لۆرانس بە درێژایی ژیانی سەری نەکردووە بە خاکی کوردستانداو وەک دوایی ساغ بووە لە ڕۆژانی ئاراراتدا ئەو سەرقاڵی گوێەنی ئەفغانستان بوو.

ئینگلیزەکانیش پێیان وابوو فەرەنسییەکان دەستیان لە ئاراراتدا هەیە، تەنانەت

سەرەتا بەڵگەنامە تایبەتییەکانیان باسی ئەوەیان دەکرد کە گوایە فەرنسییەکان حاجۆ ئاغای هەڤێرکی دژی تورک هان دەدەن تا لە دواییدا بۆیان ساغ بووە تەواو بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونەوە فەرەنسییەکان ڕێگەیان نەدا حاجۆ ئاغاو هاوبیرانی ئەو دەورە لە ئاراراتدا ببینن کە خۆیان بۆ ئامادەکردبوو، **بەو جۆرەش دەوری فەرەنسییەکان لە یاریدەدانی تورکدا بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی ئارارات لە دەوری شوورەوی کەمتر نەبوو، چۆن ئەوان لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگەی ئەرمەنستانیان لە شۆڕشگێڕانی کورد گرت، ئەمانیش لە باشوورەوە ڕێگەی سوریایان لێ گرتن.** شایانی باسە فەرەنسییەکان هەرچەندە ڕیزیان لە حاجۆ ئاغای هەڤێرکی دەنا، بەڵام لە دڵدا خۆشیان نەدەویست، تایبەت لەبەر ئەوەی بەر لە بەرپابوونی ڕاپەڕینی ئارارات بە چەند ساڵێک ژمارەیەکی لێ کوشتبوون(١٣).

**هەرچۆن بێت تێکدانی ئەو نەخشەیەی حاجۆ ئاغای هەڤێرکی و هاوبیرانی بۆ یاریدەی شۆڕشگێڕانی ئارارات دایانرشتبوو دەچێتە ناو خانەی ئەو هۆکارانەوە کە یاریدەی تورکە کەمالییەکانیان دا بتوانن دیسانەوە بەسەر کوردا زاڵ بێن و ئاراراتیش دابمرکێننەوە،** تایبەت چونکە حاجۆو هاوەڵەکانی دەیانویست لە ڕۆژئاواوە تەنگ بە تورکەکان هەڵبچنن و بەو جۆرە ناچاریان بکەن لە تەوژمی ئەو فشارەیان کەم بکەنەوە کە لە ڕۆژهەڵاتەوە خستبوویانە سەر هێزەکانی جەنەراڵ ئیحسان نوری پاشا. **هەڵبەت چالاکییەکانی حاجۆ ئاغای هەڤێرکی و کوردەکانی تری دەرەوەی تورکیا بەڵگەیەکی تری هاوچارەنووسیی کوردن.**

---

No. I/M/15 of 17-1-1931.

(13) Ibid, Secret, Refernce: I/M/13, S.S.O. Mosul, August 24th 1930, Subject: Kurdish Situation in Western Kurdistan.

**بابەتی یەکەم***

# پاسەوانێکی خەرمانی ئەدەبی کوردی لەناو فایلەکانی وەزارەتی کاروباری ناوخۆدا

## پێشکەشە بە هەڵەوەڕی خۆشەویست[1]

**«قارەمانی سێهەمی مەیدانی شیعر لە بەرەبابی ساحێبقران، پاسەوانی بە خەمی خەرمانی ئەدەب لەم دەورەی دوایی کوردان، دڵبەندی پێزی قسە بە هەموو تینێکەوە، مەفتوون بە فیکری فەلسەفە لە هەموو باس و خواستێکا، تەشبیهپەرست و خەیاڵ دروست لە هەموو کاروبارێکیا»** ـ بەم جۆرە پڕ سۆزە مامۆستا سەجادی دەست بە گێڕانەوەی سەرگوزشتەی ژیان و هەڵسەنگاندنی بەرهەمی کەم وێنەی شاعیری بە دیمەنی گەورەی کورد حەمدی دەکات[2].

حەمدی، کە نازناوی شیعریی ئەحمەدی کوڕی فەتاح بەگی ساحێبقرانە، ساڵی ١٨٧٦ لە سلێمانی لە دایک بووە، هەر لەوێش ساڵی ١٩٣٦ کۆچی دوایی کردووە. **لە بنەماڵەی کوردی و سالمە، لە سەرەتای دروستبوونی دەستەی رووناکبیری نوێی کوردەوە حەمدی لە ریزی پێشەوەی ئەو دەستەیەدا بوو.** وەک کورد

---

(*) لە ژمارە (١٨١)ی گۆڤاری **«بەیان»**ی ساڵی ١٩٩٨، لە ل٣-٥دا بلاوکراوەتەوە.

(١) هەڵەوەڕ نازناوی رووناکبیرێکە کە بەو ناوەوە، لە رێگەی پۆستەوە نامەیەکی گلەیی بۆ ناردووم.*
(*) بڕوانە: بابەتی **«نامەیەک بۆ هەڵەوەڕی بەڕێز»**.

(٢) علاءالدین سجادي، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٧١، ل٤٧٦.

پەرەوەر شەڕی دەربەندی بازیان و ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران و داستانی ئاوباریکی قارەمان و کۆمەڵی زانستی کوردان و نەورۆزو چیاو کێوی کوردستان بوونەتە بەشێکی بەرچاوی زادو هەوێنی شیعرەکانی. حەمدی لەگەڵ خۆی و نەتەوەو نیشتماندا سەرڕاست و دەستخاوێن و دووربین بوو، بۆیەکا، بە وێنە، کەی بەپێویستی زانیوە ڕەخنەی توندوتیژی لە شێخ مەحمود گرتووە، کەییش بە ڕاستی زانیوە بەرزترین ئاوازی بۆ گوتووە. ئەو پاسەوانە بە خەمەی خەرمانی ئەدەبی کوردی شێخی ئاوباریکی بەم بەیتەی گەیاندۆتە کەشکەلانی فەلەک:

ڕەببی مووی لێ بێ زوبانی، پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەر کەسێ گوڵشەن بە دەردی کوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

شاکارەکانی حەمدی هەر زوو لەناو ڕووناکبیرانی کوردا دەنگیان دایەوە، بۆیە دوان لە بەپەرۆشە دڵسۆزەکانیان لە ناوەندی سییەکانەوە بۆ یەکەم جار هەوڵی چاپکردنی دیوانەکەیان دا، **یەکەمیان** مەلا نەجمەددینی مەلا غەفورە کە هەر بە نەجمەددین مەلا مەشهوورە، **دووەمیشیان** حوسێن حوزنی موکریانییە کە لەو ساڵانەدا بە خۆی و چاپخانە نیوداشتەکەیەوە لە ڕەواندزەوە کوردستانی ڕووناک دەکردەوە. نەجمەددین مەلا کۆکردنەوەو ئامادەکردنی دیوانەکەی کەوتە ئەستۆ، حوسێن حوزنیش چاپکردنی. ڕاپۆرتنووسە کوردەکان بە نهێنی دەزگاکانی میری لەوە ئاگادار دەکەن کە بەشێک لە بەرهەمەکانی حەمدی بە هەستی کوردایەتی جۆشدراون. دەستوبرد دایەرەی ئەمن، کە ئەوساکە ناوی تەحقیقاتی جینائی بوو، دەکەوێتە خۆو خەفیەکانی دەخاتە گەڕ بۆ سۆراخی ئەو جورمە گەورەیە. تەحقیقاتی جینائی ڕۆژی شەشی مارتی ساڵی ١٩٣٥ یادداشتێکی نهێنی لەم بارەیەوە ئەدا بە وەزارەتی کاروباری ناوخۆ کە ئەمە دەقەکەیەتی:

**«وەک زانیومانە مەلا نەجمەددین، کە خاوەنی کتێبخانەیەکە لە سلێمانی، دیوانی شاعیری بەناوبانگ ئەحمەد بەگی کوڕی فەتاح بەگی دۆزیوەتەوە، لە ناو دیوانەکەدا ئەم باسانە هەیە:**

**١- باسی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود لە کاتی شەڕی ئاوباریکدا..**

| | |
|---|---|
| مدير شرطة لواء اربيل | نرجو الأمر بإجراء التحقيق بصورة سرية |
| مدير شرطة لواء كركوك | وموافاتنا بالنتيجة |

حاوي النسخة الخاصة – اشارة الى كتابنا المرقم ٥٣٢ والمؤرخ ١٠/٨/٨

| عبارات الكردية والمكتوبة المحاذاة | تعريب العبارات الكردية باللغة العربية |
|---|---|
| [illegible] | يا أهالينا نحن رايات النسر |
| [illegible] | اذا لم تلتفتوا الى الدماء [illegible] |
| [illegible] | أولادنا كبيرهم وصغيرهم |
| [illegible] | [illegible] |
| [illegible] | لا ننال الحرية والاستقلال |

٢- باسی بارودۆخی کوردی باکوور(کوردستانی تورکیا )و شێوازی خەباتیان و بیروباوەڕی ڕووناکبیرانیان لە پێناو ئازادیی کوردا.

٣- ژیانی سەختی کورد تا ئیمڕۆکەو زوڵمی دراوسێکانیان.

٤- هەروەها لەوە دەدوێت کە چۆن دەبێت کوردیش فریای خۆیان بکەون تا دووچاری ئەو نەهامەتییە نەیەن کە کوردەکانی باکوور(کوردستانی تورکیا ) لە ڕۆژگاری شۆڕشە بەناوبانگەکەیاندا پێوەی گیرۆدە بوون.

شایانی باسە ناوبراو(واتا نەجمەددین مەلا) بەم زووانە دەست دەکات بە چاپکردنی دیوانەکەو بەو کارەی ئارەزووی دانیشتوان و لاوانی شاری سلێمانی وەدی دێنێت، ئەوانەی هانیان داوە بۆ ئەو کارەو پەیمانیان داوەتێ هەر دانەیەک لەو دیوانەی بە نیو دینار لێ بکڕن. ئیمزا: بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس»[٣].

خوێندنەوەی گشت لایەنەکانی ئەم یادداشتە بۆ هەمووان کارێکی زۆر ئاسانە. لە هەمووی دژوارتر ئەوەیە کە شاعیری کورد نابێت باسی دەردو ئازاری نەتەوەکەی بکات، جا با ئەو دەردو ئازارەش هی کوردەکانی کوردستانی تورکیا بێت کە ڕۆڵی

(٣) ملفات وزارة الداخلية(م.و.د.)، المكتب الخاص، رقم الملف: بلا، موضوع الملف: الحركة الكردية، شعبة ادارة التحقيقات الجنائية المركزية، العدد: ش.خ ١٠٨٢، التأريخ: ٦ آذار ١٩٣٥، الى وزارة الدخلية.


حەمدی ساحێبقران زادە

گـەورەیان لەوەدا بینی ویلایەتی مـووسڵ بدرێتـە پاڵ عـێـراق نەک تورکـیـا. لە یادداشتەکەیدا جەنابی بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس تەنانەت باسی ئەوەش ناکات کە حەمدیی شاعیر دڵسۆزی برایەتی کوردو عەرەبە، هەر ئەوە نا، بەڵکو بە ئەوپەڕی سۆزو تەقدیرەوە باسی **«خاوەن شکۆ فەیسەڵی یەکەمی»** کردووە کە بە بۆنەی تەشریف هێنانیەوە بۆ سلێمانی، بە لای شاعیرەوە، مانگ کەوتۆتە هەڵپەڕکێ و لە خۆشیدا **«وەک ئەختەر»** جریوەی لێ هەڵستاوە تا حەمدی وای لێهاتووە پێی وابێت بەم بۆنەیەوە سلێمانی **«بۆتە جەننەت و مەحشەر»**[٤]. وا دیارە ئەویانە بڤەو ئەمیانەش واجیبە، واجیبیش، بێ گومان، پێزانینی پێ ناوی **«لا شکر علی الواجب»** (!!).

بەڕێز وەزیری کاروباری ناوخۆ هەر ئەو ڕۆژە لە دامێنی یادداشتەکەی بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیسدا فەرمان دەدات پارێزگاری سلێمانی لە ناوەرۆکی ئەو یادداشتە ئاگادار بکرێت. بۆ ڕۆژی داهاتوو دەقی ناوەرۆکی یادداشتەکە لەگەڵ نامەیەکی نهێنیی وەزیری کاروباری ناوخۆ دەنێرن بۆ پارێزگاری سلێمانی. **شایانی باسە لەو ڕۆژانەدا جەمیل مەدفەعی سەرەک وەزیران بوو، چەند جارێک مێژوونووسی شارەزا عەبدولڕەزاق حەسەنی ئەوەی پێ گوتوم کە جەمیل مەدفەعی بە ڕەگەز کوردە، لە**

(٤) بڕوانە: **«دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگ صاحێبقران»**، لە بڵاوکراوەکانی نامەخانەی گەلاوێژ، بەغدا، ١٩٥٧، ل١٢٧-١٢٨.

هەمان وەزارەتدا عەبدولعزیز قەساب وەزیری کاروباری ناوخۆ بوو، بەڵام پاش چەند ڕۆژێک مەدفەعی وازی هێناو یاسین هاشمی کابینەی نوێی دامەزراند کە ڕەشید عالی گەیلانی وەزیری کاروباری ناوخۆ بوو تێیدا، لەوساشەوە ئیتر مەسەلەی بڕیاردانی چاپی دیوانەکەی حەمدی کەوتە ئەستۆی ڕەشید عالی گەیلانی . **ڕەشید عالی هەرچەندە خۆی بە دۆستی کورد لە قەڵەم دەدا، بەڵام لە هەموو ڕوویەکەوە بەرهەڵستی گەشەکردنی ژیانی ڕووناکبیرییانی دەکرد و خوا هەڵناگرێ لەو بووارەدا هیچ درێغییەکی نەکرد.**

هەرچۆن بێت پاش چەند ڕۆژێکی کەم نامەکەی وەزیری کاروباری ناوخۆو دەقی یادداشتەکەی بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس گەیشتنە دەست پارێزگاری سلێمانی. ڕۆژی چواردەی مارتی ١٩٣٥ پارێزگار فەرمانی دا نامەو یادداشتەکە بکرێنە ئینگلیزی بۆ بینینی پشکنەری کارگێڕی **(المفتش الاداری)** پارێزگا کە ئەوساکە ئینگلیز بوو[٥].

تا ئەم نامەیە گەیشتە جێ و تا کاربەدەستانی سلێمانی کەوتنە خۆ کابینەی یاسین هاشمی، وەک گوتمان، هاتە سەر کار. ئەو کابینەیە دووچاری هەزارو یەک گیروگرفت و کێشەی سەیر سەیر هات، نە سەرەک وەزیران، نە جەنابی وەزیرەکان، لە سەرو هەمووشیانەوە ڕەشید عالی، فریا نەدەکەوتن سەری خۆیان بخورێنن، زۆریش بەپەرۆش بوون بۆ ئەوەی دڵی سەرەک هۆزەکانی کورد ڕابگرن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەستیان لە **«تاوانبارە»** گەورەکە، دیوانی حەمدی ساحێبقڕان هەڵنەگرت، پیاوانی میری بە پەرۆشەوە بە هەر چوارلادا کەوتنە سۆراخی. بە فڕوفێڵ خۆفرۆشێکی کورد بە بیانووی خوێندنەوەو پشتگیرییەوە دیوانەکە لە نەجمەددین مەلا دەسێنێت و بەوردی دەرسی دەکات و هەموو ئەو شیعرانەی هەستی کوردایەتییان تێدایە بە خەتی خۆی لە حەوت لاپەڕەی گەورەدا دەنووسێتەوەو دیوانەکە دەگێڕێتەوە بۆ نەجمەددین مەلا. ئینجا پارێزگاری سلێمانی ڕۆژی بیستی نیسانی ساڵی ١٩٣٥ ئەم نامەیە، لەگەڵ دوو دەسنووسی شەش پارچە شیعری ناو

(٥) م.و.د، الملف السابق، المکتب الخاص، سري، الی متصرف لواء السلیمانیة، العدد م.خ ٣١٨، ١٠ آذار ١٩٣٥.

دیوانەکە کە، وەک وتمان، لە حەوت لاپەڕەدا نووسراونەتەوە، دەنێرێت بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ:

**«لە پارێزگاری لیوای سلێمانییەوە بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ، یادداشت، ژمارە س/٤/٤٦١، ڕۆژی ١٩٣٥/٤/٢٠، نهێنی، بابەت: کتێبی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ.**

**نیشانە بە نامەی نهێنی ژمارە م.خ/٣١٨ی ڕۆژی ١٩٣٥/٣/١٠تان. دایەرەی پۆلیسی لیوا توانی ئەو کتێبە وەدەست بخات کە باسیتان کردووە، دوای خوێندنەوەی دیان کە تەنها ئەو حەوت لاپەڕەیەی لەگەڵ ئەم یادداشتەدا بۆتانی دەنێرین پێوەندییان بەو مەسەلانەوە هەیە کە لەناو نامەکەتاندا باسیانتان کردووە، هەرچی کتێبەکەشە دراپەوە بە مەلا نەجمەددین کە مامۆستایە لە یەکێک لە مزگەوتەکانی سلێمانی، بەوەشمان زانیوە کە مەلا نەجمەددین کتێبەکەی لە ڕێگەی دانەریەوە دەستکەوتووە کە ئەحمەد بەگی فەتاح بەگە، مەلا نەجمەددین دانەیەکیشی لەو کتێبە ناردووە بۆ سەید حوسێن حوزنیی خاوەنی چاپخانەی دیاری کوردستان لە ڕەواندوز بە نیازی چاپکردنی. ئیمزا پارێزگاری لیوای سلێمانی»**[٦].

یەکسەر وەزیری کاروباری ناوخۆ فەرمان دەدات دەقی شیعرەکانی حەمدیی لە کوردییەوە بۆ بکەنە عەرەبی. سەرەتا شیعرەکان بە کوردی لەسەر شەش لاپەڕەی قەوارە گەورە بە ناونیشانی **«نصی ئەشعاری ئەحمەد حەمدی فەتاح بەگ»**ەوە چاپ دەکەن کە ئەمانەی لای خوارەوەن:

**١- ئەی خاکی وەتەن.**

**٢- قەصیدە دەرحەق کوردی شیمال.**

**٣- وەتەنی. تەرجیع بەند. جەوابی وەتەن.**

**٤- بەندی هەشتەم.**

---

(٦) المصدر نفسه، وزارة الداخلية، المكتب الخاص، العدد ١٨٥٣، التاريخ ٢٢ نيسان ١٩٣٥.
«دیارە چاپخانەی -دیاری کوردستان- کە لە نووسراوەکەدا وا ناوی هاتووە، مەبەست لێی هەر چاپخانەی -زاری کرمانجی-یەکەی حوزنی موکریانی بووە-**عەبدوڵڵا زەنگەنە**».

(٧) دیارە مەبەست شەشی ئەیلوولە کە بە هەراکەی بەر دەرکی سەراو شەشی ڕەشی ئەیلوول بەناویانگەو ساڵی ١٩٣٠ قەوما نەک ١٩٣٣.

**٥- ڕۆژی ١٩٣٣/٩/٦ ئەیلول[٧].**

**٦- شەڕی ئاوباریک**

فەرمانبەرە کوردەکانی وەزارەت ناتوانن دەقی شیعرەکانی حەمدی بکەن بە عەرەبی، لەبەر ئەوە ئەم تێبینییانە بۆ وەزیر تۆمار دەکەن:

**«بە عەرەبی کردنی ئەو شیعرانەی ناردووتانن لە توانای وەرگێڕەکانی ئەم وەزارەتەدا نییە، بەڵام شیعرەکان بە گشتی باسی وەزعی کوردو سکاڵا لە دەست ئەم وەزعە نالەبارەی دەکەن.**

**١- پارچە شیعری یەکەمیان بریتییە لە بانگەوازێک بۆ هاونیشتمانان، شاعیر لە هۆی دواکەوتنیان و لە سەبەبی ماتەمی کورد دەپرسێت، ئینجا هێرش دەباتە سەر مەدەنییەت و دەوڵەت و دەڵێت ئەگەر شارستانەتی بێتە هۆی نەگبەتی بۆ کورد دەسا هەزار خۆزگە بە وەحشیەت و تاریکی، ئەگەر ئەمەش دەوڵەت بێت ئەوساکە خۆزگەو حەسرەت بۆ نەگبەتی. دوای ئەوە شاعیر گلەیی لە زەمانە دەکات کە کوردی وا دووچاری ناسۆری کردووە.**

**٢- پارچە شیعری دووەم باسی کوردی باکوورو ئەو کوشتارانە دەکات کە بەدەستی تورک لێیان کراوەو شاعیر دەڵێت قڕتێخستنی کورد حەڵاڵ کراوەو باسی بەسەرهاتی ڕۆژی بیست و چواری مارت دەکات[٨].**

**٣- پارچە شیعری دوای ئەو پرسیارێکە شاعیر لە نیشتمانی کردووە کە بۆ چ وا دواکەوتووە، بۆ چ وا تووشی نەگبەتی هاتووە. نیشتمانیش لە وەڵامدا دەڵێت ئەو گیرۆدەی دەستی زوڵمە، بۆیەکا گوڵی هەڵوەرێنراوە، مەلی ئاسمانی خنکێنراوە.**

**٤- پارچە شیعری چوارەم(دیارە مەبەستی پێنجەمە) وەسفی ڕۆژی شەشی ئەیلولە. شاعیر لەوێدا ڕووی دەمی کردۆتە سروشت و ئاسمان و ڕێمان لێیان دەپرسێت بۆ چ ماتەم دایگرتوون، بۆ چ دڵشکاون، دوای ئەوە شاعیر دەکەوێتە وەسفی ئەو کوشتارەی ڕۆژی شەشی ئەیلول لە سلێمانی کرا.**

---

(٨) مەبەستی ئەو ڕۆژەیە کە لە ساڵی ١٩٢٥دا شێخ سەعیدی پیران و هاوەڵەکانی لە دیاربەکر لە سێدارە دران.

**٥- پارچە شیعری پێنجەم(دیارە مەبەستی شەشەمە) وسفی شەڕی ئاوباریک دەکات کە لە ڕۆژگاری یاخیبوونەکەی شێخ مەحمودا قەوما».**

لەسەر هەمان یادداشت ئەم پێشنیارەش پێشکەش بە وەزیر کراوە:

**«وای بەباش دەزانم نامە بنێرن بۆ هەردووک پارێزگاری هەولێرو سلێمانی بۆ ئەوەی چاودێری بخەنە سەر کتێبی ناوبراو، ئەگەر هاتو خرایە ژێر چاپەوە ڕێگە نەدەن ئەو بەیتانە بڵاو بینەوە کە مەترسی لە بڵاوبوونەوەیان دەکرێت، چ ئەوانەیان کە لەگەڵ ئەم یادداشتەدان، یا هەر کامێکی تریان کە لە ناو دیوانەکەدان».**

وەزیر ڕۆژی بیستو سێی نیسان ئەم پێشنیارەی پەسند کردەوەو بە قەڵەمی سەوز پرسەکێکی **(علامە إستفهام)** لای ئەو ڕستەیەوە داناوە کە باسی شەشی ئەیلول دەکات[9].

یەکسەر بۆ سبەینێ، واتە ڕۆژی بیستوپێنجی نیسان، بە ئیمزای خودی وەزیر ڕەشید عالی گەیلانی وەزارەتی کاروباری ناوخۆ ئەم نامەیەی لای خوارەوە دەنێرێت بۆ پارێزگاری سلێمانی:

**«بیرۆی تایبەتی. نهێنی. پارێزگای لیوای سلێمانی . بابەت: کتێبی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ. نیشانە بە نامەی ژمارە س/٤٦١ی ڕۆژی ١٩٣٥/٤/٢٠تان. تکا دەکەین بە وردی موراقەبەی کتێبی ناوبراو بکەن و ئەگەر خرایە ژێر چاپەوە ڕێگەی بڵاوبوونەوەی ئەو بەیتانە نەدەن کە مەترسییان لێ دەکرێت، تایبەت پارچە شیعری چوارەم** (مەبەستی ئەو شیعرەیە کە حەمدی بۆ شەشی ئەیلوولی گوتووە) **کە لەگەڵ نامەی وەڵامدراوەتاندا ناردبووتان، هەروەها هەر پارچە شیعرێکی تری ناو دیوانەکە کە لەگەڵ نامەکەتاندا نەتاننارد‌ووەو لەوانەیە زیان بە سەلامەتی دەوڵەت بگەیەنێت.**

**تکا دەکەین وێنەی ئەو حەوت لاپەڕەیەی کتێبی ناوبراو بنێرن بۆ پارێزگاری**

---

(٩) م.و.د، الملف السابق، وزارة الداخلية، المكتب الخاص، العدد: ١٨٥٣، التأريخ ٢٢ نيسان ١٩٣٥.

(١٠) المصدر نفسه، المكتب الخاص/ سري، العدد: م.خ/٩٥٨، التأريخ: ٢١ محرم ١٣٥٤، ٢٥ نيسان ١٩٣٥.



**هەولێر. ئیمزا: وەزیری کاروباری ناوخۆ. وێنەی ئەم نامەیە لەگەڵ وێنەی نامەی پارێزگاری سلێمانی بۆ پارێزگاری هەولێر بۆ هەمان مەبەست»**(١٠).

تەحقیقاتی جینائی بە جۆرێکی تر کۆتایی بە مەسەلەکە هێنا، وا دیارە یەکسەر، لە چاپخانەی **«دیاری کوردستان»** لە ڕەواندز دەست بەسەر دیوانەکەی حەمدیدا دەگرێت، لەو نامەیەیدا کە بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس ڕۆژی ٣٠ی نیسانی ١٩٣٥ ناردوویە بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ لەم بارەیەوە نووسیویە دەڵێت:

**«نیشانە بە نامەی ژمارە ش خ/ ١٠٨٢ی ڕۆژی شەشی مارتی ساڵی ١٩٣٥مان وا لەگەڵ ئەم نامەیەدا دیوانی ئەحمەد بەگی کوری فەتاح بەگی**

---

(١١) المصدر نفسه، مديرية الشرطة العامة، شعبة ادارة التحقيقات الجنائية المركزية، العدد: ش. خ/٢١٥٩، التاريخ: ٣٠ نيسان ١٩٣٥، من مدير الشرطة العام الى وزارة الداخلية.

«لە سێ دێری بەر لەم نووسراوە د. کەمالیش هەر ناوی چاپخانەکەی بە -دیاری کوردستان- بردووە، دیارە ئەویش مەبەستی چاپخانەکەی -زاری کرمانجی- بووە، بۆ زیاتر زانیاری توێژەران هەندێک لایەنی بیرەوەرییەکانی حوسێن حوزنی موکریانی لەژێر ناونیشانی (چۆنیەتی دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان لە هەولێر) لە لایەن د. کوردستان موکریانی لە ژمارە -٩-ی زستانی ٢٠٠١ گۆڤاری «هەولێر»دا بلاوکراوەتەوە هەمووی دەبێتە پاڵپشتی ئەو باسەی د. کەمال- **عەبدوڵڵا زەنگەنە»**

(١٢) بڕوانە پەراوێزی ژمارە چوار.

**شاعیرتان بۆ دەنێرین، ناوەڕۆکی ئەم دیوانە دەسدرێژی تێدایە بۆ سەر میری. ناوبراو دیوانەکەی داوەتە مامۆستایەکی نارەسمی کە ناوی مەلا نەجمەددینی مەلا غەفوورەو دانیشتووی گەڕەکی کانێسکانە لە سلێمانی، ئەمیش دیوانەکەی ناردووە بۆ چاپکردن بۆ سەید حوسێن لە ڕەواندز کە خاوەن چاپخانەیە»**(١١).

بەم جۆرە پرۆژەیەکی ڕووناکبیری کورد بە ناهەق زیندەبەچاڵ کرا، پاش ساڵێک و شەش مانگ و دوازدە ڕۆژ لە زەوتکردنی دیوانەکەی، بەو داخەوە، حەمدی سەری نایەوە. پاش بیستویەک ساڵ ژانی تر ئینجا دیدەی ڕووناکبیرانی کورد بەو دیوانە بەرزە شاد بوو(١٢).

شایانی باسە هەست بە هەندێک جیاوازی دەکەم لە نێوان ئەو پارچە شیعرانەی حەمدیدا کە لەناو فایلەکانی وەزارەتی کاروباری ناوخۆدا هەڵگیراون لەگەڵ هەمان ئەو پارچە شیعرانەیدا کە لە دیوانەکەیدا چاپکراون، من دوو وێنەیان دەدەم بە هەردوو ئەدیبی دڵسۆزمان کاکە حەمەو بیمار بۆ ئەوەی ئەوان، ئەگەر بە پێویستیان زانی، بەجوتە، یا بە جیا ئەم لایەنەی باسەکەمان بۆ شی بکەنەوە.

**بابەتی دووەم***

# مێژووی دوو پارچە شیعری ونی پیرەمێرد

**پێشکەشە بە:**
**هاواری شاعیرو نووسەر**

ون بوونی بەرهەمی بەهرەداران دیاردەیەکی ئاساییە دانتێی کەڵەشاعیری ئیتاڵیاو جیهان (١٢٦٥-١٣٢٩) پاش کۆچی دوایی خۆی بەماوەیەک ئینجا دوا بەشی کۆمیدیا هەرە بەناوبانگەکەی لەپڕ، لە شوێنێکی چاوەڕوان نەکراودا دۆزرایەوە. لە بارودۆخی سەختی کوردەواریدا بێگومان گەلێک گەوهەری نازدارمان لە کیس چووە کە لەوانەیە بەشێکیان لەم لاو لەو لا، لە ئەستەمووڵ و تاران و قاهیرە، یا لە شوێنی دی بێ ناز کەوتبن و خۆڵیان لێ نیشتبێ.

ماوەیەک لەمەوبەر، کاتێک بە بەڵگەنامە ئینگلیزییە تایبەتییەکانی ساڵی ١٩٢٩وە خەریک بووم دوو پارچە شیعری **«پیرەمێردی نەمر»**م دۆزییەوە کە هەردووکیان، یەک بە تەنیشت یەکەوە، بەناوی حاجی تۆفیق ئەفەندییەوە لە لاپەڕەیەکی سەربەخۆدا چاپ کراون. لە بەرهەمە بڵاوکراوەکانی پیرەمێردا **(دیوان و پەندەکانی)** ئەو دوو شیعرە نین، هەرچەندە **«ژیان»**و **«ژین»**یشم لەبەردەستدا نییە تا حوکمی تەواو بدەم، بەڵام وا پێ ناچێ ئەو دوو شیعرە لە هیچ کامێکیاندا بڵاوکرابنەوە، چونکە ئەوساکە، لە ڕۆژگاری یاشاییدا بۆ بڵاوکردنەوە نەدەشیان، لە نەوەی پیرەمێرد کاک فایق هۆشیارو لە مامۆستایان ڕۆژبەیانی و محەمەدی مەلا کەریم و بیمارو دوکتۆر ئەمین موتابجی و خەڵکی تریشم پرسی ئەوانیش هیچ کامیان ئاگایان لەو دووپارچە شیعرە نییە. تەنها کاک ڕەشید باجەلان بەلێڵی

---

(*) لە ژمارە (٩٦)ی ساڵی (١٩٩٦)ی گۆڤاری **«ڕەنگین»**دا بڵاوکراوەتەوە.

بەیتێکی شیعری یەکەمی لەبەرە کە دوایی دێمەوە سەرباسی ئەویش.

هۆی بزوێنی پیرەمێرد بۆ گوتنی ئەو دووپارچە شیعرە ئەو یادداشتە گرنگە بووە کە رۆژی چواری نیسانی ساڵی ١٩٢٩ شەش پەرلەمانتاری کورد داویانەتە سەرەک وەزیرانی ئەوسا عەبدولمحسین سەعدون دەربارەی مافە رەواکانی کورد کە کاربەدەستانی ئینگلیزو رژێمی پاشایی بەر لەوە جارەهای جار هەر بە قسە گفتی جێبەجێ کردنیان دابوو. ئەو شەش نوێنەرە کوردەی ئەندامی **«ئەنجومەنی نوێنەران»** (مجلس النواب) کە یادداشتەکەیان پێشکەش کردبوو بەپێی ئیمزاکانیان لە دامێنی یادداشتەکەدا لە چەپەوە بۆ راست ئەمانە بوون: ئیسماعیل بەگی رەواندزی نوێنەری هەولێرو حەمە ساڵح بەگی نوێنەری سلێمانی و جەمال بابان نوێنەری هەولێرو حازم بەگی شەمدین ئاغای نوێنەری موسڵ و سەیفوڵلا خەندانی نوێنەری سلێمانی و محەمەد جاف نوێنەری کەرکوک.

شایانی گوتنە ئەو شەش پەرلەمانتارە یادداشتەکەیان ئاراستەی سەرەک وەزیرانی عیراق کردبوو نەک نوێنەری باڵای بەریتانی **(المندوب السامی)** کە تەنیا بۆ ئاگاداری لە ژێرەوە وێنەیەکیان پێ دابوو، ئەمەش وەرچەرخانێک بوو لە هەڵوێستی گەورە پیاوانی کوردا کە بەر لەوەو، تەنانەت دوای ئەوەیش زۆربەیان رووی دەمیان دەکردە نوێنەری باڵا چونکە باش لەوە گەیشتبوون کە کلیلی هەموو بڕیارەکان وا لە گیرفانی ئەودایە لەگەڵ ئەوەش ئەو یادداشتە بەجارێک هەستی شوڤێنییانەی زۆر دەستەو دایەرەی وروژاند کە کەوتنە رەخنەگرتنی ئاشکراو هەڕەشەکردنی ژێر لێوەوە لەو نوێنەرانەو جارویار لە سەرجەم کوردیش. رۆژنامەی **«العالم العربي»** بە وێنە لە ژمارەی رۆژی هەشتی نیسانیدا وتارێکی گەورەی بەم ناونیشانەوە بڵاوکردۆتەوە. **«برایان ئایا ئێستا کاتی ئەوەیە؟»** ئەو پرسیارەی دەیان جار ئاراستەی کورد کراوە، مێژوو دەڵێ: **ئەوی نیازی نەبێ ماف بدات هیچ کاتێک بەلایەوە کاتی لەبار نییەو هەمیشە ئەو پرسیارەی بە یەدەک هەڵگرتووە.**

له هەمووان خراپتر رۆژنامەی **«العراق»** شووڵی لێ هەڵکێشابوو، هەرچەندە ئەو رۆژنامەیە بۆ خۆی لە رۆژی دامەزراندنییەوە دەنگی دڵسۆزی ئینگلیزو لایەنگرانی ئینگلیزو دوژمنی سەرسەختی نیشتمانپەروەرانی عیراق بوو، کەس بەرادەی ئەو هێرشی نەبردە سەر شۆڕشی بیست و ئازادیخوازانی ئەو رۆژگارە، کەچی کتوپڕ لە ئاستی مافی رەوای کوردا **«العراق»** بووە یەکە **«نیشتمانپەروەر»**و لە وتارێکی دوورودرێژی رۆژی نۆی نیسانی ساڵی ١٩٢٩یدا زۆر بێ ئابڕوانەو بە ئاشکرا پێشنیار دەکات **کاربەدەستان لەسەر ئەو یادداشتەی پەرلەمانتارەکان بەرینە گیانی کوردو ئەوەیان پێ بکەن کە تورک بەر لە جەنگی یەکەم و لە رۆژانی ئەو جەنگەدا بە ئەرمەنیان کرد**، ئەوەی لاپەڕەیەکی رەشی پڕ لە شەرمەزارییە لە تۆماری مێژوودا.

ئەمە بەجارێک کوردستان دەهەژێنێ و دەبێتە هۆی تورەیی و نارەزایی جەماوەر بەرادەیەک ئینگلیزەکان چەند جارێک لە راپۆرتە نهێنییەکانی خۆیاندا بە دوورو درێژی باسیان کردووە. وتارەکەی **«العراق»** هەستی ناسکی پیرەمێرد دەوروژێنێ و یەکسەر لە وەڵامیدا شیعرێکی یازدە بەیتی لەگەڵ شیعرێکی تری چوار بەیتی لە ستایشی شەش نوێنەرە کوردەکەدا دادەنێ و وا دیارە هەر ئەو شەوە لە چاپخانەکەی شارەوانی کە **«ژیان»**ی لێ چاپ دەکرا محەمەد ئەمین رەباتی و ئەحمەد شوکری (دوکتۆر شۆ) لە شێوازی پەخشە **(نەشرە)**یەکدا لەسەر لاپەڕەیەک ژمارەیەکی زۆری لێ چاپ دەکەن و شاگردانی زانستیش بە ناو شاردا بڵاوی دەکەنەوەو ژمارەی لێ دەنێرنە شارەکانی تری کوردستان. کاربەدەستانی ئینگلیز لە سلێمانی بە دەستووری خۆیان یەکسەر ژمارەی ئەو پەخشەیە پەیدا دەکەن و دەینێرنە بەغداو لە بەغداوە بۆ لەندەن و هەردوو پارچە شعرەکەش دەکەنە ئینگلیزی لە ماوەیەکی زۆر کورتدا دەیانخەنە بەردەمی نوێنەری باڵا لە بەغداو وەزارەتی موستەعمەرات و فرۆکەوانی لە لەندەن و دەزگا تایبەتییەکانیان لێرەو لەوێ.

لەم بوارەدا دوو بەڵگەنامەی نهێنیی ئینگلیزەکان بەتایبەتی سەرنج رادەکێشن و هەردووکیان بەر لە هەر شت رادەی چالاکیی رووناکبیرانی ئەو قۆناغەی کوردستان و وریایی دەزگاکانی ئینگلیز نیشان دەدەن، ئەو دەزگایانەی زۆر بە وردی و پەرۆشەوە کەوتبوونە دوو کوردپەروەران لە هەر شوێن بووبن. بەڵگەنامەی یەکەمیان

بریتییە لە یادداشتی ژمارە أ/ ٤٠٧ی بنکەی ئاسمانی بەریتانی لە بەغدا کە رۆژی ٢٤ی نیسانی ساڵی ١٩٢٩ ناردوویە بۆ سکرتێری نوێنەری باڵای بەریتانی لە عێراق کاپتەن ڤیڤیان هۆڵت کە جێگەی میس بێلی بەناوبانگی گرتبووەو کوردییەکی چاکیشی دەزانی.

هەروەها وێنەی هەمان یادداشت دراوەتە کارگێری گشتیی پۆلیس و بەڕێوەبەرایەتی تەحقیقاتی جینائی کە دوایی ناوی بووە دایەرەی ئەمن، دەقی ناوەرۆکی یادداشتەکە دوو دێڕ نابێ، بەڵام بایەخی بۆ ئێمە زۆر زۆرە کە دەڵێ.

**«یادداشت ئەمەی بۆتانی دەنێرین تەرجەمەی شیعرێکی حاجی تۆفیق ئەفەندییە**

---

* «١» لە بارەی ئەو نووسینەی **«العراق»** کە د. کەمال ئاماژەی بۆ کردووە رۆژنامەی **«ژیان»** لە ژێر ناونیشانی **«جواب غەزەتەی – العراق – بەتاریخی ٩ی نیسانی ١٩٢٩»** لە ژمارە ١٦٧ی ١٥/٤/١٩٢٩دا نووسیویە: **«بەرامبەر بەو تەقریرەی کە وەکیلە خۆشەویستەکانی میللەتی کورد بۆ تەڵەبی حقوقی میللەتەکە دابوویان لە غەزەتەی – العراق – لە ٩ی نیسانی ٩٢٩ تاریخدا چاومان بەچەند دێڕێک کەوت ئێمە چونکە زبانی حاڵ میللەتی کوردین هەرچەند لەسەرمان واجب بوو جوابی بدەینەوە، بەڵام بۆ ئەوەی حسیاتی کوردەکان تەحریک و نەتیجە شتێکی خراپ تەولید نەکات ئەمان ویست دوورو درێژ جوابی بدەینەوە».**
هەر ئەوەندە دەڵێین بۆ –العراق – زۆر عەیب و فکرێکی غەڵەتە کە بەهەموو حسیاتییەوە میللەتێکی شەجیع، ساحیب شەرەفی وەکو کورد تەهدید دەکات و ئەیترسێنێ بەوەی کە دەڵێ **«کوردەکان تەڵەبی وا بکەن وەکو ئیدعای ئەرمەنەکانی لێ دێت کە موقابیل بەتورکیا کردیان و نەتیجە بەم حاڵە گەیشتن»** ئەی ساحب و موحەریری – العراق! بەجدی عەرزت دەکەین کورد هیچ وەختێک خۆی بەئەرمەنی نازانی و عراقیش بەتورکیا، کورد بەو شەرتە لەگەڵ عراق ئەژی نەک وەکو غەزەتەکانی خارج ئەڵێن و ئەنووسن، **«ئەبێ ئەم دوو میللەتە وەکو بریتانیاو ئەسکۆتلاند بژین و تەماشای یەکتری بکەن»** بەڵکو کورد ئەیەوێ زیاتر تەماشای بکرێ.
رجا لە ئەولیای ئمور ئەکەین ئەگەر ئەیانەوێ ئەم دوو میللەتە بەیەکەوە بژین نابێ مەیدان بدەن شتی وا بنووسرێ، چونکە غەزەتەکانی کوردیش مەجبوور دەبێ مقابیل بەهەموو تەعەروزێک نەک مدافەعە بەڵکو هجوم بکات، هەر ئەوەند، ئەڵێین – ژیان).
هەرچی پیرەمێرد بووە لە ژێر ناونیشانی **«بۆ ژیانی خۆشەویست»** نووسیویە **«دیسان لە – العراق – دا بەناوی سەلاحەدین سلێمانییەوە شەخسێکی مجهول معاوەزە ئەکا. کورد زۆری لا عەیبە لەگەڵ پەچە دارێکا بدوێ وا من دیارم لە مەیدانام و سەلاحەدین ناویش لە سلێمانی دا نەناسراوە، ئەگەر پەچە لەروو هەڵماڵێ و بێتە مەیدان خۆی تێ دەگا کەمن ئەو تۆفیقەم لە ئەوەل تەشەکولی جەمعیەتی کورد ٣٢٤ لە ئەستەمبوڵدا تائێستا لە هەموو جەمعیاتی کوردا سەلاحیەتدار بووم و لە مەیدانیشدا دیسان سەلاحەدین ناوم بە عەلاقەدار نەدیوە ئەگەر کسە ئەمە بەسە – تۆفیق»**
هەر لەم ژمارەیەداو لە هەمان لاپەڕەدا **«ژیان»** نووسیوە موحتەرەم سەلاحەدین.
بەرامبەر بەتەعەروزێک کە لە –العراق – دا مقابیل بەژیان و تۆفیق بەگ کردیون لە تەرەف تۆفیق بەگەوە جوابت درایەوە.

**که ئێمه له هەولێرەوه پێمان گەیشتووه، بۆ بینێنتان».**

خوێندنەوەی مێژوویی ئەم بەڵگەنامەیە گەلێک وەک ئاسانە، وەک وتمان وتارەکەی ڕۆژنامەی **«العراق»** ڕۆژی نۆی نیسانی ساڵی ١٩٢٩ بڵاوبۆتەوە*، ڕۆژی دەی نیسان گەیشتۆتە سلێمانی، لەوانەیە درەنگتریش، کەوابێ لە ماوەیەکی زۆر کورتدا پیرەمێرد هەردوو شیعرەکەی گوتووەو لە چاپخانە چاپیان کردووەو بە هەموو کوردستاندا بڵاویان کردۆتەوەو پاش دوو حەفتە لە هەولێرەوە نوسخەی لێ گەیشتۆتە بەغداو بە ئینگلیزی خراوەتە بەردەمی گیلبەرت کلایتۆنی نوێنەری باڵا. خوا لە گشت لا ڕازی بێ، ئامین!

بەڵگەنامەی دووەم ئەو دوو حەفتەیەمان بۆ دەکاتە یەک حەفتە، ئەمیان بریتییە لە یادداشتێکی نهێنی تر کە **«ئەفسەری خزمەتە تایبەتییەکان»**ی ئینگلیز لە هەولێرەوە ڕۆژی حەڤدەی نیسانی هەمان ساڵ سێ دانەی لێ ناردووە بۆ **«ئیستیخباراتی بنکەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عیراق»** و دوو وێنەشی لێ داوەتە **«پشکنەری کارگێڕی»** ئینگلیز لە هەولێرو وێنەیەکی تری لێ داوەتە **«پشکنەری پۆلیسی لیوای کەرکوک و هەولێر»** کە لە کەرکوک دادەنیشت.

ئەفسەری خزمەتە تایبەتییەکانی هەولێر لەگەڵ یادداشتەکەیدا دانەیەکی لە دەقی کوردیی دوو پارچە شیعرە چاپکراوەکەی پیرەمێرد ناردووە بۆ **«ئیستیخباراتی بنکەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عێراق»** و دانەیەکی تریشی ناردووە بۆ پشکنەری کارگێڕی ئینگلیز لە هەولێر. ئەمە بەڵگەیەکی ڕەت نەکراوەی ئەوەیە کە

---

ئێمەیش بەلازمان نەزانی هیچ نەبێ بەرامبەر بە تەعەروزەکەن مدافەعەیەک بکەین. نازانم جەنابتان ئەیزانی یان نا؟
بەڵام هەموو کەس (مەعلومە) کە غەزەتەیەک هەتا وەسائقی مەعلومە نەبینی لە خۆیەوە شتێک دەرج ناکات - باوەڕ ناکەم لە کوردەکان کەس بێت ئینکار کوردییەت و فەعالییەتی - تۆفیق بەگ بکا. حەقیقەتەن زۆر لە کۆنەوەو حەتا کە ئەکسەر لە کوردەکان مللیەتیان نەئەزانی دیسانەوە ئەم زاتە محتەرەمە بۆ محافەزەو دەست کەوتنی حقوقی کورد سەعی کردووە، و دائما مەنافعی خسوسیەی خۆی تەرک و بۆ مەنافع عمومیەی کورد جوهد ئەکات، بەڵام شەخسێک کە لەژێر ناوی مستەعارا بنووسێ و لە نووسینی ناوی خۆی حەزەر بکات و بترسێ باوەڕ ناکەم مللەتێک ئیستفیادەی لێ بکات ژیان.
«٢» پێم وایە ئەوکاتی هێشتا (ئەحمەد شوکری) لە بەغدا لە هەوڵی فێربوونی پیتچنی دابوو، نەهاتبووەوە سلێمانی تا لەگەڵ محەمەد ئەمین ڕەباتی کاری کردبێت. **«عەبدوڵڵا زەنگەنە»**

ژمارەیەکی زۆر لە دوو پارچە شیعرەکەی پیرەمێرد چاپ کراوەو بە هەموو لادا بڵاوکراوەتەوە دوور نییە ژمارەکانی بە دەستی گەیێندرابنە هەولێرو شارەکانی تری کوردستان.

ئەفسەری خزمەتە تایبەتییەکانی هەولێر لە یادداشتەکەیدا بەتایبەتی باسی ئەوەی کردووە جۆن وتارە توندڕەوەکەی رۆژنامەی **«العراق»** بۆتە هۆی تەقینەوەی بێزارییەکی گشتی لە ناو دانیشتوانی هەولێرداو دەڵێ: بە بۆنەی ئەو وتارەوە کە **«العراق»** بە ناونیشانی **«دیسان ئیسماعیل ڕەواندزی دێتەوە گۆڕێ»** وە بڵاوی کردۆتەوە لێرە، واتە لە هەولێر، ژمارەیەکی زۆر وتارو شیعر لە وەڵامیدا بڵاوکراوەتەوە. دەربارەی شیعرەکەی پیرەمێردیش ئەمەی لای خوارەوەی نووسیوە:

**«وا لەگەڵ ئەم یادداشتەمدا تەرجەمەی دەقی ئەو پارچە شیعرە پڕ لە خەیبەتە تاڵەتان بۆ دەنێرم کە شاعیرێک بەناوی حاجی تۆفیق ئەفەندییەوە دایناوەو وا دیارە خەڵکی سلێمانییە».**

من ئەو دوو پارچە شیعرەم لە فایلی ژمارە (٢٣/٤١٥، ئێکس ئێم ٤٥٨٣)ی وەزارەتی فرۆکەوانیدا دۆزیوەتەوە. فایلی ناوبراو بەشی پێنجەمی زنجیرەیەک دۆسییەی بایەخدارە کە بەم ناونیشانەوە لە دایەرەی سیجلاتی گشتی لە لەندەن هەڵگیراوە: **«بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لە هەژدەی نیسانەوە تا سیازدەی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٩».**

ئەمەیشی دەقی هەردوو پارچە شیعرەکەی پیرەمێردە بە ڕێنووسی ئیستە:

**«ئەبیاتی شیرینی موحتەرەم حاجی تۆفیق ئەفەندی».**

(دیارە) نایەوێ ئێمەیش میللەت بین[1]
وەک ئەوان نەختێ بە حورمەت بژین
(ئەلعێراق)[2] دەڵێ ئێوە ئەرمەنین

---

(١) هەڵبەت مەبەستی کاربەدەستانی رژێمی پاشایی و بەڕێوەبەرانی رۆژنامەی **«العراق»**ە، کە لەبەغدا چاپ دەبوو، ئەگینا پیرەمێرد بۆ خۆی روناکبیرێکی کراوەو دووربین بوو، بڕوای بە برایەتی کوردو عەرەب و هەموو میللەتانی سەرزەمین هەبوو.
(٢)و (٤) مەبەستی رۆژنامەی **«العراق»**ە.


حاجی رەمەزان

دەعـــواتان شـــومـــە بۆ هیچ لایەق نین
خـــۆیـان نـاناسن کـــە بـەتورک نـابن
خـــوا نـەیداونێ وەک کـــورد ئازا بن
کـورد هەر ئەو کـوردەن کـە (ئەوێ یان) گـرت
ئەبوجـاسـمـەکـان کـەوتنە جـرت و فـرت
دوو سـاڵ لەمـەوپێش خـۆیان و فـەوجـیـان[٣]
لەسـەر کـانـیـیـەکـەی بەر خـەراجـیـان
بـەکـــەش وفش چون بۆ کـــۆزەڕەقـــە
ســوارەی کـــورد لێـــیـــان کـــەوتنە تەقـــە
بـە ئـاخ (دایـکـەڕۆ) کـــــەوتنـە هـاوار
بە پاڵەپەســـتـــۆ رایان کـــردە شـــار

(٣) مەبست ئەو پێکادانەیە کە لە نێوان هێزێکی میری و پێشمەرگەکانی شێخ مەحمودا لە نزیک خەراجیانی نێوان سلێمانی و هەڵەبجەدا قەوماو حاجی رەمەزانی خەڵکی سلێمانی فەرماندەی هێزەکە بوو، هەر ئەو حاجی رەمەزانەش پاش ماوەیەک بووە موتەسەریف (**پارێزگار**)ی سلێمانی و لەگەڵ پیرەمێرددا پێوەندیی هەبوو تا دوایی لەسەر شیعرێکی تری دڵی لێ رەنجا.

ئەو رەمـــــــەزانە لە دێی رەمـــــــەزان
بە جـــــەژنیـــــان زانی لە تەندور خـــزان
نەبوایە بەهۆی بەریتـــــــانیـــــــاوە
دەخنکان بەدەست کـــوللەو خـــورمـــاوە
ئاخ ســـــابا فــــــرەی نەبێ تەیارە
حـــــیـــــزی و ئازایی ئەوســـــا دیارە

**پارچەیی دووەم:**

ئەبیاتی شیعری حاجی تۆفیق ئەفەندی بەرامبەر بە فەعالیەتی وەکیلە خۆشەویستەکانەوە:

حـــــسی مــــــیللی یان بلـندو بەرزە
رۆحی ئەجـــــــــدادی هێنـایە لەرزە
هەر بژین ئێــــوە پشـــتـــــان بەرنادەین
بۆ فـــــیـــــداکـــاری هەمـــوو ئامـــادەین
ئەلعـــــــراق(٤) ئاگـــــری تێ بەربووەوە
ئەورەحـــــمـــــان پاشـــای لەبیـــر چووەوە
ئاخ ئەگـــــــــەر نەبێ ورەی تەیارە
مـــــەعلوممان ئەبێ کـــام لا بیـــەکـــارە».

ئەوەی لەم دوو پارچە شیعرەدا سەرنج رادەکێشێ سکاڵای پیرەمێردە لە دەست فرۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز کە بەراستی بوونە هۆی دەمکوت کردنی کوردو دامرکاندنەوەی بزوتنەوەکانی، ئەو تێبینییەی گشت بۆچوونەکانی ناو ئەو وتارەمان دەسەلمێنێ کە ساڵی پار بە ناونیشانی **«گاڵتەو گەپ و گەمەکانی نێوان شێخ مەحمودو فرۆکەوانەکانی ئینگلیز»*** ەوە لە گۆڤاری **«رۆشنبیری نوێ»** دا بلاومان

---

(*) ئاماژەیە بۆ بابەتی سێیەمی بەشی یەکەم کە لە ل(٣٣ ، ٨٢)ی ئەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە.

(**) د. کەماڵ مەزهەر بابەتێکی لە ژێر ناونیشانی: **«ئەو کوردە خاوەنەی کەس نەبوو خۆشی نەوێت»** لە گۆڤاری **«رەنگین»** ژمارە (١٤٤)ی ساڵی ٢٠٠١ دا بلاوکردۆتەوە خوالێخۆشبوو (رەشید باجەلان)ی بەم شێوەیە پێناساندووین:



مەلا جەمیل رۆژبەیانی



رەشید باجەلان

کردەوە.

کاک رەشید باجەلان** تەنها لە پارچە شیعری یەکەمیان ئەو بەیتەیان لە یادە کە دەڵێ:

---

«لە شەستەکانەوە، لە رێگەی چەند سەرچاوەو بەڵگەنامەیەکەوە شتێکی کەمم دەربارەی دادوەری ناسراو رەشید باجەلان زانی کە رۆژی شازدەی شوباتی ئیمساڵ، لە تەمەنی هەشتاو یەک ساڵیدا بە داخەوەماڵئاوایی لێ کردین. هەر لەوساوە بەوەم زانی کە خواڵێخۆشبوو کورد پەروەرێکی خانەقینی سەر راست و دڵسوز بوو، رۆڵی دیاری هەبوو لە چالاکییەکانی رێکخراوە کوردیەکانی چلەکانداو لە بوواری پێوەندییەکانی کوردی عیراقدا بە کۆمەڵەو مەهابادەوە. دوای گەڕانەوەم لە هەندەرانەوە دەرفەتی ئەوەم بۆ هەڵکەوت لە نزیکەوە کاک رەشید کوری ئیسماعیل ئاغای عەزیز ئاغای باجەلان بناسم، تایبەت لە ناوەندی حەفتاکانەوە. لەوساوە زوو زوو لە دیوەخانە ئاوەدانەکەی کاک فوئاد عارف و شوێنی تر دەمدی و هەستم دەکرد چۆن بێ ئەندازە رێزی ئەو کوردانە دەگرێت کە بیرو خامەیان بۆ خزمەتی گەلەکەیان تەرخان کردووە، چۆن عەوداڵی گشت هەواڵەکانی نیشتمانەو بە خۆشەکانیان شاگەشکەو بە ناخۆشەکانیان دڵتەنگ دەبێت، بە دڵ حەزی دەکرد هەموو پیاوچاکێکی ئەم وڵاتە بکاتە کوردو هەموو نەفرەتلێکراوێکیش لە کورد دوور بخاتەوە، ئەوەی جار جارە کاک فوئادو شێخ عارفی تاڵەبانی دەیانقۆستەوەو دەیانجولاند، یا برایانە بەپەرچیان دەدایەوە بێ ئەوەی کەسێکیان هیچ بگرێتە دڵ. کاکە رەشید پیاوێکی زمان خاوێن و دڵفراوان و سەر راست و زۆر

«ئەلعـــــراق دەڵێ ئێـــــوە ئەرمـــــەنین
دەعـــواتان شـــومـــە بۆ هیچ لایەق نین،

بەڵام وەک دەڵێ لە هەرەتی لاویدا هەمـوو شیـعرەکەی لەبەربووە، ژمـارەیەک لە لاوانی ئەو سـەردەمـە دەمـاودەم نەقـڵـیـان کـردووە. دوای ئەم قـسـانە کـاک فـایق هۆشیـاریش بەشێـک لەو بەیتـانەی هاتەوە یاد کـە جـاروبار لەگـەڵ کـاک رەشـیـدا بەجـووتە وتویانـنەوەو هەردووکـیـان دەمێ سـاڵە هیـچیـان دەربارەی لە یادا نەمـابوو تەنها ئەو بەیتـەی سەرەوە نەبێ، دیسان کاری ئینگلیـزەکان راست کە ئەم دوو پارچە شیعرەی پیرەمێردیان بۆ پاراستین، هەردووکیشیـان دەچنە خانەی شیعری سیاسی و کـوردییـەوە کـە لەو قـۆناغـەدا بەشێکی گـەورەی ئەدەبی گـەلەکـەمـانی بەشـیـاوی دەرازاندەوە.

---

لەسەرخۆ بوو، رێزی گەورەو بچوکی دەگرت، بە پێی توانا یاریدەی قوتابیانی ماجستێرو دوکتۆرای دەدا، ئەوانەی بۆ نامەکانیان دیدەنیی تایبەتییان لەگەڵدا دەکرد، بۆ خۆیشی خوێندەوارێکی چاک بوو، هەستم دەکـرد عـەودالی نووسـینی کـوردیی بەپێـزەو هەر نووسـینێکیشی دەربارەی کـورد دەستبکەوتایە بە وردی دەیخوێندنەوەو باش هەڵیدەسەنگاندن و زۆریش عەودالی رۆژنامەو گۆڤارە کوردییە کۆنەکـان بوو، ژمارەیەکی باشی لەوانەیان کۆکردبۆوە کە بەر لە شۆڕشی چواردەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ چاپکراون.
بە راستی لە مـاوەی نزیکەی ٣٠ سـاڵدا کەسێکم نەدی رەشید باجەلانی خۆش نەوێت و بە رێزو تەقدیرەوە باسی نەکات، هەر لەبەر ئەوەیش پرسەکەی لە بەغدا بە دڵی کەسوکـارو برادەرانی گەرم بوو. خوا لە وێنەی رەشید باجەلان لە ناو کورددا زۆر بکات و سەبووری کەسوکاری و پیاوچاکانی هۆزی باجەلان بدات».
«ئەوەی شـایانی باسە ناوبراو ئەندامی دەسـتـەی سـەرکردایەتی یەکـەم کـۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستانیش بووە- عەبدوڵلا زەنگەنە».

بابەتی سێیەم*

# پوختەی مێژووی پارچەیەک شیعری سیاسیی ونی ترمان

ماوەیەک لەمەوبەر لە گۆڤاری **«رەنگین»**دا دوو پارچە شیعری ونی پیرەمێردی نەمـرم بڵاوکـردەوە[1]، لەم ژمـارەیەی گـۆڤـاری **«بەیان»**یشـدا پارچەیەکی تر بڵاودەکەمەوە کە ماوەیەکە لە ناو یەکێک لە فایلەکانی وەزارەتی ناوخۆی رۆژگاری پاشاییدا دۆزیومەتەوە[2]. هەڵبەت ئەوسا شیعری سیاسیی کوردی هەمیشە وێڵ و سەرگەردان و دەربەدەبەر بوو، دەمـاودەم بڵاودەبووەوە، ئەم شـیـعـرە یەکـێکە لەو داسـتـانە نەمرانە، توخنی باسی مـافی زەوتکراوی کوردو لافـاوی خـوێنی بەناحەق رژێنراوی کـوردو دەردو ئازارو شـەونخونی و نەبوونی کـورد دەکـەون، ئەوانەی رقی ناپیـرۆزی زۆرداران وەک مـسـتـەفـا کـەمـال و حـەمـە رەزا شـاو نیـرۆن و سـتـالین هەڵدەسێنن.

ئەمەش دەقی ئەو پارچە شیعرەمانە کە بەر لە کۆتایی چلەکان لە ترسی سیخوڕو یاساولانی رژێمی پاشایی بە نهێنی بڵاوکراوەتەوە:

---

(*) لە ژمارە (١٨٠)ی گۆڤاری **«بەیان»**ی ساڵی ١٩٩٧، لە ل٥-٦دا بڵاوکراوتەوە.

(١) **«رەنگین»**، ژمارە٩٦، ساڵی ١٩٩٦، ل٩-١١.

«ناماژەیە بۆ بابەتی دووەم، بەشی چوارەم لە ل(٥١٧-٥٢٦) ئەم کتێبەدا بیخوێنەوە- عەبدوڵڵا زەنگەنە»

(٢) دار الكتب والوثائق، الوحدة الوثائقية: ملفات وزارة الداخلية، رقم الملف ٢٧/س ل/٤، القسم الثاني، موضوع الملف: الوضع والحركات الكردية في السليمانية، ١٩٤٨.

کچانمان لـه ژێر بەیداغی رەشدا
چاو هەڵئەهێنن بە خوێنی گەشدا
کورانمان هەموو بە وردو درشت
لەرێی وەتەندا خۆ ئەدەن بە کوشت
سەربەستی نابێ، ئازادی نابێ
ئازادی دەبێ هەر خوێن بەهای بێ(٣)

بە بۆنەی جەژنی رەمەزانی ساڵی ١٩٤٨وە نیشتمانپەروەرانی کورد ئەم پارچە شیعرەیان کردۆتە کارتی جەژنە پیرۆزەو لە هەولێرو کەرکوک و سلێمانی دانەیان بە ٢٥٠ فلس فرۆشتووەو **پارەکەیان داوەتە بەندو ئاوارە سیاسییەکانی کورد**. بە یەکێک لە بەڵگەنامەکاندا وا دیارە هەر بەو پارەیە دیاریشیان بۆ شیرینی کچی مستەفا خۆشناو(٤) کڕیوە کە ئەوساکە شاگردی قوتابخانەی سەرەتایی بووە لە سلێمانی(٥). **بایەخی مێژوویی ئەم راستییانە هەڵبەت کەم نییە.**

دەزگا تایبەتییەکانی میری دەکەونە سۆراخی ئەم پارچە شیعرەو دەیان **«کتابناو کتابکم»**ی لەسەر دەنووسن. تەنها لەو فایلەی وەزارەتی کاروباری ناوخۆدا کە من دیومە پتر لە دە جاران ئەم باسە لەو نامانەدا هاتۆتە پێشەوە کە وەزارەتی ناوخۆ لە بەغداو بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی سلێمانی و ئیستخباراتی فیرقەی دوو لە کەرکوک و دەزگاکانی تر لە رۆژی دەی ئابەوە تا حەفدەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ ئاڵوگۆڕیان کردووە.

بە ناوەرۆکی ئەو بەڵگەنامانەدا وا دەردەکەوێ کارتەکە بە نهێنی یا لە بەغدا یا لە سلێمانی چاپکراوە، ئەمانەیش ئەو کەسانەن کە ناویان لەو بەڵگەنامانەدا هاتووەو دەزگاکانی میری گومانی ئەوەی لێ کردوون دەستیان هەبووبێ لە چاپکردن

---

(٣) هەمان سەرچاوە، بەڵگەنامەی ژمارە یەک.

(٤) مستەفا خۆشناو یەکێک بوو لەو چوار ئەفسەرە کوردەی رۆژی ١٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧ لە سێدارە دران.

(٥) دار الكتب والوثائق، الملف السابق، الوثيقة رقم ٤.



و بلاوکردنەوەی کارتەکەدا: قادری حاجی حوسێنی کانی کەوە، کەمال و جەمالی حاجی شەفیق کە هەردووکیان شاگردی ناوەندی بوون، ئەحمەد محەمەدی کۆیی. ئەو دەزگایانە لە هەموران زۆرتر گومان لە قادری حاجی حوسێنی کانی کەوەو کەمالی حاجی شەفیق دەکەن، **یەکەمیان** ئەو کاتە سەربازیی تەواو کردووەو گەڕاوەتەوە سلێمانی، **دووەمیشیان**، وەک گوتمان، شاگردی قوتابخانەی ناوەندی بووە هەر لەوێ. هەردووکیان بە توندی دەخرێنە ژێر چاودێرییەوە، بە نیسبەت قادری حاجی حوسێنەوە کە گومانی لێ دەکەن ئەو کارتەکانی بە چاپکراوی لە بەغداوە هێنابێت، داوا لە دەزگا تایبەتییەکان دەکەن ئاگایان لە هەموو هاتوچۆیەکی بێت و لە کاتی سەفەردا بە وردی گشت کەلوپەلێکی بپشکنن[٦].

دەربارەی کەمالی حاجی شەفیقیش بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی رۆژی دەی ئابی سالّی ١٩٤٨ نامەیەکی نهێنی دەنێرێ بۆ موتەسەریفی شارو وێنەی لێ

(٦) هەمان سەرچاوە، بەلگەنامەی ژمارە نۆو سیازدە.

دەنێرێ بۆ بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس لە بەغداو سەرکردەی فیرقەی دوو لە کەرکوک و مودیری تەحقیقاتی جینائی لە بەغداو ئامیر حامیەی سلێمانی و حاکمی تەحقیق دیسان لە سلێمانی و داوا لەمیان دەکات رێگە بدات بە پۆلیسی شار بەتایبەتی ماڵی حاجی شەفیق بپشکنن، چونکە، وەک دەڵێ، لەوانەیە لەوێ کارتەکان و ئەو ئامێرە بدۆزنەوە کە پێیان چاپکراون. بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی دوو وێنەش لە هەمان نامە دەنێرێ بۆ بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوک و هەولێرو داوایان لێ دەکات بە دووی ئەو کەسانەدا بگەڕێن کە لە شارەکانی ئەوان کارتەکەیان بڵاوکردۆتەوە[٧].

بایەخی ئەم نامەیەی بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی بۆ باسەکەمان لە هەموو بەڵگەنامەکانی تر زۆرترە، چونکە تەنها لەمیاندا دەقی پارچە شیعرەکە بە کوردی وەک خۆی تۆمار کراوە. جگە لەوە زمانی نامەکە کەمێک لەنگەو بەشێک لە رستەکانی پتر لە مانایەک دەبەخشن، بۆیەکا وام بەباش زانی دەقە عەرەبییەکەی وەک خۆی بڵاوی کەمەوە کە دەڵێ:

**«صورة كتاب مديرية شرطة اللواء المرقم ٣٩٣ والمؤرخ ١٩٤٨/٨/١٠، متصرفية لواء السليمانية، الموضوع بطاقات. لقد علمنا بصورة سرية بتوزيع بطاقات السرية[٨] باللغة الكردية على بعض الاشخاص باسم (بطاقات المعايدة) بثمن ربع دينار لكل بطاقة، وقد تمكنا العثور على نسخة منها، ورغم تحقيقاتنا السرية لم نتوصل الى معرفة الجمعية التي قامت بتوزيعها، والذين جمعوا أثمانها، اما يقال ان عضو الفعال في التوزيع هو التلميذ كمال حاجي شفيق بمساعدة أخيه التلميذ جمال. كما علمنا من ان ارسل قسماً منها الى كركوك واربيل لتوزيعها، واستيفاء أثمانها، ويقال ان أثمانها تتبرع الى البارزانيين، وان كمال يملك كاميرة فتوغرافية للكتابة[٩]، وكذلك يقال ان المحامي ابراهيم احمد هو الذي يحتفظ بالمبالغ التي تجمع، ومساعينا مبذولة لمعرفة القائمين بهذا العمل، وسوف نخبر مقامكم..»**[١٠].

---

(٧) هەمان سەرچاوە، بەڵگەنامەی ژمارە یەک.

(٨) وەک خۆی، بێ دەستکاری بڵاوی دەکەینەوە.

(٩) هەڵبەت ناوی ئەو ئامێرە هەڵەیە.

(١٠) دار الكتب والوثائق، الملف السابق، الوثيقة رقم ١.

لە دامێنی نامەکەدا پارچە شیعرەکە بە کوردی و بەرانبەرەکەی بە عەرەبی بڵاوکراوەتەوە، لێرەشدا وەرگێڕانەکە مانای گشتیی شیعرەکە رادەگەیێنێ نەک دەقەکەی وەک خۆی.

ئەم راستییانە گشتیان نیشانەو بەڵگەی چالاکیی دەستەی رووناکبیری ئەو رۆژگارەن کە لەگەڵ هێرشی بەرفراوانی دوای راپەڕینی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹٤۸دا یەک دەگرێتەوە، **واتە لەگەڵ رۆژانی وەزارەتەکەی موزاحیم پاچەچیدا کە مەیلی بەلای کوردا نەبوو**[۱۱]، حوکمی عورفی وڵاتی گرتبۆوە، بەندیخانەکان جمەیان دەهات، هەموو کڕ بوبون چونکە پۆلیس دەستی نەدەپاراست. کە رۆژی حەڤدەی ئەیلولی ئەو ساڵە لە کازم خۆنیشاندانێک ساز کرا پۆلیس خراپ دەستی وەشاند، هەشتاو هەشت کەس لە خۆنیشاندەران بریندار بوون، پتر لە دووسەدو پەنجا کەسیشیان لێ گیرا[۱۲].

یەکێک لە بەڵگەنامەکانی ناو هەمان فایل جگە لە باسی ئەو شیعرەی سەرەوە چەند راستییەکی بایەخداری تری بۆ تۆمار کردووین، **وەک هاتنی کاکە زیادی کۆیی و ئەمین رەواندزی و عەلی محەمەد ئاغای هەولێری بۆ سلێمانی و سازکردنی چەند کۆبوونەوەیەکی نهێنی بەو بۆنەیەوە لە رۆژانی یازدەو دوازدەی ئەیلولی ساڵی ۱۹٤۸دا چ لە سەرچنارو چ لە ماڵی شێخ لەتیفی شێخ مەحمودو چ لە خزمەت شێخ مەحمود خۆیدا.** بەر لەوەش بە رۆژێک ئەفراسیاو بەگی جاف لە هەڵەبجەوە هاتۆتە سلێمانی و لەوێوە چۆتە گوندی هەزارمێردو ئەویش بە نهێنی لەگەڵ بابە عەلیی شێخ مەحمودا کۆبۆتەوە. بە هەمان دەستوور ناوی محەرەم محەمەد ئەمینی چیرۆکنووسیش هاتووە کە ئەوساکە فەرمانبەر بووە لە پەروەردەو لەسەر کوردایەتی

---

(۱۱) دوای کەوتنی کابینەکەی محەمەد سەدر موزاحیم پاچەچی رۆژی بیست و شەشی حوزەیرانی ساڵی ۱۹٤۸ بۆ یەکەم جار بووە سەرەک وەزیران، لە کورد تەنها جەلال بابانی کردبووە وەزیری هاتوچۆ، کابینەکەی پاچەچی تا رۆژی هەشتی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹٤۹ لە کاردا مایەوە، دوای ئەو نوری سەعید دەیەمین کابینەی خۆی دامەزراند.

(۱۲)عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الطبعة السابعة، الجزء الثامن، بغداد، ۱۹۸۸، ص۱۵.

(۱۳) دار الكتب والوثائق، الملف السابق، الوثيقة رقم۷.

نەقڵی دێلتاوە کراوە[١٣].

پێم وایە ناوەرۆکی ئەم باسەش نیشانەی بایەخی زۆری بەڵگەنامە نهێنییەکانە نەک تەنها بۆ مێژوونووس بەڵکو بۆ ئەو شارەزایانەشمان کە بە مێژووی ئەدەب و ژیانی رووناکبیری کوردەوە خەریکن، ئەوانیش دەتوانن بۆ توێژینەوەی لە ژیانی ئەدەبی و رووناکبیریی گەلەکەمان بەڵگەنامەکانی **«دار الکتب والوثائق»** لە بەغدا بخەنە گەڕو کەڵکیان لێ وەربگرن.

# تاهیر پاکژو فایق هوشیار

هەر زۆر سەیرە ئەوانەی لەژێرەوە کوردستانیان خستبووە هەراجەوەو هەزارویەک جۆر پێوەندیان هەبوو کەس ناوی نەدەهێنان، یا پلارو توانجی تێ نەدەگرتن، بەڵام ئەوانەی بەدڵ بۆ کوردو کوردستان سووتابوون هەزارویەک ناوو ناتۆرەیان لێدەنان. ئێستەش بیرمە کە دەیانگوت پیرەمێرد بەپارەی ئینگلیز نەورۆز دەکات، ئینجا کوا خوا بیکردایەو وابوایە، بەڵام راستیان گوتووە داری بەردار بەردی تێ دەگیرێ نەک داری بێ بەر، یا پیرەمێرد وتەنی:

لقی شـــۆڕی درەخت مـــیـــوەی ئەخـــۆن بێ ئەرکی بەردودار
پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزە، لەقـــەش بۆ ســـەرپەلی بەردار

خوالێخۆشبوو حسەین حوزنی موکریانی یەکێکە لەوانەی کەمی پێ نەکراوە، هەرچەندە لەوەتەی خوا کوردی دروست کردووە کەم کەس وەک ئەم بۆ کورد سووتابوو. بە راستی ئەو پیاوە عاشقی کوردبوو، بۆ کورد لە پێناوی کوردا بەداماوی سەری نایەوە، من بەش بەحالی خۆم دەمێ ساڵە باش لەمە گەیشتووم و بەدڵ لە **«تێگەیشتنی راستی»** و **«مێژوو»**دا باسیم کردووە.

رۆژ بە رۆژ پتر هەست بە گەورەیی حسەین حوزنی موکریانی دەکەم. لەناو ئەو

(*) لە ژمارە (٩٥)ی گۆڤاری « **رەنگین**»ی ساڵی(١٩٩٦)دا بلاوکراوەتەوە.

بەڵگەنامە ئینگلیزییانەدا کە من تاوەکو ئیستە دیومن بەلایەنی کەمەوە پازدە جاران ناوی ئەو هاتووە، بێگومـانم لەوەی نـاوی لەو بەڵگەنامـانـەدا زۆر لەوە زیاتر هەیە، دوارۆژ ئەوەیش سـاغ دەبێتـەوە. لەو **بەڵگەنامـانەدا هەست دەکـەیت چۆن دەزگـا تایبـەتیـەکانی ئینگلیز هەنگاو بە هەنگاو تاقیبی حسـەین حوزنی موکـریانی و بەرهەمەکانی و ژیانی تایبەتی خۆی و سەفەرەکانیان کردووە.** هەر لەبەر ئەوەیشە کە ئینگلیزەکـان لە نزیکەوە هەسـتیـان بەوە کردبوو ئەو پیاوە لە رێگەی کورددا **چەند شەونخونی دەکێشێ و چ دەچێژێ و چ دەنۆشێ، بەوەیان زانیوو جاری ئەوتۆ هەیە بێ شێو سەر دەنێتەوە.**

جاروبـار من ئەم باسـانە دەگێـڕمـەوە حەز دەکـەم کـەس حەقی ون نـەبێ، ئەوانەی خوالێخۆشبوو دەناسن هەریەکەیان یادو یادگارێکی دانسقەی ئەویان لایە، یەکێک لەوانە کاک تاهیر حەیدەرییە کە حسەین حوزنی بەیەکەم مامۆستای کوردایەتی خۆی دادەنێ، ئەو بـانگی کـوردایەتیی بە گـوێچکەیدا داوەو **هەر بەپاکژ لە بریتی تاهیر ناوی هێناوە**، بەو زمـانـەیش لەگـەڵی دواوە کـە ئەو بەو منداڵیـیـەی خـۆی لای پەسـەنـدو دڵگیـربووە، دەڵێ جـارەهای جـار لە باوکـم بیسـتـووە، کـە ئەوسـاتە لە ڕەواندز قـازی بووە، سـەید حوزنی چ ژیانێـکی سـەخت دەباتە سـەر و چۆن شـەوو رۆژ خەریکی **«زاریی کرمانجی»**یە.

پێوەندیی نێوان پیرەمێردو حسـەین حوزنی موکریانی زۆر خۆش و گـەرم بووە، هیچ کـات لێک دانـەبڕاون، هەستی ڕەسـەنی کوردایەتی و پیشـەی رۆژنامـەنووسیی هەمیشە هەردووکیانی لە خانەیەکدا کۆکردۆتەوە. حسـەین حوزنی چەند جارێک بۆ دیدەنیی پیرەمێرد چۆتە سلێمانی و ماوەیەکی دووروودرێژی پێکەوە بە باسی ئەدەب و مێژووی کوردەوە بردۆتە سەر یەکێک لەو هاتنانەی سەید حوزنی بۆ سلێمانی بەر هاوینی ساڵی ١٩٣٤ کەوتووە، وا دیارە کاک سـەعید ناکامیـشی لەگەڵ بووە کە لەوساوە لە **«ژیان»**دا کاری کردووە. هەموو رۆژێک بەیانیان و ئێواران پیرەمێردو حسەین حوزنی و دەستـەیەک روناکبیریی شار لە ژووره گـەورەکەی ئیدارەی **«ژیان»** لەقاتی سەرەوەی شارەوانی، کە کەوتبووە ناوەڕاستی شارەوە، نیمچە کۆڕێکیـان بەسـتووە، فـایقی کـچەزای پیـرەمـێرد ئەو کـاتە منداڵ بووە، هەموو رۆژێک لەگـەڵ

باپیریدا چوّته بارەگای **«ژیان»**، تایبەتی کات پشووی سەری سالّی مەکتەبیش بووە. ئیوارەیەکیان حوزنی گلەیی لە پیرەمێرد دەکات کە بۆچ ناوێکی کوردیی بۆ فایق هەلّنەبژاردووە. پیرەمێرد لە وەلاّمدا پێی دەلّێ:

**سەید ئێستەش نەچووە بچێ، تۆ ناوی لێ بنێ.**

حوزنیش یەکسەر لەسەر بەرگی پاکەتە جگەرەیەکی **«غازی»** بە دەسخەتە خۆشەکەی خۆی ئەم بەیتە دەنووسێ:

فایق بۆ ئەوەی کە ببێ بەکورد
ناونرا هۆشیار ناوی تەبدیل کرد

پێرەمێرد کە بەیتەکە دەخوێنێتەوە بە موکریانی دەلّێ:

**«فایق هەر کورد بووە، بەلاّم دەزانم تۆ مەبەستت ناوێتی و بۆ وەزنی شیعر وا دەلّێی».**

ئینجا هەر لەوێدا رووودەکاتە محەمەد ئەمین رەباتی و ئەحمەد شوکری **(دکتۆر شۆ)** کە پیت چنی چاپخانەکە بوون و داوایان لێ دەکات لە ژمارەی داهاتووی **«ژیان»**دا ئەو بەیتەی موکریانی وەک خۆی بلاّوبکەنەوە.

بەو جۆرە ئەو بەیتەی حسەین حوزنی موکریانی لە **«ژیان»**ی ژمارە چوارسەدو حەوتی رۆژی شازدەی ئابی سالّی ١٩٣٤دا بلاّودەبێتەوەو لەو ساوە **فایق مستەفا** دەبێتە ئەو فایق هۆشیارەی هەمووومان دەیناسین، وا رێک دەکەوێ هەر ئەو سالّەش سەر ژمێرێکی سەرەتایی لە ولاّتدا دەکرێ، لە تۆماری ئەو سەرژمێرەشدا کاک فایق بەرەسمی ئیتر دەبێتە فایق هۆشیار.

کاک حیلمی عەلی شەریفیش بۆی گێرامەوە چۆن **حسەین حوزنی یەکەم هاندەری بووە کە بە کوردی پەتی بنووسێ.** ناوەندی چلەکان کاک حیلمی هێشتا شاگردی ناوەندی دەبێ کاتێک لە پڕ چیرۆکێکی بۆ دێ و بەناوی دلّسۆزەوە دەینێرێتە **«دەنگی گێتی تازە»** کە ئەوساکە موکریانی بەرێوەبەری کارگێڕی و سەرنووسەری دەبێ. ئەو یەکەم نووسینەی کاک حیلمی لە ژمارەیەکی **«دەنگی گێتی تازە»**ی ئەو سالاّنەدا بە کوردییەکی پاراو بلاّودەبێتەوە، موکریانی بۆ ئەوەی کاک حیلمی لەسەر



**لە راستەوە: سەلاح سەعدوڵڵا، بابەکر پشدەری، تاهیر پاگژ**

نووسین هان بدات، بێ ئەوەی بزانی کێیە. دەستێکی باش بە چیرۆکەکەیدا دێنێ و بە رێکوپێکی بۆی بڵاودەکاتەوە. پاش دەورووبەری چارەکە سەدەیەک ئەو سەرەتایە لە رۆژنامەی نورو گەلێک بەرهەمی تردا سەری هەڵدا.

**خوالێخۆشبوو حسەین حوزنی موکریانی زۆر بە پەرۆش بوو بۆ ئەوەی تۆوی کوردایەتی بووەشێنێتە ناو قووڵایی هەر بستە خاکێکی کوردستانەوە دستی پێیدا بکەیشتایە، بەداخەوە داماو، وەک زۆر گەورە کوردی تر، هێشتا حەقی تەواوەتی خۆی وەرنەگرتووە.**

بابەتی پێنجەم*

# دوو چیرۆکی نایابی
# تۆفیق وەهبی

## پێشەکی:

زانای گەورەمان تۆفیق وەهبی بەگ کوڕی مەعروف کوڕی محەمەدە، ڕۆژی یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٩١ لە سلێمانی لە دایک بووە، لە دایکەوە مامۆستای زانا ڕەسوڵ مەستی باپیرییە. ساڵی ١٩٠٨ فێرگەی سەربازیی ناوەندی لە بەغدا تەواو کردو دوای ئەوە چووە ئەستەمۆڵ بۆ خوێندنی باڵاو ئەرکان. لە ساڵی ١٩١١وە تا ساڵی ١٩١٨ بە پلەی ئەفسەری بەشداریی لە گشت ئەو جەنگانەدا کرد کە دەوڵەتی عوسمانی گیرۆدەیان بوو، دوایەمیان شەڕی یەکەمی جیهان بوو. لەسەر ئەو ئازایەتییەی لەمیاندا نواندی ئەڵمانەکان نیشانی تایبەتیان پێی بەخشی[1].

ئابی ساڵی ١٩١٩ تۆفیق وەهبی گەڕایەوە عیراق و کرایە قایمقامی رانیە. کە شەشی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢١ لەشکری عیراقی دامەزرێنرا یەکسەر کرایە

---

(*) لە گۆڤاری «بەیان»، ژمارە (١٨٢)ی ساڵی ١٩٩٨، لە ل٢-٧دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) ئەم زانیارییانە تۆفیق وەهبی خۆی داونی بە میر بەسری (بصري) و ئەمیش لە لاپەڕە ٢٠١-٢٠٩ی «اعلام الكرد»یەکەیدا لە لەندەن ساڵی ١٩٩١ بڵاوی کردوونەتەوە، شایانی باسە میر بەصری ئەو کتێبەی خۆی پێشکەش کردووە بە تۆفیق وەهبی و سەعید قەزاز (بڕوانە لاپەڕە یازدەی کتێبەکەی).

ئەفسەری بەشی بزووتنەوەی ئەو لەشکرە. ساڵی ١٩٢٢ دایە پاڵ شێخ مەحمود، لەسەر ئەوە ماوەیەک بەند کرا، پاشان ڕێگەی پێدرا وەک ئەفسەر بگەڕێتەوە ناو لەشکرو ساڵی ١٩٢٥ کرایە بەڕێوەبەری فێرگەی سەربازی لە بەغدا، گەلێک لە ئەفسەرە بەناوبانگەکانی ناو لەشکری عیراق پەروەردەی دەستی ئەو بوون. لە سەرەتای ساڵی ١٩٣١وە تۆفیق وەهبی دەستی لە کاری سەربازی هەڵگرت و لەوساوە بووە یەکێک لە کارگێڕە ناسراوەکانی کورد لە دەزگاکانی دەوڵەتدا، سەرەتا بووە پارێزگاری سلێمانی، بەڵام بەر لە ڕاپەڕینی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠ دەستی لەکار کێشرایەوە، ئەوەی بووە هۆی نارەزایی خەڵکەکە، پتر ڕێگەی بۆ بەرپابوونی ئەو ڕاپەڕینە خۆش کرد. بەر لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٦ تۆفیق وەهبی گەڕایەوە سەر کار.

لە ناوەندی ساڵی ١٩٤٤وە قۆناغێکی نوێ لە ژیانی تۆفیق وەهبیدا دەستی پێ کرد بەوەی لەوساوە چەند جارێک بووە وەزیرو نایب و شالیارو جێگری سەرۆکی حزبەکەی ساڵح جەبر.

**لە کۆتایی سییەکانەوە تۆفیق وەهبی وەک کاری سیاسی دەستی لە کوردایەتی هەڵگرت، بەڵام لەوساوە مێشکی دەوڵەمەندی و خامەی بەپرشتی بۆ خزمەتی وشەی کوردی تەرخان کرد.** زانایی تۆفیق وەهبی زوو خۆی نواندو ڕێگەی بۆ خۆش کرد ببێتە ئەندامی کاراو جێگری یەکەمی سەرۆکی **«کۆڕی زانیاری عیراقی»** لە ڕۆژی دامەزراندنییەوە کە بەر کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ دەکەوێت. لەوساوە تۆفیق وەهبی چەند جارێک بەناوی عیراقەوە لە کۆنگرە زانستییە جیهانییەکاندا بەشداری کردووە[٢]. کە ساڵی ١٩٧٠ش **«کۆڕی زانیاری کورد»** دامەزرا تۆفیق وەهبی یەکەم کەس بوو بە ئەندامی شەرەفی ئەو کۆڕە هەڵبژێردرا. بەرهەمە زانستییەکانی تۆفیق وەهبی هەرچەندە بە ژمارە کەمن، بەڵام بە ناوەڕۆک زۆر دەوڵەمەندو پڕن.

تۆفیق وەهبی لە بواری زانستدا لە هەرشت زۆرتر بایەخی دەدا بە زمانی

---

(٢) بڕوانە: **«المجمعيون»** في العراق ١٩٤٧-١٩٩٧، إعداد صباح ياسين الاعظمي، منشورات المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٩٧، ص١٥-١٦.

کوردی، **چونکە باش لەوە گەیشتبوو کە لە ئاروودۆخی ناسکی کوردستاندا زمان قەڵغانی یەکەمی پاراستنی نەتەوەیە.** لەو مەیدانەدا کەمی نەکرد. لێرەدا وەک بەڵگە بۆ چوونێکی وردی ئەدمۆندسی ئاگادار دێنمەوە. لەو وتارەیدا کە مایسی ساڵی ١٩٤٥ لە گۆڤاری (Royal Central Asian Journal)ی لەندەنیدا بلاوی کردۆتەوە ئەدمۆندس باسی ئەوەی بۆ کردووین چۆن تۆفیق وەهبی توانیوییە بە دارشتنی زنجیرەیەک وشەو زاراوی کوردیی پەتی و لەبار بەر لە لێشاوی ئەو وشە عەرەبییە نوێیانە بگرێت کە لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهاندا خۆیان داسەپاندو لەبەر توانستی بێ ئەندازەی عەرەبی تەنگیان بە گشت زمانە رۆژهەڵاتییەکان هەڵچنی. ئیزگەی کوردیی بەغداو هەروەها ئیزگەی کوردیی رۆژهەڵاتی نزیک ئەو وشانەی تۆفیق وەهبییان بەکاردەهێناو بەو جۆرە جێگەی خۆیان لەناو خوێندەوارانداکردەوە، بۆیەکا، وەک ئەدمۆندس دەڵێت: **«ئەوەی داهاتووی کورد قەرزداری ئەو زانایەیانن».**

ئەوە بەشێکە لە قەرزی تۆفیق وەهبی بەگ بەسەر کوردەوە، بۆیەکا کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٤ بە هەزارانیان بۆی بوونە وەجاغ و لەسەر داوای خۆی تەرمەکەیان بە پیرەمەگرونی سەرکەش سپارد[٣].

پێم وایە بەشی زۆری خوێندەوارانی کورد زۆرو کەم ئاگاداری پوختەی ئەم سەرگوزشتەیەی ژیانی تۆفیق وەهبین، بەڵام وابزانم بە دەگمەن هەن ئاگاداری ئەوە بن کە ئەو زانایەمان لە بواری چیرۆکنووسیشدا بۆ رۆژگاری خۆی سوارچاکێکی بێ وێنە بووە. عومەر مەعرووف بەرزنجی ساڵی ١٩٧٨ ئاماژەیەکی خێرای بۆ ئەو چیرۆکی فۆلکلۆرییەی تۆفیق وەهبی بەگ کردووە کە بەناونیشانی **«بەختیار و بەدبەخت»**ەوە بلاوی کردۆتەوە، سەرچاوەی مامۆستا عومەر لاپەڕە ٤٥ی بەرگی یەکەمی **«قواعد اللغة الكردية»**ەکەی تۆفیق وەهبی خۆیەتی کە ساڵی ١٩٥٦ لە

---

(٣) رۆژی پێنجی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٤ لە لەندەن کۆچی دوایی کرد.

(٤) عومەر مەعرووف بەرزنجی، لێکۆڵینەوەو بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٩، لە بلاوکراوەکانی **«کۆڕی زانیاری کورد»**، بەغدا، ١٩٧٨، ل١٤.

(٥) حوسێن عارف، بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥-١٩٨٣، نەمیندارێتی گشتیی رۆشنبیری و لاوان، لە بلاوکراوەکانی گۆڤاری **«کاروان»**، ژمارە-١-، هەولێر، ١٩٨٧.

بەغدا چاپی کردووە[٤]. هەرچی مامۆستا حوسێن عارفیشە لە بیبلیۆگرافیاکەی خۆیدا توخنی ئەو باسە نەکەوتووە[٥].

مامۆستا تۆفیق وەهبی ژمارەیەک چیرۆکی کوردیی نازداری لەسەر لاپەڕەکانی **«دەنگی گێتی تازە»**دا بلاوی کردۆتەوە. ئەو چیرۆکانەی من دیومن سەرجەمیان لە رووی زمانەوە شیرین و رەوان و لە رووی هونەرەوە بێ گرێ و پتەون، یا با بلێین شایانی خامەی زێڕین و بیری وردی تۆفیق وەهبین. ئەمەش دەقی دووان لەو چیرۆکانەن کە دەڵێی ئیمڕۆ نووسراون، وەک خۆیان، بەدەسکارییەکی کەمی رێنووسەکەیانەوە بلاویان دەکەینەوە. یەکەمیانی ناو ناوە **«چیرۆکێکی منالیم. چیرۆکی بەختیارو بەدبەخت. نووسەری تۆفیق وەهبی»** ، لە لاپەڕە ٣-٥ی ژمارەی یەکەمی بەرگی یەکەمی **«دەنگی گێتی تازە»**دا بلاوی کردۆتەوە کە مانگی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٣ لە بەغدا چاپکراوە.

## بەختیارو بەدبەخت

بەختیارو بەدبەخت دوو برا بوون لەدێیەکدا، رۆژێ لە رۆژان بڕیاریان دا پێکەوە سەری خۆیان هەڵگرن و بڕۆن بۆ شاران پارە پەیدابکەن، هەر بۆ سبەینێ بەجووتە کەوتنە رێ. هەر یەکە توێشووی رۆژێکی خۆی خستبووە ناو دەسەسڕێکی سوورەوەو لەپشتی بەستبوو.

بۆ نیوەڕۆ گەیشتنە سەر کانیوئاوێک، وتیان با لێرە وچانێکی بۆ بدەین نانی نیوەڕۆی لێ بخۆین، لەگوێ کانێکەی دانیشتن، ئینجا بەدبەخت رووی کردە بەختیار:

– بەختیار با بۆ نیوەڕۆ توێشووەکەی تۆ بخۆین، توێشووەکەی منیش بۆ ئێوارێمان.

بەختیار وتی:

– باشە.

بەختیار دەسەسڕەکەی پشتی خۆی کردەوە لەسەر ئەرزەکە رایخست، سا هەرچییەکی تێدابوو خواردیان، هەندێ بۆی حەسانەوەو کەوتنەوە رێ. ئێوارەیان

بەسەردا هات، هێشتا ئاوایی دوور بوو، گەیشتنە دووڕیانێک، کانیوئاوێکی لێبو، ئەمجار بەختیار رووی کردە بەدبەخت و وتی:

- بەدبەخت من زۆرم برسییە، وا دیارە هێشتا ئاواییش دوورە، با لێرە دانیشین شیو بکەین، ئینجا ئەکەوینەوە رێ.

بەدبەخت وتی:

-حەو، بەخوا من لە توێشووەکەم بەشی تۆ نادەم، هەر بەشی خۆم ئەکات.

بەختیار کە ئەم ناپیاوییەی دی کاس بوو، هەر ئەوەندەی پێ کرا وتی:

- کەوابوو، بەدبەخت، ئیتر من هاوڕێیی بەدسروشتێکی وەکو تۆ ناکەم، لەم دوو رێگەیە یەکێکیان بۆ خۆت هەڵبژێرە، تۆ ئەو رێگەیە بگرە، منیش ئەوی تریان ئەگرم.

بەدبەخت رێگەیەکیانی بۆ خۆی هەڵبژاردو بەختیاریش ملی رێگەکەی تریانی گرت و لێک جوێ بوونەوە.

بەختیار کە تاریکی بەسەردا داهات تووشی ئاشە کۆنێک بوو، بۆ ئەوەی ئەو شەوەی تێدا هەڵبکا چووە ناویەوەو لەپشت دوولیانەکەیەوە لێی کەوت. ئەوەندەی پێ نەچوو شێرێک هاتە ژوورەوەو لەبەردەم دوولیانەکەدا لێی دانیشت. لە پاش ئەو گورگ کردی بەژووردا، نەخێر پڵنگ دەرکەوت، کەمتیار پەیدا بوو، چەقەڵ هات، رێوی گەیشت. کە ئەمانە هەموو کۆبوونەوەو ئەنجومەنیان گرت شێر رووی کردە رێوی:

- رێویی سەگباب ئەوە لە کوێی، دیار نیت، دەمێکە هیچ دەنگوباسێکت بۆ نەگێڕاومەتەوە.

- قوربان شتی وەها گرنگ رووی نەداوە کە بیگەیێنمە پێش ئاغای خۆم. بەڵام دوو ئاگای تازەم دەسکەوتووە، ئێستا بۆتانی ئەگێڕمەوە:

**«مشکێک هەیە لەم ئاشە کۆنەدا دوانزە دیناری زێڕی هەیە، هەموو سبەینێیە کە خۆر ئەکەوێتە ناو ئاشەکەوە ئەم مشکە ئەو زێڕانە دێنێتە دەرەوە، لەبەر خۆرەکە هەڵیان ئەخاو یارییان پێ ئەکا، کەی خۆرەکە لاچوو هەڵیان ئەگرێت و ئەیانباتەوە کونەکەی. ئەم گردە بچوکەش کە لە پشت ئاشەکەوەیە حەوت کوپەڵەی پڕ لە زێڕیان**

تێدا شارراوەتەوە».
شای جانەوەران کە ئەمەی بیست سوپاسی مام ڕێویی کرد. لە پاش نەختێ هاوپرسەکی (موزاکەرە) ئەنجومەن بلاوەیان لێ کرد.
بەختیار کە گوێی لەم قسانە بوو ئیتر خەو نەچووە چاوی، چاوەڕوانی خۆرهەلات بوو... سپیدە دیاری دا، شەبەق کرایەوە، ڕۆژ سەری لە ئاسۆوە هێنایە دەرەوە، ئاهەستە ئاهەستە سەرکەوت، گزنگی خۆر ناو ئاشەکەی داگیر کرد. بەختیار خۆی لە پەنایەکدا مەلاس دابوو، هەناسەی لەخۆی بڕیبوو، خێرا خێرا چاوی ئەخشاند بە کونە دیوارەکاندا، دوودڵ بوو ئایا مام ڕێوی ڕاستی کرد بێ؟.
لەپڕ لە کونێکەوە شتێک بریسکایەوە، سەری مشکێک، شتێکی بریسکەدار بەدەمەوە، لە کونەکەوە هاتە دەرێ. مشکە کە پاش پشکنینێکی ناو ژوورەکە بە چاو دڵنیابوونی لەوە کە بێگانەی تێدا نییە لە کون دەرچوو، شتە بریسکەدارەکەی لەبەر خۆرەکە دانا. ئەمە زێڕێک بوو. مشکەکە گەڕایەوە کونەکەیەوەو زێڕێکی تری هێنایە دەرەوە، بەم جۆرە دوانزە زێڕی لەبەر خۆرەکە هەڵخست. ئینجا دەستی کرد بە یاری کردن پێیان.
بەختیار کە هەتا ئەو دەمە خۆی گرتبو چنگێ خۆڵی هەڵگرت و فڕێیدایە سەر زێڕەکان، مشکەکە ڕایکردەوە کونەکەیەوە. بەختیار چوو زێڕەکانی کۆکردەوەو خستنیە گیرفانیەوەو لە ئاشەکە هاتە دەرەوە. بەختیار ئەمجا چووە سەروکاری کوپەڵە زێڕەکان، ئەوانیشی دۆزییەوە. ئیتر زۆر دەوڵەمەند بوو، هێنای زەوییەکی گەورەی کڕی، کۆشک و سەراوباخێکی شایانەی لێ دروست کردو بە ڕایەخ و تەڕوتفاقێکی گرانبەها ڕازاندیەوە، پیاوو کارەکەرێکی زۆری دانا. بەڵام چوار دەروازەی بۆ کرد، لە تەنیشت هەر دەروازەیەکەوە ژوورێکی دروست کرد. کوپەو گۆزەی ئاوی ساردو تەختوسەندەڵی تێدا دانا. بە دەرگەوانەکانیشی وتبوو کام ڕێبوار پاش ئاو خواردنەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا بیهێننە لای. ناوبانگی ئەم ژوورانە زوو بلاوبۆوە. هەموو ڕۆژێ گەلێ ڕێبوار لایان ئەداو ئاوی ساردیان لێ ئەخواردنەوەو لێی ئەحەسانەوە.
ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕێبوارێک هاتە ژوورەوە، پیاڵەیەک ئاوی کرد بەسەرا، کە لێبۆوە

هەناسەیەکی هەڵکێشا. دەرگەوان دەسبەجێ چووە لایەوەو پێی وت کە خاوەن ماڵ تکا ئەکات بچیتە لای.

ڕێبوارییان بردە لای بەختیار. کە چاویان بەیەک کەوت دەسبەجێ یەکتریان ناسیوە. ئەمە بەدبەخت بوو. بەختیار لە جێی خۆی ڕاپەڕی و دەستی کردە ملی، ئەملاوئەولای ماچ کرد، لەتەنیشت خۆیەوە داینا. لەپاش نەختێ خۆشی و چۆنی بەختیار وتی:

- برا گیان وەکو ئەبینی ئەم کۆشک و سەرایە هی منە، من خوا دایمێ و بە ئامانجی خۆم گەیشتم، ئێستا زۆر دەوڵەمەندم، دیارە تۆ هیچت دەستنەکەوتووە، ئەوا سوپاس بۆ خوا، من هەمە، ئێمە براین، ئەوەی من هەمە لەگەڵ تۆدا بەشی ئەکەم، نیوەی بۆ تۆو نیوەی بۆ من، زۆرم هەیە، بەشی هەردووکمان ئەکاو لێشمان ئەمێنێتەوە.

بەدبەخت بێ ئەوەی خۆشنودی بنوێنێ و سوپاسێکی ئەم برا جوامێرە بکات وتی:

- ئەبێ پێم بڵێی تۆ ئەم دەوڵەتەت لە کوێ و چۆن چنگت کەوتووە، منیش ئەچم وەک تۆ پەیدای ئەکەم.

هەرچەندە بەختیار بەسەریا هات و پێی وت کە ئەم دەوڵەتەی بە هەڵکەوتێکی زۆر سەمەرەو سەراسا (فوق العادة) دەسکەوتووە کە جارێکی تر نابینرێتەوە، ئەو دەوڵەتەی هەیەتی بەسە بۆ هەردووکیان، سودێکی نەبوو، بەدبەخت پێی لێ داگرت، بە زۆر سەربوردەکەی پێ گێڕایەوە. بەختیار کە لە قسەکانی بووەوە ئیتر بەدبەخت ئارامی نەگرت، دەرپەڕییە دەرەوە بەرەو ئاشەکۆن.

بەدبەخت کە گەیشتە ئاشە کۆنەکە زەردەی ئێواری نەمابوو، چووە ژوورەوە، وەک بەختیار لە پشت دولیانەکەوە خۆی لێ مات کرد.

شەو تەواو تاریک بوبو کە شێرێک لە پڕێکا کردی بەژووراو لەبەردەم دولیانەکەدا لێی هەڵتوتا. پاش ئەو ئەندامەکان کە وەکو پڵنگ و گورگ و کەمتیار چەقەڵ و ڕێوی بن گشت کۆبوونەوەو ئەنجومەن گیرا. ئینجا شێر ڕووی کردە مام ڕێوی:

- ڕێوی سەگباب ئەوە بۆ دەمێکە دەنگوباسێکت بۆ نەگێڕاومەتەوە.

ڕێوی وەڵامی دایەوە:

– قوربان چی بگەیێنمە پێش ئاغای خۆم، جاری پێشوو کە لێرەدا ئەو ئاگایانەم بۆ ئەگێڕانەوە ئادەمیزادێک لەودیو دولیانەکەوە خۆی مات دابوو، گوێی لە هەموو بوو، کە ڕۆژ ئەبێتەوە زێڕەکانی مشکەکە ئەفڕێنێ و ئەچێ کویەڵە زێڕەکانیش دەرئەهێنێ. ئێستا ئەوەتا بەو پارانە کۆشک و سەرایەکی بۆ خۆی دروست کردووەو تیا دانیشتووە. جا لەبەر ئەوە پێش ئەوەی شتێکتان بۆ بگێڕمەوە ئەبێ تەماشایەکی ناو ئاشەکە بکەین نەوەکو ئەمجارەش ئادەمیزادێکی زۆڵ خۆی تیا شاردبێتەوە.

شێرکە ئەمەی بیست وتی:

– ئادەی نامەردتان نەکەن، ئاشەکە بگەڕێن، ئەمە خوایە شیوی ئەم ئێوارەیەمان بۆ دەرچێ. جانەوەرەکان بەجارێ لە جێی خۆیان ڕاپەڕین، هەر کە چوونە ئەودیو دولیانەکەوە بەدبەختیان دۆزیەوە، پەلاماریان دایێ و ڕایانکێشایە دەرەوە، لەبەردەمی پیرە شێردا پارچە پارچەیان کردو پێکەوە خواردیان.

## چیرۆکی دووەم

**«بەختیارو بەدبەخت»** چیرۆکێکی فۆلکلۆری بەکەڵکە لە ڕووی پەروەردەوە، گەورەش لەزەتی لێ وەردەگرێت، وێنەی ئەو چیرۆکە لە فۆلکلۆری نەتەوەی دیشدا وەبەرچاو دەکەوێت. بایەخی ئەو چیرۆکەی تۆفیق وەهبی لە ڕووی زمانیشەوە کەم نییە، کەم لە وتارەکانی ناو **«گەلاوێژ»**یش دەتوانن لەم بارەیەوە شان لە شانی بدەن. **«قەزای دیزە کەوت لە گوزە»** ناونیشانی چیرۆکی دووەمیانە. ئەمیان لەگەڵ چیرۆکی یەکەمدا جیاوازی زۆرەو یادداشتی منداڵێکی بلیمەتە، باس و خواسی قوتابخانەیەکی کوردستانە بەر لە سەدەیەک، بۆیەکا لە ڕووی مێژووشەوە بایەخی خۆی هەیە. مامۆستا وەهبی ئەم چیرۆکەیانی لە لاپەڕە ٩-١٢ی ژمارە سێی بەرگی یەکەمی **«دەنگی گێتی تازە»**دا بلاو کردۆتەوە کە بەر کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٣ دەکەوێت، ئەمەش دەقی چیرۆکی دووەمیانە.

## قەزای دیزە کەوت لە گوزە

مستەفا رەهوان، یا مستەفافەندی بۆ دە ساڵێک زابتی داخلیەی تاکانەی **«مەکتەبی روشدیەیەی عەسکەریی سلێمانی»** بوو. زابتی داخلیە لە دەبستانە سوپاییەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا ئەو ئۆفیسەرانە بوون کە گرتوبەندی ناوەوەیان بەدەست بوو. ئەو ساڵێک لەپێش ئەوەدا کە من بیچمێ، واتا ساڵی ١٨٩٨ نێررابوو بۆ مەکتەبەکەمان. مستەفافەندی لە تورکمانەکانی کەرکوک بوو، لە نەفەرییەوە(سەربازییەوە)پێگەیشتبوو، بوبووە مولازمی ئەوەڵ. هەرچەندە بە رەسمی عینوانی ئەفەندی هەبوو، بەڵام بەراستی خوێندەوارییەکی وای نەبوو کە ئەو عینوانەی پێ بشێ[٦]، قورئانی دەرئەکرد چونکە سەرو بۆری هەیە، زۆریشی ئەخوێندەوە، پیاوێکی دیندار دیار بوو. نووسراوی تر سەروگوێی ئەشکاندن. کەسمان نەمان دی شتێ بنووسێ. ئەموستیلەیەکی زیوی کردبوو بە مۆر، خستبویە ئەموستەتوتەی دەستی راستییەوە، تا بەهۆی ئیمزاکردنەوە قەڵەم نەگرێ بەدەستیەوە لەناو مرۆڤدا. هەرچییێ بێ، ئەم خوێندەوارییە کوێتەی ئەفەندییەتی بۆ پچڕیبوو.

لەبیرم ناچێتەوە مستەفا رەهوان جارێکیان لە مەکتەب بانگی کردمە لایەکەوە، کاغەزێکی پێ نووسیم بۆ کەرکوک. ئەو بە تورکییەکەی خۆی وتی و من بە ناشیەتەکەی خۆم نووسیم، دوای هەمووی وتی: **«یاز مەیرەم خانمە سەلام ایدرەم»**

من ناوی مەیرەمم نەبیستبوو، لە دڵی خۆمدا وتم ئەمە هەبێ و نەبێ ئەبێ **(بەیرام)** بێ کە بە تورکی مانای جێژنە، من بۆم نووسی **«بەیرام خانمە سەلام ایدرەم»**. پاش چەند ساڵێ لەخۆمەوە پەیم پێ برد کە(مەیرەم خانم)ی مستەفا رەهوان (مەریەم خانم)بووە.

منداڵەکانی دەبستان مستەفا فەندییان ناونابوو مستەفا رەهوان. نازانم ئەمە هەر لەبەر وێنەکەی بوو، یان لەبەر رۆینەکەشی و ئاخاوتنەکەشی بوو. مستەفا رەهوان کابرایەکی دەموچاو بۆربۆزی ریش رەشوتۆپی ناونجی باڵاو لاق کورت بوو، بەهەنگاوی کورت کورت، خێراخێرا ئەرۆیی بەرێوە، بەراستی رەهوان بوو، لە ئاخاوتنیشدا وتەکان پچڕپچڕو بەپەلەپەل لە دەمی دەرئەپەڕین.

خوا یەکێکی بۆ ناردبوو هەرچی کاروبارێکی رەسمیی هەبوو کە پێوەند بن

(٦) لە سوپای عوسمانیدا عینوانی **(ئەفەندی)** بۆ ئۆفیسەرە خوێندەوارەکان بوو، ئۆفیسەرە نەخوێندەوارەکان پێیان ئەوتن ئاغا - تۆفیق وەهبی.

بــــه خـوێندنەوەو نــــووسین بــــەوی ئەکــرد. ئــــەم کــابــرایە ســـەرۆکی کـــەڵککارەکانی **(سەر خەدەمی)** دەبستانەکە بوو، ناوی **(حاجی قەلەندەر)** بوو. کەس نەیئەزانی ناوی بنچینەیی چی بووە. حاجی قـەلەندەر بابایەک بوو باڵابەرز، ناوچەوان پان، ریش برنج و مـاش، خـۆش وتە، نووسـەر، شـاعـیـر، فـەیلەسـوف. ئەیانوت خـەڵکی رانیـەیە. لەناو منداڵەکـانا ئەیانگێـڕایەوە کـە حـاجی قـەلەندەر بە قـەلەندەری گـەلێ شـاران گـەڕاوە، دیویانە بەکـڵاوێکی قـوچەوە، ئاوێنەیە بەپێش کڵاوەکەیەوە.

نازانم ئەم کابرا خوێندەوارە چۆن بوبو بە(سەر خەدمە). هەندێ دەرز هەبوو ئەگەر مامۆستاکانیان رۆژێ نەهاتنایە مودیری دەبستان حاجی قەلەندەری ئەنارده دەرزەوە لە باتییان. ئێمە دەرزەکـانی **«ئەسمای تورکی»**، **«قـەرائەتی تورکی»** و **«نووسینی تورکی»** حاجی قـەلەندەر پێی خوێندین. ئەو رۆژەی شەهادەتنامەمان وەرگرت لەناو دەروازەی دەبسـتـانەکـەدا حـاجی قـەلەندەرم تـوش بوو، دەسـتی بەئەسـپـایی خـسـتـە سەرشانم و وتی:

- رۆڵە پیرۆزباییت لێ ئەکەم کە بە یەکەمین دەرچویت. ئێسـتـا تێگەیشتیت کە **«من صبر ظفر»**.

ئێـواران لەپێش ئەوەدا کە بەرەڵلامـان بکەن لە حـەوشی دەبسـتـانەکـەدا دوو ریزە رایانئەوەستاندین، فەرمـانی رۆژانەی دەبستانەکە ئەگەر ببوایە بۆیـان ئەخوێندینەوە. لەپاش ئەوە سێ جار **«پادشاهم چۆق یاشا»**مان ئەکرد، ئینجا بە قۆماندەی **«ساغـە-دون.. عەرش»**ی مستەفافەندی رووەمان ئەکردە دەروازەی دەبستان بۆ دەرەوە.

لەم ئایینەدا فـەرمـانی رۆژانە نەبوو مـسـتـەفـافـەندی بیـخـوێنێـتـەوە، بەڵام مـسـتـەفـافـەندی هەمـیـشـە حاجی قەلەندەری لەتەکدا بوو، بەوی ئەخوێندەوە. لەگەڵ ئەمـەشدا مـسـتـەفـا رەهوان کـە فـێـرکـردنی خووی چاک و گـەشاندنەوەی سروشـتی شاگردەکانی لەئەستۆدا بوو، هەندێ ئێـواران بەپێـویسـتی ئەزانی کـە چەند وتەیەک بڵێ بۆ ئامـۆژگـاریمان. ئەمـە وتنەیەکە لە ئامـۆژگـارییـە رەهوانیـەکـانی، بەزمـانی تورکمانیی کەرکوک:

- بوش دورماوون، او خوویین، دیە قیش، یاز، اوخوو، یاز. أما، أخ نەینم؟ سز

مەنی دینلەمەزسز، سز آدەم اولمەزسز. سزوودەن تەکمە، شەق، زللە، شەپەلاخ پارە ایتمری، سزوودەن پیامەم، نیجە ایدم؟.

مستەفا رەهوان لەپاش ئێمەش چەند ساڵێکی کە گرتوبەند(ضبط وربط)و ئامۆژگاری شاگردە بەدبەختەکانی **«مەکتەبی روشدییەی عەسکەری سلێمانی»**ی لە ئەستۆی نەزانیی ئەودا مایەوە. لە یەکێ لەم ساڵانەدا سەرپەرشتی دبستانەکە وا بڕیار ئەدا کە هەر شاگردێ لە ئیمتیحانی خسوسیدا[۷] لەهەر دەرزێکدا سفر وەربگرێ بەرانبەر بەوە بەپێنج دار حەسیر مەیدان بکرێ[۸].

چەند رۆژێ بوو ئیمتیحانی خسوسی کرابوو. ئێوارەیەکیان لە پاش ریزبوونی منالەکان مستەفافەندی دێتە پێشەوە، عەزیز چاوەش کە دەرگەوانی ئەمەکداری دەبستانەکە بوو، بە دەفتەری رۆژانەوە بەشوێنیەوە، لە دوای ئەوانیشەوە کەریم بۆرێژەن بە حەسیرێک و یەک دوو تووی لە هەنارەوە. مستەفا رەهوان کەمێ ئەوەستێ، بەپەرۆشەوە بەم لاو ئەولادا چاو ئەگێرێ، چاو ئەبڕێتە دەروازەی دەبستانەکی ئەمە خوایە حاجی قەلەندەر لە کونێکەوە پەیدا ببێ تا فەرمانەکەی بۆ بخوێنێتەوە. بەڵام، بۆ بەدبەختی حاجی قەلەندەر ئەرزی دریبوو، پیاچووبوو. لەم دەمەدا کەریم بۆرێژەن حەسیرەکە رائەخا و دوو توولە هەنارەکەی لاوە دائەنێ.

کاتەکە کاتی چاوەڕوانی نەبوو، مستەفا رەهوان ناچار دەفتەرەکە لەدەست عەزیز چاوەش وەرئەگرێ و دەست ئەکا بە خوێندنەوەی. فەرمانەکە تێدا نووسرابوو کە **«عەبدولعەزیز ئەفەندی لەبەر ئەوە کە لە نۆ دەرزدا سفری وەرگرتووە بە چل وپێنج دار سزای ئەدرێتێ. ئەم سزایە بۆ پەندی گشتی ئەبێ پێش سزای ئەو شاگردانە بکەوێ کە لە یەک دوو دەرزا سفریان وەرگرتووە»**.

مستەفافەندیی زانا سەرو گوێلاکی وشەکان شلکوت ئەکا، لە باتی عەبدولعەزیز ئەفەندی عەبدوڵڵا عەزیز ئەفەندی ئەخوێنێتەوەو بە ناخێری گیانی کە لێ ئەبێتەوە دائەنەوێ شووڵێ هەڵئەگرێ و روو ئەکاتە عەبدوڵڵا ناوێ هەر لەو پۆلە کە ناوی فێر

---

(۷) ئیمتیحانی خسوسی ئەو ئیمتیحانە بوو کە لە ناوەڕاستی ساڵدا ئەکرا. هەندێ ساڵ دوو ئیمتیحانی تایبەتیی تێدا ئەکرا - تۆفیق وەهبی.

(۸) سزای حەسیر مەیان ئێواران، کە شاگردەکان کۆئەکراونەوە بۆ ئاینی درودی پادشایی، ئەکرا، بە چەشنێ کە لەم گێرانەوەیەدا دەیبینن -تۆفیق وەهبی.

بووبوو، ئەڵێ:

- چخ عەبدوڵلافەندی.

- عەبدوڵلا دەسبەجێ ڕەنگی زەرد هەڵئەگەڕێ، ئەڵێ:

- ئەفەندم من نیم.

-چخ دی ییرەم.

-ئەفەندم بەخوا من نیم.

- عەزیز چاوش! یازن اویزنی یەرە.

عەزیز چاوەش و کەریم بۆرێژەن پەلاماری مناڵی تایەن ئەدەن و بەزۆر لەپەوڕوو لەسەر حەسیرەکە ڕای ئەخەن. یەکێکیان لەمسەرەوە هەردوو بازووی مناڵەکە هەڵئەگێرێتەوەو هەردوو مەچەکی ئەگرێ و توندتوند ئەیاننوسێنێ بە پشتیەوە، ئەوی تریشیان هەردوو پێی مناڵەکە ئەنووسێنێ بەیەکەوە توند ئەیانگرێ. ئینجا مستەفا ڕەهوان دێتە لاوەو دەست ئەکا بە شووڵ کێشان بە تەریزەیا. مناڵ هاوار ئەکا:

- ئەفەندی هەی هاوار من نیم.

سوودی نابێ، مستەفا ڕەهوان لەگەڵ دارژماردن خەریکە، ئەبێ چل وپێنج تەواو بکا.. مناڵی بەسەزمان هەتا نووزەی لێ ئەبڕێ هاوار ئەکا:

- هەی هاوار من نیم، بۆ خاتری خوا من نیم، بەخوا من نیم، بەخوا من نیم... من نیم... من نیم...من... .نیم......من......نیم...من....... . نیم... من...... . نیم... من... من... ئم... ئم... ئم.

عەبدولعەزیزی خاوەن سزاش کە لە ناو ریزی مناڵەکانا وەستاوە، چونکە مناڵ ئەبێ هەر لەسەری کارەوە ئەحەپەسێ، دڵە کوتێی تووش ئەبێ، هەموو لەشی وەک بینی ئاو دێتە لەرزین، دانی دەست ئەکا بە چۆقەچۆق، بەرچاوی تاریک ئەبێ، ئیتر نازانێ چی بکا.

کە چل و پێنج دارە تەواو ئەبێ کەڵککارەکان عەبدوڵلای هەناسەسارد ڕاست ئەکەنەوەو بە هەردووکیان ئەیگرن تا نەکەوێ. لەم کاتەدا مناڵەکان زراوەترەک بوون، هەندێکیان سەری عەبدوڵلا ئەگرن کە بیدەن بەکۆڵی کەریم بۆریژەناو بیبەنەوەماڵەوە، بەڵام بەشی زۆریان هەر لەپێش ئەوانەوە روو ئەکەنە دەروازەکە،



عەبدولعەزیزیش لەگەڵ ئەماندا.

عەبدولعەزیز سا هەرچۆنێ بێ ئەگاتە ماڵەوەو سەرو لەپ لێی ئەکەوێ، تایەکی قورس دایئەگرێ، هەموو شەو ئەبزرکێنی:

- عەبدولعەزیز، عەبدوڵلا عەزیز، عەبدوڵلا، ئەفەندم من نیم، چخ دی ییرەم، ئەفەندم بەخوا من نیم، عەزیز چاوەش، یاترن، هەیهاوار، من... نیم... من... ئم... ئم... ئم....

بۆ بەیانی باوکی پزیشکی دێنێتە سەر، لای نیوەڕۆ ئینجا چاوی ئەکاتەوە، بەرە بەرە قسە بۆ دایک و باوکی ئەکا. دڵخۆشی ئەدەنەوە، دیاری و میاری بۆ ئەکڕن و پێی ئەڵێن تۆبە، ئیتر نایبنێرنەوە مەکتەب، ئیتر مستەفافەندی ناتوانێ لێی بدا.

باوک و کەسوکاری عەبدولعەزیز لەلایەکەوە بە دیاری و پاڕانەوە باوکی عەبدوڵلاو عەبدوڵلا خۆشنود ئەکەن، لەلایەکی تریشەوە ئەشرافی سلێمانی تکاکار ئەنێرنە لای فەرماندەی سوپایی شارەکەو پێی ئەڵێن **«سزاکە منالێ کێشاوێتی، ئەمە قەزایەکەو بووە، ئیتر خوا هەڵناگرێ منالێکی تریش بەو مەرەیە بچێ»**.

لەپاش بەڵێنی فەرماندەرەکە عەبدولعەزیز ئەگەڕێتەوە مەکتەب و قەزای دیزە دابووی لە گۆزە!.

## دوا وشە

ئافەرین مامۆستای گەورەو هێژا جەنابی تۆفیق وەهبی بەگ بۆ خۆت و بیری تیژو نووسینی وردو رازاوەت، بۆ خۆت و گوڵبژێری لەباری وشەو زاراوەو رستەی نازداری پتر لە نیو سەدەی لەمەوبەرت کە دەتخەنە ریزی هەرە پێشەوەی خامەڕەوانانی کوردەوە، ئافەرین و هەزار جار ئافەرین کە فریا نەکەوتی بەرهەمی وا نازدارمان بۆ بنووسی هەرچەندە سەرقاڵی **«دەستووری زمانی کوردی»**و رێنووسی کوردی بە عەرەبی و بە لاتینی و **«بارامی گور»**و مێژووی ناوی کەرکوک و شارەزوورو گەشتی ملەی تاسلوجەو دەیان باسی قووڵی تر بوویت. ئافەرین چۆن فریاکەوتیت هەر لەو ژمارەیەی **«دەنگی گێتی تازە»**دا کە **«قەزای دیزە کەوت لە گۆزە»**ت تێدا بلاویکردۆتەوە چوار بەرهەمی بەپێزی تر دەربارەی مەم وزینی ئەحمەدی خانی و پیرەمێردو دەستووری زمانی کوردی و ئەحەی کوڕنو بلاوبکەیتەوە، فێرمان بکەیت بلێین رستەو فرۆکەو فەرمان و ئاگاو ئاگای تەواوو دانیارو وێنەو چەندان وشەی پەتیی تر کە ئیمرۆکە هەموومان پێیان راهاتووین و بەهۆی جەنابتەوە نووسینی کوردییان پێ دەرازێنێتەوە. هەڵبەت چیرۆکەکانی مامۆستا وەهبیش جێگەی خۆیان دەبێت لەناو تۆماری خزمەتە گەورەکانیدا. شایانی باسە مامۆستا بۆ خۆی چەند جارێک لە نووسینەکانیدا گەڕاوەتەوە سەر **«بەختیارو بەدبەخت»**ەکەی و ساڵی ١٩٦٦ کردوویەتی بە پاشکۆی ژمارە شەشی فەرهەنگە **«کوردی - ئینگلیزی»**یەکەی کە لەگەڵ ئەدمۆندسدا لە ئۆکسفۆرد بلاویانکردۆتەوە. ئەمجاریان **«بەختیار و بەدبەخت»** بەکوردی بەپیتی لاتینی و ئینگلیزی بلاوکراوەتەوە(٩).

---

(9) Taufiq Wahby and C. J. Edmonds, A Kurdish English Dictionary, Oxford, 1966, Appendix VI, PP. 175-179.

بابەتی یەکەم*

# دەرسێکی مێژوو
# بۆ هاوسەرانی نووسەران

گەلێک جار وتارەکانم پێشکەش دەکەم بە پیاوچاکێکی کورد، یا یەکێک لەوانەی کوردیان خۆش دەوێت. ئەمجاریشیان ویستم بە هەمان دەستوور ئەم وتارە پێشکەش بکەم بە یەکێک لەوانەی لای من شایستەی رێزو تەقدیرن. بەر لە هەمووان بیرم لە قەدەم خەیرو مەستوورەی کوردستانی و حەپسەخانی نەقیبی سلێمانی و لەیلا زاناو ئەختەرو ئەوانەی **«ژیانەوە»** دەور ئەکەن کردەوە، ئینجا هاتمە سەر دایکم و فاتمەلبەتولی خەسوم و سینەم بەدرخان و شابالی ماجید مستەفا و قەفتانەکان و شەفیقە سەعیدو بەهێ مەعروف و زەکێی سام ئاغاو پەریخانی میرزا فەتاح و خوشکەکانی خۆم- زەکاوو نەساوو نەجاتی خۆشەویست، جگە لە شیرینی هاوسەری کاکە حەمەی مەلا کەریم کە زوو زوو لەسەر من پەلاماری حەمەی خۆشەویستی هەردووکمان دەدات.

نایشارمەوە زۆر زوو بیرم لە شەهلای خۆیشم کردەوە کە تا ئێستا جارەهای جار لەسەر بەرماڵ هەر سی جزمەی قورئانی خەتم کردووەو هەر ئەوەندە دەزانیت پەلاماری **«تەفسیری جەلالەین»** دەدات بێ ئەوەی **سێ دێری لە بەرهەمەکانی من خوێندبێتەوە.** هەر چۆن بێت ئەم وتارەم پێشکەش دەکەم بە گشت ئەوانەی ناویانم هێناوەو هەموو کیژە کوردێکی دڵسۆز، تایبەت سەمیرەو ژیان و ئامینە خان و موناو

(*) لە گۆڤاری **«رەنگین»**، ژمارە (١٢٦)، لە ١٤ی تەمووزی ١٩٩٩، لە ل٦-٧دا بلاوکراوەتەوە.

مەی کە وەک مۆم بۆ **«رەنگین»** و **«رۆشنبیری نوێ»** و **«بەیان»** دەسووتێن.

باسی ئەمجارمان دەربارەی هاوسەری یەکێک لە کەڵە ناسراوەکانی جیهانە- هاوسەری مەکیاڤێللیی بەناوبانگ. نیکۆلۆ دی بیرناردۆ مەکیاڤێللی(١٤٦٩ - ١٥٢٧) لە نووسینە سەرەکیەکانی خۆیدا بە دەگمەن توخنی باسی ئافرەت کەوتووە، چونکە ئەو لە سیاسەت و هونەری فەرمانڕەوایی دەدوێت و ئەوانەیش هەمیشە کاری پیاو بوون، هەرچەندە دەبوو بیوتایە گەر لەو بووارەدا ئافرەتیش دەستی بڕۆیشتایە لەوانەبوو ژمارەی لاپەڕە تاریکو تروسکە خوێناوێکانی مێژوو کەمتر بوایەتەوە، چونکە بەپێی یاسای سروشت ئافرەت لە پیاو دڵنەرمترە.

مەکیاڤێللی هەرچەندە سەرەتاتکێ و چاوبازی و ئەمـلاو ئەولای کردووەو سەرنجی گشت ئافرەتە شۆخەکانی دەوروبەری ڕاکێشاوە، بەڵام ماریێتای هاوسەری و هەر شەش منداڵەکەی دەپەرست. کە لە فلۆرەنسە دوور دەکەوتەوە بەپەرۆشەوە نامەی پڕ لە سۆزی بۆ ماریێتا دەنووسی و هەمیشە پێی دەگوت **«رابەرە خۆشەویستەکەم»**. لەگەڵ ئەوەشدا مەکیاڤێللی لە هەرشت پتر شەیدای ئیتالیای ژێردەستەو دابەشکراو بوو، بۆیەکا سەرلەبەری ژیانی خۆی بۆ ئەو تەرخان کرد، لە هەشت بەرگدا کەوتە شیکردنەوەی مێژووی و لە بەرهەمەکانی تریشیدا کەوتە سۆراخی ئەو رێبازو قارەمانە لێهاتووەی دەیتوانی رزگاری بۆ ئیتالیا بسێنێ. لەبەر ئەوە مەکیاڤێللی غەرقی ناو دەریای کتێب و بەڵگەنامەی دەگمەن و دەسنووسی زەردباو بوو، دەستی بەسەر هیچدا نەدەپەرژا، شەوو رۆژ بیری دەکردەوە، دەیخوێندەوەو دەینووسی.

ماریێتاش ئافرەتێکی ژیرو دووربین و نیشتمانپەروەر بوو، دروست لەوە گەیشتبوو کە مەکیاڤێلليی هاوسەری **چ ئەرکێکی پیرۆزی گرتۆتە ئەستۆو لەناو هەمووواندا خۆی بۆچی تەرخانکردووە،** بۆیەکا، بە پێچەوانەی زۆربەی دەستە خوشکەکانیەوە، رۆژێک لە رۆژان رێگەی بە خۆی نەئەدا ببێتە تەگەرە، یان کۆسپ لەبەردەم مەکیاڤێللیدا، بۆی ببووە پاڵپشت، پەپوولەی ناوماڵ، ئەو کەیبانووە دەستڕەنگینە رووخۆشەی هەموو پیاوێک ئاواتەخوازی بێت، وا نەبوایە زەحمەت بوو مەکیاڤێللی بگەیشتبایە ئەو پایەو مەقامەی پێی گەیشت. هەڵبەت راستیان



**شیرین خان، مامۆستای رۆشنبیران**



**شەمملا خان، هاوڕازی د. کەمال**

گوتووە کە لە پشت هــەر گەورە پیاوێکەوە ئافرەتێکی گەورە هەیە.

رۆژێکیان لە شاری فلۆرەنسەی بەناوبانگ دەستەیەک لە هاوسەرانی ناوداران، ئەدیبان و نووسەران و سیاسەتمەداران کۆبوونەوەیەکی تایبەتییان لەناو خۆیاندا ساز کــرد بۆ هەڵســەنگاندنی باری ژیانیــان لەو دەوروبەرەیاندا کــە لە زۆر رووەوە لە دەوروبەری خەڵکی تری نەدەکرد. مارییێتای هاوسەری مەکیاڤێللی یەکێک بوو لە بانگکراوەکان. هەر لە سەرەتاوە خانمێکی قسەزان بووە دەمڕاستی دانیشتووان و کــەوتە شــیکردنەوەی باری نالەباری هاوســەرانی ناوداران و لەناو هەمــوواندا مارییێتای هاوسەری مەکیاڤێللی کردە نموونەی سەلمێنەری بۆچوونەکانی و فەرمووی :

**بەرێزان ، هاوسەرانی هونەرمەندان و نووسەران و هەڵکەوتووان، لە هەمــوومان پتر مــارییێتای هاوسەری مــەکیاڤێللی دەتوانێت وێنەی چارەنووسی ناهەمــواری ئێمەومانان بکێشێت، بێگومــان هەگبەکەی پڕەو دەشێت لەم بارەیەوە زۆرمان بۆ هەڵبڕێژێت، مێردەکەی یەکێک بوو لەو شەیتانە دڕندە زۆرزانانەی تەنها بە رووکەش مرۆڤن و ژیانی جەنابتان و ناسوودەییتان دەبنە قوربانیی ئەوەی لە مێشکیاندا**

**پەنگی خواردۆتەوە، یا ئەوەی هەڵیدەڕێژن. لێرەدا کاتێک باسی ماریێتای دڵسۆزو هێمن و راستگۆ دەکەم مەبەستم هەمووتانە. ئەو پاڵەوانە هەر بۆ خۆی بە تەنها خەمخۆری ماڵ و منداڵ بوو، ماکیاڤێلیش لە جیهانێکی تردا بە میرو میرانەوە خەریک بوو(*).**

ئەو رۆژە خانمی دەمڕاستی دانیشتووان زۆری لەو بابەتە رست و ئاگری رقی ناپیرۆزی خۆش دەکردو مەکیاڤێللی کردبووە بنێشتەخۆشەی ژێر دانی، لەو کاتەدا هەموو بە پەرۆشەوە چاوەڕوان بوون بزانن ماریێتا چ دەڵێت. ماریێتا لەسەرەخۆ هاتە دەنگ و گوتی:

**من بەش بە حاڵی خۆم هیچ جۆرە گلەییەکم لە نیکۆلۆ نییە لەوە بەولاوە کە مرۆڤێکی کەم ئیمان بوو، قێزی لە کەشیدە بەسەرو قەشەکانی کڵێسە دەهاتەوە، کتێبە لەعنەتییەکانی لە نوێژو رۆژوویان کردبوو، رۆژانی هەینی بێ باکانە گۆشتی دەخوارد، ئەوەی لێ دەرکەیت ئیتر من هیچ گلەییەکم لێی نییە، نیکۆلۆ هەمیشە چ خۆم و چ منداڵەکانی خۆشدەویست، بەپێی توانای رۆژێک لە رۆژان نەیدەهێشت لەسەر هیچ پەکمان بکەوێت. دەمزانی جاروبار شیعر بەسەر باڵای ئەم شۆخ و ئەو شۆخدا هەڵدەدات و نامەی رازاوەیان لە رێگەی کابیتینۆوە بۆ دەنێرێت، کابیتینۆی هاورێمان ئەو نامانەی نیشان دەدام بەر لەوەی بیانگەیێنێتە شوێنی مەبەست، بەڵام من ئێستاو ئەوساش ئەوەم نەدایەوە بەرووی نیکۆلۆدا، چونکە دەزانم ئەو جۆرە کەڵە پیاوانە پێویستیان بەوەیە خەیاڵی فراوانیان برەوێنن، ئەو ئافرەتانە وەک جامی مەی وان بۆ ئەوان... نیکۆلۆ بە هەژاری، بەڵام بە سەربەرزی بەجێی هێشتین.**

پێم وایە دەبوو ماریێتا ئەوەش بڵێت کە نیکۆلۆ دی بیرناردۆ مەکیاڤێللیی هاوسەری نەمری بۆ ئەویش نووسی، کەس ناوی هەزاران و هەزاران شاجوان و ملیۆنەها هاوسەری رێکوپێکی تری ئەم گێتییە پان و بەرینەی لەیاد نییە، کەچی مێژوو ناوی ماریێتای هاوسەری مەکیاڤێللیی بە رێکوپێکی بۆ پاراستووین، **ئەوەش بۆ خۆی یەکێکە لە بایەخی وانە زۆرەکانی مێژوو!**

---

(*) مەبەستی کتێبی **«میر»** کە بەناوبانگترین بەرهەمی مەکیاڤێللییە.

بابەتی دووەم*

# رەخنەو گلەیی لە خۆم

بە داخەوە زۆر جاران شتم لەبیر دەچێت، جارویاریش کەمتەرخەمی دەکەم، هەرچەندە نە ئەمیان و نە ئەویان لەگەڵ سەرنج و هەست و نەستمدا ناگونجێن و لەوانەشە گلەیی رەوام بهێننە سەر. کێ بڕوا دەکات ئەوە بیست و حەوت ساڵی تەواوە نامەیەکی پرۆفیسۆری بەناوبانگ و دڵسۆز کوردۆییڤم لە لینینگرادی ئەوساوە نەگەیاندۆتە دەست برای هەرە خۆشەویستم مامۆستا ئیحسان شێرزاد، نامەکە هەروا بە داخراوی لە ناو چاوی مێزی نووسینەکەمدا هەڵگیراوەو مێزەکەش بۆ خۆی دیاریی کاک ئیحسانە. پاش کۆچی دوایی کوردۆییڤ بە چەند ساڵێک بەو کەمتەرخەمییەی خۆمم زانی و عوزرم بۆ ئیحسان شێرزاد، خوا تەمەن درێژی بکات، هێنایەوە.

ماوەیەکە بە رێکخستنەوەی کتێبخانەکەمەوە خەریکم، چونکە خەریک بوو زۆر تێکەڵ وپێکەڵ بێت. کە سەیر دەکەم دەیان کەمتەرخەمی تری ئەوتۆم کردووە کە هەرگیز نەدەبوو شتی وا لە من بووەشێتەوە. کورد واتەنی مشتێک نمونەی خەراوێکە، وا منیش لەناو دەیان شتی تردا تەنها ئەمیان دەگێڕمەوە.

لە رۆژانی خوێندندا لە وڵاتی شوورەوی دکتۆر جوبرائێل رۆئێندیژم ناسی کە یەکێک بووە لە پەنابەرە سیاسییە ئێرانییەکان لەوێ، کاتی خۆی ئەفسەر بووەو داویەتە پاڵ شۆڕشگێڕانی ئازەربایجان کە پێشەوەری هاوسەنگەری قازی محەمەدی

---

(*) لە گۆڤاری «رەنگین»، ژمارە (١٢٧)ی رێکەوتی ١٤ی ئابی ١٩٩٩، لە ل٦-٧دا بڵاوکراوەتەوە.

خۆمـان رابەریان بوو. رۆئێندیژ لە شاری باکۆ، لە ئامۆژگـای گـەلانی رۆژهەلاتی نزیک و ناوەڕاست دوکتۆرای دەخوێند.

ئەو پیاوە کوردی خۆشدەویست، پێوەندی لەگەڵ دوکتۆر رەحیمی قازی و دوکتۆر عەلی گەلاوێژدا زۆر چاک بوو، لەو کتێبەیدا کە ساڵی ۱۹٦٦ بە زمانی رووسی بە ناونیشانی **«خەباتی گەلی عیراق دژی پەیمانی بەغدا»**وە بلاوی کردۆتەوە بە رێزەوە باسی تێکۆشانی کوردی لەو بووارەدا کـردووە. **بەلام دوکـتـۆر رۆئێندیژ لە هەمووان پتر ریزی بارزانی دەگرت، وا دیارە لە نزیکەوە دەیناسی.** کە مایسی ساڵی ۱۹۷۰ گەڕامەوە بۆ نیشتمان، رۆئێندیژ زنجیرەیەک لەو وتارانەی خۆی، کە بەزمانی ئازەری لە رۆژنامـەی **«ئازەربایجـان»**دا دەربارەی مـێـژووی هاوچەرخی عـیـراق بلاوی کردبوونەوە، بە مندا ناردنییە خزمـەت بارزانی و لای ناونیشانی هەموویشیانەوە دوو سێ دێڕی پڕ لە سۆزی بە ئازەری بۆ نووسیووە. جا کێ بڕوا دەکات لەم رۆژانەدا زانیم کە ئەو دیارییەش یەکێکە لەو راسپاردانەی نەمگەیاندونەتە جێ. هەرچەندە ئەمیانە خێری تێدایە بۆ کتێبخانەکەی خۆم، بەلام بریا وا نەبووایە.

ئەم سـەرەتایەم بە پێـویست زانی بۆ گـێـڕانەوەی سەرگـوزشـتـەیەکی پڕ بەهای دوورودرێژ کە ئەمەی لای خوارەوە پوختەیەکی زۆر کورتییە:

لە پۆلی یەکی ناوەندیدا مـحـەمـەد رەشـیـد ئەحـمـەدم ناسی، کـوڕێکی زیرەکی لەسـەرەخـۆی بێ وەی بـوو، زمـان و دەروونی یەکـجـار خـاوێن بوون. لە کـۆلیـجی پەروەردەی زانکۆی بەغـداش، کە ئەوسـاکە **«دار المعلمين العالية»**یان پـێـدەگوت، هەر بەیەکەوە بووین، ئەو لە بەشی فیزیا بوو، منیش لە بەشی مێژوو. دوواییش لە ولاتی شوورەوی پێکڕا خوێندنی بالامـان تەواو کرد. برایەتیمـان تا دەهات پتەوتر دەبوو، تـایـبـەت چونکە کـوردێکی دلسـۆزیش بوو. **گـشت هاوخـوێندکـارانی ئەو رۆژگارە ئەوەمان لە یادە چۆن کاکە حەمە لە ناوجەرگەی زانکۆی مۆسکۆدا لەسەر کـورد زەبەلاحێکی شوڤێنیی دوو هێندی خۆی بە تەکـانێکی پەهلەوانەی پڕ لە رقی پیرۆزەوە خەپ کرد.**

کاکە حەمە لە بوواری فیزیکدا زۆر سەرکەوتوو بوو، زۆری نەبرد بووە زانایەکی لێهاتووی ئەتۆم و لەگەڵ زانا ئەوروپاییەکاندا وتاری هاوبەشی بلاودەکردەوە. داخم



**د. محەمەد ڕەشید ئەحمەدو نەسرین عەبدوڵڵا**

ناچێ پایزی ساڵی ١٩٧٨ ئەو زانا گەورەیەمان ئیفلیج بوو. هەرچەندە وەک دەڵێن تەمەن بەدەست خوایە، بەڵام پێم وایە ست نەسرین عەبدوڵڵای هاوسەری نەبوایە زۆر زوو ئەو ئەستێرەیەمان ئاوا دەبوو. لە ماوەی هەژدە ساڵی ڕەبەقدا ست نەسرین بووە فریشتەی ئەو کەفتەکارە، شەوو ڕۆژی لە یەک دەداو لەسەر جێگە ئەمدیوو ئەودیوی دەکرد نەبا خوانەکەردە زیبکەیەک لە لەشی بێت. دەرمانی لەبن ئەرزدا بۆ پەیدا دەکرد، ببووە دایک و باوکی شوان و لەیلان، کەیبانووی ماڵەوەو پیاوی دەرەوە، مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێت بە چ دەردی سەرییەک ئەو پارچە زەوییەی کردە خانوو کە کاکە حەمە لەگەڵ مامۆستایانی زانکۆدا بەر لە نەخۆشییەکەی وەریگرتبوو. لە گەڕەکی ئێمە ئاو کز بوو، بە چاوی خۆم دیومە ئەو ئافرەتە شۆخە بە دەستی خۆی بە سەتڵ ئاوی سەردەخست بۆ ئاوڕشێنی چیمەنتۆی سەربان. **لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژێک ئەو ئافرەتەم بە ڕووگرژی نەدی، زۆر زیرەکانە هەستی کاکە حەمەی دەبزواندو ئازاری لەشی لەبیر دەبردەوەو بە زۆر دەیهێنایە پێکەنین. بێ هیچ جۆرە پاداشتێک لە ماڵەکەی خۆیدا ماماتیکی بە کوڕو کچی ئاسیاوان دەگوتەوە. ست نەسرین بووە نموونەو وێردی سەر زمانی گشت دانیشتووانی گەڕەکەکەمان.**

بەرەبەیانی ڕۆژی حەڤدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٦ خوا کاکە حەمەی بردەوە. ئا

لێرەدا داستانی نەسرین عەبدوڵڵا دەگاتە لوتکە. لەسەرەخۆ، بەدەم هەنسک و چاوی پڕ لە فرمێسکەوە ناوچەوانی حەمەی ماچ کرد، بێ دەنگ هاتە دەرەوە چونکە نابێت شوان بە هیچ بزانێت تا بەرچاویی خۆی دەکات، لەیلانیش نابێت لەخەو هەڵسێت چونکە سبەینێ تاقیکردنەوەیەکی قورسی هەیە. بەهجەت و کەمال کوردن و نزیکن، جارێکا با هەر ئەو دووانە پێی بزانن. بەڵام کەمال لە نیوەشەوەوە چووە لەگەڵ خزماندا تەرمی شێخ عوسمانی نەقشبەندی بەرێ بکات، کەوابێ مایەوە سەر تەنها بەهجەت. بە جووتە چوون شەهادەی وەفات و سندوقی تایبەتی تەرم و تاکسییان هێنا ، ئەوجا دراوسێ پێیانزانی.

تەرمی حەمە لە بەغداوە بەرەو گردی سەیوانی سلێمانی کەوتە رێ. ست نەسرین پێی ستەم بوو کتوپڕو لەناکاو تەرمی برای تاقانە بەرێتە بەر ماڵی خوشکەکانی، پێشی رەوا نەبوو بیباتە لای براکانی خۆی، بۆیەکا هەر لە رێگاوە بڕیاریدا تەرمەکە بە مزگەوتێکی شار بسپێرێت و بۆ خۆی بچێتە لای محەمەدی برای و لەسەرەخۆ لەگەڵ ئەودا تەدبیرێک پێکەوە بکەن. ئەم قسانە هەر بەدەم خۆشن و تەنها لە دڵ و دەروونی ئەو ست نەسرینە دێن **کە تا ئێستاش خۆزگەو ئاواتی گەورەی ئەوەیە هەژدە ساڵی تریش بە دەستی خۆی لەناو جێگەدا ئەمدیوو ئەودیوی حەمەی هاوسەری بکردایە.** هەڵبەت لەخۆڕا نییە تا ئێستا چەند جارێک وتومە هەر پەیکەرتاشێکی جیهانی بیەوێت کۆتەڵێکی رازاوە بۆ ژنی وەفادار دابڕێژێت پێویستە بەر لە هەر شت بێتە خزمەت نەسرین عەبدوڵڵاو گوێ لە داستانی دانسقەی ئەو ئافرەتە کوردە سەربەرزە بگرێت و رووی ئەو بکاتە نموونەی کۆتەڵەکەی. جارێکیان داستانی ئەم ست نەسرینە لەبەر چاوی خۆی دڵە گەورەکەی فوئاد عارفی هەژاندو بۆ یەکەم جار فرمێسکم لە چاویدا بە قەتیسماوی دی.

لێرەدا دێمە سەر مەبەست و دەڵێم بە ریشی کێ رەوایە **کەمال مەزهەر** ئەم داستانە گەورەیە لە یاد بکات و ناوی ست نەسرین نەخاتە ریزی پێشەوەی ئەو ناوانەی کە وتاری **«دەرسێکی مێژوو بۆ هاوسەرانی نووسەران»***ی لە ژمارەی

(*) «ئاماژەیە بۆ بابەتی یەکەم لە بەشی چوارەم لە ل(٥٥٥، ٥٥٨ )ی ئەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە- **عەبدوڵڵا زەنگەنە**».

پێشووی «رەنگین»دا پێشکەش کردوون. تۆ بڵێی ئەمە سووکە پاکانەیەکم لای ئەو ئازیزانە بۆ بکات کە نامە بێ وەڵامەکانیان ئیمڕۆکە یەکێکن لە شتە نازدارەکانی ناو کتێبخانەکەم، یا ئەوانەی راسپاردەکانیانم نەگەیاندوون.

**بابەتی سێیەم***

## یادی نەورۆز و خۆزگەیەک

ئێمەو مانان لەسەرەتای ژیانمانەوە مێشکمان بە وشەی نەورۆزو جێژنی نەورۆز گۆش کراوەو زاخاو دراوە، بە هۆی نەورۆزی ئەحمەدی خانی لە مەم و زین داو بە هۆی پیرەمێردی گەورەوە لە چلەکانەوە ئاگامان لە نەورۆزە، لەوساوە بە جێژنی نەتەوەیی خۆمانی دەزانین.

نەورۆزەکەی ساڵی ١٩٥٤ی سلێمانیش، لە رۆژانی فەرمانڕەوایی فازیل جەمالیدا کە قەدرمان نەزانی، رۆژێکە لەو رۆژانەی لەیاد ناکرێن، شار هەمووی خرۆشا، لاوان بە بەرگی کوردی و کیژان بە ئاڵ و واڵای زەردو سوورەوە رژانە تووی مەلیک کە پێم وایە هەوارگەی مەلیک مەحمود بووە بۆیە وا ناونراوە. هەرگیزاوهەرگیز ئەو نەورۆزەی ساڵی ١٩٥٥یش لەیاد ناکەم چۆن ئێمەی شاگردانی زانکۆی بەغدا بە دزییەوە چووینە ئەو ناوچەیەی ئێستا پێی دەگوترێ «جزیرە الاعراس»و لەوێ ئاهەنگێکی بە سۆزمان ساز کرد. درەخشان عارف نەجیب و نازەنین قەفتان و گوڵشەن سەعید رەواندزی و نەجمەددین و فوئادی مەجید بەگ و رەفیق فەتحوڵلاو شیروان عەلی ئەمین و کاوس قەفتان و ئیحسان فوئاد لە بەشدارانی ئەو نەورۆزەن کە تا ئێستاش لە یادمن. ئەوەی بیرم بێ دوکتۆر ئیحسان فوئاد لەو ئاهەنگە نهێنییەماندا پارچە شیعرێکی نازداری خوێندەوە، بەپێی

---

(*) لە ژمارە (١٠٠-١٠١)ی گۆڤاری «رەنگین»، ساڵی ١٩٩٧، لە ل٦دا بلاوکراوەتەوە، واتا لە یادی نەورۆزدا.

پێودانی ئەو شیعرە دەبوو کاک ئیحسان ئێستا یەکێک بووایە لە کەڵە شاعیرانی کورد.

کە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ سەرکەوت ئێمە هێشتا شاگردی زانکۆ بووین، دوو ئاهەنگی قەشەنگمان لە نەورۆزی ساڵی ١٩٥٩دا* گێڕا، یەکەمیان لە دەرەوەی بەغدا کە بە هەزاران کەس بەشدارییان کرد، ئەوی تریان لە هۆڵی کۆلێجی عولوم لە ساحەی عەنتەری ئێستا. لەمیاندا عەبدولکەریم قاسم و ژمارەیەک وەزیرو کوردی ناسراوو باڵوێزی شوورەوی و چەند دیپلۆماسییەکی وڵاتە سۆشیالیزمەکان میوان بوون، عیزەددین مستەفا رەسوڵ کە زۆر نەبوو لە سووریەوە گەڕابۆوە، عەریفی ئەو ئاهەنگە بوو. ئەو شەوە عەبدولکەریم قاسم قسەی کردو ئەوی بیرم بێ گوتی : **مژدە بە هەمووان بدەن کە پاش چەند رۆژێک بڕیارێکی گرنگ بڵاو دەکەینەوە، یەک دوو رۆژی نەخایاند بڕیاری کشانەوەی عیراقی لە پەیمانی بەغدا راگەیاند.**

بۆ ساڵی داهاتوو نەسرین فەخری و مارف خەزنەدارو عیزەددین مستەفاو من بۆ خوێندنی باڵا لە وڵاتی شوورەوی هەڵبژێردراین، ئەوە رووداوێکی رووناکبیریی گەورە بوو، تەنانەت کاک فوئاد عارف کە ئەوساکە وەزیری دەوڵەت بوو بە تایبەتی ناردی بە دووماندا. ئەوە یەکەم جار بوو کاک فوئاد ببینم، هەر لای ئەویش ئەو رۆژە بۆ یەکەم جار لە ژیاندا عەلی کەمالم دی، چ ئەمیان و چ ئەویان دوو کوردی لێهاتوون، شایانی ئەوەن ناویان لە نەورۆزنامەدا تۆمار بکرێ. هەر لەو رۆژانەشدا لە نزیکەوە مامۆستا بەشیر موشیرم ناسی، زۆری پێ خۆشبوو دەچین بۆ خوێندن، گەلێک ئامۆژگاری نەسرین فەخری وعیزەددین و منی کرد. خوالێخۆشبوو کوردپەروەرێکی سەیر بوو.

رۆژی شازدەی مارتی ساڵی ١٩٦٠ هەر چوارمان بەرەو وڵاتی شوورەوی بە فرۆکە کەوتینە رێ، رۆژێکمان لە ڤیەنا لەگەڵ دوکتۆر وریا رەواندزیدا بردە سەر، خزمەتێکی زۆری کردین و گەلێک مۆزەخانەو شوێنی خۆشی نیشاندایین. دوای ڤیەنا چووینە ستۆکهۆڵمی پایتەختی سویدو لەوێ شەوێکمان بردە سەر، لای

---

(*) هیوادارم دکتۆر کەمال لەبیری نەچوبێتەوە کە خۆی تێروتەسەلترین ریپۆرتاژی رۆژنامەنووسیی بەناونیشانی **«نەورۆزی ساڵی ١٩٥٩ لە بەغدا»** لە ژمارە(٨)ی نەورۆزی هەمان ساڵ لە گۆڤاری (هیوا)دا بڵاوکردۆتەوە—ع.زەنگەنە.



**بارزانی و عەبدولکەریم قاسم**
**١٩٥٨/١٠/٧**

ئێواری بوو، بردیانینە ئوتێلێکی خۆشی ئەوتۆ کە لە ژیاندا شتی وامان بە خۆمانەوە نەدیبوو. **هەر ئەو ئێوارەیە بۆ ئەوەی خۆمان لە خوشکە نەسرین بدزینەوە هەرسێکمان کەوتینە باوێشک و وەنەوز،** هەر یەکەمان روومان کردە ژووری خۆمان گوایە بۆ ئەوەی بنووین، نەسرین خانیش هیچی بۆ نەمایەوە، ئەویش بە ناچاری بەرەو ژوورەکەی خۆی رۆیی، **دوای ئەو هەرسێکمان بەرەو ناو شار چووین، بەرەبەیان، پاش ئەوەی هەموو ستۆکهۆڵممان تەی کرد بە هێواشی گەڕاینەوە ئوتێل، رۆژی داهاتوو بە پەلە پروسکێ فریای فڕۆکەکەمان کەوتین.**

هەژدەی مارت گەیشتینە مۆسکۆ، لە فڕۆکەخانەوە بردیانینە باڵوێزخانەی عیراقی و لەوێ پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردین، خوالێخۆشبوو خەسرەو رەشید جەودەت و عارفی حاجی حەمە عەلیی هەڵەبجەیی و عومەر خەفاف، کە هەر سێکیان لەوێ فەرمانبەر بوون، زۆر بایەخیان پێ داین، دوکتۆر مستەفا

سەڵماسیشیان لەگەڵدابوو کە لە پەنابەرەکانی مەهاباد بوو لە وڵاتی شوورەوی.
سەرەتا براینە ئوتێلی ئۆکراینا کە یەکێک بوو لە ئوتێلە هەرە قەشەنگەکانی ئەوسای مۆسکۆو ئەوروپا. ئەو ڕۆژەی مارف و عیزەددین ومن لە ئوتێلەکەوە براینە باڵەخانی قوتابیان لە گەڕەکی سۆکۆڵ عیراقییەکان خۆیان بۆ ئاهەنگی جێژنی نەورۆز ئامادە دەکرد ، ژمارەیەکی زۆر لە کچ و کوڕی رووس و ئەڵەمانی و پۆڵۆنی و چیکی و ڕۆژهەڵاتی و هی تریان بانگ کردبوو، ئاهەنگێکی جوانیان سازکرد، هەر ئێمەش کوردبووین بۆیەکا دەبوو ئێمە سروودی نەورۆز بڵێین، **هەرسێکمان بە سۆزەوە دەنگمان لێ بڵند کرد، بەڵام بەوەی باش بوو کەس بەهۆی چەپڵەو مۆسیقاو هەڵپەرکێی حەشامەتەکەوە بەتەواوەتی دەنگی ئێمەی نەدەبیست.** ئەوە یەکێک بوو لە نەورۆزە هەرە خۆشەکانی ژیانم، **خۆزگەو هەزار جار خۆزگە هەر وا بەسێ قۆڵی لە ڕقی هەژدەهاک پێکرا نەورۆزمان بگوتایەو بگوتایەوە،** حەیفە کورد دەست لە ملان و بە کۆمەڵ هەمیشە **«ئیمرۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە»** نەڵێین. .ئەو خۆزگەی پیرەمێردی نەمریش بوو، خۆشی سروودی نەورۆزی هەر بۆ ئەوە بۆ دانایین!!

بابەتی چوارەم*

# کورد لای دێلا ڤالێ

دێلا ڤـالێ (١٥٨٦ - ١٦٥٢) وەک خـوێندەوارێکی قـووڵ و بە دەسـتـووری گەڕیدەی زانا هەرچییەکی لە ڕۆژهەڵات بەرچاو دەکەوت تۆماری دەکردن و بە نامەی دوورودرێژ دەیناردنە خزمەت ماریۆ سکیپانۆی هاوڕێی کە مامۆستای زانکۆو یەکێک لە شاعیرانی ئەوسای ئیتالیا بوو.

لە ماوەی گەشتی ڕۆژهەڵاتیدا، کە نزیکەی دوازدە ساڵی خایاند، دێلا ڤالێ ٥٤ نامەی نووسی، لە ئەستەمووڵ ڕۆژی ٢٣ی ئابی ساڵی ١٦١٤ یەکەمیانی تەواوکردو ڕۆژی یەکی ئابی ساڵی ١٦٢٦ دوا نامەیانی لە ڕۆما نووسی. ناوەڕۆکی نامەکان باسی گەلێک لایەنی ژیان و داب ونەریت و خوورەوشتی گەلانی ئەو وڵاتانە دەکات کە دێلا ڤالێ دیونی، وەک هندوستان و ئێران و توران و وڵاتی عوسمانییان. نامە زووەکانی تێروتەسەلن، ئەوانەی ساڵانی ژیانی لەگەڵ خاتوو مەعانیدا پڕ لە هەستن، بەڵام دوای مردنی مەعانی ماوەیەکی ویست بێتەوە سەر خۆی و وەک جاران قەڵەمی بکەوێتەوە کار. ئەو نامانەی دێلا ڤالێ دوایی لە کتێبێکی سەربەخۆدا چاپکران. هەر زوو ئەو کتێبە لە زمانی ئیتالییەوە وەرگێڕدرایە سەر گەلێک زمانی زیندووی ئەورووپایی. لەوساشەوە گەشتی دێلا ڤالێ بۆتە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی تێگەیشتنی زۆر لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ڕۆژهەڵاتی کۆتایی سەدەی شازدەمین و سەرەتای سەدەی حەڤدەمین. کوردیش بەشی

---

(*) لە گۆڤاری «ڕەنگین»، ژمارە (١٧)ی ڕێکەوتی ئاداری ١٩٨٩، لە ل٣٨دا بلاوکراوەتەوە.

خۆی لەو ئامانەدا هەیە.

کە لە بەغداوە بەرەو ئەسفەهانی پایتەختی بەناوبانگی شاعەباسی گەورە کەوتەڕێ دێلا ڤالێێ سەرەتا خاکی کوردەواری بڕی، بۆیەکا لە یەکەم نامەی ئەسفەهانیدا کە ڕۆژی حەڤدەی مارتی ساڵی ١٦١٧ نووسیوییە، بەم جۆرە باسی کوردی بۆ ماریۆ سکیپانۆ کردووە:

«گەورەم: پێویستە کەمێکیش باسی کوردانت بۆ بکەم. کوردستان کەوتۆتە نێوان هەردووک دەوڵەتی عوسمانی و عەجەمانەوە. وڵاتیان چۆن درێژە وا بەرین نییە، بە دە دوازدە ڕۆژان ڕۆژئاوای تا ڕۆژهەڵاتی دەبڕێ، بەڵام باکووری بۆ باشوور یەکجار دووورودرێژە، پێم وایە لە نزیک بەغداو سووسەوە دەست پێدەکاو دەگاتە مووسڵ، واتە نەینەواو وڵاتی مادو ئەرمەن تا سەر دەریا. وڵاتێکی سەختی شاخاوییە، لە شاخی تۆرۆس جیادەبێتەوە. لەوێوە ئەو زنجیرە شاخە دەست پێدەکاو ئاسیا دابەش دەکاو بەرەو باشوور دەکشێ تا دەگاتە ئاستی کەنداو. ئەم زنجیرە شاخە سەرکەشە وڵاتی عوسمانی و عەجەم لێک دادەبڕێ، هەروەک چۆن دێرزەمان ڕۆمان و فورثی لێک جیادەکردەوە.

ئاخۆ ڕۆژگاری زوو کوردستان ناوی چی بووبێ؟. بەش بە حاڵی خۆم من ئەمە نازانم. لەو باوەڕەشدا نیم ئەوساکە بە ناوێکی گشتیی واوە ناسرابێ. دێرزەمان گەلێ جیاوازو ناوی جیاوازی بووە. بەرهەمی نووسەرانی ڕابردوو ئەمە دەسەلمێنن. بەشێکیان بە کاردۆک (کاردۆخ) ناویان هاتووە، ئەوانەی هێرشیان بردە سەر زەینەفون و جەنگاوەرەکانی کە بەرەو یۆنان دەگەڕانەوەو لە نزیک دیجلەوە دەستیان لێوەشاندن. لە کتێبە بەهادارەکەیدا دەربارەی هێرشی کوورشی بچووک زەینەفون بۆ خۆی ئەو بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە، پێشم وایە «ئەناباسیس» بەنرخترین بەرهەمی زەینەفونە.

کوردان زمانی تایبەتی خۆیان هەیە کە لە زمانی دراوسێکانیان، واتە، عەرەبی و تورکی و فارسی ناچێ. لەگەڵ ئەوەش جۆرە نزیکییەک لە نێوان ئەو و فارسیدا هەیە.

بەشێکی کورد دەوارنشینن، لەگەڵ ئاژەڵەکانیان دێن ودەچن، زۆربەیان

گوندنشینن، سەر بە سەرداری هاورەگەزی خۆیانن کە گەلێکیان پشتاوپشت سەردارێتییان بۆ ماوەتەوە. بە پێی دووروونزیکی بەشێکی ئەو سەردارانە سەر بە عوسمانی، بەشێکیشیان سەر بە عەجەمن. بەڵام میرە دەسەڵاتدارەکانیان ئازادو سەربەخۆن، هەیانە بەهێزو هەشیانە یەکجار بەهێزن. سەرداری کورد هەیە دەتوانێ دە دوازدە هەزار سواری چەکدار کۆکاتەوە، وەک میری بتلیس کە بۆ خۆم لە ئەستەموڵ دیومە. هەرچی محەممەد بەگی قزلاباتە، کە کەمێک لەمەوبەر باسیم کرد، دەتوانێ دوو سێ هەزار سوارە کۆکاتەوە.

سەردارە هێزدارەکان مل بۆ کەس نادەن، بەڵام چاودێری سوڵتانی عوسمانییان یا شای عەجەمان قەبووڵ دەکەن، بە پێی بەرژەوەندی خۆیان وا دەبێ ئەمیان بەویان بگۆڕنەوە، هەروەک چۆن لای خۆشمان لە ئیتالیا روو دەدا. هەرچیش کەم هێزەکانیانە ناچارن مل بدەن و بە سەرۆکایەتی دەمەکی یا هەمیشەیی قایل بن، هەرچەند مەرج نییە ئەو سەرۆکایەتییە دوای خۆیان بۆ نەوەیان بمێنێتەوە.

جل و بەرگی کوردان کاڵایەکی زبری تێکەڵە لە بەرگی باوی ناو تورک و عەجەمان. ئافرەتیان پەچەو پوشی ناگرنەوە، تەواو ئازادن، بێ سڵ تێکەڵ بە پیاوی خۆوییانی دەبن. بە ئایین کورد موسڵمانن، بە پێی پێوەندیی سیاسی یا هاومەزهەبی عەجەم، یا هاومەزهەبی تورکانن. موسڵمان هەن لێیان دوو دڵن، ئەفسانەیان تیا بڵاوە. چونکە زانیاریم دەربارەیان کەمە ناتوانم زۆر لەسەر داب ونەریتیان بڕۆم.

میری چەند شوێنێ، وەک شاری جزیری سەر کەناری دیجلەی وڵاتی دووئاوان، یا میری ئەو شاخەی کلدانەکان ناوی توریان لێ ناوە (تور عابدین)، کوردن. ژمارەیەکی زۆر لە کلدانی و نەستوری و یاقوبی لەم ناوچە شاخاوییە سەختەدا دەژین کە تا ئیمڕۆکەش بە شێوەی باوی کلدانی دەدوێن. میری کوردان لە تور ئەو عیسایییانەی کردوونە سەربازی جەنگاوەری ناو ریزەکانی لەشکرەکەی. ئەمە هەموو ئەو زانیارییانەیە کە توانیومە دەربارەی کورد کۆیان بکەمەوە»

گەر عاشقی هەست گولپەڕە ناسک ئیمڕۆکە زیندوو بێتەوەو دیسان بە چاوە تیژەکانی کوردستان و (مەعانی)ی شاجوان ببینێتەوە ئاخۆ چی بڵێ و چی بنووسێ...

**بابەتی پێنجەم***

# خۆشەویستی لای دێلا ڤالیێ**

هەر چاپکراوێکی کوردی ٣٠ هەزار دانەی لێ بڵاوبێتەوەو خوێنەران تامەزرۆی بن و بیقۆزنەوە جێگەی ڕێزەو دەبێ قەڵەمە خێرخوا دڵسۆزەکان ڕووی تێ بکەن. منیش کە لەم قۆزنەوە سەیری **«ڕەنگین»**ی تازە پشکوتوو دەکەم، ماوەیەکە پێوەم کورتە وتاری بۆ بنووسم. ئەوەبو لە ژمارە(١٧)ی ئەم گۆڤارەدا دەربارەی گەشتەکەی (دێلاڤالیێ) شتێکم بڵاوکردەوە***، وا لەم ژمارەیەدا ئەگەڕێمەوە سەر داستانە خۆشەویستییە دانسقەکەی ئەو نوسەرە بەناوبانگە.

پیترۆ دێلاڤالیێ ڕۆژی ١١ی نیسانی ساڵی ١٥٨٦ لەناو خێزانێکی خواپێداوی ڕۆمای ئیتالیادا چاوی هەڵهێنا، لە منداڵییەوە دێلاڤالیێ سەری کردە سەر خوێندن و خوی دایە مۆسیقاو ڕووی کردە هونەرو کەوتە مەشقی سواری. لە هەرەتی لاویدا بێ هوودە بەتیری عیشقی شازادەیەکی شۆخ و شەنگ گرفتار و تیر ئەنداز بوو. بۆ سارێژی برینی دڵ دێلاڤالیێ کەوتە خولیای ڕۆژهەڵات و بۆ پێنج ساڵان لە شاری ناپۆلی دەرس و دەوری بۆ کرد. گەرمەی هاوینی ساڵی ١٦١٤ وەک دەروێشان

---

(*) لە ژمارە (١٨)ی گۆڤاری **«ڕەنگین»**، ڕێکەوتی نیسانی ١٩٨٩، لە ل٢٢دا بڵاوکراوەتەوە.

(**) پوختەی ئەم کورتە وتارەم بە دەسکارییەکی کەمەوە لە دەستنوسی **«گەشتی دێلاڤالیێ بۆ عیراق لە سەدەی هەژدەمین دا»** وەرگرتووە.

(***) «ئاماژەیە بۆ بابەتی چوارەمی بەشی پێنجەم کە لە لاپەڕە (٥٦٩، ٥٧١)ی ئەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە- **عەبدوڵڵا زەنگەنە**».

رووی کردە شاری ئەستەمووڵی عوسمانییـان. تورکی فێر بوو، ئینجا رووی کردە میسرو لەوێشەوە هاتە حەڵەب لە وڵاتی شام. لە حەڵەب دێلاڤالیێ تووشی هاونیشتمانییێکی ئیتالیایی دێ کە تازە بە تازە لە بەغدای شاری هەزارو یەک شەوەوە هاتبۆوە. شۆخی بەغدایی خاتو (مەعانی) ببووە وێردی سەر زمانی، باس هەر باسی ئەو بەژن بەرزە لێو ئاڵە پرچ ڕەشە چاو گەشە بێ وێنەیە بوو. دێلاڤالیێ لە نامەیەکیدا نووسیویە دەڵێ:

**«ئازیزان: لە پێشدا گوێم بۆ شل دەکرد تا کات بەرمە سەرو خەم بەبا دەم تا وام لێ هات بەدڵ حەز بە دیداری ئەو شۆخە بکەم، دواییش هەر ئەو حەزە بوو هەڵ تۆقی و بووە خۆشەویستی».**

خولیای تەمومژاوی (**مەعانی**) دای لە کەلەی لاوی دڵ شکستەی ئیتالی. خۆی دایە دەست قەدەرو بەرەو بەغدای خاتوو مەعانی کەوتە ڕێ. کە بەدیداری شاد بوو زۆر لەوە شۆختر بوو کە لە خەیاڵی بەرەبەیان و ئێواراندا وێنەی بۆ کێشابوو. هەر مەعانی بوو بتوانێ گشت تەم و مژی رابوردووی سەخت و دژوار بڕەوێنێتەوە، ڕەوڕەوەی ژیانی دڵ بریندارێک بگێڕێتەوە سەرەتای سەرەتا. ئەو ڕۆژەی مەعانی بووە هاوسەری دێلاڤالیێ ژیانی سەرلەنوێ بۆ نووسرایەوە. وەک ئاشقەو ماشقە کچە بەغدایی و لاوی ئیتالی تێک ئاڵان. خۆشەویستی ئەو جووتە پەردەی زمانی دڕیبوو، ئەمیان بە عارەبییەکی شکستە رۆمێوو جولێتێکی نوێ و ئەویان بە یەک دوو وشەی ئیتالی لەیل و مەجنونێکی تازەی دەگوتەوە.

دێلاڤالیێ گەڕیدە وای لێ هات هیچ گەشتێکی بێ مەعانی پێ نەدەکرا، لە بەغداوە روویان کردە ئەسفەهان. وایدەزانی گەشتی ئەم جارە دەبێتە شای گەشتانی هەموو ژیان، ڕۆژی دەژمارد کەی مەعانی دوای پێنج ساڵان یەکەم نۆبەرەی خۆشەویستی هەردووکیانی پێ دەبەخشێ. بەڵام، دیسان ژیان بۆی نەهانی، یەکەم گەشتی خاتوو مەعانی زایەڵەی کۆچی ماڵ ئاوایی بوو، بە دەم لەرزو تاوە لەگەڵ دوا ڕۆژی ساڵی ١٦٢١دا چاوە گەشەکانی بۆ دواجار لێک نا.

ئاواتی دێلاڤالیێ ئەوەبوو کەی گەشتی رۆژهەڵاتی دێرینی تەواو کرد لەگەڵ مەعانیدا بە جووتە بگەڕێنەوە ئیتالیای خۆشەویست کە ڕۆژ نەبوو باسی جوانی و

قـەشـەنگی بۆ نەکـات.. هیچ نەبێ با بەشـێکی ئەو ئاواتە بێـتـەدی، دەبێ تەرمی خاتوو مـەعانی بە خاکی نیشتمـانی ئازیز شاد بێ. لاشەی خۆشەویست پێچرایەوەو خـرایە جـوانتـرین سندوقی ئەبەنووسـەوە. پێنج سـاڵان و دوو مـانگان و بیـست و هەشت رۆژان بە جـــووتە دێلاڤـــالیێ و تەرمی نازدار لە ئێـــران و لە تووران، تا ئەوسەری هندوستان ئەم شارو ئەو شار، ئەم گوندو ئەو گوندیان کرد تا رۆژی ٢٨ی مارتی ساڵی ١٦٢٦ پێکڕا خۆیان کرد بە رۆمادا.

لێـــرەش سێ مـــانگان و ٢٧ رۆژان دێلاڤـــالیێ چاوی بەرایی نەهات تەرمی خۆشەویست بە خاک بسپێرێ. بۆ خۆی لەو نامە تایبەتییەی دا کە رۆژی یەکی ئابی ساڵی ١٦٢٦ نووسیوییە دەڵێ:

**«رۆژی ٢٥ی تەمموز بڕیارم دا تەرمی خـاتوو مـەعـانی هاوسـەرم، کـە چەند ساڵێک بوو پێکەوە بووین، بە خاکی گۆرستانی بنەماڵەی دێلاڤالیێ، لە نوێژگەی پۆلسی پیرۆز، لە کڵێسـەی ئەراجێلی، لە ناوچەی کەمپیدۆلێوی رۆما، بسپێرم. داوام کرد سندوقێکی قورقوشمیان بۆ هێنام و سندوقی لاشەکەم بەدەستی خۆم تێ ناو قایم بزمار ڕێژم کردو بە لاتینی ناوی کۆچ کردووم لەسەر نووسی.. لە نیوەشەودا مۆکیبی ماتەم کەوتە رێ و بۆ خۆم لە دەرگەی کڵێسە پێشوازیم کردو روومان کردە نوێژگەو لەوێ دابەزینەوە ناو گۆڕی هەڵکەنراوەوە تا دوا خزمەتم پێشکەش خاتوونە ئازیزەکەم بکەم، بەدەسـتی خۆم تەرمی پیرۆزی لە نێوان گڵکۆی دایک و کەس و کارما بنێژم.**

**جوان جوان گۆڕەم داپۆشی و دوا خزمەتی ژیانم پێشکەش هاوسەری شۆخم خاتوو مەعانی کردو نوێژم بۆ گیانی پاکی کرد».**

لە یادی یەکەم سـاڵەی ناشتنی خـاتوو مـەعـانی دا دێلاڤـالیێ کـۆبوونەوەیەکی گـەورەی سـازکـردو هەمـوو ئەو شـیـعـرە رازاوەو لاوانەوە پڕ سـۆزانەی لەوێ دا وتران کۆی کردنەوەو لە کتێبێکی سەربەخۆدا چاپی کردن. کە رۆژی ٢١ی نیسانی ساڵی ١٦٥٢ دێلاڤـالیێ کـۆچی دوایی کـرد لە تەنیـشت مـەعـانییـەوە نێژراو گـڵکۆی جا...... عاشق لەوساوە بووە مەزاری دڵداران.

بابەتی شەشەم*

# دەردە کورد
# لە خاتوو بێڵەوە تا مەحمود زامدار

-١-

زۆر بە داخەوە دووبەرەکی و ناکۆکی و خۆخۆری و خۆپەرستی جێگەو جێ پەنجەی ڕەشیان لە تۆماری مێژووی گەلی کوردا گەلێک دیارە. ڕاستە ئەوانە هەموویان نیشانەی دواکەوتووین و زۆر گەلی دواکەوتووی تر دووچاریان هاتوون، بەڵام پێم وایە هیچ گەلێک بە رادەی گەلی کورد گیرۆدەیان نەبووەو وا زۆر بە دەستیانەوە نەیناڵاندووە. ئەوانە هەمیشە داردەستێکی بێئەرک و مفت بوون بە دەست دوژمنەوە بۆ لێدانی گەلی کوردو سەرکوت کردنی. تۆماری مێژووی عوسمانی و صەفەوی پڕییە لە بەڵگەی ئەم بۆچوونە.

هەموانیش، هەریەکەی بە رادەی خۆی، پریشکی ئەو ئاگرەیان بەرکەوتووە. یەزدان شێر کە بووە پوازو دژی بەدرخانی گەورە وەستا سوڵتانی عوسمانی و دەروازەی باڵاو سەرجەمی دوژمنانی کورد پڕ بە دڵ چەپڵەیان بۆ لێداو ئافەرینیان

---

(*) لە ژمارە (١١٨٦)ی ڕۆژنامەی (**هاوکاری**)دا بڵاوکراوەتەوە.
- بە یارمەتی کارمەندی کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی سەلاحەدین، کاک مەحمود ئەکبەر عەلی کەوتۆتە بەردەست.

کردو بەشان و باهوویاندا هەڵدا تا نۆرەی خۆی هات، ئەوساکە هەر ئەوان بە هەمان شیرو تیرو گوللە تۆپ بەربوونە گیان و سەروماڵی خۆی و لایەنگرانی و کەسوکاری هەموویان. ئەو کوردانەی دژی سمکۆ یاریدەی رەزاشایان دا زۆری نەبرد خۆیان ئاخنرانە زیندانە تاریک و نوتەکانی تارانەوە.

-٢-

لەو رۆژەی دەستەی رووناکبیری کورد لەدایک بووە گەرای رەشی هەمان دووبەرەکیی کوشندە تێکەڵ بە هەموو تنۆکە خوێنێکی دەمار دەزوو ئامێزە باریکەکانی لەش و ئەندامی لەرو لاوازی بووە. **هەمووی بەسەر یەکەوە چوار خوێندەوارو لەتێکێن کەچی کەسێکمان دانی خێر بەوی ترماندا نانێ، هی واشمان هەیە بە خوێنی سەری سێ و لەتەکەی ترمان تینووە.** خۆ وەنەبێ کەسیش رێگەی لە کەس گرتبێ، گشت مەیدانەکان وەک دەشتێکی کاکی بە کاکی چۆڵ و هۆڵ و ئاواڵەن، جێگەی هەزارانی تریان تیا دەبێتەوە.

پێویستمان بە دەیان و بە صەدان قەرەداغی و سیامەنسوری و بێگەردو هەڵمەت و موکری و موکریانییە، کەچی کەسمان دانومان لەگەڵ کەسێکماندا پێکەوە ناکوڵێ میقرۆبی دووبەرەکی و خۆ خۆری کورد سەرباری ئەوەی میقرۆبێکی یەکجار پیس و کوشندەیە زۆر بە خێراییش بە هەر چوار لادا تەشەنە ئەسێنێ. وابوو ماوەی ساڵێک رۆژ نەبێ ئەورەحمانی مزوری و رەشیدی فندی نەبینم، دەتگوت دوانەی سیامێن، موو بە بەینیاندا نەئەچوو، گەلێک لە برا زیاتر بوون، لەوانە بوو پێکەوە دوا هەناسەی ژیان بدەن. کە بەو جۆرە دەمدین لە خۆشیدا دڵم گەورە ئەبوو، کەچی، خوا بیبڕێ، وا ئەوانیش تووش بوون و هاتنە ریزەوە.

ئەی هونەرمەندەکانمان کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن و لەگەڵ رەنگی دڵڕفێن و سروشتی رازاوەو جوانیی مرۆو ئاوازی لاوک و حەیرانی ناسکدا دەژین بۆ چ وا بە خوێنی یەکجار دەگمەنی سەری یەک تینوون.

ئەی پارەدارەکانمان، کە لە چاو زەنگین و پارەدارانی گەلانی تردا سواڵکەرن، بۆ وا ئەکەن، بۆ ئەگەر راست بێ یا درۆ خێرخوایە، یا ئەدەب دۆستێکیان تیا هەڵکەوت هەموو ئەوانی تر وا سەرکوتی ئەکەن و هەزارو یەک تۆمەو بوختانی



**مس بێڵ**



**مەحمود زامدار**

نالەباری بۆ دروست ئەکەن ... ئەی و هەزار ئەیی تر ... ئەمانەش خوێی چێشتن لە چاو شتی جەرگبڕی ئەوتۆدا کە دەگەنە ئاستی شوورەیی و بێ ئابڕوویی واوە لە گوتن و نووسین نایەن.

وەک کوردێک و وەک بابایەکی کەم وزۆر ئاگاداری مێژووی گەلی کورد ئەم هەزار بەرەکییە کوشندەیە هەمیشە لە ناخەوە دەروونی هەژاندووەو بە دووی هۆکانیدا گەڕاوم و هەوڵم داوە لەوە تێ بگەم بۆچ هەموومان گیرۆدەی ئەم دەردە پیسە بووین؟. لەگەڵ زۆر برادەردا لەم باسە دواوین، هەمووشمان، ئەوەندەی من بیزانم، پێی نیگەرانین. **وەک جگەرەکێش بە زیانی دەزانین و ناتوانین دەسبەرداری بین.**

بیرم دێ سەرەتای حەفتاکان، ڕۆژێکیان لە کۆڕی زانیاری کورد لەگەڵ کاک مەحمود زامداری ڕۆژنامەنووسدا لەم باسە دەدواین. ئەو خۆی ئاسایی بە توانجێکی

---

(*) ئەو بابەتەی زامدار لە ساڵی ١٩٧٢ بەناونیشانی **«یادو ئاوات و دەردە کورد»** لە ژمارە (٦)ی گۆڤاری **«نووسەری کورد»** بلاوکراوەتەوە، ئەوکات جێی سەرنج ڕاکێشانی خوێنەران بوو، بۆیە دوازدە نامەی دەستخۆشانە لەلایەن خوێنەرانەوە بۆ نووسەرەکەی ناردرا، دواتر هەمان بابەت دەوڵەمەند کراو لە ساڵی ١٩٩٧ بەناونیشانی **«دەردەکورد»** لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان چاپ کراوەتەوە، دواتر د. مارف خەزنەداریش (بەباڵابڕین)ێکی لە هەفتەنامەی **«گوڵان»** لەبارەی کتێبەکە نووسیوەو چەند لایەنێکی دیکەی **«دەردە کورد»**ی دەستنیشان کردووە - **عەبدوڵڵا زەنگەنە.**

ڕەواوە ئەم دیاردە کوشندەیەی ناو نا **«دەردە کورد»*** کە بێگومان پڕ بە پێستییە. زاراوەی **«دەردە کورد»** لەو ڕۆژەوە لە مێشکما گیری خواردو تێکەڵ بە قسەی ڕۆژانەم بوو.

**«دەردە کورد»** پیسترین و ناشرینترین و کوشندەترین دەردی کۆمەڵگای کوردەوارییە. دەستکردی کوردەکە خۆیەتی و هەر ئەشبێ خۆی چارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە تا بە تەواوەتی لەشی دانەوەشاندووەو بوونی هەڵنەتەکاندووەو کاری بە یەکجاری سەرەولێژ نەکردووە.

- ٣ -

دۆست و دوژمن ئاگاداری **«دەردە کورد»**ن. جارەهای جار برادەری عەرەب و کوردناسی بیانی بە داخەوە باسی **«دەردە کورد»**یان کردووە. هی واشیان هەیە لەسەریان نووسیوە.

خاتوو بێڵ یەکێکە لەو کەسانەی بە تەوسێکی زۆرو زۆر بە ڕەقی باسی **«دەردە کورد»**ی کردووە. قسەو هەڵسەنگاندنی یەکێکی وەکو خاتو بێڵ شایانی بیر لێ کردنەوەیە.

گێرترود مارگرێت لوثیان بێڵ لە بنەماڵەیەکی ئینگلیزی ناودارە[(١)]. لە باپیرە گەورەیەوە خەڵکی ناوچە شاخاوییەکانی سکۆچە[(٢)]. ساڵی ١٨٦٨ لە یۆرکشایری دەوڵەمەند لە دایک بووە. خوێندنی لە ئۆکسفۆرد تەواو کردووە، سیاسەت و

---

(١) پوختەی ژیانی گێرترود بێڵ لەم سەرچاوانە وەرگیراون

أ- The Letters of Gertrude Bell, Eleventh Printing, London, April 1930.

ب- **«العراق في رسائل المس بيل»**. ترجمه وعلق عليه جعفر خياط. قدم له وزاده تعليقا عبدالحميد العلوجي، بغداد، ١٩٧٧.

ج- المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب، نقله الى العربية وكتب حواشيه جعفر الخياط. الطبعة الثانية، بغداد ١٩٧١.

د- ڕۆژنامەی **«العراق»**، سیازدەو چواردەی تەمووزی ١٩٢٦.

هـ- دیدەنی لەگەڵ عەبدولڕەزاق حەسەنی ڕۆژی ١٩ی مایسی ١٩٩٠.

(٢) کورد بە وڵاتی سکۆتلاند دەڵێن سکۆچ یا ئەسکۆچ.



ئیزدین هیشر

مێژووی کۆن و نوێ ئارەزووی یەکەمی بووە، وەک ئینگلیزی فەرەنسی و ئەڵمانی زانیوە، لە زمانە ڕۆژهەڵاتییەکانیش عەرەبی و فارسی و کەمێک هندیی دەزانی. ئافرەتێکی ئەندام ڕێکی سپیکەڵانەی باڵابەرزی شۆخ بووە. ئەوانەی لە تافی لاویدا دیویانە پێیان جوان بووە. بەپێی گێڕانەوەی مامۆستای مێژوونووس عەبدولڕەزاق حەسەنی، کە ساڵی ١٩٢٥ تاقی کردنەوەی دوو قۆلیی تایبەتیی خۆی لەگەڵ خاتو بێڵدا لە ماڵی ئەمیان لە **(شارع النهر)** هەبووە، بێڵ بە ڕاستی ئافرەت بووە...

خاتو بێڵ لە هەرەتی لاوییەوە کەوتبووە داوی ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتناسییەوە. لە تەمەنی بیست و چوار ساڵیدا بۆ یەکەم جار ڕووی کردە **«ڕۆژهەڵاتی تەلیسماوی»** و چەند ساڵێکی لە تاران بردە سەر.

بەرهەمی ئەو گەشتەی دوو کتێب بوو، یەکەمیان **«سەفەرنامە، وێنەی وڵاتی فارس»**[3]، دووەمیشیان بریتی بوو لە وەرگێڕانی چەند پارچە شیعرێکی حافزی شیرازی بۆ سەر زمانی ئینگلیزی.

گێرترود بێڵ گرفتاری هەموو ڕۆژهەڵات بوو، بۆیەکان دوایی تا هندستان و ژاپۆنیش چوو. بەڵام لە هەر شوێن زیاتر بایەخی بە ڕۆژهەڵاتی عەرەبیدا.

---

(3) G. Bell, Safar — Nama.Persian Pictures, London, 1984.

بەر لەوەی سەدەی نۆزدەمین کۆتایی بێ بە ماوەیەکی کورت گێرترود بێڵ رووی کردە وڵاتانی عەرەب و بە سواری وڵاخ و حوشتر کەوتە گەڕان بە ناو خاکی فەلەستین و سوریەو عیراق و نیمچە دورگەی عەرەبدا. بە قووڵی کەوتە لێکۆڵینەوەی داب و نەریت و سروشت و سامان و ژیانی عێل و هۆزو شوێنەوارو مێژووی ئەو ناوچانەو چەند بەرهەمێکی لەسەریان نووسی کە بوونە سەرچاوەی رەسەن بۆ شارەزایان و دەزگا تایبەتییەکانی ئینگلیز، جگە لە رووناکبیران کە بە پەرۆشەوە بەرهەمەکانی خاتو بێڵیان دەقۆستەوە. جارێکیان لە مەجلیسێکیدا کە مەلیک فەیسەڵی یەکەم و نوری سەعیدو جەعفەر عەسکەری و رۆستەم حەیدەری تێدا دەبێ پێیان دەڵێ:

**«رۆستەم حەیدەری لێ دەرکەی من لە هەمووتان زیاتر شارەزای سوریەم و لە هەمووتان زیاتر خۆشم دەوێ، گوند بە گوندی، شاخ بە شاخی، چۆم بە چۆمی بەڵەدم».**

هەر زوو دەزگا تایبەتییەکانی بەریتانیای گەورە پێوەندییان بە گێرترود بێڵەوە کرد، بۆیەکا گەشتەکانی و جۆری هەڵس و کەوت و دیدەنییەکانی بوونە مایەی گومانی عوسمانییەکان، گەر فریای خۆی نەکەوتایەو زوو دەرباز نەبووایە ساڵی ١٩١٣ لە سوریە دەیانگرت.

شەڕی یەکەمی جیهان بووە سەرەتای قۆناغێکی بایەخدار لە ژیانی گێرترود بێڵدا. لە ساڵی ١٩١٥وە هاتە قاهیرەو لە سەرەتای ساڵی داهاتووەوە بووە یەکێک لە کارگەرانی **«مەکتەبی عەرەبی»** لە میسر کە دەزگایەکی نهێنی گرنکی سەر بە وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیای گەورە بوو. لەوساوە خاتو بێڵ چووە ریزی لۆرانسی بەناوبانگەوە کە بە **«لۆرانسی عەرەب»** ناو دەبرێ[٤].

عیراق لە هەموو روویەکەوە سەرنجی گێرترود بێڵی راکێشاو بەر لە شەڕی یەکەم چەند جارێک بە تایبەتی زیارەتی کرد[٥] و تێکەڵ بە خەڵکی تەنانەت شاری وەک کەربەلاو نەجەف و کازم بوو، چووە ناو ناخی ژیانی حۆیان و وڵاتیانەوە، بە قووڵی

---

(٤) تۆماس ئەدوەرد لورانس (١٨٨٨ - ١٩٣٥) یەکێک بوو لە سیخوڕە هەرە بەناوبانگەکانی ئینگلیز، دۆستی نزیکی فەیسەڵی یەکەم بوو.

(٥) بۆ یەکەم جار خاتو بێڵ ساڵی ١٩٠٩ هاتە زیارەتی عیراق.

و بە وردی دەرسی کردن و لەسەریانی نووسی.

لەبەر شارەزایی زۆری لە ناوەندی ساڵی ١٩١٦وە بەریتانییەکان گێرترود بێلیان گواستەوە بەسرەو لەو کاتەوە هێندەی تر تێکەڵی ژیانی عیراقییەکان و بەسەرهاتی وڵاتەکەیان بوو. دوای ئەوەی رۆژی یازدەی مارتی ساڵی ١٩١٧ ئینگلیز بەغدایان داگیر کرد ئیتر لەوساوە بێڵ تا رۆژی مردنی نیشتەجێی بەغدا بوو. زۆر زوو ناوو شۆرەتی دەرکردو بووە خاتوونەی هەموان[٦].

ماڵەکەی بووە یەکێک لە دیوەخانە گەورەکانی شاری بەغدا، شاو گەدا، وەزیرو گزیر روویان تێ دەکرد.

بۆ نیشان دانی دەوری گەورەی ئەو ئافرەتە ئەفسانەییە لە ژیانی رۆژانەی عیراق و دیارکردنی چارەنووسیدا بەڵگە هێند زۆرە لە ژماردن نایەن.

ئەو سەرنووسەری **«العرب»**ی یەکەم رۆژنامەی ئینگلیز بوو لە بەغدا کە یەکەم ژمارەی رۆژی چواری تەمموزی ساڵی ١٩١٧ دەرچوو. یەکێک لە ئەندامانی ئەو وەفدە بوو کە بە ناوی عیراقەوە لە کۆنگرەی قاهیرەدا بەشداریی کرد، ئەو کۆنگرە بایەخدارەی بە سەرۆکایەتی چەرچل بۆ تەتەڵە کردنی سیاسەتی بەریتانیا بەرامبەر رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست لە مانگی مارتی ١٩٢١دا سازکرا.

گێرترود بێڵ یەکێکە لەوانەی دەستیان لە هەڵبژاردنی مەلیک فەیسەڵی یەکەمدا بۆ تەختی پاشایی عیراق هەبوو.

بۆ خۆی لەو نامەیەیدا کە رۆژی هەشتی تەمووزی ساڵی ١٩٢١ ناردوویە بۆ باوکی نووسیویە دەڵێ:

**«دەبێ باوەڕتان بە شتێک هەبێ، ئەویش ئەوەیە کە جارێکی تر لە دروست کردنی هیچ پاشایەک و دانانی لەسەر تەختدا بەشدار نابم، بە راستی کارێکی زەحمەتە».**

لە ناوەڕۆکی ژمارەیەک لە نامەکانییەوە ئاشکرا دیارە کە زۆر جار گێرترود بێڵ دەرسی مەلیک فەیسەڵی داداوە.

مێژوونووسی ئاگادار ماموستا حەسەنی دەڵێ بێڵ چاکەی بەسەر مەلیک

(٦) لە بەغدا هەر بە خاتوون ناویان دەبرد.

فەیسەڵەوە زۆر بوو، فەیسەڵیش بە دڵ خۆشی دەویست و بە چاوی خوشکی خۆی سەیری دەکرد، هەرچەندە بێڵ بۆ خۆی لە یەکێک لە نامەکانیدا دەڵێ جارێکیان کە هەردووکمان بە تەنها بووین فەیسەڵ نووساندمی بەخۆیەوە.

هەرچۆن بێ ئەمانەی لێرەدا زۆر بە کورتی باسمان کردن بێ گومان نیشانەی ئەوەن کە خاتو بێڵ بە راستی شت بووە. لەبەر ئەوە کە بەرەبەیانی رۆژی یەک شەممەی دوازدەی تەمووزی ساڵی ١٩٢٦ لە بەغدا لەپڕ کۆچی دوایی کرد وەک شاژن بە خاکی گۆڕستانی عیسایییە پرۆتستانتەکان سپێردرا کە کەوتۆتە سەر ئەو گۆڕەپانەی ئیستە پێی دەڵێن **«ساحة الطيران»**.

-٤-

خاتوو بێڵ زۆر جار باسی کاری رۆژانەی خۆی و رووداوەکانی وڵاتی دەکردە نامەی تایبەتی و یەک لە دوای یەک ئەو نامانەی دەناردە خزمەت باوکی، یا خاتوو فلۆرەنسی باوەژنی، جارویار نامەی لەو بابەتەی بۆ ڤالەنتین چیرۆلی رۆژنامەنووس و فرانک بەلفۆری ئەفسەر دەنارد. رۆژی حەوتی تەمووزی ساڵی ١٩٢٦، واتە پێنج رۆژ بەر لە مردنی بێڵ دوا نامەی بۆ باوکی ناردووە.

ئەو نامانە پڕن لە زانیاریی دەگمەن و بایەخدارو باس و خواسی سەیر، بۆیەکا دەمێکە بوونەتە سەرچاوەیەکی بایەخداری رەسەنی مێژووی نوێ و هاوچەرخی عێراق و ناوچەکە. دوای ئەوەی خاتو بێڵ کۆچی دوایی کرد فلۆرەنسی باوەژنی کەوتە رێکخستنی ئەو نامانەو ساڵی ١٩٢٧ بەشی هەرە زۆریانی لە دوو بەرگدا بە ناونیشانی **«نامەکانی گێرترود بێڵ»**ەوە بڵاوکردەوە.

هەر کە کەوتە بازاڕەوە خەڵکی ئەو کتێبەیان قۆستەوە.

تا نیسانی ساڵی ١٩٣٠، واتە لە ماوەی سێ ساڵدا، ئەو کتێبە یازدە جار لەسەر یەک چاپ کرایەوە[٧].

---

(٧) دوور نییە دوای ئەوەش چاپی تری لێ دەرچووبێ، ئەوەی نیسانی ساڵی ١٩٣٠ دوا چاپی ئەو کتێبەیە کە من دیومە.

(٨) مەرج نییە ئەوەی خاتو بێڵ نووسیوییە هەمووی دروست بێ. ئەم لایەنە مەبەستی لێکدانەوەی ئەم وتارەمان نییە.



عادلە خانم

کەواتە دیسان خاتو بێل شتەو ئەوەی خاتو بێل گوتوونی و نووسیونی بایەخی خۆیان هەیە[٨].

- ٥ -

کوردیش بەشی خۆیان لە نووسینەکانی خاتو بێلدا هەیە، سالّی ١٩٠٩ چۆتە ژەنگارو ژمارەیەک سەرەک هۆزی ئەو ناوچەیەی دیوە - بۆ سالّی داهاتوو لە

---

(٩) پێنج کەس بە ناوی مورادەوە بوونە سولّتانی عوسمانی، مورادی یەکەم لە سالّی ١٣٥٩ وە تاوەکو سالّی ١٣٨٩ سولّتان بوو. موورادی پینجەمیش لە رۆژی ٣٠ی مایسەوە تا رۆژی ٣١ی ئابی ١٨٧٦ بە سولّتانی مایەوەو دوای ئەو سولّتان عەبدولحەمیدی دووەم هاتە جێی.

(10-11) Bell, Amurath to Amurath, London, 1911

Great Britain, Civil Commissioner of Mesopotamia.
Review of the Civil Administration of Mesopotamia.
Presented to both House of Parliament by Command of His Mlajesty, Lonon, 1920.

حەڵەبەوە گەشتێکی دەست پێ کرد پێنج مانگی خایاند لەو گەشتەیدا بێڵ لە ڕێگەی بەغداوە چووە کوردستان و لەوێشەوە بە ناو خاکی تورکیادا تاوەکو قۆنیە ڕۆیشت **«لە مورادەوە[9] تا موراد»** بەرهەمی ئەو گەشتەی بوو کە ساڵی ١٩١١ لە لەندەن چاپی کرد[10]. زستانی ساڵی ١٩١٨یش بە سواری گەشتێکی بە ناوچە کوردەوارییەکاندا کرد تا گەیشتە ناو خاکی ئێران. پێم وایە لەو گەشتەیدا لە هەڵەبجە عادلە خانی جافی دیوە. بەر لەوەو دوای ئەوە لە نزیکەوە پێوەندیی بە ژمارەیەک سەرداری ناسراوی کوردەوە کردووە. گەلێکیان لە بەغدا چوونەتە لای. **هی وایان هەیە ماست و ناسکە هەرمێ و هەنگوین و پەنیری پێستەی کوردەوارییان بە دیاری بۆ هێناوە.**

لەو بەرهەمە بایەخدارەیدا کە بریتییە لە ڕاپۆرتێکی تایبەتی بۆ پەرلەمانی ئینگلیزی دەربارەی باری کارگێڕی عیراق لە شەشی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٤وە تاوەکو پازدەی ئابی ساڵی ١٩٢٠[11] خاتو بێڵ گەلێک باسی کوردو کوردستانی کردووە. لە بەشی چوارەمی ئەو ڕاپۆرتەیدا، کە بۆ خۆی دە بەشە، باسی چەند هۆزێکی کوردی ناوچەی خانەقی و کەرکووک و پێوەندی رووسی بە کوردەوە کردووە. سەرجەمی بەشی شەشەمی دەربارەی مەسەلەی کوردە.

لە نامەکانیشیدا خاتو بێڵ بە هەمان دەستوور زۆر جار هاتۆتە سەر باسی کوردو کوردستان. ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەو نامەیەیەتی کە ڕۆژی دوازدەی نیسانی ساڵی ١٩٢٣ نووسیوییە. چەند جارێک لەو نامەیەدا باسی کوردو مەسەلەی کوردی کردووە. خاتو بێڵ لە کۆتایی ئەو نامەیەیدا زۆر بە ڕەقی باسی گەورە پیاوو سەردارانی کورد دەکات، هەموویان، وەک دەڵێ، **«پیاوی ئایینی نیمچە خوێندەوارو نیمچە برسی دڕندەن. هەریەکەیان چەند ڕقی لە شەیتانە هێندەش ڕقی لەوانی ترە»**. دوای ئەوە خاتو بێڵ دەپرسی: **«جا چۆن دەتوانین دەوڵەتی کورد دابمەزرێنین؟»** ....

**ئای ((دەردە کورد))چیت کرد بە کورد.**

**ئای ((دەردە کورد))چی ئەکەیت بە کورد...**

# پێرستی ناو



---

**سەرنج:** تکایە، بە مەبەستی سوود وەرگرتنی زۆرتر لەم پێرستەدا رەچاوی ئەم خاڵانە بکەن:

١- لەبەر ئەوەی سەرەتا بە تەما بووین کۆمپیوتەر ناوەکانی نێو لاپەڕەکانی ئەم کتێبەمان بۆ دیاری بکات، بۆیە بەرایی تەنیا ناوەکانمان لەسەر کارت بەبێ دەستنیشان کردنی لاپەڕەکان دیارکردن. دواتر کە کارەکە بە کۆمپیوتەر پێک نەهات ناچاربووین لە نووکەوە دەستی پێ بکەینەوەو دووبارە ناوەکان و لاپەڕەکانمان لەسەر کارت دەستنیشانکردنەوە، لە ئەنجامدا هەندێ ناو زیادی کرد لەبەر گەورەیی ئەم کارەو پەلەکردنیش، لە کاتی دووبارە پێرست کردنەوە، هەست دەکەین جۆرە ناڕێکییەک کەوتۆتە ریزبەندی ناوەکانی هەر پیتێک، بۆیە لەسەر خوێنەرو تۆژەرانە بۆ دۆزینەوەی ناوێک دەبێ سەرجەم ناوەکانی بەرامبەر پیتەکە بسەر بکەنەوە.

٢- هەوڵدراوە هەموو ناوەکانی نێو ئەم کتێبە، بە ناوەکانی ناو پەراوێزەکانیشەوە، وەکو یەک مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

٣- هەندێ ناوی وەکو: کوردستان، عیراق، بەغدا، سلێمانی، شێخ مەحموود... هتد، کە لەنێو ئەم کتێبەدا زۆر دووبارە بوونەتەوە، لە پێرستەکەدا وەلانراون.

٤- هەندێ ناوی وەکو: (پیرەمێرد، حاجی تۆفیق) یان (بیمار، عەبدولرەزاق بیمار)... هتد، کە ئاماژەیە بۆ هەمان کەس، دووجار، لەگەڵ دوو پیتی جیا دووبارە بوونەتەوە، بە پێویست نەزانرا یەک بخرێن.

**عەبدوڵلا زەنگەنە**

**(ب، پ)**

(ت)



(ج، چ)

## (خ)

(د)



(ر)

## (ش)

## (ص، ض)



## (ع)

(غ)



(ف)

(گ)

(ل)



(م)

## شوێن

(أ)

(گ)



(ل)



(م)

# دوا گوتە

مەبەست لە نووسینەوەی مێژووی هەر گەلێک، هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە دۆزینەوەی راستییەکان، کە تا ئەو ساتە هەر لامان بە بزری ماونەتەوە، بە زانینی ئەو راستییانە بنەمایەکی تۆکمە بۆ دارشتنی دوارۆژێکی ئاسوودە و خۆش بۆ زۆرینە دابین دەکرێ، بۆ گەیشتن بەم ئامانجە چ لەسەر ئاستی کوردستان و چ لە سەر ئاستی عێراق و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، جێ پەنجەی دانایی دکتۆر کەمال مەزهەر دیارو بەرچاوە، ئەو خۆی وای چەسپاندۆتە مێشکی خوێنەرانییەوە کە **«مێژوو یەکێکە لە زانستە هەرە گرنگەکانی ژیان»** بۆیە **«رەورەوەی مێژوو یەکجار گەورە و زەلامە، بەرەو پێشبردنی هەرگیز لە ویزەی تاکە کەسێکدا نەبووەو نییە»** دیارە **«زانایان دەمێکە بۆیان ساغ بۆتەوە کە مێژوو یەک قۆناغ نییە»**.

منیش لای خۆمەوە دەمێکە هەستم کردووە د. کەمال ئەو قسەیەی خۆی بردۆتە سەر کە پێی وایە **«مێژوو زانستێکی وشک و برنگ نییە، بەرهەمەکانی وەک ئەدەب وایە بۆ هەموانە، نەک بۆ شارەزایان بە تەنها»**. دیسان هەستم کردووە د. کەمال **«شێواز و نووسینەوەی رووداوەکانی رەوان و دڵگیر»** بووە، بۆیە **«بە ئاسانی دەرژێتە ناو هەست و دەروونی خوێنەرانەوە»**و بۆ رازاندنەوەی بەرهەمەکانیشی **«پەنای بردۆتە بەر شیعر و ئەدەب و داستان و ئەفسانە و پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی باب و باپیران و گاڵتەوگەپ و فۆلکلۆر و بەسەرهاتی دانسقە و خۆشی و ناخۆشی کۆمەڵاتی خەڵک»*** ئەوەشی بۆ زیاد دەکەم رۆژنامەنووسیی کوردی سەرچاوەیەکی دیکەی نووسینەکانێتی کە ئەوەیان مەبەستی سەرەکی کارەکەی منە، وام دانابوو لە نێو ئەو بابەتانەوە کتێبێکی (٣٠٠-٣٥٠) لاپەڕەیی لەم بەرگەدا

---

(*) رستەی ناو کەوانە رەشەکان لە کتێبی **«مێژوو»** وەرگیراون.

ئامادە بکەم، بەرایی وام دەزانی ئەم کارە زۆر بە ئاسانی بە من تەواو دەبێت، بەڵام دواتر لە کـاری مـەزەندە چووە دەرەوەو هەر بابەتە و هی دیکەی بە دوای خـۆیدا رادەکێشا، وەک دەبینن لە (٦٠٠) لاپەڕەی ئاوا کردووە، ئاگاداری ئەوەش هەم کە زۆر بابەتی دیکەی ماون.

بەڵام پەندی پێشـینانەی کـوردییە و دەڵێ: **«لۆمـەی عـەبدی لە عـەزابی قـەبری گـرانتـرە»**، لەبەر ئەوەی ئەنجـامی کـارەکـە مـاوەیەکی درێژی پێـچـوو، بۆیە چەند برادەرێکی دڵسـۆز زانیبـوویان کـە بە بێ ئەوەی د. کـەمـال ئاگـاداربێت، وا من خەریکی ئەو کارەم و کەوتنە سەرزەنشت کردنم، بەڵام دواتر یەکێکیان ئامۆژگاریی کـردم هەر چۆنێک بێت خـۆم بگەینمـە د.کـەمـال، لەوانەیە ئەویش پێی باش بێت پێشەکییەک بۆ ئەو کتێبەی بنووسێ و هەندێک خاڵی دیکەیان لە بارەوە بخاتەڕوو و لەوانەیە پێشکەشی خۆشەویستێکیشی بکات، ئەوەی راستی بێت خۆیشم حەزم دەکرد لە دوا ساتەکانی کاری نەخشەسازی کتێبەکەدا خۆم بگەیەنمە د. کەمال، ئەوە بوو لە کـۆتایی مـارتی ٢٠٠١، نزیک نیـوەڕۆکـەی گـەیشـتـمـە کـۆلـێژی پەروەردەی زانکۆی بەغـدا، بە داخـەوە دیار بوو بەخـتی من ئەو رۆژە وەکـو جـاران یار نەبوو، دەوام کۆتایی هاتبوو، بۆ بەختی کەچ تەلەفۆنی گەڕەکەکەشیان ئەو رۆژە گەرمی تێدا نەبوو، بۆیە هەوڵەکانم بۆ بینینی و تەنانەت قسە لەگەڵ کردنیشی بێهوودە بوون.

دواتر کە چوومە دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی کۆمـەڵێک گۆڤـاری **«رەنگین»**م کـڕی، ژمارە(١٣٨)ی بابەتێکی لەسەر خواجا ئەفەندی و ئەمین زەکی بەگ تێدا بڵاو کـرابووەوە، لە هەمـووان پتر سەرنجی راکێـشـام و دڵی خۆش کـردم، چونکە لەگەڵ بابەتەکەدا فۆتۆی دەستنووسی نامەیەکی تێدا بڵاوکراوەتەوە، کە د. کەمال بۆ سەرنووسـەری گۆڤـارەکەی ناردووە، تیـایدا بە ئاشکرا گوتوویە **«ئەو دڵی بەو کەسانە خۆشە کە نووسین و بیروڕایەکانی بڵاو دەکەنەوە»**، وەکـو هەنگوینم لە کلۆرەی داران دۆزیبـێـتـەوە وام بەسـەر هات، چونـکە بابەتەکـەم ئەوەندە لە لا شیـرین بوو، ئەوە بوو هەر زوو خۆم گەیاندەوە پیرە هەولێـرو هەمـوو ئەو بابەتانەشم خسـتـە سـەر پڕۆژەکـەم کـە لە ژمـارە(١٢٠) بە دواوەی **«رەنگین»**دا د. کـەمـال بڵاوی کردبوونەوە.

بەڵام مەراقێکم هەر لە دڵ ماوە، حەز دەکـەم خوێنەرانی لێ ئاگادار بکەمەوە، ئەوەی لە بیـرمـە سـەرەتای هەشـتـاکـان، دوو سـاڵ دوای بڵاوکـردنەوەی کـتێـبی

**«تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا»** بوو، مامۆستایەکی بەڕێز لە ناکاو بابەتێکی رەخنە ئامێزی لە بارەی ئەم کتێبەوە لە رۆژنامەی **«العراق»** بڵاوکردەوە، گوایە ئەم کتێبە رێبازی زانستی تێدا رەچاو نەکراوە، هەر لەوێدا توانجێکیشی لە کتێبی **«شەرەفنامە»** گرتبوو کە مام هەژار کردبوویە کوردی و هەشت ساڵ پێشتر **«کۆڕی زانیاری کورد»** بڵاوی کردبووەوە. رەخنەکەی مامۆستا ئەوەبوو چۆن دەبێ وێنەی هەندێ کەسی تێدا بڵاوبکرێتەوە؟ کە بە قسەی مام هەژار گوایە ئەوان بۆ شەرەفنامە کوردییەکە بەهرەیان پێی گەیاندبوو، لە نێوانیاندا بە باڵا برینێکی د.کەمال و وێنەکەی هەبوو، ئەو مامۆستایە وای باس کردبوو ئەگەر شەرەفخانی بەدلیسی جارێکی دیکە هەستابایەوە، دەستی دەدایە شیرەکەی و لەم کارەیان نارازی دەبوو..!

ئەوەبوو دوای کەمتر لە دوو مانگ د. کەمال لە گۆڤاری **«الثقافة»**ی ئەوسا وەڵامێکی پڕ لە زانیاری وردو زۆر بە هێمنی و نەرمی بۆ مامۆستاکە نووسیبووەوە، باسی گەورەیی کارەکەی مام هەژاری تێدا کردبوو کە  دوای ئەو چەند ساڵە شەرەفخان زیندوو بێتەوە، شانازی بەم کارەوە دەکات کە بە زمانی نەتەوەکەی خۆی بەم شێوەیە **«شەرەفنامە»**کەیان بۆ بڵاوکردۆتەوە، د. کەمال ئەو خاڵەشی تێدا باس کردبوو کە ئەوو **«تێگەیشتنی راستی»**یەکەی هەقیان بەسەر وەرگێڕانی کتێبی **«شەرەفنامە»**و- ئەگەر هەبێت - هەڵەت و پەڵەتییەکانیەوە چییە؟ یان ئەو هەقی بەسەر ئەوەدا چییە کە هەژار حەزی کردووە وێنەی هەندێ کەس لە کتێبەکەی بدا کە خزمەتی مێژووی میللەتەکەیان کردووە؟ دیارە مامۆستا ئاگاداری ئەوە نییە کە هەشت ساڵە کتێبەکە بڵاوکراوەتەوەو رۆژ لە دوای رۆژ نرخ و بایەخی لای دڵسۆزانی رۆشنبیری کوردی هەر لە زیاد بوون دایە، یان ئاگادار نییە کە **«شەرەفخان»** خۆی لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا ( ٢٠ ) وێنەی جوان و دانسقەی بڵاوکردۆتەوە.

ئەوەی لە بیرم مابێ، هەمووی چوار ساڵ بەسەر ئەو ئاگادارکردنەوەیەی د. کەمال دا رانەبرد بوو ئەو مامۆستایە کەوتبووە سۆراغی ئەو وێنانەی ناو **«شەرەفنامە»**، پێدەچێ دواتر لە یەکێک لە دەستنووسی کتێبخانەکانی دەرەوە چنگی کەوتبوون و لێکۆڵینەوەیەکی وردو شیاوی لە بارەوە نووسیبوو، لەوساوە چەند جار لە دەرەوەو لە کوردستانیش چاپ و بڵاوکراونەتەوە، تا دواجار لە لای خۆمان لە کۆڕێکی تایبەتیدا رێزی لێ گیرا.

لەگەڵ ئامادەکردنی ئەو **«چەند لاپەڕە..»**یەدا پانۆرامای ئەو ڕووداوانە تیژ بە بەرچاومدا تێدەپەڕین، چونکە منیش کۆمەڵێک وێنەی دانسقەو دەگمەنم لەم لاو ئەو لادا دەست نیشان کردبوون، د. کەمال گووتەنی دەمەویست **«هەر کەس دەنکە جۆیەکی ماڵی پاشای خواردووە»** وێنەیەکی لەم کتێبە بدەمێ، بەڵام هەر دوودڵ بووم، لە خۆم دەپرسی ئایا دەکرێ، ئەو وێنانە لەگەڵ کتێبەکەدا بڵاوبکەمەوە؟ بە تایبەتی، کە پێشتر جگە لە باسەکانی ناو بڵاوکراوەکان، نەمبینیوە هیچ کام لە کتێبەکانی د. کەمال وێنەیان تێدا بڵاوکرابێتەوە، بە هەرحاڵ من پێم وایە هەر کارێک دەستی بدرێتێ، تا بە ئەنجام دەگا پێویستە لە هەموو لایەنەکانی بکۆڵدرێتەوە، پێشم وایە وێنەو بەڵگەنامە زیاتر سەرچاوەی باوەڕپێکراوو متمانە پێکراون بۆ ڕوونکردنەوەی لاپەڕە نادیارەکان و سەلماندنی ڕاستییەکان کە مێژووی بە هۆیەوە بە ڕاست و دروستی بنووسرێتەوە. بۆیە بەپێی توانا هەوڵم دا بەشێک لەم وێنانە بخەمە ناو کتێبەکەوە کە هەندێکیان پێشتر لەگەڵ بابەتەکاندا بڵاوکراونەتەوە، هەندێکیشیان لە کتێبخانەکەی خۆم هەبوون، ئەوانی دیکەش دیاریی ئەم شوێن و کەسانەن:

* وێنەی جەنابی شێخ ئەحمەدی بارزانی و جەنابی مەلا مستەفا کە لە ڕاستەوە بۆ چەپ ئەو زاتانەش دەبینرێن: لوقمان بارزانی، شێخ محەمەد خالیدی بارزانی، شێخ عوبەیدوڵلای بارزانی، دیاریی دوکانەکەی مەلا نوورییە لە گەڕەکی عەقاری لە سلێمانی.
* وێنەی جەنابی کاک ئەحمەدی شێخ، دیاریی کۆمەڵەی کەلەپووری کوردە لە سلێمانی، بە هۆی کاک محەمەد مەردانەوە چنگمان کەوتووە.
* وێنە تاکەکەی جەنابی ئەحمەد چەلەبی دەباغ، دیاریی ناوەندی ڕۆشنبیری قەڵاتە، بەهۆی کاک محەمەد عەلی عوزێری چنگمان کەوتووە.
* وێنەی هەر یەک لە جەنابی مەلا فەندی و ئەحمەد چەلەبی دەباغ و ئەوانی دیکە دیاری کاک تاریق ئیبراهیم شەریفە.
* وێنەی بنەماڵەی سائیب دیاریی مامۆستا جەمال بابانە.
* وێنەی عەرەبی شەمۆ و هەژارو ئەوانەی دیکە هی ئەرشیفی جاسمی جەلیلە، دیاریی کاک فەیسەڵ دێهاتییە.
* ماڵی شەرەفخانی بەدلیسی بە هۆی ئاسانکاری د. فەهاد پیرباڵ کتێبی

**«کوردستان لە سێبەری مێژوودا»**ی **«سۆزانا میەسلاس»**ی بە خواستنەوە داینێ، وێنەی فڕۆکەکەی ویلسۆن و حەپسە خانی نەقیب و شێخ مەحموودم لە کاتی دیلیدا لەبەر گرتەوە.

* وێنەی جەنابی شێخ محیەدین شێخ سالح بەرزنجی و سالح جەبرو میرەکانی خۆشناوان، دیاریی کاک سالار عەبدولڕەحمانە.
* وێنەی قەڵاکەی هەولێر دیاریی مامۆستا نەژاد عەبدوڵلا عەزیزە.
* وێنەی ئیزدین شێر **«یەزدان شێر= عزەددین شێر»** لە کتێبی، البدرخانیون في جزيرة بوتان، مالميسانژ، ترجمة دلاور الزنگي وگولبهار بدرخان، الطبعة الاولى ١٩٩٨، مطبعة أميرال، بيروت لبنان، وەرگیراوە.

دەبێ ئەوەش بڵێم بابەتەکانی ناو ئەم کتێبە بە گوێرەی کرۆنۆلۆژیای ڕووداوەکان ریز کراون نەک بڵاوکردنەوەیان، لە دوا ساتەکانی پرۆڤەی کتێبەکەدا هەستم پێی کردووە دەبا بابەتی سێیەم و چوارەمی بەشی یەکەم هەر یەکەی لە شوێنی ئەوی دیکە دانرابان، بەڵام دواتر ئەو کارەم نەکردووە، نەبادا ئەو تێبینی و سەرنجانەم هەڵەیان تێکەوتبا کە پێشتر بۆ دیارکردنی نێوان بابەتەکان ئەستێرەم لە پەراوێز بۆ داناون و ڕوون کردنەوەم لە بارەیانەوە بۆ نووسیون.

ئەو پێرستەی بۆ ناوو شوێن دانراوە. سەرەتا ناوەڕۆکەکەیم هەمووی لەسەر کارت تۆمار کردوون، دواتر بەگوێرەی پیتەکانی هیجا ڕێکم خستوون. بەرایی بە تەما بووم کۆمپیوتەر ژمارەی لاپەڕەکانم بۆ دیار بکات. بەڵام لەدواجاردا،(خواو راستان) کارمەندانی سەر کۆمپیوتەر ئەنجامی کارەکەیان بەنیوەچڵی بەسەر دادامەوە، بۆیە ناچار بووم جارێکی دیکە بەسەر پەڕەی ترێسەکاندا چوومەوەو هەموو ئەو ناوو شوێنانەی پێشووم لەناو کتێبەکە دووبارە دەرهێناوە تەوەو ئەم جارەیان هەر لەسەر کارت ژمارەی لاپەڕەکانم لەتەک نووسینەوە.

ئەو کارەشم زۆر بە ساردییەوە دەکرد. چونکە یەکەمیان ئەو ماوەیە زۆر سەرقاڵ بووم و دووەمیشیان دەمویست یەکێکی باوەڕپێکراوم تووش بێت- دڵسۆزی ئەم کارە بێت وئەویش کتێبەکە بخوێنێتەوە- چونکە دەمێکە هەستم کردووە:

١- د. کەمال شێوازێکی ڕێنووس ونووسینی کوردی تایبەت بەخۆی هەبووە وهەیە، لەهەر شوێنێک خاڵ یان کۆمایەک لابدرێت، تەواوی مانای رستەو دەستەواژەکەی دەگۆڕێت.

٢- ئەوەندەی من شارەزام و لێی ئاگادارم د. کەمال هەر کاتێک بابەتێک بڵاو دەکاتەوە، دواتر داوا دەکا خۆی هەڵەبڕێری تێدا بکات، بۆ بەجێهێنانی ئەم حەزەشی، بیستوومە هەتا ڕۆژی هەینیانیش چەند کاتژمێر لەچاپخانە ماوەتەوە و هەڵەبڕێری نووسینەکانی خۆی کردووە.

٣- ئەو بابەتانەی لەدوو توێی ئەم کتێبە دایە بەرهەمی نێوان ساڵانی ١٩٨٩-٢٠٠٠ بووە، دیارە لەم ماوەیەشدا گۆڕانکارییەکی زۆر بەسەر ڕێنووسی کوردیدا هاتووە.

٤- ئەو ڕێنووسانەی ئێستا لەدەزگاکانی بڵاوکردنەوە لە کوردستان لەسەری دەڕۆن، جیایە لەو ڕێنووسەی کە تاوەکو ئێستاش بڵاوکراوەکانی بەغداو شوێنانی دیکە لەسەری دەڕۆن.

لەبەر ئەم هۆیانەو هی دیکەش هەوڵم داوە بابەتەکانی نێو ئەم کتێبە وەکوخۆی ڕێنووس بکرێنەوە، بەڵام وا پێدەچێت تا کۆتایی لەم کارەمدا ئەم خۆزگەیەم بەری نەگرتبێ، بۆیە دوای ئەوەی ئەو برادەرەم دەستنیشانکرد کە بە حەزو ئارەزووی خۆی کتێبەکە بخوێنێتەوە کە ئەویش کاک (ئازاد عوبێد) بوو. پەڕەی ترێسەکانم بۆی بردە ماڵەوە، دوای هەفتەیەک کە بۆی هێنامەوە دیاربوو کۆشێک هەڵەی چاپی چنیبووەوە، هەڵبەت حەزم نەدەکرد ئەم هەموو هەڵانە ببەمەوە دەزگاکەی چاپ و داوای دووبارە ڕاکێشانەوەی ترێسەکان بکەمەوە، ئەوەشیان زیاتر لەبەر ئەوە بوو گلەیی بەرایی و دوایی لەخۆم دوور بخەمەوە، چونکە سەرباری کاری هەڵەبڕێرەکانی دەزگاکە خۆیشم هەڵەبڕێریم تێدا کردبوو. بەڵام لەبەر فانۆس و لەمپە. بۆیە وشەی وەکو (نازیزم) ببووە (ئازیزم) و (ئەفسەر) ببووە (نەفسەر)... هتد

چاکترین حەل بۆ من ئەوەبوو بەشێنەیی و بەبێ دەنگی هەموو ترێسەکانی کتێبەکە ببەمە لای (زادە)ی هونەرمەندی ڕۆژنامەنووس. ئەویش دوای ئەوەی دوو هەفتە لای خۆی گلی دایەوە، دیاربوو ٨٠٪ ئەو هەڵانەی لابردبوو کەخۆم مەبەستم بوو، چونکە کاک (ئازاد)یش هەندێک وشەی بەهەڵە دانابوو کە لەئەسڵی بابەتەکەدا هەروا بووە، هەر بۆ وێنە ئەو پێی وابووە (هێوەر)ی د.کەمال دەبێ (هێور)بێت، ئەوانەی دیکەش کە هەڵەی هونەری زەق بوون دووبارە ترێسەکانمان ڕاکێشاوەتەوە.

لێرەدا دەمەوێ ئەوە بڵێم ئێستا دەبێتە کارێکی عەیب یان سەیرو سەمەرە ئەگەر

کتێبێک لەکوردستان بڵاوکرابێتەوە هەڵەی چاپی تێدا نەبێت. بۆیە لێرەدا خۆزگە دەخوازم، هەڵەکانی ناو ئەم کتێبە هەر ئەوانە بن کە (واو)ەکان ئەگەر لەوێ (تاقانە) بێت لێرە (جمکە)، یان وشەی (عیراق) (٧)ی سەر یایەکەی زیادەو د. کەمال پێی ناخۆشە بۆی دابنرێت یان (ل)ی ناوی وەکو (مووسڵ و سلێمان و سلێمانی) قەڵەو نەکرابێت دیارە ئەوەش، وەکو لەپێشەوە گوتوومە، لە ئەنجامی روونووس کردنەوەی بابەتەکان و کاری پیتچنین و هەڵەچنیەوە وای لێهاتووە.

هەیشە لای ئێمە (کوردو کوردستان)و دەستەواژە لێکدراوەکان وا دەنووسێ (واو)ەکەی نێوانیان بچێتە تەک (کوردستان).

خوا رەحممان پێ بکاو رایە جیاوازەکان زووتر لێک نزیک بکاتەوە.

خوازیارم وڵات هەر ئاوەدان و کوردستانیش پڕ لە ئاشتی بێت.

**عەبدوڵلا زەنگەنە**

**٢٠٠١/٥/٣**